

# مێژووی میسۆپۆتامیا و زاگرۆس

## پێش ماد تا کۆتایی ساسانییەکان

ماریژان مۆڵە ـ هێرتزفێلد ـ گێرشمەن

وەرگێڕانی

ئەردەڵان مام وسو دزەیی



# مێژووی میسۆپۆتامیا و زاگرۆس

## (پێش ماد تا کۆتایی ساسانییەکان)

## (بەرگی دووەم)

ماریژان مۆڵە ـ هێرتزفێڵد ـ گێرشمەن

**وەرگێڕانی**

**ئەردەڵان مام وسو دزەیی**

# خانەی موکریانی بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

- **مێژووی میسۆپۆتامیا و زاگرۆس (پێش ماد تا کۆتایی ساسانییەکان)**
- لە نووسینەکانی: **ماریژان مۆڵە، هێرتزفێڵد، گێرشمەن**
- وەرگێڕانی بۆ فارسی: زەبیحوڵڵا مەنسووری
- وەرگێڕانی بۆ کوردی: ئەردەلان مام وسو دزەیی
- نەخشەسازی ناوەوە: رێدار جەعفەر
- بەرگ: رێمان
- نرخ: (٢٠,٠٠٠) دینار بۆ هەر چوار بەرگ
- چاپی یەکەم : ٢٠١٤
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە
- چاپخانە: (هەولێر)
- **لەبەڕێوەبەراتیی گشتی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی (٧٤٢) ساڵی (٢٠١٣)ی پێ دراوە.**

**زنجیرەی کتێب (٨٥٢)**





**ماڵپەڕ:** www.mukiryani.com

**ئیمەیل:** info@mukiryani.com

# پێرست

## داریوش و یاخی بوونەکان لە دژی

ئێمە سەبارەت بە سێ ساڵی سەرەتای پاشایەتی داریوش، جگە لەو بابەتانەی لە لایەن مێژوونووسەکان نووسراوە، زۆر زانیاری و بەڵگەی سەلمێندراومان هەیە و ئەو بەڵگانە لە لایەن داریوش و لە چوارچێوەی کەتیبەکاندا نووسراوەتەوە و بۆمان ماوەتەوە.

هەندێ لەو کەتیبانە لە ئێران دۆزراونەتەوە و بەردەستن، هەندێکیشیان لە دەرەوەی ئێران بە تایبەتی بابل دۆزراونەتەوە.

بەپێی زانیاری سەر کەتیبەکان، زاندراوە داریوش لە ساڵی یەکەمی دەسەڵاتی وێڕای سەرکوت کردنی یاخی بووەکان، هاوسەرگیری لەگەڵ ئاتووسای کچی کوروش کردووە کە وەك دەزانن خێزانی پێشووی کەمبۆجییە و دواتر هی بەردیە و بەردیەی درۆیین یا گۆماتە کرد، هەروەها رێنووسی تازەی زمانی فارسی پەرە پێدا بە بێ گوشار خستنە سەر خەڵك.

تا سەردەمی داریوش رێنووسی ئێران، رێنووسی بزماری بوو و لە چل پیت پێکهاتبوو، کە سێ لەو پیتانە دەنگیان هەبوو و بریتی بوون لە (واو، یا، ئا)، چوار پیتیش وەك هێما بەکاردەهاتن و گۆڕانیان بەسەردا نەدەهات و وەك چوون ئێستا بە بینینی هێمای کۆمپانیایەکی فرۆکەوانی، دەزانین ئەو هێمایە هی چ کۆمپانیایەکە و بە هەمان شێوە خەڵکی ئەوکات دەیانزانی هێماکانی هەریەکە لە (ئاهورامەزدا، دەسەڵاتدار، وڵات و بۆم) یان دەردەخست.

سی و دوو پیتەکەی تر هەموویان پیتەکانی ئەلیفبای بزماری بوون و ئەو ئەلفبایە یەك پیتی هەبوو کە ئەمرۆ خاڵی کۆتایی ڕستە بوو (ئێمە بروامان وایە کە لە ئەورووپییەکانەوە وەرمانگرتووە) و هەر کاتێك ڕستەیەك کۆتایی دەهات، کۆتایی بە ڕستە دەهێنا.

فێربوونی ئەو چل هێمایە و تێکەڵکردنیان بۆ خەڵك قورس بوو و بۆیە ئەو کەسانەی خوێندەوار بوون لە ژمارەیەکی کەم تێپەڕی نەدەکرد و داریوش لە یەکەم ساڵی دەسەڵاتداریدا، رێنووسی ئارامی کە هەمان رێنووسی فینیقی بوو، کردە جێگرەوەی ئەو رێنووسە و هەر

ئەوکات خوێندنی بۆ هەموو منداڵەکان خۆڕایی و بە زۆری کرا و بڕیاردرا کە لە هەموو خوێندنگاکان، ڕێنووسی تازە بخوێندرێت.

هۆخشترە (جەمشید) پاشای ماد خزمەتی سەربازی دامەزراند و کوروش قوتابخانە پیشەییەکانی دامەزراند، داریوش خوێندنی بۆ هەموان و بە خۆڕایی کرد. بێ زێدەڕۆیی لەو کارە (٢٥٠٠) سەد ساڵ لە سەردەمی خۆی پێشکەوتبوو.

ڕێنووسی تازە کە لە ئێران بڵاو بۆوە، ڕێنووسی فینیقی بوو و لە ڕێگەی ئارامییەکان هاتە ئێران، ئارامییەکان نەتەوەیەك بوون کە لە رۆژهەلاتی زێی ئۆردەن و دەریاچەی (بحر المیت) دەژیان.

ڕێنووسی ئارامی بیست و دوو پیت بوو و کارکردن بەو ڕێنووسە زۆر ئاسانتر بوو لە کارکردن بە ڕێنووسی بزماری و لەو ڕێنووسە هەر پیتێك دەنگی یەك وشەی ئارامی بوو، یا دەنگی پیتی یەکەم دەربڕی یەك وشە دەبوو و بۆ نموونە: (ب) پیتی یەکەمی وشەی (بیت) واتە ماڵ بوو و (د) پیتی یەکەمی وشەی (دالّت) واتە دەرگا. (گ) پیتی یەکەمی وشەی (گیمەل) واتە وشتر و ئێستاش لە زمانی ئینگلیزیدا وشەی (کەمێڵ) بۆ وشتر بەکار دێت. (ه) دەنگی یەکەمی وشەی (هە) بوو کە لە ئارامیدا واتای درەخت دەدات و بە هەمان شێوە وشەکانی تر دەهاتن.

هەر ئەو ڕێنووسەیە کە دواتر بە ڕێنووسی پەهلەوی ناسرا و خەتی پەهلەوی کە هەندێك باوەڕیان وایە لە سەردەمی ئەشکانی و ساسانییەکان هاتۆتە کایەوە، بە هۆی داریوش هاتە ئێران وماوەیەکی خایاند تا ببێتە جێگرەوەی ڕێنووسی بزماری.

داریوش بۆ فێربوونی ئەو ڕێنووسە گوشاری نەخستە سەر کەسانی بە تەمەنو هاوکات نەیدەویست خەتی بزماری کە پەرتووکە ئایینییەکان و مێژووی ڕابردووی ئێرانی پێنووسراوەتەوە، لەناو بچێت. لە ڕاستیدا ئێران لەو قۆناغەدا بۆوە خاوەنی دوو ڕێنووس، یەکیان ڕێنووسی بزماری و ئەوی تر ڕێنووسی ئارامی.

خەڵکی ئاسایی ڕێنووسی تازە واتە ئارامیان دەزانی، بە بێ ئەوەی ڕێنووسی بزماری بزانن و چینی تایبەتیش، هەردوو ڕێنووسیان دەزانی. ڕێنووسی تازە دوای دوو سەد ساڵ، ڕێنووسی بزماری لەناو برد و دوای ئەردەشێری سێ یەم ، پاشای هەخامەنشی چیتر هیچ کەتیبەیەك بە ڕێنووسی بزماری نەنووسرا و یا ئەگەر نووسرابێت یا لەناو چوون و یا هێشتا لە ناو خاکدا نەدۆزراونەتەوە.

* * *

هێشتا یەك مانگ لە دەسەڵاتداری داریوش تەواو نەببوو، (ئات ری نا) کە حوکمڕانی خوزستان و یەك لە شەش سەرداره هاوپەیمانەکەی داریوش بوو بۆ لەناو بردنی گۆماتە، یاخی بوو و داریوش ناچاربوو بچێت بۆ جەنگی ئەو.

(ئات ری نا) لە شاری شووش بەرگری کرد و داریوش شارەکەی گەمارۆدا و مێژوونووسان دەڵێن نە تەنها لە وشکانی بەڵکو لە لای دەریاوەش، ئەو شارە گەمارۆدرا. ئەو وتەیە نیشاندەری ئەو بابەتەیە کە ئەو کات شاری شووش کە شارێکی گەورەی دنیای کۆن بووە، کەوتووتە کەناری دەریا.

گومانمان نییە لە سەردەمی هەخامەنشییەکان، کەنداوی فارس زۆر زیاتر لە ئەمرۆ هاتبۆوە ناو خاکی ئێران و شاری ئەهواز کەوتبۆوە کەناری دەریا. بەڵام گۆمان نابرێت شووش ئەوەندە لە دەریا نزیك بووبێت کە داریوش لە دەریاوە گەمارۆی دابێت و لەوانەیە مەبەستی مێژوونووسەکان، زێی (کورخە) بوو بێت کە بە پەنا ئەو شارەدا تێپەڕبووە، لە رۆژهەڵات خەڵك زێیە گەورەکانیان بە دەریا ناودەبرد و هێشتاش ئەو نەریتە تا ڕادەیەك ماوە.

شووش یەك لە شارە قایمەکانی رۆژهەڵات بوو و خاوەن دیوارێك بوو کە لە خشتی سوورکراو و بەرد دروستکرا بوو، دیوارەکە دوو سەد ئەستاد درێژ بوو و هەندێك دەڵێن سەد و بیست ئەستاد بووە (هەر ئەستادێك دووسەد مەتر بووە).

مێژوونووسی رۆمی (دیۆن) کە لە سەدەی دووەمی زایینی ژیاوە و هەشتا پەرتووکی مێژوویی نووسیوە و بیست و چوار لەو پەرتووکانە ماون، دەڵێت: داریوش بۆ سەرکەوتن بە سەر شاری شووش، سوودی لە روونی زەوی وەرگرت، ئەو روونە لە نزیك شووش هەبوو و دوای ئەوەی گڕیان تێ بەر دەدا، بە سەر پارێزەرانی شارەکەیان دادەباراند.

ئەمرۆ بێ ئەوەی دووچاری هەڵە ببین، دەزانین ئەو رۆنە هەمان نەوت بووە و ئەوە یەکەم جار بووە کە وەك چەك، سوود لە نەوت وەربگیرێت و دوای ئەوە زۆر جار ئەگەر کانی نەوت نزیك بوو بێت، بۆ جەنگ سوودیان لێ وەرگیراوە.

بە وتەی دیۆن، داریوش ئەوەندە ئاگری بەسەر پارێزەرانی شارەکەدا باراند کە پارێزگاری لە دیوارەکە لە لایەن بەرگریکارانەوە بۆو بە کارێکی ئەستەم و (ئات ری نا) هاتە سەر دیوار و وتی دەمەوێت لەگەڵ پاشا بدوێم، داریوش دەرکەوت و وتی دەوتەوێت چ بڵێیت؟

ئات ری نا وتی: ئەگەر لە فەرمانرەوایی خوزستان لام نەدەی و سزام نەدەی، خۆم ڕادەست دەکەم.

داریوش وتی: بەو یاخی بوونەت، متمانەت لای من نەماوە و بۆی بە هۆکاری کوژرانی بەشێك لە سەربازەکانم، بۆیە من ناتوانم تۆ لە دەسەڵاتەدا بهێڵمەوە و جگە لەمەش تۆ پێویستە سزای مەرگت بە سەردا بسەپێندرێت و بکوژرێیت.

ئات ری نا وتی: ئەگەر نەتوانی چاوپۆشی بکەی لە سزادانم، منیش بەرگری دەکەم و بەرلە کوژرانم هەموو خەڵکی ئەو شارە دەکوژم.

داریوش وتی: هەرچی دەتەوێت بیکە، من تۆ نابەخشم.

پاشای هەخامەنشی دەیزانی ئات ری نا دووچاری هەڵەی گەورە بووە و بە هۆی هەڵەکەیەوە لەوانەیە بکوژرێت، چونکە ئات ری نا دوای نائۆمێد بوونی لە بەرگری دەست دەکات بە کۆمەڵکوژی خەڵکی شار و ئەوانیش کاتێك بزانن کۆمەڵکوژی دەکرێت، لەوانەیە ڕاپەرن و بیکوژن، هەر ئەمەش روویدا و نیوەی شەو سەربازەکانی سەر دیوارەکان هاواریان کرد (ئات ری نا) کوژراوە و داریوش دەتوانێت بێتە ناو شار. بەڵام چونکە دیواریان لە پشت دەرگاکان دروستکرد بوو، ماوەیەکی پێچوو تا دیوارەکانیان رووخاند و دەروازەکانیان کردەوە.

داریوش بە ئەفسەرەکانی لەشکرەکەی وت کە وریا بن، لەوانەیە هەواڵی کوژرانی ئات ری نا ڕاست نەبێت و ئەوان بەو فێڵە بیانەوێت ڕامان بکێشن بۆ ناو شار و ئەوکات سەربازەکانمان لەناو ببن، بۆیە بەرلە چوونمان بۆ ناو شار داوا بکەن تا لاشەی ئات ری نا پێشانمان بدرێت. پارێزەرەکانی شاریش تەرمی خوێناوی ئات ری نایان هێنایە دەرەوەی شار و لە پێش هەندێ لە ئەفسەرەکانی داریوشیان دانا و پاشای هەخامەنشیش کاتێك دڵنیا بۆوە کە ئات ری نا نەماوە، رێگەی چوونی لەشکری بۆ ناو شارەکەدا.

هێشتا یاخی بوونی ئات ری نا تەواو نەببوو، هەواڵ بۆ داریوش هات کە حوکمڕانی ناوچەی میدیا واتە ئەو ناوچەیەی ئێستا بە کوردستان و ئازەربایجان دادەنرێت، بانگەشەی پاشایەتی کردووە و خۆی بە جێ نشینی خاوەن مافی مادەکان ناساندووە و بە ناوی پاشای ئێران نەك پاشای میدیا سککەی پارەی لێداوە.

باسکرا کە داریوش دەسەڵاتی بە حوکمڕانەکانی ویلایەتەکان دابوو کە سککەی پارە لێبدەن تا پارەی دروست لەبەر دەستی خەڵك هەبێت، بەڵام (فەراوەرتی) حوکمڕانی ویلایەتی میدیا بە ناوی خۆی و وەك پاشای ئێران سککەی لێدا بوو و ناوی پارە زێرەکەی بە (مادا) و ناوی پارە زیوەکەی بە (سادا) دیاریکردبوو.

داریوش کە تازە هاوسەرگیری لەگەڵ ئاتووسای کچی کوروش کردبوو و ئەوی وەك (نائب السەلتەنە) واتە جێ نشینی پاشا لە پازارگاد دیاریکرد و ئین تافرەنسی سەرداری بە ناوبانگی کردە حوکمڕانی فارس و فەرمانی پێ کرد کە لە کارەکاندا ڕاوێژکاری ئاتووسا بێت.

داریوش دەیویست لە سەر ڕێگەی ئازەربایجان سەر لە ڕانە ئەسپەکانی پاشایەتی بدات، لە ئێران ئەوکات حەوت ناوچە هەبوون کە بە (نسا) ناسرا بوون، بەڵام نسای گەورە کە مێگەلەکانی پاشایەتی لێ بە خێو دەکران لە کرماشان بوو و دەشتێکی پان و بەرین بوو کە ئێستا بە (ماهی دەشت) ناسراوە و لە کۆندا بە (نسا) ناودەبرا و لە سەردەمی هەخامەنشییەکان، مێگەلی ئەسپەکانی پاشایەتیان لەو شوێنە دەلەوەڕاند و سەرتاسەری نسا یا ئەو دەشتە گەورەیە، لەوەرگە بوو.

ناوچەی نسا سەرەرای ئەوەی ئەسپەکانی پاشایەتی لێ بەخێودەکرا، ناوچەیەکی بە پیت بوو بۆ ژیانی جۆرە جیاکانی ئاژەڵەکان و هەموو جۆرە ئاژەڵێك، تەنانەت دڕندەکانیشی لێ دەژیان و هیچ کەس ئەوانی ڕاو نەدەکرد و لە سەردەمی خەشایارشای کوری داریوش، حەوت هەزار کەس پارێزەر و ڕاهێنەری ئەسپ بوون لە ئەوێ.

گەزنەفۆن دەڵێت: ئەو ئەسپەی کە ساڵانە بۆ ئاهورامەزدا دەکرایە قوربانی، لەو شوێنە دەهێندرا. ئاریان بە هۆی ئەوەی بەشی یەکەمی ناوی ئاهورامەزدا (هۆر) بووە و هۆر و خۆر یەك وشە بووە و یەك مانا بوون، وای بیر کردووتەوە کە ئێرانییەکان ئەسپیان بۆ خوای هەتاو کردووە بە قوربانی.

لە کەتیبەی بەناوبانگی تەختی جەمشید، داریوش سەربەرزی دەردەبڕێت و دەڵێت ئاهورامەز وڵاتێکی پێ بەخشیوم کە ئەسپی چاك و خەڵکی چاکی هەیە و لە ناو کەتیبەکەدا وشەکانی (هو مەرتیە) و (هو ئەسپا) هەیە و وشەی (هو) هەر ئەوەیە کە ئەمرۆ بە واتەی (باش) دێت.

جوگرافی ناسی بەناوبانگی (یاقوت حەمەوی) لە پەرتووکی (معجم البلدان) باس لە پێنج شوێن بەناوی (نسا) دەکات کە یەکیان لە خوراسان و ئەوانی تر لە (فارس، کرمان، هەمەدان و کرمان). ئەو دەڵێت جگە لە شارێکی بچووك بەو ناوە، پارچەیەکیش بەو ناوە هەبووە و لە شاهنامەشدا دووجار ناوی نسا براوە، هەندێك کەس بڕوایان وایە شاری (فسا) لە ئێران هەمان (نسا) بووە و بە تێپەڕینی کات گۆڕاوە.

نسایەکی تر لە نزیك ئەشك ئاباد (عشق ئابادی ئێستا) هەبووە و لە (٣٠٠ پ. ز) پایتەختی ئەشکانییەکان بووە، لە ئاڤیستا ناوی نسا بەڵام بە شێوە ڕەسەنەکەی واتە

(نیسای)[1] [2]نووسراوە. دەبێت پیتی (ی) بە دەنگی بزوێن بخوێندرێتەوە، ئەو پیتە دوای هاتنی ئیسلام و لە فارسی گۆڕاوە بە (الف) و چووە کۆتایی هەندێ وشەی فارسی وەك (رفت، گفت و... هتد) بۆ نموونە: (گفتا شیخا هەر انچە گویی هستم، لیکن هر انچە می نمایی هستی)

لە سەردەمی پاشایەتی مادەکان، نسای کرماشان ناوەندی بەخێوکردنی ئەسپەکان بوو و دواتر لە سەردەمی هەخامەنشی و ساسانییەکان، دەشتی پان و بەرینی ماهی دەشت بۆ ئەم مەبەستە دیاریکرا. دوای هاتنی ئیسلام و لە سەردەمی دەسەڵاتداری خەلیفەکانی (ئۆمەوی و عباسی) هەر بەو شێوە مایەوە، بەڵام ناوەکەی گوڕا بە (مرجع القلعە) واتە (لەوەرگای قەڵا، قەڵای پەلەوەر) و ئەو وشەیە لە مانای دوو وشەی ناو کەتیبەی داریوش وەرگیراوە، داریوش ناوی قەڵای (سکیە هوتی) دێنێت کە لە نسای پاشایەتی مادەکان بووە و ئەو قەڵایە کە عەرەبەکان بە (مرجع القلعە) ناویان بردووە، تا ئێستا ماوە و تا ئەو دواییانە بە (هارۆن ئاباد) و دواتر بە (شاە ئاباد) ناوی برا.

کاتێك داریوش چووە نسا، وێڕای ئەو کارەساتانەی گۆماتە ئەنجامی دابوون، هێشتا سەد و شەست هەزار ئەسپ و ماین لەوێ مابوو و لە کۆتایی دەسەڵاتی داریوش، ژمارەی ئەو ئاژەڵە لەو شوێنە سەوز و بەرینەدا گەیشتە پێنج سەد هەزار. کاتی باس کردنی ئەسپەکانی پاشایەتی، پێویستە ئەسپەکانی لەشکرمان بیر بێت و ئەسپەکانی لەشکر هەمان ئەسپەکانی پاشایەتی بوون.

---

(١) لەوانەیە خوێنەری بەرێز لە زۆر باس کردنی وشەی نساماندوو بووبێت و بۆ ئەوانەی لێ کۆلینەوە لە ڕیشەی وشە جوگرافیەکان ناکەن، ماندوویەتی دێنێت، بەڵام ئەو وشەیەی لە مێژووی کۆنی ئێران ئەوەندە گرنگ بووە کە بزاندرێت لە کوێیە و بۆ بەو ناوە خوێندراوەتەوە، چەندین رۆژهەڵاتناسی ئالمانی تەمەنی خۆیان بۆ ناسینی ئەو شوێنە دانا و ئەگەر پەرتووکەکانیان رۆژێك وەربگێڕدرێت، ئەو کات دەزانین ئەوان لە مێژووی ئێمە بۆ ریشەی وشە و ناوەکان چەند ماندوو بوون. زەبیحوڵڵا)

(٢) (ئەو وشەیە لە ئاڤێستا هاتووە و پێش سەردەمی مادەکانە، وشەیەکی فارسی هەخامەنشی نییە و نموونە شیعریەکەش دەگەرێتەوە بۆ حەوت سەدە پێش و ئەو شێوە خوێندنەوەی لە لایەن زەبیحوڵڵا باس کراوە دەبێتە نیسایە و یا نیسێیە کە بە باوەڕی من وشەیەکی ڕەسەنی کوردییە و ئێستاش زۆر شوێن لە کوردستان بە ناوەکانی نیسێ، نیسار، نێسێ و هاوشێوەی ئەو ناوانە هەن، وەرگێر بۆ کوردی.)

هەخامەنشییەکان ئەسپەکانی لەشکری خۆیان کە لە رۆژهەڵاتەوە تا هندستان و کەنارەکانی دەریای ئاراڵ و لە رۆژئاواوە تا یۆنان و میسر دەرۆیشتن، لە نساوە دەبرد.

بە وتەی شوارتز رۆژهەڵاتناسی ئاڵمانی، ئەوکات لە نسا دوازدە ڕەگەزی جۆراوجۆر پەروەردەدەکرا و جۆرێکیان تایبەت بوو بە عارەبانە جەنگییەکان و جۆرێکی تر بۆ غار پێکردن بوون. داریوش دوای تێگەیشتن لە باروودۆخی نسا، بەرەو ئازەربایجان کەوتەرێ.

داریوش لە کاتی چوونی بۆ ئازەربایجان، رێگەی لە تەواوی ئەو کاروانانەی بەرەو ئەوێ دەچوون گرت تا هەواڵ بە فراوەرتی پاشای ئەوێ نەگات و ئەویش خۆی ئامادە نەکات، بەم هۆیەوە تەنها چەند رۆژێك پێش گەیشتنی داریوش بۆ ئەوێ، فراوەرتی بەئاگا هاتەوە لە جووڵەی لەشکر بەرەو تەبرێز (تۆرۆز، توروسی کۆن).

داریوش دەیزانی یەك لە هۆکارەکانی سەرکەوتن، بێ ئاگایی دوژمنە و ئەگەر بتوانێت ئەوکارە بکات، بێ گومان سەرکەوتوو دەبێت. دە رۆژ بەر لە گەیشتنی لەشکری هەخامەنشی بۆ ئازەربایجان، هەواڵ گەیشتە فەراوەرتی.

وێڕای کوششی داریوش بۆ پەردەپۆش کردنی جووڵەی لەشکرەکەی، بەڵام لە رۆژانی کۆتایی ئەو هەواڵە گەیشت، چونکە جووڵەی لەشکر وەك جووڵەی کاروانێك نییە کە سەرەنجەکان بۆ لای خۆی ڕانەکێشێت و تێپەڕبوونی لەشکرەێك چەند کاتژمێری دەویست تا لە بەرانبەر ئەو کەسە تێپەڕببێت کە لە کەناری جادەوە تەماشایان دەکات و ئەگەر لەشکرەکە گەورە بوایە ئەوە تێپەڕبوونیان بە کەناری جادەیەکدا چەند رۆژی دەویست، بۆیە لە سەردەمانی کۆنەوە زانستی بەرێدابردنی لەشکر هاتەکایەوە، واتە زانستی رۆیشتنی لەشکرەکان لە جادەکان بۆ ئاسان کردنی گەیشتنیان بە مەیدانی جەنگ.

شاری تەبریز دیواری بەرزی هەبوو و داریوش لە دوایین مانگی هاوینی ساڵی (٥١٩ پ. ز) لە تەبریز نزیك کەوتەوە و فراوەرتی بیری کردەوە ئەگەر لە پشت دیوارەکە پەنا بگرێت، بە هۆی هاتنی زستانی سەختی ئازەربایجان، داریوش ناچار بە گەڕانەوە دەبێت.

کاتێك داریوش گەیشتە تبریز، بینی ناتوانێت بچێتە ناوشار و فەرمانی بە ئەندازیارانی لەشکرەکەی کرد کە بە پشتیوانی سەرباز و کرێکارەکان، ئامێرەکانی گرتنی قەڵا دروست بکەن و زاندراوە ئامێری گرتنی قەڵا بریتی بوو لە مەنجەنیقە گەورەکان ( باسکرا کە هەندێ مەنجەنیقی سێ قاتیشیان دروستکرد) هەروەها هەندێ بورجی گەرۆکیان دروستکرد تا نزیك ببنەوە لە قەڵاکان و لە ناویانەوە بەرد و تیر و هەندێ کات ئاگر ببارێنن بۆ سەر پارێزەرانی

دیواری شارەکە و لەوکاتەدا لە نێوان بورج و دیوارەکەدا پردێکی تەختەی بەپەلە دابنێن و بەسەریدا بپەڕنەوە و بچنە سەر دیوارەکان.

بۆ ئێمە ئەستەمە بتوانین دیمەنی هێرشی هێرشبەران بۆ گرتنی قەڵاکان و بەرگری بەرگریکاران بۆ ڕێگرتنیان بێنینە بەرچاومان، چونکە لە سەردەمی ئێمەدا ئەو کارە بوونی نەماوە و بوونی چەکە ئاگرینەکان، بیری دروستکردنی دیواری بەرز و بەهێزی بۆ بەرگری نەهێشتووە.

ڕۆژهەڵاتناسی ئاڵمانی (مارکۆرات) لە شاری لایپزیکی ئاڵمانیا لە ساڵی (١٩٠٥ ز) پەرتووکێکی بۆ باسی جەنگی داریوش لە دژی فراوەرتی نووسیوە و کاتی خوێندنەوەی پەرتووکەکە دەردەکەوێت دەستبەجێ مەنجەنیقی گەورە و بورجی گەورەی جوڵاویان (کە لە دار دروستکراون) دروستکردووە.

داریوش فەرمانی هێرشیداوە و مەنجەنیقەکان بێ بەزەییانە بەرد بارانی پارێزەرانی شاریان کردووە و هەروەها لە بەشەکانی سەرەوەی بورجەکان و لەکاتی نزیك بوونەوەیان لە دیواری شار، بە تیر لە پارێزەرانیان داوە و هاوکات هەندێ لە سەربازەکان بە هۆی قادرمەی دار لە هەوڵی سەرکەوتن بۆ سەر دیوارەکاندا بوون و ئەوان زۆرتر لەو سەربازانەی کە لە بورجەکاندا بوون، دەبوونە ئامانجی تیر و بەردەکان.

داریوش دەیزانی وەرزی زستان نزیکە و هەوڵی دەدا پێش وەرزی سەرما کۆتایی بە جەنگ بێنێت، فەراوەرتیش بە پێچەوانەوە هەوڵی دەدا بەرگری درێژە پێبدات تا داریوش بە ناچاری بە هۆی زستانی سەخت بگەڕێتەوە. داریوش رایگەیاند هەر سەربازێك بتوانێت خۆی بگەیێنێتە سەر دیواری شارەکە و شوێنێك داگیر بکات، یەك (داریك) زێری پێدەدات و ئەو ڕێژەیە لە زێریش زۆر بوو بۆ هەر سەربازێك.

کاتێك بەردە قورسەکان لە مەنجەنیقەکانەوە هەڵدەدران و بەر سەربانی خانوویەك دەکەوتن، خانووەکە وێران دەبوو و بەم شێوەیە تەواوی ئەو خانوانەی تەبرێز کە دەکەوتنە ڕێزەی مەنجەنیق وێران بوون و دانیشتوانی ئەو خانوانە بە ناچاری پەنایان بردە بەر شوێنی تر.

یەکەم سەربازی داریوش کە توانی لە ڕێگەی پردۆکەی بورجەکانەوە بگاتە سەر دیواری شار، ناوی (گۆئێ دەرسە) بوو و دوای گەیشتنی بۆ سەر دیوارەکە بەو گورزەی بە دەستییەوە بوو، دوو لە بەرگریکارانی دیوارەکەی کوشت و بەم کارەی بۆوە هۆی گەیشتنی چەند سەربازێکی تری داریوش بۆ سەر دیوارەکە. ئەو بە دەرخستنەی ئازایەتی خۆی، بۆوە هۆی

دروستبوونی بنکەیەك بۆ سەربازەکانی داریوش لە سەر دیواری شارەکە و بە دروستبوونی بنکەکە، سەرکەوتن لەو دیوارە بۆ سەربازەکانی داریوش ئاسان بوو.

لە شوێنەکانی تری دیواری شار ئەو سەربازانەی دەیانەویست سەرکەون لە لایەن بەرگریکاران، دەکوژران یا هەڵدەدرانە خوارەوە و ئەوانەی دەکەوتنە خوارەوە، بە هۆی کەوتنیانەوە ئێسکەکانیان دەشکا و دەمردن. بەڵام لەو شوێنەی دیوار کە بنکەی ئەوانی لێ دروست ببوو، بە ئاسانی سەردەکەوتن و تا ژمارەی ئەوانەی دەچوونە ناوشار زیاتر دەبوون، ئاسانتر دەیانتوانی بەرگریکارەکانی شوێنەکانی تری سەر دیوارەکە دەربکەن.

ئەو رۆژەی سەربازەکانی داریوش توانیان لە سەر دیوارەکە بنکەیەك دروست بکەن، بەرانبەر بوو بە رۆژی سێ یەمی ئوکتۆبەری (٥١٩ پ. ز) و هەر ئەو رۆژەش فراوەرتی کە لە ترسی سەربازانی داریوش پەنای بردبۆوە بەر کۆشکی پاشایەتی، داوای پارێزرانی کرد و پەیامی بۆ داریوش نارد کە ئەگەر ئەو و  کەسوکاری نەکوژێت، خۆی بەدەستەوە دەدات و داریوشیش بۆ رێگرتن لە خوێن رشتنی زیاتر، داواکەی بەو مەرجە پەسەندکرد کە شوێنی نیشتەجێی ئەو لە لایەن داریوش بۆ داهاتوو دیاری بکرێت.

لە کاتی دەورەگرتنی تەبرێز، کوروش هەواڵی پێگەیشت کە (نادیل توبل) حوکمڕانی بابل خۆی بە نەبوکد نصری دووەم (بخت النصر دووەم) و پاشایەکی سەربەخۆ ناساندووە و بە ناوی خۆی سککەی پارەی لێداوە، هەروەها لەشکری تایبەت بە خۆی دامەزراندووە.

داریوش لە ئازەربایجان گەڕایەوە و لە پاییز و زستانی ئەو ساڵە واتە (٥١٩ و ٥١٨ پ. ز) وێڕای ڕاگەیشتن بە کاروباری حکومەت، نەخشەی دروستکردنی شاری پێرسپۆلیسی دانا. داریوش میسری بینی بوو و مەبەستی بوو لە شاری پێرسپۆلیس بینایەك دروست بکات کە وەك هەرەمەکانی میسر، دەستی رۆژگار توانای وێرانکردنی نەبێت و هەر بەشێك لەو بینایە، دەرخەری یەك لە نەریتە نەتەوەیی و ئایینییەکانی ئێران بێت.

ماوەیەك پێش پاییز و زستانی (٥١٩ و ٥١٨ پ. ز) داریوش دەستەیەك لە ئەندازیار و تەلارسازەکانی یۆنانی و میسری بۆ لای خۆی بانگهێشت کردبوو تا تەلارسازە ئێرانییەکان سوود لە نەخشە و بیرۆکەکانی ئەوان وەربگرن، پێویستە بزاندرێت پێش ئەوەی دەست بە کارەکانی دروستکردنی شارەکە بکەن، نەخشەکەیان لەسەر پێستەی ئاژەڵ ئامادەکردبوو و نەخشەکێشان لە جیهاندا زۆر کۆنە و (٢٥٠٠) ساڵ پێش زایین، پێش دروستکردنی هەر بینایەك نەخشەکەی لەسەر پێستەی ئاژەڵ دەکێشرا.

داریوش بە ئەندازیارە میسری و یۆنانییەکانی وت دەمەوێت تەواوی هونەرەکانی یۆنانی و میسری لەو کۆشکەی دروستی دەکەم ڕەنگ بداتەوە، بەڵام نابێت تێکەڵ بە هونەری ئێرانی بکرێت. ستوونەکانی تالاری گشتی ژمارەیان (٣٦) دانە بوو و ستوونەکانی تالاری ئاپادانا ژمارەیان (١٠٠) یا لە ڕاستیدا (٩٩) دانە بوون، هەموویان بەشێك بوون لە هونەری ئێرانی.

بیناسازە میسری و یۆنانییەکان لە بیناکانی خۆیاندا ستوونەکانیان کورت و ئەستوور دروست دەکردن، بەڵام لە پێرس پۆلیس ستوونەکان باریك و بەرز بوون. لەو نەخشەیەی بۆ تەختی جەمشید دانرا و دواتر بۆ داریوشیان هێنا و ئەویش هەندێکی لادا و چاکسازی تێدا کرد، هیچ شتێك نەبوو دەرخەری کولتوور و نەریت و ئایینی ئێران نەبێت و داریوش دەیویست تەختی جەمشید، بکاتە ئاوێنەی شکۆ و پایەداری کولتووری ئێران.

زانای باستان ناسی ئەمریکی (کامێرۆن) بەشێك لە پازدە هەزار کەتیبەکانی تەختی جەمشیدی خوێندۆتەوە، وتوویەتی: هیچ شتێك لە تەختی جەمشید بێ مانا نییە، هەر لە ژمارەی ستوونەکان تا شێوەی تراشینی بەردەکان و وێنە نەخشێندراوەکان، رێرەوەکان و ژوورەکان و هتد....، ئەگەر شتێك بەردەست کەوێت و ماناکەی نەزانین، تەنها دەگەڕێتەوە بۆ کەم زانی و نەبوونی زانیاری ئێمە.

داریوش دەیزانی ئەو کۆشکە گەورەیە لە سەردەمی ژیانیدا تەواو نابێت و ئەندازیارەکان پێشبینی پەنجا ساڵیان بۆ کردبوو،چونکە پێداویستییەکانی دەبوایە لە شوێنەکانی تری جیهان بهێندرێت و لە بەشەکانی تری پەرتووکەکە تا ئەوەندەی زاناکان زانیویانە باس لە دروستکردنی کۆشکەکە و مانای بەشە جیاوازەکانی لە رووی کولتوور و نەریتە ئایینی و نەتەوەییەکانەوە دەکەین، چونکە ئەو کۆشکە کە دەربڕی کولتووری ئێرانی باستانە، شایستەی باسکردنە بە درێژی.

وێڕای ئەوەی لە ساڵی (١٩٢٨ ز) دەستپێکی کاری هەڵکەندنی زانستی لە تەختی جەمشید لە لایەن (ئاندرێ گۆداری) فەرەنسی دەستی پێکرا و بەڵگە نامەی زۆری لە خاك دەرهێنا، بەڵام هێشتا سەرەتای لێکۆڵینەوەیە سەبارەت بە تەختی جەمشید و لەوانەیە پەنجا ساڵی تر تازەگەریەکانی کاری ئەو کۆشکە دەرنەکەوێت.

سەرەتای بەهاری ساڵی (٥١٨ پ. ز) داریوش بۆ جەنگی (نادین توبل) کە خۆی بە پاشای بابل دانابوو، بەرەو بین النهرین رۆیشت و لە دیجلە پەڕییەوە و گەیشتە فورات و شاری بابلی دەورەگرت. (کاتێك باسمان لە گەمارۆدانی ئەو شارە لە لایەن کوروشەوە کرد، بە تەواوەتی

باسمان لە هەڵکەوتەی شارەکە کرد و دووبارە باسکردنەوە دەبێتە هۆی ماندوو کردنتان و خۆمان دەپارێزین لەو بابەتە.)

داریوش بیست ساڵ دوای کوروش دەورەی ئەو شارەی گرت و لەو ماوەیەدا هەڵکەوتەی سروشتی شارەکە نەگۆڕا بوو و وەك جاران ئاو بە تەنیشت شارەکەدا دەڕۆیشت، نەك بە ناوەڕاستیدا. هەرچەندە دەوروبەری شار لە لاکەی تری زێ بوو، بەڵام نەدەکەوتە ناو دیواری شارەکە.

ئەگەر گریمان بکەین کە هەر وەك ئەو ئەفسانەی بۆ کوروش وتراوە، داریوش ئاوی زێیەکەی هەڵگەڕاندبێتەوە، ئەوکارە بە چەندین ساڵ لە هەڵکەندن ناکرێت و ئەو نەیدەتوانی بچێتە ناوشار. بەڵام ڕێگەی گەیشتن بە شار هەر ڕێگە کۆنەکە بوو کە شار دەورەی بگیرێت و هێرشی بکرێتە سەر، هەر ئەو کارەش ڕوویدا.

نادین توبل ناوی (بخت النصری دووەمی) بۆ خۆی دانا، چونکە ئەو یەهودییەکانی کردە کۆیلە. کاتێك کوروش بابلی گرت و یەهودییەکانی ئازاد کرد، وەك باسمان کرد هەندێکیان چونکە خوویان بەو شوێنەوە گرتبوو، نەڕۆیشتن و لە بابل مانەوە و دەیانزانی کە دواتر ژیانیان ئاسوودەتر دەبێت و هەرواش بوو و لە ماوەی ئەو بیست ساڵەدا ژمارەیان زۆرتر ببوو و گەیشتبۆوە بیست و پێنج هەزار کەس.

دوای ئەوەی نادین توبڵ بۆوە پاشا، بۆ جارێکی تر ئەوانی بە کۆیلە کردەوە و لە گاسنی بەستن و جووتی پێ دەکردن، یا خۆڵ و بەرد و خشتە و... هتدیان بە عارەبانە لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر پێ دەگواستنەوە.

لە ڕۆژی دەیەمی بەهاری ساڵی (٥١٨ پ. ز) کە داریوش دەورەی ئەو شارەی گرت، جەنگ دەستی پێکرد و داریوش بۆ گرتنی ئەو شارەش مەنجەنیقی بەکارهێنا، بەڵام بورجی جووڵاوی بەکار نەهێنا و هەڵیدا لە تەنیشت دیواری شار، چەند تەپۆلکەیەك دروست بکات تا سەربازەکانی لە سەر گردەکانەوە بچنە سەر دیواری شار.

بە ڕۆژ سەربازەکان بە هۆی ئەو تیر و بەردانەی لە سەر دیوارەکەوە ئاراستەیان دەکرا نەیان دەتوانی ئەو گردانە دروست بکەن، بەڵام شەوانە بە سوود وەرگرتن لە تاریکی، بە خۆڵ و بەرد و بەو شێوەی کە ئەندازیار و بیناسازەکان فێریان دەکردن، گردیان دروست دەکرد و دوو گردی گەورە و بە پانتایی لە لای باکوور و باشووری دیواری شاری بابل دروستبوو. لە شەوی

نۆزدەهەمی بەهار و لەو کاتەی بەشەکانی کۆتایی گردەکە دروست دەکران، مەنجەنیقەکانی داریوش کە گواستراوبوونەوە سەر گردەکان، بەردەوام بەردیان بۆ سەر پارێزەرانی شار دەباراند.

لەو شارەدا بە فەرمانی داریوش ژمارەیەکی زۆر مەشخەڵ ئامادەکرابوون تا لە کاتی هێرش بۆ سەر شارەکە پێ بکرێن و مەیدانی جەنگ رووناك بکەنەوە. لە گەڵ کۆتایی هاتنی دروستکردنی گردەکان، بە فەرمانی داریوش دەستەیەك سەرباز کە کاسکیان لەسەر و قەڵغانیان لە بەربوو و شمشیر و تیر کاری لێ نەدەکردن، کاری هێرشکردنە سەر دیوارەکەیان پێ سپێردرا و مەشخەڵەکانیش داگیرسان.

هاوکات لە گەڵ کۆششی سەربازانی داریوش بۆ سەرکەوتن لە رێگەی گردەکان، سەربازەکانی تر بە قادرمە لە شوێنی تری دیوارەکە سەرکەوتن. ئەو خۆدەرخستنە وێڕای ئەوەی بۆ مەبەستی سەرکەوتن بۆ سەر دیوارەکە بوو، هاوکاتیش گوشاری بەرگریکارانی لە بەرانبەر هەردوو گردەکە کەم دەکردەوە.

ئەو سەربازانەی داریوش کە لە باکوور و باشووری شار هێرشیان دەکرد، بە هۆی پۆششی بەریان کەمتر دەکوژران و توانیان لەسەر دیوارەکان، لە دوو شوێن بنکەی پالێشت بۆ ئاسان بوونی سەرکەوتنی سەربازەکان دروست بکەن و هێشتا شەو کۆتایی نەهاتبوو، سەربازەکانی داریوش لەسەر دیوارەکەوە خۆیان گەیاندە ناوشار و بەشێکیان بە پاچ و خاکەناز و پێداویستییەکانی شکاندن، بەرەو دەروازەکانی باکوور و باشوور چوون تا ئەو دەروازانە بەرووی سەربازەکانی پاشای هەخامەنشیدا بکەنەوە.

نادین توبل کاتێك دیتی سەربازەکانی هەخامەنشی گەیشتنە ناوشار، بەپەلە بەرگی یەك لە سەربازە کوژراوەکانی هەخامەنشی کردەبەر، ئەو نەیدەزانی سەربازانی هەخامەنشی هەموویان گەنجن و جگە لەوکەسەی مووی لێ نەهاتووە، ئەوانی تر ریشیان هەیە و بە پێچەوانەوە ئەو تا ڕادەیەك بە تەمەنە و ریشی نییە.

سەربازەکانی تر بە دیتنی ئەو سەربازە بە تەمەنە کە ریشی تاشی بوو، دووچاری سەرسوڕمان بوون و ویستیان بزانن ئەو خەڵکی کوێیە کە ریشی دەتاشێت، لە شێوەزاری نادین زانیان ئێرانی نییە و ئەویش کە زانی فێڵەکەی ئاشکرا بووە، دەستی بۆ شمشێرەکەی برد و ویستی بە جەنگ رێگەی خۆی بکاتەوە و بڕوات، بەڵام کوژرا.

تا نیوەرۆی رۆژی دواتر، داریوش توانی دەست بگرێت بەسەر تەواوی بابلدا و هیچ شوێنێك بەرگری لێ نەما و بە تەواوبوونی جەنگ، داریوش لە رێگەی جارچییەکان بە خەڵکی ڕاگەیاند

جگە لەو کەسانەی کە ملکەچ نەکەن بۆ یاساکانی سوپای هەخامەنشی کە دەستی بەسەر شاردا گرتووە، گیان و ماڵ و ناموسیان پارێزراوە و هیچ کەس دەست درێژی ناکرێتەسەر، تەنها ئەگەر بە یاساکانی داگیرکردنی شارەکە ڕازی نەبێت کە لە لایەن پاشای هەخامەنشی دانراون.

لە ڕۆژانی یەکەمی داگیرکردنی بابل، داریوش ئەو بیست و پێنج هەزار یەهودییە کۆیلەیەی ئازاد کرد کە لە بابل و لە کێڵگەکانی نادین توبل کاری بێ مووچەیان پێدەکرا و ئەوانیش ڕازی بوون تا بگوازرێنەوە بۆ کەنارە بە پیتەکانی (زایەندە روود) و نیشتەجێ بوونیان لەو شوێنە، ئەو شوێنە بە بوونەی نیشتەجێ بوونی یەهودییەکان لە ئەوێ بە (یۆدە) ناسرا کە لە زمانی فارسی (یەهودییە) دەکات و بە پێی یەك لە گێرانەوە مێژووییەکان، یەکەم دەستە لە کۆچ بەرانی یەهودی لە سەردەمی کوروش لە کەنارەکانی زایەندە رووود نیشتەجێ بوونە و دواتر کوچبەرانی سەردەمی داریوشیش چوونە.

پێش ئەوەی داریوش لە بابل بگەڕێتەوە، هەواڵی پێگەیشت کە (چیت ڕات هەمە) حوکمڕانی (ئاراخۆزیا) کە لە نەتەوەی سکا بوون، ڕاپەڕیوە و خۆی بە پاشا ناساندووە.

پێش ئەوەی باسی جەنگی داریوش و چیت ڕات هەمە بکەین، دەمانەوێت هەڵەیەکی مێژوویی ڕاست بکەینەوە کە هەروەك گەڕاندنەوەی ئاوی فەڕات لە لایەن کوروش بە هەڵە هاتووە، ئەویش ئاوا بە هەڵە ڕۆیشتووە و کەس نایەوێت دان بنێت بەو هەڵەیە کە تایبەتە بە وشەی (سکا).

ووشەی سکا هەر هەمان وشەی (سەگ) واتە ئەو ئاژەڵە بە وەفایەیە کە هەزارەها ساڵە پاسەوانی ماڵ و مێگەلەکانن و هەندێ لە مێژوونووسەکانی ئامادە نین وشەی سکا بە سەگ بزانن، لە کاتێکدا کە گومان لەو بابەتە نییە.

خێڵە سەرەتاییەکان، خەلکێکی سادە بوون کە ناوی ئاژەڵە خۆشەویستەکانیان بۆ خۆیان دیاری دەکرد و لە ئێران ناوی ئەسپ و گا و سەگ و کەڵەشێر (خروس بە فارسی) زیاتر لە ناوەکانی تر بۆ کەس و خێڵەکان بەکارهێناوە.

سەگ لە ئێران ئاژەڵێکی بە سوود و خۆشەویست بووە و ئەو نەتەوەیەی لە ڕۆژهەڵاتی ئێران دەژیان و شوێنی نیشتەجێیان ڕۆژئاوای ئەفغانستانی ئێستا و سیستان بووە، ناویان بە (سەگ)

دەخوێندرایەوە و سیستان لە دوو وشەی (سەگ)[٣] و (ستان) دروستبووە کە یەکەمیان ناوی ئاژەڵ و دووەمیان بۆ شوێنی نیشتەجێ بەکاردێت.

یۆنانییە کۆنەکان ڕۆژئاوای ئەفغانستانی ئێستایان بە (ئاراخازیا) ناو دەبرد و هەندێ کات سیستان (سەگستان) دەبۆوە بەشێك لە ئەوێ و بە پێچەوانەوە هەندێ کات ئاراخازیا دەبۆوە بەشیك لە سیستان و زێی گەورە و بەناوبانگی (ئێتی ماندرۆس) کە ئێستا بە (هێرمەند) ناسراوە، دوای تێپەڕینی بە ئاراخازیا دەچۆوە ناو سیستان و دەڕژایە دەریای (هاموون). مێژوونووسەکانی ئێستا پێیانوایە ئەگەر ناوی سەگ بۆ (سکا) بەکاربێت بێ ڕێزی بەرانبەر سکاکان کراوە، لە کاتێکدا ئەو کەس یا خێڵەی لە ڕابردوو ناوی سەگی بۆ خۆی دانابوایە، شانازی بەخۆی دەکرد.

بەداخەوە تەواوی ئەو کەتیبانەی لە شاخەکانی ئێران نووسرابوون، لەناوبران و لە ئاکامدا لە هەموو زمان هەخامەنشی تەنها چوارسەد و پێنج وشە جگە لە وشە دووبارەکان مایەوە و ئەگەر ئەو زمانە بە تەواوەتی بەردەست مابوایە، نەتەنها مێژووی کۆن دیاردەکەت، بەڵکو ناسینی ڕەگەکانی وشەکانی فارسی بە تەواوی دەبوو و ئەمڕۆ دەزاندرا کە هەر وشەیەك لە سەرەتاوە لە چ ڕەگێك بووە و سەبارەت بە وشە و زمانی فارسی هەخامەنشی کەس دووچاری هەڵە نەدەبوو.

دوای ئەوەی تەواوی حوکمڕانەکانی ناوچەکانی ئاراخازیا و سیستانی کردە بەر فەرمان بۆ خۆی، (چیت ڕات هەمە) خۆی بە پاشای ئێران ناساند و وتی جێ نشینی کەمبۆجییەیە و هەموو ویلایەتەکان (خشترە پاوەن) پێویستە بەرفەرمانی بن. ئەو وەك هەموو والیەکانی ویلایەتەکان مافی سککە لێدانی هەبوو و لە سەر سککەی پارەکەی نووسی:"چیت رات هەمە بە یاوەری ئاهورامەزدا بۆتە پاشای ئێران."

---

(٣) (لەو بابەتە ناکرێت هاوڕای زەبیحوڵڵا بین و هەر بۆ پشت ئەستووربوونی وتەکەمان شیعرێکی شانامەی فێردۆسی هەیە کە وەڵامی رۆستەمە بۆ پاڵەوانێکی تورك کە لە جەنگدا پەلاماری دەدات و دەڵێت: "مرا نام روستم کند زال زر، تو سگزی چرا خانی ای بدگوهر" واتە "من لە لایەن زاڵەوە ناوم رۆستەم نراوە، تۆ بۆچی بە سەگ زی ناوم دەبەی ئەی بێ نرخ" واتە فێردۆسی کە لە زۆر بابەت سەرچاوەی زەبیحوڵڵا بووە ئەو ڕایە بە دروست نازانێت. لە لایەکی تر پاشگری (ان) لە زمانی کوردی بۆ کۆ بەکار دێت و لە زمانی فارسید (ها) بەکاردێت، سکاکان یا سەکزییەکان ناویان لە ئاژەڵ وەرنەگیراوە و دەشبینین لە کوردستان ناوی شاری وەك سەقز هەیە. وەرگێر بۆ کوردی)

سنووری دەسەڵاتی ئەو پیاوە لە کەناری زێی جەیحون تا کارمانیا (کرمانی ئێستا) بووە، ئەو وەك تەواوی دانیشتوانی سیستان باڵابەرز بوو و سەربازەکانی تیر و کەوان و گۆپاڵی قورسی دروستکراو لە داری ئەرزەنیان (ئەزجەن) هەبوو، داری ئەرزەن جۆرێکە لە بادامی کێوی کە لە هەندێ ناوچەی ئێران و بە تایبەتی لە دەوروبەری بیابانی ناوەندی و لەوانەش لە سیستان دەروا و دارێکی زۆر قایم و قورسە.

چیت ڕات لەشکری سوارەشی هەبوو و سەربازەکانی لە جیاتی ئەسپ سواری گا دەبوون و کاتێك غاریان بە گا دەکرد ئەوەندە خێرا دەبوون کە خێراییان دەگەیشتە خێرایی ئەسپ. ئەو دوای ئەوەی پاشایەتی خۆی ڕاگەیاند، دەیزانی دەبێت لەگەڵ داریوش جەنگ بکات، بۆیە هەفتا هەزار سەربازی لەو نەتەوە و خێڵانەی دەکەوتنە سنووری پاشایەتییەکەی کۆکردەوە.

مێژوونووسە یۆنانییەکان نووسیویانە ئەو سی هەزار سەربازی سکایی هەبوو و هەفتا هەزار سەربازی لە نەتەوەکانی تر ئامادەکرد و بۆوە خاوەنی سەد هەزار سەرباز، بەڵام سەربازەکانی تر پیادە بوون. ئەوکات لە ئاراخازیا (ئەفغانستان) و کارمانیا (کرمان) ئەسپ دەست نەدەکەوت.

پاشای تازەی ئێرانی ڕۆژهەڵاتیش ئەسپی نەبوو تا بیانداتێ و گای نێریش بەو ڕادەیە زۆر نەبوون کە بتوانن هەموویان سوار بن. لەشکری پاشای تازەی ڕۆژهەڵاتی ئێران بە لەشکرێکی بەهێز دەژمێردرا، بەڵام دوو پێداویستی نەبوو کە بریتی بوون لە: یەکگرتوویی شێوەی جەگ و ئەوەی تریش عارەبانەی جەنگی. ئەو خێڵانەی هاتبوونە ناو لەشکری ئەو، هەریەکەیان بە شێوەی تایبەتی خۆی جەنگی دەکرد و هیچیشیان جەنگ کردن لەگەڵ عارەبانە جەنگییەکانیان نەدەزانی.

داریوش پاشای هەخامەنشی زۆر گرنگی بە عارەبانەی جەنگی دەدا و لەوانەیە ئەو گرنگیە بە هۆی ئەوە بووبێت کە سەردەمی گەنجی لە لەشکری کەمبۆجییە لە بەشی عارەبانە بەسەر بردبوو و ماوەیەکیش فەرماندەی ئەوان بوو و دواتر بۆوە فەرماندەی لەشکرەکە. ئەو دوای گەڕانەوەی لە بابل و لە کاتێکدا کە هێشتا هاوسەرەکەی (ئاتووسای کچی کوروشی) بە جێنشینی پاشایەتی دانابوو، بەرەو سیستان کەوتەرێ.

ئەو ڕێگایەی کە داریوش لەشکرەکەی خۆی پێدا برد، هەمان ئەو ڕێگەیە بوو کە کوروش دروستی کردبوو و عارەبانەکان دەیانتوانی پێی دا بڕۆن، دواتر داریوش ئەو ڕێگەیەی فراوانتر کرد و دوای دووهەزار و پێنج سەد ساڵ، ئەو وێنانەی لە ئاسمانەوە گیراون تا ڕادەیەك دەرخەری بەشێك لە پاشماوەکانی ئەو ڕێگەیەن و بەشەکانی تری ڕێگەکەش یا بە لم داپۆشراوە یا بە هۆی

گۆڕانکاریەکانی تویّی دەرەوەی زەوی بە تایبەتی لەو زەویانەی توانای کشتوکاڵیان نامێنێت، لەناو چووە.

ئەو ڕێگەیە لە لایەن داریوش کرایە رێگای تەواوی ئاسیا، ئەو ڕێگەیە لە کەنارەکانی دەریای مەرمەرەی تورکیای ئێستا دەستی پێدەکرد و لە هندستان کۆتایی دەهات و هەندێ ڕێگەی لاوەکی وەك ڕێگەی ئاراخازیا و خوراسان و کارامانیا دەهاتنەوە سەر ئەو ڕێگەیە.

داریوش لە دەیەم ساڵی پاشایەتیدا کۆمەڵێك شارێی تری دروستکرد و بە رێگەی سەرەکی ئاسیای بەستنەوە و ئەو رێیە بە خوراساندا تێپەردەبوو و لە رۆژئاوای چین کە بە (خوتەن) ناسراوە کۆتایی دەهات، هەر ئەو رێگەیە بوو کە لە سەردەمانی دواتر و لە لایەن مێژوونووسەکان بە رێگای ئاوریشم ناسرا. بە درێژایی ئەو رێگەیەی لە فارس دەچوو بۆ سیستان، لە هەر پێنج تا شەش کیلۆمەتردا ئاوەدانی یا جەنگەڵ و سەرچاوەی ئاو هەبوو و ئێستاش جگە لە بیابانی بێ سوود نییە، بەڵام هەندێ لە جەنگەڵەکان ماون و بەهاران سەوز دەبنەوە و دانیشتوانی ناوچەکان سوودیان لێ دەبینن.

داریوش لە رۆژی شەستەمی بەهاری ساڵی.... گەیشتە شوێنێك لە نزیکی سیستان، کە ئێستا وێرانەی قەڵایەك بە ناوی (تور) لێ ماوە. (لە کەتیبەی داریوش رۆژی رووداوەکانی ساڵانی سەرەتای پاشایەتی نووسراوە، بەڵام ساڵ دیار نەکراوە و بۆیە شوێنی ساڵ بە بۆشی هاتووە.)

ئەو ناوچەیە لە بیست و پێنج سەدە پێش سەوز بوو و ئێستا بۆتە بیابان، چونکە ئەوکات لە سەردەمی داریوشدا دەریاچەی هاموون ئەوەندە گەورە بوو کە وەك دەریایەکی ناوخۆیی ئێران دەژمێردرا و گەورەیی زێی هیرمەند چەند بەرانبەری ئێستای بوو.

هیرۆدۆت و گەزنەفۆن و کەتزیاس زێی هیرمەندیان بە یەك لە گەورەترین زێیەکانی ئاسیا ناسیوە و ئەو زێیانە لە کاتی پڕ ئاوی و لە وەرزی بەهاردا وەك دەریاچەیەك لە رۆیشتندا دەردەکەوتن و ئاوێکی زۆر دەهاتە ناو دەریاچەی هاموون و هەرچەندە گەرمای هاوینی سیستان زۆر بوو، بەڵام بە هۆی بە هەڵم بوونی ئاو، بەردەوام لە دەوروبەری دەریاچەکە جەنگەڵ و لەوەڕگە هەبوو.

لە ساڵی (١١٠ پ. ز) بوومەلەرزە لە ئێرانی رۆژهەڵاتیدا و هەندێ لەو شاخانەی دارووخاند کە سەرچاوەی ئاوەکانی هیرمەند بوون و رێگەی رۆیشتنی ئاوەکان گۆڕا و زێی هیرمەند ئاوەکەی کەم بۆوە. لەگەڵ ئەوەشدا لە وەرزی بەهار پانی ئەو زێیە دەگاتە سێ سەد مەتر و بەرزی ئاوەکەشی سێ مەتر دەبێت و جووڵەی ئاوەکەشی ئەوەندە بەهێز بوو کە تەنانەت فیل خۆی بۆ ڕانەدەگرت.

چیت رات هەمە کە زانی داریوش و لەشکرەکەی لە سیستان نزیك دەبنەوە، لەشکرەکەی خۆی لە دەشتێك بە ناوی کەلاتە تور (قەڵاتی تور) جێگیر کرد. تەواوی پیاوانی لەشکری چیت رات ئازا بوون، بەڵام لە یەکەم کاتی جەنگەوە کەوتنە بەرانبەر چەکێك کە شێوەی بەربەرەکانی ئەویان نەدەزانی و ئەویش عارەبانە جەنگییەکان بوون.

داریوش لە گەڵ هاتنی بۆ مەیدانی جەنگ، تێگەیشت ئەو دەشتە تەختە باشترین شوێنە بۆ بەکار خستنی عارەبانەکان، ئەوکات بە دووری دەیان کیلۆمەتری درێژی و پانی ئەوێ دەیان هیچ بەرز و نزمییەك نەدەبیندراو و عارەبانە جەنگییەکان لە هەر لایەکەوە دەیانتوانی خۆیان بگەیێننە لەشکری دوژمن. عارەبانەکان کە لە پێشیانەوە داسی تیژ هەبوو، وەك گیا کەوتنە دورینەوەی سەربازەکانی چیت رات و دەیانخستن و بەسەریاندا دەرۆیشتن.

سەربازەکان نەیاندەتوانی عارەبانەکان لەناو ببن چونکە ئەوان لە چوارچێوەی دەستەی بیست و پێنجی و لە یەك ریزدا دەجوولان تا ئەسپەکانیان لە دوولاوە نەکوژرێن. لە دواوەی عارەبانەکانیش سەربازەکانی داریوش لە هێرش دابوون و توانیان لەشکری دوژمن بکەنە چەند بەشی جیا لە یەك.

ئەو رۆژە گەرمای زۆری سیستان جەنگکەرەکانی هەردوولای خستبۆوە ئازارەوە، بەڵام چارەی تریان نەبوو جگە لە بەردەوام کردنی جەنگ و خۆڕاگری بەرانبەر بە گەرما و دوو کاتژمێر و نیو دوای نیوەرۆ، پاشای سیستان و ئاراخازیا گەمارۆ درا و ئەسیر بوو، وێڕای ئەوە هەندێ لە سەربازەکانی تا ئێوارەی ئەو رۆژە درێژ و گەرمەی بەهار بەرگریان کرد و کوژران، یا بە هۆی برینداربوونەوە توانای جەنگیان نەما.

داریوش لە تەواوی سەردەمی پاشایەتیدا، بەرانبەر بەو کەسانەی لێی یاخی دەبوون، زۆر بێ بەزەیی بوو و دوای دەستگیر کردنیان بە شێوازی زۆر نامرۆڤانە و سەخت دەیکوشتن، بەڵام سەبارەت بە چیت رات هەمە و سەربازەکانی بە هۆی ئازایەتییەکەیەوە جیاواز بوو و نەرمی نواند و پێی وت: بە هۆی یاخی بوونت لە دژم، سزات ئەوەیە کە دەبێت بە زیندوویی پێستت لە لاشەت داماڵدرێت، بەڵام چونکە زۆر ئازا بووی و سەربازەکانت ئازایانە جەنگان، رێگەت دەدەم بۆ خۆت شێوەازی مردنەکەت هەڵبژێری.

چیت ڕات وتی: ئەگەر دەتەوێت بەرانبەرم لێبوردە بی، لێ بگەرێ تا زیندوو بمێنمەوە.

داریوش وتی: ناتوانم ڕازی بم بە زیندوومانەوت و تۆ دەبێت بکوژرێی.

چیت رات وتی: کەواتە لێم بگەرێ با بە دەستی خۆم بکوژرێم.

داریوش ڕازی بوو و فەرمانی کرد خەنجەرەکەی خۆی بدەنەوە کە لێیان ستاندبوو و دوای ئەوە چەند کەسێك لە گاردی پارێزەرانی داریوش بۆ ئەوەی ڕێگەی فێڵ کردن لە چیت رات بگرن چواردەوری داریوشیان گرت تا هێرش نەکاتە سەری ، بەڵام چیت رات فێڵی نەکرد و خەنجەرەکەی خستە سەر سینگی و بە گوشارێکی توند، لە دڵی خۆی چەقاند و کەوتە سەر زەوی و دوای چەند خولەکێك مرد و بەم شێوەیە داریوش لە دوژمنێکی بەهێز ڕزگاری بوو.

ئەوکاتەی داریوش لە سیستان و ئاراخازیا بوو، دوو ڕووداو ڕوویاندا کە زۆر کاردانەوەی هەبوو. ڕووداوی یەکەم یاخی بوونی (ئین تافرەنس) ئەفسەری بەناوبانگی داریوش بوو لە پازارگاد و ڕووداوەکەی تر کە بۆ یەکەمجار بوو، پێکدادانی نێوان هەخامەنشی و کارتاژەکان بوو. لە جەنگی دەریایی هەخامەنشی و میسرییەکان و ئەوکاتەی کەمبۆجییە لە ئەفریقا بوو، ژمارەیەك لە کەشتییە جەنگییەکانی ئێران نوقم بوون.

کەمبۆجییە کاتێك ویستی لە میسر بگەڕێتەوە، پڕکردنەوەی کەموکوریەکانی بە فەرماندەی لەشکری دەریایی (هیست ئەسپ) سپارد و ئەویش بە خێرایی زۆر دەستی بەو کارە کرد و کارگەکانی کەناری دەریای مەدیتەرانەی ناچارکرد تا کەشتی جەنگی بۆ دروست بکەن، چەتە دەریاییەکانیشی لە کاتی گرتن نەدەکوشت و دەیخستە پشت سەڵبەکانی کەشتییەکان، چونکە ئەو سەردەمە هەرچەندە سوود وەرگرتن لە چارۆکە لە کەشتیدا لە لایەن هەموو نەتەوەکان هەبوو، بەڵام ئامڕازی سەرەکی بۆ جووڵەی کەشتییە جەنگییەکان سەڵبە بوو و چاروگە و هێزی با لە پلەی دووەم بوو.

ئەو شێوە سزایە بۆ ماوەی بیست و چوار سەدە بەردەوامبوو و تەنانەت لە سەدەی نۆزدەهەمی میلادی و لە سەردەمی دەسەڵاتی ناپلیۆن لە فەرەنسا، دادگاکانی فەرەنسا تاوانبارە کارامەکانیان بە سزایەك بە ناوی (گاڵمە) سزادەدا و سزاکە بریتی بوو لە سەڵبە لێدان لە کەشتییە جەنگکەرە سووکەکانی. لە تەواوی سەردەمەکان لە کوروش و داریوش تا سەدەی نۆزدەهەم تاوانباران دەکرانە سەڵبە لێدەر لە کەشتییەکان، چونکە سەڵبەلێدان ئەوەندە قورس بوو کە هیچ کەس نەیدەویست تەنانەت بە پارەش ئەو کارە بکات.

هەخامەنشییەکان لە دەریای مەدیتەرانە و بە تایبەتی بەشی ڕۆژهەڵات و باشووری ئەوێ بەهێز بوو و کارتاژیش کە دەکەوتە شوێنی ئێستای تونس، دەیەویست لە دەریای مەدیتەرانە بازرگانی بە تەواوەتی لە دەست خۆی بگرێت و هەخامەنشییەکان ڕێگر بوون لەو کارە، بۆیە دەوڵەتی کارتاژ تێکۆشان تا بازرگانی ئەوان لە دەریای مەدیتەرانە بڕۆخێنن و ژمارەیەك لە

فەرماندە دەریاییەکانی خۆیان ناچارکرد هێرش بکەنە سەر کەشتییە بازرگانییەکانی هەخامەنشییەکان و نوقمی ئاویان بکەن یا بە دەستکەوت بیانهێنن، سەرنشینەکانی کەشتییەکانیش ئەگەر ئێرانی بن لە گەڵ خۆیان بیانهێنن تا سەڵبە لێ بدەن.(٤)

هەر کەشتییەکی هەخامەنشی لە بەندەرەکانی ڕۆژهەڵات و باکووری دەریای مەدیتەرانە بۆ باشوور یا ڕۆژئاوا چووبا، لە لایەن کارتاژ نوقم دەکرا و ئەوەندە بارودۆخەکە لەسەر کەشتییەکان سەخت کرا کە هیچ کەشتییەکی هەخامەنشی جا چ فەرماندەکەی ئێرانی بوایە یا نا ئێرانی، نەدەوێران بچنە دەریا.

کارتاژییەکان دوای نوقم کردن یا بە دەستکەوت بردنی کەشتییەکان، تەواوی سەرنشینەکانیشیان بە ئەسیر دەبرد و دەیان کردن بە سەڵبە لێدەر لە کەشتییەکانیاندا. هێزی دەریایی هەخامەنشی کە لە جەنگی میسر لاواز ببوو، ئەوکات ئەوەندە بە توانا نەبوون کە دەریا سالارەکەیان دەسەڵات بەسەر دەریای مەدیتەرانەدا بگرێتەوە. لە لایەکی تر فەرماندە کارتاژییەکان لە کارەکەیاندا شارەزا بوون و دەریاوانی چاك بوون و لە هەموو وەرزەکاندا دەیانزانی بارووداۆخی کەشوهەوا و دەریا چوون دەبێت، دەووترا دەریاوانە کارتاژییەکان توانیویانە بگەنە کۆتایی زەریای ڕەش (زەریای ئەتلەسی) و لە ئەوێ جیهانێکی تازەیان دۆزیوەتەوە.

بابەتی دۆزینەوەی جیهانی نوێ لە لایەن کارتاژەکانەوە ئەوەندە ناوبانگی دەرکردبوو کە لە سەدەی پازدەهەم و لە کاتی دۆزینەوەی ئەمریکا، ناویان لێنا جیهانی تازە کە هەمان ناوی کۆن و باو بوو کە لە کارتاژ بەکاردەهات.

سەرئەنجام فەرماندەی هێزی دەریایی هەخامەنشییەکان ناچاربوو کەشتییە جەنگییەکانی بۆ پارێزگاری لە کەشتییەکانی تر، لە لایەکی مەدیتەرانە بۆ لایەکی تر بنێرێت. لە هاوینی ساڵی (٥١٧ یا ٥١٦ پ. ز) کەشتیگەلی هەخامەنشی لە ڕۆژهەڵاتی دەریای مەدیتەرانە بەرەو

---

(٤) (ناوی ئەو کارە لە زمانەکانی ئێستای ئەورووپا بە (کورەس) دێت و ئەو فەرماندە کەشتیوانەی کە بەو کارەش هەڵدەستێت بە (کوروسەر) دەناسێنن، جیاوازی ئەوان لە گەڵ چەتەکانی دەریا لەوەدایە کە ئەوان بە فەرمانی دەوڵەت بەوکارە هەڵدەستن و دەستکەوتەکانیان دەدەنە دەوڵەت، بەڵام چەتەکان دەستکەوت بۆ خۆیانە. ئەو کارە لە جەنگەکانی یەکەم و دووەمی جیهانی لە لایەن فەرماندەکانی کەشتیوانەکانی ژێر دەریایی ئاڵمانی بەرانبەر بە کەشتییەکانی بەریتانیا ئەنجامدرا و تا توانیان کەشتییە بەریتانییەکانیان نوقم کرد، زەبیحوڵڵا.)

بەندەری ئەسکەندەریە (کە ئەو کات ناوی تری هەبوو) چوو. زانیاریمان لە بارەی ژمارەی کەشتییە بازرگانییەکانی ئەو کاروانە نییە، بەڵام دەزانین کە حەوت کەشتی جەنگی لەگەڵدا بووە.

زانیاریمان نییە کەشتیگەلی (کوروس) کارتاژ کە بەرەو مەدیتەرانەی رۆژهەڵات دەچوون، لە چ رۆژێکی هاوین و پێش پەرت بوونیان گەیشتنە کەشتیگەلی هەخامەنشی، ئەوان یەکراست هێرشیان کرد. شێوەی هێرشی ئەوان وەك جەنگی دەریایی ئەوکات بوو کە تاك بەرانبەر تاك بێت.

لەوکاتەی کە هەندێکیان هێرشیان کرد، ئەوانەی تر کەوتنە دەست بەسەر داگرتنی کەشتییە بازرگانییەکان و هەندێك لەوانیان نوقمی ئاو کرد و هەندێکیان لەگەڵ خۆیان برد. حەوت کەشتییە جەنگییەکانی هەخامەنشیش بە دوای یەکدا نوقم بوون و سەربازەکانی ناویان خۆیان بەدەستەوە نەدا.

هەموو سەڵبە لێدەرەکانی ناو کەشتییە هەخامەنشییەکان لەگەڵ کەشتییەکانیان چوونە قوڵایی دەریا و ئەوانەی لە کەشتییە بازرگانییەکانیشدا بوون، بە ئەسیر گیران و بردرانە کارتاژ، کرانە کۆیلە و بە زنجیر بەستران و کرانە سەڵبەلیدەر.

رۆژانێك کەمبۆجییە تەنها بەرانبەر کوژرانی چەند کەسێك لە دانیشتوانی قوبرس لەشکری بردە سەر میسر، بەڵام وەك مێژوونووسەکان نووسیویانە لەشکرکێشی کەمبۆجییە تەنها بۆ تۆڵە نەبووە و هۆکاری سیاسی بەدواوە بوو و تەنها پاشای هەخامەنشی کوشتنی ئەو چەند کەسەی کردۆتە بیانۆ بۆ ئەو لەشکرکێشییە و وەك باسکرا فێرعەونی لەناو برد، بەڵام لە سەردەمی کارتاژییەکان سەدان کەس لە ئێرانییەکان دەکوژران یا بە ئەسیر دەگیران بە بێ ئەوەی ئێرانییەکان بتوانن رێ لە کارەکانیان بگرن یا ئەوان بە سزای خۆیان بگەیێنن. هەواڵی نوقم بوونی کەشتییە جەنگییەکان و یاخی بوونی ئین تافرەنس لەیەك کاتدا بە داریوش گەیشت.

داریوش دوای سەرکەوتن بە سەر چیت رات هەمە بەرەو ئاراخازیا چووبوو و هاوینی گەرم لەوێ مابۆوە و دوای گەڕانەوەی هەواڵیان پێدا کە کارتاژییەکان کەشتیگەلێکی جەنگی ئەوانیان نوقم کردووە و کەشتییە بازرگانییەکانیشیان بە دەستکەوت بردووە. داریوش سەرکەوتن بەسەر ئین تافرەنسی لا گرنگتر بوو لە سزادانی کارتاژەکان و کاتی گەڕانەوەی دوودڵ بوو بەرانبەر بە باشووری وڵاتەکەی. ئەو پێش ئەوەی بەرەو سیستان بچێت، ئاتوسای خێزانی کردبۆوە جێ نشینی پاشایەتی و نەیدەزانی ئەو چی بە سەر هاتووە، کە ئین تافرەنس کە دەبوایە ڕاوێژکاری بووبێت یاخی بووە.

داریوش گومانی لە وەفاداری ئاتوسا نەبوو و دەیزانی کە بانگەشەی پاشایەتی ئین تافرەنس بەبێ ڕەزامەندی هاوسەرەکەی روویداوە، بۆیە بیری کردەوە کە لەوانەیە ئین تافرنس هاوسەرەکەی ئەوی کوشتووە یا زیندانی کردووە و بە پێچەوانەوە ئەو ڕێگەی بە ئین تافرەنس نەدەدا ئەو بانگەشەیە بکات.

ئاریان مێژوونووسی بەناوبانگ نووسیویەتی: لەو کاتەدا ئین تافرەنس لە کوشتنی چیت رات هەمە پەشیمان بۆوە و بیری کردەوە کە ئەگەر ئەو پیاوە زیندوو بوایە دەیتوانی بۆ سەرکەوتن بەسەر ئین تافرەنسدا یارمەتی لێ وەربگرێت. بەڵام بەو زانیارییەی لە بارەی ورەی داریوش هەمانە، ئەو کەسێك نەبوو کە لە کاتی سەرکەوتن بەسەر ئەوانەی خۆیان بە پاشا دەناساند پەشیمان بێتەوە.

داریوش تا ئەو رۆژەی ناچاربوو جەنگی ئەو کەسانە بکات کە بانگەشەی پاشایەتیان بۆ خۆیان دەکرد، هەرکامیانی دەگرت، دەیکوشت و بە باوەڕی ئەو هەر کەسێك بانگەشەی پاشایەتی کردبایە، ئەگەر زیندوو بمێنێت دووبارە بانگەشەی پاشا بوون دەکات و دەبێتە هۆکاری ڕەنج و ماندوو بوون بۆی.

داریوش بە هۆی کوشتنی چیت ڕات متمانەی بە سکاکان نەبوو بۆ جەنگی ئین تافرەنس و کاتی گەڕانەوە لە سیستان و دوای گەڕانەوەی لە ئاراخازیا بەرەو کارمانیا چوو، تا کەموکورتییەکانی لەشکرەکەی پڕکاتەوە و بچێتە جەنگی ئین تافرەنس.

هەرچەندە ئاتووسا لە کاتی یاخی بوونی ئین تافرەنس دووگیان بوو، بەڵام لە پازارگاد هەڵات و بەهۆی ئەوەی دەیزانی لە فارس لە ئاسایشدا نابێت، لەوێ دەرچوو و ڕێگەی باکووری گرتەبەر تا گەیشتە (رأس) کە ئێستا بە (ڕێی) ناسراوە و پەنای بردە بەر ئاگرخانەی ئەو شوێنە. لە شاری ڕێی ئاگرخانەیەکی گەورە لەسەر شاخێکی بەرز کە بە گریمانی زۆر بە ناوی (بی بی شەهر بانو) ناوبراوە. ئەو ئاگرخانەیە بە درێژایی سەردەمی هەخامەنشییەکان و ئەشکانییەکان و ساسانییەکان بەردەوامبوو و تەنانەت دوای سەرکەوتنی عەرەبەکان بەسەر ئێراندا، تا ماوەیەك بەردەوام مایەوە.

برۆکێڵمان رۆژهەڵاتناسی ناسراو، شوێنی ئاگرخانەی ڕێی بە شوێنێك دەزانێت کە ئەمرۆ گوندێکە بە ناوی (کەن) و لە داوێنی شاخێك بە هەمان ناوە. هەر ئەو زانایە باوەڕی وایە کە لە نزیك ئاگرخانەکەی ڕێی کۆچبەرێکی ئاشووری ژیاوە و پەرستگایەکی هەبووە کە خوای ئاشوورییەکان ناسراو بە ئاشوور لەو پەرستگایەدا دەبینرا.

هەرچەندە هۆوە خشتەرەی پاشای مادەکان شاری نینەوای پایتەختی ئاشووری وێرانکرد و دەوڵەتی ئاشووری بە شێوەیەك رووخاند کە نەتواندرێت جارێکی تر دروست ببێتەوە، بەڵام وێڕای ئەوە کوچبەرە ئاشوورییەکان لە ئێران دەژیان و لە سێ شوێن پەرستگایان هەبوو، یەکەمیان لە نزیك دەریاچەی چیچەست (ورمێ) و دووەمیان لە کەرماسین یا قەرمەسین کە ئێستا بە کرماشان ناسراوە و سێیەم لە رێی. کوچبەرە ئاشووری یا ئاسووریەکان هێشتا لە ورمێ و کرماشان هەن، بەڵام لە شاری رێی کوچبەری ئاشووری نەماوە و شوێنەواری پەرستگاش نەماوە.

ئاتووسە بە هەر شێوەیەك بێت خۆی گەیاندە ئاگرخانەکە و دوای چەند رۆژێك لە مانەوەی لەو شوێنە، منداڵی بوو و ناوی (خەشایار یا خودایاری) لێنا، خەشایار کە دوای داریوش بۆوە پاشا لە دایکیەوە نەوەی کوروش بوو، دەزاندرێت کە ئاتووسا کچی کوروش بێت.

دوای ئەوەی منداڵەکە هاتە دونیاوە، لە سەر پێشنیاری سەرۆکی ئاگرخانەکە تەتەرێکی خێرای لە رێگای سەحرای ناوەڕاستەوە بۆ سیستان نارد تا هەواڵی لە دایك بوونی کورەکە بە داریوشی باوکی بگەیێنێت و پێی ڕابگەیێنێت کە بە شێوەی کاتی ناوی خەشایاری لێندراوە تا ئەو کاتەی کە ئەو ناوی یەکجارەکی بۆ دیاری دەکات. ئەوکات لای ژنەکانی ئێران نەریت بوو، کاتێك منداڵ لە دووری دایکی دەهاتە دونیاوە ناوێکی کاتیان بۆ دادەنا تا باوکی لە سەفەر دەهاتەوە و ناوی بۆ دیاری دەکرد.

تەتەرەکەی ئاتووسا لە رێگای سەحرای ناوەندییەوە گەیشتە سیستان و لەوێ بیستی کە داریوش چووتە کرمان و بۆیە بەرەو ئەوێ کەوتەرێ و لەوێ گەیشتە داریوش و هەواڵەکەی پێگەیاند. بە بیستنی هەواڵی بوونی ژنەکەی لە ئاگرخانەی رێی و لە دایك بوونی کورەکەی، پاشا ئاسوودە بوو و تەتەرەکەی ڕاسپارد تا بچێتەوە بۆ لای ئاتووسا و پێی بڵێت ناوی کورەکە بە فەرمی بکاتە خەشایار، هەروەها ئاتووسا ئامادەبێت بۆ سەفەر تا لە گەڵ ناردنی پەیامێکی تر بۆی، ڕاستەوخۆ بێت و لە فارس لە گەڵ هاوسەرەکەی یەك بگرێتەوە.

داریوش دوای ئەوەی تەتەرەکەی بۆ رێی ناردەوە، خۆشی کەوتەرێ و ئین تافرەنس بە لەشکرێکی پێکهاتوو لە سەربازانی ئیلامی و بابلی بۆ پێشوازی داریوش رۆیشت و هەر دوو لەشکر لە ناوچەیەك کە ئێستا بە مەرڤ دەشت ناسراوە و زێی (کەر) پیایدا دەروات و دەرژێتە دەریای (بەختەگان) بە یەك گەیشتن. داریوش لە کەتیبەکەیدا دەڵێت لە یەکەم رۆژی یەکەم مانگی پاییز گەیشتە ئین تافرەنس و ساڵەکەی دیاری نەکردووە.

ئین تافرەنس لە بەشی سەرەوەی زێی کەر لە مەرڤ دەشت نزیك بۆوە و ئەو کات بە هۆی پاییز ئاوی زێیەکە کەم بوو و فەرمانی کرد تا پێش لە ئاوی زێیەکە بگرن بۆ ئەوەی ئاو نەگاتە لەشکری داریوش کە لە بەشی خوارەوەی زێیەکە بوون. سەربازەکانی ئەو بێ ماندووبوونی زۆر، پێش ئاوی زێیەکەیان گرت و لەشکری داریوش دووچاری بێ ئاوی بوون و پاشای هەخامەنشی بۆ ئەوەی دەستی بگاتە ئاو، پاشەکشەی کرد.

لە رابردوو پانتایی دەریاچەی بەختەگان زۆر لە ئێستا زیاتر بوو و ئێستا لە بەرانبەر سەردەمی داریوش پانتاییەکەی بۆ نیوەی کەم بووتەوە. ئەو دەریاچەیە وەك زۆر دەریاچەی تر کە کەوتوونەتە دەورەی سەحرای ناوەندی ئێران، پاشماوەی وشکبوونی دەریای ناوەندی ئێرانە و وەك چوون دەریای ناوەندی ئێران نەما، بە هەمان شێوە و بە هەندێ هۆکار ئەو دەریاچانەش وشکدەبن، بەڵام بە هۆی ئەو زێیانەی دەڕژێنە ناویان ئەو وشکبوونە بە هێواشی دەبێت و دەریاچەی بەختەگانیش لە کۆتاییدا وشکدەبێت.

داریوش دوای نیو رۆژ لە پاشەکشە خۆی گەیاندە کەناری دەریاچە و ئین تافرەنسیش بە دوایەوە بوو. لە رۆژی سێیەمی پاییز داریوش بە تەواوی هێزەوە هێرشی برد، ئین تافرەنس سەردارێکی لێهاتوو بوو و سەربازی ئازای هەبوون، بەڵام نەیتوانی لە بەرانبەر عارەبانەکانی کوروش بەرگری بکات و پاشەکشەی کرد. فەرماندەی هێزی عارەبانەی لەشکری داریوش، گەنجێك بوو لە بنەماڵە خانەدانەکان بە ناوی (گوور ئەسپ) و ئەو بە فەرمانی داریوش کەوتە دوای ئین تافرەنس.

داریوش پێی وت: بۆ من سەربازەکانی ئین تافرەنس گرنگ نین و تۆ کاتی خۆت بۆ ئەسیر کردنی بە فیرۆ مەدە و هەوڵ بدەی تا ئین تافرەنس ئەسیر بکەی و دوای ئەوەی کە ئەو ئەسیر بوو یا کوژرا، جەنگ تەواو دەبێت.

گور ئەسپ دوای ئەوەی بە عارەبانەکانی لە مەرڤ دەشت تێپەڕبوو و گەیشتە پێدەشتە تەختەکان، عارەبانەکانی بڵاوتر کرد و توانی پێش پاشەکشەی ئین تافرەنس بگرێت، دواتر هەندێ لە عارەبانەکانی گەڕاندەوە و رێگەی پاشەکشەکەی لێ گرت. ئین تافرەنس دوای ئەوەی کەوتە گەمارۆوە، واتێگەیشت کە تەواوی هێزی داریوش هاتووە بۆ گەمارۆدانی، بەڵام بۆی دەرکەوت کە تەنها عارەبانەکانن و هەوڵیدا کە بازنەی گەمارۆکەی بشکێنێت.

داریوش دەیزانی ئەگەر عارەبانەکانی بتوانن پاشەکشەی ئین تافرەنس ڕابگرن پێویستیان بە هێز دەبێت و پێنج هەزار سەربازی لە دوای گور ئەسپەوە نارد بۆ یارمەتی، ئەو سوارانە رێگر

بوو لەوەی ئین تافرەنس بتوانێت بازنەی گەمارۆکە بشکێنێت و خۆی ڕزگار بکات و دوای ئەوەی چەند شوێنی جەستەی ئەو بریندار بوو، گور ئەسپ توانی ئەسیری بکات و هەر دوو دەستی بەستەوە، خستییە پاشی عارەبانەکەی و گەڕایەوە.

داریوش خۆی لە دیتنی ئین تافرەنس پاراست و بە گورئەسپی وت: من ئەو پیاوەم وەك برای خۆم خۆش ویست و ژنەکەم بە ئەو سپارد، بەڵام ئەو وێڕای ئەوەی دەیزانی ژنەکەم دووگیانە، ویستی ئەو بکوژێت و ئاتووساش ناچاربوو بۆ پارێزگاری لە گیانی لە فارس هەڵبێت. ئێستاش دەترسم ئەگەر ئین تافرەنس ببینم و چاوەکانم بەرانبەر چاوەکانی بێت، بە یادی دۆستایەتی کۆنمان بکەومەوە و واز لە سزادانی بێنم، هەر کەسێکیش خیانەت بکات دەبێت سزا بدرێت جا ئەو کەسە برام بێت یا کورم.

سەربازە بابلی و ئیلامییەکان کە لە لەشکرە شکست خواردووەکەی ئین تافرەنس بوون، خۆیان بەدەستەوەدا و داریوش ئەوانەی گەنجتر بوون لە لەشکری خۆی کردنی بە سەرباز و ئەوانی تری ئازاد کردن و ڕێگەی گەڕانەوە بۆ بابل و ئیلامی پێدان و بە گورئەسپی وت: ئین تافرەنس لە پازارگاد یاخی بووە و لە ئەوێ دەبێت سزا بدرێت.

دوای گەیشتنەوەی بۆ پازارگاد، داریوش هەواڵی بۆ ئاتووسا نارد کە خۆی و منداڵەکەی بێن بۆ ئەوێ و دواجار ڕۆژی سزادانی ئین تافرەنسی دیاریکرد، بە دانیشتوانیان ڕاگەیاند بۆ دیتنی سزادانی خائینی گەورە کۆببنەوە و دوای کۆبوونەوەی خەڵك، ئین تافرەنسیان هێنا بۆ شوێنی سزادانەکە و بەستیانەوە، دوو بکوژ (جەللاد) دەستیان کرد بە بڕینی بەشەکانی جەستەی و قامکەکانی دەست و لاقیان لێ کردەوە، دواتر دەست و لاقیان جومگە بە جومگە بڕی و ئەو پیاوە ئەوەندە خۆڕاگر بوو کە تەنانەت هاوارێکی نەکرد و دوای ئەوەی دوایین جومگەی دەستیان بڕی لە هۆش چوو.

ئەوکات جەللادەکان دوایین جومگەکانی لاقی ئەویان کە بریتی بوو لە جومگەکانی سەر حەوزی، بە ماندوو بوونی زۆر لێکردەوە و دوای ئەوە ئین تا فرەنس مرد. خێزان و منداڵ و کەسوکاری ئین تافرەنس تەواوی ئەو ماوەیەی سزاکە چاویان لێدەکرد و شیوەنیان دەگێڕا و دەگریان.

ماوەیەکی کەم دوای ڕزگاربوونی داریوش لە کێشەی ئین تافرەنس، ڕووداوێکی زۆر گەورە و ترسێنەر ڕوویدا و بریتی بوو لە هاتنی بوومەلەرزە بوو لە شەودا لە دوازدە شاری باشووری ئێران کە یەکیان پازارگاد بوو، شارەکان وێران بوون و دانیشتوانی شارەکان لە ژێر داروخاوەکانی شارەکاندا مانەوە و کوژران، ئەو ڕووداوە زەرەری گەورەی لە ئێرانییەکانی

فارس و کارمانیا (کرمان) دا و بوومەلەرزەکە تەواوی ئەو شارانەی ئەو ناوچەیە تا دەگەیشتە شوێنی ئێستای (میناب) گرتەوە.

داریوش دوای ئەو بوومەلەرزە ترسناکە، دانیشتوانی ئەو شوێنانەی بەر بوومەلەرزە کەوتبوون لە دانی باج بەخشی و ئەوانی فێرکرد لە کاتی دروستکردنەوەی خانوو، لە سەقفی خانووەکانیان دارەکان بە شێوەی یەکتربڕ بەکار بهێنن تا لە کاتی بوومەلەرزە، سەقفی ژوورەکان و دیوارەکان نەرۆخێن و لە ژێر داروخاوەکاندا نەمرن. ئێسترابوون کە ئەو جۆرە بیناکردنەی خانووی بینی بوو، داریوشی بە داهێنەری ئەو کارە ناسی و لە هەر شوێنێك کە ئەو جۆرە خانووە دروستکرا، بە بوومەلەرزە نەرووخان.

ساڵی (٥١٤ پ. ز) لە رووی کولتووریەوە یەك لە ساڵە گەورەکانی پاشایەتی داریوش بوو و لەو ساڵەدا داریوش بڕیاریدا رێنووسی فینیقی کە باسمانکرد بێنێتە ناو رێنووسی فارسی، تا فارسەکان بتوانن هەرچی دەیانەوێت بەو رێنووسە بینووسن. لە هەمان ساڵدا فێر بوونی ئەو رێنووسە بۆ هەموان کرایە زۆرە ملێی و مەبەستیش لەو کارە هەر ئەو مەبەستەیە کە ئێستا هەیە و بریتییە لە خوێندەوار بوون.

لە ئەورووپا ناپلیۆن بوناپارت یەکەم کەس بوو کە خوێندنی بە زۆرملێ کرد بۆ هەموان، بەڵام ئەو دەزگایەی بۆ ئەو کارەی دامەزراند بوو، دوای مردنی لەناو چوو.

بەڵام لە رۆژهەڵات و لە بیست و سێ سەدە پێش ئێستا، پاشای هەخامەنشی خوێندنی بە زۆرەملێ کرد و مەبەستی جێگیر کردنی رێنووسی فینیقی بوو لە جیاتی رێنووسی بزماری، بەڵام ئەو لە کاتی ژیانی خۆیدا نەیتوانی ئەو کارە تەواو بکات و سەرنەکەوتنیشی بۆ دوو هۆکار دەگەڕایەوە و بریتی بوون لە:

یەکەم بەرهەڵستی موبیدە ئێرانییەکان کە لەگەڵ خەتی بزماری ڕاهاتبوون و دەقە ئایینییەکانیان بەو رێنووسە دەنووسییەوە و دووەم ئەوەبوو کە سەردەم گونجاو نەبوو بۆ پەسەندکردنی ئەو چاکسازییە گەورەیە.

لە ڕاستیدا ئێرانییەکان ئەوکات نەیاندەتوانی نرخی خوێندنی زۆرەملێ بزانن و زانینی خوێندەواریان تەنها بۆ موغەکان و نووسەرەکان بە پێویست دەزانی و بە بێ سوودیان دادەنا، داریوش بەلانی کەم بیست سەدە پێش نەتەوەکەی خۆی کەوت بۆوە و ئەوەی ئەو دەیزانی، خەڵك تێی نەدەگەیشتن.

خەڵك کەمتر لە زەرووریەتی گۆڕانی ڕێنووس دەگەیشتن و پێیان وابوو ڕێنووسی بزماری بۆ پێداویستییەکانی ئەوان بەسە و لە لایەکتر موغەکان بەرهەڵەستیان دەکرد و ئەو هۆیانە ڕێگر بوون لە پەرە سەندنی ئەو ڕێنووسە، بۆیە ئەو کەتیبانەی لە لایەن داریوش نووسران بە ڕێنووسی بزماری بوو، کە یە لە گرنگترینیان کەتیبەی بێستوون بوو.

ئەو تۆیەی داریوش چاندی لە سەردەمی دوای خۆی بەری گرت و کە لە سەردەمی جێ نشینی ئەو خوێندن و نووسین بەو ڕێنووسی فینیقی بە ڕادەیەك پەرەی سەند کە سەربازەکانی خەشایاری کوری داریوش لەو کاتەی لەگەڵێدا چوون بۆ یۆنان، بە گشتی خوێندەوار بوون، چونکە ژن و پیاو دەیانخوێند، ڕێنووسی بزماری بوونی نەما و لە نیوەی دووەمی زنجیرەی پاشایەتی بەو لاوە تەنها یەك کەتیبە دەست ناکەوێت کە بە ڕێنووسی بزماری نووسرا بێت.

پێویست نییە شیکاری گرنگی ئەو هەنگاوەی داریوش بکەین کە لە ساڵی (٥١٤ پ. ز) لە بواری خوێندنی هەمووان و دروستکردنی فێرکردنی گشتی نای و چوون ئەو پیاوە مەزنە لە سەرەوە دەیەویست شوێنکەوتووانی خۆی بگەیێنێتە ئاستێك کە ئێستا (بەڵام نەك لە هەموو وڵاتان) پێی گەیشتوون.

ئێمە هەروەك چوون بە زەرووری نازانیین زیاتر باس لەو هەوڵە گەورەیە بکەین و گرنگیەکانی باس بکەین، هەر بە هەمان شێوەش پێویستمان بە باس کردنی هۆکارەکان بەرهەڵستی موبیدەکان و جەماوەریش لەو ڕێنووسە نییە، یەك لە هۆکارەکانی تری سەرنەکەوتنی ئەو کارەی داریوش سەربەخۆ بوونی ساتراب (پارێزگارەکان) بوو لە کارە ناوخۆییەکانیان و ئەوانیش بەرهەڵستکار بوون و دەرفەتی ئەو کارەیان نەدا.

پاشایەتی هەخامەنشی لە رووی جوگرافیەوە زۆر بڵاو بوو و لە کەنارەکانی دەریای مەدیتەرانەوە تا هندی دەگرتەوە و گۆڕینی ڕێنووس لەو ناوچە گەورەیە ئاسان نەبوو و داریوشیش بەردەوام لە ناوەندی وڵات نەبوو تا بتوانێت خۆی چاودێری هەموو لایەکی وڵات بکات.

بۆ نموونە ساڵی (٥١٤ پ. ز) کە داریوش بەو کارە هەستا ناچاربوو بڕوات بۆ سوریا، چونکە هێرشی بەردەوامی کارتاژەکان پەکی بازرگانی هەخامەنشییەکانی لە دەریای مەدیتەرانە خستبوو. کوروش و دواتر کەمبۆجییە هەوڵی بەهێز کردنی دەسەڵاتی خۆیان لە دەریای مەدیتەرانەدا، بەڵام کارتاژەکان ڕێگر بوون لە هاتووچووی کەشتییەکانی ئەوان لەو دەریایە بە ئاسانی و داریوش لە گەرمەی کاری بیناسازی و خوێندنی زۆرەملێ، ئاتووسای کردە

جێ نشینی خۆی و بەرەو سوریا چوو تا ئەگەر بە ڕێگەی هێزی دەریایی نەتوانێت هێزی دەریایی کارتاژ لەناو ببات، لە ڕێگەی هێزی زەمینی ئەو وڵاتە لەناو ببات.

داریوش لە جەنگە ئەفریقاییەکان خاوەن ئەزموون بوو و بارودۆخی ئەو وڵاتانەی دەناسی و دەیزانی کارتاژ لە ڕۆژئاوای لیبیایە. لەشکری کەمبۆجییە توانی لەشکری فێرعەون شکست بدات و داریوش بیری دەکردەوە ئەگەر لەشکر لە هەمان ڕێگەوە بڕوات و خۆی بگەیێنێتە ڕۆژئاوای لیبیا، دەتوانێت کارتاژ وێران بکات. ئەوکاتەی ڕۆم و کارتاژ دوژمنایەتیان هەبوو و کارتاژەکان بازرگانی ڕۆمیان لە دەریای مەدیتەرانە پەك خستبوو، یەك لە نوێنەرانی سنای ڕۆم لە کاتی وتارەکانی ڕۆژانەیدا دەیوت: شتێکی تر ئەوەیە کە دەبێت کارتاژ وێران بکرێت. دوو سەد ساڵ پێش ئەو نوێنەرە ڕۆمییە، داریوش کەوتە بیرکردنەوە لە وێرانکردنی کارتاژ.

لە شاری صور داریوش زانیاری لە فەرماندەی هێزی دەریای (هیست ئەسپ) لە بارەی دروستکردنی کەشتی وەرگرت و لە بوون و توانای ئەوانی پرسی و دەریاسالاری ئێرانی وتی: لە ماوەی شەش مانگدا دەتوانم بە هێزێکی دەریای بەهێز هێرش بکەمە سەر کارتاژ.

داریوش وتی: شەش مانگ ماوەیەکی زۆرە و پێویستە کارتاژ زووتر لەناو بچێت.

پێش ئەوەی داریوش بیەوێت لە ڕێگەی وشکانی هێرش بکاتە سەر کارتاژ، پەیوەندی کرد بە (ئاریاندس) فەرمانڕەوای ئەوێ (بە وتەی یۆنانییەکان ساترابی میسر) کە پێشتر یەك لەو شەش سەردارە هاوپەیمانەی ئەو بوو لە ڕووخاندنی گۆماتە کە بە داریوشەوە دەبوونە حەوت کەس و پێی ڕاگەیاند ناتوانێت لە ڕێگەی دەریاوە هێرش بکاتە سەر کارتاژ و پێویستە لەشکرێك لە پیاوانی ناوچەی کۆش ئامادەبکات.

داریوش لە سەردەمی کەمبۆجییە لە میسر ژیابوو و دەیزانی ڕەش پێستەکانی ناوچەی کۆش کە دەکەوتە باشووری میسر زۆر ئازان و پێش هاتنی کەمبۆجییە بۆ میسر، چەند جار بوونە مایەی دەردەسەری بۆ فێرعەون، چونکە لە باشوورەوە کەوتوونەرێ و شارەکانی میسری ناوەند و میسری باکووریان خستە بەر هێرش و هەرکەسیان دیت بوو، کوشت بوویان و هەرچی توانی بوویان، بردبوویان.

دوای خوێندنەوەی ڕێنووسی وێنەیی میسر، ڕێگە بۆ زانینی زانیارییەکانی بەڵگەنامە میسرییەکان بۆ زانایانی میسرناس بۆوە و زانایانی میسرناس لە بەڵگەنامە مێژووییەکاندا زۆر جار وشەی (تاعوونی ڕەش) دەکەوتە بەر چاویان و بیردەکرایەوە مەبەست لەو وشەیە هەمان

تاعوونە، بەڵام دواتر زاندرا کە ئەوە دەستەواژەیەکە بۆ دەرخستنی هێرشی ڕەش پێستەکانی باشووری میسر بەکاردێت.

هیرۆدۆت دەڵێت: ئاریاندس فەرماندەی میسر بۆ جێ بەجێ کردنی فەرمانی داریوش، سێ سەد کەشتی نارده باشووری میسر تا ڕەش پێستەکان بە کرێ بگرن و بیانهێنن بۆ باکووری میسر.

ئاریاندس هەندێ ئەفسەری میسری کە زمانی خەڵکی ناوچەی کۆشیان دەزانی، لەگەڵ ئەو کەشتیانە دانا کە بۆ هێنانی سەربازانی کۆش ئامادەکرابوون و پێی وتن: هەر ئەوەندە هەندێ سەربازتان بە کرێ گرت، ڕاستەوخۆ بە کەشتی بیان نێرن و مەوەستن تا ئەو ڕێژە سەربازەی پێویستە دەستەبەر بکەن و دواتر ئەوان بخەنەرێ.

هاوکات لە گەڵ بە کرێ گرتنی سەربازی ڕەش پێست لە ناوچەی کۆش لە لایەن ئەفسەرە میسرییەکان، ئاریاندس لە باکووری میسر سەرگەرمی ئامادەکردنی چەك لە جۆرەکانی (تیر و کەوان و نیزە و زووبین) بوو بۆ ئەوان و دەیزانی ئەوان لە بەکارهێنانی ئەو چەکانە کارامەن. ئەو تیرانەی لە کەمانی ئەوان دەردەچێت، بکوژە و زووبین بە شێوەیەك هەڵدەدەن کە بەر ئامانج بکەوێت.

ئاریاندس دەستە دەستە سەربازە ڕەش پێستەکانی دەخستە بەر دەستی ئەو ئەفسەرانەی دەیانزانی بە زمانی ئەوان بدوێن، تا ڕاهێنانی پێویستیان پێ بکەن و فێریان بکەن لە یەکە سەربازییەکاندا، خۆیان ڕێك بخەن.

لە هەموو سەردەمێك سەربازان بۆ دوو مەبەست ڕاهێنانیان پێدەکرا کە بریتی بوو لە: چونێتی بەکار هێنانی چەك و بەرگەگرتنی ماندووبوونی مەیدانی جەنگ. بەڵام ئەو سەربازە ڕەش پێستانەی لە لایەن ئاریاندس بە کرێ دەگیران، لە سەرەتای منداڵی بەکار هێنانی تیر و کەوان و زووبین فێر دەبوون و دوای گەورە بوون جەنگیان بە نێزە دەکرد، ئەوان بەو ڕادەیە کارامە بوون کە سەربازانی ئاسایی نەیان دەتوانی وەك ئەوان چەك بەکاربهێنن، تەنها لەو دۆخەدا نەبێت کە چەند ساڵێك ڕاهێنانیان کرد بێت.

ئەوان لە منداڵیەوە بە پێی پەتی لە جەنگەڵەکان بۆ ڕاو دەگەڕان، بۆیە بنی پێیان پتەو بوو و نەیان دەتوانی پێڵاو لە پێ بکەن و ئەمەش بە گشتی ئەوانی بەو ڕادەیە خۆڕاگر کردبوو کە ماندووبوونی مەیدانی جەنگ، بۆیان ئاسایی بوو.

ئاریاندس لە میسر لەشکری سازدا و داریوش لە سوریا و لیدی، سەرئەنجام دوای دوو مانگ داریوش هاتە میسر و لە دیتنی لەشکری ڕەش پێستەکان کە لە لایەن ئاریاندس بە کرێ

گیرابوون، تەواو ڕازی بوو. بەڵام چونکە ئەوان رووت بوون، فەرمانیدا تا بەرگی ئەستوور بۆ هەموویان ئامادەبکرێت و دواتر لە یەکەم رۆژی زیاد بوونی ئاوی زێی نیل لە باکووری میسر، کە یەکەم رۆژی هاتنی باڵندەکانیش بوو و دەبۆوە یەکەم رۆژی پاییز، بە لەشکرەوە کەوتەرێ و بەو رێگایەدا رۆیشت کە کەمبۆجییە بۆ جەنگی فێرعەونی پەز ئاموون پێیدا رۆیشت بوو.

بە وتەی خانتووسی مێژوونووسی لیدی، ژمارەی سەربازەکانی لەشکری داریوش لەو جەنگەدا سەد و پەنجا هەزار کەس بووە، بەڵام ئەو ژمارەیە ڕاست نییە، گەزنەفۆن ئەو ژمارەیە بە سەد هەزار سەرباز دەزانێت و لەوانەیە ئەو ژمارەیەش دوور نەبێت لە زێدەرۆیی.

لە پێشەوەی لەشکرەکە دەستەیەك وەك پێشەنگ دەرۆیشتن و ئەرکیان بوو کە جگە لە دەست نیشان کردنی شوێنەکانی پشوودانی لەشکر، کۆمەڵێك چاڵ لە تەنیشت دەریا هەڵکەنن تا پێداویستی سەربازەکان بۆ ئاو دابین بکات و دەزاندرێت کە لە کەناری دەریا ئەگەر کەمێك زەوی هەڵکەنیین، دەگەینە ئاوی شیرین.

دەستەیەك سەرباز وەك پێشەنگ لە باشووری لەشکری داریوش دەرۆیشتن تا رێگر بن لە هێرشی لەنەکاو بۆ سەریان و فەرماندەی هێزی دەریایی (هیست ئەسپ) لە نێوان میسر و لەشکری داریوشدا لە رێگەی دەریا، زنجیرێکی دەریایی پێکهێنابوو و تا داریوش زیاتر دەرۆیشتە پێشەوە زنجیرەکە درێژتر دەبۆوە، ئەو زنجیرە دەریاییە بۆوە رێگەیەکی پارێزراو بۆ تێپەڕینی کەشتییە بارکێشەکان کە خۆراکیان بۆ لەشکری داریوش پێ بوو و کارتاژییەکان نەیاندەتوانی لەو رێگەیە کەشتییەکانی بازرگانی هەخامەنشی نوقم بکەن یا وەك دەسکەوتی خۆیان بیانبەن.

ئەو رۆژەی لەشکر لە میسرەوە کەوتەرێ، ڕەش پێستەکان نەیان ویست ئەو بەرگانە لەبەر بکەن کە داریوش بۆی ئامادەکردبوون و دوای پازدە رۆژ لە رۆیشتن و لە شەوێکدا کە هەوا ساردبوو، ئەوان لە سەرما دەلەرزین و ئەوکات نرخی ئەو بەرگانەیان زانی و بە ڕەزامەندییەوە کردیانە بەریان. دوای ئەوە تا ئەو رۆژەی کە گەیشتنە سنووری کارتاژ، ڕەش پێستەکان بە رۆژ خۆیان رووت دەکردەوە و بە شەو بەرگیان دەکردە بەریان و رۆژی گەیشتنی لەشکری داریوش بۆ سنووری کارتاژ، بەرانبەر بوو لەگەڵ سی و پێنجەم رۆژی پاییزی ساڵی (٥١٤ پ. ز).

سەرەتا کارتاژەکان نەیانزانی لەشکرێك بۆ جەنگی ئەوان دێت، بەڵام دواتر بە هۆی ئەو زنجیرە دەریاییەی باسمان کرد تێ گەیشتن کە داریوش بە لەشکرەوە بۆ ویران کردنی کارتاژ دێت.

تا ئەوکات کارتاژ لەشکری نەبوو و تەنها هێزی دەریایی هەبوو، هێرشی داریوش بۆوە هۆکاری دامەزراندنی لەشکری کارتاژ و ئەو لەشکرەی کارتاژەکان دواتر هێرشی کردە سەر ئەورووپا.

لەوکاتەدا کارتاژەکان نە لەشکریان هەبوو و نە دەرفەتی سازکردنی لەشکریان هەبوو، بۆیە ئەنجوومەنی پیرانی کارتاژەکان بڕیاریاندا لە گەڵ داریوش ئاشتی بکەن و سێ کەسیان بۆ ئەم مەبەستە ناردە لای ئەو، ئەوان لە سنووری کارتاژ گەیشتنە داریوش و پێشنیاری ئاشتیان پێدا.

داریوش وتی داخوازی ئێوە بۆ ئاشتی بە سێ مەرج پەسەند دەکرێت:

یەکەم: کارتاژەکان کۆمەڵێك زیانیان بە هەخامەنشییەکان و لایەنگرانیان گەیاندووە و بەهای خوێنی کوژراوەکان و تێچووی لەشکرکێشی داریوش بۆ ئەوێ بدەنەوە.

دووەم: هێزی دەریایی کارتاژ لەناو ببرێت.

سێ یەم: فەرمانڕەوایەکی ئێرانی دەسەڵاتی کارتاژ بەڕێوە ببات و لە بەرانبەردا من بەڵێنتان پێدەدەم کە گیان و سەر و ماڵی خەڵکی کارتاژ پارێزراو بێت، هەروەها ئازاد بن لە بەردەوامبوون لە سەر ئایینی خۆیان و تەنها باجی ساڵانەیان لێ وەربگرێت و هیچ پارەی تریان لێ نەستێندرێت.

سێ نوێنەرەکە داوایان کرد کە کاتیان پێ بدرێت تا بگەڕێنەوە و ڕاوێژ بە ئەنجوومەنی پیرانیان بکەن، بەڵام داریوش رەتی کردەوە و وتی ناتوانم ئەو دەرفەتەتان پێ بدەم و بروام وایە داخوازیتان بۆ کات پێ بەخشین تەنها بۆ ئەوەیە کە سەربازی پتڕتان دەست کەوێت و ئەگەر مەرجەکان پەسەند نەکەن، هێرش دەکەمەسەر کارتاژ و بە پێی یاساکانی جەنگ لەگەڵ ئێوەدا ڕەفتار دەکەم.

ئەو سێ نوێنەرە بە ناچاری مەرجەکانیان پەسەندکرد و پاشا دوو کرۆری داریك خوێن بەها و زیان و زەرەر و تێچووی لەشکرکێشی لێ وەرگرتنەوە، بەم شێوەیە کارتاژ بەبێ جەنگکردن بۆوە بەشێك لە ئیمپراتۆریەتی گەورەی هەخامەنشی و هێزی دەریایی لە ناوچوو، بەڵام کەشتییە بازرگانییەکانیان لە سەر پیشەی خۆیان بەردەوامبوون.

کاتی گەڕانەوەی لەشکری داریوش لە کارتاژ، کاروانێکی میسری کەوتە بەر هێرشی ڕێگرەکان و داریوش داوای لە ئاریاندس فەرمانڕەوای میسر کرد تا ڕێگرەکان ببینێتەوە و دوای ئەوەی دەستگیر کران، فەرمانی کرد تا ئەوان لە ناوەڕاستەوە بکەنە دوو کەت و دوای ئەو رووداوە، سزای ڕێگری لە سنووری هەخامەنشی بۆوە دوو پارچە کردن.

# دروستکردنی پێرسپۆلیس

زانایانی میسرناس دەڵێن ئەو کەسەی هەرەمی گەورەی میسر واتە هەرەمی کۆفۆی بیناکرد، وێڕای ئەوەی مەبەستی دروستکردنی بینایەك بوو کە هەرگیز تێك نەچێت، دەیەویست تەواوی زانستەکانی بیناسازی سەردەمی خۆی لەو هەرەمەدا جێگیر بکات و بەپێی لێکۆڵینەوەکان دەرکەوتووە کە لەو هەرەمەدا بابەتێك نییە کە کلیلی یاسایەکی زانستی نەبێت، لە درێژی و پانی و بەرزی هەرەمەکە تا دەگاتە درێژی ڕێرەوەکان و پانتایی ژوورەکان و قورسی بەردەکان و... هتد.

کۆشکی پێرسپۆلیسیش کە لە لایەن داریوش دەست بە دروستکردنی کرا و بەشێکی لە سەردەمی خۆیدا و بەشەکانی تریش لە سەردەمی جێنشینەکانی تەواو کرا، کۆمەڵەیەك بوو لە زانستەکانی بیناسازی و هونەرەکانی تەواوی نەتەوەکانی جیهانی کۆن و ئەگەر بڕیاردرابایە کە کۆمەڵێك لە پیشەگەر و هونەرمەندەکانی جیهانی کۆن کۆببنەوە تا پێشانگایەکی گەورە بۆ زانست و هونەری نەتەوەکان بکەنەوە، نەیاندەتوانی پێشانگایەك باشتر لە پێرسپۆلیس بکەنەوە.

هەموو ئەو پیشەسازیانەی لە بوارەکانی بیناسازی و جوانکاری جیهانی ئەوکات هەبوون لە پێرسپۆلیس ڕەنگیان دابۆوە و بەو مەرجەش کە پیشەسازی بەپێی ماناکانی رابردوو پێناس بکەین، تەواوی ئەو هونەرانەی لە جیهانی کۆندا هەبوون لەو کوشکە سوودیان لێ بینرابوو و کۆشکی پێرسپۆلیس تەنها لە لایەن هونەرمەند و پیشەگەرانی ئێرانی بینا نەکرا و بەڵکو لە لایەن نوێنەرانی پیشەگەر و هونەرمەندانی هەموو نەتەوەکانی جیهان بیناکرا.

داریوش میسری دیتبوو و دەیویست کۆشکێك بینا بکات کە وەك هەرەمەکانی ئەوێ هیچ شتێك لە ناوی نەبات و تا هەتایە بمێنێت. نەخشەی ئەو کۆشکە لە ساڵی دووەم و بە هەندێ گێڕانەوەی تر لە ساڵی سێیەمی پاشایەتی داریوش داندرا، بیناسازە کارامەکانی جیهان بۆ ئەم

مەبەستە لە پازارگاد کۆبوونەوە و ناوی هەندێکیان لە پەرتووکەکانی مێژوونووسە کۆنەکان هاتووە و بریتین لە: ئارتی مان لە فارس، فیلی وادس لە یۆنان، تالبوون لە بابل، ترادۆس لە لیدی و هێپلێ لە میسر.

هەریەکە لەو بیناسازانە نەخشەیەکی تایبەتیان بۆ ئەو کۆشکە کێشا و خستیانە بەرچاوی داریوش، ئەو کاتیش پێش ئەوەی بینایەك دروست بکرێت، نەخشەی بۆ دروست دەکرا و تەنانەت لە میسری کۆن کێشانی نەخشەی بیناکان باوبوو. داریوش تەواوی نەخشەکانی دەدیت و بەردەوام ڕایدەسپارد نەخشەکان تێکەڵ بکرێن، بە شێوەیەك کە بیناسازی یۆنانی، لیدی، میسری، بابلی و ئێرانی و.... هتد تێکەڵ بن.

ئەو کەسەی چاودێری تێکەڵ کردنی نەخشەکانی دەکرد، ئایا (ئارتی مان) بیناسازی ئێرانی بوو یا خودی داریوش ئەو کارە دەکرد؟ وەڵامی ئەو پرسیارە نەزاندراوە، تەنها دەزاندرێت داریوش دەیویست بیناسازی تەواوی ئەو نەتەوانەی دەکەوتنە ژێردەستی ئیمپراتۆریەتەکەی و هەروەها ئەو نەتەوانەی لە دەرەوەی دەسەڵاتیشی بوون، جێ دەستیان و نموونەی کارەکانیان لەو کۆشکەدا دەرکەوێت، بەڵام سەرجەمی ئەو هونەرانەی تێکەڵ بە هونەری ئێرانی کرد یا باشتر بڵێین خستنییە ناو چوارچێوەی هونەری ئێرانی.

دوای یەکلا بوونەوەی کۆتا نەخشەی ئەو کۆشکە، داریوش فەرمانی کرد تا نموونەی بچووك کراوە یا مۆدێلی ئەو کۆشکە دروست بکەن، بۆ ئەوەی بتوانێت لە ناو میشکیدا دیمەنی ئەو کۆشکە وێنە بکات. لە ڕۆژی کۆبوونەوەی بیناسازانی جیهان لە پازارگاد تا ئەو ڕۆژەی مۆدێلەکە ئامادەکرا، سێ ساڵی خایاند و بە سەرەنجدان لەو بابەتەی کە ئێستاش لە جیهانی پێشکەوتن و پەیوەندی خێرادا بۆ کارە گەورەکان کاتی زۆری دەوێت، ئەو ماوەیە زۆر نەبووە.

دوای ئەوەی داریوش مۆدێلەکەی کۆشکی پێرسپۆلیسی دیت و پەسەندی کرد، فەرمانی کرد لەو شوێنەی بۆ کۆشکەکە دیاریکراوە شارێك بۆ مانەوەی کرێکار و وەستاکان و خێزانەکانیان دروست بکرێت و ئەو شارە دواتر ناوی پێرسپۆلیسی لێندرا. شاری پێرسپۆلیس سەرەتا بۆ کرێکاران بووە و خانووەکانی بە شێوەیەك دروستکرا کە دوای تەواو بوونی کۆشکەکە بۆ بەردەوام کردنی ژیان سوودیان هەبێت.

کۆشکەکە لە ناوچەیەکی شاخاوی بە پانتایی (١٣) هەکتار (بەرانبەر ٥٢ دەونم) واتە (١٣٠٠٠٠) مەتری چوارگۆشە و بە بەرزایی بیست مەتر بیناکرا و شاری پێرسپۆلیسیش لە پێ دەشتی مەرڤ دەشت دروستکرا. مێژوونوسان بە هەڵە ئەو کۆشکەیان بە شوێنی نیشتەجێ

بوونی داریوش و پاشا هەخامەنشییەکان زانی بوو، دواتر بۆیان دەرکەوت شوێنی نیشتەجێ نەبووە و مەبەستی داریوش بینا کردنی موزەخانەیەکی نێو نەتەوەیی لە کۆمەڵێك هونەر و پیشەی سنووری ئیمپراتۆریەتەکەی بووە.

هەڵەیەکی تری مێژوونووسان بریتی بوو لە ئەوەی ئەو کۆشکەیان بە پەرستگا دانابوو و وایان بیرکردبۆوە کە بۆ مەبەستی ئایینی بیناکراوە، لە کاتێکدا کە ئەو کۆشکە بۆ ئەو مەبەستە دروست نەکرابوو کە ببێتە پەرستگا و ئامانجی سەرەکی ئەوەبوو کە موزەخانەیەکی نێونەتەوەیی لە پیشەسازی و هونەرەکانی نەتەوەکانی سنووری ئیمپراتۆریەتی هەخامەنشی و نەتەوەکانی تر دروست ببێت و لە هەندێك لە رۆژەکاندا شکۆی دەوڵەت و لەشکر بخرێتە بەرچاوی نەتەوەکانی ئێران و لەو رۆژانەی داریوش و جێنشینەکانی بە شێوەی فەرمی بە یەك دەگەیشتن، نوێنەرانی تەواوی نەتەوەکانی ژێردەستی ئیمپراتۆریەتەکە لەو کۆشکە ئامادەدەبوون.

چونکە لە کۆشکی پێرسپۆلیس پازدە هەزار کەتیبە دەست کەوتوون و زانا و رۆژهەڵاتناسی ئەمریکی (کامێرۆن) هەندێ لە کەتیبەکانی خوێندووتەوە و ئێستا زانیاری زۆر هەیە لە بارەی کرێکاران و ژمارەیان، دەستەکانیان و چۆنێتی ژیان و خۆراکیان، چەندێتی کرێی رۆژانەیان و ئەو کەرەستە بیناسازیانەی لە کۆشکەکە بەکاریان بردووە و.. هتد، ئەگەر تەواوی کەتیبەکان بخوێندرێتەوە بە دڵنیاییەوە زانیارییەکان زیاتر دەبن.

زاندراوە بیست و پێنج هەزار کرێکار کە هەریەکەیان لە بوارێك شارەزا بوونە لەو کۆشکە بە شێوەی بەردەوام کاریان کردووە و تەنها لە وەرزی زستان ئەو رۆژانەی زۆر سارد دەبوون کارەکەیان دەکرد بە پشوو، بەڵام کرێی ئەو رۆژانەیان وەرگرتووە کە بە ناچاری کردوویانە بە پشوو.

ئەو کرێکارانەی کە ئێرانی نەبوون و لە پێرسپۆلیس کاریان دەکرد، هاورێ لەگەڵ خێزانەکانیان لەو شارە دەژیان و هەر کەسێك بە شاری کرێکاران لە پێدەشتی مەرڤ دەشتدا تێپەڕدەبوو، ژنە میسرییەکانی بە پرچی تاشراو و ژنە یۆنانییەکان بە پرچی ڕەش یا خورمایی درێژ، ژنە لیدییەکان کە لە وەرزی گەرما تەنها بۆ خۆداپۆشین بەرگێکیان دەکردە بەریان و ژنە بابلییەکانیش بە باڵا پۆشەوە دەردەکەوتن.

ئەو شارە ببوو بە شاری نەتەوەکان و هەریەکە لە کرێکارانی میسری، سریانی، لیدی، یۆنانی، بابلی و کریتی (خەڵکی ی کریتی) و... هتد، لەو شارە پەرستگای خۆیان هەبوو و خودای خۆیان دەپەرستی.

دوانیوەرۆکانی رۆژانی هاوین و دوای نان خواردن بۆ ماوەی چوار کاتژمێر کارکردن دەوەستا و دەبوو بە پشوو و کرێکارەکان دەرۆیشتنەوە بۆ ماڵەکانیان و لە بەرانبەردا بەیانیان زووتر کار دەستی پێدەکرا. لەوانەیە مایەی سەرسوڕمان بێت کە ماوەی کارکردن لە هاوین بۆ کرێکاران دە کاتژمێر و لە زستاندا هەشت کاتژمێر بووە.

لە کاتێکدا کە لە وڵاتانی تر و لە هەمان کاتدا لە بەیانی تا ئاوا بوونی خۆر بووە و لە رۆژانی هاوین نزیك پازدە کاتژمێر یا زیاتر دەبۆوە. هەموو ئەو کرێکارانەی لە ئەوێ کاریان دەکرد، کرێیان وەردەگرت و کەس بێگاری پێ نەدەکرا، لە کاتێکدا لە میسر و لە کاتی دروستکردنی هەرەمەکان یا پەرستگایەکدا، هەموو پیاوان بۆ بێگار دەگیران و تەنها نانە زگیان پێدەدان و خواردنیان بریتی بوو لە نان و پاقلەی کوڵاو و هەندێ کات ماسی زێی نیل.

بە پێی نووسینی کەتیبەکانی تەختی جەمشید، کرێی وەستاکان واتە پیشەگەر و هونەرمەندەکان کە لە پێرسپۆلیس کاریان کردووە بە ئێرانی یا هی وڵاتانی تر زۆر بووە و کرێی پێنج رۆژیان بەرانبەر بووە بە یەك (داریك) زێر یا بە هەمان ڕێژەی ئەو لە زیو و بە زانینی ئەوەی یەك داریك زێر یەکسان بووە بە بیست داریك زیو و هەر مەرێك نرخەکەی یەك داریکی زیو بووە، بێ زێدەرۆیی بۆمان دەردەکەوێت کە ژیانی ئەو وەستایانەی لە پێرسپۆلیس کاریان کردووە، وەك خانەدانەکان بووە و هەرچی پێداویستی ژیانی ئەو کات بووە، توانیویانە بۆ ئاسوودەیی خۆیان دابینی بکەن.

پێش هەر شتێك لە کۆشکەکە، ئەو پایەیەی (ئەستووندە) داریوش بۆ ڕاگرتنی کۆشك دایمەزراند بوو، بینەر بۆ لای خۆی ڕادەکێشێت. چونکە پاشای ئێران تا ئەوکات کۆشکی دروست نەکردبوو و لە پێداویستییەکانی بیناکردنی کۆشکێکی مەزنی وەك پێرسپۆلیس بێ ئاگا بوو و پیاوێکی بێ ئاگا دەبوایە بۆ سازدانی کۆشکێکی ئاوا، دەبوایە هەنگاوبەهەنگاو کارەکان بەرەو پێش ببات و تەنانەت هەندێ کات ئەوەی دروستی کردووە ، بروخێنێتەوە و سەر لە نوێ بینای بکاتەوە، بەڵام داریوش بە شێوەیەك کاری ئەو کۆشکەی بەرێوە دەبرد کە وادەزاندرا کاری گەورەی بیناسازی ئەنجام داوە و ڕاستیش ئەوە بوو کە ئەو لە میسر شارەزایی لە بواری بیناسازی بە دەست هێنابوو.

داریوش لە میسر فێرببوو کە دوای کاری نەخشەسازی بینایەك، سەرەتا پێویستە مۆدێلی بۆ دروست بکرێت و دواتر کرێکاران بەکرێ بگرێت یا بە بێگار بیانهێنێت، کاری بیناسازی بە شێوەیەك بوو کە دوای دەست پێکردن تا کۆتایی تەواو نەدەبوو.

دوای ئامادەکاریەکان و کۆکردنەوەی بیست و پێنج هەزار وەستا و کرێکاری شارەزا، دەست بە کاری کۆشکەکە کرا. لەو کۆشکە کار بە خۆڵ نەدەکرا تا کرێکاری ناشارەزا بێنن و ئەو کەرەستانەی بەکاردەهات هەموویان پلە یەك بوون، تەنانەت ساروجیش لەو کۆشکە تەنها بە کولاَوی بەکاردەهات و دەزاندرێت ساروج دوای کولاَندن دەبێتە چیمەنتۆ.

بیست جۆرە مەرمەر و بەردی گرانبەها و دە جۆرە داری تایبەت لە شوێنە جیاکانی جیهانەوە بۆ بەکار هێنان لەو کۆشکە هێنرابوون. بۆ سەقفی تالارەکانی کۆشکەکە داری سەدری لوبنانی بەکارهێندرا و بۆ قادرمە و بەلەکۆنەکانیش داری (فووفەل یا ئابنۆس یا داری گەز) بەکارهات، کە دوای چەورکردنیان بە روونی خواردن زۆر جوان دەبوون و ڕازاندنەوەی تالارەکان و ژوورەکان لەگەڵ یەکتری جیابوو.

یۆنانییەکان پێش سوتاندنی ئەو کۆشکە، تەواوی کەرەستە و خشڵە گران بەهاکانیان برد، دارە گرانبەهاکان لە ئاگردا سووتان، بەلاَم بەرد و مەرمەر و کاشییەکان مانەوە و دواتر وردە وردە ئەوانیشیان برد. لە سەدەی یەکەمی کۆچی و سێ سەدە دوای سوتاندنی (سەدەی شەشەمی زایینی) جگە لە بەردەکان هیچ شتێك لەو کۆشکە نەما بۆوە و تەنانەت ئەو بەردانەش کە بۆ کاری بینا سوودیان دەبوو، بردران و تەنها ئەوانە مانەوە کە بە هۆی قورسی و گەورەیی نەدەگواسترانەوە.

بەپێی نەخشەکە مۆدێلی کۆشك ئامادەکرا و لەسەر مۆدیلەکەش کۆشکەکە دامەزرا، کەرەستەی بیناسازی و جوانکاریش بەو شێوەیە لە ولاَتان هێندرا: زێر لە ولاَتی میسر، زیو لە ولاَتی لیدی کە دەکەوتە تورکیای ئێستا، ئاسن لە ولاَتی هاتی کۆن کە ئەویش دەکەوتە تورکیای ئێستا، لەعل لە شاخەکانی بەدەخشان، زۆمورروود لە شاخەکانی ئالتَایی، یەشم لە شاخەکانی هێندوکۆش، بەردی علیمورادی کە ڕەنگی سوور و روون و جوان بوو لە شاخەکانی هەزار مەسجد دەهێندرا، فیرووزە لە شاخەکانی خوراسان، قیر لە خوزستان، عاج لە سەرزەوی کۆش لە باشووری میسر، داری سەدر لە لوبنان، داری فۆفەل لە هندستان، داری ئابنۆس لە ئەفریقا، داری گەز لە هەندێ شوێنی ئێران وەك ئیسفەهان و فارس، جۆرەکانی بەردی گرانیت و بە تایبەتی جۆری ڕەش و سماقی و سەوزەکەی کە سەوزەکە بە بەردی سەوز ناسراوە و لە زۆر شوێنی ئێران و ئەفغانستان دەهێنران و بەردی مەرمەڕ لە قەوقازیا و یەزد و لیدی و یۆنان هێندراوە.

بۆ هێنانی ئەو پێداویستیانەی کە باسکران، ژمارەیەك خەڵك کە نزیکەی سەد هەزار کەس دەبوون دیاریکرابوون و بە عارەبانەوە لەو ڕێگایانەی داریوش دروستی کردبوون، لە ئێران و تەواوی وڵاتانی کە باسکران، دەگەڕان و ئەو پێداویستیانەیان دابین دەکرد.

هەندێ لەو پێداویستیانە بە ڕادەیەك گەورە بوون کە تەنها بە عارەبانەی زۆر گەورە کە بە پەنجا ئەسپ کە بە چوار ریز لە عارەبانەکان دەبەسترانەوە، دەگواسترانەوە و نموونەش ئەو بەردانەن کە دوای تاشینیان و لێ کردنەوەی بەشێکی زۆر لێیان، هێشتا بە پێوەر دیارە چەندە قورسن و لەو بەردانەوە کە ماونەتەوە قورسی ئەوان دەردەکەوێت.

داریوش کە لە وڵاتی میسر هەرەمەکان و پەرستگای رامسیسی دووەمی دیتبوو کە ئێستا بە (ئەبوو سومبول) ناودەبرێت، سەرەنجیدا کە تێپەڕینی کات نەیتوانیوە ئەو بینا گرنگە لەناو ببات و بۆیە بڕیاریدا ئەو کۆشکە دروست بکات، تا بۆ هەمیشە بمێنێتەوە و لەو بڕیارەشدا سەرکەوتوو بوو و وێرای ئەو هەموو وێرانکاریانەی لە سەردەمە جیاکان و بە هۆکاری جیای وەك نەزانی و ڕق و چاوتێ بڕین و.... هتد دووچاری ئەو کۆشکە هات، بەڵام تا ئێستاش هێشتا پاشماوەکانی ئەو کۆشکە ماوە و زاندراویشە کە تەنها ماوەیەکە ئەو کۆشکە خراوەتە بەر پارێزگاری. ئەو کە دەیویست بینایەکی نێودەوڵەتی دروست بکات، خوایانی هەموو نەتەوەکانی لەو کۆشکەدا کۆکردەوە و بۆ هەریەکەیان ژوورێك داندرا و مەبەستیش لەو کارە پەرستینی ئەو خوایانە نەبوو لە کاتی هاتنی نەتەوەکان بۆ ئەو کۆشکە.

لە سەردەمانی کۆن، هونەر لە خواپەرستی دانەبڕا بوو، لە یۆنان و رۆم هەر هونەرێك خوای خۆی هەبوو و داریوش بە تایبەت کردنی کۆمەڵێك ژوور بۆ خوایانی نەتەوەکان لە کۆشکی پێرسپۆلیس، ویستی نیشانەی هەریەکە لە هونەری نەتەوەکان لەو کۆشکە هەبێت. هەر پیشەوەر و هونەرمەندێك بە کاری خۆی هەڵدەستا و زێرنگر و زیوچییەکان لە سەر کاری زێر و زیو بوون و جوانکارەکانیش بەردە گرانبەهاکانیان دەتاشی و جوانتریان دەکردن، دارتاش و بەردتاشەکان سەرگەرمی دارتاشی و بەرد هەڵکەندنی و لوس کردن و درەوشاندنەوەیان بوون، بە شێوەیەك کە تا ئەو کات نەبینرابوو.

بەردەکانی پەرستگاکانی میسر و یۆنان و رۆمیش لووسکردن و جوانکاریان لە سەر کراوە و بەردە شەبەقەکانی پێرسپۆلیسیش بە هەمان شێوە، بەڵام لەکاتی بەراوردکردنیان دەبینین ئەوانەی کۆشکی پێرسپۆلیس بە بەراورد لەگەڵ ئەوانی تر زۆر تەواو و پێشکەوتووترن و وەك ئەوەی بە ئامێری پێشکەوتووی ئەو سەردەمە دروستکرابن. بەردە مەرمەرەکانی ئەو کۆشکە

هیچیان نەماون و تەنها بەردی ئاسایی ماوە و دوای وردبوونەوە لە ئەوان ئەو ڕاستییەمان بۆ ئاشکرا دەبێت، بەڵام چونکە بەردە ڕەقەکانیان لووس کردووە، دەتوانیین لێکدانەوە بکەین کە بەردی مەرمەریان باشتر لووس کردووە.

لە کاشییەکانی کۆشکی پێرسپۆلیسیش هیچ ئاسەوارێك نەماوە و بەکاربردنی کاشی لەو کۆشکەدا دەرخەری ئەو ڕاستییەیە کە ئێرانییەکان لە زانستی شیمی زۆر پێشکەوتوو بوون، چونکە ئەوان بە ئۆکساندنی کانزاکان ڕەنگی تایبەتیان داوە بە کاشییەکان و بینەران وایان دەزانی ئەو کاشیانە نەخشێندراون.

ئێستا باس دەکرێت کە هەندێ لەو بەردانەی لەو کۆشکە بەکارهاتوون، دوای داندران لە شوێنەکانیان لە لایەن بەردتاشەکانەوە، تاشراون. بۆ نموونە ستونەکانی ئەو کۆشکە، دوای ئەوەی بەردەکان لە شوێنی خۆیان داندراون، لە لایەن وەستا و بەردتاشەکانەوە تاشراون و ئەوەش توانای ئەو بەرد تاشانە دەردەخات کە دوای دانرانیان، وایان کردووە ستوونەکان بەو شێوەیە هەموویان بە ئەندازەی یەکتر بن و گورە و بچووك دەرنەچن.

ئەگەر ئەو گریمانەیە پشتڕاست بکرێت کە سەرەتا بەردەکان یا هەندێك لە بەردەکانیان لە بیناکە داناوە و دواتر ئەوانیان داتاشیوە، ناچارین ئەوە پەسەند بکەین کە ئەوان بۆ جووڵاندنی بەردەکان و دانانی ئەوان لەسەر شوێنی کارەکەیان، ئامێری تایبەت بە بەرزکردنەوەیان (سرینگ) بەکار هێنابێت.

بەهۆی کەتیبە دۆزراوەکان دەتواندرێت ناوی هەندێ وەستاکانی بینای پێرسپۆلیس بزاندرێت و بزاندرێت کە چوون لە گەڵ پاشای هەخامەنشی لە بواری کارەکانیاندا گرێ بەستیان کردووە و لەوانەش (کاردۆس)، وەستا و بەردتاشی ناسراوی یۆنانی کە بەڵێنی پێگەیاندنی بیست قوتابی باشیدابوو لە پازدە ساڵدا و دەبوایە بیانکاتە وەستا لە بواری کارەکەی، بە پێچەوانەوە ئەگەر ئەو کارەی نەکرد، دەبێت ئەو حەقدەستەی لە پاشای وەرگرتووە بۆی بگەرێنێتەوە.

کاردۆس وتبووی بۆ هەر فێر بوونێك دوولایەنی (مامۆستا) و (فێر خواز) هەنە و پێویستە لە فێرکردندا وێڕای ئەوەی مامۆستا کۆشش بکات، فێرخوازیش بە تەواوەتی ویستی فێربوونی ببێت و بە پێچەوانەوە سوودی لێ وەرناگیرێت. داریوشیش دەسەڵاتی پێدابوو کە بە دڵی خۆی قوتابییەکانی دیاری بکات و گرنگ نییە کە قوتابییەکان ئێرانی بن یا یۆنانی یا هی هەر وڵاتێکی تر.

ماوەی دروستکردنی کۆشکەکە پەنجا ساڵی دەخایاند و ئەمەش وایکرد کە داریوش بیر لە پەروەردەکردنی نەوەیەکی تازە لە وەستا و پیشەوەرەکان بکاتەوە، چونکە دەیزانی تەمەنی ئەوان بەشی تەواوکردنی کارەکان ناکات و بۆ ئەوەی کارەکە بە نیوەیی نەوەستێت، ئەو بڕیارەیدا. پێدەچێت ئەوکات جۆرە جاوچنۆوکیەك لە فێر کردنی هونەر و پیشەکاندا هەبووبێت و لە بارەی زانستەکان بێ گومانین لە بوونی ئەو چاوچنووکیە، بەڵام سەبارەت بە هونەرەکان دڵنیا نین.

بەڵگەنامەکانی کۆن نیشاندەری ئەو ڕاستییەن کە زاناکان، هەموو کەسیان فێری زانستەکانیان نەدەکرد و هەندێ بابەتیان بە نهێنی دەهێشتەوە و ئەمەش بۆ ئەوە بوو کە زانست نەکەوێتە دەست خەڵکی بێ کەڵك، بەڵام چاوچنووکی پیشەوەری و هونەری کارێکی گشتی نەبووە و وەستا و هونەرمەندان قوتابی تازەیان پەروەردەدەکرد.

یەکی تر لەو وەستایانەی کە لە پێرسپۆلیس کاری کردووە، ناوی (هننە) بووە و خەڵکی میسر بووە، ئەو بەرپرس بووە لە تەواوی جوانکاری و وردەکارییەکانی هەڵکەندن و ئەویش بە هەمان شێوە ڕاسپاردرا بوو کە کۆمەڵە قوتابییەك پەروەردەبکات.

هەروەها (ئۆکلۆن) کە خەڵکی بابل بوو، یەکی تر بووە لەو وەستا هونەرمەندانەی بە بەرد تاش ناسرابوو و شێوەی کاری پەیکەرتاشییەکەی جیاواز بوو لە شێوەی کاری (رۆدس).

ئێستا هیچ ئاسەوارێکی ئەو پەیکەرانە نەماوە کە کاردۆس و یۆنانییەکانی تر سازیان کرد بوون و ئەو پەیکەرانە بە هۆی بچووکی قەبارە، دوای سوتاندنی پێرسپۆلیس لە لایەن یۆنانییەکان بردران. بەڵام ئەو پەیکەرانە ماون کە ئۆکلۆنی بابلی و شاگردەکانی لە شێوەی گای باڵدار دروستیان کرد بوون، بە مەرجێك هی ئەوان بووبن و هی بابلییەکانی تر نەبووبن.

ئەگەر تەواوی کەتیبەکانی پێرسپۆلیس بخوێندرێنەوە لەوانەیە ناوی هەموو ئەو وەستا و هونەرمەندانە و شێوە و رێژەی کارەکانیان لەو کۆشکە و ژمارەی قوتابییەکانیان بزانین، هەروەك چۆن ئێستا دەزانین (ئیلیدیس) کە خەڵکی لیدی بووە و لە پێرسپۆلیس کاری کردووە، سێ سەد قوتابی هەبووە.

ئەو بیست و پێنج هەزار وەستا و کرێکارەی لە گەڵ خێزان و منداڵەکانیان لە شاری مەرڤ دەشت دەژیان، بە هەموو زمانەکانی ئەوکاتی جیهان دەدوان، بەڵام سێ زمان زۆرتر لە ئەوانی تر بەکار دەهێندران و بریتی بوون لە: (فارسی، عیلامی و بابلی) و هەر ئەو زمانانەن کە لە کەتیبەکانی سەرەتایی هەخامەنشییەکان و بۆ نموونە کەتیبەکانی بێستوون دەدیترێن.

بیر نەکرێتەوە کە بڵاوبوونەوەی بەکار هێنانی زمانی فارسی بە تایبەتی بۆ نووسین و بە خێرایی لە هەموو ئێران لە سەردەمی هەخامەنشییەکان بۆ دەسەڵاتی ئەوان بگەرێتەوە، واتە ئەوان بە زۆر ئەو کارەیان کردبێت و ئەوەی بۆوە هۆکاری ئەو کارە، ئاسان بوونی بەکار هێنانی ئەو رێنووسە بوو. دوای ئەوەی داریوش ئەلفبای فینیقی هێنایە ناو رێنووسی فارسی، رێنووسی فارسی زۆر ئاسان بۆوە و وەك رێنووسی فینیقی بۆوە (٣٢) پیت کە هەمان پیتەکانی ئێستان، بەڵام رێنووسی عیلامی (١٥٠) پیتی هەبووە و رێنووسی بابلیش (٤٠٠) پیت. بۆیە بە شێوەیەکی سروشتی رێنووسی فارسی هەردوو رێنووسی عیلامی و بابلی بەجێ هێشت.

چونکە دانیشتوانی بابل و عیلام رێنووسی فارسی ئاسانتر لە رێنووسی خۆیان فێر دەبوون، بۆیە هێواش هێواش زمانی فارسی بوو بە زمانی نێودەوڵەتی و ئەو رێبوارانەی سەفەریان بۆ شوێنە جیاکان دەکرد، ئەگەر زمانی فارسیان زانیبوایە گرفتیان نەدەبوو، تەنانەت لە وڵاتێکی وەك یۆنان کە بەربەرەکانی لە گەڵ ئێران هەبوو زمانی فارسی بە دووەم زمان دەهات.

هاوشێوەی ئەوەش لە دوای هاتنی ئیسلام روویدا و زمانی فارسی دوای ئیسلام واتە زمانی فارسی ئێستای ئێران کە بە (فارسی دەری) ناسراوە، بۆوە زمانێکی نێونەتەوەیی و گەواهیدەری ئەو ڕاستییە پەرتووکی مێژوونووسان و جوگرافی زانان و بە تایبەتی جیهانگەردە ئیسلامییەکانە کە کاتی سەفەریان بۆ هەر وڵاتێك و تەنانەت بۆ چین، ئەگەر فارسیان زانیبوایە گرفتیان نەدەبوو.

باسمان کرد کە لە کۆشکی پێرسپۆلیس بۆ بەرزکردنەوەی کەرەستە قورسەکان، ئامێری تایبەتیان بەکار هێناوە و ریچارد فرای زانای ئێرانناسی ئەمەریکی، گریمانی ئەوەی کردووە کە ئامێرەکانی ئەوێ لە ئامێرەکانی میسر بوونە و لەوانەیە لەو وڵاتە هێندرابن، ئەو ئامێرانە ئێستا لە ئەورووپا بە (پالان) ناو دەبرێن کە زۆر لە ناوە ئێرانییەکان دەچێت.

هاوشێوەی ئەو جۆرە ئامێرە، لە ڕابردووی نزیکدا لە هەندێ کەشتی گوێزەرەوەی کاڵاکاندا دەبینرا و بریتی بوو لە بورجێکی بەرز کە بەنێکی ئەستووری بەسەردا راهێڵ کرابوو و قولابێك بە سەرێکی بنەکەوە هەڵواسرابوو و دوای لکاندنی قولاب بە کەرەستەکە، لایەکەی تریان ڕادەکێشا تا بەرز ببێتەوە.

زانای ئەمریکی گریمانی کردووە کە ئەو جۆرە ئامێرە لە پێرسپۆلیس بەکارهاتووە و ئەگەر ئەو بابتە پەسەند بکەین، بە ناچاری دەبێت بڵێین کە جۆرە ئامێرێك بەکار هاتووە کە ئێستا بجوکترین ئاسەواری نەماوە. مێژوونووسی یۆنانی کەتزیاس باس لە بەکارهێنانی ئامێر لە بەرز کردنەوەی

کەرەستە قورسەکان دەکات و بە (مێکانیك) ناوی دەبات، بەڵام مەبەستی ئەو لە مێکانیك بە ماناکەی ئێستای نییە و ئەوکات ئەو وشەیە بە مانای ئێستای (ئامێر) بەکار هێندراوە.

تا ماوەیەك لە دوای دروستکردنی شاری کرێکاران لە (مەرڤ دەشت)، داریوش لەرێگەی خزمەتکارەکانەوە بەرگ و خۆراك و سووتەمەنی دەگەیاندە کرێکاران، چونکە ئەوکات لە (مەرڤ دەشت) هێشتا مامەڵەچی و بازرگان نەبوون و دواتر هاتنەکایەوە. ئەو خواردەمەنی و جل و بەرگانەی کە داریوش بۆ ئەوانی دەنارد تەواو و باش بوو و هۆی دابین کردنیشیان دەگەڕایەوە بۆ ئەوەی داریوش نەیدەویست ئەوان بۆ دابین کردنی پێداویستییەکانیان، کارەکانیان بەجێ بهێڵن.

زانای ئێراناسی ئەمریکی (کامێرۆن) کە بەشێك لە پازدە هەزار کەتیبەکەی پێرسپۆلیسی خوێندۆتەوە، باسێکی لەمەر چۆنێتی خواردنی وەستا و کرێکارەکان خستۆتەروو، کە دوای (٢٥) سەدە و لە کاتێکدا کە دەیخوێنینەوە دەزانین ئەوان خواردنی باش و بەهێزیان خواردووە، هەروەها دەردەکەوێت خواردنی ئەوان یەك شێوە بووە و تەنها وەستاکان بە هۆی داهاتی زۆرتریان، توانیویانە کەلوپەل و خواردەمەنی زۆرتر لە بازاری ئازاددا بکڕن و خوانی ماڵەکانیان ڕازاوەتر بکەن، چونکە هەموو ئەو وەستا و کرێکارانەی لە مەرڤ دەشت دەژیان، ماڵ و منداڵیان لەگەڵدا بوون.

لە لایەن داریوش خواردن بە شێوەی یەکسان بە ئەوان دەدرا و بە پێی وتەی کامێرۆن و پشت بەستن بە کەتیبەکان، بۆ هەر (١٠) وەستا و کرێکار قورسایی یەك بەردی هەخامەنشی (واتە ٢٥٠٠) گرام گۆشت دەردرا و بە پێوەری ئەمرۆ بۆ خۆی و بۆ هەر تاکێکی ماڵەکەی کە گەیشتبوونە تەمەنی لاوەتی، دووسەد و پەنجا گرام گۆشتیان وەردەگرت، هەریەکەیان بۆ هەر ڕۆژێك (١٢٥٠) گرام نانی وەردەگرت و بە دە ڕۆژ جارێك (٦٢٥) گرام ڕۆنی کەرە و بە هەمان ئەندازە پەنیری وەردەگرت، هەروەها (١٢٥٠) گرام هەنگوینیان بۆ هەمان ماوە وەردەگرت و ئێرانییەکان یەکەم نەتەوە بوونە کە دەرکیان بەو ڕاستییە کردووە کە تا پەنیر کۆنتر بێت، خۆشتر دەبیت و توانیویانە پەنیر کۆن بکەن بێ ئەوەی تێك بچێت.

ئەوەی باسکرا ئەو خواردنە سەرەکیانە بوون کە بە وەستا و کرێکاران دەدران، جگە لەوانە سەوزە و میوە بە پێی وەرزەکان دەدرا بە ئەوان، هەروەها هەر وەستایەك دەیتوانی بۆ چوار کەس لە منداڵەکانی کە تەمەنیان لاو بوو خۆراك وەربگرێت و بۆ منداڵەکانیش نیوەی ئەو بەشەی پێدەدرا. ئەو خۆراکانەی کە پێشیان دەفرۆشترا بە کەمترین نرخی گونجاو بوو.

بەلاَم دوای گەورە بوونی شاری مەرڤ دەشت و هاتنی بازرگان و مامەڵەچییەکان بۆ شارەکە، دابەشکردنی خۆراك کە لە داهێنانی داریوش بوو بە هۆی دەستکەوتنی خۆراك لە بازارەکان، هەڵوەشایەوە و دواتریش هیچ بەڵگەیەك نییە بۆ سەلماندنی ئەوەی کەسی تر بەشە خۆراکی دیاریکراوی بە وەستا و کرێکاران دابێت.

مێژوونووسی بەناوبانگ ئاریان دەڵێت کرێکارانی پێرسپۆلیس هەر دە رۆژ جارێك یەك رۆژ پشوویان هەبوو و بەو پێوەرە لە هەر مانگێك (٢٧) رۆژ کاریان دەکرد، جگە لەوەش کرێکاران هەر نەتەوەیەك بۆیان هەبوو رۆژی چەژنی خوای گەورەی خۆیان بکەن بە پشوو و ئەو رۆژانە کە بەو شێوە هەندێ کرێکار دەیانکرد بە پشوو، هەندێ لە کارەکان دەوەستان و هەندێ کارگە دادەخران.

زانینی ئەو بابەتە باشە کە داریوش پێش دەستپێکی کارەکانی بیناسازی پێرسپۆلیس، فەرمانی کرد بوو (یەك لەسەر هەشتی) مووچەی تەواوی ئەو کەسانەی لە کارکردندا دەبن بخرێتە ناو خزینەیەك تا ببێتە پاشکەوت بۆی و لە کاتی وازهێنانی لەکار و گەڕانەوەی بۆ وڵاتەکەی پێی بدرێتەوە. زاندراوە کە کاری پێرسپۆلیس پەنجا ساڵی دەویست و بۆیە پێش دەست پێکردنی کارەکان، کرێکارەکان دەبوایە دیاری بکەن کە ئەگەر لە کاتی کارکردندا مردن، پاشکەوتەکانیان بدرێتە کێ و بە واتەیەکی کێ میراتگریانە.

هەندێ لە کرێکارەکان لە دەستپێکدا رەبەن بوون و هاوسەرگیریان نەکردبوو و لە سەرەتا برا یا دایکیان بە میراتگر دیاری دەکرد، بەلاَم دوای ماوەیەك هاوسەرگیریان دەکرد و منداڵیان دەبوون و بۆیە لە کاتی گۆڕینی رایان سەبارەت بە میراتگرەکەیان، ئەوە ئەوان دەسەلاَت بە دەست بوون.

ئەوانەی دەیان ویست بگەڕێنەوە بۆ نیشتیمانەکانیان و چیتر کاریان نەدەکرد، دەیانتوانی تەواوی پاشکەوتەکانیان وەربگرنەوە و برۆن. ئەو کرێیەی کە دەدرا بە کرێکار و وەستاکان، تەنها یەك لەسەر هەشتی لای داریوش پاشکەوت دەکرا و خۆشیان لەوەی وەریان دەگرت، هەندێکیان پاشکەوت دەکرد و ئەوانەی دەگەڕانەوە بۆ وڵاتەکانیان، ئەوەندەیان پارە پێدەبوو کە بە خەڵکانی دەست رۆیشتوو دەژمێردران.

هەندێ کەس باوەڕیان وایە کە جێنشینەکانی داریوش لە دوای مردنی ئەو، هەندێ بەشی سەرەکی وەك تالاری ئاپادانایان (کە خاوەنی سەد ستوونە) لەو کۆشکە زیاد کردووە و ئەمە بە پێی ئەو بەڵگەنامانەی دەست کەوتوون، دوورە لە ڕاستی و بۆ ئەو کارە پێویست بووە کۆشکەکە وێران و سەر لەنوێ دروست بکرێت.

لەوانەیە دوای داریوش وردەکارییەکانی جوانکاری کۆشکەکە لە لایەن ئەوان بڕیاڕی لێدرا بێت، چونکە نەخشەی کۆشکی پێرسپۆلیس بە شێوەیەك بووە کە نەدەتواندرا، بێ وێرانکردنی ئەو کۆشکە، دەستکاری بەشە سەرەکیەکانی بکرێت و وێرانکردنیشی ئاسان نەبووە، زاندراوە بە درێژایی (٢٥) سەدە لە هەموو لایەکەوە دەستی وێرانکاری گەیشتووتە ئەو کۆشکە و تا ئێستا هەندێکی هەر ماوەتەوە.

کۆشکی پێرسپۆلیس لە سەردەمی دەسەڵاتداری سێ پاشا (داریوش، خەشاریار و ئەردەشێر) بینا کراوە و لە سەردەمی ئەردەشێردا ژمارەی پێنج هەزار کرێکار هەبووە، مێژوونووسی یۆنانی (دی نون) کە بۆ یەکەم جار لە مێژوو ئەردەشێری بە (ئەردەشێری درێژ دەست) ناساند، باسی ژمارەی کرێکارەکانی کردووە و هەر ئەویش روونی دەکاتەوە کە ئەو نازناوەی دایناوە بۆ ئەردەشێر، هیچ مانایەکی لاوەکی نییە و ئەو بە ڕاستی دەستی درێژ بووە و هۆکەشی بۆ ئەوە گەڕاوەتەوە کە لە مێرمنداڵیەوە، زووبینی هەڵداوە. هۆکاری کەمبوونەوەی کرێکارەکانیش لەو سەردەمە بە هۆی تەواو بوونی کارەکانی کۆشکەکە بووە، کە تەنها جوانکاریەکانی ماوەتەوە.

لە سەردەمی خەشایارشادا تالاری ئاپادانا تەواو بوو و لە سەردەمی ئەردەشێردا کۆشکەکە تەواو بوو کە شاکارێك بوو لە بیناسازی، ئەو پێکهاتە هونەریەی تیایدا بەکارهات تا ئێستا وێنەی نییە و شەو و ڕۆژ بە هۆی ئەو زێر و خشڵانەی تیایدا بەکار هاتبوو، دەدرەوشایەوە و شەوانەی رووناکی چراکانی کۆشکەکە، ئەو کۆشکەیان دەردەخست.

(دی نون) دەڵێت: ئەو کەسەی بە شەو لە کۆشکی پێرسپۆلیس نزیك دەبۆوە چراکانی نەدەدیت، بەڵام دەیدیت کە رووناکی ئەوان بەسەر بەشە جیاوازەکانی کۆشکەکەدا دەدرەوشێتەوە، چونکە لە شەودا کۆشکی داریوش بە رووناکی ناڕاستەوخۆی ئەو چرایانە رووناك دەبۆوە.

ئەوانەی ئێستا بەردتاشییەکانی ئەو کۆشکە دەبینن، لە بوونی ئەو جیاوازیانەی لە شێوازەکانی ئەوکات هەبووە، دووچاری سەرسوڕمان دەبن و ئەگەر نیگارەکانی ئەو کۆشکە مابوانە بە دڵنیاییەوە لەوانیش دووچاری سەرسوڕمان دەبوون، بەڵام ئاگر تێبەردانی کۆشك و دەستی ڕۆژگار ئەو نیگارانەی نەهێشت، هەر وەك چوون پەیکەرەکانی ئەو کۆشکەش لە لایەن یۆنانییەکان کە یەك سەدە دەسەڵاتداری ئێران بوون، بردران و لەو سەدەیەشدا نووسینی پەهلەوی هەخامەنشی نەما و خەڵك بە یۆنانی دەدوان.

ئێسترابوونی سکرتێری ئەسکەندەر کە سوتانی کۆشکەکەی بەچاوی خۆی دیتووە، دەڵێت لەو کۆشکە تالارێك تایبەت بە خوایانی (ئۆلەمپ) هەبووە کە پەیکەری هەموویانی تێدا بووە و لەویٚ زێئۆس (ژووپی تێر) و خوایانی تر، کارەکانی خۆیان بەرێوە بردووە.

شاراوە نییە کە بە باوەڕی یۆنانییەکان خوایانی ئەوان کە گەورەکەیان (ژووپی تێر) بووە لە شاخی ئۆلەمپ (ئەو شاخەی یاریەکانی ئۆڵەمپیای لیٚ ئەنجام دەدرێت) ژیاون و هەیەکەیان کاری تایبەت بە خۆیان هەبووە، پەیکەری تەواوی ئەو خوایانە کە بە زێر و خشڵ ڕازاندرابوونەوە، لە پێرسپۆلیس هەبوون.

ڕەخنەیەك لە بەردتاشی و نیگارەکانی پێرسپۆلیس هەیە کە وێڕای بوونی ورد کاری و جوانی زۆر لە هەندێکیان کە مایەی دەست خۆشین، بەشێکیان ئەوەندە دواکەوتوون کە لە نیگارەکانی بیست هەزار ساڵ پێش خۆیان و سەردەمی ئەشکەوت نشینی مرۆڤەکان، دواکەوتووتر بوون.

ئەو کەسانە ئاگادار نین کە پێرسپۆلیس موزەخانەی نێونەتەوەیی بووە و هونەر و پیشەکاری هەموو نەتەوەکانی تێدا بووە. کاتێك دەچینە موزەخانەیەك قاپی گڵێن دەبینین کە زۆر زەبر و ناشیرینە، لە حەوت هەزار ساڵ پێش و بیٚ ئامێر دروستکراوە، هەروەها پەیکەری (سەرکەوتن) دەبینین کە بە گریمانی زۆر پەیکەرتاشی یۆنانی (کاردۆس) تاشیویەتی و لە سەیر کردنی تێر نابین، لە پێرسپۆلیسیش بە هەمان شێوە بووە.

پەیکەرتاشی بەناو بانگی یۆنانی (کاردۆس) لە پێرسپۆلیس کاری دەکرد و کاتێك توانای کاری نەماو و قوتابییەکانی جێیان گرتەوە، گەڕایەوە بۆ وڵاتەکەی و ئەوەندە پارەی پاشکەوت کردبوو کە دەوڵەمەند بوو و خزمەتکارە گەنج و جوانەکانی، جەستەی ئەو پیرەپیاوەیان بە بۆنی خۆش نەرم دەکردەوە. بەرد تاشییەکانی کۆشکی پێرسپۆلیس بە گشتی کاری کاردۆس و قوتابییەکانی ئەون کە لەوانەیە لە داهاتوودا ناوی لە سەر کەتیبەکانی ئەو شوێنە دەرکەوێت.

گایە باڵدارەکان و سەری ستوونەکان کە لە تەختی جەمشید دەدیترێن، لە لایەن (ئاکلۆن) وەستای بابلی کراون و بەردتاش و وەستاکانی بابلی لەو بوارەدا شارەزایی باشیان هەبوە. بەڵام ئەو بەردتاشی و هەڵکەندنە سادانەی، جوانی و وردەکاری یۆنانییەکانی تێدا بەدی نەدەکرا، کاری (ئەبلیدیس) بوون کە خەڵکی وڵاتی لیدی بووە.

داریوش و دوای ئەو خەشایار و دوای ئەویش ئەردەشێری دەست درێژ دەیانزانی ئەو بەردتاشییە سادانە لە بەرانبەر بەردتاشینی یۆنانی و بابلییەکان بەرچاو نابن، بەڵام بە

ئەنقەست دەیان ویست کاری تەواوی نەتەوەکانی جیهان لەو کۆشکە هەبێت و بۆیە دوای تەواو بوونی بەشێك لە کۆشکەکە و تەواوی بوونی تالاری ئاپادانا[١]، داریوش تەواوی فەرمانڕەوایانی جیهانی بانگهێشت کرد بۆ پێرسپۆلیس تا بێن و ئەو کۆشکە ببینن و هاوکات لە تالاری ئاپادانا مەراسیمی تاج کردنە سەری خۆی بەریوەبرد.

زانای یەهودی (ئێس دێر ئێس) کە هاوکات لە سەردەمی داریوش ژیاوە و چوار پەرتووکی لەدوا بەجێ ماوە، دەڵێت: داریوش لە ساڵی پازدەهەمی دوای بەدەستەوە گرتنی دەسەڵات، لە کۆشکی پێرسپۆلیس تاجی کردەسەر و شوێنی دانیشتنی ئەو تالارێك بوو کە (٣٦) ستوونی بەردی هەبوو. ئێستا دەزانیین ئەو تالارە هەمان تالاری ئاپادانایە.

مێژوو نووسانی رۆمی (سۆئەتوون) و (فلاویۆس ئاریان) دەڵێن داریوش بیست ساڵ دوای بوونی بە پاشا و لە پێرسپۆلیس تاجی کردەسەر و لە کاتی تاج کردنەسەری، پاشاکانی جیهان لەوێ ئامادەبوون. ئەگەر ئەو گێڕانەوەیە ڕاست بێت، داریوش لە ساڵی (٤٩٥ پ. ز) لە تالاری ئاپادانا تاجی کردووتە سەر، چونکە ئەو لە ساڵی (٥٢١ پ. ز)[٢] بۆتە پاشا.

دووەمین تالاری ئەو کۆشکە بە ناوی (تات جارا) لە سەردەمی داریوش دەستی پێکرا و لە سەردەمی ئەو و خەشایاری کوریدا تەواو نەبوو و ئەردەشێر کۆتایی پێهێنا، تات راجا سەد ستوونی هەبوو و پاشاکانی ئێران نەمایشی لەشکری تایبەتی پاشایەتیان لەو تالارە سازدەکرد، ئەو لەشکرە بە گاردی جاوید ناودەبرا و لەوانەیە ئەو گاردە تا کۆتایی مێژووی مرۆڤایەتی وێنەی نەبێتەوە، گرنگی ئەو گاردە لە جوانی جل و بەرگیان و شکۆی رێکخستنیان نەبوو، بەڵکو بابەتی هەڵبژاردنی سەربازەکانی زۆر گرنگ بوو.

(ئێس دێر ئێس) دەڵێت: سەربازەکانی گاردی جاوید لە نێوان گەنجانی باڵا بەرز و بەهێز دیاری دەکران، سەردەمی داریوش ئەوانیان دەنارده قوتابخانە و ماوەی خوێندنیان شەش ساڵ بوو، لە ماوەی خوێندنیان سەرەرای زانستەکان، زانستە سەربازییەکانیشیان دەخوێند و

---

(١) (چەند پاراگرافێك پێشتر باسکراوە کە تالاری ئاپادانا لە سەردەمی خەشایارشادا تەواو کراوە، نازانین کە بە چ هۆیەك لەو پاراگرافە زەبیحوڵڵا تەواو بوونی ئەو تالارە دەگەڕێنێتەوە بۆ سەردەمی داریوش، بۆ زانیاری هەردوو پاراگراف وەك خۆی و بێ دەستکاری هاتووە و لەوانەشە هەڵەی وەرگێر بۆ فارسی بووبێت. وەرگێر بۆ کوردی)

(٢) (بە پێی وتەی هەردوو مێژوونووسی رۆمی سۆئێتۆن و فلاویۆس ئاریان، داریوش کە لە ساڵی ٥٢١ پێش زایین بۆتە پاشای هەخامەنشی، بیست ساڵ دوای بە پاشابوونی لە کۆشکی پێرسپۆلیس تاجی کردووتە سەری، کە بە کەمکردنەوەی ئەو بیست ساڵە لەو بەروارەوە، رێورەسمەکە دەبێتە ساڵی (٥٠١ پ. ز). وەرگێر بۆ کوردی.)

پەروەردەی ئاکار و رەوشتیشیان زۆر گرنگی پێدەدرا، دوای دەرچوونیان لە قوتابخانە جێگەی ئەو سەربازانەی گاردەکەیان دەگرتەوە کە دەگەیشتنە چل ساڵی و خانەنشین دەکران.

مێژوونووسی رۆمی (سوئی داس) دەڵێت پێرسپۆلیس یەکەم کۆشك بووە کە شووشە بۆ پەنجەرەکانی بەکار هاتووە، تا رووناکی بێتە ناو کۆشك و رێگەی با بۆ ژوورەوە بگیرێت. ئەو ڕایە هەر وەك ڕای زۆرێك لە مێژوونووسان کە وتوویانە پێرسپۆلیس شووشەی نەبووە، جێگەی گومانە. دڵنیاین پێنج سەد ساڵ پێش زایین لە ئەسکەندەریە شووشە دروست دەکرا و بە زانینی ئەو پەیوەندییەی لە نێوان ئێران و میسر هەبووە، بە دووری دەزانین شووشە نەگەیشتبێتە ئێران.

ئەوانەی دەڵێن لە پێرسپۆلیس شووشە بەکار نەهاتوو، پشت ئەستوورن بەوەی کە لە پاشماوەکانی ئەو کۆشکە شووشە بەدەست نەکەوتووە.

هەر ئەوکات لە یۆنان شووشە هەبووە و لانی کەم لە سەردەمی ئەفلاتووندا شووشە لە یۆنان هەبووە و لە وەرزی زستان کە ئەفلاتوون بۆ وانە وتنەوە لە باغەکەی (باغی ئاکادمی) دەچۆو بۆ ژووریٚ، ئەوانەی بە کۆلانەکەدا دەهاتن، ئەو و قوتابییەکانیان دەدیت، بیٚ ئەوەی دەرگای ژوورەکە کراوە بێت و هەروەها ئەرەستووی قوتابی ئەفلاتوونیش دوای ئەوەی بوو بە مامۆستا لە لایەن خەڵکەوە دەدیترا کاتێك کە بۆ وانە وتنەوە بە پێوە دەوەستا[٣]. ئاشکرایە کە ئەفلاتوون و ئەرەستوو دوای داریوش دەژیان.

بەڵام بەڵگەنامەی تر هەیە کە پشتراستی دەکاتەوە کە پێش سەردەمی داریوش لە یۆنان شووشە هەبووە و ئەوانەی بۆ زانینی بەختی خۆیان دەچوونە پەرستگای (دۆلفی) لە پشت جامەکانەوە، چاویان لە کاهینی پەرستگا دەکرد و بە بوونی ئەو پەیوەندییەی لە نێوان هەخامەنشی و یۆنانییەکان هەبووە، بە دوور دەزاندرێت لە یۆنان شووشە هەبووبێت و لە ئێران نەبووبێت.

بەجیٚ نەمانی پاشماوەی شووشە نابێتە بەڵگە بۆ نەبوونی شووشە لەو کۆشکە و زاندراوە هەروەك چوون کانزاکان لەناو دەچن، شووشەش لە ژێر خاك شی دەبێتەوە و لەناو دەچێت، هەروەك دەبینین لە کۆشکی پێرسپۆلیس تەواوی ئەو کەرەستانەی لە کانزا بوونە شی بوونەوە و لەناو چوون و تەنها دوو پارچە زێر و زیو نەبێت کە لە صندووقێکی ئاسن یا زیو و لە بناغەی کۆشك دانرابوون، مانەوە.

---

(٣) (نەریتی ئەرەستۆ وابوو کە لە کاتی وانەووتنەوە هاتووچۆی دەکرد و بۆیە بە فەلسەفەی ئەو دەووترا فەلسەفەی رێرۆیشتن کە لە عەرەبی بە فەلسەفەی مەشائی ناو دەبرێت، زەبیحوڵڵا)

پێویستە سوپاسی هۆشمەندی ئەو کەسانە بکەین کە ئەو کارەیان کردووە، چونکە ئەگەر وانەبووایە، ئەو دوو پارچە زێڕ و زیوە لەناو دەچوون. بەڵام شێوەی دانانی ئەو صندووقە کە بچووکترین ڕێگەی نەبووە تا هەواو و بابەتە شیمیاییەکان بتوانن بگەنە پێکهاتەی صندووقەکە و شی بکەنەوە و دوای بیست و پێنج سەدە بێ ئەوەی هیچیان لێبێت، ئەو دوو پارچە زێڕ و زێوە لە پاشماوەکانی ئەو کۆشکەدا ماوە.

بە زانینی ئەو پەیوەندییەی لە نێوان هەخامەنشی و یۆنان و ئەسکەندەریەی میسر هەبووە، بە دووری دەزانین لە ئێران شووشە نەبووبێت و نەخرابێتە بەر سوود لێ وەرگرتن.

وێڕای ئەوەی پێرسپۆلیس وەك موزەخانەیەکی نیونەتەوەیی دەژمێردرا، ببۆوە ناوەندێکی سیاسی و سێ جار پاشاکانی جیهان لەوێ بەیەك گەیشتن: جاری یەکەم بۆ کردنەوەی کۆشك و جارەکانی تر بۆ باسکردنی بابەتە سیاسیەکانی جیهان.

یەکەمجار کە پێرسپۆلیس بۆوە ناوەندی بەیەك گەیشتنی دەسەڵاتدارانی جیهان بۆ چارسەری کێشە سیاسیەکان، دوای ڕۆژی (١٢ی سپتامبەری ٤٩٠ پ. ز) بۆوە و هۆکاری نووسینی بەروارەکە بۆ ناونانی ئەو ڕۆژەیە لە لایەن هیرۆدۆت کە بە گەورەترین ڕۆژی مێژووی ناوناوە و باوەڕی وایە هیچ ڕۆژێك لە ڕووی گرنگی ناگاتە ئەو ڕۆژە، چونکە بە وتەی ئەو لەشکری یۆنان لەو ڕۆژەدا لە پێدەشتی (ماراتوون) لەشکری داریوشی شکاند و بۆ هەتایە (شارستانییەتی ڕۆژئاوا لە مەترسی هێرشی وەحشییەکان، ڕزگاری بوو) و پێویست ناکات کە باس بکەین کە مەبەستی هیرۆدۆت لە وەحشییەکان، هەخامەنشییەکان بووە.

شوانێکی یۆنانی تەمەن هەڤدە ساڵ بەناوی (ڕۆزیك) مەودای نێوان پێدەشتی ماراتوون و ئەسینای پایتەختی یۆنان کە (٤٥) کیلۆمەتر بوو، بێ پشوودان و بە ڕاکردن بڕی، تا مژدەی شکاندنی لەشکری هەخامەنشی بگەیێنێتە خەڵك و دوای گەیاندنی موژدەکە، گیانی دەرچوو. هێرۆدۆت دەڵێت پێویستە ئەو لاوە لە ریزی خوایان دابنرێت، گەلی یۆنانیش ناوی ئەویان لەبیر نەکرد و تا ئێستا لە ئۆلەمپیادەکان یاریەك هەیە بە ناوی ڕاکردنی (ماراتۆن). دواتر باس لە ئەو جەنگە و لێدوانی هیرۆدۆت دەکەین.

شاراوە نییە کە پاشایەکی گەورەی وەك داریوش کاتێك بۆ ڕاوێژ کردن بانگهێشتی پاشاکانی جیهان بکات، لە ڕووی لاوازییەوە نییە و بە پێچەوانەوە نیشانەی ڕۆحی ئازادی خوازییە، ئەو خۆی بە بەرپرس دەزانی بەرانبەر بەو بڵاوکراوەی ئازادی کە لە لایەن داریوشەوە نووسرابوو.

دواجار کە لە سەردەمی ژیانی داریوشدا پێرسپۆلیس بوو بە ناوەندی کۆبوونەوەی سەرانی جیهان، دوا ساڵی تەمەنی ئەو واتە ساڵی (٤٨٥ پ. ز) بوو. لەو ساڵەدا بە هۆی ڕاپەرینی میسر، داریوش ویستی بە ڕێککەوتن لە گەڵ سەرانی جیهان و لە ناویاندا خودی میسرییەکان، چارەسەری کێشەکە بکات.

هیرۆدۆت و گەزنەفۆن دەڵێن فیرعەونی ئەوکاتی میسر ناوی (خاباش) یا (خەبەش) بووە و ماوەیەکی کەم دوای کونگرەی سەرۆکەکانی جیهان لە پێرسپۆلیس و گەرانەوەی بەشدار بوانی کۆنگرەکە، داریوش مرد. ئەمجار پێویستە چاوێك بخشێنینەوە بە تێچووی گشتی دروستکردنی کۆشکی پێرسپۆلیس و تێبگەین کە داریوش و خەشایار و ئەردەشێری یەکەم کە ماوەی نیو سەدەیان پێچوو تا ئەو کۆشکە دروست بکەن، چەندیان بۆ ئەم مەبەستە خەرج کردووە[٤].

لە کۆشکی پێرسپۆلیس بە بەردەوامی دەهەزار وەستا کاریان کردووە کە مانگانەی هەر یەکەیان شەش داریك بووە و بەو پێوەرە تەنها پارەی ئەوان هەفتا و دوو هەزار داریك زێر بووە. جگە لە ئەوان (٢٤٠٠٠) کرێکار جگە لە سەردەمی ئەردەشێر کە ژمارەیان کەم بۆوە، کاریان لەو کۆشکە کردووە و ئەوانیش لە کرێکارە باشەکان بوونە و پارەی زوورتریان وەرگرتووە و رۆژانەیان یەك (سیکلۆ) بووە، واتە لە بیست رۆژدا یەك داریکیان وەرگرتووە و ساڵانەیان هەژدە داریك بووە، واتە ساڵانە (٤٣٢٠٠٠) داریك مووچەی هەموویان بووە کە بە مووچەی وەستاکانەوە دەکاتە (٥٠٤٠٠٠) داریك و واتە داریوش ساڵانە زیاتر لە نیو ملیۆن داریك زێری داوەتە ئەوان.

ئەگەر بە بەراورد لەگەڵ ئێستا نرخی زێر تەنها بیست بەرانبەر بێ، دەزانین چ پارەیەکی زۆر ساڵانە لە لایەن داریوش خەرج کراوە و لە کاتێکدا کە پارەی خۆراك و پۆشاك جیا بووە لە مووچەکانیان.

ئاشکرایە کە تێچووی ئەو کۆشکە تەنیا بریتی نەبووە لە مووچەی کرێکار و وەستاکان، پێداویستی و کەرەستەکانی بیناسازی کە لە شوێنە جیاکانی دونیا دەهێندران و پێداویستی تریش هەبوو کە هیچ زانیاریمان لە بارەی بەهاکانیان و ریژەیان نییە، ئەگەر لە کەتیبەکانیشدا باسیان کرابێت هێشتا نەخوێندراونەوە یا ئێمە نایان زانین. لە یەك لە کەتیبەکاندا باس لە

---

(٤) (بەڵگەنامەکانمان بۆ دیارکردنی تێچووی ئەو کۆشکە لە کەتیبەکانی پێرسپۆلیس وەرگیراون و بەشێك لە ئەوان لە لایەن زانای بە ناوبانگی ئەمەریکی و رۆژهەڵاتناس (کامێرۆن) خوێندراونەتەوە و ئەوانی تریش جارێ نەخوێندراونەتەوە و یا ئەگەر خوێندراونەتەوە، ناوەرۆکیان نەگەیشتوتە ئێمە، زەبیحوڵڵا.)

(٧٥) بەردی زێر کراوە کە بە زانینی ئەوەی بەردی هەخامەنشی (٢٥٠٠) گرام بووە، دەکاتە (١٨٨.٥) کیلۆگرام زێر.

کەرەستە گران بەهاکانی ئەو کۆشکە تەنها بریتی نەبوون لە زێر، بەڵکو بابەتگەلی وەك دارە پڕ نرخەکانی (سەدر، ئابنۆس، فووفەل و عاج کە لە ئەفریقاوە دەهات) و جۆرەکانی خشڵ بۆ ڕازاندنەوەی ژوورەکانی کۆشکەکە و ئاسن کە ئەو کات نرخی بەرز بوو، بە گشتی لەو کۆشکەدا بەکار هاتوون.

بە هۆی کەمبوونەوەی ژمارەی کرێکارەکان لە سەردەمی ئەردەشێری یەکەم، ماوەی بیناکردنی کۆشکی پێرسپۆلیس تەنها بە سی ساڵ دیاری دەکەین، بەم پێوەرە دەسەڵاتدارانی ئێران (١٥١٢٠٠٠٠) پازدە ملیۆن و سەد و بیست هەزار داریك زێریان خەرج کردووە و بەم پێیە دەکرێت بگوترێت ئەو کۆشکە بە گرانترین کۆشك دیاری بکرێت.

بە هۆی نەبوونی زانیاری دروست لە بابەت ڕێژە و نرخی ئەو کەرەستە گرانبەهایانەی لە کۆشکەکە بەکار هاتوون و نەبوونی بەڵگە لەو بوارە، چیتر باس لەو بابەتە ناکەین و تەنها دەڵێین سەبارەت بە مووچەکان زانیارییەکانمان بە بەڵگەوەن.

فێرعەونی میسر (کۆفۆ) کە هەرەمی گەورەی میسری بیناکرد کە تا ئێستا ماوە، مووچەی بە کرێکارەکان نەدەدا و تەنها خۆراکی پێدەدان، بۆیە دەکرێت بگوترێت ئەو هەرەمەی بێ تێچوو و بە خۆڕایی دروستکرد.

بە رووکار کرێکاران لە پێناو (ئامون) خوای گەورەی خۆیان بە خۆبەخشانە کاری خۆیان بەجێ دەهێشت و دەهاتن کاریان لە دروستکردنی هەرەمەکەدا دەکرد، بەڵام لە ڕاستیدا ئەوان بە زۆر کاریان پێ دەکرا و ئەگەر کاریان نەکردبایە و کەموکوریان نواندبایە، بە قامچی لێیان دەدان.

سینۆهە پزیشکی تایبەتی ئاموون هۆتەپی چوارەم فێرعەونی میسر بووە کە هاوکات مێژوونووسیش بووە، لە سەدەی چوارەمی پێش زایێن ژیاوە و لە پەرتووکەکەیدا کە سەبارەت بە سەردەمی دەسەڵاتی فێرعەونەکان نووسیویەتی و ئێستا بەردەست دەکەوێت، دەڵێت: تا خوایانی میسر هەبن، پێویستە پەرستگایان بۆ دروست بکرێت، بۆیە میسر پێویستی بە کۆیلە هەیە.

بەڵام ئەمە رووکاری بابەتەکەیە و لە ڕاستیدا تا ئەو ڕۆژەی فێرعەونەکان هەبوون، میسر پێویستی بە کۆیلە بووە و ئەوان نەتەنیا کۆشك و قەبرەکانیان بە هۆی کۆیلەکانەوە دروست دەکرد، بەلکو کێڵگە و کانەکانیان بە هۆی ئەوانەوە دەخستەگەر و نووسەری ئەو پەرتووکە خۆشی لە کێڵگەکانی کۆمەڵێك کۆیلەی هەبوو کە کاری بە زۆری پێدەکردن.

دیۆدۆر مێژووناسی بەناوبانگی (سیسیل) کە پەرتووکە گشتییەکەی یەك لە پەرتووکە گرنگەکانی مێژووە و ڕووداوەکانی پێش سالّی شەستی زایینی باسکردووە، دەڵێت لە دەوروبەری پێرسپۆلیس سێ دیوار کە لە بەردی گرانیت بوون هەبووە. ئەو بابەتە سەیرە چونکە ئێستر‌ابوون کە خۆی پێرسپۆلیسی دیت بوو، باسی لەو دیوارانە نەکردووە.

بە وتەی دیۆدۆر ئەو سێ دیوارە لە بەردە داتاشراوەکانی گرانیت دروستکرابوون و ئێستا هیچ شوێنەواریان نەماوە، بە گشتی هەر بەردێك گواستنەوەی ئاسان بووبێت لە پێرسپۆلیس بردراوە و لە شوێنی تر لە دروستکردنی خانوودا بەکارهاتووە، ئەم کارە لە میسریش لەو بینا مێژووییانەدا دووبارە بۆتەوە کە وێران کراون.[٥]

ئەو کەسانەی خۆیان پێرسپۆلیسیان دیتووە، باس لە بوونی تەنها دیوارێك لە دەورەی ناکەن چ جای ئەوەی باس لە سێ دیوار بکرێت. لێرە کۆتایی بە باسی ئەو کۆشکە دێنین و جارێکی تر لە کاتی سوتاندنی بەدەست ئەسکەندەر باسی لێ دەکەینەوە.

ئایا لە پێرسپۆلیس خزینەیەکی نهێنی هەیە کە لە ناویدا زێر و خشڵ حەشار درابێت؟

(ژان پێرۆی) فەرەنسی کە لە سالّی (١٩٦٩ ز) و دوای ڕۆیشتنی (گێرشمەن) کاری بەرێوەبردنی هەڵکەندنەکانی شووشی گرتە ئەستۆ، ڕای وایە کە شتی وانییە و ئەوەی هەبووە لە لایەن ئەسکەندەر و یۆنانییەکان تالاّن کراوە.[٦]

وێڕای ئەوە ئالبێر شامپۆدەری فەرەنسی باوەڕی وایە کە ئەو بابەتە بوونی هەیە و لەوانەیە بە هۆی تیشکی تایبەتییەوە کە لە هەرەمەکانی میسر بەکار هاتووە و دەتوانێت بە بەردە ئەستوورەکاندا تێپەڕبێت، بدۆزرێتەوە. لەوانەیە ئەو تیشکە کە وەك تیشکی ئێکس کارایە، بتوانێت ئەو کارەمان بۆ یەکلا بکاتەوە.

---

(٥) (بە وتەی ڕۆژنامەی لایفی ئەمریکی، لە سالّی (١٩٦٩ ز) پەنجا و نۆ دەستە لە شارەزایانی ئەمریکی و ئەورووپی و میسری لە بواری هەڵکەندنی شوێنەوار، بە درێژایی کەنارەکانی زێی نیل کاری بەدوادا گەڕان دەکەن. بە هۆی ئەوەی تەواوی شار و ئاوەدانییەکان هەروەك ئێستا لە کەنارەکانی زێیەکان بوون، بۆیە لە کەنارەکان ئەو کارە ئەنجام دەدەن و ئەوان لە کارەکانیاندا هەندێ بەردی داتاشراویان دۆزیوەتەوە کە لە بینا کۆنەکاندا بەکار هاتوون. زەبیحوڵلا.)

(٦) (بابەتی بوونی ئەو گەنجینە شاراوەیە لە نزیکەی ئەو سالاّنەی کە نووسراوە واتە سالاّنی هەفتاکان باس کراوە. وەرگێر بۆ کوردی)

## داریوش و فەرهەنگ و ئاوەدانی

دانیشتوانی ئەوکاتی ئێرانیش وەك تەواوی خەڵکی تر باوەڕیان بە کاریگەری ئەستێرەکان لە ژیانی مرۆڤدا هەبووە، جگە لەو لایەنە نادروستانەی کە تیایدا بوو. ئێستاش ناتوانین لە کاریگەر ئەستێرەکان بێ بەری بین، چونکە هەرچی هەمانە لە هەتاوە و (ئەگەر گریمانی جیابوونەوەی زەوی لە هەتاو بە ڕاست بزانین) کاتێك ئاو دەخۆینەوە وەك ئەوە وایە کە هەندێ لە هەتاو بخۆینەوە. ئێرانییەکان وەك هەموو نەتەوەکانی کۆن، ئەستێرەکانیان بە کاریگەر دەزانی لە ژیانی مرۆڤ و هەوڵیاندا ئەستێرەکان بناسن و ڕێگای جووڵەیان بدۆزنەوە و هەژماری بکەن.

گومانمان نییە لە ئێرانیش هەروەك وڵاتانی تر، لە سەرەتا بە تەواوەتی جووڵەکانی مانگیان ناسی و زۆری پێچوو تا بەو باوەڕە بگەن کە هەتاو لە یەك ساڵدا یەکجار بە دەوری زەویدا دەسورێتەوە (بە باوەڕی خەڵکی کۆن کە زەویان بە وەستاو و هەتاویان بە جووڵاو دەناسی) و دوای ئەوەی زانرا هەتاو لە ساڵێکدا جارێك بە دەوری زەویدا دەسورێتەوە، ژمارەی دوازدە کەوتە ناو مێشکی نەتەوەکانی کۆن.

هەندێك کەس دەڵێن ژمارەی دوازدە لە ئەوەوە هات کە پێشینان زانیان کاتێك هەتاو بە دەورەی زەویدا دەسورێتەوە، لە دوازدە پێگە تێپەڕدەبێت و ماوەی بڕینی هەریەکەیان سی ڕۆژ یا کەمێك زیاتر دەبێت.

ژمارەی دوازدە کە وەك پێوەری وەستانی هەتاو لە پێگەکانی سورانەوەی بە دەورەی زەویدا یا لە دوازدە خوولی جووڵەی مانگ بە دەورەی زەویدا هاتە کایەوە، بەر لە دانانی ژمارەکان بە پێوەری (١٠ دەیی) هاتەکایەوە و تا ئێستاش ژمارەی دوازدە وەك پێوانە (دەرزەن) ماوەتەوە،

لای نەتەوەکانی ڕابردووش ئەو ژمارەیە بە ڕادەیەك گەورە بوو کە کاتێك ویستبایان باس لە ژمارەی گەورە یا جێگەی شانازی بکەن، نەیاندەتوانی جگە لەو ژمارەیە هیچی تر باس بکەن.

بە باوەڕی ئێرانییەکان (ئاهورامەزدا) دوازدە هەزار ساڵ پێش زەوی خوڵقاندووە و ئێرانیش دوازدە هەزار ساڵ پێش دامەزراوە، هەروەها دەستپێکی مێژوو دوازدە هەزار ساڵ پێشە و ئەو ماوەیە لە ساڵی (١٢٣٢ زایینی) کۆتایی هاتووە، بۆیە ئێستا لە هەزارەی یەکەمی دوازدە هەزار ساڵی دووەمدا دەژین.

ژمارە دوازدە لە ژیانی کۆمەڵایەتی هەموو نەتەوەکانی جیهان لە ڕۆژهەڵات تا ڕۆژئاوا هەبووە و ڕۆمەکان وەك گەلانی ڕۆژهەڵات ڕێزیان لەو ژمارەیە ناوە، تورکەکانیش ڕێزیان لەو ژمارەیە گرتووە و ساڵیان بە دوازدە بەش کردووە و باوەڕیان وابوو کە لە هەریەکە لەو بەشانەدا، ئاژەڵێك دەسەڵاتی زۆرترە.

هەرچەندە (دوازدە) لەلای نەتەوەکانی جیهان بەرێز بووە، بەڵام مێژوونووسی فەرەنسی (ئالبێر شامپادۆر) وێڕای باسی سەردەمی پاشایەتی داریوش دەڵێت پێش سەردەمی هەخامەنشییەکان، ئێرانییەکان ساڵیان کردبووە دە مانگ کە هەر مانگێك (٣٦) ڕۆژ بوو و دەزانیین کە ساڵ (٣٦٥) ڕۆژە و پێنج ڕۆژە زیادەکەیان دەختەسەر مانگی کۆتایی و ئەو مانگە دەکرایە (٤١) ڕۆژ و دوای ئەو مانگە، (نەورۆز) دەستی پێدەکرد و دەکرایە جەژن.(١)

لە کەتیبەکانی بێستووندا، داریوش لە سەرەتای پاشایەتی خۆی و لەوانەیە لە ساڵی حەوتەم یا هەشتەمی دەسەڵاتیدا بووبێت، باس لە ناوی نۆ مانگ دەکات کە پێش پاشایەتی ئەو لە دە مانگەکەی ساڵ بوونە. بە هەمان شێوە کە داریوش بۆ دروستکردنی کۆشکی پێرسپۆلیس باشترین وەستا و هونەرمەندەکانی بانگهێشت کرد، بە هەمان شێوە بۆ دارشتنەوەی ساڵنامەی تازەی خۆی دەستەیەك لە زاناکانی میسری و بابلی لە پازارگاد کۆکردەوە. لە ئێرانیش زانای ئەستێرەناس هەبوون و ئەوانیش لە لایەن داریوشەوە لەو لیژنەیە بەشداریان پێکرا، سەرۆکی ئەو لیژنەیە زانایەکی خەڵکی بابل بوو کە ناوی (دێنی تۆن) بوو.

---

(١) (نەریتی زیادکردنی پێنج ڕۆژ بۆ سەر دواهەمین مانگی ساڵ، تا ئێستاش لە ئێران لەناونەچووە و لە هەندێ شوێنی وەك مازەندەران، خەڵکانی بە تەمەن دواهەمین مانگی هەر ساڵێك بە سی و پێنج ڕۆژ هەژمار دەکەن و تەنها جیاوازیان لە گەڵ ساڵی کۆندا بریتییە لەوەی ساڵی ئەوان (١٢) مانگە و یازدە مانگ سی ڕۆژین و دوا مانگیش سی و پێنج ڕۆژە، زەبیحوڵڵا.)

داریوش داوای لێکردبوون کە ساڵنامەیەك دروست بکەن کە ژمارەی ڕۆژەکانی مانگەکان بەردەوام وەك یەك بن، ڕۆژی جەژنی نەورۆز و جەژنە ئایینییەکان نەگۆڕێت و هەموان بزانن کە جەژنەکان لە چ ڕۆژ و وەرزێکدا دەبن.

وێڕای ئەوەی داریوش بانگهێشتی زاناکانی میسر و بابلی کرد بۆ ئێران، بەڵام نەیویست ساڵنامەی خۆی بە سەر نەتەوەکانی تردا بسەپێنێت. پێش گەیشتنی بە دەسەڵات، داریوش کەمبۆجییەی لە بابەت پێویست بوونی گۆڕینی ساڵنامە ئاگادارکردبۆوە، بەڵام کەمبۆجییە لە ترسی دژایەتی کردنی زانایانی ئایینی ئەوکات، ئەو هەنگاوەی نەنا، ئەوان لە گەڵ مانگە (٣٦) ڕۆژییەکان ڕاهاتبوون و نەیاندەتوانی ئەو مانگانە تەرك بکەن.

دوای ئەوەی زاناکان زۆر لێکۆڵینەوەیان کرد، بڕیاریاندا ساڵ بکرێتە دوازدە مانگ و شەش مانگی یەکەم (٣١) ڕۆژ، پێنج مانگی دووەم (٣٠) ڕۆژ و مانگی کۆتایی (٢٩) ڕۆژ بێت، هەر پێنج ساڵیش یەکجار مانگی کۆتایی دەبێتە (٣٠) ڕۆژ و ئێستا لە ئێران بە ساڵی (کەبیسە) ناسراوە، ئەو ساڵە (٣٦٦) ڕۆژە.

گۆڕینی ساڵنامە لە لای (موبیدەکان) موغەکان دژایەتی لێکەوتەوە و بە دژایەتی لەگەڵ یاساکانی خوداوەند دانرا کە هەموویان لە (ئاڤیستا) هاتوون. بەڵام ئەو زانایانەی لە فارس کۆ ببوونەوە، نەیاندەتوانی دەقە ئایینییەکان بخوێننەوە و بزانن کە گۆڕینی ساڵنامە دژی یاساکانی ئایینە یا نا؟ خودی داریوشیش توانای خوێندنەوەی دەقە ئایینییەکانی نەبوو، چونکە پەرتووکی ئاڤیستا بە زمانی باختەری واتە ئەو زمانەی لە باکووری ئێران، ناوچەکانی خۆڕاسان و بەشێك لە تورکەمەنستان قسەی پێدەکرێت، نووسراوە.[(٢)]،[(٣)]

---

(٢) (هەر بەو هۆیەوە هەندێ کەس دەڵێن زەردەشت لە ڕۆژهەڵات یا باکووری ئێران واتە خۆڕاسان لە دایك بووە یا لەو شوێنە گەورە بووە، بۆیە ئاڤیستا بە زمانی باختەری نووسراوە و باختەر واتە باکوور، زەبیحوڵڵا.)

(٣) (بەڵگە نەویستە کە زەردەشت لە کەناری دەریاچەی ورمێی لە دایك بووە و ئەو ڕاستییە لە لایەن زۆرینەی مێژوونووس و ڕۆژهەڵاتناسانەوە پشت ڕاست کراوەتەوە و تەنانەت لە سەرەتای ئەو پەرتووکەشدا باسمان لەو بابەتە کردووە، دواتر زەردەشت بۆ ماوەی زیاتر لە بیست ساڵ لە گوندی (بەڵخ) لە ناوچەی هەورامان ژیاوە، هەندێ کەس بە هەڵە ناوی گوندی بەڵخەیان کردووە بە ناوچەی (بەڵخ) کە لە خوراسانە و ئەوە هەڵەیەکی گەورەیە. جگە لەمەش ئاڤیستا بە شێوەزاری هەورامی کە بنەچەی ڕاستینەی زمانی کوردییە نووسراوە و بەو هۆیەشەوە داریوش کە فارس زمان بووە لە توانای نەبووە کە ئاڤیستا بخوێنێتەوە کە بە وتەی خۆیان بە زمانی

هیچ کەسێك جگە لە موغەکان نەیدەتوانی دەقەکانی ئاڤیستا بخوێنێتەوە و لە یاساکانی تێ بگەن، ئەوان هەرچی لە بارەی یاساکانی ئاڤیستا دەیانگووت تەنها بەڵگە هێنانەوە بوو و هەموان دەبوایە وتەکانیان پەسەند بکەن، تەنانەت خەڵکانێکی وەك کوروش و داریوشیش بەدەر نەبوون لەو یاسایە. بۆیە دوای ئەوەی داریوش رووبەرووی بەرهەڵستی موغەکان بۆوە، بڕیاریدا تا ئاڤیستا وەربگێردرێتە سەر زمانی فارسی، تا هەمووان بیخوێننەوە و لێی تێبگەن.

هەندێ لە مێژوونووسانی کۆنی یۆنانی دەڵێن گوایە داریوش فەرمانی کردووە کە ئاڤیستا وەربگێڕدرێتە سەر زمانەکانی تر، بۆ ئەوەی نەتەوەکانی تریش بێنە سەر ئایینی زەردەشتی. ئەو بابەتە ڕاستی تێدا نییە و هەر دوو پاشای هەخامەنشی کوروش و داریوش بە درێژایی سەردەمی دەسەڵاتیان هەوڵی سەپاندنی ئایینی خۆیان نەداوە، چونکە هەر دوو پاشا باوەڕیان بە ئازادی ئاین هەبووە و بروایان وابوو کە هەموو نەتەوەیەك پێویستە ئازاد بێت تا هەر ئایینێکی پێ باشە، پەیرەوی بکات.

بێ گومان داریوش ئاڤیستای لە زمانی باختەری وەرگێڕاوە بۆ فارسی، تا مافی تێگەیشتن و هەڵێنجانی لە لە دەست موغەکان دەربکات و وابکات هەموان لێی تێ بگەن. لە چاپی نۆیەمی (فەرهەنگی زانیاری بریتانیکا) کە زۆربەی بۆ بابەتی مێژوویی تەرخانکراوە، هاتووە کاتێك داریوش فەرمانیدا ئاڤیستا وەربگێردرێتە زمانی فارسی، ناوی گۆڕا بە (زەند). بەڵام ئەو بابەتە ڕاست نییە و زەند تەنها لێکدانەوەی ماناکەیەتی و لە سەردەمی ساسانییەکاندا نووسراوە و لە نێوان ئەو سەردەمە و سەردەمی داریوش، چەند سەدەی خایاندووە.

هۆکاری نووسینی زەندیش لە سەردەمی ساسانییەکان دەگەڕایەوە بۆ ئەوەی خەڵك نەیاندەتوانی ئاڤیستا کە بە فارسی هەخامەنشی نووسرابوو، بخوێننەوە و هۆکەشی ئەوەبوو کە دوای هاتنی ئەسکەندەر بۆ ئێران و لەناوچوونی هەخامەنشییەکان، زمانی یۆنانی لە ئێران زاڵ بوو و خەڵك بەو زمانە دەدوا. لە چوار سەدەی دەسەڵاتداری ئەشکانییەکان، شێوە زارێکی فارسی بە ناوی فارسی ئەشکانی هاتەکایەوە کە هیچ کەتیبە و نووسراوێك بەو زمانە نەماوە، تا بزانین چوون بووە.

بەڵام بە گشتی کاتێك ساسانییەکان هاتنە سەر دەسەڵات، زمانی فارسی هەخامەنشی مردبوو و بۆیە ئاڤیستا لە زمانی هەخامەنشی وەرگێڕدرایە ساسانی و ماناکەی لێکدرایەوە. هۆکاری ماناکردنەوەی ئاڤیستا بریتی بوو لە ئەوەی خەڵك وردەکارییەکانی ئاڤیستایان

---

باختەری واتە باختەران یا کرماشان نووسراوە و هەمان زمانی کوردییە کە یەکە لە زمانە کانی لقی زمانی ئێرانییەکان. وەرگێر بۆ کوردی)

نەدەزانی کە لە سەردەمی هەخامەنشی ناسرا بوون، ئەوانەی کاری وەرگێڕانیان بۆ ئاڤیستا دەکرد، ناچاربوون ماناکەی شی بکەنەوە تا خەڵك لە دەقە ئایینییەکان تێ بگات.

سەبارەت بە وەرگێرانی ئاڤیستا لە زمانی باختەری بۆ فارسی، بەڵگەنامەیەك هەیە کە بە نرخترە لە گێڕانەوەی هەزار مێژوونووسی رۆژئاوایی و رۆژهەڵاتی و بریتییە لە کەتیبەیەکی بێستوون کە تیایدا داریوش دەڵێت: پەرتووکی یاساکانی خوداوەندم (واتە ئاڤیستا) لە زمانی باختەری وەرگێڕا بۆ فارسی تا هەمووان بتوانن بیخوێننەوە و لێ تێ بگەن.

ئاڤیستای ئێستا تەنها بریتییە لە یەك بەش لە چوار بەشەکەی و سێ بەشەکەی تری بە هۆی هێرشەکانەوە لەناو چووە. وەرگێرانی ئاڤیستا تەنها بە یەك کەس و لە ماوەیەکی کورتدا نەدەکرا و بۆیە داریوش چەندین کەس لە وەرگێرەکانی ڕاسپارد بۆ ئەو مەبەستە و سەرۆکی وەرگێرەکان یەك لە موغەکان بوو بە ناوی (فەراورد یا فەرووردەد). ئەو لەناو موغە گەورەکاندا تەنها کەس بوو کە پاڵپشتی دەکرد لە چاکسازییەکانی داریوش سەبارەت بە ساڵنامەی تازە و وەرگێڕانی ئاڤیستا و ئەوانی تر بە گشتی دژی داریوش بوون.

چونکە بۆ ئەوان مەترسی وەرگێڕانی ئاڤیستا زیاتر بوو لە مەترسی ساڵنامەی تازە، ساڵنامەی تازە تەنها نەریتەکانی تێکدەدان، بەڵام وەرگێڕانەکە ئاڤیستای لە دەست ئەوان دەردەهێنا و دەیکرد بە هی هەموان.

داریوش بۆ ئەو وەرگێڕانە زۆری خەرج کرد، بەڵام وێڕای ئەوە وتەی گەزنەفۆن سەبارەت بە تێچووی ئەو کارە کە بە (هەزار تالان) باسی دەکات، بە زێدەرۆیی دێتە بەرچاو. بە وتەی (نیکەلسۆن) زانای رۆژهەڵاتناسی بەریتانی هەر تالانێك بەرانبەر بووە بە چوارسەد لیرەی زێر کە لە رووی کێش و نرخەوە جیا بووە لە (تالانی) رۆمی و یۆنانی، ئەگەر وتەی گەزنەفۆن ڕاست بێت، داریوش بۆ ئەو کارەی چوارسەد هەزار لیرەی زێری خەرج کردووە و ئەو ژمارەیە زێدەرۆیی تێدایە.

بەڵام گەزنەفۆن لەو مێژوو نووسانەیە کە ڕایان وایە ئاڤیستا وەرگێردراوەتە سەر زمانی نەتەوەکانی تر و جێگەی بڕوا نییە کە بۆ وەرگێڕانی ئەو بابەتە لە ئەختریییەوە بۆ فارسی ئەو تێچووەی هەبێت.

دوای وەرگێڕانی ئاڤیستا بۆ فارسی دەرکەوت کە شتێکی پێچەوانەی ساڵنامەی تازەی تێدا نییە و داریوش لەو بابەتەوە ئاسوودە بوو و لە لایەکی تر ئەو کارە کاریگەری لەسەر

کەمکردنەوەی دەسەڵاتی لایەنگرانی موغەکان هەبوو، بە بێ ئەوەی لە ڕیزی ئەوان لەناو خەڵکدا کەم بکاتەوە.

دوای تەواو بوونی وەرگێڕانی ئەو پەرتووکە، فەراوردی سەرۆکی لیژنەکە لە لایەن داریوش کرایە موغی گەورە و ئەمەش پاداشتێك بوو بۆ ئەو خزمەتە گەورەیەی ئەنجامی دابوو. دوای ئەوە لە تەواوی سەفەرەکان واتە سەفەرە ئاسایی یان جەنگییەکاندا، داریوش ئاڤێستای فارسی دەبرد و دەیخوێندەوە و سوودی لە دەقەکانی وەردەگرت.

نوێکردنەوەی ساڵنامەی نوێ لە لایەن داریوش، سەرەڕای ڕاست ڕاگرتنەوەی جەژنەکانی نەوروز و نەتەوەیی و ئایینی، کارەکانی کشتوکاڵی و دارچاندن و ئاودێریشی ڕێکخستەوە و دوای ئەوە ساڵنامەی ئێرانییەکان نەگۆڕا، ئەو ساڵنامەیە بە ڕادەیەك ڕێك و باش بوو کە ئەسکەندەر دوای داگیرکردنی ئێران، ئەو ساڵنامەیەی لە یۆنان پەرەپێدا و لە سەردەمی ئەشکانی و ساسانییەکان هەر بەردەوامی هەبوو.

یەك لە زانایانی هاوچەرخ و ئێرانناسەکان بە ناوی پرۆفیسۆر (لێنتس) کە مامۆستای زانکۆی هامبورگ و ساڵانێکی زۆر سەرگەرمی لێکۆڵینەوە لە بینای پێرسپۆلیس بووە، باوەڕی وایە هەرچی لەو کۆشکەدا هەیە، دەربڕی یەك لە دەرکەوتە ئەستێرە ناسیەکانە. ئەو دەڵێت داریوش پێش ئەوەی ببێتە پاشای ئێران ماوەیەك لە میسر ژیاوە و لەوێ زانیاری وەرگرتووە کە هەرەمی کۆفۆ کلیلی هەموو زانیارییە ئەستێرەناسیەکان. هەر کەسێك لێکۆڵینەوە لەو هەرەمە بکات دەتوانێت هەموو بابەتە ئەستێرەناسیەکان تێ بگات.

بۆ نموونە بەرزی هەرەمی کۆفۆ (١٤٩) مەترە و ئەگەر بە پێوەری ملیۆن گەورە بکرێت دەکاتە مەودای نێوان هەتاو و زەوی واتە سەد و چل و نۆ ملیۆن کیلۆمەتر. هەر تیرەیەکی ئەو هەرەمە، دەرخەری درێژی یەك لە هێڵەکانی درێژی سەر زەوین. هەر ژوورێکی ناو هەرەمەکەش نیشاندەری وێنەیەکی فەلەکە و ژمارەی ژوورەکان یەکسانن بە ژمارەی وێنە فەلەکیەکان، هەر ژوورێکیش کەوتووتە ئاستی ئەو شوێنەی ئەو تاقمە ئەستێرەی لێیە کە ژوورەکە هێمایەتی، داریوش هەوڵیدا تا کۆشکی پێرسپۆلیس بە شێوەیەك دروست بکات کە هەر بابەتێکی ناوی نیشاندەری هێمایەکی ئەستێرەناسی بێت.

بە بڕوای پرۆفیسۆر لێنتس، هەر ژوور و تالارێك لەو کۆشکە هێمایە بۆ بابەتێکی جوگرافیایی یا ئەستێرەناسی دونیای کۆن، هەروەها ستوونەکانی ئەو کۆشکەی بەدەر نین لەو بیرکردنەوەیە.

ئەو زانا ئێرانناسە سەرەرای بەڵگە زانستییەکان، بەڵگەیەکی مێژوویی دێنێتەوە کە پێرسپۆلیس وێڕای ئەوەی پێشانگایەکی نیونەتەوەیی بووە بۆ زانست و هونەر، زانکۆی زانستی ئەستێرەناسی و جوگرافی دونیای کۆن بووە، ئەگەر ئێستا فەرهەنگی زمانی ئاڵمانیمان هەبێت دەتوانین مانای تەواوی وشەکانی ئەو زمانە بزانین، بە هەمان شێوە ئەو کەسەی پێرسپۆلیسی دیتبا و خوێندنەوەی رێنووسی ئەوانی زانیبا، توانای تێگەیشتنی دەبوو لە تەواوی یاسا و زانیارییەکانی دونیای کۆن لەو بوارانەی باسمان کردن.

بەڵگەی مێژوویی ناوبراو دەگەڕێتەوە بۆ ئێسترابوونی مێژووناس کە دەڵێیت: لە ئاگر کەوتنەوەکەی کۆشکی پێرسپۆلیس پەرتووکە ئەستێرەناسیەکەی ئەو کۆشکەش لەناو چوو.

ئێسترابوون لە بارەی ئەو پەرتووکە هێچ باسێکی نەکردووە و تەنها ئێمە دەزانین کە مەبەستی لەو پەرتووکە بووە کە لەناویدا تەواوی ئەو مانا و لێکدانەوانەی تایبەت بە بابەتە ئەستێرەناسی و جوگرافیەکانی ناو ئەو کۆشکە بوون، تۆمار کراون.

داریوش دوای دانانی ساڵنامەی تازە، ژمارەی ڕۆژانی پشووی پاشایەتییەکەشی دیار کرد و رۆژانی یەکەم و پازدەهەمی هەر مانگێك کرایە پشوو، هەروەها پێنج جەژنی ئایینی و جەژنی نەورۆز و رۆژێکیش کە بە رۆژی پرسەی نیشتیمانی (دواتر بە رۆژی پرسە بۆ سیاووەش ناسرا) داندرا بوو پشوو بوون، رۆژانی پشوو کار نەدەکرا و بە گشتی ژمارەی رۆژانی پشوو دەبۆوە (٣١) سی و یەك رۆژ.

لە دەورەکانی دواتر رۆژانی پشوو زیاد بوون و مانگ بووە سێ بەشی دەرۆژی و کۆتایی هەموو دەرۆژێك پشوو بوو. ژمارەی حەوت لە کۆن بە پیرۆز زاندراوە و لە ژمارەی حەوت ئەستێرە هاتووە و هەفتەش لەو ژمارە وەرگیراوە، بەڵام لە ئێران تا هاتنی ئیسلام هەفتە بەرەوی نەگرت. هەفتە داهێنانی بابلییەکان بوو و لە ئەوانەوە بۆ عبرانییەکان گواسترایەوە، ئەستێرەناسە کۆنەکان حەوت ئەستێرە و هەسارەیان دەناسی کە (هەتاو، مانگ، زوهرە، موشتەری، عوتارۆد، زوحەل و مەرریخ) بوون، ئەوان زەوییان وەك هەسارە هەژمار نەدەکرد و پێیانوابوو ناجووڵێت، هەتاویش بە هۆی ئەوەی دەردەکەوت دەجووڵێت لای ئەوان بە جووڵاو دەناسرا.

لە دەورەکانی دواتر ژمارەی رۆژانی پشوو و جەژنە نیشتیمانی و ئایینییەکان لە ئێران ئەوەندە زیادی کرد کە کارمەندانی حکومەت، لە ساڵێکدا دووسەد و پەنجا رۆژیان پشوو بوو. لەوانەی خوێنەرانی ئازیز باوەڕمان پێ نەکەن کە یەك لە هۆکارەکانی رووخانی زنجیرە پاشایەتی

ساسانییەکان بوونی ئەو هەموو پشوویە بووە، دووسەد و پەنجا رۆژ پشوو بۆ کارمەندانی حکومەت و لەشکر، نەیدەهێشت ئەوان بۆ رێگرتن لە هێرشی دوژمنان، توانای رێکخستنی لەشکری بەهێزیان هەبێت و دوای دەورەی ساسانییەکان بە هۆی ڕاهاتنیان لەگەڵ ئەو هەموو پشوویە، کارمەندانی حکومەت توانای کارکردنیان نەبوو.

بەڵام خەڵکی ئاسایی بۆ مسۆگەرکردنی پێداویستییەکانی ژیانیان نەیاندەتوانی سوود لە پشووەکان وەربگرن. زۆر بوونی رۆژانی پشوو بوو بە هۆی کەم بوونەوەی بایەخی جەژنە نەتەوەیی و ئایینییەکان و تەنانەت جەژنی نەورۆزیش، لە کۆتایی پاشایەتی ساسانییەکاندا خەڵك یادی ئەو جەژنەیان نەدەکردەوە.

داریوش کاری زۆر گەورەی ئەنجامداون کە هەندێکیان بەپێی پێوەرەکانی ئێستا هیچ نین، بۆ نموونە داریوش هیچ کات بۆ مەبەستی داگیرکردنی وڵاتان لەشکرکێشی نەکردووە و تەنها بۆ دامرکاندنەوەی ڕاپەرینەکان ئەو کارەی ئەنجامداوە، بەڵام ئەوە لە ئێستادا لە لای مێژوونووسەکان هیچ بایەخی نییە و نابێتە مایەی شانازی بۆ داریوش.

چوار لەو کارانەی داریوش ئەنجامی داون لە لایەن تەواوی مێژوونووسانی هاوچەرخ بایەخی هەیە و تەنانەت ئەو سەرچاوانەش کە بۆ لێدوان لە بارەی دەسەڵاتداران هەن ئەو چوار کارە ستایش دەکەن و ئەو کارانە بریتین لە گۆڕینی ڕێنووسی ئێرانییەکان و برەودان بە ڕێنووسی ئاسانی فینیقی و گشتاندنی خوێندن و نووسین بە شێوەیەك کە هەموان بتوانن بخوێنن و بنووسن. وەرگێرانی ئاڤیستا لە زمانی باختەری بۆ زمانی فارسی سەردەمی هەخامەنشی (پەهلەوی هەخامەنشی).

سێیەم، گۆڕینی ساڵنامەی ئێرانییەکان و جێگیرکردنی ڕۆژانی پشوو و جەژنەکان و پرسەکان و وەرزەکانی کشتوکاڵ و ئاودێری و دار چاندن. چوارەم: دانانی یاساکان بە پێی پێویستییە خێرا و کۆمەڵایەتییەکانی جەماوەر و دانانی دامەزراوەکان بۆ جێبەجێ کردنی ئەو یاسایانە.

یەك لەو دامەزراوانەی کە داریوش دایمەزراند، بریتی بوو لە دامەزراوەی سەربازگیری و سیستەمی سەربازی بوو لە وڵات کە دواتر لەناو چوو. چەند مێژوونووسی باوەڕ پێکراوی جیهان (سۆئتۆن، کەتزیاس و خانتۆس) دەڵێن خزمەتی سەربازی لەلایەن داریوش داندرا و لە سەردەمی ئەو و خەشایاری کوڕیدا، کوڕانی هەموو چینەکان بەبێ جیاوازی دەبردران بۆ

سەربازی و هونەرەکانی جەنگ فێر دەبوون و دوای ماوەیەکی دیاریکراو کۆتایی بە ماوەی خزمەتیان دەهات و دەبوونە هێزی یەدەگ.

دامەزراوەی ئاو بریتی بوو لە دامەزراوەیەکی تر کە داریوش دایمەزراندبوو و بە سەرۆکی ئەو دامەزراوەیە (ئاو- تەر) دەوترا کە لە زمانی فارسیدا واتە ئەو کەسەی ئاوی بە دەستە، سەرۆکی ئەو دامەزراوە چاودێری جوگەکان، ئاوەرۆکان و ئەو ئاوبەندانەی دەکرد کە لە سەر زێیەکان دروستکرابوون و لەوانەش ئاوبەندی خوزستان.

ئەو ئاوبەندانە دوای سەردەمی دەسەڵاتدارە هەخامەنشییەکان، چیتر گرنگیان پێ نەدرا و پڕ بوون لە لیتە و قور و سوودیان نەما. بابەتی ئاودێری کە لە سەردەمی کوروش گرنگی زۆری پێدەدرا، لە سەردەمی داریوشیش هەر گرنگ مایەوە و ئەو دەیزانی بۆ بەردەوامبوونی کشتوکاڵ پێویستە تا دەتوانێت ئاو بۆ وڵاتەکەی دابین بکات، چونکە لە سەردەمی ئەودا ئێران دووچاری کێشەی کەم ئاوی ببۆوە.

پسپۆڕانی کەشناسی جیهان بڕوایان وایە ئاسیای ناوەڕاست و وڵاتی ئێرانی ئێستا لە بواری ئاو، حەوت سەد ساڵ بە هۆی کەمی باران بارین کەم ئاو دەبن و حەوت سەد ساڵی تر بە پێچەوانەوە باران زۆر دەبارێت و ئاو تیایاندا زۆر دەبێت. چونکە دەسەڵاتداری داریوش هاوکات بوو لەگەڵ حەوت سەد ساڵی کەم بارانی، بە ناچاری دامەزراوەی هەمیشەیی ئاوی دامەزراند و تا کۆتایی دەسەڵاتی هەخامەنشییەکان ئەو دامەزراوە هەر مایەوە.

دامەزراوەی (دروستکردنی ڕێگاکان) یەکی تر بوو لەو دامەزراوە بەردەوامانەی داریوش دایمەزراند، مێژوونوسە ڕۆژئاواییەکان دامەزراندنی ئەو ڕێگایانەی بە بەرد دروست دەکران و بەردەکان بە خیز دادەپۆشران، بۆ ڕۆمەکان دەگێڕنەوە و لە ڕاستیدا دوو سەد و پەنجا ساڵ پێش ڕۆمەکان و لە لایەن داریوش ئەو جۆرە ڕێگایە دروستکرابوو.

داریوش دەیزانی ئیمپراتۆریەتی گەورەی هەخامەنشی پێویستی بە ڕێگای زۆر هەیە بۆ بەردەوامبوونی گواستنەوە و گەیاندن و هەرچەندە کشتوکاڵ و بازرگانی پەرەی دەسەند، ئەوەندەش ڕێگای تازە پێویست بوون و هاوکات دەبوایە ڕێگە کۆنەکانیش بپارێزرێن، بۆ ئەوەی لەناو نەچن. ئەو پاشایە دەیزانی دروستکردنی ڕێگای تازە و نۆژەن کردنەوەیان بە شێوەی بەردەوام، بە کردەوە کاتییەکان ناکرێت و پێویستی بە دامەزراوەی تایبەت و کاری بەردەوام بۆ ئەم مەبەستە هەیە.

دوای دامەزراندنی دامەزراوەی ڕێگاوبان، بەردەوام دەسەڵاتدارێکی ئێران بە ناونیشانی (ڕاهدار) کە لە کوردی دەکاتە (بەرپرسی ڕێگا) بەرپرسیاری ئەو دامەزراوە بووە کە تا کۆتایی دەورەی هەخامەنشی هەبووە، جێگەی سەرسوڕمانە کە لە کاتی هاتنی ئەسکەندەر، بە وتەی ئێسترابوون نزیکەی سەد هەزار کەس لە سنووری ئەو ئیمپراتۆریەتە لە دامەزراوە کاریان کردووە.

یەکی تر لەو دامەزراوانەی داریوش دایمەزراند، (پۆستە) بوو کە لە کۆن و لە دەسەڵاتی هەخامەنشی، بە (چاپارخانە و بورجەکان) دەناسرا و تا کۆتایی دەسەڵاتی هەخامەنشییەکان مایەوە، ئەو دامەزراوە ئەو کات بە شێوەیەك بوو کە لە درێژایی ڕێگاکان و لە هەر سێ فەرسەخ (٢١ کم) شوێنێکی حەسانەوە هەبوو کە بەردەوام هەندێ ئەسپ و ئێستری بۆ بە کرێدان یا ڕاکێشانی عارەبانە لێ بوو، بوونی ئەو شوێنانە گواستنەوەی پۆستە و سەفەری هاووڵاتیانی لە شارێکەوە بۆ شارێکی تر زۆر خێرا کردبوو.

سەرەڕای ئەمەش لەو دامەزراوەیە بەشێك هەبوو کە لە بێ تەلی ئەمڕۆ دەچوو و پێکهاتبوو لە کۆمەڵێك بورج و لە مەوداکانی دیاریکراوی لە یەکتر دوور دروستکرابوون، لە ڕۆژدا بە ڕێگەی نیشانەکان و لە شەویشدا بە ڕێگەی مەشخەڵ و ڕووناکی ئاگاداریان دەدا بە یەکتری. دوای دەستپێکردنی ڕۆنێسانس لە ئەورووپا، پەرتووکەکانی نووسەرە یۆنانییەکان سەبارەت بە ئێران کەوتە بەردەستی ئەوان کە بە ڕێگەی ڕووناکی و مەشخەڵەکانەوە، لە سەر بورجەکانەوە هەواڵیان ناردووە و بە زانینی ئەو زانیاریانە جۆرێك بێتەل کە بە ناوی داهێنەرەکەیەوە بە (چاپ) ناونرا، لە لایەن ئەوانەوە هاتەکایەوە.

لە نووسینەکانی مێژوونووسە یۆنانییەکانەوە دەزاندرێت کە داریوش بۆ هەواڵ ناردن سوودی لە کۆتر وەرگرتووە، بەڵام ئەم سوود وەرگرتنە کەمتر بووە. چونکە کۆتری نامەبەر تەنها بۆ لای هێلانەکەی دەفرێت و بە شەویش ناتوانێ بفرێت، بۆیە تەنانەت ئەگەر نامە لەسەر کاغەزی پاپیرۆسی میسریش نووسرابوایە، ناردنی بەو ڕێگەیە سەرکەوتوو نەدەبوو.لە سەردەمی هەخامەنشییەکان نامە درێژەکانیان لە سەر (تیماج) دەنووسی و بە هۆی درێژی و پانی تیماج، ئەوەندە گەورە دەبوو کە نەدەتواندرا بە هۆی کۆتر بنێردرێت، پاپیرۆسی میسریش لە کەشوهەوای شێداردا بە هۆی تەربوونی ناوەڕۆکەکەی دەسڕایەوە، بۆیە داریوش سوودوەرگرتن لەو جۆرە بێتەلەی پێ باشتر بوو.

دامەزراوەیەکی تری بەردەوام کە داریوش دایمەزراند، تاپۆ[٤] بوو و هەموان پێیانوایە دامەزراوەیەکی تازەیە، ئەو دامەزراوەیە پێشتر لە ئێران نەبووە و لە میسر لە زنجیرەی چوارەمی فێرعەونەکانی ئەو وڵاتە واتە (٣٥٠٠ پ. ز) تاپۆ هەبوو و کاری تۆماری تەواوی مۆڵکەکانی دەکرد و کاری تۆمار و پێوانەی زەوییەکان گرێدراوی یەکتر بوون.

ئەندازیارە میسرییەکان زۆر بە وردی زەوییە کشتوکاڵییەکانیان دەپێوا و وێنەکەیان دەکرد کە چوارگۆشە یا لاکێشە و هتد...، پێوەری ئەوان (زەرع) بوو و دوای ئەو کارانەیان، وێنە و پێوانەی زەوییەکەیان لە سەر دوو قاپی گڵێین بە ڕێنووسی وێنەیی میسری دەکرد و یەك لەو دوو قاپە کە دەبۆوە تاپۆ دەدرایە خاوەنەکەی و ئەوی تر لە دامەزراوەی تاپۆ هەڵدەگیرا.

دوای ئەوەی میسرییەکان لە رووەك کاغەزی پاپیرۆسیان دروستکرد، تاپۆکەیان لە سەر کاغەزێك دەنووسی و لە دەفتەریشدا تۆماریان دەکرد، کاتی مردنی جووتیارێك ڕاستەوخۆ زەوییەکەی دەبەخشرایە میراتگرەکانی و کەس نەیدەتوانی بەرهەڵستی لەو کارە بکات، تەنها لە تاپۆکە ناوی خاوەن دەگۆڕا و لە تۆمارەکەش بە هەمان شێوە دەکرا.

تاپۆ لە وڵاتی میسر ئەوەندە سوود بەخش بوو کە دوای هەزاران ساڵ لە برەو گرتنی تاپۆ لە میسر و بە وتەی هیرۆدۆت، کێشەی زەوی لە میسر نەبوو، کەس زەوی داگیرنەدەکرا و بۆ وەرگرتنەوەی زەوییەکەشی پێویستی بە دادوەر نەبوو. پاشای هەخامەنشی کە ماوەیەك لە میسر مابۆوە، زۆر بەو بابەتە سەرسام بوو و بڕیاریدا کە دەقی ئەو کارە لە سنووری ئیمپراتۆریەتەکەی بەردەوام بکات.

ئێستا لە موزەخانەکانی بەریتانیا و فەرەنسا، هەندێ لەو تاپۆیانە ماون کە دەگەڕێنەوە بۆ هەزار و پێنج سەد ساڵ پێش زایێن و تەنانەت ئەوانەی لە دامەزراوەی تاپۆ کاردەکەن، ناتوانن ڕەخنەی لێ بگرن، لەو تاپۆیانەدا سەرەڕای دیاریکردنی پانتایی زەوییەکە و شێوەکەی، ناوی خاوەن و کەسوکاری و دراوسێکانی زەوییەکە هەبوو و تەنانەت مێژوو و زنجیرەشی هەبوو.

---

(٤) (داریوش ئەوکاتەی لە میسر دەژیا و فەرماندەی هێزەکانی کەمبۆجییە بوو، سەرسام بووە بە زۆرێك لە زانستەکانی خەڵکی میسر وەك هەرەمەکان، ئەستێرەناسی، دروستکردنی سایلۆ و تاپۆ و ... هتد و دوای گەڕانەوەی بۆ وڵاتەکەی، هەوڵیدا سوود لەو زانستانەی میسر و لەبەر گیراوەکانیان وەربگرێت لەسنووری ئیمپراتۆریەتەکەی و زۆرێك لەو دامەزراوانەی کە دایمەزراندن لە سنووری دەسەڵاتیدا لەبەر گیراوەی میسرییەکان بوون، وەرگێر بۆ کوردی.)

داریوش لەساڵی دەیەمی پاشایەتی خۆیدا، هەندێ زەوی کشتوکاڵی بۆ مەبەستی ئاوەدانکردنەوەیان بە هەندێ جووتیار بەخشی و بۆ ئەوەی دوای مردنیان کەس توانای زەوت کردنی زەوییەکانی ئەوانی نەبێت فەرمانی کرد بە هەمان شێوەی میسرییەکان، تاپۆیان بۆ دروست بکرێت و ئەو هەنگاوە بۆوە سەرەتای دروستبوونی دامەزراوەی تاپۆ لە دەسەڵاتی هەخامەنشییەکاندا. کەتزیاسی مێژوونووس کە باسی ئەو بابەتە دەکات، بەردەوام دەبێت و دەڵێت: چیتر بە دەسەڵاتەکان نەیاندەتوانی زەوی بێ دەسەڵاتەکان داگیر بکەن، چونکە ئەوان خاوەنی تاپۆ بوون.

بەردەوامبوونی دامەزراوەی ئاو و دامەزراوەی تاپۆ، پێویستی بە بوونی ئامارێکی باش هەبوو تا بزانن ژمارەی پیاوان و ژنان چەندە و چ پانتاییەکیش لە زەوی هەیە.

سۆئێتۆنی مێژوونووس دەڵێت لە سەردەمی داریوش و خەشایارشای کوریدا تەنانەت ئاماری ئاژەڵە ماڵیەکانیش هەبووە و ساڵانە دەزاندرا ژمارەی ئەسپ و مانگاکان چەندە.

پێشتر بە کورتی ئاماژەمان بە کارەکانی داریوش لە هندستان کرد و لەو بەشەدا درێژەی باسەکەتان بۆ دەخەینەروو.

زاندراوە داریوش ناوی بیست و سێ وڵات لە کەتیبەی بێستوون لە کرماشان دەبات کە لە ژێر دەسەڵاتی ئیمپراتۆری هەخامەنشی بوونە و ناوی هندستان لەو کەتیبەدا ناهێنێت، بەڵام لە کەتیبەی گۆڕی داریوش کە لە تەختی جەمشید بەر دەست کەوتووە، ناوی ئەو وڵاتە هاتووە.

هندستان لە سەردەمی داریوش بەشێك بووە لەو وڵاتانەی ژێردەستی هەخامەنشییەکان بوونە و تەنها دەسەڵاتداری خۆجێیی هەبووە، داریوش نەیتوانی تەواوی هند بخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆی و دوای ئەویش تەواوی ئەو کەسانەی لەشکرکێشیان بۆ ئەو وڵاتە کرد، هەر لە ئەسکەندەر و سوڵتان محمودی غەزنەوی و تیمووری لەنگ تا دەگاتە نادرشا نەیانتوانی هەموو ئەو وڵاتە بخەنە ژێر ڕەکیفی خۆیان و جگە لەمەش تا جەنگی دووەمی جیهانیش وڵاتی (بیرمانی) کە ئێستا سەربەخۆیە، بەشێك بوو لە هندستان و تا ئەو دواییانە واتە تا جەنگی دووەمی جیهانی یەك بووە لە ویلایەتەکانی هندستان.

ناوچەی (سێند و پونجاب) کە بەشێك بوون لە هندستان، لە سەردەمی داریوش بوونە بەشێك لە ئیمپراتۆری هەخامەنشی و لە ماوەیەکی کورتدا دووجار دووچاری قاتی و نەبوونی بۆوە، لە وەرزی هاوین کە وەرزی (بەرسات) واتە باران بوو، وێڕای ئەوەی زێیە پڕ ئاوەکان کە

سەرچاوەیان لە شاخەکانی باکووری هندستانەوە بوو، دەهاتن و دەڕۆیشتنە ناو دەریا، بەڵام باران نەباری.

داریوش بڕیاریدا بۆ بەربەرەکانی لە گەڵ قاتی لە هندستاندا کە تا ئەو دواییەش بۆ گەل و دەوڵەتی هند مایەی کێشە بوو، دەست بۆ کارێکی بنەڕەتی ببات، بۆیە پسپۆرێکی بواری ئاوناسی به ناوی (ئێستیلاکس) کە یۆنانی بوو و لە دامەزراوەی ئاوی هەخامەنشی کاری دەکرد، بە سەرۆکایەتی لیژنەیەك نارد بۆ هندستان تا لێکۆڵینەوە لە ئەگەری دروستکردنی چەند ئاوبەندێك لەسەر زێی گەورەی سێند بکەن.

دوای گەیشتنی ئێستیلاکس لە گەڵ ئەو لیژنەیە بۆ هندستان، کەوتەکار و لێکۆڵینەوەی لەو بابەتە لە سەرچاوەی زێیەکە تا دەگەیشتە کۆتاییەکەی واتە نزیك شاری ئێستای کراچی کرد و ڕاپۆرتێکی بۆ داریوش ئامادەکرد کە وەك ڕاپۆرتی کەسێکی پسپۆری بواری ئاو و جوگرافیا بوو کە دەرچووی یەك لە زانکۆکانی ئەو سەردەمە وابوو.

یەك لە بەشە سەرەنج ڕاکێش و سەرسورهێنەرەکانی ئەو ڕاپۆرتە کە سەبارەت بە سێند بۆ داریوش خراوەتەروو، ئەوەیە کە ئێستیلاکس شوێنە جیاکانی زێیەکەی بە پێوەری هێڵە ئاسۆییەکانی زەوی لە ئاست بابلدا پێوابوو و دەڵێت کە فلان شوێنی زێیەکە دەکەوێتە بەرانبەر فلان هێڵی ئاسۆیی بابل.

ئەو ڕاپۆرتە زۆر گرنگە و بە پێویستی دەزانین بۆ زانینی ئەوەی چ پیاوانێك[٥] لە ڕۆژهەڵات ژیاون، هەندێ بەشی بخەینە بەر دیدەتان:

(سەرچاوەی زێی سێند لە شاخی کیلاتە کە یەکێکە لە شاخەکانی هیمالایا و دوای بیست و پێنج فەرسەنگ لە بەردەوامبوونی زێیەکە، زێیێکی تر بە ناوی (سۆتلەج) کە ئەویش سەرچاوەکەی لە شاخەکانی هیمالایایە تێکەڵی دەبێت. ئەو زێیە بە درێژایی پەنجا فەرسەنگ لە سەرچاوەکەیەوە بەرەو باکووری ڕۆژئاوا بەردەوام دەبێت و لەو مەودایەدا ئەو زێیە بە (سەنگاب) ناو دەبرێت. دواتر زێیێکی تر بە ناوی (زێی گەڕ) تێکەڵی دەبێت و دواتر دە فەرسەنگی تر بە درێژایی باشووردا دەڕوات و دەگاتە ناوچەی کشمیر.

---

(٥) ( ئێستیلاکس بە ڕەچەڵەك یۆنانی بووە و لە بەرانبەر مووچە کاری بۆ داریوش کردووە، زەبیحوڵڵا بیری چووتەوە ئەو ڕاپۆرتە لە لایەن کەسێکی یۆنانی ئامادەکراوە و بە هی ئەو خەڵکەی داناوە کە لە ڕۆژهەڵات ژیاون، لە بنەڕەتیش هەڵیداوە تەواوی توانا باشەکان بکاتە ئێرانی و لەناو ئێرانیش بە نەتەوەی فارسی زمان و ئەوەی نەخوازراویش بووە بداتە خەڵکی تر، وەرگێر بۆ کوردی.)

له دوای ئەو شوێنەوە ڕێگای ئەو زێیە دەگۆڕێت بەرەو ڕۆژئاوا و دواتر بەرەو باشووری ڕۆژئاوا و دەگاتە دۆلێك کە بەشێکە لە دۆڵەکانی بەشی ڕۆژئاوای شاخەکانی هیمالایا و ئەو دۆڵە لە هەندێ شوێن چوار هەزار زەرع قووڵە. زێی سێند بە درێژایی چل فەرسەنگ بەو ناوچە شاخاویەدا دەڕوات و ئێمە بە هۆی نەبوونی ڕێگا بۆ تێپەڕبوون، نەمانتوانی لەو ناوچەیە بەدواداچوون بۆ زێیەکە بکەین و بە دەورەی شاخەکەدا تێپەڕبووین و لە ناوچەیەك بە ناوی (دەربەند) کە زێیەکەی لێ دەهاتە دەرەوە، گەیشتینەوە سەر زێیەکە و دەربەند سەرەتای وڵاتی (پونجاب) بوو.

تا ئەو شوێنە هیچ جێگایەکمان نەدۆزییەوە بۆ دروستکردنی ئاوبەند باش بێت و لەو شوێنانە وێڕای ئەوەی ئاوی زێیەکە کەمە، بە هۆی نەبوونی زەوی کشتوکاڵی لە هەردوو لای زێیەکە، دروستکردنی ئاوبەند هیچ سوودی نابێت.

زێی سێند لە ناوچەی پێندی (ڕاوەڵ پێندی ئێستا) ئاوی زێی کابۆل بە ڕێگەی گەرووی خەیبەر لە ئەفغانستانەوە وەردەگرێت، بەرزی زێیەکە لە سەرچاوەکەی نزیکەی پێنج هەزار و پێنج سەد زەرعە، بەڵام کاتی گەیشتنی بۆ پونجاب بەرزییەکەی زۆر کەم دەبێتەوە و ڕێرەوەکەشی لەوێوە بەرەو باشوور دەبێت و لە ڕۆژئاوای پونجاب تێپەڕدەبێت.

لە ڕۆژهەڵاتی پونجاب زێیێك بە ناوی (جۆمنە) هەیە، کە لە نێوان ئەو زێیە و زێی سێند، پێنج زێی تر بە ناوەکانی (جەهلۆم، شەناب، ڕاوی، بیاس و سۆتلەج) هەنە کە هەر بە بۆنەی بوونی ئەو پێنج زێیە ئەو وڵاتە بە پۆنجاب واتە (پێنج ئاو) ناونراوە. ئەو پێنج زێیە بەیەك دەگەن و زێی گەورەی (پۆنج ناد) واتە (پێنج ئاو) پێکدەهێنن، ئەو زێیە گەورەیە لە ناوچەیەك بە ناوی (میتان کۆت) کە (١٦٢) فەرسەنگ لە دەریا دوورە، لە گەڵ زێی سێند تێکەڵ دەبنەوە.

پانی زێی سێند پێش تێکەڵ بوونی بە زێی (پۆنج ناد) نزیکەی شەش سەد زەرعە، ئاوی ئەو زێیە بە خێرایی سێ فەرسەنگ لە کاتژمێرێکدا (کاتژمێری سەردەمی داریوش دوو کاتژمێری ئێستا بووە) دەڕوات و قووڵی ئاوەکەش چوار تا پێنج زەرع دەبێت.

پانی زێی پونج ناد بەر لە گەیشتنی بە زێی سێند نزیکەی (١٧٧٥) زەرعە و قووڵیەکەی چوار تا پێنج زەرعە، بەڵام خێرایی ئەو ئاوە کەمە و لە یەك کاتژمێردا تەنها یەك و یەك چارەگی فەرسەخ خێراییەتی، دوای تێکەڵ بوونی ئەو دوو زێیە بە یەکتری پانی دەگاتە (٢٠٠٠) زەرع و لە کاتی زۆر بوونی ئاوەکەی ئەو پانییە لە شەش هەزار زەرع تێپەڕدەبێت، قووڵی زێیەکە لەو وەرزەدا لە هەندێ شوێن دەگاتە هەشت زەرع و خێراییشی دەگاتە هەشت

فەرسەخ لە کاتژمێرێکدا، لە هەموو وەرزەکان ئاوی زێی سێند وشکترە لە ئاو و هەوای ئەویَ و وەرزی سەررێژی و زیاد بوونی ئاوی ئەو زێیە بەهارە و لە مانگی پێنجەمی هەموو ساڵێك ئەو سەررێژییە کۆتایی پیَ دێت.)

بە مەبەستی ماندوو نەکردنی خوێنەری بەرێز، خۆمان پاراست لە باس کردنی هەردوو بابەتی دیاریکردنی شوێنەکانی ئەو زێیە بە هۆی پێوەرەکانی هێڵەکانی پانی زەوی لە ئاستی بابل و هەروەها لە ئەو شوێنانەی بۆ ئاوبەند دەشیان لەو زێیەدا. لە ڕاپۆرتەکەدا ئاوی زێی سێند لە زێیەکانی تر بە بەرد پێوراوە و مەبەست ئەو ڕێژە ئاوە بووە کە لە یەك چرکەدا بەردێك دەبڕێت کە هەر سیَ تیرەکەی واتە (درێژی، پانی و بەرزی) یەك بست بووە.

لە ڕاپۆرتەکەدا بە درێژی باس لەو جۆرە ماسیانە کراوە کە لەو زێیە ڕاوکران و تەواوی ئەو ئاژەڵانەی لە دەورەی دەژیان، باس لە شوێنی گەیشتنی زێیەکە بە دەریاش دەکات و ئێستیلاکس دەڵێت:"لە نزیك دەریا، زێی سێند دێلتایەك پێك دێنێت کە پانتاییەکەی نزیکەی سەد فەرسەنگی دووجا دەبێت و ئەو لقانەی لە کاتی گەیشتنی بە دەریا، ئەو لقانەی لێی دەبنەوە ناوچەیەك بە درێژایی چل و دوو فەرسەنگ لە کەنارەکانی دەریاکە داگیر دەکات، لەو شوێنە جەنگەلێکی پڕپشت لە هەموو جۆرەکانی دارەکانی گەرمێن هەیە. ئێستا و دوای دووهەزار ساڵ لە ئامادەکردنی ئەو ڕاپۆرتە، هێشتا پێویستە دەست خۆشی لەو کەسە بکەین کە ئامادەی کردووە.

بە وتەی هیرۆدۆت، داریوش بە مەبەستی زانینی ئەو شوێنانەی زێی سێند کە بۆ کەشتیوانی دەبن، ئێستیلاکسی ناردووە بۆ ئەویَ، بەڵام بەلانی کەم هەزار ساڵ پێش لەدایك بوونی داریوش، خەڵکی ئەویَ کەشتیوانیان لەو زێیەدا کردووە و ئەو شوێنانەیان ناسیوە کە بۆ کەشتیوانی شیاون. بەڵام مەبەستی داریوش لە ناردنی ئێستیلاکس بۆ دروستکردنی ئاوبەند بوو لە سەر زێیەکان تا ئاوی ئەو زێیانە بۆ ئاودێری زەوییە کشتوکاڵییەکانی هندستان بەکاربهێنێت، بۆ ئەوەی لە ساڵانی وشکەساڵیدا ئەو وڵاتە دووچاری نەبوونی و قاتی نەبێتەوە و هەر ئەم کارەشی کرد و ڕێگەی لە ڕوودانی قاتی لە هندستان گرت. ناکرێت بڕوا بکەین ئەفلاتوون لەو بارەوە هەڵەی کردووە، چونکە ئەو ماوەیەك لە ئێران ژیاوە و مێژووی ئێرانی لە سەرچاوەی باوەڕ پێکراوەوە وەرگرتووە.

هەندیَ لە وەرگێرەکانی پەرتووکە مێژووییەکەی ئەفلاتوون (کە نۆ بەرگە) بۆ زمانە ئەوروپییەکان، پێیانوایە ئەو دوای ئەوەی بوو بە شوێنکەوتەی یۆنان، دەستکاری هەندیَ لە

نووسینەکانی خۆی کردووە. بابەتی گەشتەکەی ئێستیلاکسیش لەوانەیە یەك بێت لەو نمونانەی کە ئەو لە مێژوودا گۆڕیویەتی.

پرۆفیسۆری بەریتانی (ڕاولین سۆن) کە مامۆستای مێژووی یۆنانی کۆنە لە زانکۆی ئۆکسفۆرد و بابەتی تایبەت بە هیرۆدۆتی لە فەرهەنگی زانیاری (بریتانیکا) نووسیوە، بڕوای وایە هیرۆدۆت ڕاستییەکانی شێواندووە. ئەو باسەی ئەو مامۆستایە نووسیویەتی ئەوەندە پشتڕاست بووە کە تەنانەت لە هەموو ئەو جارانەی ئەو فەرهەنگە زانیارییە چاپی نوێی لێ کراوەتەوە، هیچ دەستکاری نەکراوە و ئەمە وێڕای ئەوەی زۆرینەی بابەتەکانی ناو ئەو پەرتووکە هەندێ بەشیان لێ گۆڕدراوە.

هیرۆدۆت یەك ساڵ لە دوای مردنی داریوش لە شاری (هالیکارناس) کە یەك لە شارە یۆنانییەکانی ئاسیای بچووك و هاوکات بەشێك بووە لە ئیمپراتۆریەتی هەخامەنشی بوو، لە دایك بووە. بنەماڵەی ئەو لە بنەماڵە گەورەکانی شار هەژمار دەکرا و باوکی هیرۆدۆت لە لایەن پاشای هەخامەنشییەوە پایەی بەرێوەبەری پۆلیسی لەو شارە هەبووە. بە هۆی ئەوەی باوکی پلەی گەورەی هەبوو، ناردرا بۆ خوێندن و زمانی (پەهلەوی هەخامەنشی) فێربوو. لە تەمەنی بیست ساڵیەوە دەستی بە گەشتەکانی کردووە و لەوانەش گەشتی بۆ ئێران کردووە و لەبەر ئەوەی لە وڵاتەکانی شوێنکەوتەی هەخامەنشی دەناسرا و فارسی دەزانی، ئەویان وەك ئێرانی دەبینی.

هیرۆدۆت ماوەی یەکساڵ لە ئێران مایەوە و کۆشکی پێرسپۆلیس ئەوەندە سەرەنجی ڕاکێشا کە ماوەی دوو مانگ، ڕۆژانە دەچوو بۆ چاولێکردنی ئەو کۆشکە، بەڵام لە پەرتووکەکەیدا هیچی لە بارەی شکۆمەندی ئەو کۆشکە نەنووسیوە. ئەو لەو ماوەیە لە گەڵ زانا و هونەرمەندانی ئەوێ زۆر هەڵسوکەوت و دانیشتنی کردووە، ئەگەر ئەوکات مێژووی ئێرانیشی نەنووسیبێت، ئەوا پێویستییەکانی بەردەست کەوتووە.

هیرۆدۆت ماوەی هەڤدە ساڵ لە گەشت بەردەوامبوو و لەو ماوەیەدا گەشتی بۆ میسریش کرد و دواتر گەرایەوە بۆ شاری (هالیکارناس) کە شوێنی لەدایك بوونی بوو، بەڵام نەیتوانی لەوێ بمێنێتەوە و بەرەو یۆنان چوو و بۆوە خاوەن ڕەگەزنامەی یۆنانی، گێڕانەوەکان لە بارەی تەمەنی لە کاتی مردنی جیاوازە و چل ساڵ و پەنجا ساڵ و شەست ساڵ باسیکراوە و ئەگەر شەست ساڵی تەمەن کردبێت، زانیاریمان لە بیست ساڵی کۆتایی تەمەنی نییە.

لەوانەیە ببینە جێگەی ڕەخنە لەو بابەتەوە کە دەڵێین ئەفلاتوون دەستکاری هەندێ ڕووداوی مێژوویی کردووە، لە کاتێکدا ئەو بەناو بانگترین مێژووناسە. وەڵام بۆ ئەو رەخنەیە ئەوەیە کە

شێوە نووسینی ئەو بە ڕادەیەك پاراو بوو کە هیچ نووسەر و شاعیرێکی یۆنانی وەك ئەو بە پاراوی نەنووسیوە. هیرۆدۆت یەکەم کەس بووە کە بە ئەنقەست ناوی ئێرانییەکانی بە وەحشی بردووە و یەکەم کەسیش بووە کە ناوی یۆنانی لە مێژوودا هێناوە و تا ئەوکات ئەو وڵاتە بە (هەللا) ناودەبرا.

هیرۆدۆت لە سەردەمێك لە یۆنان دەژیا کە بە سەردەمی زێرینی یۆنان ناسراوە و ژمارەیەکی زۆری نووسەر و شاعر و وێنەکێش و پەیکەرتاش لەو وڵاتە دەژیان، تەنانەت بە هۆی وەرزش و ئۆلەمپیادەکان دانیشتوانی ئەو وڵاتە بە جوانترین مرۆڤەکانی ئەوکات دەناسران، لەگەڵ ئەوەشدا تەنانەت کەس نەیتوانی وەك ئەو بە جوانی بنووسێت.

بەڵام ئەو جوانی و شیرینییە لە نۆ بەرگە وەرگێڕدراوەکانی پەرتووکەکانی بۆ زمانەکانی تر دەرناکەوێت و کەس توانای نەبووە لە وەرگێڕاندا ئەو پاراویە بپارێزێت و ئەوەی بیەوێت تام لەو پاراویە بکات دەبێت دەقە یۆنانییەکەی ئەو پەرتووکانە بخوێنێتەوە، شێوە نووسینی ئەو مێژوونووسە بوو کە ئەوی بە باوکی مێژوو ناساند.

جگە لەوە شێوەی نووسینی پەرتووکە مێژووییەکانی بۆوە بەناو بانگ بوونی ئەو، ئەو مێژووی بە شێوەی پاراگراف نووسییەوە و هەر رستەیەکی مێژوویی لە ڕستەی تر جیاکردەوە و بۆ هەر رستەیەك ژمارەیەکی دیاریکرد. بۆ نموونە لە پەرتووکی (جەنگەکانی ئێران) ئەو هەزار و دووسەد پاراگرافی هەیە و هەر پاراگرافێك ژمارەی تایبەتی خۆی هەیە و هەریەکەشیان رووداوێکی مێژوویین. بۆیە هەر کەسێك چاو لە پەرتووکەکانی بکات، بەرلەوەی بیخوێنێتەوە، دەزانێت کە چەند رووداوی مێژوویی تێدایە.

هیرۆدۆت لە هەندێ لە بەشەکانی مێژوودا رووداوەکانی مێژووی ئێرانی گۆڕیوە و لە هەندێ شوێن هەڵەی کردووە و لەوانەیە چونکە هیرۆدۆت شوێنکەوتوویی هەخامەنشی وەلانا، لە پەرتووکەکانیدا باسی لە کارەکانی بیناکردنی ئاوبەندەکان بۆ مەبەستی ڕێگری لە قاتی لە هندستانی رۆژئاوا نەکردبێت. بەڵام خەڵکی تر و لەوانەش (سۆئێتۆن) دەڵێت: تێچووی بینا کردنی ئاوبەندەکان لە لایەن داریوش لەو وڵاتە لە ماوەی چەند ساڵێکدا دوو کرۆر داریك بووە.

کارەکانی بیناسازی و خزمەتگوزاری گشتی داریوش یەك و دووان نین تا بتوانیین باسیان بکەین، بەڵام بە هەمان شێوە کە لە ناو کارە معنەویەکانی ئەودا بابەتی دیار هەن، لە بابەتە خزمەتگوزاریەکانیش سێ کاری زیاتر لە کارەکانی تری دیارن، کە یەکیان بیناکردنی کۆشکی

پێرسپۆلیس و ئەوەی تر دروستکردنی ئاوبەندەکان بۆ ئاودێری لە هندستان و سێیەم دروستکردنی کەناڵێك بۆ بەیەك گەیاندنی هەر دوو دەریای قەلزەم و دەریای مەدیتەرانە.

ئەگەر بوترێت کە داریوش بە مەبەستی خزمەت کردنی خەڵك، کەناڵی میسر و کۆشکی پێرسپۆلیسی بینا نەکردووە، ئەوا لە بارەی ئاوبەنەکانی هندستان ناتواندرێت ئەو ڕەخنەیە بگرین و بێ گومانبۆ مەبەستی خزمەت بە هندەکان و نەهێشتنی وشکەساڵی ئەنجامدا و دوای ئەو کارە، چیتر دانیشتوانی هندی رۆژئاوا دووچاری نەبوونی و وشکەساڵی نەهاتن.

ڕووداوێك کە لە سەردەمی داریوش بە گرنگ نەزاندراوە و ئێستا گرنگی دەرکەوتووە، هاتنی زانای بەناو بانگی یۆنانی (فیساغۆرێس) بۆ ئێران و مانەوەیەتی لەو وڵاتە، ئەو لە گەڵ زاناکانی ئێران کووبۆتەوە و لە لایەن داریوش، مووچەی مانگانەی هەبووە. ئەوکات هێشتا ژیاننامەی فیساغۆرێس نەنووسرابۆوە و پلەی ئەویان بە نووسین بەرز نەکردبۆوە و دواتر و دوای مردنی، ئەویان گەیاندە پایەی خواوەندی و وتیان ئەو کوری خودایەك بە ناوی (ئاپۆلۆن) بووە کە لە شاخی (ئەلەمپ) چیاوە و زانایی و زانستی خۆی لەو وەرگرتووە.

بەو هۆیەوە بەشێك لە ژیاننامەکەی تێکەڵاوە بە ئەفسانە و ئەوانەی ویستوویانە فیساغۆرێس بگەیێننە پلەی خوداوەندی، هەندێ لە رووداوە گرنگەکانی ژیانیان نەنووسیوەتەوە و بۆیە نازاندرێت ئەو کەی لەدایك بووە و کەی مردووە. هەندێ بەرواری مردنی بە (٥١٠ پ. ز) و هەندێکی تر بە (٥٠٠ پ. ز) باس دەکەن.

فیساغۆرێس زانا و فەیلەسوف بوو و بە باوکی بیرکاری و ئەندازە لە یۆنان ناسراوە، هۆکاری کۆچی ئەو لە یۆنان بۆ ئێران بە وتەی خۆی دەگەڕایەوە بۆ ئەو ئارەزووەی ئەو بەرانبەر ژمارەکان هەیبوو و ئەو باوەڕانەی ئەو لەو بارەوە لە گەڵ ئایینی یۆنانییەکان ناکۆك بوون.

(ئاندریۆسیت) پرۆفیسۆری بەریتانی بەناو بانگ و مامۆستای فەلسەفە لە زانکۆی ئاکسفۆرد، کە هاوکات لێکۆڵەرە لە بارەی فیساغۆرێس، دەڵێت: ئەو پیاوە خوداوەند و جیهانی بە زیاتر لە ژمارە نەناسیوە و باوەڕی وابووە کە خوا و جیهان ژمارە و ئەندازەن، چونکە لە ناوکی خانەوە تا کاکێشان ڕیزی ژمارە و پانتایی ئەندازە دێنە بەرچاو و تەنانەت وزەش شتێك نییە جگە لە ڕێککاری ژمارەکان.

ئاندریۆسیت دەڵێت ئەو بیرۆکەیە لە رووی زانستی بۆ ئێمە جێگەی لێکۆڵینەوەیە، بەڵام بۆ یۆنانییە کۆنەکان تێگەیشتنی ئەستەم بوو و چونکە فیساغۆرێس ئەوەی دەیوت لەگەڵ ئایینی ئەوان ناکۆك بوو، بە بێ دینیان دەناسی. بە باوەڕی یۆنانییە کۆنەکان، یەك خودای گەورە و

کۆمەڵێك خوای بچووك هەبوون کە هەموو خوا بچووکەکان بەرفەرمانی خوداوەندی گەورە بوون، هەموویان لە شاخی (ئەلەمپ) نیشتەجێ بوون و لە مرۆڤی ئاسایی دەچن، هەندێکیان مێ و هەندێکیان نێرەن.

فیساغۆرێس دوای ئەوەی لە لایەن یۆنانییەکان بە دەرچوو لە ئایین ناسرا، وڵاتەکەی بەجێ هێشت و رۆیشت بۆ ئێران. ئاندریۆسیت دەڵێت: پێش فیساغۆرێس زۆر زانای تر سەبارەت بە خوایانی یۆنان بابەتی ناکۆکیان وتووە بەڵام ناچار نەبوون لە وڵاتەکەیان بڕۆن، بەڵام فیساغۆرێس بە هۆی پێگەی بەهێز و گرنگ بوونی وتەکانی لە یۆنانی کۆن، ناچاربوو ئەو کارە بکات، ئێستا دوای بیست و پێنج سەدە لە کۆچی ئەو زانایە بۆ ئێران و دەرکەوتنی گرنگی بیرکاری لە جیهان، گرنگی ئەو کۆچە دەردەکەوێت.

چونکە لە ئێران لە سەردەمی داریوش رێز لە زاناکان دەگیرا و لە لایەکی تر کەس بە هۆی باوەڕی ئایینی دووچاری ناراحەتی نەدەهات، فیساغۆرێس کۆچ بۆ ئەو وڵاتەی هەڵبژارد. مێژووی هاتنی ئەو بۆ ئێران دیاری نەکراوە و تەنها زاندراوە پێنج ساڵ پێش مردنی ئەو وڵاتەی جێهێشت و لە ناوچەی (مێتاپۆن تۆم) نیشتەجێ بوو و کاتی رۆیشتنی لە داهاتەکەی لە ئێران کەمێك پاشکەوتی هەبوو، چونکە ئەوەی بە مانگانە وەریدەگرت زیاتر بوو لە پێداویستییەکانی.

(مێتاپۆن تۆم) وڵاتێکی سەربەخۆ بوو کە دەکەوتە باشووری ئیتاڵیا و کەنارەکانی ئێستای (تارانت)، کەشتییە بازرگانی و سەربازییەکانی هەخامەنشی هاتووچۆی ئەو وڵاتەیان دەکرد و فیساغۆرێس ماوەی پێنج ساڵ لەو وڵاتەدا ژیا و دواتر بە ئارامی مرد.

ئەگەر مێژووی کۆچی ئەو پیاوە بە (٥٠٠ پ. ز) دیاربکەین، ئەو پیاوە زانایە هەشت ساڵ و لەوانەیە بیست ساڵ لە ژێر دەسەڵاتی هەخامەنشییەکان بە ئاسوودەیی سەرگەرمی نووسین بوو، لەوانەیە بتوانین بڵێین ئەگەر ئەو دەرفەتە بۆ ئەو زانایە نەهاتبایە پێش، لەوانەبوو نەتوانێت پەرتووکەکانی خۆی بنووسێت و دوای مردنی دانیشتوانی جیهان سوودیان لێ ببینن و داریوش بە وەرگرتنی ئەو پیاوە زانایە و ئاسوودە کردنی لە بواری مووچەوە، خزمەتی بە زانستەکانی مرۆڤ کرد و میراتی زانستی فیساغۆرسی بۆ نەوەکانی داهاتوو پاراست.

پێش پرۆفیسۆر ئاندریۆسیت خەڵکی تر هەبوون کە وتوویانە کۆچی ئەو زانایە لە یۆنانەوە هۆکاری سیاسی هەبووە، بەڵام بە گشتی داریوش ماوەیەك ئەو زانایەی پاراست و کات و

ئامرازی پێویستی بۆ ئەو دابین کرد تا بتوانێت زانستی خۆی بنووسێتەوە و بۆ نەوەکانی داهاتووی بەجێ بهێڵێت.

ساڵەکانی کۆتایی تەمەنی داریوش، وڵاتەکەی ببوو بە شوێنی هاتنی زاناکانی جیهان لە هەموو لایەکەوە بۆی و هەموان دەهاتن تا ئەوەی لە زانست و هونەر هەیانە لەو شوێنە بیفرۆشن تا بە باشی ژیان بەسەر بەرن، سێئۆتۆن ناوی سێ زانا دەبات کە لە ساڵانی کۆتایی تەمەنی داریوش چوونەتە ئێران و هەموویان لە زانایانی وڵاتانی ترن.

پێش ئەوەی کۆتایی بە باسی کارەکانی زانستی و فەرهەنگی و فێرکاری و ئاوەدانکاری داریوش بێنین و باسی سیاسەتی داریوش بکەین، پێویستە چەندێکیش باس لە باج لە سەردەمی ئەو بکەین و لەو بارەوە دوو ڕا لەناو مێژوونووسەکاندا هەیە، هەندێك لایانوایە ئێرانییەکان باجیان نەدەدا و تەنها ئەو نەتەوانەی ژێردەستەیان بوون دەبوایە باج بدەن و ڕایەکەی تر پێیانوایە کە ئەوانیش باجیان بەخشیوە بەڵام کەمتر لە نەتەوەکانی تر بووە.

ئەوانەی کە پێیانوابوو ئێرانییەکان باجیان داوە، ڕێژەی باجەکەیان بە پێوەری زێڕ و زیو و بۆ ماوەی چەند ساڵ دیار کردووە و باجی شتومەك و دانەوێڵە هەر لە شتومەك و دانەوێڵەکان وەرگیراوە و ڕوونەداوە کە ئاژەڵ لە جیاتی باج وەربگیرێت، چونکە دەزاندرێت کاتێك خاوەن ئاژەڵ ناچار بە بەخشینی ئاژەڵەکەی دەبێت، ناتوانێت چیتر داهاتی هەبێت.

ئەگەر کارەساتە سروشتییەکان لە ناوچەیەك ڕوویاندابوایە و بووبانە بە هۆکاری نەبوونی دانەوێڵە و بەروبووم، ئەو ناوچەیە لە باج دەبەخشران و ئەو بەخشرانەش بۆ تەواوی سنووری دەسەڵاتی هەخامەنشی بوو. باوەڕپێکراوە ناوچەییەکان باجیان کۆدەکردەوە و بۆیە ناچار نەبوون کۆکردنەوەی باج تێچووی زۆری هەبێت. بە هۆی باشی باری دارایی خەزێنەی شاهانەوە لە کاتی لەشکرکێشی گەورەدا باجی زیادە نەدەخرایە سەر خەڵك.

(ڕاولین سۆن) مامۆستای مێژووی کۆنی یۆنان لە زانکۆی ئۆکسفۆردی بەریتانی دەڵێیت لە سالانی کۆتایی تەمەنی داریوشدا، بەردەوام خەزینەی شاهانە بەرانبەر بە دەملیۆن لیرەی بەریتانی زێر و زیوی لێ بووە. پارەی زێر و زیوی هەخامەنشی لە ڕووی کانزاییەوە زۆر باش بوون و ساختەکاریان تێدا نەکرا بوو، بۆیە هەرگیز لە مەحەك نەدەدران و جێگەی باوەڕی هەموان بوون.

لە ماوەی شەش ساڵی یەکەمی پاشایەتیدا، داریوش بەردەوامبوو لە سەرکوت کردنی یاخی بووەکان و ئێمە بۆ ماندوو نەکردنی خوێنەر تەنها چەند دانەیەك لەو یاخی بوونانەمان خستەبەر

دیدەتان و تەنها ناوی هەندێك لە ئەوانمان هێنا. بە وتەی مێژوونووسان لەو ماوەیەدا (٢٤٢) لە سەردار و میرەکان لە دژی یاخی بوون و داریوش یا بۆ خۆی و یا سەردارەکانی دەچوون بۆ نیشاندنەوە و سرکوت کردنی یاخی بوونەکە.(٦)

مرۆڤ دەکەوێتە سەرسوڕمانەوە کە چوون داریوش توانیویەتی لە ماوەی شەش ساڵدا (٢٤٢) یاخی بوون لەناو ببات کە دوو لە ئەوان لە سوارکارەکانی رۆژئاوای خۆی بوون و یەکیشیان خۆی بە بەردیەی برای کەمبۆجییە ناساند و هەموویانی لەناو برد. هەر یەك لە یاخی بووەکان ئەگەر داوای لێخووشبوونی کردبوایە، ئەوا بەر لیٚ خۆشبوون دەکەوت.

کەتزیاس هۆکاری سەرکەوتنی داریوش بەسەر یاخی بووەکاندا دەگێڕێتەوە بۆ لێبووردەیی ئەو و مونتسکیوی نووسەری پەرتووکی (رووح القوانین) ئەو کاتەی لە پەرتووکەکەیدا باسی لێبوردەیی دەسەڵاتداران دەکات، لێبوردەیی بە یەك لە هۆکارەکانی بەهێز بوونی پایەکانی دەسەڵاتی پاشاکان دەزانێت. بە وتەی کەتزیاس چونکە داریوش یاخی بووەکانی دەبەخشی و هەرگیز ئەوانی نەدەخستە بارێکەوە کە بە هۆی نائۆمێدی تا دوایین هەناسە بەرگری بکەن و ئەوانیش دەیانزانی ئەگەر داوای لێبوردن بکەن ، دەکەونە بەر لێبوردەیی.

بۆیە یاخی بووەکان لە یاخی بوون پشیمان ببنەوە، دەکەونە بەر لیٚ خووشبوون و بۆیە هیچ کات بەرگری تا مردنیان نەدەکرد،بەڵام ئەوانەی بەرگریان دەکرد بە شێوازی زۆر ترسناك لە لایەن داریوش دەکوژران. هەر ئەو سزا ترسناکانە بوو کە رێگەی بۆ هیرۆدۆت و دیۆدۆر و چەند مێژوونووسی تر کردەوە تا بڵێین داریوش قوتابخانەی تایبت بە جەلادی هەبووە و لەو قوتابخانەیەدا خەڵك پەروەردەکراوە تا بن بە جەللاد و بتوانن بە دڵرەقانەترین شێوەکان ئەو کەسانە بکوژن کە تاوانیان کردووە.

لە سەردەمی داریوش و نە دوای ئەو لە ئێران قوتابخانەی لەو شێوە نەبووە، بەڵام سزای توندی یاخی بووەکان بابەتێکە حاشا هەڵنەگرە. ئەگەر مێژوونووسانی دنیای کۆن سەردەمانی

---

(٦) (لە سەرتادا زەبیحوڵڵا دەڵێیت داریوش بە کووبوونەوەی تەواوی سەردار و میرەکانی سنووری هەخامەنشی، بۆ پاشایەتی دیاریکرا و باسێکی ورد لەوبارەوە پێشکەش دەکات کە نامانەوێت دووبارەی بکەینەوە، بەڵام هەر خۆی باس لە ٢٤٢ یاخی بوون دەکات کە ئەگەر وردببینەوە دەکرێت بگوترێت تەواوی ناوچەکانی ژێردەستی هەخامەنشی هەر ئەو ژمارە یا کەمێك زیاتر لە میر و سەرداری هەبووە و تەنانەت دەرکەوتووە کە نەتەنیا ئەو بابەتە راست نییە، بەڵکو داریوش زۆردار بووە و لە مامەڵە لەگەڵ ئەوانەی دەسەڵاتی ئەویان پەسەند نەکردووە، زۆر دڵرەق و بیٚ بەزەییانە جووڵاوەتەوە. وەرگێر بۆ کوردی.)

تازەیان دەبینی، داریوشیان سەرزەنشت نەدەکرد کە بۆچی یاخی بووانی بەم شێوە ترسناکانە دەکوشت، چونکە لە رۆژئاوا لە نیوەی دووەمی سەدەی هەژدەهەم کە سەدەی زانست و پیشەسازی بوو و لە وڵاتانی وەك فەرەنسا و بریتانیا فەرهەنگی زانیاری دەنووسران و کۆمەڵە نووسەرێك لە بەریتانیا و فەرەنسا و ئاڵمانیا هەبوون کە نەتەوە ئەوروپییەکان شاناز بوون پێیانەوە، تاوانباران چوار پارچە دەکران.

گەنجێك بە ناوی (دامین) بە هۆی ئەوەی بە قەڵەم دادەرێك هێرشی بردە سەر لۆیی پازدەهەم و بە سووکی بریندار کرد، بە زیندوویی چوار پارچە کرا.(٧)

بە شێوەیەکی گشتی سزا سەختەکان لە رۆژهەڵات و لە رۆژئاوادا بەشێك بوونە لە سیستەمی حکومەتەکان و ئەو کەسانەی بانگەشەی دەسەڵاتیان کردووە بە شێوەی زۆر درندانە کوشتووە تا هاوشێوەی ئەوان دەرنەکەونەوە و لە وڵاتانی فەرەنسا و ئیسپانیا لە گەرمەی سەدەی هەژدەهەمی زایینی، ئەشکەنجەدانی تاوانباران بەشێك بوو لە نەریتەکانی حکومەت و یاسای تایبەتی هەبووە.

مێژوونووسانی کۆنی یۆنان و بە تایبەتی هیرۆدۆت و پلۆتارك کە تەواوی نووسینەکانی لە هیرۆدۆت وەرگرتووتەوە، لە پەرتووکەکانیاندا زۆرینەی پاشاکانی هەخامەنشیان بە زۆڵ ناساندووە و چونکە هیچ سەرچاوەی تر جگە لە هی یۆنانییەکان لەبەر دەست نییە، بۆیە دەبێت بە ناچاری وتەکانیان بە ڕاست بزانین.

لە نێوان پاشاکانی هەخامەنشی تەنها یەك پاشا ئەویش (داریوشی سێ یەم) لەو وتانەی یۆنانییەکان پارێزراو بووە و ئەویش دوای ئەوەی بە دەستی ئەسکەندەر شکستی خوارد، لە

(٧) (زەبیحوڵڵا لەو چەند پاراگرافەدا بیانۆ بۆ خەراپە و توندوتیژی دەسەڵاتدارانی هەخامەنشی و بە تایبەتی داریوش دەهێنێتەوە و دەڵێیت هاوشێوەیان لە هەموو سەدەکان هەبووە، بەڵام زاندراوە هەمیشە دەسەڵاتداری لێبووردە و باش هەبووە و پاساوێك نییە بۆمان دەربخات پاشاکانی هەخامەنشی و بە تایبەتی داریوش دوور بووە لە سزای وەحشیانە. جگە لەوە ناکرێت مرۆڤ خۆی بە هۆی هەبوونی خەراپە لە لایەن خەلکی تر بچووك بکاتەوە و ئەمە هەرگیز لە یاساکانی مرۆڤایەتیدا دروست نەبووە و مێژووش وەك خۆی دێت و کەس ناتوانێت خەراپەکان بشارێتەوە یا چاکەکان بگۆڕێت، لە لایەکی تر دەکرێت بگوترێت نەریتی توقاندن و کوشتن بەشێکە لە نەریتی دەسەڵات لە ئێران و تەنانەت لە ئێرانی ئێستاش ئەو بابەتە بەڵام بە شێوازی تازە و ناشیاوتر پەیرەو دەکرێت. وەرگێر بۆ کوردی.)

لایەن حاکمی هەرێمی باختر کە دەکەوتە باکووری خوراسانی ئێستا کوژرا و ئەسکەندریش پێستی بکوژی (داریوشی سێ یەم) واتە حاکمی ئەو هەرێمەی بە زیندوویی لێ کردەوە.

یۆنانییەکان بۆ تاوانبارکردنی پاشا هەخامەنشییەکان بە زۆڵ پشتیان بە هیچ بەڵگەیەك نەبەستووە و بەڵگەیەکیش نابینرێت کە گرنگ بێت و تەنانەت نەیانتوانیوە ناوی ئەو کەسانەش بنووسن و دەنگۆی تاوانبار کردنەکانیشیان لە رووی مێژووییەوە بایەخیان نییە. چونکە بە وتەی ئەو مێژوونووسانە، ئەو پاشایانە بە شێوەی فەرمی و بە ئاشکرا هاوسەرگیریان کردووە و دوای دانانی ناسنامە لە لایەن داریوش، منداڵەکانی پاشاکانی هەخامەنشی دەبوونە خاوەنی ناسنامە و جێنشینیش بە فەرمی دادەنرا، بۆیە جێگەی گومان نەدەمایەوە.

رێورەسمی هاوسەرگیری لە تەواوی جیهانی ئەوکات بە ئەنجام دەگەیشت، بەڵام لە هەموو شوێنێك رێورەسمەکان بە پێی نەریت بوون و بە پێی جەنگع نەبوون. بەڵام لە ئێران ژن و پیاو بە گرێبەست، هاوسەرگیریان دەکرد و رێورەسمی هاوسەرگیریش بە شێوەی ئاشکرا بوو.[٨]

بە داخەوە درۆ و بوختانە بێ بنەماکانی مێژوونووسە یۆنانییەکان تەنانەت لە هەندێ لە فەرهەنگەکانی ئەمرۆکە و لە ناویشیاندا فەرهەنگی بریتانیکادا نووسراونەتەوە، بەڵام هەڵبەت ئەوەی لە فەرهەنگەدا هاتووە لە خۆوە نەنووسراوە و لەوبارەوە تەنها وتەی خەڵکی تر گێردراوەتەوە. بەڵام پێویستە گوناهی مێژوونووسە یۆنانییەکان لە نووسینەوەی مێژوو ئاشکرا بکرێت تا نووسینەکانیان نەبنە سەرچاوە بۆ ئەوانی تر. زۆرینەی درۆکانی مێژوونووسە یۆنانییەکان بە شێوەیەك ئاشکران کە هەرکەسێك تێگەیشتنی هەبێت، لەکاتی خوێندنەوەیان بۆی ئاشکرا دەبێت کە درۆن.

باسی شەش ساڵی یەکەمی دەسەڵاتداری داریوش لێرە کۆتایی دێت و تەنها دەڵێین وێڕای ئەوەی لەو ماوەیەدا خەڵکی ئێران تێچووی جەنگ لە دژی یاخی بووەکان و ئەوانەی دەدا کە دەستدرێژیان دەکرد بۆ وڵات، بەڵام ئەو سەردەمە لە روانگەکانی ئاوەدانکردنەوە و چاکسازی بە یەك لە سەردەمە درەوشاوەکانی باستان دادەنرێت.

---

(٨) (ڕاست کردنەوەی ناراستییەکانی ناو مێژوو تەنها بە بەڵگەی سەلمێندراو دەبێت و ئەو بابەتانە بە تورەیی و هێرش کردن بۆ سەر ئەم و ئەو راست ناکرێنەوە، لە لایەکی تر ئەو بابەتە هەبووە کە زۆربەی پاشاکانی هەخامەنشی ژمارەی زۆری هاوسەریان بووە و هەندێجاریش وەك فیرعەوکانی میسر لە گەڵ برازا و ژن خوشك و ... هتد خۆیان هاوسەرگیریان کردووە و بۆیەش ئەو بابەتانە وتەی بەم شێوەیەیان لێکەوتووتەوە و وتراوە کە زۆربەی پاشا هەخامەنشییەکان کوری باوکیان نەبوونە و بە واتایەکی تر زۆڵ بوون. وەرگێر بۆ کوردی)

## داریوش و هێرشی سیتەکان

لە نێوان زێیێك کە لە کۆندا بە (تانائیس) ناودەبرا  و ئەمرۆ بە زێی (دوون) ناودەبرێت و لە ئەوروووپایە و زێیێك بە ناوی (ئیس تەر) کە ئێستا بە (دانووب) ناو دەبرێت و ئەویش دەکەوێتە ئەوروووپا، نەتەوەیەك دەژیان کە (حەوت سەدە پ. ز) یۆنانییەکان بە ناوی (سیت) ناساندیانن.

لە هەندێ لە مێژووە یۆنانییەکان بە (سۆلۆت) ناویان هاتووە، نابێت ئەو نەتەوە لەگەڵ (سەك) یا (سکاکان) کە لە رۆژهەڵاتی ئێران دەژیان بە هەڵە بەیەك نەتەوە بزانین و ئەوان نەتەوەیەك بوون کە لە سەرووی دەریای ڕەش دەژیان.

مێژوونووسانی ئێستا لەو باوەڕەدان کە سیتەکان لە نەتەوە ئارییەکانن، بەڵام لە پەرتووکە یۆنانییەکاندا سەبارەت بە ڕەچەڵەکی ئەوان هیچ نەنووسراوە و لە بەرانبەردا یۆنانییەکان زانیاری فراوانیان لەسەر ئەوان لە پەرتووکەکانیاندا نووسیوەتەوە.

سیتەکان سەحرا نشین بوو و لە رێگەی کشتوکاڵ و بەخێوکردنی ئەسپ و ماین ژیانیان بەرێوە دەبرد و لە جۆرە خانوویەکدا دەژیان کە ئەمرۆ بە (یۆرت) ناو دەبرێن. یۆرت لە (چیخی) گەورە و بەهێز کە لە داری گەز کە دارێکی سووکە دروستدەکرا و بە (لباد) دادەپۆشرا و هەرچەندە ئەو هەرێمەی ئەوانی لێ دەژیان، سارد بوو و بەفر و بارانی زۆری لێ دەباری بەڵام ئاو نەدەچوو ناو خانووەکانیان. دەتواندرا لە کەمتر لە چارەگە رۆژێکدا یۆرت کۆبکرێتەوە و بگوازرێتەوە بۆ شوێنێکی تر و دووبارە دابمەزرێندرێتەوە، لە وەرزی زستاندا ئەسپ و ماینەکانی خۆشیان لە ناو یۆرت دادەنا کە گەورەتر بوون.

هەندێ وایانزانیوە سیتەکان هەر ئەوانەن کە دواتر بە ناوی (خەزەر) ناوبران، بەڵام لە نێوان نەتەوەی سیت و نەتەوەی خەزەرەکان نەتەنها لە رووی شوێنی دانیشتن، بەڵکو تەنانەت لە هەڵکەوتەی رۆخسار و جەستەشدا جیاواز بوون و خەزەریەکان لە باکوور و باکووری رۆژهەڵاتی

دەریای خەزەر دەژیان و سیتەکان لە باشووری رۆسیا و لە ناوچەیەك لە نێوانی هەر دوو زێی (دوون و دانووب) بوون.

خەزەریەکان بە وتەی ڕەچەڵەك ناسەکان (مەنگۆلۆپید) بوون، واتە بە یەك لە تیرەکانی (موغۆل) هەژمار دەکران و سیتەکان یەك لە نەتەوە ئارياييەکان بوون.

هێشتا ڕەگەزی (ئسلاڤ) کە نەتەوەی رووسین، نەهاتبوون دەشتە بەرینەکانی ئەو وڵاتە و سیتەکانیش زانیاریان لە بارەی باکووری ئەو وڵاتەوە نەبوو و یا نەیاندەویست لە شوێنی ژیانی خۆیان کۆچ بکەن بۆ ئەوێ، کەواتە نابێت ئەو نەتەوەیە بە ئسلاڤ بناسین و رەچەڵەکی ئسلاڤەکان ماوەیەك دوای ئەوان هاتوونە رووسیا.

لەو مێژووەی کە ئێستا باسی دەکەین، سیتەکان لە زێی دانووب پەرینەوە و تەواوی ئەو خاکانەیان داگیرکرد کە دەکەوتە رۆژئاوای دەریای ڕەش تا دەگەیشتە ئەو ناوچەیەی بە کەنارەکانی گەلی (بۆسفۆر) ناسراون و دوای ئەو رووداوە بەردەوام بۆ وڵاتەکانی ئیمپراتۆریەتی هەخامەنشی کە کەوتبوونە رۆژهەڵاتی گەرووی بۆسفۆر دەبوونە مایەی کێشە.

دەسەڵاتدارە ناوچەییەکان و بە وتەی یۆنانییەکان (ساترابەکان)، لە توانایاندا نەبوو سیتەکان بشکێنن و بۆیە لە هەموو هێرشێکی سیتەکاندا، ئەوەی دەیانتوانی بە تایبەتی مێگەلەکانیان بە تالآن دەبرد و شارەکانیان وێران دەکرد. داریوش دووجار هێزی نارد بۆ یارمەتیدانی دەسەڵاتدارە ناوچەییەکان، بەڵام ئەوان دیسان نەیانتوانی رێگە لە سیتەکان بگرن.

دوو هۆکار بۆ بێتوانایی دەسەلاتدارە ناوچەییەکان هەبوو لە بەربەرەکانی سیتەکان، یەکەمیان ئەوە بوو کە سیتەکان لە کۆمەڵێك خێڵ پێکهاتبوون کە هەر خێڵێك سەرۆکی خۆی هەبوو و تەواوی ئەو خێڵانەش بەرفەرمان بوون بۆ پاشاکەیان و تەنها لە یەك شوێن نیشتەجێ نەبوون و لە تەواوی پانتایی هەرێمەکەیان جێگۆڕکێیان دەکرد و کاتێك هەستیان بە مەترسی کردبایە، یۆرتەکانیان کۆدەکردەوە و هەڵدەهاتن و دوای نەمانی مەترسی دەگەڕانەوە.

هۆکاری دووەم دەگەڕایەوە بۆ ئەوەی بەشێك لە سیتەکان دەریاوان بوون و لە رێگەی دەریا هێرشیان دەکردە سەر وڵاتەکانی ئاسیای بچووك کە بەشێك بوون لە ناوچەی دەسەڵاتی هەخامەنشییەکان، گەمییەکانی ئەوان لە داری سووك و بە شێوەی هێلەگی (کون کون) دروست دەکران و بەرلە ئەوەی بە پێستی ئەسپ داپۆشرێن و باربکرێن، ئەوەندە سووك بوون کە بە دوو نەفەر دەگواسترایەوە.

دوای ئەوەی گەمییەکانیان بە پێستی ئەسپ دادەپۆشی و سوار دەبوون، چارۆکەیان بەرز دەکردەوە و دەبوونە خاوەنی ئامێرێکی گواستنەوەی سووك و توند و تووڵ و زۆر خێرا و دوای ئەوەی لە گەمی دادەنیشتن و چارۆگەکانیان دەکردەوە، بە درێژایی کەنارە باشووریەکانی دەریای ڕەش هەر شوێنێکی ویستبایان هێرشیان دەکردە سەر و بە زانینی ئەوەی کە لەشکرێکی گەورە بۆ جەنگی ئەوان دێت، بە پەلە ئەوەی بە تالان بۆیان دەبردرا دەیانخستە ناو گەمییەکان و دەڕۆیشتن. لە کەنارەکانی دەریای ڕەشدا هیچ خێڵێك لە هێرش و تاڵانی دەریاوانە سیتەکان پارێزراو نەبوو، تەنها خۆیان نەبێت کە لە کەنارە باکووریەکان نیشتەجێ بوون.

چەندین جار هێزی دەریایی هەخامەنشی بە سەرۆکایەتی (هیست ئەسپ) لە گەلکانی (داردانێڵ و بۆسفۆر) دەپەڕییەوە و بەڵام نەیاندەتوانی سیتەکان تەنبێ بکەن، چونکە ئەوان بە بینینی کەشتیگەلی هەخامەنشی، بە هۆی گەمییە خێراکانیان لە ناوچەکە دەڕۆیشتن.

جەنگی کەشتییە جەنگییەکانی ئێران لە گەڵ گەمییە سووکەکانی سیت لە جەنگێك دەچوو کە لە سەردەمی ئێستادا چەند کەشتییەکی جەنگی قورس لە جۆری (کەشتی شکێن) کە هەریەکەیان چل یل پەنجا تەن قورساییان بێت، بیانەوێت لە گەڵ چەند کەشتییەکی جەنگی زەبەلاح و قورسی دوو تا سێ هەزار تەنی بجەنگن و بێ گومان لەو جەنگەدا کەشتی شکێنەکان وندەبن، چونکە کەشتییە گەورەکان هەرچەندە بەهێز و پتەون، بەڵام خێراییان کەمترە لە کەشتی شکێنەکان. ئەوانی تریش هێزەکەیان کەمترە، بەڵام خێراییان زۆرترە و بە سوود وەرگرتن لە خێراییەکەیان هەڵدێن.

کەشتییە جەنگییە قورسەکانی هەخامەنشی کە بە چارۆگە دەجووڵان، لە کاتی نەبوونی با دەبوایە بە سەڵبەلێدان بجووڵێن، نەیاندەتوانی بگەنە گەمییە خێراکانی سیتەکان و ئەوان بە زووترین کات لە دەریادا لەبەر چاو وندەبوون یا دەگەیشتنە شوێنە پارێزراوەکان.

هیست ئەسپ دوای چەندین هەوڵ بۆ تەنبێ کردنی سیتەکان، سەرکەوتوو نەبوو و ڕاپۆرتێکی بۆ داریوش نارد کە (ئاریس تاس) مێژوونووسی یۆنانی لە پەرتووکە مێژووییەکەی خۆیدا باسی کردووە.[1] ئاریس تاس دەڵێت دەریاسالاری ئێرانی ڕاپۆرتەکی بۆ داریوش نارد کە بەشە کورت و بە سوودەکەی بریتی بوو لە:

---

(١) (ئاریس تاس) مێژوونووس و شاعری یۆنانی، گەشتی لە تەواوی وڵاتانی کەناری دەریای رەش کرد بوو و بۆیە لە بارەی سیتەکان و تەواوی ئەو نەتەوانەی لە کەناری ئەو دەریایە دەژیان، زانیاری بە سوودی لە دوا خۆی بە جێ هیشتووە. بەرواری مردنی ئەو دیارنییە و گریمان وایە لە کاتی دەسەڵاتداری داریوش مردبێت، زەبیحوڵلا.)

(جەنگی ئێمە لە گەڵ سیتە ڕێگرەکان وەك جەنگی شمشێرە لە گەڵ ئەو پەرەمووچانەی مریشك کە بە شنینەوەی با بۆ هەموو لایەك دەروون و ئێمەش هەرچەندە بە شمشێر هەوڵ بدەین ناتوانین پەرەمووچەکان لەناو بەرین، ڕێگەی دروست ئەوەیە کە ئێمە کۆختەی مریشکەکانمان بەدەستەوە بێت تا چی تر پەرەمووچەکان نەیەنەدەرەوە.)

ماوەیەك بوو داریوش مەبەستی بوو هێرش بکاتە سەر وڵاتی سیتەکان و ئەویٚ داگیر بکات، یا بەڵێن وەربگرێت کە سنووری دەسەڵاتی هەخامەنشی لە لایەن ئەوانەوە نەخرێتە بەر هێرش.

ئەو بۆ هێرشکردن بۆ وڵاتی سیتەکان چەند ڕێگەیەکی لە پێش بوو کە یەکەمیان ڕێگەی خۆراسان بوو کە دوای تێپەڕبوونی لە ئەویٚ و تێپەڕین لە باکووری دەریای خەزەر، خۆی بگەیێنێتە وڵاتی سیتەکان و ئەو ڕێگەیە زۆر درێژ بوو و چەندین نەتەوەی لیٚ دەژیا کە لەوانە بوو لە گەڵ داریوش جەنگ بکەن و لەشکرەکەی لاواز بکەن یا لە ناوی ببەن، لەو ڕێگەیە بەردەوام ئەگەری نەمانی پەیوەندی لە ناو بەشەکانی لەشکری داریوش لە گەڵ پشتەوە هەبوو.

ڕێگەیەکی تر کە لە پێش داریوش بوو، ڕۆیشتن بە ڕێگەی قەوقازیا بۆ وڵاتی سیتەکان بوو و داریوش دەیزانی بۆ پەرینەوە لە شاخەکانی قەوقازیا دەبێت بەو ڕێگەیەدا بڕوات کە دواتر بە (باب الابواب) ناسرا، بەڵام ڕێگە باریك و پڕ پێچەکانی شاخەکانی قەوقازیا ڕێگر بوون لە بەردەم ڕۆیشتنی مەنجەنیقە گەورەکان و عارەبانە جەنگییەکان و گەیشتنیان بە وڵاتی سیتەکان. بۆیە داریوش بڕیاریدا لە ڕێگەی ئاسیای بچووك بڕوات بۆ ئەو وڵاتە، ئەو ڕێگەیە درێژتر بوو لە ڕێگەی قەوقاز، بەڵام درێژایی ڕێگەکە لە جادەی خیز و پان بوو و لەشکری داریوش بە بیٚ گرفت دەیتوانی تا کەناری دەریای مەرمەرە بڕوات.

ئەو ڕێگەیەی داریوش بڕیاری دابوو پیایدا بڕوات، لە سەردەمی کوروشدا تەخت کرابوو و لە سەردەمی داریوشدا خۆش کرابوو و خیزی خرابۆوە سەر و ببوو بە شارێیەك لە ئیمپراتۆریەتی هەخامەنشی، تەواوی مێژوونووسانی کۆن دەڵێن ئەو جادەیە ئەوەندە پان بووە کە چوار عارەبانە بەیەکەوە بە ئاسوودەیی توانیویانە لە ئەوێوە تێپەڕبن.

لەو ڕێگەیە ئاوی زۆر بەردەست دەکەوت و لە کەناری ڕێگەکە ناوەناوە میوان خانە هەبوو، ئەو میوانخانانە لە زمانی ئینگلیزی بە (ئین) و لە فەرەنسی بە (ئۆبراژ) ناو دەبرێن و واتای میوان خانەی سەحرایی دەدات، لە ناو هەخامەنشیدا بە (میز) ناودەبرا و لەو کاتەشەوە خاوەن میوان لە ناو فارسدا بە (میزبان) ناودەبرێت، ئەو میوان خانانە تا کۆتایی دەسەڵاتی هەخامەنشییەکان بەردەوامبوون.

داریوش ئەگەر بە ڕێگای ئاسیای بچووکدا ڕۆیشتبایە بۆ وڵاتی سیت، دەیتوانی یارمەتی لە دەسەڵاتدارەکانی ئاسیای بچووك وەربگرێت کە بەرفەرمانی داریوش بوون و لە ئەوان هێز و پێداویستی جەنگی کۆبکاتەوە. لە بەهاری ساڵی (٥١٠ یا ٥٠٩ پ. ز) داریوش بە سەرۆکایەتی سوپایەك لە ناوچەی (نسا) کەوتەرێ کە دەکەوتە پێدەشتی (ماهی دەشت) لە ناوچەی کرماشانی ئێستا.

زۆرینەی مێژوونوسە یۆنانییەکان وەك نەریت ژمارەی سەربازەکانی داریوش بە پێی ژمارەکانی ئەستێرە ناسی دیاری دەکەن و تەنها مێژوونووسی بەناوبانگ (سۆئێتوون) ڕای وایە ژمارەی سەربازەکانی داریوش نەوەد یا سەد هەزار کەس بووە و ئەو ژمارەیە لە دروست دەچێت. بەشی پیادەی لەشکر بەردەوام لە پێشەوە دەڕۆیشت تا لە سەربازە سوارەکان جێ نەمێنێت و مەنجەنیق و عارەبانەی جەنگیشیان پێبوو. لە ئاسیای بچووك هەندێ لە دەسەڵاتدارە هەرێمییەکان یارمەتی داریوشیاندا و کاتێك داریوش لەو ناوچەیە تێپەڕی لەشکرەکەی بەهێزتر بوو لەوەی کە لە ئێرانەوە هێنابووی و بەڵام نەزاندراوە ڕێژەی یارمەتییەکان چەند بوونە.

دوازدە شارەکەی ئاسیای بچووك کە لە ژێر دەسەڵاتی هەخامەنشی بوون، یارمەتی هونەری زۆری لەشکری داریوشیاندا و یارمەتی هونەری یەك لە پیاوانی یۆنانی بە ناوی (مەندرۆ کلێس) بۆ داریوش زۆر بە سوود بوو.

مەندرۆکلێس لە کاتی گەیشتنی داریوش بۆ کەنارەکانی بۆسفۆر و لە یەکەمجار، پیاوێکی چل و پێنج ساڵان بوو و چاوی شین و بەرزی بەژنی ئاسایی بوو و کاتێك لە تەنیشت ئێرانییە باڵابەرزەکان دەوەستا باڵای کورت دەردەکەوت. ئەو زانای بوارەکانی بیرکاری، ئەندازیاری و دەریاناسی بوو و زانیاری لەمەر هەموو دەریاکانی نزیك لە ئاسیای بچووك و یۆنان و لەوانەش (دەریای ڕەش، دەریای مەرمەرە و ئیجە و ڕۆم و گەلی بۆسفۆر) زۆر بوو. هەرچەندە هەڵکشان و داکشانی ئاو لەو دەریایانە وەك دەریا ئازادەکان بەهێز نییە، بەڵام ئەو دەیزانی هەرجارەی ئەوانە چەند بەرزی و نزمی ئاویان دەبێت.

داریوش لە کەناری گەلی بۆسفۆر وەستا، تا مەندرۆکێلسی ئەندازیاری یۆنانی بۆ ئەو لەسەر گەرووی بۆسفۆر پردێك دروست بکات و ئەو بتوانێت لەشکری خۆی لەو پردە بپەڕێنێتەوە و بچێت بۆ ناو ئەورووپا. کاتی گەیشتنی داریوش بۆ بۆسفۆر، کەشی گۆڕانی هەوا بوو و هەمووکات ئەو ترسە هەبوو کە با و شەپۆلەکانی ئاو، ئەو بەشەی پردەکە کە دروستکرابوو.، بڕۆخێنێت.

هێزی دەریایی هەخامەنشی بە فەرماندەیی دەریاسالار هیست ئەسپ یارمەتی زۆری مەندرۆکلێسیدا بۆ تەواو کردنی پردەکە و تەواوی ئەو گەمییە گەورانەی لە دروستکردنی پردەکەدا بەکارهات، لە لایەن هێزی دەریایی هەخامەنشی ئامادەکران.

پردێك کە لە بیست و پێنج سەدە پێش ئێستا دروستکرا، ئێستاش وەك شاکاری پیشەسازی دژمێردرێت و ئەو تەختانەی تیایدا بەکارهات، هەریەکەیان دوو گەمیی بە یەك دەبەستەوە و پانی پردەکە دوازدە (زەرع) و درێژییەکەی (٨٠٠ زەرع) بوو و تەنانەت تەنیشتیشیان بۆ پردەکە دروستکردبوو تا لە کاتی پەرینەوەدا هیچ سەرباز، ئەسپ یا عارەبانەیەك بە هۆی با یا شەپۆلەکانی ئاو نەکەوێتە خوارەوە.

ئەمرۆکە لە باریکترین شوێن درێژی گەلی بۆسفۆر لە هەشت سەد مەتر کەمترە و لە ئەوکاتدا ئەو درێژییە زیاتر بوو، تەواوی ئەو تەختانەی لەو پردەدا بەکارهاتن، بە بورغی و سەموونە توند کران و پێچەوانەی بیرکردنەوەکانی ئێستا، ئەو دوو ئامێرە لە داهێنانەکانی سەردەمی تازە نییە.

تەنها لە چەند رۆژی پێش کۆتایی هاتنی کاری پردەکە نەبێت، رێگەی هاتووچۆی کەشتییەکان نەگیرا و هاتووچوو هەبوو، چونکە مەندرۆکلێس پردەکەی لە هەر دوو کەنارەکانەوە دەست پێکرد و ناوەڕاستی گەروەکەی بە چووڵی هێشتەوە تا کەشتییەکان هاتووچۆ بکەن.

پردەکە بە ڕادەیەك پتەو دروستکراوە کە تا گەڕانەوەی لەشکری داریوش خەراپ نەبووە و لە گەڕانەوەدا لەشکرەکە بەو پردەدا گەڕایەوە. بەڵام دوای پەرینەوەی لەشکرەکە، مەندرۆ کلێس ناوەڕاستی پردەکەی هەڵوەشاندەوە تا هاتووچوو هەبێت و دوای گەڕانەوەی داریوش چاکی کردەوە.

داریوش دەیەویست بۆ هەتایە خەڵکی سیت تەنبێ بکات و نەهێڵێت چیتر رێگری بکەن، بۆیە تەواوی لەشکری دەریایی خۆی کۆکردەوە کە لە دەریای ڕەش و ئیجە بلاوبوون.

کەشتییەکانی هەخامەنشی تەنانەت لە جەبل تارق هەبوون و بۆ بەدەست خستنی ئاو و ئازووقە لەوێ لەنگەریان دەخست، داریوش هەموو ئەوانەشی هێنایەوە و تەنها چەند کەشتییەکی هێشتەوە تا ئاسایشی دەریاکە بپارێزن.

بە وتەی ڕۆمەکان ژمارەی کەشتییەکانی هەخامەنشی کە لە بەهاری ساڵی (٥١٠ یا ٥٠٩ پ. ز) لە کەنارەکانی ئاسیای بچووك (کەنارەکانی دەریای مەرمەرە) کۆببوونەوە، (٦٠٠) کەشتی جەنگی بوونە و بە وتەی ئەوان هەندێك لەو کەشتیانە (دی رەم) واتە دوو ریز سەڵبە

لێدەریان هەبووە و کەشتی (تری رەم) سێ ریز سەڵبەچی هەبووە کە هەر ریزێك لە سەرووی ئەوی تر دادەنیشتن،

بە باوەڕی ئێمە ژمارەی شەش سەد کەشتی جەنگی کە لە لایەن مێژوونووسە یۆنانییەکانەوە باسکراوە کە هەندێکیان دووریز و هەندێکیان سێ ریز سەڵبەچییان هەبووە، زیادە رۆیی تێدایە و ئەو کەشتی گەلە بە لەشکری زۆر گەورە هەژمار دەکرێت و ئیدارە دانی کارێکی ئاسان نییە.

هەفتا و پێنج رۆژ دوای بەهار داریوش وەك دوایین کەسی لەشکرەکەی لەو پردە پڕیەوە، ئەورووپا کە داریوش بۆ یەکەمجار چۆوە ناوی، بە مانای رۆژئاوا دەهات و بۆ تەواوی ئەو نەتەوانە بەکاردەهات کە لە رۆژئاوای فەلاتی ناوەندی ئاسیا بوون.[(٢)]

بە گەیشتنی داریوش بە ئەورووپا ژمارەیەك سەربازی ئێسپارتی و یۆنانی هاتن بۆ یارمەتیدانی، ئەوکات هێشتا پەیوەندییەکانی هەخامەنشی و یۆنان تێك نەچوو بوو.

سەربازە ئێرانییەکان لە بینینی سەربازانی یۆنانی و بە تایبەتی سەربازانی ئیسپارتی دووچاری سەر سورمان هاتن، چونکە ئەوان ریش و سەمێڵیان دەتاشی و پرچیان درێژ دەکرد و ئەگەر کانیاو یا سەرچاوەیەکی ئاوی خاوێنیان دیتبایە و کاتیان دەست کەوتبایە، سەرگەرمی شانە کردنی دەبوون.

سەربازە هەخامەنشییەکان بە یەکتریان دەووت، خەڵکێك ئەوەندە بە مووەکانیانەوە ماندوو بن، چۆن دەتوانن جەنگ بکەن؟

بەڵام دوای ئەوەی لە نێوان لەشکری داریوش و سیتەکان جەنگ دەستی پێکرد، ئەوان دیتیان کە یۆنانی و ئیسپارتەکان زۆر بە ئازیانە جەنگ دەکەن و تێگەیشتن کە ئازایەتی بە بوون و نەبوونی پرچ و ریش و سمێڵ پەیوەست نییە.

کاتێك داریوش هەنگاوی نایە ناو ئەورووپا، شاری ئێستانبۆڵ کە ئەوکات بە (بیزەن تیۆم) دەناسرا، هەبوو و لە ساڵی (٦٦٧ پ. ز) دروستکرابوو.[(٣)]

---

(٢) (زانا و رۆژهەڵاتناسی بەناوبانگی ئاڵمانی ماکس مۆلەر کە لە یەك لە دیارترین رۆژهەڵاتناسانی نیوەی دووەمی سەدەی نوزدەهەم بوو، گومانی لەوە نییە کە ئەورووپا یا ئەورووپ بە مانای رۆژئاوا دێت، زەبیحوڵڵا.)

(٣) (ئەو شارە لە سەرەتا بە مەگاری دەناسرا، چەنکە لە لایەن نەتەوەی مەگاری یا مەجاری دروستکرا، دواتر بە بیزان تیۆم ناوبرا و ناوەکانی تری قوستەنتینە و ئێستانبولە. عوسمانییەکان ناوی ئێستانبۆڵیان بە

داریوش لەشکری خۆی نەبردە ناوشار و لە تەنیشت شارەوە ڕێگەی گرتەبەر و هاوکات و لە هەمان ڕۆژیش لەشکری دەریایی ئەو، گەیشتە ناو دەریای ڕەش. داریوش هێشتا لە سنووری وڵاتانی دۆست بوو و بەڵام ئەگەر کەمێکی تر بەرەو پێش چووبایە نزیك دەبۆوە لە وڵاتی سیتەکان. هیزی دەریایی داریوش دوای گەیشتنی بۆ دەریای ڕەش بووە دووبەش:

بەشێك بەرەو ڕۆژهەڵات ڕۆیشت تا بە دوای کەشتییە خێراکانی سیتەکان بکەوێت و ئەگەر بتوانێت ئەوان بگرێت یا نقومیان بکات و بەشەکەی تریش تەریب بە لەشکری داریوش لە ناو ئاودا دەجووڵان، بۆ ئەوەی ڕێگر بن لە هێرشی لە ناکاوی سیتەکان لە دەریاوە بۆ سەر لەشکری داریوش.

دوای ئەوەی ماوەیەك ڕێگایان بڕی، داریوش گەیشتە ناوچەیەك کە ئێستا بە (کیرك لارك) ناودەبرێت و ئەوکات کۆمەڵە گردێکی لێ بوو کە با و باران و گۆڕانەکانی کەشوهەوا نەیانهێشتوون. کەشتییە جەنگییەکانی هەخامەنشی کاتێك زانیان لەشکری داریوش لەو شوێنە پشوو دەدات، لە شوێنی خۆیان لەنگریان گرت.

ئەو شەوەی کە داریوش بڕیاری پشووی لەو شوێنەدا، بەرانبەر بوو بە شەوی حەفتا و هەشتەمی بەهار. بە فەرمانی داریوش لەشکرەکەی لە دەوروبەری گردەکان و نێوانی گردەکان و دەریا، جێ نشین بوون و پاشا و گاردی جاوید (گاردی تایبەتی پاشا) لەسەر گردەکان جێگیر بوون، بە هۆی کەمی پانتایی گردەکانەوە بوو کە داریوش فەرمانیدا تا لەشکر بەم شێوەیە بڵاوە بکات.

کەشتییەکان لە کەنارەکان وەستانەوە و هەندێ بەلەمی بچووك لە نێوانیاندا هاتووچوویان دەکرد و فەرمانی فەرماندەی دەرییایان پێ دەگەیاندن، لە کەناری دەریاش سەربازەکان ئاگریان کردەوە و هەریەکەیان بەپێی نەریتی خۆیان دەستیان کرد بە گەرم کردنەوە و لێنانی خواردنی سەربازی.

لە گەشتە جەنگییەکان، تەنها کاتێك کە زیاتر لە شەوێك دەرفەتی مانەوە هەبوایە گۆشتیان ئامادەدەکرد، چونکە کات بۆ کوڵاندنی گۆشت نەبوو و تەنها سەربازەکان دەکەوتنە لێنانی شۆربا یا گەرم کردنەوەی ئەو خواردنانەی هێنا بوویان.

خواردنەکان لە هەر دەستەیەك لە سەربازانی لەشکرەکە بە جۆرێك بوو، خواردنی ناوچە شاخاویەکانی ڕۆژئاوای ئێران کە بریتی بوون لە دانیشتوانی ئازەربایجان و کوردستان و لورستان لە جەنگدا بریتی بوو لە (ئەروەد) کە بریتی بوو لەو گەنمەی پێشتر لە کاتی بێ ئیشی و هەبوونی کات، لە گەڵ زۆر لە جۆرەکانی سەوزەی بۆندار و دۆ دەکولێندرا و بەیەکەوە دەنووسا،

---

ئێستامبۆڵ گۆڕی تا بڵێین ئەو شارە ناوەندی ئیسلامە، شاری بیزانتیۆم لە کاتی چوونی داریوش بۆ ئەورووپا، بەشێك بووە لە سنووری هەخامەنشی و پاشاکەی بەرفەرمانی داریوش بوو، زەبیحوڵڵا.)

دواتر بە شێوەی بۆرییان لێدەکرد و پارچە پارچە دەیانبڕی، لە گەڵ وەستانی لەشکر بۆ پشوو ئەو خواردنەیان دەردێنا و لەسەر ئاگر گەرمیان دەکردەوە و دوای ئەوەی بە روونەکەرە یا روون چەوریان دەکرد، یا بە پەنیر دەیانخوارد و دوو سێ پارچە لەو خواردنە بۆن خۆش و بەتامە، یەك کەسی تێر دەکرد.

سەربازە فارسەکان کەشکی کوتراو و نانی وشك، نەعنای وشك و روونیان پێبوو و هەرکە پشوویان دەدا، نەختێ روونیان دەکردە ناو تاوەیەك و هەندێ کەشکیان لەناو ئاودا دەخوساند و لەناو روونەکەیان دەکرد و نەعنایان بۆ زیاد دەکرد و دوای کوڵاندنی، ئاشێکی خۆش و بەهێزیان دەست دەکەوت و نانی وشکیان دەکردە ناوی و دوای ئەوەی نانەکە تەر دەبوو دەیانخوارد، ئەو خواردنە بە (کروتی) ناسرا بوو و لە مانای کەشکەوە وەرگیرابوو.

سەربازانی کەنارەکانی خەزەر لە هەر شوێنێك وەستابان، هەندێ برنجیان دەکردە ناو تاوە و لە سەر ئاگر دەیانکوڵاند و بە رۆون یا بە پەنیر دەیانخوارد و هەندێ لە برنجەکەش کە دوای ڕەق بوونی وەك قالبێك خوێنی وشکبووی لێ دەهات، هەڵیان دەگرت وەك خواردنی رۆژانی داهاتوو. (ئەوکات برنجی کەنارەکانی خەزەر سوورێکی کراوە بوو.)

سەربازانی نەتەوەکانی تریش بە پێی ویست و نەریتی خۆیان خواردنی خێرایان ئامادەدەکرد، بۆ نموونە سەربازانی ئیسپارتی هەندێ پیازیان بە باشی وردەدەکرد و لە ناو تاوەیان دەکرد، نەختێك رۆونی زەیتوون و ئاردی گەنمیان دەکردە سەر و دواتر دەیانخوارد و ئەو خواردنەیان بە (بەرات) ناو دەبرد.

دەبوایە سەربازەکان زۆر بە خێرایی خواردن ئامادەبکەن تا بەیانی زوو لەخەو هەستن و دەرفەت بۆ شەونشینی دوای رۆژێك لە رێپێوانی بەردەوام و بە تایبەتی لە شەوانی کورتی بەهار و هاوین نەبوو، بۆیە سەربازەکان هەر دوای نانخواردن یەکراست خەویان لێ دەکەوت.

دوای نان خواردن سەربازەکان خەویان لێکەوت و ڕاستەوخۆ هێرشی سەربازەکانی سیت کە بە گشتی سواری ئەسپ بوون دەستی پێ کرد، بێ ئەوەی کەس ئاگای لە هاتنیان یا گوێی لە دەنگی حیلەی ئەسپەکانیان بێت، وەك ئەوەی لە زەوی دەرهاتبن لە پڕ دەرکەوتن.

هێرشەکە ئەوەندە لە ناکاو بوو کە تەنانەت فەرماندەی خێوەتگای هەخامەنشی کە ئەفسەرێك بوو بە ناوی (ئاریانس) لە جیاتی خۆی بۆ بەرگری ئامادەبکات، لە ترسان شەپرزە بوو.

هەزاران سوار لە پڕ لە نێوان دەریا و گردەکان، هێرشیان کردە لەشکری داریوش و دوو ریز پاسەوان کە لە دەورەی خێوەتگاکە بوون، بە زوویی کوژران و ئەوان هاتنە ناو خێوەتگاکە، بە

هاتنیان بۆ ناو خێوەتگا خێرایی ڕۆیشتنیان بە هۆی پەتی خێوەتەکان کەم بۆوە و بەم هۆیەوە بە ئاسانی نەیاندەتوانی سەربازەکانی داریوش بکوژن.

ئەگەر ئەو شەوە سیتەکان لە هەر چوار لاوە یا لە دوو لاوە هێرشیان کردبایە، ئەوا تەواوی سەربازەکانی داریوشیان دەکوشت، بەڵام ئەوان تەنها بە درێژایی باکوور هێرشیان کرد و وێڕای ئەوەش هێرشەکەیان ئەوەندە کوتوپڕ بوو کە ئاریانس نەیدەتوانی یەکەکانی لەشکرەکە کۆبکاتەوە بۆ بەرگری.

داریوش کە زانی هێرش لە ناکاوی کراوەتە سەر خێوەتگاکەی، سەربازەکانی گاردی جاویدی لە خەو هەستاند و فەرمانی کرد تا ببنە دووبەش و لە باکوور و باشووری خێوەتگاکە جێگیر بن، ئەو سەربازانە قەلغانیان لەبەر بوو و نێزەی زۆر درێژیان پێبوو، فەرمانیان پێکرابوو کە ئەوەندە بەرگری بکەن تا دوژمن دەکوژن یا دەکوژرێن و ئەوانیش لە گردەکان بەرەو خوار هاتن.

دیاریکردنی باکوور و باشوور بۆ جەنگ کارێکی زۆرە ملیٚ بوو، چونکە لایەکیان خێوەتگا و لایەکەی تریش گردەکانی (کیرك لارك) بوون و ئەوان تەنها لەو دوو شوێنە دەیانتوانی هێرشی دوژمن ڕابگرن.

ئەوان بۆیە نێزەی بەرزیان لەگەڵ خۆیان هەڵگرتبوو، چونکە باشترین چەك بوو بۆ جەنگ کردن لە گەڵ ئەسپ سوارکان و هەر ئەو نێزانە بوون کە دواتر لە لژیۆنەکانی ڕۆمەکان بە (پیٚلاّ) ناسراو و ئەوان ئەو چەکەیان لە هەموو چەکەکانی تر لا باشتر بوو.

هاوکات لەگەڵ دابەشبوونی سەربازەکانی گاردی جاوید، ئاریانسیش بەسەر ئەسپەوە لەناو خێوەتگاکەدا دەگەڕا و داوای لە ئەفسەرەکان دەکرد بە پەلە سەربازەکانیان کۆبکەنەوە و ئامادەی بەرگری بن. هەندیٚ لە ئەفسەرەکان کە دوور بوون لە هێرشی سیتەکان توانیان سەربازەکانیان کۆبکەنەوە، بەڵام ئەو ئەفسەرانەی کە لەسەر ڕێگای هێرشی سیتەکان بوون نەیانتوانی بەو کارە هەستن.

پێشتر باسمانکرد کە هێزی دەریایی هەخامەنشی دوای ئەوەی هاتنەناو دەریای ڕەش ببوون بە دوو بەش و بەشێك لە دەریاوە بۆ پارێزگاری لە لەشکرەکەیان بە تەریب لە گەڵ ئەوان دەڕۆیشت، چونکە داریوش دەیزانی دەریاوانەکانی سیت خەڵکانی ئازان و لەوانەیە لە ڕێگەی دەریاوە هێرش بکەنە سەر لەشکرەکەی.

فەرماندەی ئەو بەشەی هێزی دەریایی، پیاوێك بوو بە ناوی (گاومن) کە بە مانای (گاومەرد) دێت. ئەو لە سەرەتادا نەیزانی کە لەشکری داریوش هێرشی کراوەتەسەر و دواتر کە

مەشخەڵەکان پێکران و دەنگی هاتووهاوار بەرز بۆوە، ئەوەی بۆ دەرکەوت و پێش ئەوەی هیچ فەرمانێکی لە داریوش پێبگات، فەرمانی کرد مەلەوانەکان هەستن و چەك بگرنە دەست و بچنە وشکانی بۆ پاڵپشتی لە لەشکرەکەیان.

کاتێك مەلەوانەکان گەیشتنە وشکانی، هەندێ سەرباز بەرەو روویان دەهاتن، دەرکەوت ئەوان لە هێرشی سیتەکان هەڵاتوون و پەرش و بڵاوبوون و روویان کردووتە دەریا تا بچنە ناو کەشتییەکان، ئەوان ناو کەشتییەکانیان بە شوێنی پارێزراو دەزانی. ئەوان دوای بینینی مەلەوانەکان، بە جەنگمەزاریەوە لە گەڵیان کەوتن تا بەیەکەوە بچنە یارمەتیدانی لەشکرەکەیان لە جەنگی سیتەکان.

ئەو تاقمە سەربازەی گاردی جاوید کە بەرەو باشوور چووبوون، بینیان فەرماندەکانی لەشکری داریوش لەو شوێنە خۆیان بۆ بەرگری ئامادەدەکەن و هێشتاش سیتەکان نەگەیشتبوونە ئەو شوێنە و تەنها دەنگیان دەهات کە لە ئەوێ نزیك دەبنەوە و هەندێ لە تیرەکانیشیان دەگەیشتە ئەو شوێنە.

فەرماندەی سەربازەکانی گاردی جاوید کە چووبوو بۆ باشووری ئۆردووگاکە، بە هۆی ئەوەی ئەفسەری پلە بەرز بوو، فەرماندەیی بەشی باشووری ئۆردووگای گرتە ئەستۆ و وتی نابێت چاوەروان بن تا سوارکارەکانی دوژمن بگەنە ئێرە و پێویستە بچینە پێشوازیان.

فەرماندەی باشووری ئۆردووگاکە کە ناوی (ساڵیاندووش) بوو و ئەفسەری پلەبەرزی گاردی جاوید بوو، پێش ئەوەی سەربازەکانی بجووڵێنێت، ئەوانی دابەشکرد بە دوولا و دڵ و هێزی یەدەگ و ئەوکات بەرێکەوت. لە باشووری ئۆردووگای هەخامەنشی، هەموان بە گشتی تەنانەت ئەفسەرەکانیش پیادە بوون و کەوتنەرێ تا بە هێزی خۆیان پێش بە سوارەکانی دوژمن بگرن.

ئەو بەشەی گاردی جاوید کە بەرەو باکوور چووبوون، بە گەیشتنیان بۆ لای سیتەکان، دەستیان بە هێرشی توند کرد و بێ سڵ کردنەوە لە شمشێر و گورز و تیر و تەور، خۆیان هەڵدەدایە پێش ئەسپەکان و بە نێزەکانیان ورگی ئەسپەکانیان دەدڕی یا سوارەکانیان لە ئەسپ دەخستە خوارێ، ئەوان دەیانزانی کە نێزە بە دەستی سەربازی لێهاتوو وەك نیرێکی بەهێز وایە و ئەگەر نێزەچییەکە بتوانێت نووکی ئەو نێزە بەرزە لە سگ یا سینگی سوارێك بدات بە تایبەتی سوارەکانی سیت کە ئاوزۆنگیان نەبوو، هەرکە زەربەکەی بەرکەوێت لەسەر پشتی ئەسپ دەکەوێت و یا لە لای راست یا چەپەوە دەکەوێت.

ئەنجامدانی ئەو کارە وەك پێشوازی لە مەرگ بوو و ئەو سەربازەی بەو کارە هەڵدەستا بەر لە ئەنجامدانی لەوانە بوو لە ژێر پێی ئەسپەکان بمرێت یاخود بە شمشیر و تیرەکانی ئەسپ سوارکان بکوژرێت. ئەوان پۆششی جەنگیان لەبەر بوو، بەڵام دەست و لاقیان و دەموچاو و سەریان پۆششی نەبوو و سوارەکان دەیانتوانی ئەوان بکوژرن یا کەم ئەندام بکەن، بەڵام ئەو سەربازانە کە دەیانزانی سوارەکانی وژمن لە باکوورەوە دێن، بە فەرمانی (خانووبۆش) کە فەرماندەی گاردی جاوید بوو بێ ئەوەی بیر لە گیانیان بکەنەوە هێرشیان دەکرد و بە وتەی هەندێ مێژوونووس (خانوو بۆش) برای داریوش بوو.

خانووبۆش دەیزانی لێشاوی ئەسپ سوار سیتەکان لە باکوورەوە دێت و پێویستە بە هەر شێوەیەك بێت رێگەیان لێ بگیرێت، تا ئەفسەر و سەربازەکان بتوانن خۆیان ئامادەبکەن بۆ ڕاگرتنی سیتەکان. ئەو بڕیاری دابوو خۆی و سەربازەکانی فیدا بکات تا دەرفەتی خۆ کۆکردنەوە بۆ خێوەتگاکە دەستەبەر بکات. ئەگەر لە ئۆردووگایەکدا سەد هەزار سەربازی تاك هەبێت، ناتوانن پێش بە پەلامارێك بگرن. بەڵام ئەگەر پەنجا هەزار کەس لە ئەوان ریزەکانیان یەك بخەن دەتوانن لە بەشێك لە ئۆردووگاکە پێشرەوی دوژمن رابگرن.

خانۆبۆش بریاریدابوو کە خۆی و سەربازەکانی فیدابکات تا بتوانێت لێشاوی سوارکارەکان رابگرێت تا ریزەکانی ناو ئۆردووگا رێك بخرێن. ئەو بەشەی سەربازەکانی گاردی جاوید کە لە باکوور لە گەڵ سیتەکان دەجەنگان، لە ڕاستیدا لەو شەوە خۆکوژییان دەکرد، چونکە بەشێك لە سەربازەکانی سیت وێڕای ئەوەی سواری ئەسپ بوون جگە لە تیر و کەوان، نیزەیان پێبوو و هەرچەندە ئەوان پۆششی جەنگیان لە بەر بوو، بەڵام کە نێزەکانیان بەردەکەوت، بە هۆی ئەوەی پیادە بوون، یەکراست دەکەوتن و سوارێکی تر دوای ئەوە دەیکوشتن، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو پۆششە لەو شەوەدا زۆر ئەوانی پاراست و ئەگەر وانەبوایە، لەوانەبوو تا دوایین سەربازیان لەو شەوەدا بکوژرابایە، بەبێ ئەوەی بتوانن هێرشی ئەوان بوەستێنن. بەرەبەرە سەربازەکانی گاردی جاوید لە رۆژئاوا بەرەو رۆژهەڵات هەنگاویان دەنا و بەو شێوەیە رێگای هاتووچووی سیتەکانیان تەسکتر دەکردەوە.

هەر سەربازێگی گاردی جاوید کە دەگەیشتە رۆژهەڵات، دەیزانی دەبێت بە جەستەی خۆی ببێتە هۆی ڕاگرتنی هێرشی سیتەکان، نەزاندراوە پاشای سیت ئەو شەوە چەند هەزار سەربازی بۆ ئەو پەلامارە ناردبوو، بەڵام ئەوەندە هەبوو کە هەرچەندەیان لێ دەکوژرا هێشتا سواری تر لە باکوور دەهات. لە باکووری خێوەتگاکە تەرمی سەربازەکانی هەخامەنشی و سیتەکان و ئەسپەکانیان زەوی

داپۆشیبوو، بەڵام ڕێگر نەبوو لە هاتنی ئەسپەکان و خانووبۆش بینی کە سوارەکانی سیت کاتی گەیشتن بە تەرمەکان لەسەری باز دەدەن و ئەسپەکانیشیان لەسەر ئەو کارە ڕاهاتوون.

هەواڵیان بۆ خانووبۆش هێنا کە سەربازەکانی گەیشتوونەتە سەر دەریا، واتە لە ڕۆژئاوا تا ڕۆژهەڵاتیان لە لای باکوورەوە گرتووە و توانیویانە ڕێگربن لە هاتنی سیتەکان، بەڵام سیتەکان کە لە پشتەوە دەهاتن دیسان هێرشیان دەکرد و هەوڵی تێکشکاندنی ئەو بەربەستە مرۆییەیان دەدا کە ئەوان دروستیان کرد بوو. ژمارەی سەربازەکانی گاردی جاوید کە لەگەڵ خانووبۆش بوون، بریتی بوو لە سێهەزار و ئەوانی تر یا لە باشوور و یا لەگەڵ داریوش بوون، تا ئەوکات نزیکەی دووهەزار لە سەربازانی گاردەکە یا کوژرابوون و یا برینەکانیان ئەوەندە توند بوو کە توانای جەنگیان نەبوو.

ماوەیەك دوای ئەوەی سەربازەکانی گاردی جاوید گەیشتنە کەناری دەریا و لە تەواوی بەشەکانی باکووری ئۆردووگاکە ڕێگەی تێپەڕبوونی سوارە سیتەکانیان داخستبوو، لەناکاو تیرێك لە چاوی ڕاستی خانووبۆش ڕۆچوو و ئەو دەستی درێژ کرد تا تیرەکە لە چاوی دەربکات، بەڵام دیتی پەرەی هەیە و نایەتەدەر،[٤] پێش ئەوەی دەستی لاببات زەربەیەك بە بەشی سەرەوەی روخساری کەوت.

زەربەکە ئەوەندە بەهێز بوو کە خانووبوش کەوت و ئەو ئەسپ سواری بەو کارە هەستا بوو، نیزەی دووەمیشی لە روخساری ئەودا و نیزەکە گەیشتە مێشکی و خانووبۆش مرد.

خۆبەخشی خانووبۆش و سەربازەکانی ئەو سوودەی هەبوو کە بە شێوەی کاتی هێرشی سیتەکانی ڕاگرت وساڵیاندووشی فەرماندەی بەشی باشوور، هاوکات لەگەڵ ئەودا هێرشی کرد. کاتێك سیتەکان هێرشیان کرد، خێوەتگا تاریك بوو، بەڵام کاتێك ساڵیاندووش هێرشی کرد، سەربازەکانی ئەو و سەربازەکانی خێوەتگاکە مەشخەڵەکانیان پێکردبوو و ڕووناکی هەبوو و دەیانزانی لەگەڵ کێ جەنگ دەکەن.

سیتەکان بە زانینی ئەوەی کە هێرشیان بۆ کراوە هەوڵیاندا کە ریزی سەربازانی داریوش تێکبدەن و تا ڕادەیەکیش سەرکەوتوو بوون و لە دوو شوێن دەرزیان خستە ناویان، بەڵام هەر بە

---

(٤) (ئەگەر تیر بەر چاوی یەکێك بکەوێت، ئەوا چاوەکە دەپڕژێت و چاوەکەی تریش لەوکاتەدا توانای بینینی نابێت، بۆیە زیاتر لە چیرۆك دەچێت کە فەرماندەیەك بیەوێت تیرێك لە چاوی دەربکات بە تایبەتی کە تیرەکە پەرەی هەبێت و بە هۆی پەرەکانییەوە تیرەکە نەیاتە دەرەوە، بەڵام زەبیحوڵڵا بە داخەوە هەندێ کات لە گێرانەوەی مێژوو چووتە ناو گێرانەوەی چیرۆك. وەرگێر بۆ کوردی)

زوویی دەرزەکە لە لایەن سەربازانی داریوش داخرانەوە و سیتەکان کوژران، سەربازەکانی داریوش ئەوەندە لە یەك نزیك بوونەوە کە سیتەکان نەیاندەتوانی لە نێوانیان تێپەڕبن.

کاتێك سیتەکان بینیان گوشاری ئێرانییەکان کە لە باشوورەوە هێرش دەکەن لە زیاد بووندایە، ویستیان بە هێرشێکی سەخت سەربازە پیادەکانی هەخامەنشی لە ژێر سمی ئەسپەکانیاندا وردبکەن و بەسەر لاشەکانیاندا تێپەڕبن، بەڵام نێزەی سەربازە هەخامەنشییەکان هێرشەکەیانی تێکشکاند.

هەر ئەوکاتەی سالیاندووش توانی یەکەکانی سوپاکەی ڕێك بخاتەوە، زاندرا کە دەتوانن هێرشی سیتەکان ڕابگرن، چونکە ریزێکی پوخت لە سەرباز دەتوانێت ببێتە بەربەست لە پێش هێرش، بەڵام لەشکرێکی چەند هەزار کەسی کە پەرش و بڵاو بێت ناتوانێت ڕێ لە دەستەیەك بگرێت لەکاتی هێرشدا. سالیاندووش بە ئەفسەرەکانی وتبوو کە بە سەربازەکانیان بڵێن تا ئەو شەوە نەبنە مایەی سەرشووری پاشاکەیان و سەربازەکانیش دەیانزانی کە ئەگەر ئەو شەوە خۆڕاگری نەکەن، لە پێش هێرشی سیتەکان هەموویان دەکوژرێن.

لە سەر سەری سەربازە هەخامەنشییەکان هەڵۆ دەدی ترا و بریتی بوو لە پەیکەری ئەو باڵندەیە کە لەسەر قامیش دەدرا و بەرز دەکرایەوە، لە جەنگەکاندا ئەوان هەندێجار چاویان لە هەڵۆ دەکرد و داوایان دەکرد باڵندەی (شاهین) کە لە لای ئەوان بە سونبولی سەرکەوتن دەزاندرا، سەرکەوتوویان بکات، تەندیسی هەڵۆ هی نەتەوە ئێرانییەکان بووە و چۆتە ناو نەتەوەکانی تر.

بەڵام لە ڕاستیدا ئەگەر ئەو شەوە لەشکری داریوش دەیانەویست ئازایەتی و خۆڕاگری خۆیان پیشان بدەن، ئەسپ سوارە سیتەکانیش بڕیاریان دابوو بوێری و پیاوەتی خۆیان دەربخەن و بیسەلمێنن کە لە مردن ناترسن. ئەوان دەیانزانی دەبێت لەشکری داریوش ڕابگرن پێش ئەوەی ئەو لەشکرە گەورەیە بگاتە نیشتیمانەکەیان و چونکە ئەگەر ئەو لەشکرە بگاتە نیشتیمانەکەیان، یۆرتەکانیان لەناو دەبەن و رەوە ئەسپ و ئاژەڵەکانیان دەبەن و خاوەنی هیچ شتێك نامێنن.

سیتەکان لە منداڵیەوە لەسەر پشتی ئەسپ پەروەدە دەبوون و ئەسپەکانیان بە بێ ئاوزونگ لێدەخوری، بەڵام دەیانتوانی کاری وا لەسەر ئەسپەکانیانەوە بکەن کە بە کاری ئاکرۆباتەکان دەچوو. یەك لە کارەکانی ئەوان کە بریتی بوو لە جەژنێك کە لە مانگی دووەمی بەهاردا ئەنجامدەدرا، لەو جەژنەدا بیست پیاو کە دەبوایە تەمەنیان لە چل ساڵ کەمتر بێت، دەبوونە دوو دەستەی دە کەسی و بەیەکەوە دەجەنگان تا بزانن کامیان ئازاترن.

ئەو جەنگە تەنها نەمایش نەبووە و لەو جەنگەدا بە ڕاستی یەکتریان کوشتووە تا دەرکەوێت کە کێ ئازاترە، مێژوونووسانی کۆنی یۆنانی نووسیویانە کە چەند جار روویداوە کە هەر بیست نەفەر کوژراون یا بریندار بوونە و بەم شێوەیە دەرنەدەکەوت کە کێ لە مەیدانی جەنگەکەدا سەرکەوتووە.

کاتێك کە یەك لەو پیاوانە دەکوژرا، بینەرەکان وەك ئەوەی کە شانوویەکی خۆشیان دیتبێت، شادی و کەیف خۆشی دەیگرتن و هەستەکانی خۆیان بە سوودی ئەم و ئەو دەستەیە دەردەبڕی و ناوی جەنگاوەرەکانیان بە دەنگی بەرز دەهێنا.

نەتەوەیەك کە ئەوە نەریتیان بێت ترسنۆك نین، بە تایبەتی کە دەوڵەمەند بوونی ئەوان لە رێگەی چەتەیی لە وشکانی و دەریا دەبوو و لەوانە بوو بکوژرێن و ئەگەر شکستیان خواردبایە سەریان لە لاشەیان جیادەکرایەوە یا ئەوانیان هەڵدەواسی، چونکە هیچ کەس بەزەیی بە چەتەدا نایاتەوە جا چەتەی دەریایی بێت یا هی وشکانی و سزای چەتە، کوشتنێتی.

ئەو شەوە سیتەکان بریاریاندابوو لەشکری هەخامەنشی لەناو ببەن یا بە شێوەیەك شیرازەی تێکبدەن کە داریوش نەتوانێت سەربازەکانی خۆی کۆبکاتەوە و لەشکرێکی تر ئامادەبکاتەوە، سوارەکان بە ئازایەتییەکی بەرچاو و بە جووڵەی خێرای چوار سمی ئەسپەکانیان خۆیان دەخستەسەر پیادەکان و ئەوانیان دەکوشت و دەکوژران، بەڵام چونکە هەر ریزێکیان لە سەربازەکانی داریوش دەشکاند، ریزێکی تر هەبوو و ئەو سوارانەی لە ریزی یەکەم تێپەڕدەبوون لە ریزی دووەم یا دەکوژران و یا بریندارەدەبوون و دەکەوتنە سەر زەوی.

سەربازە هەخامەنشییەکان کاتێك سەربازە ئێسپارتی و یۆنانییەکانیان دیت، دڵنیا بوون ئەو کەسانەی ریش و سمێڵیان دەتاشن و بەردەوام سەرگەرمی داهێنانی پرچە درێژەکانیان دەبن، هیچ توانا و بایەخی جەنگیان نییە. بەڵام ئەو شەوە لە کاتی جەنگکردندا بۆیان دەرکەوت کە هەڵەنە و بەتایبەتی سەربازە ئێسپارتییەکان کە بە بێ گرفت و بە ئازایەتی و بێ ترس لە مردن جەنگیان دەکرد، بوونە جێی بایەخی سالیاندووش.

ئێسپارتییەکان زرێی قورسیان پێبوو و شمشێری درێژ و ئەستوور و قورسیان بە بەردەوامی و بێ ماندوو بوون ڕادەوەشاند، ئەوان شمشێرەکانیان دوو دەم بوون. سەربازی ئێسپارتی ناچار نەبوو کە شمشێرەکەی بە شێوەیەك بجووڵێنێت کە رووی تیژی بگاتە دوژمن و ئەگەر دوو سەربازی کەوتوو لە ئەسپ بەرەو رووی هاتبان، دەیتوانی بە هەر روویەکی شمشێرەکەی یەکیان بپێکێت.

سەربازە ئەسینابییەکان (یۆنانییەکان) بە ڕادەی ئەوان لەسەر خۆ نەبوون، بەڵام ئەوانیش بوێر بوون و ئەوان نەیاندەتوانی بێ دەنگی خۆیان بپارێزن و بە هۆی ئەو هاتوو هاوارەی دەیانکرد، هەندێجار شمشێریان تەنها لە ئاسمان دەسوڕایەوە و بەر دوژمن نەدەکەوت. بەڵام سەربازە ئێسپارتییەکان شمشێری بێهوودەیان نەدەوەشاند و هاواریان نەدەکرد و لە کوشتنی دوژمنیش هاواری شادییان نەدەکرد. سەربازی ئازا لە کوشتنی دوژمنەکەی کەیف خۆش نابێت، چونکە دەزانێت هەموو کاتێك لەوانەیە بە دەست یەکی تر لە دوژمنەکانی بکوژرێت.

زرێی سەربازە ئێسپارتییەکان گەورە و قورس بوو و بەشێك لە جەستەی دادەپۆشین و کاتێك کە زەربەیەکی بەردەکەوت، دەنگی کانزاکە بەرز دەبۆوە و بە دەنگی ئەو زەربەیە هەخامەنشییەکان دەیانزانی کە زرێیەکە زۆر قورسە. بە گشتی ئازایەتی ئێسپارتی و ئەسینابییەکان ئەو شەوە لەسەر سەربازانی داریوش کاریگەری هەبوو و ئەوان چیتر بە چاوی کەمزانی ئەوانیان سەیر نەدەکرد.

تا ئەوکاتەی هێرشی سیتەکان بەردەوامبوو، سالیاندووش وای هەست دەکرد کە ناتوانێت بەردەوام بێ لە هێرشکردن، بەڵام دوای خۆڕاگری خانووبۆش و سەربازەکانی و ڕاگرتنی هێرشی سیتەکان، گوشار لە سەر سەربازە پیادەکانی کەمبۆوە. سیتەکان بۆیان دەرکەوت کە ڕێگەی پشتەوەیان داخراوە و هێزی یارمەتیدەریان بۆ نایات، بۆیە دەستیان کرد بە پاشەکشە و ویستیان بگەڕێنەوە و سالیاندووش فەرمانی کرد تا ئەوەندەی دەتوانن لە ئەوان بکوژن، بەڵام ئەوان سوار بوون و هەخامەنشییەکان پیادە، بۆیە توانایان نەبوو بە دوایان بکەون.

ئەسپ سوارەکانی سیت بۆیان دەرکەوت ناتوانن دەرز بخەنە ناو لەشکری داریوش، بۆیە بەرەو باکوور دەستیان بە گەرانەوە کرد و لە سەر ڕێگەیان هەزار سەربازی گاردی جاوید هەبوون، کە خرابوونە بەر هێرشی دوولایەنە لە لایەن سیتەکان. لە لایەك لە لایەن ئەو سوارکارانەی لە باشوور و لە ناو خێوەتگاکە دەهاتنەوە و لە لای باکووریش لە لایەن ئەو سوارکارانەی هێرشیان دەکرد. ئەو هەزار سەربازە بە ئەندازەی دووهەزار سەرباز بەرگری و فیداکاریان نواند و گەرانەوەی سیتەکانیان وەستاند، هەرچەندە لە دوولاوە هێرشیان کرابۆوە سەر.

ئاشکرایە بەرگری هەزار پیاو کە لە نێوان دوو هێز کە لە دوو لایانەوە هێرشیان بۆ دەکەن، چ چارەنووسێکی بەدواوە دێت و ئەو پیاوە ئازایانە تا دوایین کەس کوژران و بەرگری و خۆڕاگریان بۆوە هۆی ئەوەی سالیاندووش و هێزەکەی بگەنە سوارە سیتەکان و هاوکات هێزی دەریاییش گەیشتن و بەشدار بوون لە کوشتنی سەربازەکانی سیت، ئەو سوارانەی سیت کە

مانەوە و توانیان دەربچن، هەواڵیان بە سەربازەکانی تریان گەیاند کە پەلامارەکەیان بە هۆی خۆ کۆکردنەوەی لەشکری داریوش، شکستی هێنا.

سەربازەکانی سیت گەڕانەوە بەڵام هێرشی ئەوان بۆ هەخامەنشییەکان زۆر قورس بوو و ئەو شەوە سێ هەزار سەربازی گاردی جاوید کە لە باکووری جەنگگە بوون کوژران و تەنانەت یەکیان زیندوو نەمان، هەروەها ئەوانەی لە گەڵ ساڵیاندووش بوون هەندێکیان کوژران و لاشەی ئەسپ و سەربازە کوژراوەکان تەواوی بەشەکانی باکوور و ناوەڕاستی خێوەتگاکەی داپۆشی بوو.

فەرماندەی خیوەتگای داریوش کە هێرشی لەناکاوی سیتەکانی بە دەرئەنجامی کەمتەرخەمی خۆی دەزانی، پەنای بۆ خۆکوژی برد. ئەو بیری دەکردەوە کە لە رووی نایات بچێتە بەردەم داریوش و بۆیە بە ئارەزووی خۆی داوای شمشێرەکەی خۆی کرد کە دوو لێو و نووکی تیژی هەبوو و فەرمانی کرد کە بەرانبەر سینگی ڕابگرن، ئەو سەربازەی کە شمشێرەکەی بەدەست گرتبوو، نەیزانی مەبەستی لەو کارە چییە و بۆیە فەرمانەکەی بەجێ گەیاند و فەرماندەی ئۆردووگاکە لە پڕ خۆی خستە سەر شمشێرەکە و نووکە تیژەکانی لە پشتی دەرچوو و کەوتە سەر زەوی.

ئەو شەوە نزیکەی چوار هەزار لە گاردی تایبەتی داریوش کوژران و داریوش لەوکاتەدا نەیدەتوانی ئەو زیانانە پڕ بکاتەوە و لە جیاتی کوژراوەکان سەربازی تازە بێنێتە ناو گاردی جاوید، چونکە وەك باسمان کرد ئەوان بە ڕێگەی تایبەتی دیاری دەکران و دەهێندرانە ناو سوپا و بۆ داریوش نەدەگونجا لە ئەورووپا سەربازانی ئەو گاردە هەڵبژێرێت و بیانخاتە ناو سوپاکەی.

کاتێك ئەو هەواڵەیان بۆ داریوش برد، وتی ئەو خۆی سەزای خۆیدا و ئەگەر هاتبوایە بۆ لام فەرمانی کوشتنی ئەوم دەردەکرد، چونکە ئەو کەمتەرخەم بوو، دەبوایە لە باکوور و ڕۆژئاوای خێوەتگاکە ژمارەی پاسەوانەکان زۆرتر بکات تا دووچاری ئەو دۆخە نەبین و خۆی دەبوایە بۆ ئەو هێرشەی ئەوان لێکدانەوەی هەبێت. ساڵیاندووشی ئەفسەری گاردی جاوید و گاومەنی فەرماندە لە هێزی دەریایی کە ئەو شەوە یارمەتی لەشکرەکەیاندابوو، خەڵات کران.

ئەو پەلامارە لەشکری داریوشی بە ڕادەیەك شەپرزە کردبوو کە بۆ ڕێکخستنەوەی لەشکر و ناشتنی کوژراوەکان، ماوەی سێ ڕۆژ لەو شوێنە مانەوە. لەوانەیە بگوترێت ئێرانییەکان تەرمی مردووەکانیان نەدەناشت و تەنها لە سەر گردێکیان دادەنان، تا ئەوکاتەی تەنها ئێسك دەمایەوە، ئەوکات ئێسکەکانیان دەکردە تورەکەیەك و دەیانناشتن. بەڵام ئەو نەریتە هی سەردەمانی دواترە و شێوەی ناشتنی (کوروش و داریوش) کە لە لایەن یۆنانییەکان باسکراون، پاڵپشتی وتەکانمانە و ئەوان تەنها بە هۆی بە پیرۆز زانینی پێکهاتەکانی خاك، هەوڵیانداوە کە

تەرمەکان لەناو تابووتی بەردین یا گەڵیین دابنێن و دواتر بیاننێژن، تا گۆشت و خاك لە بەریەککەوتن بپارێزن.

ئەو کەسانەی بە توانا بوون، مردووەکانیان لە ناو تابووتی ئاسن یا مس یا قەڵا واتە کانزایی دادەنا و دەیانناشتن، لەو تابووتانە بەردەست نەکەوتوون، چونکە وەك دەزانن ئەوانە لە ناو دەچن و ئەو کەسانەی کەم دەرامەتیش بوون، مردووەکانیان لە تابووتی گڵییندا (لە شێوەی گۆزەی گەورە) دەناشت.

دوای سێ رۆژ لەشکر لە کیری لارك بەرەو باکوور کەوتەرێ و هێزی دەریاییش بە فەرماندەیی گاومەن تەریب بە ئەوان جوولا، پێشتر باسمانکرد کە بەشی تری هێزی دەریایی بە فەرماندەی (هیست ئەسپ) بۆ بەدەا کەوتنی سیتەکان رۆیشتبوو.

داریوش بە هۆی بوونی هێزی دەریاییەوە لە لای رۆژهەڵات ئاسوودە بوو و لە هێرشی کوتوپڕ نەدەترسا، بەڵام وێڕای بوونی سێ دەستە سەرباز وەك پێشرەو و پارێزەر لەو سێ لایەوە، هێشتا لە رۆژئاوا و باکوور و تەنانەت باشووریش دڵنیا نەبوو و ترسی هەبوو کە سیتەکان بۆیان بسوڕێنەوە و لە باشوور و لە پشتیانەوە لێیان بدەن.

داریوش دەیزانی دوژمن بەردەوام وەك سێبەر لە دوایانە و لە دەرفەت دەگەڕێت بۆ پەلامارێکی تر. بۆیە لە هەر شوێنێك دەوەستا، خێوەتگاکەی وەك قەڵایەکی سەربازی لێدەکرد تا هێرشی لەناکاو، شەپرزەیان نەکات.

بەرەبەیانی رۆژی هەشتا و شەشەمی بەهار خیوەتگای داریوش کۆکرایەوە و سەربازەکان دەستیان بە جووڵە بەرەو باکوور کرد، تا گەیشتنە پێدەشتێکی تەخت بە ناوی (سۆڵدا) و سەربازە پێشەنگەکان هەواڵی بینینی دوژمنیان ڕاگەیاند.

داریوش فەرمانیدا لەشکر بوەستێت و ریزەکانی خۆی رێك بخات، داریوش دوای ئەوەی پێدەشتەکەی بینی و دیتی کە تەختە، زانی بۆچی دوژمن لەو شوێنە هاتوونەتە پێشوازی، چونکە سیتەکان ئەسپ سوارن و هێزی سواریش لە ناوچەیەکی شاخاوی یا لە نا گردەکاندا ناتوانێت بە باشی سوود لە هێزی خۆی وەربگرێت و لە بەرانبەردا لە پێدەشتێکی تەختدا لەشکرێکی سوارە زۆرترین سوود دەکات.

بە پێی ئەو شێوەی کوروش دایهێنابوو لەشکری داریوش دامەزرا، واتە لە ناوەڕاست دڵی لەشکر داندرا و لە هەردوولا هێز داندرا و هێزێکیش وەك یەدەك هێشترایەوە. عارەبانە جەنگییەکان بەسەر هەردوو لای راست و چەپدا دابەشبوون، چونکە داریوش دەیزانی ئەگەر

سیتەکان بیانەوێت دەورەی لەشکرەکەی بگرن، لە لای ڕاست یا چەپ دەبێت بسوڕێنەوە و بۆیە عارەبانەکان بەرپرس بوون لە ڕێگەگرتن لێیان، مەنجەنیقە بچووکەکانیش لە پێشەوەی هەردوولا و دڵی لەشکر داندران تا بەرد بەسەر دوژمندا ببارێنن.

داریوش ئەسپ سوارکانی وەك یەدەگ هێشتەوە تا لە هەر کاتێکی پێویست، فریای دڵ یا لایەکانی تری لەشکر بکەون. لە دڵ و هەردوولای لەشکری داریوش، تەنها سەربازانی پیادە وەستابوون، ئەوان وێڕای ئەوەی چەکی تریان پێبوو، بۆ ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ ئەسپ سوارەکان نێزەشیان هەڵگرتبوو.

داریوش ئەو ڕۆژە نەیدەزانی ژمارەی سیتەکان چەندە، بەڵام دەیزانی کە ئەوان لە ژمارە و شێوەی لەشکرەکەی و عارەبانە و مەنجەنیقەکانی ئاگادارن.

ئەسپ سوارە سیتەکان لە ناوچەیەك دەجەنگان کە بە هۆی ئەوەی ماوەیەك لە ژێر دەستیان بوو تا ڕادەیەك لە نیشتیمانی خۆیان دەچوو، بەڵام داریوش لە ناوچەیەك بوو کە بۆ ئەو بیگانە بوو و لە پشتی جەبهەش دڵنیا نەبوو و لەوە دەترسا کە ئەوان لە پشتەوە پەیوەندی ئەو لەگەڵ ئێران نەهێڵن و لەو کاتەدا دەسەڵاتدارانی ئاسیای بچووك یارمەتی ئەویان نەدەدا تا لە دەورەگیران رزگاری بکەن.

داریوش دوای گەیشتنی بە ئەورووپا دەبوایە پشت خۆی بپارێزێت و ئەمەی نەکرد، بەڵام بەختی هەبوو کە سیتەکان پەیوەندی ئەویان لەگەڵ ئێران نەپچراند. داریوش لەو جەنگە تەنها پشتی بە ئەستێرەی بەخت بەستبوو، بەڵام هیچ جارێکی تر وای نەکرد.

وەك باسمانکرا ئەسپ لە سەردەمانی کۆن لە ئێران بۆ وڵاتانی تر ڕۆیشت، بەڵام (سیت و پارت[٥]) ەکان لە سەردەمانی باستان و موغولەکان لە سەدەکانی ناوەڕاست لە ئەسپ سواری لە ئەوان پێش کەوتنەوە، لەوانەیە ئەوە بەو هۆیەوە بێت کە ئەسپ و ماین هۆکاری بژێویان بووبن.

ئەوان لە منداڵیەوە لە سەر پشتی ئەسپ بوون و لە بەیانی تا ئێوارە ئەوەندە سواری ئەسپ دەبوون کە بە هۆی بەردەوامیان لەو کارە، قاچەکانیان دەچەمایەوە و کاتێك لە ئەسپ دادەبەزین، بە هۆی ئەو چەمانەوەیە نەیاندەتوانی بە باشی ڕێگە ببڕن و بە پێچەوانەوە کاتێك لەسەر پشتی ئەسپەکانیان دەبوون، وەك ماسی ناو ئاو پێویستی ژیانی خۆیان دەدۆزییەوە.

---

(٥) (لە سەرەتای ئەو پەرتووکەوە کە دەست بە باسی پێکهاتە سەرەکیەکانی ئێرانی کۆن کرا، پارتەکان لە لایەن زەبیحوڵڵا بە یەك لە پێکهاتە سەرەکیەکانی ئێران دانران کە لە ڕۆژهەڵاتی ئەوکاتی ئەو وڵاتە دەژیان، بەڵام وادیارە بەرەبەرە ئێرانی بوون لە لایەن ئەوەوە بەرتەسك دەبێتەوە و جێگەی خۆی بە فارس بوون دەبەخشێت، بۆیە دەڵێت ئەسپ لە ئێرانەوە ڕۆیشت و سیت و پارتەکان لە ئەسپ سواری پێش ئەوان کەوتنەوە. وەرگێر بۆ کوردی.)

لەشکری سیت بە گشتی ئەسپ سوار بوون و لە هەموو هونەرەکانی سوارکاری شارەزا بوون و زینی ئەسپەکانیان ئاوزوونگی نەبوو، بەڵام ئەوان مەنجەنیق و عارەبانەی جەنگیان نەبوو. شێوەی جەنگی سیتەکان بریتی بوو لە دروستکردنی گوشاری زۆر بۆ سەر دوژمن تا ناچاربێت ریزەکانی تێك بشکێت و دواتر سەربازە گەنجەکان ئەسیر بکەن و لە وڵاتی خۆیان کاری کشتوکاڵیان پێ ئەنجام بدەن.

وەك چوون هەزار ساڵ پێش زایێن لە وڵاتی سعودیا رەسەنییەت، واتە خاوەنداریەتی وشتر بوو و ئەوانەی وشتریان هەبوایە کشتوکاڵیان نەدەکرد، سیتەکانیش پەروەردەکردنی ئەسپ و ماینیان بەکاری خۆیان زانیوە و کشتوکاڵیان بە کۆیلەکان دەسپارد.

هێرشی سیتەکان بۆ سەر لەشکری داریوش دەستی پێکرد و ئەوەندە توند بوو کە گاومەنی فەرماندەی هێزی دەریایی کە لە دوورەوە جەنگەکەی دەدیت، بڕیاریدا کە بە پەلە ژمارەیەکی زۆر لە دەریاوانەکان بۆ یارمەتی داریوش بنێرێت. سیتەکان ئەو رۆژە تەور و گورزەکانی خۆیان لە دژی سەربازەکانی داریوش بەکارهێنا و لە هێرش بۆ سەر ئەو لەشکرەی بەشێك یا هەموو سەربازەکانی قەلغانیان لەبەرە، تەور و گورزیان لا باشتر بوو، چونکە شمشێر توانای شکاندنی قەلغانی نەبوو.

سیتەکان وێڕای ئەوەی بە کۆمەڵ هێرشیان دەکرد، بەڵام بۆ یەکتری نەدەبوونە گرفت و بەردەوام مەودایەك لە نێوان دوو ئەسپ سوار هەبوو و گورز و تەورەکانیشیان بە شێوەیەك بەرز و نزم دەکرد و ڕایان دەوەشاند کە بە ئەسپی تەنیشتیان نەکەوێت، لە نێوان هەزاران سواری هێرشبەر کەسێك نەبوو کە گورزەکەی دووجار بسوڕێنێتەوە یا بۆ چەپ و ڕاستی بسوڕێنێت. تەور و گورزەکان وەك ئەوەی بە یەك دەسکەوە بەسترابنەوە، بە شێوەی ستوونی بەرز و نزم دەبوونەوە و کاتێك بەر سەربازە هەخامەنشی یا یۆنانییەکان دەکەوتن، سەربازەکان دەکەوتن و هەڵنەدەستانەوە.

ئەو کەسەی لە بەرزاییەکەوە شانۆی ئەو جەنگەی دیبا، تێ دەگەیشت کە سەربازانی سیت بە باشی پەروەردەکراون و سەرەنجیدەدا کە ئەوان هیچ ترسیان لە مردن نییە و لێی ناترسن. ئەو سەربازانەی لە ریزی پێشەوە هێرشیان دەکردە سەر ئێرانییەکان دەیانزانی دەکوژرێن، بەڵام بە شێوەیەك هێرشیان دەکرد کە وەدەزاندرا بۆ گەشت و خۆشی بەسەر بردن دەچن.

لە گەڵ دەستپێکی هێرشی سیتەکان، مەنجەنیقەکانی داریوش کە لە بەرانبەر دڵی سوپای داریوش بوون بەردیان بەسەردا باراندن و هەندێ لە سیتەکان یا ئەسپەکانی ئەوانیان کوشت، بەڵام ئەوان نەیانتوانی سیتەکان ڕابگرن و سیتەکان لە گەڵ دەستپێکی بەردباران، خێرایی ئەسپەکانیان زیاد کرد و وەك باڵندە بەرەو روویان دەهاتن.

تا ئەوکاتەی سیتەکان لە لەشکری داریوش نزیك نەببوونەوە، بێ دەنگیان پاراست بوو و هیچیان نەدەگوت، بەڵام لە گەڵ بەردباراندا دەنگێکی رۆژئاوایی لە گەروویان دەردەچوو کە لە دەنگی دڕندەیەك دەچوو کە لە نێچیرەکەی نزیك دەبۆوە و یۆنانی و هەخامەنشییەکان ئەو دەنگەیان دەبیست. سیتەکان گەیشتنە مەنجەنیقەکان و ئەوانیان تێك شکاند و سەربازە مەنجەنیق هاوێژەکانیان کوشت. لەو جەنگەدا داریوش بە هۆی قورسی کاری گواستنەوەیان مەنجەنیقی گەورەی نەبردبوو و تەنها بچووکەکانیان لابوو.

داریوش کاتێك سەرەنجی دۆخی جەنگی سوارە سیتەکانی دا، هەستی کرد پێویستە عارەبانەکان بەگەڕ بخات و ئەوان تێبکۆشن تا بچنە پشت سیتەکانیان و رێ لە لێشاوی ئەوان بگرین. عارەبانەکان هەر ئەوانە بوون کە لە جەنگەکانی رۆژهەڵات بەکار دەهاتن و لە پێشەوەیان داسی تیژی قەڵا هەبوو و ئەوکات ئاسن کەم دەست دەکەت و بۆیە داسیان پێ دروست نەدەکرد، لە ساڵانی دوایی تەمەنی داریوشدا ئەو عارەبانانە هاتنە ناو لەشکری هەخامەنشی کە داسی ئاسنینیان هەبوو.

عارەبان قورسەکانی ئەوان بە داسە تیژ و درێژەکانیان بە چەکی مەترسیدار دەناسران و لە دوولاوە کەوتنە جووڵە. لە ئێرانی کۆن سەربازەکان عارەبانە جەنگییەکانیان بە (ئەرتشتار) ناودەبرد و بەردەوام ئەفسەرێکی دیار فەرماندەیان دەبوو. داریوش بە فەرماندەی عارەبانە جەنگییەکانی وت: پێویستە پێش سیتەکان بگری، لە نێوان ئێمە و ئەواندا بەربەستێك دروست بکەی تا سەربازی تری ئەوان نەتوانن هێرشمان بۆ بکەن. ئەگەر تۆ لە کارەکەت سەرکەوتوو بی، ئێمە هەوڵ دەدەین لەودیوەی بەربەستەکە ئەوان لە ناو ببەین و بەم شێوەیە سەرکەوتوو دەبین.

فەرماندەی عارەبانەکان ناوی (کۆریلیۆس) و پیاوێکی سی ساڵان و باڵابەرز بوو، ناوەکەی لە ناوی یۆنانی دەچێت، بەڵام ئەوکات هێشتا دۆستایەتی لە نێوان هەخامەنشی و یۆنانییەکان هەبوو و سەربازە یۆنانییەکان بۆ داریوش دەجەنگان و هەردوولا ناوی یەکتریان بەکاریان دەهێنا. ئەو بە پاشای وت:"من بە فەرمانی تۆ هەموو عارەبانەکانم دەبەم بۆ جەنگ و ئۆمێد دەکەم بتوانم رێگە لە دوژمن بگرم."

عارەبانەکان لە هەردوو لاوە بەرەو باکوور چوون و کەوتنە مەیدانی جەنگ، بە پێی ئەو فەرمانەی پاشا بە کۆریلیۆسی دابوو ئەو هەوڵیدا بە پشت سیتەکاندا بسۆڕێتەوە و پشت ئەوانە بگرێت کە هێرشیان کردووە. بە هەمان شێوە کە ئەو ناوچەیە بۆ ئەسپ سواری باش بوو، بۆ لێخورینی عارەبانەکانیش هیچ گرفتی تێدا نەبوو.

سیتەکان تا ئەو ڕۆژە عارەبانەیان نەبوو و شێوەی جەنگ لەگەڵ ئەوانیان نەدەزانی و یۆنانییەکانیش (ڤالانژ) کە یەکەی سەربازی یۆنان و ئیسپارت بوو بە باشترین ئامراز بۆ سەرکەوتن دەزانی. یۆنانییەکان هەوڵیاندا ببنە خاوەنی عارەبانە بەڵام تا ئەوکات نەیانبوو.

دەرکەوتنی عارەبانە جەنگییەکانی داریوش بۆ سیتەکان شتێکی تازە بوو و ئەوان چەکێکیان دیت کە شێوەی بەرپەرچ دانەوەیان نەدەزانی و بۆ ئەوان چاوەروان نەکراو بوو، بەڵام چونکە ئازا و بوێر بوون، نەترسان. بە بینینی ئەوەی عارەبانەکان بە چوار ئەسپ ڕادەکێشران، زانیان ئەگەر ئەسپەکان بکوژن عارەبانەکان لەکار دەکەون، بەڵام بە زوویی تێگەیشتن کوشتنی ئەسپەکان ئەستەمە، عارەبانەکان بە تەنیشت یەکەوە دەجووڵان و ڕێگەیان نەدەدا سیتەکان خۆیان بخزێننە ناویان.

تێکشکاندنی عارەبانەکان لە پێشەوەش بە هۆی ئەو داسە تیژانەی هەیانبوو، نەدەکرا و ئەوان تەنها دەیانتوانی لە پشتەوە سەربازانی ناو عارەبانەکە بکوژن. وێرای پێشرەوی، سەربازەکانی سەر عارەبانەکان بە تیر لە سیتەکانیان دەدا و دەنگی ڕاکێشان و بەربوونی ژێی کەمانەکان، مۆسیقایەکی ترسناکیان دروست دەکرد.

کاتێك کەمانچییەك بە کەمانەکەی نیشان شکێنی دەکرد، دەنگی زەیی کەمانەکەی سەرەنج راکێجەنگ بوو و کاتێك هەزاران کەمان بە یەکەوە رادەکێشران، دەنگەکانیان بێ پشانەوە دەگەیشتە گوێ و تیرهاوێژە کۆنەکان بە خێرایی تیریان دەهاویشت و خێرایی ئەوان نزیك خێرایی تفەنگەکانی ئێستا (مەبەستی تفەنگە تاك هاوێژەکانی هەفتاکانی سەدەی رابردووە) بوو و کەمانچییەکی لێهاتوو لە یەك خولەکدا دەیتوانی (١٥ تا ٢٠) تیر بهاوێژێت.

مێژوونووسی رۆمی سوئێتۆن (٧٥ تا ١٦٠ ز) دوای زایێن ژیاوە، دەڵێت: پاشای سیتەکان کە ناوی (کات ڕازین) بوو لەو جەنگە ئامادەبوو و سەرەتا بە بینینی عارەبانەکان کە بۆ ئەو چەکی تازە بوون شڵەژا، بەڵام دوای بیرکردنەوە توانی بەرگری بکات.

سۆئێتۆن هەرچەندە دوای زایێن ژیاوە، بەڵام دەستی بە زۆر سەرچاوە ڕاگەیشتووە و بۆیە پەرتووکێکی باشی نووسیوە و دەڵێت: دواتر کات ڕازین یەك لە فەرماندەکانی بانگ دەکات و پێیوت هەزار سەربازی خۆبەخش ئامادەبکە تا دوو دوو لە ژێر قەڵغانەکانیان خۆیان بگەیێننە ژێر سگی ئەسپی عارەبانەکان و بیانکوژن.

هەزار خۆبەخش لە ئەسپەکانیان هاتنەخوارەوە و دوو بە دوو کەوتنە سەر سینگ و قەلغانەکانیان لە سەرووی سەر و پشتیان گرت و بەرەو عارەبانەکان خزین، ئەوان هەرچەندە ئەزموونیان لە جەنگ لە گەڵ عارەبانەکان نەبوو، بەڵام دەیانزانی ئەگەر تەنها ئەسپێك

بکوژرێت، عارەبانەکە لەکار ناکەوێت و بۆیە لە یەکتری دانەدەبڕان و دوو کەس بەیەکەوە هەوڵی کوشتنی ئەسپەکانی عارەبانەیەکیان دەدا.

ئەوان لەوکاتەدا تەنها مەترسی دوژمنیان نەبوو و لەوانەبوو لە ژێر پێی ئەسپی سوارەکانی خۆشیان وردبن و ئەسپ سوارانی سیت زۆر وردبینیان دەکرد تا سەربازە پیادەکانیان بە هۆی سمی ئەسپەکانیان زەرەربار نەکەن، بەڵام جەنگ بوو و تا ڕادەیەك ئەوانیش زەرەریان لە سەربازانی خۆیان دەدا و دەیانکوشتن یا بریندارییان دەکردن. دوو سەربازی پیادەی سیت لەیەك دانەدەبڕان، چونکە دەیانزانی بەیەکەوە پێویستە بچنە ژێر ئەسپی عارەبانەکان تا بیانکوژن و عارەبانەکە بوەستێنن.

هەرچەندە سیتەکان لە جەنگی عارەبانەکان ئەزموونیان نەبوو، هەر ئەو ڕۆژە زانیان کاتێك ئەسپێکی عارەبانەکە دەکوژرێت، سەربازەکانی سەری بە چەقۆ ماڵبەندەکەی دەپسێنن تا بکەوێت و بە سێ ئەسپەکەی تر بەردەوام دەبوون لە جەنگ و ئەمەس بۆوە هۆی ئەوەی دوو دوو بچنە ژێر ئەسپەکان، چونکە یەك سەرباز یەك یا دوو ئەسپی دەکوشت و ئەگەر دوو سەرباز بووانە دەیانتوانی تەواوی ئەسپەکانی عارەبانەکە لەناو ببەن.

ئەو دەستە دوو کەسیانە کە خۆیان دەگەیاندە ژێر عارەبانەکان، پێشوازیان لە مردن دەکرد و لەوانە بوو پێش ئەوەی بە شمشێر یا خەنجەر ئەسپ یا ئەسپەکانی عارەبانەکان بکوژن، بۆ خۆیان بکوژرێن. عارەبانەکان زۆر بە خێرایی دەهاتن تا داسەکانیان بە هێزی زۆری خۆیان بتوانن خەرمانی بوونی سەربازەکانی دوژمن بدورنەوە و لەناویان ببەن. ئەگەر ئەسپەکان بە هێواشی هاتبان، هێزی داسەکان کەم دەبۆوە. جگە لەوە ئەسپەکانی عارەبانەکان ناڵیان هەبوو و ناڵیش وەك ئازونگ لە داهێنانەکانی ئێرانییەکان بوو.

کاتێك دوو خۆبەخشی مەرگ لە سەر ڕێگەی عارەبانەکان دەوەستان تا ئەسپەکانیان بکوژن، لەوانەبوو پێش ئەوەی بتوانن دەست بجووڵێنن، بە هۆی زەربەکانی سمی ئەسپەکان و ناڵەکانیان بمرن و زەربەیەکی سمی ئەسپ کە ناڵی هەبێت بۆ شکاندنی کاسکی سەری سەربازێك بەسە و پیاوانی سیت کە لە منداڵیەوە سوارکار بوون بە باشی ئەو بابەتەیان دەزانی و وێڕای ئەمەش خۆیان فیدا دەکرد.

خۆبەخشەکانی مەرگ لەو ڕۆژەدا توانیان ئەسپەکانی ژمارەیەك عارەبانە بکوژن و هەندێك لە ئەوان پێش ئەوەی سەرکەوتوو بن لە کوشتنی ئەسپێك، دەکوژران و ئەوانەش کە سەرکەوتوو بوون بە برینداری و شەکەتی هەستانەوە. چونکە سەربازانی هەخامەنشی دەیاندیت ئەو دوو

سەربازانە ئەسپەکان دەکوژن، لە عارەبانەکانیان دادەبەزین و پێش ئەوەی ئەوان لە ژێر قاچەکانی ئەسپەکان هەستنەوە، دەیانکوشتن.

خۆبەخشەکانی مەرگ نەیانتوانی هەموو عارەبانەکان تێك بشکێنن و دوای ئەوان بەشێك لە عارەبانەکان هەر بەردەوامبوون لە جووڵە، بەڵام ئەو کارە بوێرانەیەی ئەو هەزار پیاوە توانی بۆشایی بخاتە نێوان عارەبانەکان کە پێشتر لە پەنا یەکەوە دەهاتن و لە دوورەوە بە ئامێرێکی یەکپارچە دەچوو کە تایەی هەبوو و سەربازە سیتەکان لە هیچ لایەکەوە نەیاندەتوانی بیانشکێنن، تەنها لە پشتەوە نەبێت کە ئەویش لە لایەن هەخامەنشییەکانەوە گیرابوو و لێکدانەدەبڕان.

دوای لەکارکەوتنی بەشێك لە عارەبانەکان، پێویست بوو تا کوریلیۆسی فەرماندەی عارەبانەکان ئەوان رێك بخاتەوە و ریزیان بکاتەوە بە شێوەیەك کە بکەونەوە تەنیشت یەکتر، بەڵام چونکە ئەسپ سوارە سیتەکان گەیشتبوونە ناویان نەیتوانی عارەبانەکان بە شێوەیەك رێك بخاتەوە کە دیسان یەك ریزی لە تەنیش یەك بن. چونکە سوارە سیتەکان کەوتبوونە ناو عارەبانەکان، بە ئاسوودەیی و لە هەموو لایەکەوە کەوتنە کوشتنی ئەسپ و سەربازەکانی سەر عارەبانەکان و توانیان عارەبانەکانی تریش ڕابگرن و تەنانەت عارەبانەی کۆریلۆسیشیان لەکار خست و ئەسپەکانیان کوشت.

دوای ئەوەی عارەبانەکەی کۆریلۆس شکا، لە عارەبانە دابەزی و شمشێرە درێژەکەی خۆی لە کالانەکەی دەرکرد و بە دەستییەوە گرت و هەر سوارێکی سیت کە نزیك دەکەوتەوە، شمشێرەکەی لە سگی ئەسپەکەی رۆدەبرد یا دەستەکانی ئەسپەکەی بە شمشێر دەبڕیەوە تا سوارەکە دابەزێنێت و بە کەوتنی سوار لە ئەسپ، سوارەکە دووچاری شمشێری کۆرۆلیۆس دەبوو.

بەڵام ئەو لە چەند خولەکێك زیاتر نەیتوانی ئەو بەرگریە بکات و بە تیر و شمشیری سیتەکان کوژرا و تەرمەکەشی کەوتە بەر پێی ئەسپی سیتەکان و پان بۆوە. بەم شێوەیە کات رازین بە فیدا کردنی هەزار پیاو، توانی رێگە لە عارەبانەکان بگرێت. کاتێك داریوش بینی هێرشی عارەبانەکان بێ سوود بوو، بۆ ئەوەی پاشماوەی عارەبانەکان لەناو نەچن، فەرمانیدا ئەو عارەبانانەی لە جووڵەدا بوون، پاشەکشە بکەن، بەڵام لە کاتی پاشەکشەدا سیتەکان هەندێك لە ئەوانیشیان شکاندن و کات رازین کە دیتی مەترسی عارەبانەکان نەما، فەرمانیدا تا زۆر بە توندی هێرش بکەنە سەر لەشکری داریوش.

وەك باسمانكرد داریوش ئەسپ سوارەكانی خۆی بە یەدەگ دانابوو، لە سەردەمی ئەو و خەشایاری كوریدا ئەسپ سوارەكانی هەخامەنشی دووجۆر بوون، یەكەمیان ئەسپ سوار بە چەكی سووك و ئەوەی تر ئەسپ سوار بە چەكی قورس، جۆری دووەم خۆیان و ئەسپەكانیان قەلغانیان لەبەر بوو.

سوارەكانی داریوش هەموو جۆرە چەكی ئەوكات تەنانەت بەردهاوێژیان هەبوو و سوارە قەلغان لەبەرەكان، گورزیشیان پێبوو و گورزەكە بریتی بوو لە پارچەیەك قەلای درێژ وەك داری دەستی، بەلام سێیەكی یەكەمی ئەویان بە شێوەیەك باریك و پوخت دەكرد كە دەستی سەرباز لە بەكار هێنانی ئاسوودە بێت و سەرەكەی تری ئەستوور و چەند كەلوویەكی لە شێوەی سێوی هەبوو.

هەرچەندە گورز قورس نەبوو، بەلام مەترسیدار بوو و كاتێك بەر كەسێك دەكەوت، چیتر ئەو كەسە جەنگی پێ نەدەكرا. ئەسپی جۆری دووەم بە هۆی ئەوەی باریان قورستر بوو، لەو ئەسپانە دیاری دەكران كە لە لەوەرگەكانی زێی جەیحوون كە دەكەوتە رۆژهەلاتی دەریای خەزەر پەروەردەدەكران[٦]، ئەو ئەسپانە هیكەلیان گەورە بوو، لاق و دەستیان درێژ و هەناسەیان زۆر باش بوو.[٧]

لە گەڵ هێرشی تازەی سیتەكان، گاومەن فەرماندەی ئەو بەشەی هێزی دەریایی هات و هەموو سەربازەكان و ئەوانەی دەیانتوانی بجەنگن، تەنانەت سەڵبەچییەكانیشی هێنابوو و پێی وتبوون ئەگەر هێرشی سیتەكان بوەستێنن، سێ مانگ مۆڵەتی بە مووچەیان دەبێت و بۆ هەر مانگێك، پێنج سیكلوو واتە سككەی زیو وەردەگرێت و سێ مانگ مۆڵەت و پازدە سیكلو زێر بۆ ئەوان بەخششێك بوو كە تەنانەت لە جیهانی خەیاڵیش بۆیان بەدی نەدەهات.

سەڵبەچییەكان پیاوگەلێكی ئازا و زبر بوون و بە هۆی سەڵبەلێدانی بەردەوام، ببوونە خاوەنی بازووی بەهێز و سینگی پان و هیچیان لاواز و بێ توانا نەبوون، سەڵبەلێدان یەكێكە لە باشترین وەرزشەكان بۆ بەهێزكردنی جەستە. سەڵبەچی بێ توانا و لاواز نەبوو، چونكە سەڵبەچی بێ توانا لە یەكەم هەفتەی كارەكەیدا دەكەوت و لە بەر قورسی كارەكەی دەمرد.

ئەوكات لە ئێران نەریتی كۆیلەیی نەبوو و ئێرانییەكان نەتەوەیەك بوون كە نە كۆیلەیان دەكڕی و نە دەیانفرۆشت و تەنها ئەو كەسانەی تاوانبار بوون و خەڵكی شوێنە ژێر دەستەكانی هەخامەنشی بوون، بە كۆیلە دەكران. لە كاتی باسكردنی كەتزیاسدا وتمان ئەو وتوویەتی لە

(٦) (زێی جەیحون لە كۆندا دەڕژایە ناو دەریای خەزەر و لە ڕێرەوی ئەو زێیە لە دەشتەكانی توركەمەنستاندا، لەوەرگەی زۆر هەبوو، زەبیحوڵڵا.)

(٧) (ئێستا ڕەگەزی ئەو ئەسپانە بە كۆكلانی ناسراون، زەبیحوڵڵا.)

تەواوی ئەو ماوەی لە ئێران ژیاوە، دزی و کوشتنی نەدیتووە تا بێنە لای دادوەر و ئەویش سزایان بدات.

بەڵام ئەو نەتەوانەی ژێر دەستەی ئێران بوون، پیاوکوژ و دزیان تێدا بوو و سزاکەشیان ئەوە بوو کە بکرێنە سەڵبەچی لە کەشتییەکان. جگە لە تاوانباران، لە نێوان خەلکی ناوچەکانی (صور و صەیدا لە فنیقیە، کیلیکیە و ئایدن و ئەنتاکیە لە ئاسیای بچووك و جەزیرەکانی قوبرس و روودس) کۆمەڵێك پیاوی ئازا وەك سەرباز بۆ کەشتییەکان هەڵدەبژێردران، ئەوان لە خزمەت پاشای هەخامەنشیدا بوون و جگە لە مووچەی مانگانە و خواردنیان نەبوو و لە نێوان ئەو وڵاتانەی ئەوکات هێزی دەریاییان هەبوو وەك (یۆنان، فنیفیە، کارتاژ و میسر) بەهێزترین پیاوان بوون.

گاومەن ئەو رۆژە لەگەڵ پیاوانێك بوو لە ناوچەی کیلیکیە و ئایدین و انتاکیە و صۆر و صەیدا و قوبرس و هەموو ئەو سەڵبەچیانەی کە ئازادی کردبوون تا لەگەڵ سیتەکان بجەنگن، بۆ یارمەتی داریوش رۆیشت. هەر سەڵبەچییەك شمشێرەکی پێدرا بوو کە بە کەمەریەوە بوو و سەڵبەکانی خۆیان پێبوو. جەنگاوەرەکانی تریش بە هەموو جۆرەکانی چەك و بە تایبەتی تیر کە چەکی کارای جەنگە دەریاییەکان بوو هاتنە مەیدانی جەنگ.

دووچاری سەرسوڕمان دەبین کە گاومەنی فەرماندەی بەشێك لە هێزی دەریایی چوون سەڵبەچییەکانی بۆ جەنگ هێنا، چونکە بە بەرچاوی ئێمە سەڵبە تەنها پارچە دارێکە و زیاتر نییە، بەڵام ئەو سەڵبانەی بە دەست ئەوان بوو بۆ پێشگیری لە تێپەڕبوونی سەربازە سیتەکان وەك دیوارێك تێنەپەر وابوو.

گاومەن سەڵبەکانی هێنابوون تا لە رێگەیانەوە رێ لە هێرشی سیتەکان بگرێت، هەر سەڵبەیەك لە جۆری ریزی سێ هەم درێژایی (١٦) مەتر بوو و دەسکەکەیان ئەوەندە ئەستوور بوون کە بە شمشێر و تەور نەدەبڕدران و تەنها ئەگەر چەند زەربەیەکی لەسەر یەك بەر شوێنێکی کەوتبایە، ئەوا دەشکا.

بە فەرمانی گاومەن سەڵبەچییەکان دەبوایە سەڵبەکانیان بەرانبەر سیتەکان ڕابگرن تا رێگە لە تێپەڕبوونیان بگرن و کەمانچی و تەورچی و شمشێروەشێنەکانی کلیکی و ئایدن و ئەنتاکیە و... هتدیش بە شمشێر و تیر و تەورەکانیان بیانپارێزن و نەهێڵن سوارەکانی سیت بیانکوژن، گاومەن خۆشی بڕیاریدا لە گەڵ هەندێ پیاوی ئازا و بەهێز لە کەناری دەریا واتە لە رۆژهەڵاتەوە هێرش بکاتە سەر سیتەکان تا رێگە لە پێشرەوی ئەوان بگرێت.

ئەو سەڵبەچیانەی بە سەڵبەکانیانەوە پێشیان بە سوارە سیتەکان گرتبوو، نەتەنها لە ئەو سوارانە نەدەترسان، بەڵکو لە ئەژدیهای ناو ئەفسانەکانیش نەدەترسان و لە جیهانی کۆن پیاوگەلێکی ڕەق و بەهێزتر و بێبەزەیی و ئازاتر لە سەڵبەچییەکان نەبوو و سەرۆك و بەرێوەبەرانی کەشتییەکان ناچاربوون بە توندی و رێککاری زۆرەوە ئیدارەیان بدەن و ئەو رێکوپێکیەی لە هێزی دەریایی لە ئێستادا هەیە، میراتی ئەو سەردەمەیەکە ئەو سەڵبەلێدەرانەی تێدابوون.

سەڵبەچییەکان بە سەڵبەکانیان پێشیان بە سوارە سیتەکان گرتبوو و نە لە خۆیان و نە لە ئەسپەکانیان نەدەترسان. ئەسپ سوارە سیتییەکان بە خێرایی دەهات و کاتێك بەر سەڵبەکان دەکەوتن، لە ئەسپەکانیان بەردەبوونەوە و هەندێکیان هەردوو دەستیان دەشکا و ئەوکات لە لایەن جەنگکەرێکی ئەنتاکی یا کلیکی بە تەنها بە یەك زەربەی شمشێر یا تەور دەکوژرا.

گاومەن قەلغانی لەبەر بوو، ڕانەکان و باسکەکانی بە ئاسن داپۆشی بوو و کاسکی لەسەر بوو، لە گەڵ پیاوانی ئازا لە رۆژهەڵاتەوە هاتە ناو مەیدانی جەنگ و بە نێزە و تیر رێگای بەرەو رۆژئاوا بۆ خۆی دەکردەوە.

هەندێکات هەندێ لە پیاوەکانی دەکەوتن، بەڵام ئەوانی تر لە دوایانەوە دەهاتن و ئەویش بە نەعرەتەیەك کە لە مەیدانی جەنگدا دەنگی دەدایەوە، پیاوە ئازاکانی خۆی دەدواند و دەیوت ئەی کورانی ئایدین و ئەی قارەمانانی کلیکی چ دەکەن و بۆ من ئێوە نابینم؟ مەگەر نابینن کە رۆژی جەنگ و لە خۆ بۆردەبیە و نازانن پیاو هەروەك چوون یەکجار لە دایك دەبێت، هەرچی رووبدات زیاتر لە یەکجار نامرێت.

هاوکات لە گەڵ سەڵبەچییەکان کە لە پێناو سێ مانگ مۆڵەت و مووچەی سێ مانگ واتە پازدە سککەی زیو، بی ترس لە مردن دەجەنگان. پیادەکانیش بەردەوامبوون لە جەنگ و تەنانەت هێزی یەدەگی داریوشیش کەوتنە جەنگکردن بۆ ڕاگرتنی سیتەکان، ئەسپ سوارەکانی داریوش چوونە پشت سوارە سیتەکان و لە پشتەوە هێرشیان کردە سەر سوارە سیتەکان و چی نەمابوو کە کات رازین ئەسیر بکەن، بەڵام ئەو توانی لەگەڵ دەوروبەرەکەی دەرباز ببێت و لە جەنگەکە بە سەلامەتی دەربچێت.

پاشای سیت ئەوەندە بە خێرایی لە جەنگگە دەرچوو کە نەیتوانی فەرمان بە سەربازەکانی بدات کە چ بکەن، بۆیە سیتەکان سست بوون و کاتێك دیتیان لە پێشەوە و لە دواوە

کەوتوونەتە بەر هێرش، پێیان باشتر بوو کە پاشەکشە بکەن و هێشتا هەتاو نەگەیشتبۆوە رۆئاوا، جەنگ لە ناوچەی سۆڵدا کۆتایی پێهات.

بەڵام داریوش لە پەلاماری دووبارەی سیتەکان بۆ سەر لەشکرەکەی دەترسا، بۆیە وێڕای ماندوویەتی زۆری لەشکرەکەی، رێگەی خەوتنی لە سەربازەکان گرت و ئەو دووجەنگە واتە (کیری لارك و سۆڵدا) بە داریوشی سەلماند کە رووبەرووی بەهێزترین دوژمن بووتەوە کە تا ئەو کات جەنگی لەگەڵ کردبێت. هەر چەندە ئەو رۆژە داریوش سەرکەوت، بەڵام لەشکری سیت لەناو نەچووبوو و تەنها پاشەکشەی کردبوو، کات رازین پاشای ئەو وڵاتە لە ناو نیشتیمانی خۆی بوو و دەیتوانی بە زوویی خۆی رێك بخاتەوە و دووبارە هێرشیان بکاتە سەر.

بە هۆی ئەو زەربە توندەی بەر لەشکرەکەی کەوتبوو، داریوش تا ناوچەی کیری لارك پاشەکشەی کرد و چاوەروانی هێزی یارمەتیدەری کرد. هەڵبژاردنی ئەو ناوچەیە دەگەڕایەوە بۆ ئەوەی لەو شوێنە ئەسپ سوارە سیتەکان نەیاندەتوانی بە تەواوەتی خۆیان نیشان بدەن. داریوش لە کیری لارك ئۆردووگایەکی پتەوی سەربازی دامەزراند و رێگەی دەریا و باشووری بۆ پەیوەندی بە دەرەوە هێشتەوە.

دوژمن نەیدەتوانی بێتە ناو ئۆردووگاکە، چونکە لە لای دەریا لەبەر کەشتییەکان ئەمە نەدەکرا و لە باشووریش رێگە نەبوو، تەنها دەبوایە بە دەورەی گردەکاندا بسورێنەوە و پاسەوانەکانی لەشکری داریوش کە رۆژ و شەو لەسەر گردەکان بوون، دەیاندیتن و لە جووڵەی ئەوان ئاگادار دەبوون و سیتەکان نەیاندەتوانی لەپڕ هێرشیان بکەنە سەر.

داریوش ماوەی چل رۆژ لەو شوێنە مایەوە تا لە ئاسیای بچووك و یۆنانەوە یارمەتی بۆ هات. ئەوکات وێڕای شارە یۆنانییەکانی ئاسیای بچووك، شارەکانی تری یۆنان و لەوانە ئێسپارتییەکانیش یارمەتی داریوشیان دەدا.

## جەنگ لە نیشتیمانی سیتەکان و لە کەناری دانووب

ئەوکاتەی داریوش لە کیری لارك چاوەڕوانی هاتنی هێزی یارمەتیدەر بوو، گاومەنی نارد تا زانیاری تەواوی بۆ وەربگرێت لە بارەی وڵاتی سیتەکان لە ڕێگەی کەنارەکانی رۆژئاوا و باکووری رۆژئاوای دەریای ڕەش.

گاومەن دوای گەڕانەوە لە سەفەرەکەی بە داریوشی یەکەمی ڕاگەیاند: لە باکووری رۆژئاوای ئەو دەریایە زێیێکی زۆر گەورە هەیە کە لە هەموو دنیا لەو گەورەتری لێ نییە و لە کەنارەکانی زێیەکە سەدان هەزار گای وەحشی و مامز دەڵەوەرێن، کاتێك بە کەشتی گەیشتینە ناوەندی زێیەکە، هەر هەستمان دەکرد لە دەریادا دەڕۆین.

لە کەناری زێیەکە ئەوەندە گای وەحشی و مامزمان بینی کە لە ژمارە بەدەر بوو و گایە وەحشییەکان هەروەك شێر یاڵیان هەبوو و مامزەکانیش ژمارەیان ئەوەندە زۆر بوو کە کاتێك لە دوورەوە قوچی ئەوانمان دەدیت، واماندەزانی جەنگەڵە و لەگەڵ ئەوەشدا دانیشتوانی ئەوێ دەیانگووت کە لەو وەرزەدا قۆچی مامزەکان بە تەواوەتی گەورە نەبوونە و زستانان گەورەتر دەبن و درێژیان دەگاتە چەند زەرع.

لە دانیشتوانی ئەو شوێنەمان بیست کە ئەو زێیە بە (ئایس تەر) ناسراوە و ئەوەندە درێژە کە بە دەیان وڵاتدا دەڕوات و زیاتر لە سەد زێ کە هەندێکیان بۆ کەشتیوانی دەشێن، دەڕژێنە ناو ئەو زێیە و ماسیش لەو زێیە ئەوەندە زۆرە کە هەرچەندە ڕاو بکرێت کۆتایی نایەت.

هەروەها گاومەن بە داریوشی وت بە درێژایی ئەوکاتەی لە زێی ئایس تەر دەڕۆیشتین هیچ کەسێکی سیتمان نەدیت و دەردەکەوێت (کات رازین) پاشای سیت، بۆ جەنگی ئێمە هەموو سوارەکانی خۆی هێناوەتە باشوور و ناوەندی وڵاتەکەی کە بریتییە لە زێی ئایس تەر بێ پارێزگاری ماوەتەوە.

داریوش وتی: ئایا دەتەوێت پێم بڵێیت، دەتواندرێت هێرش بکرێتە سەر ناوەندی وڵاتی سیتەکان؟

گاومەن وتی: بەڵی ئەی پاشای گەورە، ئێمە ئەگەر هێرش بکەین دەتوانین بە بێ گرفت ناوەندی وڵاتی سیتەکان داگیر بکەین.

داریوش وتی: بۆ گەیشتن بە زێی ئایس تەر دەبێت لەشکری سیتەکان لەسەر ڕێگەمان لابدەین، ئێمە دوو جار لەگەڵ لەشکری ئەواندا جەنگاین و لەو دوو جەنگەدا بۆمان دەرکەوت کە خەڵکانێکی زۆر ئازا و بوێرن و بە ئاسانی ناتواندرێت ئەوان لەناو ببرێن.

گاومەن وتی: ناچار نین لە ڕێگەی وشکانییەوە خۆمان بگەیێنین بە زێی ئایس تەر، بەڵکو بە ڕێگەی دەریادا دەڕۆین و لەشکری سیت ناکەونە سەر ڕێگەمان.

داریوش وتی: بەڵام کەشتییە جەنگییەکانیان دەکەونە سەر ڕێگەمان.

گاومەن وتی: ئێمە بە درێژایی ئەوکاتەی بەرەو باکوور و باکووری ڕۆژئاوا دەڕۆیشتین و تەنانەت لە کاتی گەڕانەوەشماندا، یەك کەشتی سیتەکانمان نەدیت و من دڵنیام لە شوێنی تریش ئەوان نابینین، چونکە فەرماندەی دەریایی (هیست ئەسپ) هەموو کەشتییەکانی ئەوانی لە دەریادا لەناو بردووە.

دوو ڕۆژ دوای ئەو ڕاپۆرتە هیست ئەسپ کە دەریای ڕەشی جێ هێشت بوو، گەیشتە کیری لارك و هەواڵی بە داریووش گەیاند کە لە دەریادا چیتر کەشتی سیتەکانی لێ نەماوە، ئەویش سەبارەت بە زێی ئایس تەر کە بەشێك لەو زێیەی دیت بوو، هەندێ شتی تازەی باسکرد و وتی: دانیشتوانی هەر دوو لای زێیەکە کشتوکاڵ ناکەن و نازانن چۆن دەکرێت، چونکە پێویستیان پێ نییە و ئەوەندە گا و مامز و ماسی هەیە، کە پێویستیان بە دانەوێڵەکان نییە، لەو شوێنە خەڵك خانوویان نییە و لە وەرزەکانی هاوین و زستان لەو خانوانەدا کە هەمووساڵێك دروستیان دەکەن، دەژین.

دەریاسالار هیست ئەسپ وتی کە ئەویش لە ناوچەی ئایس تەر کەسی لە سیتەکان نەبینیوە.

داریوش وتی ئایا دەکرێت لە ڕێگەی دەریاوە لەشکرەکەمان بگاتە ئایس تەر.

هیست ئەسپ وتی: بەڵێن دەدەم لەشکری پاشای گەورەی هەخامەنشی بەبێ هیچ زەرەر و زیانێك لە دەریا تێپەڕدەبێت و دەگاتە زێی ئایس تەر.

داریوش وتی: بەڵام پێویستە بزانین کاتێك گەیشتینە ئەو زێیە، دەتوانین لە کەنارەکانی نیشتەجێ ببین.

گاومەن وتی: ئەی پاشای من، لەشکر پێویستی بە خواردەمەنی و ئاو هەیە و لە کەنارەکانی ئەو زێیە ئەوەندە مامز و گا و ماسی دەست دەکەوێت کە ئەگەر ژمارەی لەشکری پاشاکەمان دە ئەوەندەی ژمارەی ئێستا بێت، دووچاری کەمی خواردەمەنی نابین و ئاویش لەو زێیە و لە لقەکانی ئەوەندە زۆرە کە دەتواندرێت هەرچەندی سەرباز و ئەسپی هەیە لە ئەوێ ئاو بدرێن.

داریوش تێگەیشت کە ئەگەر بە رێگەی دەریادا لەشکرەکەی بباتە زێی ئایس تەر و لە ناوەندی وڵاتی سیتەکانی دابنێت، پاشای سیت ناتوانێت لەشکری ئەوان لەناو ببات و لە خۆبەدەستەوەدان زیاتر هیچ چارەیەکی نامێنێت و داریوش ئەو بابەتەی لە وتەکانی هیست ئەسپ و گاومەن بۆ دەرکەوت.

ئەو دوو کەسە دەیانووت بە هۆی لەناو چوونی کەشتییەکانی سیتەکان، نەتەنیا دەسەڵات لە دەریای ڕەش، بەڵکو لە زێی ئایس تەریش بە دەست هێزی دەریایی هەخامەنشییەوەیە و ئەگەر گریمانی ئەوە هەبێت کە کات ڕازینی پاشای سیت بتوانێت لە وڵاتی خۆیدا بە رادەیەك گوشار بخاتە سەر لەشکری داریوش کە پاشای ئێران ناچار بە گەرانەوە ببێت، ئەوکات ئەوان دەتوانن بە بێ مەترسی و لە رێگەی زێی ئایس تەر و دەریای ڕەش بگەڕێنەوە.

ئەو نەخشەی گاومەن ئەفسەری پلەبەرزی لەشکری هەخامەنشی پێشنیار و هیست ئەسپ پەسەندی کرد و داریوش بڕیاریدا جێ بەجێ بکرێت، لە دیارترین نەخشە جەنگییەکانی دنیا هەژمار دەکرا و دوای داریوش هیچ کەس نەیتوانی هاوشێوەی بکات، تەنانەت ئانی باڵی سەرداری کارتاژ کە دوو سەد ساڵ دواتر ویستی لەنەکاو هێرش بکاتە سەر رۆمەکان و لە پشتەوە لێیان بدات، نەیتوانی وەك داریوش بە تەواوەتی سەرکەوتوو بێت.

کاتێك ئانی باڵ لەشکری خۆی لە ئەفریقا خستەرێ و بە گەرووی جەبل تارقدا تێپەڕبوو و لە رێگای ئیسپانیا و فەرەنسا و باکووری ئیتاڵیا گەیشتە رۆم، لە رۆم لەشکری ئامادە بۆ جەنگی ئەو هەبوو، بەڵام داریوش کە هێزی یارمەتیدەری لە ئاسیای بچووك پێگەیشت و لە کیری لارك سواری کەشتییەکانیان بوون و بەرەو ئایس تەر کەوتەرێ و بێ مەترسی چۆوە ناو ناوچەی زێی دانووب، تەنانەت یەك سەربازی سیت لەو شوێنە نەبوو کە بەرگری لە پێش بکات.

هەموو ئەسپ سوارە سیتەکان لە سنوورەکانی باشووری وڵاتەکەیان چاوەڕوانی هاتنی لەشکری ئێران بوون، بەڵام لەشکری داریوش هەموو سوارەکانی کات رازینی لە ئەوێ جێ

هێشت و خۆی گەیاندە ناوچەی دانووب و چوونە ناوەندی وڵاتی سیتەکان، کات ڕازین ئاگاداری نەبوو کە داریوش گەیشتووتە پشت ئەو و ناوەندی وڵاتەکەی داگیرکردووە، چونکە کەشتی نەبوو تا لە دەریاوە هەوڵی دۆزینەوەیان بدات.

ئەفسەرە ئێرانییەکان کاتێك لەشکرەکەیان سواری کەشتی کرد وکیری لارکیان بەجێ هێشت، ئەوەندە لە کەنارەکانی رۆژئاوای دەریای ڕەش دوور کەوتنەوە کە پاسەوانەکانی کات ڕازین نەیانبینن و نەزانن لە دەریادا بەرەو کوێ دەڕوون.

داریوش بۆ خافلاندنی دوژمن، ئۆردووگای مەزنی خۆی لە کیری لارك وەك خۆی بەجێ هێشت تا سیتەکان وابزانن لەشکری داریوش هێشتا لە ئەوێن، بەڵام پێداویستییە جەنگییەکانیان لە ئۆردووگاوە بۆ ناو کەشتییەکان گواستەوە، پاسەوانە سیتەکان بەردەوامبوون لە چاودێری خێوەتگای داریوشیان کە لە ئەوێ مابوو و تەنانەت رۆژانە دووکەڵی ئاگریان دەدیت و وایاندەزانی سەربازەکانی داریوش خواردن ئامادەدەکەن، کات ڕازین پاشای سیت کاتێك زانی ئەوان رۆیشتوون کە داریوش لەشکرەکەی لە باشووری دانووب دادەبەزاند.

رۆژێك کە داریوش لەشکرەکەی سواری کەشتییەکان کرد، وایدەزانی دەتوانێت بە ئاسانی لەشکرەکەی لە دەمی زێیەکە دابەزێنێت، بەڵام کاتێك گەیشتە دەمی زێیەکە، هەرچەندە کەمێك لە هاوین تێپەڕ ببوو، بەڵام دەرکەوت هەڵکشانی ئەو زێیە تازە دەستی پێکردووە.

ئێستا وەك تەواوی زێیەکانی تر، ئاوی دانووب لە بەهارا زیاد دەکات و دووچاری هەڵکشان دێت، بەڵام بیست و پێنج سەدە پێش ئێستا ئەو زێیە لە هاویندا سەرکێشی دەکرد، چونکە بەفرەکانی بەستەڵەکی جەمسەری باکوور کە لقەکانی ئەو زێیەیان تێرئاو دەکرد لە وەرزی هاویندا دەتوانەوە و و بیست و پێنج سەدە پێش ئێستا تەنها ماوەیەك بەسەر توانەوەی بەفرەکانی جەمسەری باکووردا تێدەپەری و ئەوکات ئاژەڵە رووەك خۆرەکان فراوان بوون و تەنانەت ئەو مامزەی بە مامزی جەمسەری باکوور ناسراوە لەو شوێنانە و لە باکووری دەسەڵاتی هەخامەنشیش هەبوو.

هەڵکشانی ئاوی دانووب، رێگر بوو لەبەردەمی داریوش بۆ دابەزاندنی لەشکرەکەی لە یەکێك لە لقەکانی دانووبەوە، بۆیە داریوش پێش ئەوەی بگاتە دانووب ناچاربوو کە لەشکرەکەی لە باشووری زێیەکە و لە کەناری دەریا دابەزێنێت، کاتێك لەشکر لە کەنارەکانی دەریا دابەزی وەك ئەوە وابوو کە هاتبن بۆ وڵاتێکی دۆست، چونکە کەس بۆ جەنگی ئەوان

نەهات و داریوش دوای سێ رۆژ لە ناوچەیەك بە ناوی (ژێتا) یا (گێتا) کە سێ فەرسەنگ لە زێی دانووب دوور بوو، خێوەتگای خۆی دانا.

هەروەك گاومەن وتی لەو شوێنەی داریوش خێوەتگای خۆی دانا، بۆ خواردەمەنی نەکەوتنە کێشە و ئەوەندەی ویستبایان گا و مامزیان دەست دەکەوت. بەڵام زێی دانووب کەوتبۆوە نێوان ئەوان و وڵاتی سیتەکان، داریوش بە هۆی هەڵکشانی ئاو نەیدەتوانی بپەڕێتەوە و بگاتە کەنارەکانی باکووری دانووب، کەشتییەکانیش لە کەنارەکانی (ژێتا) بەجێ مان و لە ئەوێوە پاسەوانی لەشکری داریوش بوون.

ئەگەر کات ڕازین زانیبای داریوش لە ناوەندی وڵاتەکەی نزیك دەبێتەوە، دەگەڕایەوە و بۆ ئەو کێشەی دروست دەکرد، بۆیە دەبوایە داریوش لە ئاو بپەڕێتەوە تا وەك هەردوو جاری پێشوو سیتەکان بۆیان نەبنە مەترسی و هێرشیان نەکەنە سەر.

داریوش دوو مەبەستی لە گرتنی ئەو وڵاتە هەبوو، یەکەمیان وێرانکردنی شارەکانی و ئەوەی تریان بە کۆیلە کردنی خەڵکانی ئەوێ و بردنیان وەك بارمتە، تا ڕێگر بێت لە دووبارە چەتەیی کردنی ئەوان لە وشکانی و دەریاکان. بنەماکانی ئاکار لەمڕۆدا وێرانکردنی شارەکان ڕەت دەکەنەوە، بەڵام ئەوکات ئەوە بەشێك بوو لە کاروباری جەنگ.

داریوش لەوە تێگەیشت کە بۆ پەڕینەوە لە دانووب تەنها ڕێگە دروستکردنی پردە، بەڵام ئەو کارە لەسەر زێی دانووب زۆر جیاواز بوو لە سەر گەرووی بۆسفۆر، چونکە لە بۆسفۆر ئاو هێواش و لەسەر خۆ بوو و لە دانووب ئاوەکە زۆر بە تەوژم بوو. مندرۆکێلسی ئەندازیاری یۆنانیش لای پاشا نەبوو تا ئەو کارەی بۆ بکات و ئەگەر ناردبایان بە دوای ئەویشدا، کات درەنگ دەبوو. مندرۆکێلس پارێزگاری پردی بۆسفۆر بوو و دەبوایە پارێزگاری لە پردی بۆسفۆر بکات تا ئەوکاتەی لەشکری داریوش دەگەڕێتەوە، تا بتوانن بە ئاسانی لەوێ بپەڕنەوە.

داریوش فەرمانیدا تا چەشنە گەمییێك دروست بکەن کە سەریان تەخت بێت و بە تەواوەتی سەرەکانیان بگرن تا هاتووچوو لەسەریان ئاسان بێت و گەمییەکان لە تەنیشت یەك دابنێن و ئەوکات لەسەر ئەوان پرد دروست بکەن، بەم شێوەیە لە سەریان بپەڕنەوە.

سەربازەکان بە فەرمانی پیشەوەرەکانی ناو لەشکر دەستیان کرد بە دروستکردنی گەمی تا پرد دروست بکەن و خێوەتگای داریوش لە ژێتا گۆڕا بە کارگەیەکی گەورەی دروستکردنی

گەمی و داریوشیش بە هۆی ئەوەی لە کاری دارتاشی شارەزا بوو، بۆ زیاتر هاندانی سەربازەکانی، جلوبەرگی سەربازی دانا و وەك سەربازەکانی خۆی دەستی بەکار کرد.[1]

شەوێك لەپڕ خێوەتگای داریوش لە ژێتا کەوتە بەر هێرش و بە پێی وتەی سۆئێتۆنی رۆمی، ئەو شەوە شەوی سەد و بیست و شەشەمی دوای بەهار بوو. ئەو کەسانەی ئەو شەوە هێرشیان کردە سەر ئۆردووگای داریوش لە ژێتا، لە باکووری زێی دانووب هاتبوون و بە بەلەمی بچووك و گەورە خۆیان دابۆوە دەست شەپۆلەکانی ئاو و تا بگەنە کەنارە باشووریەکان، لە نێوان ئەو تاقمەی ئەو شەوە هێرشیان کرد، کەسانی لاو زۆر کەم بوون و زۆربەیان بە تەمەن یا هەرزەکار بوون.

لاوەکان لە گەڵ پاشاکەیان رۆیشت بوون تا جەنگی داریوش بکەن و کاتێك بە تەمەنەکان زانیبوویان داریوش سەرگەرمی دروستکردنی گەمی و پردە، بڕیاریاندابوو زەربەیەکی توند لە ئەوان بدەن، ئەو هێرشە بۆ داریوش چاوەروان نەکراو نەبوو، بەڵام داریوش چاوەڕێ بوو ئەو هێرشە لە باشوورەوە بکرێتە سەری نەوەك لە باکوور و بیری دەکردەوە کە کات رازین بە لەشکرەکەیەوە دێت بۆ ئەو هێرشە.

بە داریوشیان ڕاگەیاندبوو کە لە ئەوبەری دانووب جگە لە هەندێ بە ساڵاچوو و ژن و منداڵ کە لە یۆرتەکاندا دەژین، کەسی لێ نییە و ئەوانیش مەترسی نین بۆ لەشکری ئەو، بەڵام دوای ئەو هێرشە دەرکەوت کە بوێری هەرزەکار و بە تەمەنەکانی سیت، کەمتر نییە لە بوێری لاوەکانیان. بەڵام ئەوان بە بێ ئەسپ هاتبوون، چونکە نەیاندەتوانی ئەسپەکان بە بەلەم بپەرێننەوە و بە هۆی خێرایی ئاوەکەش، ئەسپ هەرچەندە مەلەوانە بەڵام توانای پەرینەوەی نابێت و ئاو دەیبات، بۆیە بە بێ ئەسپ و کەمێك دوای دەستپێکی شەو هێرشیان کرد. ئەوان سەرەتا هێرشیان کردە سەر ئەوانەی لەبەر رووناکی گەمییان دروست دەکرد و هەندێك لەوانیان کوشت.

دوای ئەوەی هەندێك لە ئەو کەسانەیان کوشت کە سەرگەرمی کار بوون، بە هۆی ئەو دەنگ و هەرایەی دروستبوو و ئاگرکەوتنەوە لە هەندێ لە گەمییەکاندا، داریوش چەند دەستەیەکی گەورە لە

---

(١) (مێژوونووسەکانی رۆژئاوا وابیردەکەنەوە کە یەکەم کەس کە ئاموژگاری دەسەڵاتدار و خانەدانەکان دەکات کە جگە لە دەسەڵاتداری کارێکی تر فێر بن، (جان جاك رۆسۆ) فەیلەسوفی بەناو بانگ بووە کە لە پەرتووکی (ئەمیل) ئەو ئامۆژگارییەی داوە. بەڵام ئاگادار نەبوونە کە ئەو کارە لە ئێرانی کۆن، بەشێك بووە لە نەریت و هەموو شازادە و خانەدانەکان لە منداڵیدا دەبوایە پیشەیەك فێر بن. کوروشی دامەزرێنەری هەخامەنشییەکان ریختەگەر بوو و کەمبۆجییەی کوری شمشێری دروست دەکرد، داریوش دارتاش بوو و خەشایاریش زینی ئەسپی دەکرد و داریوشی سێ هەم دواپاشای هەخامەنشی کاسك (کلاو خوودە) ی دروست دەکرد، زەبیحوڵڵا)

سەربازانی نارد و سەربازانی داریوش لە سەرەتادا وایانزانی کەوتوونەتە بەر هێرشی سوارەکانی سیت، بەڵام دوای ئەوەی دیتیان کە دوژمنەکەیان پیادەیە و زۆرتر پیر و هەرزەکارن، بە بێ کێشەی زۆر توانیان بیانشکێنن و هەندێکیان لێ کوشتن و ئەوانی تریا ئەسیر کرد.

داریوش خۆی لە شوێنی جەنگ ئامادەبوو و ئەسیرەکانی خستەبەر لێکۆڵینەوە و تێگەیشت ئەوان لە یۆرتەکانی باکووری زێیەکە دادەنیشن و نازانن کات رازینی پاشایان لە کوێیە. هەرچەندە ئەو شەوە هێرشی ئەوان تێك شکا، بەڵام بە هۆی سوتاندنی هەندێ گەمی و کوشتنی ئەوانەی کاریان تێدا دەکردن، هەروەها سوتاندنی هەندێ لە کارگەکانی دروستکردنی گەمی، کاری بیناکردنی پردی سەر زێی دانووب کەمێك دواکەوت.

کاتێك (کات رازین) پاشای سیتەکان زانی لەشکری داریوش گەیشتووتە ناوەندی وڵاتەکەی کە ماوەیەك بەسەر دووەم بەشی دروستکردنی پردی داریوش لە ناوچەی ژێتا تێپەڕ دەبوو، چونکە یەکەم کاری پردسازییەکە بە هۆی هێرشی سیتەکانەوە تێکچوو.

مێژوونووسی رۆمی (سۆئێتۆن) دەڵێت ئەوکاتەی داریوش سەرگەرمی دروستکردنی پرد لە ناوچەی ژێتا بوو، هەندێ پیاو هاتن بۆ لای کە بەژنیان ئاسایی و چوار شانە بوون، جلوبەرگیان لە پێستە بوو و پرچیان زەرد و تا کەمەریان هاتبوو، سەمێڵیان درێژ بوو و ئەوان بە داریوشیان وت کە بە درێژایی تەمەنیان زەرەریان لە لایەن سیتەکانەوە پێگەیشتووە و ئێستا کە ئەو هاتووە بۆ جەنگی سیتەکان، ئەوان ئامادەن یارمەتی بدەن.

داریوش وتی ئەو یارمەتییەی دەتانەوێت بۆ منی بکەن، چییە؟

ئەوان وتیان ئەو شێوە پرد دروستکردنەی ئێوە باش نییە و کاتی زۆری دەوێت و لە زێیەکەشدا هیچ بوارێك بۆ پەرینەوە نییە، لە جیاتی گەمی دروست بکەن، باشتر وایە کە پێستەی گا بدوورن و بای تێبکەن و سەری دابخەن، دواتر بە سەمغ و ئاهەك دایانپۆشن تا ئاو نەچێتە ناویان، ئەوجار هەر دوودوو یا سێ سێ بەیەکەوەیان دابنێن و تەختەی پردیان بخەنە سەر تا سەربازەکانتان بەسەریاندا بپەرنەوە.

سەربازانی داریوش پێستەکانیان ئامادەکرد و خستیانە سەر ئاو، ئاوەکەش پێستەکانی برد. پیاوە موو زەردەکان خەلکانی زۆر سادە بوون، بۆیە بە دەنگ بە ئەوان پێکەنین. سەربازەکان سەرتا تورە بوون و ویستیان بیانکوژن، چونکە وایان بیرکردەوە کە گاڵتەیان پێکراوە، دواتر زانیان پێکەنینی ئەوان لە رووی دڵسافی و سادەییە.

ئەوان بە سەربازەکانیان وت پێستی با تێکراوی گا سووکە و ئاو دەیبات، پێویستە بە شەبەکەیەك لە پەت ببەسترێت و سەرێکی پەتەکە لە بەردێکی گەورە بخەن و بیخەنە ناو ئاو تا دەگاتە بنی زێ و ئەوکات لەسەر ئاو دەمێنێتەوە، ئەوان وتیان لە سەرتاسەری زێی دانووب پردەکان بەم شێوەیە دروست دەکرێن. دوای ئەوەی سەربازەکان ئامووژگاریەکەیان جێبە جێ کرد، دیتیان چیتر ئاو پێستەکان نابات و ئەوان دەتوانن زیاتر پێستە لە تەنیشت یەك دابنێن تا پردەکە پانتر بێت.

پیاوە مووزەردەکان لە نەتەوەی فرانکی بوون و یەکەمجار بوو ئێرانییەکان فرانکیەکان ببینن، بە ئامۆژگاری ئەوان کە دوژمنی سیتەکان بوون، پردەکە دروستکرا. مێژوونووسی رۆمی سۆئێتۆن دەڵێت لە رۆژی سەد و پەنجا و یەکەم لە دەسپێکی بەهاردا لەشکری داریوش پەڕییەوە و بە هۆی ئەوەی مەودا لە نێوان پێستەکاندا هەبوو، گوشاری ئاو هیچ زەرەری لە پردەکە نەدا.

داریوش دەیزانی پێویستە ژمارەی کەم لە سەربازان بە یەکەوە بپەرنەوە، چونکە ئەگەر هەموو بەیەکەوە بپەرنەوە ئەوا پردەکە توانای نابێت و نوقمی ئاو دەبێت و لەوانەیە لەیەك بپچڕێت.

ماوەی چەند رۆژ سەربازانی داریوش سەرەتا پیادەکان و دواتر ئەسپ سوارەکان پەرینەوە و گەیشتنە باکووری زێی دانووب و وڵاتی سیتەکان. لەو شوێنەوە ئەگەر لەشکری داریوش بەرەو رۆژئاوا رۆیشتبان، دەچوونە ناو هەندێ نەتەوە کە پێستەیان دەپۆشی و هیچ کامیان کشتوکاڵیان نەدەکرد و لە رێگەی ڕاو کردن و بە تایبەتی ڕاوی مامز و گا، ژیانیان بەسەر دەبرد و گۆشتی ئەو ئاژەڵانەیان دەخوارد و بە چەوریەکانیان لە شەواندا، ئاگریان بۆ رووناکی دەکردەوە.

ئەگەر کەسێك توانا و بوێری هەبوایە و زیاتر بەرەو رۆژئاوا چووبا و جەنگەڵ و زوونگاوەکانی بڕیبوایە، سەرەنجام دەگەیشتە ناوچەی (گیل) واتە فەرانسا و لەوێ خەڵکانێکی دەدیت کە شاد و بە کەیفن، چونکە ئەوان گەنمیان دەچاند و بەری جەنگەڵە گەورەکانی سێویان لێدەکردەوە و شەرابیان دروست دەکرد، لە ئەوێ جۆرە ترێیەك هەبوو کە تەنانەت لە پاییزیشدا ترش بوو و نەدەتواندرا شرابە لێ بەرهەم بێت.

بەڵام داریوش تەنها دەیەویست شارەکانی سیتەکان وێران بکات و لە ئەوێ بارمتە ببات پێش ئەوەی لەشکرەکەی بگەڕێنێتەوە. ئەو بیری کردەوە ئەو پردەی دروستی کردووە، تێکی بدات یا تا گەڕانەوەی بیهێڵێتەوە تا بەسەریدا بگەڕێتەوە. ئەو بیرۆکەیەشی لەوەوە بۆ هات کە دوای ئەوەی هەواڵ بە کات ڕازین بگات لە بارەی گەیشتنی بۆ وڵاتی ئەوان، ئەو بە پەلە دوای

دەکەوێت و کاتێك لە ناوچەی ژێتا پردێکی ئامادە دەبینێت، بە ئاسانی دەپەڕێتەوە و بە پێچەوانەوە کاتی دەوێت بۆ دروستکردنی پرد.

پیاوە فرانکیەکان وتیان: لێ بگەڕێ پردەکە لە شوێنی خۆی بێت، بۆ ئەوەی کاتی گەڕانەوەت ئەگەر وەرزی هەڵکشانی ئاو بێت دووبارە لێی دەپەڕییەوە.

داریوش وتی: بە باوەڕی من کات ڕازین بە دوا مندا دێت و لەبەر ئەو دەمەوێت پردەکە بروخێنم.

پیاوانی فرانکی وتیان: تا کات ڕازین دێت، ئاو کەم دەبێتەوە و ئەو دەتوانێت بە ئاسانی لە زێیەکە بپەڕێتەوە، ئەسپەکانی ئەو وەك هەر ئەسپێکی تر مەلە دەزانن و دەپەڕنەوە و بۆ کات ڕازین باشترە کە لە زێیەکە بپەڕێتەوە، چونکە دەتوانێت هەموو سوارەکانی بەیەکەوە بپەڕنەوە و بەڵام لە پردەکەوە تەنها ژمارەی کەم دەپەڕنەوە و کاتی زیاتری پێویستە.

هەرچەندە داریوش فەرماندە بوو، بەڵام ئەو بابەتەی بیر نەبوو کە لەشکرێکی جەنگی بە تایبەتی لە ناوچەی خۆی، لە وەرزی کەم بوونەوەی ئاو بۆ پەرینەوە لە زێ پێویستیان بە پرد نییە. کوروش لە وتەکانی دەڵێت هەر جەنگێك تایبەتمەندی هەیە و ناتواندرێت دووجەنگ یەك تایبەتمەندیان هەبێت، داریوش لەو ڕۆژە جارێکی تر ئەو وتەیەی ئەوی پشت ڕاست کردەوە و پردەکەی بەجێ هێشت و بەرەو ڕۆژهەڵات ڕۆیشت. چونکە بە ناوچەیەکدا دەڕۆیشت کە شارەزای نەبوو، هەندێ لە خەڵکی ناوچەکەی بە کرێ گرت و دوای یەك ڕۆژ لە ڕێگە بڕین، گەیشتە ناوچەیەکی زوونگاو کە تەنانەت لە وەرزی هاوین و لە ژێر سێبەری دارەکاندا، مێشولەی زۆری هەبوو و ڕێپێشاندەرەکان پێیان وت پێویستە بەردەوام ئاگری گەورە کە دووکەڵی زۆری هەبێت، بکەنەوە تا میشولەکان لێیان دوور بکەونەوە.

لەشکری داریوش ئەو شەوە بە هۆی ئاگر و دووکەڵ توانیان لەو شوێنە بمێننەوە و بەیانی زوو کەوتنەڕێ، ڕێپێشاندەرەکان پێیانووتن لەمەودوا دەبێت لەو شوێنانەوە بڕۆن کە گا و مامزیان پێدا ڕۆیشتوون، چونکە ئەوان سمیان باریکە و ئەگەر ئەوان ڕۆنەچن، ئەوا مرۆڤ و ئەسپەکانیش ڕۆناچن. بە پێی ڕێنمایی ئەوان دوای ئەوەی داریوش لەو شوێنە زوونگاویە دەپەڕییەوە، یەکەم شاری گەورەی سیتەکان دەکەوتە بەرچاویان و ئەو شارە لە ژمارەیەکی زۆر لە یۆرت دروستکرابوو.

لەشکری داریوش، دوای دەرچوون لەو ناوچەیە و بە هەمان شێوە کە ڕێپێشاندەرەکان وتبوویان، گەیشتە یەك لە شارە گەورەکانی سیتەکان، بەڵام ئەو شارە تەنانەت یەك خانووی

بەرد یا قوڕی تێدا نەبوو و تەنها لە یۆرتەکان پێکهاتبوو و هەرچەندە شارەکە لە ناوچەیەکی پڕ باران و بفر دروستکرابوو، بەڵام لە تەواوی وەرزی بارینیدا ئاو نەدەچۆوە ناو یۆرتەکان.

لەو شارە یەك کەس نەدەبینرا، تەنانەت ئاژەڵەکانیش و ئەمەش لە کاتێکدا بوو کە سیتەکان وێڕای ئەسپ و ئاژەڵە خۆماڵیەکان، سەگیشیان ڕادەگرت، بەڵام دوای هاتنی لەشکری داریوش تەنانەت دەنگی سەگێکیش نەدەهات.

ڕێپێشاندەران وتیان کە سیتەکان ڕۆیشتوون و یۆرتەکانیان بەجێ هێشتووە و ناتواندرێت بەدوایان بکەوین، چونکە بەدوا کەوتنیان لەناو جەنگەڵ و زوونگاوەکاندا، جگە لە بە فیڕۆدانی کات و بە کوشتدانی سەرباز، شتێکی تر نییە. یۆرتەکان بەتاڵ بوون و جگە لە هەندێ صندووقی گەورە کە بە پێی وتەی ڕێپێشاندەرەکان بۆ هەڵگرتنی خۆراك بەکار دەهاتن، شتێکی تری لێ نەبوو.

داریوش ویستی لەو ناوچە فێنکە خۆی و سەربازەکانی لە ناو یۆرتی سیتەکاندا بنوون، بەڵام ڕێ پێشاندەرەکان ڕێگر بوون لەو کارە و پێیان وت کە لە ناو یۆرتەکان جۆرە میشوولەیەکی ئازار بەخش هەیە کە دوای پێوەدان ئازاری زۆر دروست دەکات و سەربازەکانی نەخۆش دەکات.

ئەوان وتیان کە ئەو مێشوولەیە بە سیتەکانەوە نادات و لەوانەیە ئەوە بگەڕێتەوە بۆ بۆنی سیتەکان و بەو هۆیەشەوە میشوولەکە بە (غەریب گەز)[٢] ناسراوە. کۆکردنەوە و گواستنەوەی یۆرتەکان زۆر ئاسانە و سیتەکان بە ئەنقەست یۆرتەکانیان نەبردووە تا سەربازانتان لەوێدا بخەون و نەخۆش بکەون. ئەو شەوە داریوش فەرمانیدا کەس لە یۆرتەکاندا نەنوێت تا نەخۆش نەکەون.

ڕۆژی دواتر داریوش ئەو شارەی بەجێ هێشت کە هەموو دانیشتوانەکەی یۆرتەکان بوون، بێ ئەوەی هیچ سەربازێکی دووچاری گەستنی میشوولە ببێت و نەخۆش بکەون. ئەوکات بەرەو گەورەترین شاری نەتەوەی سیت ناسراو بە (گلۆنۆس) ڕۆیشت. لە ڕێگادا ژمارەیەکی زۆر یۆرتیان دیت، بەڵام سەربازەکان دەیانزانی لە بەر مەترسی گەستنی میشوولە نابێت لە ناویاندا

(٢) (ئەو مێژوونووسە یۆنانیانەی باسی ئەو ڕووداوە دەکەن، نەیانتوانیوە بڵێین ئەو مێشوولە هی چ ئاژەڵێك بووە و تەنیا ترسی بێگانەکان لە غەریب گەزیان بە سەرسورمانەوە باس کردووە، بەڵام ئێستا ئێمە دەزانیین کە پێوەدانی هەندێ میشوولە دانیشتوانی شوێنەکە ئازار نادات و هۆکەشی ئەوەیە کە لەگەڵ ئەو جۆرە میکرۆبە ڕاهاتوون کە ئەو مێشوولەیە بۆ جەستەی مرۆڤی دەگوازێتەوە، بەڵام ڕێبوارەکان بەو جۆرە میشوولانە نەخۆش دەکەون و هاوشێوەی ئەو بابەتە لە زۆر شوێنی تر جگە لە یۆرتەکانی سیتەکان هەیە، زەبیحوڵڵا.)

پشوو بدەن، چونکە یۆرتەکان بە رۆژیش نیمچە تاریك بوون و دەبوونە شوێنی مانەوەی مێشوولەکان.

داریوش زۆر بە ئەسپایی لەشکرەکەی دەجوولاند، هەرچەندە دەیزانی گەنجە سیتەکان لە گەڵ پاشاکەیان لە پشتیانەوە واتە لە ئەوبەری زێی دانووبن، بەڵام لەبەر مەترسی هێرشی سیتە بە تەمەن و هەرزەکارەکان خۆپارێزی دەکرد. بەردەوام لەشکرەکەی دەستەی پێشەنگ و پارێزەری لە پشتەوە و تەنیشتەکان هەبوو و بەڵام دوژمن لە هیچ شوێنێك دیار نەبوو. سەرەنجام بەیانی رۆژی سەد و شەست و پێنجەمی بەهار شاری (گلۆنۆس) دەرکەوت.

داریوش و سەربازەکانی بە دیتنی ئەو شارە دووچاری سەرسوڕمان هاتن، چونکە شارەکە باڵەخانەی بەرزی زۆری هەبوو و هەر باڵەخانەیەکیش بە ڕەنگێك بوو، داریوش پرسیاری لە رێپێشاندەرەکان کرد کە بۆ خانووەکانی ئەو شارە ئەوەندە بەرزن و بۆ هەریەکە بە ڕەنگێکن؟

ئەوان وتیان: ئەو شوێنەی ئێستا ئێمەی لێ وەستاوین، بەرزە و بەردەوام بای دێت، بەڵام شار وەك دیارە لە شوێنێکی نزمدایە و لە وەرزی ئێستادا کە هێشتا هەوا تا ڕادەیەك گەرمە، لەناو شار تەنها ئەو شوێنانەی بەرز بێت با دەیگرێتەوە، بۆیە باڵەخانەکان بەرز دروست دەکەن تا بتوانن لە نهۆمە بەرزەکان بە ئاسانی ژیان ببەنە سەر و فێنك ببنەوە.

داریوش پرسی: بۆ هەر باڵەخانەیەکیان بە ڕەنگێك بینا کردووە؟

رێپێشانەرەکان وتیان: لەو شارەدا هەر کەسێك باڵەخانەیەك بینا دەکات، بە رەنگی خێڵەکەی خۆی دەکات و هەر خێڵێك لەناو سیتەکان ڕەنگی خۆی هەیە.

وەك باسکرا ئەو شارە کەوتبۆوە شوێنێکی نزم و داریوش لە دوورەوە مەزەندەی کرد کە بۆ نیوەڕۆ دەگاتە شار، بەڵام چونکە دەبوایە لە جەنگەڵە پڕ دارەکان تێپەڕبووبان، لە کاتی رۆژئاوابووندا گەیشتن و وەك دەزاندرێت لە رۆژی سەد و شەست و پێنجەمی بەهار (واتە ناوەڕاستی مانگی کۆتایی هاوین) رۆژەکان کورتترن لە رۆژانی بەهار.داریوش بە هۆی رۆژئاوا بوون بە پەسەندی نەزانی لەشکرەکەی بچێتە ناوشار و فەرمانی کرد تا خێوەتگا ئامادەبکەن و ئەو شەوە لە ئەوێ بمێننەوە و رۆژی دواتر بچنە ناو شاری گلۆنۆس.

ئەو شەوە تا بەرەبەیان ئەوان چاوەڕێ بوون سیتەکان پەلاماریان بدەن، بەڵام هیچ رووینەدا و بەرە بەیانی رۆژی دواتر داریوش بەرەو شار کەوتە رێ و بە گەیشتنی بۆ دەروازەی شار لە لایەن دەستەیەك لە سوارانەوە هێرشی کرایەسەر. سەربازەکانی داریوش دیتیان کە ئافرەتانیش

شانبەشانی پیاوانی ساڵمەند و کوڕانی هەرزەکار هێرش دەکەنە سەریان و بە نێزە و تیر و شمشێر لێیان دەدەن و دیتیان شمشێری ئەوانیش وەك هی پیاوان ئەوان دەبڕێت.

بۆ داریوش و سەربازەکانی دۆخێکی چاوەڕوان نەکراو بوو و تا ئەوکات ئەوان جەنگیان لەگەڵ ئافرەتاندا نەکردبوو. ئێرانییەکانی پێش مێژوو ڕێزیان بۆ ئافرەت هەبووە و لە سەردەمێك کە گێرشمەن بە سێ هەزار ساڵی داناوە، ژنان گەورەی وڵات بوون و دەسەڵات و یاسایان لە دەستدا بووە.

جگە لەوە لە ئایینی زەردەشت کە ئەوان پەیرەوی بوون، ڕێزی تایبەت بۆ ئافرەت هەبوو. لەوانەیە ئەو ڕێزە هی ئەو قۆناغە بووبێت و چونکە پیاوانی ئێرانی ڕێزیان بۆ ئافرەتانی خۆیان هەبوو، ژنانی نەتەوەکانی تریش لایان بەڕێز بوون، ئەمەش لە لایەن تەواوی مێژوونووسانی کۆنی لیدی و یۆنانی و ڕۆمی پشتڕاست کراوەتەوە.

سەربازانی ئێرانی لە جەنگەکاندا پیاوانیان دەکوشت و شارەکانیان وێران دەکردن، تالانیان دەبرد و هەندێ کات دوای ماوەیەك لە مانەوەیان لەو شوێنەی داگیریان دەکرد، لە گەڵ ژنەکانیان هاوسەرگیریان دەکرد، بەڵام ڕووینەداوە دەست درێژیان کردبێتە سەر ژنان. ئەو ڕۆژە دۆخێکی تایبەت بوو بۆ لەشکری داریوش و نەیاندەزانی چ بکەن، ئەگەر جەنگیان بکردایە دەبوایە ژنەکان بکوژن و ئەگەرنا دەکوژران.

داریوش لە ڕێگەی ئەفسەرەکانەوە فەرمانی بە سەربازەکان کرد تا ئەسپی ژنەکان بکوژن و دوای ئەوە بیانگرن، بەڵام ئەمە کارێکی مەترسیدار بوو و ژنەکان بە ئاسانی نەدەگیران و تەنانەت سەربازەکانیان دەکوشت، دەبوایە سەربازەکانی داریوش بە تەکتیك و فێڵ ئەوان بگرن، بۆیە جەنگ تا نیوەڕۆ درێژەی کێشا و دوای نیوەڕۆ لەشکری داریوش چوونە ناو گەورەترین شاری سیتەکان.

ڕۆژی دواتر داریوش فەرمانی کرد تا شارەکە وێران بکەن و چونکە سیتەکان بێگاریان بۆ نەکردن، سەربازانی داریوش خۆیان بەو کارە هەستان و ئەو ڕۆژەی داریوش شارەکەی بەجێ هێشت، تەنانەت یەك خانووی تێدا نەمابوو و هەمووی وێران کرابوو.

مێژوونووسی ڕۆمی سۆئێتۆن دەڵێت هاوکات لەگەڵ وێرانکردنی شار، چەند بەرد هەڵکەنێك لە شاخێك لە ڕۆژهەڵاتی شار کە زۆر بەرز نەبوو، بۆ نەوەکانی داهاتوو هۆکاری وێرانکردنی شارەکەیان بە فەرمانی داریوش دەنووسی: (من بەرانبەر بە خۆیی و بیگانە زۆردار نیم، بەڵام دانیشتوانی ئەو وڵاتە زۆریان ستەم بەرانبەر بە خەڵکی وڵاتەکەم و ئەو وڵاتانە کرد کە لە ژێر دەسەڵاتی منن، بۆیە شارەکەیانم وێرانکرد.)

ووشەی (زۆرا)[٣] کە سۆئێتۆن لە داریوشەوە دیسان باسی کردووە، لە کەتیبەکانی هەخامەنشیدا بە مانای ستەم دێت و داریوش ئەو وشەیەی لە کەتیبەی تری هاوشێوە و بۆ نموونە لە کەتیبەی شاخی (گەرتا) لە ناوچەی (کانیاوەر) لە نزیك شاری بەمبەئی لە هند بەجێ هێشتووە، بەڵام کەتیبەی وڵاتی سیتەکان نەماوە و خەڵکی سیت دوای ڕۆیشتنی لەشکری داریوش کەتیبەکەیان لەناو برد.

دوای وێرانکردنی شاری گلۆنۆس، داریوش لە وڵاتی سیتەکان تا گەیشتنی بە دووەم شاری گەورەی سیتەکان کە ناوی (وەڵنی) بوو، دوچاری ڕووبەڕووبوونەوە نەبوو و کاتی گەیشتنی بەو شارەش نەتەنها کەس ڕووبەڕووی نەبۆوە، بەڵکو یەك کەسیش لە شارەکەدا نەمابوو و هەموو دانیشتوانەکەی شارەکەیان بەجێ هێشتبوو.

کاتژمێك دوای گەیشتنی لەشکری داریوش بۆ ئەو شارە، لە پڕ لە لایەکی شار ئاگر کەوتەوە و دووکەڵ بەرەو ئاسمان بەرز بۆوە، پێشتر داریوش سەرەنجی دابوو کە زۆربەی کەرەستەی بەکارهاتوو لە خانووەکانی شارەکە لە دار پێکهاتووە و بۆیە فەرمانی کرد بە زوویی ئاگرەکە بکوژێننەوە تا ئاگر شوێنەکانی تری شار نەگرێتەوە.

بەڵام زۆری نەخایاند کە لە شوێنی تر و دواتر لە هەموو لایەکی شار ئاگر کەوتەوە و دووکەڵ پەیدا بوو. داریوش بڕیاریدا بوو ئەو شارەش وەك شاری گلۆنۆس وێران بکات، بەڵام پێش وێرانکردنی بۆ پشوودانی سەربازەکانی دەیویست ماوەی سێ ڕۆژ سوود لە خانووەکانی شارەکە وەربگرێت. بەڵام ژمارەی ئاگرەکان ئەوەندە زۆر بوون و ئاگرەکە ئەوەندە بە خێرایی پەرەی دەستاند کە داریوش زانی ئەگەر بە زووترین کات شارەکە چووڵ نەکات، خۆی و سەربازەکانی لەناو ئاگردا دەسوتێن و بە خێرایی شارەکەی بەجێ هێشت. دەرکەوت دانیشتوانی شارەکە زانیبوویان داریوش شارەکەیان وێران دەکات بۆیە هەوڵیاندا داریوش و سەربازەکانی لە ئاگری شارەکەدا بسوتێنن.[٤]

---

(٣) (زۆرا لە زمانی فارسیدا مایەوە و گەیشتە ئێستا و ئێستا ئەو وشەیە بەم شێوەیە زۆر دەنووسرێت. زەبیحوڵڵا.)

(٤) (توین بی مێژوونووسی بەریتانی هاوچەرخ و نووسەری یەك لە بە نرخترین پەرتووکەکانی سەدە بە ناوی (مێژوو) کە لێکدانەوەی مێژوویە، دەڵێت لە ساڵی ١٨١٢ زایینی ئەلکساندەری یەکەم ئیمپراتۆری ڕووسیا فەرمانیدا شاری مۆسکۆ بە تەواوەتی چووڵ بکەن و دوای ئەوەی ناپلیۆن دێتە ناوی ئاگری بدەن، ئەمەش لاسایی کردنەوەی خەڵکی سیت بوو لە شاری وڵنی و ئەوکات لە مۆسکۆش زۆرینەی پێکهاتەی خانوەکان لە دار بوو و بۆیە شار بەو ئاسانی و خێراییە دەسووتا، زەبیحوڵڵا.)

دوای دەرچوونی لە شاری ولّنی و لە کاتی شەودا دەنگی قاز و قولّینگ دەهات کە بەرەو گەرمێن دەڕۆیشتن، داریوش تێگەیشت وەرزی سەرما نزیکە و پێویستە بگەڕێتەوە، بۆیە فەرمانی گەرانەوەیدا و سەبارەت بە گەڕانەوەی دوو گێڕانەوە هەیە کە هەموو مێژوونووسان و تەنانەت کەتزیاسیش باوەڕیان وایە بە هەمان شوێنی خۆی واتە لە ڕێگەی پردی دانووب کە هێشتا وێران نەببوو یا بە هۆی کەمی ئاو لەو زێیە پەڕییەوە و بەردەوامبوو لە ڕێگە تا بە گەرووی بۆسفۆردا تێپەڕبوو و بەلاّم پرسیار ئەوەیە، کە ئەی بۆچی داریوش و کات ڕازین کە بە هەمان ڕێگەدا دەهات، ڕووبەڕووی یەکتر نەبوونەوە؟

هەر چەندە ئەوکات ناوچەی نێوان زێی دانووب و زێی دۆن واتە ولاّتی سیتەکان بە جەنگەلّ و زوونگاوی گەورە داپۆشرابوو، بەلاّم ناچێتە عەقلّەوە کە وێڕای ئەوەی کات ڕازین تەواوی ولاّتەکەی خۆی شارەزا بوو و هەموو دانیشتوانی ولاّتەکەی هەر هەوالّێکیان بیستبوایە بە پاشای خۆیان ڕادەگەیاند، چوون ئەو نەیتوانی شوێنی لەشکری داریوش بدۆزێتەوە.

گێڕانەوەیەکی تر لە لایەن سۆئێتۆن و خانتۆسە، ئەوان دەلّێن داریوش دەیزانی کات ڕازین دوای دەکەوێت و بۆ ئەوەی دوای وێرانکردنی شارەکانی سیت و لە ڕێگەی گەڕانەوەدا، لەشکرەکەی دووچاری کێشە نەکات، ڕاستەوخۆ بەرەو باشوور چوو تا بگاتە دەریای ڕەش و بە کەشتی بگەڕێتەوە.

ئەم گێڕانەوە دروستتر دێتە بەرچاو و ئەگەر داریوش بە پێی گێرانەوەی یەکەمی کردبایە، لەوانەیە ڕووبەڕووی کات رازین بووبایە و لەشکرەکەی زەرەری گەورەی بەرکەوتبایە یا لەناو چووبایە، بەلاّم ئەگەر لە شاری ولّنی یەکراست بەرەو باشوور و بۆ دەریای ڕەش هاتبایە بەرانبەر کات رازین نەدەبۆوە.

بە پێی گێڕانەوەی یەکەم داریوش لە کاتی گەڕانەوە لە پردی بۆسفۆر پەڕییەوە کە تا ئەوکات لەناو نەچووبوو و لە گێڕانەوەی دووەمدا هاتووە کە داریوش خۆی پاراست لە ڕۆیشتن بەرەو بۆسفۆر، چونکە ئەگەر بەرەو ئەوێ چووبایە دەبوایە لە ڕۆژئاوا بۆ ڕۆژهەلاّتی ئاسیای بچووك ببڕێت بۆ گەیشتنەوەی بە ولاّتەکەی و ئەمەش دووچاری وەرزی سەرمای دەکرد. بۆیە فەرمانی کرد بەرەو بەندەری (ئێیز) لە ڕۆژهەلاّتی (ترابزوون) بڕۆن کە لە نزیك سنووری ولاّتەکەی بوو.

لەشکری داریوش لە سەرەتای زستان و پێش وەرزی بفر بارین گەیشتە دەشتی (ماهیدەشت) و ئەگەر ئەوان بە ڕێگەی وشکانی هاتبانەوە، لەوانە بوو کاتێك گەیشتبووانە ئەو شوێنە کە زستان کۆتایی دەهات و سەرەتای وەرزی بەهار دەبوو.

داریوش لە جەنگەکانی سیت کەوتبۆوە رووبەرووی دوژمنێکی سەرسەخت و ئازا، بەڵام توانی بە چوونی بۆ وڵاتی دوژمن، زیانێکی گەورە بە سیتەکان بگەیێنێت بە شێوەیەك کە تا کۆتایی دەسەڵاتی داریوش، سیتەکان دەستیان بۆ هێرش و پەلامارە گەورەکانیان نەبردەوە. هەرچەندە سیتەکان دیسان ڕێگریان لە وشکانی و دەریادا دەکرد، بەڵام نەك بە شێوەیەك کە ببنە مەترسی بۆ سەر بازرگانی هەخامەنشییەکان یا مایەی بەدبەختی بن بۆ وڵاتانی ژێر دەستەی هەخامەنشی و ئەوان ناچاربکەن دەنگی سکالایان بەرز بکەنەوە.

کاتێك داریوش لە سنووری ئێران پەڕییەوە، بیستی لە خوزستان کەسێك بە ناوی بەردیە کە زۆر لە کەمبۆجییە دەچێت بۆتە دەسەڵاتدار و خۆی بە میراتگری راستەقینەی تاج و تەختی هەخامەنشی ناساندووە و دەسەڵاتداری ناوچەی خوزستانی گرتووە و نەزاندراوە ئەوی کوشتووە یا زیندانی کردووە، بەڵام ئەو کەس نابینێت.

لەو هەواڵانەی گەیشتنە داریوش، ئەو تێگەیشت کە ئەو پیاوەی لە خوزستان خۆی کردووتە بەردیە، دەبێت زۆر بە کەمبۆجییە بچێت.

داریوش بە بیستنی ئەو هەواڵە کەوتە بیرکردنەوە کە هەرچەندە گۆماتەی بت پەرست لە کاتی ئەو لێکۆڵینەوەی لەگەڵیدا کرا و دانی نا کە بەردیەی کوشتووە و تەنانەت گۆڕەکەی و تەرمەکەی پیشانی داریوش دابوو، بەڵام لەوانەیە درووی لەگەڵدا کردبێت و کاتێك بەردیەی ڕاستی هەستی بە مەترسی کردووە، لە دەست دوژمنی خۆی ڕایکردووە و لە شوێنێك خۆی حەشارداوە.

داریوش بۆ ئەوەی زووتر بگاتە خوزستان و فارس، لە ماهی دەشت لەشکرەکەی بەجێ هێشت و ڕایسپاردن کە بە خێرایی بە دوایەوە بێن و خۆی و ئەسپ سوارەکانی ڕێگەی خۆراسانیان گرتەبەر.

## بەردیەی تازە و پیلانی کوشتنی داریوش

دوای ئەوەی پیاوێك لە خوزستان و ناوچەی شووش بە هۆی لێکچوونی زۆری جەستە و روخسار و تەمەنی لە بەردیە، خۆی بە برای کەمبۆجییە واتە بەردیە ناساند، خەڵك لەو ناوچەیە پاڵپشتیان کرد و بە پاشایان ناسی، هەموان دەیانزانی بەردیە بە هۆی لێکچوونی بە کەمبۆجییە و لە ترسی ئەو تا کاتی مردنی براکەی ماسکی لە روخساری کردبوو و گۆماتەش هەر سوودی لەو کارە وەرگرتبوو و خۆی بە بەردیە و پاشا دیاریکردبوو.

گۆماتە کە ماوەیەك خۆی بە بەردیە ناساند، بت پەرستی لە وڵات پەرەپێدا و بە وەرگرتنی باجی زۆر لە خەڵك، هەمووانی خستبۆوە ئازارەوە. بەڵام بەردیەی تازە خۆی مەزدا پەرست بوو و ڕێزی لە زانایانی ئەو ئایینە دەگرت، باجی زیادەی لە خەڵك نەدەستاند و لە ماوەی ئەو چەند مانگەی داریوش لە جەنگ بوو لەناو خەڵکی ناوچەی شووش بە تەواوەتی خۆشەویست و بەهێز ببوو، بەڵام چونکە کچی کوروش واتە خێزانی داریوش لە ئەوێ و لە جیاتی هاوسەرەکەی دەسەڵاتی بەرێوە دەبرد، هەوڵی نەدابوو سنووری دەسەڵاتی خۆی بەرەو فارس ببات.

خەڵکی خوزستان دەیانزانی خێزانی داریوش هەمان خوشکی بەردیەیە، بەڵام لە نەرۆیشتنی بەردیە بۆ پازارگاد و نەبوونی بە پاشا دووچاری سەرسوڕمان نەبوون، چونکە دەیانزانی هەرچەندە ئەو خوشکی بەردیەیە بەڵام ناتوانێت لەبەر هاوسەرەکەی بۆ پاشایەتی براکەی ڕازی ببێت، چونکە هەموو ژنێك لە ژێر دەسەڵاتی هاوسەرەکەیەتی و بەردیە نایەوێت بە چوونی بۆ فارس barوودۆخی خوشکەکەی تێك بدات. داریوش کاتی کوشتنی گۆماتە وتبووی ئەگەر بەردیە زیندوو بوایە، خۆم بە پاشا نەدەزانی و بە پاشایەتی ئەو ڕازی دەبووم و بۆیەخەڵکی ئاسایی پێیانوابوو داریوش دوای ئەوەی دەگەڕێتەوە و دەزانێت بەردیەی کوری کوروش زیندووە، پاشایەتی ئەو بە فەرمی پەسەند دەکات.

ڕۆژهەڵاتناسانی ناسراوی ئاڵمانی (شوارتز) و (وۆڵف گانك كنتس) كە مامۆستای زانكۆی هامبۆرگیش بوو، دەڵێن ئەو كارانەی تا ئەوكات داریوش بۆ ئێرانی ئەنجامدابوو، ئەوەندە هەبوو كە خەڵك ئەو بۆ پاشایەتی بە پەسەند بزانن. خانەدان و خاوەن دەسەڵات و زاناكانی ئێران بە بەرژەوەندیان نەدەزانی داریوش واز لە پاشایەتی بێنێت و ئەو كارەیان لە بەرژەوەندی ئێران نەدەزانی، چونكە پێیانوابوو ئەو لێهاتوویی و چاكسازیخوازی خۆی سەلماندووە و نەشیاندەزانی بەردیە كە تازە دەركەوتووە، ئەگەر بە سەر هەموو ئێراندا ببێتە دەسەڵاتدار، لە دەسەڵاتداری چوون دەبێت.

بەردیە بە ڕادەیەك جێگەی خۆی لە دڵی خەڵكدا كردبۆوە كە تەنانەت ئاتووسای خوشكی واتە خێزانی داریوش، كەوتە گومان كە لەوانەیە ئەو بەردیەی برای بێت، هەرچەندە ئەو ئاگاداری ئەو بەسەرهاتە بوو كە گۆماتە پێش مردنی لە بارەی كوشتنی ئەودا باسی كردبوو. یەك لەو هۆكارانەی پاڵنەری ئەو بوو بۆ ئەو گومانە، متمانەی زۆری بەردیە بوو بە خۆی و ئەو زۆر بە متمانەوە باسی لە میراتگر بوونی خۆی بۆ پاشایەتی دەكرد و ئاتووسا بیری دەكردەوە كە ئەگەر خاوەن ماف نەبێت بەو ڕادەیە بە جورئەتەوە باس لەو بابەتە ناكات.

داریوش كاتی نزیك بوونەوەی لە شووش، دڵنیا بوو بانگەشەی بەردیە ڕاست نییە و ئەو لە لایەن گۆماتە كاتی خۆی كوژراوە و بەردیەش بۆ جەنگی ئەو نەكەوتەرێ و وتی باوەڕم وایە داریوش بە گەیشتنی بۆ لام متمانەم پێ دەبەخشێت و لە دەسەڵات دەكشێتەوە و من بە پاشا دەناسێت.

داریوش دیتی هیچ لەشكرێك بۆ جەنگی ئەو نەهاتووە، بۆیە دووچاری سەرسوڕمان بوو و لە ترسی ئەوەی لەپڕ پەلامار نەدرێت، لە دەرەوەی شار مایەوە و یەك لە سەربازەكانی لە گەڵ چەند ئەسپ سوارێك نارد بۆ شار تا بەردیە ببینێت و پێی ڕابگەیێنێت بە پەلە و بێ دوا كەوتن لە شار بێتە دەرەوە و لە خێوەتگای داریوش بگاتە خزمەتی داریوش.

بەڵام بەردیە لە وەڵامی نێردراوەكەی داریوش وتی: من كوری كوروشی گەورە و پاشای ئێرانم، ئەگەر داریوش دەیەوێت من ببینێت، با خۆی بێتە ئێرە.

داریوش دوای بیستنی ئەو پەیامە فەرمانی بە یەك لە ئەفسەرەكانی بە ناوی (ئاڵكن تێس) كرد تا بە فەرماندەیی هەزار سوار بچێت و بەردیە بێنێت بۆ لای.

بەردیە هیچ پێداویستییەكی بۆ بەرگری لەلا نەبوو، بە ناچاری لە شار هاتەدەر، بەڵام گەورەكانی شار و لە ناویشیاندا زانای ئایینی ئەو شارە لەگەڵ بەردیە هاتنەدەر، بۆ ئەوەی لە

گەلێدا بچن بۆ لای داریوش و پێی بڵێن ئەگەر پاشایەتی بەردیەش بە فەرمی ناناسێت، نابێت دەست درێژ بکات بۆ سەر گیانی شازادەی گەورەی ئێران و کوری کوروش.

دوای ئەوەی بردیە چۆوە ناو خێوەتی داریوش یەکەم و چاوی بە باڵا و رۆخساری ئەو کەوت، دووچاری سەرسوڕمان هات و ئەوەندە بە کەمبۆجییە دەچوو کە داریوش بیری کردەوە لەوانەیە ئەو بردیەی برای کەمبۆجییە بێت و لە ناخەوە مافیدا بە خەڵکی شاری شووش لە پەسەندکردنی پاشایەتی ئەو.

دوای ئەوەی بەردیە هاتە ناو خێوەتی داریوش، زانای ئایینی و گەورەکانی شار داوایان کرد داریوش ئەوان ببینێت، داریوش مۆڵەتی بە ئەواندا بچنە لای و زانا ئایینییەکە دەستی بە قسە کرد کە کورتەکەی بریتی بوو لە ستایشی کارەکانی داریوش لەمەڕ وڵاتداری و لەناو بردنی بت پەرستی و ئاوەدانی و.... هتد، دواتر وتی لە گەڵ ئەوەشدا گۆمان ناکرێت ئەو پیاوە مەزنەی ئێستا لە لای پاشای هەخامەنشی دانیشتووە، بەردیەی کوری کوروشی گەورەیە و بۆیە خەڵکی شووش داوا دەکەن بەرامبەر بەو، بڕیارێك نەدەن کە دوور بێت لە دادپەروەری و ویژدان.

داریوش بەڵێنی پێدان کە ئەگەر دوای لێکۆڵینەوە ناسنامەی ئەو ئاشکرابوو و ڕاست دەرچوو، وەك شازادەیەك و بە ریزێك کە شیاوی ئەو بێت رەفتاری لەگەڵدا دەکات. هەروەها پێیوتن گۆماتە پێش مردنی پێیڕاگەیاندووە کە بەردیەی کوشتووە و تەنانەت گۆرەکەی پێشانداوە و دوای هەڵکەندنەوەی گۆڕەکە، تەرمەکەم بینیوە و بەڵام بە هۆی تێکچوونی تەرمەکە، نەمتوانیوە بیناسمەوە.

داریوش لە پێش گەورەکانی شار کەوتە قسەکردن لەگەڵ بەردیە و دوای بیستنی دەنگی پێیوت: من دڵنیام ئەوە دەنگی بەردیە نییە، ڕاستە بە تێپەڕبوونی تەمەن دەنگی مرۆڤ دەگۆڕێت، بەڵام بەو ڕادەیە نابێت کە نەناسرێتەوە، من زۆر جار لەگەڵ بەردیە قسەم کردووە و دەنگی دەناسمەوە.

بەردیە لە بەرانبەر ئەو پرسیارانەی داریوش لە بارەی ئەوەی دوای مردنی کەمبۆجییە تا ئێستا لە کوێ بووە و چوون ژیاوە و بۆچی لە سەردەمێك کە گۆماتە خۆی بە بەردیە ناساند خۆت لە شوێنێك ئاشکرا نەکرد تا خەڵك ڕاستی بزانن و ئەو درۆزنە بناسن و لە تەخت و دەسەڵات لای بدەن و تۆ لە جیاتی دابنێن، وەڵامی دایەوە و وەڵامەکانی پتەو و دروست نەبوون و نەیتوانی متمانەی ئەوان بە دەست بێنێت و داریوش پێی وت تۆ پیاوێکی درۆزنی و بۆ

ئاشکرا بوونی ڕاستییەکان، ئێستا وەڵام بۆ ئاتووسای خێزانم دەنێرم تا بێتە ئێرە و بێ گومان ئەو ڕاستەوخۆ براکەی دەناسێتەوە.

داریوش بەڵێنی بە زانا ئایینییەکە و گەورەکانی شاردا کە تا هاتنی ئاتووسا و دەرکەوتنی ڕاستی، بە باشی لەگەڵ بەردیە رەفتار دەکات و ئەوانیش متمانەیان کرد و بە ئاسوودەیی رۆیشتنەوە بۆ ناو شار.

کاتێك ئاتووسا گەیشت، داریوش پێیوت: دڵنیام کە دەزانی بۆچی داوام کردووی و ئاگاداریشی کەسێك بانگەشە دەکات کە بەردیەی برای تۆیە، من دڵنیام ئەو بەردیە نییە و تەرمی بەردیەم بینیوە کە بە دەست گۆماتە کوژرابوو. لێکچوونی ئەو پیاوە بە بەردیە مایەی سەرسوڕمانە، بەڵام دەنگی لە ئەو ناچێت و لەوانەیە روخساری مرۆڤ بگۆڕێت، بەڵام دەنگ ناگۆڕێت و ئەگەریش بگۆڕێت وانابێت کە نەناسرێتەوە، ئێستا تەنها تۆی بتوانی بە روونی ئەو بناسیەوە و بزانی ئەو بەردیەیە یا نا؟

ئاتووسا پرسی: ئایا بە ئەوتان وتووە من لێرەم.

داریوش وتی: نەخێر.

ئاتووسا پرسی: ئایا ئەو هەرگیز منی بینیوە؟

داریوش وتی: زۆر کەس لەو وڵاتە تۆی دیتووە، بەڵام نازانم ئەویش تۆی دیتووە یان نا.

ئاتووسا وتی: نابێت بزانێت من خێزانی تۆم و بێ ئەوەی ئەو بابەتە بزانێت، دەچمە لای.

داریوش فەرمانی بە پاسەوانەکاندا بە بەردیە نەڵێن ئاتووسای خێزانی داریوش دێتە لای و ئاتووسا بە جلوبەرگی ژنانی ئاسایی چۆوە دیتنی بەردیە و هەر کەسێك ئەوی دیتبایە، نەیدەزانی ئەو شاژنە. دوای چوونی بۆ ژوورەکەی بەردیە وتی: منیان بۆ خزمەتکاری تۆ ناردووە و ئەگەر فەرمانێکتان هەیە، بە من بڵێن تا بۆتان بکەم.

بەردیەی تازە وتی: بەڵام من هیچ کارم نییە و من هیچ کات داوام نەکردووە کە خزمەتکارم بۆ بنێرن.

لە کاتی قسەکردندا ئاتووسا بە وردی چاوی بڕیبۆوە چاوەکانی بەردیە و جگە لەوەی چاوەکانی لە چاوی بەردیە نەدەچوو، هەستی کرد کە ئەو هەرگیز ئاتووسای نەدیتووە. بەردیە بە بینینی ئاتووسا هەستی کرد کە ئەویان تەنها بۆ زانینی نەهێنییەکانی ناردووە و بۆیە ئەوی ڕەت کردەوە.

ئاتووسا لە ژوورەکە هاتەدەرەوە و بە داریوشی وت: بە دڵنیاییەوە ئەو پیاوە درۆزنە و ئەو بەردیە نییە. داریوش وتەکەی ئەوی پەسەندکرد و فەرمانی کرد تا ماقووڵ و گەورەکانی شووش بێن، بۆ ئەوەی وتەکانی ئاتووسایان بۆ باس بکاتەوە.

لەوانەیە بگوترێت داریوش چوون ئاوا بە ئاسانی وتەکانی ئاتووسای پەسەندکرد و ئەو خۆی لە بیانۆ دەگەڕا و بۆیە وتەکانی ئەوی لا پەسەند بوو، بەڵام ئاتووسا کە خۆشکی کەمبۆجییە و بەردیە بووە، هاوکات لە رابردوودا سەرەتا ژنی کەمبۆجییە و دواتر بەردیە بووە و هەموو ژنێك هاوسەرەکەی دەناسێت و لە ناسینەوەی هاوسەرەکەی هەڵە ناکات.

ئاتووسا لە پێش گەورەی پیاوە ئایینییەکان و گەورەکانی شاری شووش ڕای خۆی لە بارەی ئەو پیاوەی خۆی بە بەردیە ناساندبوو، دەربڕی و وتی: ئەو پیاوە سوودی لەو لێك چوونەی وەرگرتووە کە بە کەمبۆجییە هەیەتی و خۆی بە بەردیە ناساندووە و لە ڕاستیدا ئێوەی خەڵەتاندووە، چونکە ئێوە بینیوتانە کە لێکچوونی لە رادەبەدەری بە کەمبۆجییە هەیە، باوەڕتان پێ کردووە، بەڵام من لەو بارەوە هەڵە ناکەم و دووپاتی دەکەمەوە کە ئەو بەردیە نییە.

دواتر داریوش وتی: هەرچەندە ئەو پیاوە بێ ئەوەی خاوەن ماف بێت بانگەشەی بۆ پاشایەتی کرد، بەڵام چونکە لە ماوەی دەسەڵاتیدا لە گەڵ خەڵك باش بووە و رێزی لە ئایینەکەیان گرتووە، فەرمان بە کوشتنی ناکەم و تەنها فەرمان دەدەم لە قەڵای (بادان شار) واتە شاری (ئەردەبیل) زیندانی بکەن. بە وتەی مێژوونووسانی یۆنانی ئەو تەنها یەك ساڵ لەو شوێنە زیندانی بوو و دواتر مرد، هەروەها ئەوان باوەڕیان وایە بە فەرمانی داریوش ئەو پیاوە لەو شوینە کوژراوە.

پێشتر باسمان کرد کە کاتێك داریوشی یەکەم بۆ جەنگی سیتەکان چوو، یۆنانییەکان یارمەتیاندا و ئەندازیارێکی یۆنانیان بۆ ئەو نارد تا پرد لەسەر گەرووی بۆسفۆر دروست بکات و سەربازە یۆنانییەکان شانبە شانی لەشکری داریوش لە جەنگی سیتەکانیان ئازایەتیان نواند. دوازدە شارەکەی ئاسیای بچووك بەشێك بوون لە سنووری هەخامەنشی و سەربەخۆیی خۆیان هەبوو.

هەرچەندە لە رووی جەستەییەوە جیاوازی لە نێوان ئێرانی و یۆنانییەکان هەبوو، بەڵام ئەوان لە ئۆلەمپیادەکاندا بەشدار دەبوون و چونکە داریوش و سەردارەکانی هۆگری وەرزش بوون و وێڕای ئەوەی ئەوان ریش تاشینی پیاوانی یۆنانی و رووت بوونەوەیان لە کاتی ئۆلەمپیادەکانیان بە لاوە پەسەند نەبوو، بەڵام لە گەڵ ئەوەشدا بەشداری ئۆلەمپیادە وەرزشییەکانیان دەکرد.

ئێرانییەکان باوەڕیان وابوو کە سروشت بۆیە ریشی داوەتە پیاوان تا ئەوان جوان بکات و وایان دادەنا کە لە سروشتدا بوونەوەرە نێرەکان جوانترن لە بوونەوەرە مێیەکان و ئەو بابەتەیان بۆ تەواوی ئاژەڵەکان لە شێردەر و باڵندەکان بە دروست دەزانی، ئەوان پێیان وابوو ڕیش تاکە هۆکارە بۆ جوانتر بوونی پیاو لە ژن، بۆیە رێکیان دەخست و شانەیان دەکرد و دەوڵەمەندەکانیش زێر و خشڵە گرانبەهاکانیان لە ریشیان دەخست.

پیاوانی ئەو نەتەوانەی لە دەوروبەری ئێران دەژیان، ریشیان نەبوو واتە ریشیان دەتاشی و یا لە تەمەنی هەرزەکاریەوە وردە وردە مووەکانیان دەردەهێنا و بێ گومان هەر نەتەوەیەکی ئاسیایی ریشی هێشتەوە، لە ئێرانییەکان فێربوو.

وەرزشکارە ئێرانییەکان لە ئۆلەمپیادەکان بەشدار دەبوون و بە هۆی بوونی ئەو ریشە درێژانەیانەوە لە ناو بەشداربووانی تر دیاربوون و رێزی تایبەتیان هەبوو، چونکە بەشێك بوون لەو نەتەوەیەی کە لە سەردەمی داریوش بەهێزترین نەتەوەی ئاسیا بوون.

وڵاتی (ئاری تا) لە دەوڵەتە شارەکانی یۆنان بوو و ژمارەی دانیشتوانی (٤٥٠٠) کەس بوو، لاوێکی ئەو شارە کە بەشداری لە ئۆلەمپیادی ساڵی (٥٠٤ پ. ز) کردبوو لە کاتی ئۆلەمپیادەکەدا سووکایەتی بە لاوێکی ئێرانی کرد و وشەی ناشیرینی پێووت. ئەو وڵاتەی لاوە وەرزشکارەکەی لێوە هاتبوو، لە چوارهەزار و پێنج سەد کەس دانیشتوانی تێپەڕی نەدەکرد و زاندراوە کە وڵاتە یۆنانییە کۆنەکان لە رابردوودا و تەنانەت ئەسیناش دانیشتوانیان کەم بوو.

وەرزشکارە ئێرانییەکە نەیتوانی وشە ناشیرینەکە پەسەند بکات و هێرشی کردەسەر و چەند وەرزشکارێکی تری یۆنانی لایەنگری وەرزشکارەکەی خۆیان کرد و سروشتییە کە وەرزشکارە ئێرانییەکانیش بە هەمان شێوە پاڵپشتی وەرزشکارەکەی خۆیان کرد، سەرەنجام بەرێوەبەری ئۆلەمپیاد بە هۆی سەربازەکانی توانی ئێرانی و یۆنانییەکان لەیەك دووربکاتەوە تا بتوانێت لێکۆڵینەوە بکات.

ئێرانییەکان وتیان لاوەکەی خەڵکی ئات ری نا وشەی ناشیاو و سووکی بە ئێرانییەکە وتووە و چاودێرەکەی ئۆلەمپیادیش وتەکەی ئێرانییەکانی پەسەندکرد، چونکە یەك لە خەسلەتەکانی ئێرانییەکان ئەوە بوو کە وشەی ناشیرین و سووکیان بەکار نەدەهێنا و (گووتەی باش) یەك لەو سێ بنەمایە بوو کە پەروەردەی ئاکار و کۆمەلایەتی ئەوان بوو.

ئەو رووداوە دوای ماوەیەك لە نێوان ئێرانی و یۆنانییەکان کە پەیوەندی دۆستانەیان هەبوو، بۆوە مایەی دڵگرانی، بەڵام هۆکاری جیاوازی یۆنان و ئێران، هۆکاری ئابووری و سیاسی بوون.

یۆنانییەکان بە رواڵەت رێزیان لە ئێرانییەکان دەگرت، بەڵام لەناو خۆیاندا ئەوانیان بە وەحشی و دواکەوتوو دەناسی و بیریان دەکردەوە کە سیستەمی حکومەتی ئەوان کە کۆماری بوو باشترینی حکومەتی جیهانە و لە سەراسەری ناوچەی مەدیتەرانەی رۆژهەڵات، هەموو بازارەکانیان بەدەستەوە بوو و یۆنانییەکان نەیاندەتوانی ڕکابەری بازرگانی ئێران بن و هێزی دەریایی هەخامەنشیش کە لە رۆژهەڵاتی مەدیتەرانە بوو، پاڵپشتی لە بازرگانییەکەی خۆی دەکرد.

یەك لەو بابەتانەی هۆکار بوو بۆ بە وەحشی زانینی ئێرانییەکان لە لایەن یۆنانییەکانەوە، بابەتی رێزگرتن بوو لە ئاگر و وایاندەزانی ئەوان ئاگرپەرستن و نەیاندەتوانی پەی ببەن بە هۆی رێزگرتنی ئاگر لە لایەن ئێرانییەکانەوە.

مامۆستای مێژووی ئێران (ژاك دۆخێن) لە زانکۆی (لیژ) لە بەلژیك لە پەرتووکی خۆی بە ناوی (ئایین لە ئێرانی کۆن) نووسیویەتی ئێرانییەکان دەیانزانی ئەو رەگەزەی جیهانی لێ دروستبووە، ئاگرە و بروایان وابوو مەزدا بە هۆی ئاگرەوە جیهانی بنیات ناوە و ئەمرۆکە هەموومان بروامان بەو بیرۆکەیە هەیە و ئێرانییەکانیش چونکە ئاگریان بە پێکهێنەری بوونی زەوی بە فەرمانی مەزدا دەزانی و هەر بۆیە رێزیان لێ دەگرت.

یۆنانییەکان بە هەڵە ئێرانییەکانیان بە بتپەرست دەناسی و ئەو باوەڕەیان بە هۆکاری وەحشی بوونی ئەوان دەزانی، ئەوان بۆ خۆیان کۆمەڵێك خودایان هەبوو و بۆ هەریەکەیان پەیکەریان داتاشی بوو و پێویست بوونی داتاشینی پەیکەر بۆ خوایانی مێینە و نێرینەی ئەوان و دانانیان لە پەرستگاکانیان، ببوو بە هۆکاری پێشکەوتنی هونەری پەیکەرتاشی لە یۆنان بە رادەیەك کە تەنانەت ئێستاش واتە لە سەدەی بیستەم مرۆڤ نەیتوانیوە لە پەیکەرتاشی شان لە شانی ئەوان بدات.

هەندێ لەو پەیکەرانەی لە یۆنانی کۆن دروستکراون و لە بن خووڵ دۆزراونەتەوە، لە رووی هونەریەوە بە شاکاری پایەدار دەناسرێن و چاوی مرۆڤ لە بینینیان تێر نابێت و باسمان کرد کە داریوش بۆ دروستکردنی پەیکەرەکان لە پێرسپۆلیس سوودی لە یۆنانییەکان وەرگرت.

هەرچەندە یۆنانییەکان بت پەرست بوون بەڵام هەخامەنشییەکان لۆمەیان نەدەکردن، چونکە باوەڕیان بە ئازادی بیروڕای ئایینی هەبوو و کوروش و داریوش لایەنگری ئازادی ئایین بوون، بەڵام لە یۆنان ئازادی ئایینی نەبوو و لەوانەیە ئەو بابەتە بۆ ئەمرۆ مایەی سەرسوڕمان بێت، چونکە خەڵك وابیردەکەنەوە کە لە وڵاتانی یۆنان کە سیستەمی دیمۆکراسی هەبوو، بگوترێت لە وڵاتێکی دیموکراسیدا چوون ئازادی ئایینی نییە.

ئێمە جارێك لە مێژوودا وتمان کە لە یۆنان سیستەمی دیموکراسی نەبووە و لە ڕاستیدا یۆنان وڵاتێکی ئێریستۆکراسی بووە نەك دیمۆکراسی و لەو وڵاتەدا کەمینەیەکی خانەدان دەسەڵاتیان بەسەر زۆرینەیەکی کۆیلەدا دەگێڕا و کۆیلەکان لە یۆنان هیچ مافیان نەبوو و لەگەڵ ئەوان بە شێوەیەك رەفتار دەکرا کە سەرووی ئەو رەفتارە بوو کە لە گەڵ بەردەست و نۆکەر دەکرێت و چوون لە کۆمەڵگایەك کە کۆیلە بوونی تێدا هەبێت و ژمارەی کۆیلەکان لە ژمارەی خانەدانەکان زۆرتر بێت، دیموکراسی دێتەکایەوە.

بە هەمان شێوەش کە دیمۆکراسیەتی ڕاستەقینە لە یۆنان نەبوو، ئازادی ئایینیش نەبوو و ئەوان ئێرانییەکانیان بە وەحشی دەناسی بە هۆی رێزگرتنیان لە ئاگر و نەتەوەکانی تریشیان سەرزەنش دەکرد بۆ پەرستینی خواکانیان و بۆ نموونە بەردەوام وشەی ناشیاو و ناشیرینیان بۆ (کارید) خوای لیدییەکان بەکار دەهێنا و سووکایەتیان پێدەکرد.

خەڵکی لیدی کە نەیاندەتوانی بەرگەی سووکایەتی بگرن و وشە سووکەکانی ئەوان ببیستن، وەك وەڵامدانەوەی ئەوان بە هەمان شێوە سووکایەتیان بە خواکانی یۆنان دەکرد و لە کاغەزی پاپیرۆسی میسری پەیکەری خوایانی یۆنانیان دروست دەکرد و دوای ئەوەی ئەو پەیکەرانەیان لە پیسی هەڵدەکێشا، دەیانسوتاندن.

لە ساڵی (٥٠٣ پ. ز) دەسەڵاتداری ئەسینا کە ناوی (تالیدۆس) بووە، توانیویەتی لە وڵاتی لیدی ببێتە خاوەنی پارچە زەوییەك کە چوار هەزار کۆیلە کاری لەسەر بکەن و ساڵی دواتر توانی ئەو پارچە زەوییە فراوان بکات و لە ساڵی (٥٠٠ پ. ز) دەهەزار کەس کاری لەو زەوییەدا دەکرد.

بە هۆی ئەوەی پەیوەندی هەخامەنشی و یۆنانییەکان ئەکات باش بوو، یۆنانییەکان دەیانتوانی لە تەواوی سنووری ئیمپراتۆریەتی هەخامەنشیدا، موڵك بکرن.

لە ساڵی (٥٠٠ پ. ز) سێ رووداوی گرنگ لە لیدی روویاندا و بە هۆیانەوە تالیدۆس توانی بەشێکی زۆر لە زەوییەکانی لیدی بە زەوییەکانی خۆی گرێ بدات و ئەوانی تریش بۆ هاووڵاتییەکانی تەرخان بکات.

رووداوی یەکەم دەرکەوتنەوەی کارتاژەکان و هێرش کردنیان بۆ سەر کەشتییە بازرگانییەکان بوو، بەو هۆیەوە کەشتییە جەنگییەکانی هەخامەنشی رۆژهەڵاتی دەریای مەدیتەرانەیان چووڵ کرد، تەنها چەند کەشتییەکی بچووکیان لە ئەوێ هێشتەوە و بەرەو ناوەند و رۆژئاوای ئەو

دەریایە چوون، تالیدۆس بیری کردەوە ئەگەر لەوکاتەدا هێرش بکاتە سەر لیدی، هەخامەنشییەکان ناتوانن ڕێگەی لێ بگرن.

هۆکاری دووەم ئەوە بوو کە لە ساڵێك پێشتر واتە لە (٥٠١ پ. ز) سووکایەتی و جنێودان بە خوایانی یۆنانی لە لایەن خەڵکی لیدی بەرەو زیادبوون ڕۆیشت و خوایانی یۆنان لە لیدی کەوتنەبەر خەراپترین تاوانبار کردنەکان و تورەیی زۆری یۆنانییەکانی بەرانبەر بە خەڵکی لیدی بەدواداهات.

ڕووداوی سێیەم بریتی بوو لە ئەوەی هەر لەو ساڵەدا هەواڵی کوشتنی داریوش درا و ناکام بوو، هەواڵی کوژرانی داریوش بە خێرایی گەیشتە یۆنان و بەڵام نەگەیشتنی هەواڵی دووەم واتە ناکام بوونی هەوڵەکە بۆ دوو هۆکار دەگەڕایەوە:

یەکەمیان هێواشی هۆیەکانی گەیاندن بوو و دووەم یۆنانییەکانیش خۆیان بە هۆی ئەوەی بەرانبەر داریوش بەدبین بوون و ئەویان خۆش نەدەویست[1]، نەیانەویست بە خێرایی هەواڵی دووەم بگات.

سەرجەم ئەو هۆکارانە بوونە هۆی ئەوەی تالیدۆس بە گونجاوترین کاتی بزانێت بۆ هێرش، چونکە دەیزانی تا پاشای تازە دێتە سەرکار و خۆی ڕێکدەخاتەوە، ماوەیەکی باشی پێویستە و ئەگەر ئەو سوود لەو دەرفەتە وەربگرێت کە تیایدا بە گریمانی بەهێز هەخامەنشییەکان و وڵاتانی ژێردەستیان دووچاری پاشا گەردانی دەبن، ئەوە لیدی تا هەتایە دەبێتە هی یۆنان.

---

(١) (پێشتر بە بایەخەوە باسی چوونی سەربازانی یۆنانی و ئێسپارتی بۆ یارمەتی داریوش لە جەنگی سیتەکان و هاوکاری تەکنیکی ئەوان بۆ دروستکردنی پرد بۆ داریوش کراوە، بەڵام جێگەی سەرەنجە کە لە پڕ زەبیحوڵڵا بابەتی بەد بینی یۆنانییەکان بەرانبەر بە داریوشی زەق کردووتەوە و کردوویەتی هۆکارێکی ڕووداوەکە و ویستوویەتی هەموو تاوانی جەنگەکانی ئەوان و هەخامەنشییەکان لە بوارەکانی ئابووری و سیاسی و تەنانەت کۆمەڵایەتیش بخاتە ئەستووی یۆنان و تەنانەت بابەتێکی زۆر بێ بایەخی جەنگە جوێنی دوو وەرزشکاری کردووتە بنێشتە خۆشەی هەموو یۆنان و ئێران،کە لە ڕاستیدا لەوانەیە ئەو ڕووداوە لە لایەن زۆرینەی هەرە زۆری خەڵك لەو وڵاتانەدا هەر نەشبیسترابێت. بەڵام ڕاستییەکەی ئەوەیە لە ڕابردوودا زۆر لە جەنگەکان لە لایەن پاوەن خوازان لە کاتی ڕووخانی پاشاکان سازدراوە تا سوودی لە ئاڵۆزییەکان بدی ترێت و یۆنانیش ویستوویانە سوود لەو هەواڵە وەربگرن و لە لایەکی تر داریوش و حکومەتی هەخامەنشی یەك بوونە لە پاوانخوازە گەورەکانی جیهان و یۆنانییەکانیش کاتیان بە باش زانیوە بۆ سنووردانان بۆ پاوانخوازی و سنوور تێپەڕاندنەکانی داریوش بەرەو ئەورووپا و ڕۆژئاوا، وەرگێڕ بۆ کوردی)

بەرژەوەندی تاکە کەسی لە زۆربەی رووداوە مێژووییەکان لە هۆکارە سەرەکیەکانی رووداوەکان بووە و ئەوەش رەت ناکەینەوە کە لە بەشی کەم لە رووداوە مێژووییەکاندا بەرژەوەندی تاکەکەس کاریگەر نەبووە و بۆ نموونە لە یەکەم جەنگی سەلیبیدا ئەو بابەتە گرنگ نەبووە، بەڵام لەو رووداوانە کە بەرژەوەندی تاکەکەسی تیایاندا پەراوێز خراوە بە کەمی دەدۆزرێنەوە.

تالیدۆس بۆیە خوازیاری هێرش بۆ لیدی بوو تا لەو وڵاتە بە رێژەی چەند جارەی زەوییەکانی ئەسینا، زەوی بەدەست بێنێت و خانتۆسی مێژوونووسی لیدی ئەو بابەتە باس دەکات، بەڵام مێژوونووسە یۆنانییەکان بە گشتی ئەو هۆیە رەت دەکەنەوە و ڕایان وایە بەرژەوەندی یۆنان پاڵنەری سەرەکی بووە.

تالیدۆس بووە پێشەوای هێرشی یۆنانییەکان بۆ لیدی و بە نەتەوە یۆنانییەکانی وت ئێوە سەرباز ئامادەبکەن تا ئەسینا بۆ گواستنەوەی ئەوان بۆ لیدی کەشتی بنێرێت و لەناو دەوڵەتە شارەکانی یۆناندا، ئەسینا لە هەمووان زیاتر کەشتی جەنگی و بازرگانی هەبوو، بۆیە تالیدۆس دابین کردنی کەشتی بۆ جەنگ لە ئەستۆ گرت، ئەو بۆ هاندانی دانیشتوانی یۆنان سوودی لە هەستی ئایینیان وەرگرت بەرانبەر بە لیدی و هەروەها بەڵێنی پێدان کە هەر دەوڵەتە شارێکی یۆنانی دوای گرتنی لیدی دەبێتە خاوەنی دەوڵەتێکی تر. ئەو هانیدان تا پێش ئەوەی پاشایەکی تازە بێتە سەرکار، ئەو جەنگە بکەن و دواتر شارە یۆنانییەکانی ئاسیای بچووك بگرن.

ووتراوە یۆنانییەکان سی هەزار یا پەنجا هەزار یا سەد هەزار سەربازیان ئامادەکرد و کە سی هەزارەکە ژمارەیەکی ڕاستترە، دانیشتوانی ئەوکاتی یۆنان ئەوەندە نەبوو کە بتوانن سەدهەزار سەرباز ئامادەبکەن، گواستنەوەی بەشێك لە سەربازان بە کەشتی لە ئەسیناوە دەستی پێکرد و بڕیاردرا بەشەکەی تر لە رێگەی گەرووی بۆسفۆر بپەرنەوە بۆ ناو وڵاتی لیدی.

تالیدۆس بۆ ئەوەی داوای کەنارەکانی لیدی داگیر بکات، لەشکرەکەی کردە دووبەش و بەو رێگەیەوە توانی داوای یارمەتی لە دوازدە شارە یۆنانییەکەی ئاسیای بچووك بکات و ئەوانیش زۆر هاوکاریان کردن. یۆنانییەکان لە هەردوو رێگەی بۆسفۆر و بەندەری (ئەزبەن) کە دەکەوتە باشووری گەرووی (داردانێل) خۆیان گەیاندە لیدی و لەسەر رێگەیان هەر پیاوێکیان دیت، کوشتیان و ژنەکانیشیان بە ئەسیر برد تا تۆڵەی خوایانی خۆیان بکەنەوە.

هەردوو بەشی لەشکری یۆنانی بەناو خاکی لیدیدا رۆیشتن و لە نزیك شاری (سارد) کە پایتەختی ئەو وڵاتە بوو یەکیان گرتەوە، ئەوان هێرشیان کردەسەر ئەو شارە و تەواوی

ئێرانییەکانی دانیشتووی ئەو شارە و هەموو پیاوانیان کوشت و تەواوی ژنە گەنجەکانیان ئەسیر کرد و هەرچی لەو شارە هەبوو تالانیان کرد، دواتر لە تووڵەی ئەو سووکایەتییەی خەڵکی لیدی بەرانبەر خوایانی یۆنان کردبوویان، ئەو شارەیان وێرانکرد کە بە بووکی ئەوسای جیهان ناسرابوو، هەرچەندە دواتر شارەکە دروستکرایەوە بەڵام نەیتوانی ئەو جوانییەی وەربگرێتەوە.

وتمان کە یەك لە هۆکارەکانی هێرشی یۆنان بۆ لیدی، هەواڵی کوژرانی داریوش بوو و رووداوەکە بەم شێوەیە بوو: (پیاوێك بە ناوی (کۆندران) بە فەرمانی داریوش والی (خەشتەرە پاوەن) باختەر واتە باکووری وڵات (ماوەراء النهر) بوو و ئەو ناوچەیە وێڕای گرنگی لە بواری کشتوکاڵی، لە رووی بازرگانیش زۆر گرنگ بوو و رێگەی گواستنەوەی تەواوی کاڵاکانی رۆژئاوایی و ئێرانی بۆ رۆژهەڵاتی ئاسیا و بە پێچەوانەوە بوو.

کۆندران وەك هەر یەکە لە والییەکانی تر مافی دەرکردنی دراوی هەبوو، سنووری هەخامەنشی زۆر فراوان بوو و گواستنەوەی دراو لە ناوەندەوە کارێکی ئاسان و دروست نەبوو، بۆیە بۆ کارئاسانی لە بابەتی دراو ئەو دەسەڵاتە لە ویلایەتەکان هەبوو.

داریوش دەیەویست لە تەواوی ویلایەتەکان عەیاری دراوی زێر و زیو بە یەك کێش بێت و تەڵەکەبازی تێدا نەکرێت، بۆیە خواست لەسەر دراوی هەخامەنشی بەردەوام هەبوو. کۆندران بۆی دەرکەوت ئەگەر عەیاری پارەکە زیاد بکات بە زوویی دەوڵەمەند دەبێت، بۆیە بە نهێنی فەرمانی کرد تا عەیاری زێر بکرێتە پەنجا لە سەد و عەیاری زیویش دوو ئەوەندە زیاد بکرێت.

وەك نەریتێك لە چەژنی نەورۆزدا هەخامەنشییەکان لە پایتەخت واتە شووش یا پازارگاد (دوای تەواو بوونی) کۆدەبوونەوە و نوێنەرانی هەر ویلایەتێك، دیارییان لە گەڵ خۆیاندا دەهێنا، نوێنەرانی ویلایەتی باختریش هەندێك دراوی زێریان بە دیاری دەهێنا. ئەو رۆژەی نوێنەرەکانی کۆندران بۆ نەورۆزی ئەو ساڵە دەکەوتنەرێ و زێریان بۆ داریوش دەبرد، کۆندران بیری نەبوو ئەو دراوەی بردوویانە لە زێرە غەشدارەکەیە و بەو شێوەیە تەلەکەبازییەکەی ئەو لە لای داریوش ئاشکرا بوو.

نوێنەرەکانی ویلایەتی باختەر چوونە لای داریوش و دیاریەکانیان بەخشی، دواتر دیاریەکان بردران بۆ خەزێنە و کاتێك خەزنەدار زێرەکەی دیت، هەستی کرد رەنگیان کەمێك لە زێرەکانی تر سپیترە و بۆیە فەرمانی کرد تا بیانکێشن و دیتی کێشیان کەمترە، دواتر لە زێرەکان لە محەك دران و دەرکەوت کە غەشیان زۆرە و داریوشی لەو بابەتە ئاگادار کردەوە.

داریوش دراوەکانی بینی و داوای کرد جارێکی تر لە پێش چاوی خۆی، کێش بکرێنەوە و لە محەك بدرێن، گومانی نەما و داوای کرد نوێنەرەکانی باختەر کە هێشتا نەرۆیشتبوونەوە، بهێنن بۆ بەردەمی و لەوانی پرسی: ئەو دراوانە لە کویٚ دروستکراون؟

ئەوان وتیان: لە شوێنی دراو ئامادەکردنی باختەر.

داریوش پرسی: ئایا نەتان زانیوە ئەو دراوانە ساختەن.

ئەوان وتیان: تەواوی ئەو پارەیەی لە باختر کاری پێدەکرێت، بە هەمان شێوەیە و ئێمە ناتوانین لە خۆمانەوە بڕیار بدەین کە پارەکە ساختەیە.

داریوش فەرمانیدا کۆندران بێنن بۆ لای، چونکە خشتەرە پاوەنەکان (والیەکان) بەرپرس بوو بەرانبەر دروستکردنی پارە و داریوش دەیزانی ئەو پیشەوەرانەی لە شوێنی دروستکردنی دراو کار دەکەن ناتوانن دراو دەستکاری بکەن، چونکە دراوەکان بە گشتی دوای دروستکردنیان دەکەوتنە بەر پشکنین و ئەگەر هەست بە ساختە بوونیان کرابایە، ئاشکرا دەبوو و ئیتر نەیاندەتوانی کاری لەو چەشنە بکەنەوە و لێکۆڵینەوە لەو بابەتەش کاری دەسەڵاتدار یا باوەڕ پێکراوی ئەوە، بۆیە داریوش هیچ گومانی نەما لەوەی ئەو کارە لە لایەن کۆندران ئەنجامدراوە تا سوودی زیادەی ساختە بوونی پارەکە بۆ خۆی ببات.

دوای ئەوەی داریوش فەرمانیدا تا کۆندران بێتە لای، نوێنەرەکانی باختەری ناردەوە و ئەوانیش بەرەو باختەر بەرێکەوتن و لە ڕێگا کۆندرانیان دیت و هەموو بەسەر هاتەکەیان بۆ گێرایەوە، ئەو وایدەرخست کە تەواوی ئەو کارەی بە فەرمانی داریوش ئەنجامداوە و لە ناخیشدا ترس دیگرتوو و دەیزانی ئەگەر بچێتە پایتەخت، داریوش لەو ناپاکیەی خۆش نابێت و بەو هۆیەوە دەیکوژرێت.

بۆیە دوای ئەوەی نوێنەرەکانی ویلایەتەکەی دوورکەوتنەوە، ماوەیەکی کەم ڕۆیشت و بە هاوکارەکانی وت: داریوش فەرمانی کردووە بە تەنها بچم بۆ لای و ئێوە بەیانی زوو بەرەو باختەر بکەونە ڕێگا، لەوانەشە من بە زوویی و لە ڕێگەدا بگەمە ئێوە. مەبەستی کۆندران لە ناردنەوەی هاورێکانی بۆ ئەوە بوو گەیشتنی بە پایتەخت ئاشکرا نەبێت.

لەوکاتەوە کۆندران زانی داریوش بە ناپاکی ئەوی زانیوە، دەیزانی لێی خۆش نابێت، هەروەها دەیزانی بۆ دەرباز بوونی لە دەست داریوش پێویستە ژێر دەسەڵاتی ئیمپراتۆریەتی هەخامەنشی بەجێ بهێڵێت و برواتە شوێنێك دەستی ئەوی پێ نەگات، لە لایەکی تر تەواوی ئەو پارەی بەو شێوەیە دەستی کەوتبوو لە کرینی زەوی و زار و باغی خەرج کردبوو و ئەگەر

هەڵاتبایە هەموو ئەوانەی لە لایەن داریوش لێ زەوت دەکرا. ئەو لە توانای خۆی نەدەدیت کە رووبەرووی داریوش ببێتەوە و جەنگ بکات و دەیزانی سزای ئەوانەی یاخی بوون، لە دوای شکست خواردنیان زۆر توندە و بۆیە بە ناچاری بڕیاریدا داریوش بکوژێت و لەوانەیە بڕیاردانی لەو شێوەیە زۆر شێتانە بێتە بەرچاو.

کۆندران کاتێك گەیشتە پایتەخت کە گەرمەی بڵاوبوونەوەی هەواڵی مردن یا کوشتنی بەردیە بوو لەو قەڵایەی تیایدا زیندانی کرا بوو و لێکچوونی زۆری بەردیە بە بەردیەی ڕاستی، بۆوە هۆکاری کەم بوونەوەی خۆشەویستی داریوش لەناو خەڵك و ئەمەش سوود بوخش بوو بۆ کۆندران و بیری دەکردەوە خەڵك لە کاتی کوشتنی داریوش پاڵپشتی دەکەن، ئەگەر بزانن کە لە تۆڵەی بەردیە داریوشی کوشتووە.

ئەمڕۆ بیرۆکە و بریاری کۆندران زۆر نەزانانە دێتەبەرچاو، چونکە ناتواندرێت پەسەند بکرێت کەسێك بە تەنها بێتە ناو پازارگاد یا شووش و پیاوێکی وەك داریوش بکوژێت و بیەوێت بە تاوانی کوشتنی داریوش نەکوژرێتەوە و خۆشی بتوانێت دوای کوشتنی ئەو، دەسەڵات و سەرمایەی خۆی بپارێزێت. بەڵام لە رابردوودا ناو و جێ و رێ و نەریت زۆر گرنگ بوو و کاریگەری لە دڵەکان دەکرد و کۆندران لە پازارگاد و شووش و ئەکباتان و ئازەربایجان زۆر دۆستی هەبوو و هیوای دەدا بە خۆی کە دوای کوشتنی داریوش، دۆستەکانی پاڵپشتی دەکەن، چونکە دەزانن پاڵپشتی لە مردوو بۆ ئەوان سوودی نییە و پاڵپشتی لە زیندوو بۆ ئەوان سوودبەخشە.

بە ئەو لێکدانەوە و هیوامەندیانە، کۆندران گەیشتە ناو پازارگاد و گەیشتنی ئەو بۆ ناو پازارگاد هاوکات بوو لە گەڵ بڵاوبوونەوەی هەواڵی کوژرانی بەردیەی تازە لە قەڵای ئەردەبیل لە سنووری فارس و خوزستان و ئەوان وایانزانی بەردیە لەو قەڵایەدا کوژراوە. چونکە لێکچوونی بەردیە بە کەمبۆجییە ببوو بە هۆی خۆشەویست بوونی ئەو لەناو جەماوەردا و کەمبوونەوەی خۆشەویستی داریوش لەناو جەماوەر، کۆندران زیاتر هیوادار بوو کە دوای کوشتنی داریوش جەماوەر پاڵپشتی دەکەن بە تایبەتی کە ئەو کارە بە ناوی تووڵە سەندنەوەی بەردیە دەبێت.

داریوش کە حەزی دەکرد کارەکانی بیناسازی پێرسپۆلیس پێشکەوتن بە خۆی ببینێت، بۆ ئاگادار بوون لە کارەکانی دروستکردنی کۆشکی پێرسپۆلیس چوو بۆ مەرڤدەشت و کاتێك کۆندران گەیشتە پازارگاد، ئەو هەواڵەی بیست و بە پەلە چوو بۆ ئەوێ و لە رۆژی سی و چوارەمی بەهاری ساڵی (٥٠٠ پ. ز) لە کاتێك داریوش سەرگەرمی بەسەر کردنەوەی

کارەکانی کۆشکەکە بوو، بە خەنجەر هێرشی کردەسەر و هاواری کرد: من تووڵەی بەردیەی کوری کوروشی گەورەی لێ دەکەمەوە.

ئەو توانی خەنجەری یەکەمی لە داریوش بدات و پاسەوانەکانی داریوش ماوەیان نەدا بتوانێت خەنجەری دووەم بوەشێنێت و گرتیان و ئەویش بەردەوامبوو لە وتنەوەی وتەکەی خۆی، بەڵام لێدانەکە کاریگەر بوو و داریوشی خست و پاسەوانەکان بە پەلە تەرمی نیوە مردووی داریوشیان لەو شوێنە گواستەوە و خەڵك وەیانزانی داریوش مردووە، لە کاتێکدا بیست رۆژ و بە پێی هەندێ سەرچاوە سی رۆژ دواتر چاك بۆوە. پاسەوانەکان بە پەلە پزیشکیان گەیاندە لای داریوش و کۆندرانیان گرت، تا دواتر بزانن ئەو بۆچی هێرشی کردووتە سەر داریوش.

مێژوونووسانی یۆنانی باسی بەخشینی خوێن لە لایەن گەنجانەوە بە داریوش دەکەن و ماوەیەکی زۆر تەنها وابیر دەکرایەوە ئەم بابەتە بۆ فیداکاری بووە و لە رووی پزیشکی سوودی لێ وەرنەگیراوە، لە کاتێکدا کە بە پێی تێگەیشتنە تازەکان کە بە پێی بەڵگەنامە مێژووییەکانی زانستی پزیشکی لە ئێرانی کۆن دەرکەوتوون، دیارە ئەو بابەتە دروستبووە و ئەو بابەتە تەنها لە چوارچێوەی پاڕانەوە نەبووە.

زانای رۆژهەڵاتناسی ئاڵمانی (باڵدێنس بێرگەر) کە لە نێوەی یەکەمی سەدەی بیستەم ژیاوە دەڵێت: گواستنەوەی خوێن لە جەستەی کەسێکی ساغ بۆ یەکی بریندار لە دۆزینەوەکانی سەدەی بیستەم نییە و دەڵێت لە رۆژهەڵات ئەو کارە بۆ چارەسەری بریندارەکان ئەنجام دراوە. زانیاریمان لەسەر شێوەی ئەنجامدانی ئەو بابەتە نییە.

پزیشکەکان جگە لە گواستنەوەی خوێن بۆ داریوش (ئەگەر ئەو کارەیان ئەنجامدابێت) سوودی لە زۆر دەرمان وەرگرت بۆ رێگرتن لە مردنی ناوبراو و مێژوونووسە کۆنەکان تەنها ناوی سێ لەو دەرمانانەیان باس کردووە کە بریتین لە:"نێترۆن، شەنبەلیلە و رۆنی زەیتوون) کە دەبنە هۆکاری کوشتنی میکرۆبەکان و هاوکار دەبن بۆ خێراتر بوونی زیندووبوونەوەی خانەکانی لەش. داریوش دوای شەو و رۆژێك لە بێهۆشی، بە هۆش هاتەوە و بیری هاتەوە کە کێ هێرشی کردووتەسەر و پرسیاری کرد لە کوێیە؟ وەڵامیاندایەوە کە گیراوە و فەرمانی کرد لە زیندان بێت تا چاکتر دەبێت.

داریوش دوای چاك بوونەوەی، فەرمانی کرد تا کۆندران بێنن و لە پێش چاوی خۆی دراوەکانی لە مەحەك بدەن تا دەرکەوێت پەنجا لە سەد غەشیان تێدا کراوە. کۆندران ویستی بڵێت بێ ئاگاداری خۆی ئەو کارە کراوە. داریوش هاواری بەسەردا کرد و وتی پیاوی ناڕاست،

بەڵگەی دروست بۆ ناپاکیت ئەوەیە کە خۆت ویستت من بکوژی تا تاوانەکەت ئاشکرا نەبێت و سزای خۆت وەرنەگری، ئایا جگە لەو بابەتە شتێکی تر هەیە ببێتە هۆکار بۆ کوشتنی من؟ کوندران تەنها بێ دەنگی نواند.

داریوش وتی: بۆ داپۆشینی تاوانەکەت ویستت من بکوژی، من چاوپۆشی دەکەم لە سزادانت بە هۆکاری هەوڵدان بۆ کوشتنم، مەزدا نەیویست من بمرم و منی زیندوو هێشتەوە، هەرچەندە تۆ منت کوشت. بەڵام ناتوانم چاوپۆشی لە ناپاکیەکەت بکەم چونکە تۆ بەو کارەت باوەڕ بە دراوی ئێرانت لای خەڵکان کەم کردووتەوە، ماوەیەکم پێویستە تا بتوانم کاریگەری ئەو کارەی تۆ بسڕمەوە و وابکەم نەتەوەکانی تر وەك جاران باوەڕیان بە دراوەکەمان هەبێت.

کۆندران وتی: ئەی پاشا، تۆ لە مافی خۆت خۆشدەبی، بۆ لە پێناو کەمێك مس کە کراوەتە ناو زێر سزام ئەدەیت.

داریوش وتی: دەتوانم لە مافی خۆم خۆش ببم، بەڵام ناتوانم پێشێلی مافی نەتەوەیەك بکەم کە پاشایانم و ناتوانم چاوپۆشی بکەم لە مافی تەواوی ئەو نەتەوانەی باوەڕیان بە دراوەکەمان کردووە و لە ژێر دەسەڵاتماندان و بە رەچاوکردنی متمانەیان بە پارەی وڵاتەکەم، زێر و زیویان لە مەحەك نەداوە.

پێش ئەوەی کۆندران بهێندرێتە لای داریوش، لێکۆڵینەوەی لەگەڵدا کرابوو لە بارەی دراوی ساختە و دانی نابوو بە دروستکردنی حەوت سەد هەزار دراوی (سکە) زێری ساختە. بۆیە داریوش فەرمانیدا لە تەواوی سنووری دەسەڵاتیدا، جارچییەکان بانگەشە بکەن هەر کەسێك لەو پارە ساختەیەی لە باختەر لێدراوە لایەتی، دەتوانێت بیباتە نزیکترین خزینەی پاشایەتی و بیگۆڕێتەوە.

جارچییەکان ئەو بابەتەیان بۆ خەڵك شی کردەوە کە بە هۆی ناپاکی کۆندران دەسەڵاتداری پێشووی باختەر لە رێژەی زێر بە عەیاری پەنجا لە سەد کراوە و پێویستە ئەو زێرانە کۆبکرێنەوە.

داریوش دەیزانی ئەو هەواڵە بۆ ئەو کەسانەی ئاگادار نین کە هەندێ پارەی ساختە کەوتووتە ناو بازار دەبێتە مایەی سەرسوڕمان، بەڵام ئەو هەواڵەی بە خەڵك ڕاگەیاند و لە ئەوانی ویست سککەکان لە گەڵ خۆیان بێنن بۆ سککەخانەکان بیگۆڕنەوە. ئەو کارە باشترە لەوەی پارەی ساختە لەناو دەستی خەڵکدا بمێنێتەوە و هێواش هێواش متمانە بە پارەی ئێران لەناوخۆ و لە دەرەوە کەم ببێتەوە. چونکە کاتێك خەڵك لەو هەواڵە ئاگادار ببنەوە کە کار پێکردنی هەندێ

پارەی ساختە بە فەرمانی داریوش نەبووە و بە پێچەوانەوە خەڵك پارە ساختەکانیان لەگەڵ پارەی دروست دەگۆڕنەوە و ئەمەش بۆ گێرانەوەی متمانەی هاووڵاتیان و بێگانەکان بە دراوی هەخامەنشی ئەنجامدرا. هەروەهاش بوو و خەڵك تێگەیشتن کە داریوش تاوانی لە بابەتی پارە ساختەکە نییە و متمانەیان بە پارەکە نوێ بۆوە.

داریوش فەرمانی کرد تا وەك سزا بۆ ئەو ناپاکیە مەزنەی کۆندران کردبووی، بە زیندوویی پێستی لێ داماڵن و بە کا پڕی بکەن و سەری بە پێستی پڕ کراو نووسێندرا و سالانێك ئەو پێستە پڕە سەرەنجی خەڵکی ڕادەکێشا و هەر کەس دەیدیت بە ئەوی تری دەووت ئەمەیە کۆندران کە سککەکانی زێری زیاتر لە ڕێژەی پێویست مس تێکەڵ کرد و هەر کەسێك ئەو جۆرە ناپاکیە بکات، دووچاری ئەو سزایە دەبێت. داریوش دوای سزادانی کۆندران و چاکتر بوونی باری تەندروستی، جارێکی تر ناچاربوو لە پایتەختەکەی خۆی دوورکەوێتەوە.

# گەمارۆدانی بەڵخ

ساڵی پێنج سەدی پێش زایین لە مێژووی ئێران و هەروەها یۆنان جێگەی بایەخە، چونکە لەو ساڵەدا هەوڵ کوشتنی داریوشی یەکەم درا و ئەو زیندوو مایەوە، هەروەها لەو ساڵەدا یەکەم هێرشی یۆنان بۆ سنووری دەسەڵاتی هەخامەنشی روویدا و ئەو ساڵە بووە دەستپێکی دوژمنایەتی ئەو دوو ئیمپراتۆرییە، تەنانەت نووسەری پەرتووکی ناوداری (لێکدانەوەی مێژوو) و لێکۆڵەری بەناو بانگی بریتانی (ئارنۆڵد جۆزێف توین بی) ئەو ساڵە بە ساڵێکی زۆر گرنگ و ساڵی دەستپێکی رووخانی شارستانییەتی یۆنان و ئێران دادەنێت.

لە ساڵ (٥٠٠ پ. ز) داریوشی یەکەم وێڕای بیستنی هەواڵی هێرشی یۆنانییەکان بۆ لیدی و کوشتاری خەڵکی لیدی و ئەو ئێرانیانەی لەو وڵاتە دەژیان لە لایەن یۆنانییەکانەوە، نەیتوانی بێ دواکەوتن بچێتە لیدی و سەرەڕای نزیك بوونەوەی وەرزی سەرما لە لیدی و قورس بوونی لەشکرکێشی لەو وەرزەدا بە ناوچە شاخاویەکانی رۆژئاوادا بۆ لیدی و ئاسیای بچووك، هەروەها لە باختەر ڕاپەرین کرابوو و ئەگەر داریوش پێشی بە راپەرینەکە نەگرتبایە، هەموو ناوچەکانی باکوور و رۆژهەڵات لە سنووری ئیمپراتۆریەتی هەخامەنشی لێ دادەبڕان.

پایتەختی وڵاتی باختەر لە سەردەمانی جیادا گۆڕاوە و ئەوکات پایتەختی ئەو وڵاتە شاری بەڵخ بوو، کە ئێستا بەشێکە لە خاکی ئەفغانستان و ئێمە زانیاریمان نییە کە ئاگرخانەی بەناو بانگی (بەهار) کە دوو هەزار خزمەتکاری لێبووە و گەورەترین ناوەندی پەروەردەکردنی گوڵ لە جیهانی ئەوکات بووە، لەو ساڵەدا هەبووە یا دواتر دروستکراوە؟ بەڵام زاندراوە ئەو شارە کە پایتەختی ولاتی باختەر بووە و تەنها دە فەرسەنگ لە زێی جەیحوون دوور بووە، یەکێك بووە لە گەورەترین شارەکانی وڵاتانی ژێر دەسەڵاتی هەخامەنشییەکان و ئەو ڕاستییە لە لایەن

مێژوونووسان پشتڕاست کراوەتەوە و لە کەتیبەکانی بێستوون کە لە لایەن داریوشەوە هەڵکەندراوە، ناوی بە (باختەردیس) هاتووە.

داریوش دوای ئەوەی هەواڵی راپەرینەکەی پێگەیشت، بۆی دەرکەوت سەرکردەی یاخی بووان پیاوێکە بە ناوی تەلمەن و بالاگاکەی لە بەلخە، ئەگەر ئەو توانیبای پێش هاتنی زستان خۆی بگەیێنێتە بەڵخ، دەیتوانی تەلمەن شکست بدات، بە پێچەوانەوە دەبێت بوەستێت تا زستان بڕوات و بەهار بێت. پیاوی هێرشبەر دەبێت بە ڕێگەیەکدا بڕوات کە دووچاری زێی هیرمەند نەبێت، چونکە لە وەرزی بەهار ئاوی هیرمەند ئەوەندە توندە کە هیچ کەس ناتوانێت لێی بپەڕێتەوە و بە هۆی هەڵکشانی ئاوی زێی هیرمەند ناتوانێت بپەڕێتەوە و دروستکردنی پردیش لەو وەرزەدا کارێکی ئەستەمە و ئاوەکە دەتوانێت فیلێك وەك پەرەمووچێك نوقم بکات.

ئەو کە باودۆخی بەشە جیاکانی سنووری ئیمپراتۆریەتەکەی شارەزا بوو، دەیزانی کە دەبێت بە شێوەیەك بڕوات کە پێش هاتنی سەرمای زستان شاری بەلخ داگیر بکات و ئەگەر دوای هاتنی وەرزی سەرما بگاتە ئەو شارە و ئەوان بەرگری بکەن، لەوانەیە تەواوی سەربازەکانی بە هۆی سەرما لەناو بچن، چونکە ئەو شارە یەك لە ساردترین شارەکانی سنووری ئیمپراتۆریەتەکەی بوو و لە ئەویّ و لە وەرزی سەرمادا رۆنی کونجی لە سەرمان دەبوو بە شەختە.

داریوش دەیزانی شاری بەڵخ هەروەك شارەکانی تری باختەر، قەڵای بەردینی هەیە و هەرچەندە لە بەردی تاشراو دروست نەکراوە. بەڵام چونکە لە بەردە، زۆر بەهێزە و بە کەلوپەلی ئاسایی ناتواندرێت بە سەریدا زاڵ ببێت.

ماریژان مۆڵە رۆژهەڵاتناسی بەناو بانگی سەدەی بیستەم کە لەو بەشەی پەرتووکەکەدا لە لێکۆڵینەوەکانی ئەو زۆرمان سوود وەرگرتووە، دەڵێت لە باختەر بۆ دروستکردنی قەڵا جۆرە گڵێکی تایبەت هەبوو کە یۆنانییەکان پێیان نەدەزانی و بەو گڵە دەتواندرا بەردە نەتاشراو و نارێکەکان لە پەنا یەکتری لەناو دیوار دابندرێن.

هونەری دروستکردنی ئەو قەڵایانە بەو جۆرە گڵە تەنانەت لە سەدەکانی ناوەڕاست کە هونەری قەڵاسازی پێشکەوتنی بەخۆوە دیت، لە ئەورووپا نەدەزاندرا و ئەوان بەردی تاشراویان لە دروستکردنی قەڵاکانیان بەکاردەهێنا و ئەمەش کاتی زۆری پێویست بوو و لە لایەکی تر تێچووی زۆری دەویست.

داریوش بۆ گەیشتنی بە باختەر، ڕێگەی زابول و قەندهاری هەڵبژارد و هەواڵی بۆ پاشای وڵاتی سکاکان لە زابۆل نارد تا دە هەزار هەڵبژێرێت و کاتی گەیشتنی لەشکرەکەی، ببن بە

بەشێك لەو لەشکرە و سکاکان سواری گا دەبوون و گواستنەوەی گاکان کاری قورس بوو، بۆیە فەرمانیدا تا سەربازە پیادەکانی خۆی ڕەوان بکات.

زابۆلێستان ئێستا تەنها سەحرایەکی بێ سوودە لە روانگەی کشتوکاڵی و ئەوکات واتە (٥٠٠ پ. ز) لە ناوچە سەوز و ئاوەدانەکان بوو و جەنگەڵێکی گەورەی هەبوو کە دوو سەدە دوای داریوش، ئەسکەندەر و هاورێکانی درێژی و پانی ئەو جەنگەڵانەیان بە سی فەرسەنگ دیاریکردووە و ئەمرۆ لەو جەنگەڵە بە پانتاییە و لەوەرگە گەورەکان کە گاکان تیایاندا دەلەوەڕان، هیچ شوێنەوارێك نەماوە.

هەرچەندە داریوش پەلەی بوو پێش گەیشتنی زستان شاری بەڵخ داگیر بکاتەوە، بەڵام کاتێك لەشکرەکەی لە زابۆلێستان بە هەموو پێداویستییەکانی جەنگ کۆبۆوە و ئامادەبوو، زانی ئەگەر بەرەو بەڵخ بڕوات لە وەرزی سەرما دەگات و سەربازەکانی لەناو دەچن. بۆیە بە پەسەندی زانی تا کۆتایی سەرمای توندی باختەر لە زابۆلێستان بمێنێتەوە و پێش وەرزی سەرکێشی زێی هیرمەند و توانەوەی بەفرەکان بەرەو باختەر بڕوات.

سەربازەکانی داریوش لە زابۆلێستان هەستیان بە سەرما نەکرد، چونکە ئەو ناوچەیە گەرمێن بوو و لە وەرزی زستان لەوەرگەکانی سەوز دەچوون. ژمارەیەکی زۆر مراوی لە شوێنە ساردەکان دەهاتن و لەو ناوچەیە دەمانەوە.

ئەو وەرزە لە ڕووی خواردن بۆ سەربازەکانی داریوش خۆش تێپەڕی، چونکە مراوی لە زابۆلێستان بە خۆرایی بوو و بەهای نەبوو، ئێستا دەزاندرێت کە مراویەکان تەنانەت لە شوێنە ساردەکانی وەك سیبیریا لە وەرزی سەرما کۆچ دەکەن تا لە زستان لە شوێنە گەرمەکانی ئێران و لە ئەوانیش لە زابۆلێستان ببەنەسەر.

چل و پێنج ڕۆژ پێش هاتنی بەهار لەشکری داریوش بەرێکەوت و بێ هیچ کێشەیەك لە زێی هیرمەند پەڕییەوە و لەو ڕێگایەی لە نێوان زابۆلێستان و قەندەهاردا هەبوو، ڕێگەی ڕۆژهەڵاتی گرتەبەر و بێ هیچ ڕووداوێك کە شیاوی باسکردن بێت گەیشتە (قەندەهار).[١]

---

(١) (ئەوکات ناوی ئەو شارە قەندەهار نەبوو و لە دوای هاتنی ئەسکەندەر بۆ ئەو شارە ئەو ناوە هاتووە و دواتر دووچاری سوان بووە، بەڵام مێژوونووسە ئەفغانییەکان ئەوە بە دروست نازانن و دەڵێن ناوی ڕاستی ئەو شارە (گەندهارا) بووە و بەم شێوە گۆڕاوە. لە مێژووە یۆنانییەکان ئەو ناوە دەبینرێ و ئەوان ناوی (ئەرکوزی) بۆ ئەو شارە بەکاردەبەن و دەڵێن پایتەختی ولاتی (ئەرکوزیا) بووە کە ولاتێك بووە لە باشووری ئەفغانستانی

قەندەهار لە رووی سەربازی و بازرگانییەوە گرنگی زۆری هەبوو و دوای گەیشتنی داریوش بۆ ئەو شوێنە، هەواڵیان پێدا کە تەلمەن لە بەلْخ هاتۆتە دەرەوە. دەرچوونی تەلمەن لەو وەرزەی ساڵ لە بەلْخ شتێکی ئاسایی نەبوو، چونکە هێشتا وەرزی سەرما تەواو نەببوو تا ئەو لە شار دەربچێت، بەڵام ئەو هەواڵەی هاتبوو راست بوو.

دواتر دەرکەوت تەلمەن نەهاتۆتەدەر و تەنها بە بۆنەی نزیك بوونەوەی وەرزی بەهار ئەسپەکانی هێندراون بۆ کەنارەکانی زێی جەیحون بۆ لەوەڕ و ئێستا لەشکری تەلمەن بێ ئەسپە، هەرچەندە ئەو دەتوانێت لە ماوەیەکی کەمدا ئەسپەکان بباتەوە، بەڵام ئەسپێك کە لە لەوەڕ بێت بە هۆی ئەوەی گیای تازە دەخوات سوودی بۆ لەشکر نابێت و پێویستە بۆ ماوەی دە تا پازدە رۆژ ئالیکی بدرێتێ تا بۆ ئەو کارە ئامادەبێت.

ئەو ناوچەیەی داریوش لەشکری خۆی پێدا تێپەڕاند تا بگاتە بەلخ، یەك لە شارێکانی سەردەمانی کۆن بوو و لە هەمان رێگاوە ئارياییەکان بەرەو باشوور چوون و پێش گەیشتنیان بۆ باشووری ئاسیا بوونە چەند بەشێك، هەندێکیان لەو شوێنە مانەوە و بەشێك چوونە هند و هەندێکیش بەرەو میزووپۆتامیا و ئێرانی ئێستا هاتن.

ئەمرۆ پێشکەوتنی زانست لە چەند سەدەی ڕابردوو گۆڕانی لە جوگرافی ناوچەکان بەدی هێناوە و بەشێك لە شاخ و دەشت و زێ و رێگەکانی گۆڕیوە، پێش ئەوکات تا ڕادەیەك جوگرافیای جیهان وەك جوگرافیای پەنجا یا سەد هەزار ساڵ پێش بوو و تەنها بە وردبوونەوە لە بارودۆخی جوگرافیای ئاسیا، دەزاندرا رێگای پەڕینەوەی ئارياکان لە کوێ بووە و چوون خۆيان گەیاندووتە باشوور و رۆژئاوای ئاسیا.

ناوچەیەك کە ئەمرۆ تورکەمەنستانە لە رابردوودا بەدار داپۆشراو و سەرسەوز بوو و ئارياکان لەو رێگەوە چوونە ئەورووپا، ئەوان ئەگەر لە باشوورەوە چووبان، دەبوایە لە شاخە بەرزەکانی خوراسان بپەرنەوە و لە سەردەمانی کۆن ئەو کارە ئەستەم بوو، بۆیە بە گریمانی زۆر ئەوان بەو رێگەیەدا کە داریوش پێیدا چوو بۆ بەلْخ، هەنگاويان نا بۆ ناو ئێران.

بەشێك لە رێگای لەشکری داریوش جەنگەڵی چڕ بوو و پڕ بوو لە بالندە و ئاژەڵی گیاخۆر، داریوش لە بەشێك لەو رێگایە لەشکرەکەی بە کەناری زێی (کۆفس) تێپەڕاند، ئەو زێیە ئێستا بە زێی کابۆل ناسراوە و یەك لە زێیە گەورەکانی ئەو وڵاتە بووە. ئەو ناوچەیەش لە رووی

---

ئێستا و لە پیشاوەر، نەبوونی ناوی گەندهارا لە مێژووە یۆنانییەکان بەڵگە نییە بۆ ناراستی ئەو ناوە و پێویست بە لێکۆڵینەوەی زیاتر لەو بارەوە هەیە. زەبیحوڵڵا.)

جوگرافی وەك ناوچەکانی تر گۆڕانی بەسەردا هاتووە و جەنگەڵ و لەوەرگەکانی نەماون و وێڕای ئەمەش هێشتا لە کابوول جەنگەڵ ماوە و دەرخەری ئەو ڕاستییەیە کە ئاراخازیا پڕ بووە لە جەنگەڵ و دارستان.

داریوش دوای تێپەڕینی بەو ناوچەیە و دواتر بە ناوچەی (غوور یا گوور) کە ئەویش ناوچەیەکی سەوز بوو، لە دەستپێکی بەهاردا گەیشتە باختەر و پایتەختەکەی واتە شاری بەڵخ. هەرچەندە زستانی ئەو وڵاتە زۆر سارد بوو، بەڵام بە ناوچەیەکی کشتوکاڵی باش دادەنرا و دانەوێڵەی چاکی لێ بەرهەم دەهات، هەروەها کاڵەك و شوتی ئەو ناوچەیە لە ئاسیای ناوەڕاست بەناو بانگ بوو.

ڕۆژهەڵاتناس و لێکۆڵەری ناسراوی بریتانی (فەریەر) کە لە سەدەی نۆزدەهەم ژیاوە لەو بارەوە دەڵێت: شووتی ئەو ناوچەیە ئەوەندە گەورە بوون کە تەنها دوو دانە بەیەکەوە لە لایەکی تێڕی وشتر دادەنران و زۆر شیرین بوو، بە هۆی سەرمای ناوچەکەش تا کۆتایی وەرزی هاوین شووتی دەما.

کاتێك داریوش گەیشتە بەلخ، هەژدە رووبار کە لە زێی بەڵخ جیا دەبوونەوە، زەوییەکانی ئەو ناوچەیان تێر ئاو دەکرد و بۆ کشتوکاڵ ئامادەیان دەکردن، کاتێك داریوش گەیشتە بەڵخ، گەنم و جۆ شین ببوو و کەمێك بەرز ببوونەوە، بۆیە داریوش فەرمانیدا لەشکرەکەی بەناو کێڵگەکاندا نەروون و بچنە ناو باغەکان کە تازە چرۆیان کردبوو، سەربازەکان دەیانزانی مانای ئەو یاساغکردنە چییە و هەر کەس نافەرمانی بکات بە توندی سزا دەدرێت.

تەلمەن سەرکردەی یاخی بوونەکە، خەلکی بەڵخ و لە سەردارەکانی ئەوێ نەبوو، ئەو لە سەردارەکانی سەرووی زێی سەیحوون بوو و هەڵسوکەوتی لە خەڵکی ئەو سنوورە نەدەچوو. ئەوکات لە سەرووی ئەو زێی سەیحوون هەندێ دەشتی فراوان هەبوو کە کەس نەیدەزانی کۆتاییان کوێیە و کەسیش نەیدەویست ئەو بابەتە بزانێت، چونکە دەیانزانی دەگاتە ئەو شوێنەی ڕۆژی لێ هەڵنایەت و بەردەوام تاریکە.

لە زەوییەکانی سەرووی سەیحوون راو زۆر بوو و ئەوەندەی مامز لێ بوو کە کاتی ڕۆیشتنی ڕەوەکانیان، دەنگی زۆر بەهێز لە بەر یەککەوتنی قۆچیان دەهاتە بەرگوێ کە وەك هەورە بروسکە بوو. دانیشتوانی ئەوێ گۆشتی مامزیان دەخوارد و پێستەکەیان دەپۆشی و هەندێ کاتیش هێرشیان دەکردە سەر ناوچەکانی باشووری خۆیان، ئەگەر کەس ڕێی نەگرتبانە یا وەرزی زستان نەهاتبایە، ئەوەندەی توانایان هەبوایە بەرەو پێش دەچوون.

تەلمەن یەك بوو لە سەردارەكانی ئەو نەتەوەیە و داریوش كەسایەتی و بوونی ئەوی دەناسی و بۆی دەركەوت كە پێویستە هەوڵ بدات بە زوویی ئەو لە بەلخ دەر بكات یا لەناوی ببات. تەلمەن پیاوێكی سەحرانشین بوو و ئەو پیاوانە بە پێی نەریت، جەنگ لە دەرەوەی شار و لە كەشێكی ئاوەڵەیان پێ باشترە. بەڵام تەلمەن گوێی بۆ ئامۆژگاری چەن كەسێك لە ڕاوێژكارەكانی گرت كە پێیانوابوو دیوارەكانی ئەو شارە ئەستەمە بگیرێن و بڕیاریدا لە ناو شاردا بەرگری بكات.

ئایا ئامۆژگاری ڕاوێژكارەكانی تەلمەن بۆ ئەوە بوو كە لە ناوی ببەن؟ چونكە ئەگەر لە دەرەوەی شار جەنگی لە گەڵ داریوش بكردبایە، لەوانە بوو سەركەوتوو بێ یا بتوانێت رزگاری ببێت، بەڵام مانەوە لە پشت دیوارەكان بەو ئۆمێدەی لە مەترسی داریوش پارێزراو بێت ئەوی لەناو دەبرد. ئەمڕۆ دوای بیست و پێنج سەدە داوەری كردن لە بارەی ئەم پرسن كاری ئێمە نییە و تەنها دەتوانیین بڵێین پەناگیری تەلمەن لە گەڵ نەریت و خووی ئەودا نەدەگەنجا و خەڵكی سەحرانشین پێیان باشترە لە كەشی كراوەدا بجەنگن.

داریوش پێش ئەوەی بۆ چوونە ناوشار دەست بە جەنگ بكات، وەڵامی بۆ تەلمەن نارد و وتی: حەز ناكەم بە هۆی جەنگ ئەو شارە وێران بكەم و دانیشتوانی بكوژم، تۆ بێگانەی و هاتووی بۆ ئەو شارە و سۆزت بۆ شارەكە و دانیشتوانی نییە، بەڵام ئێرە ناوچەی دەسەڵاتی منە و من نامەوێت شارێك یا وڵاتێكی ژێر دەستی هەخامەنشی بە وێرانی و دانیشتوانەكەی بە برسیەتی ببینم.

ئەگەر بە بێ جەنگ خۆت ڕادەست بكەی و زیان بە دانیشتوانی شار نەگات و هیچ خانوویەك نەرووخێت، ئەوكات بەڵێنت پێ دەدەم هیچ زیانت لێ نادەم، بەڵام ئەگەر جەنگ بكەی و خەڵك دووچاری زیان و شاریش دووچاری وێرانی بكەیت، بە پێی ڕێژەی وێران بوونی شار و زیانی خەلكەكە، سزات بەسەردا دەدەم.

تەلمەن وەڵامی دایەوە: من منداڵ نیم تا بمترسێنی و ئەگەر منت دەستگیر كرد ئەوەی دەتوانی بەرانبەرم ئەنجام بدە.

داریوش كە شارەكەی گەمارۆ دابوو، بێ ئەوەی دەست بە جەنگ بكات، فەرمانیدا سەربازەكانی ئامادەبن بۆ هێرش بۆ سەر شارەكە.

مێژوونووسی بەریتانی (فریر) دەڵێت: كورتەی باسی ئەو جەنگە لە كەتیبەی گۆڕی داریوش هەیە. بەڵام ئەو كەتیبەیە ئێستا نەماوە. وێڕای ئەوەی بەشێك لە كەتیبەكان تا كۆتایی سەدەی نۆزدەهەم مابوون، بەڵام ڕۆژهەڵاتناسان دەڵێن زۆرینەی كەتیبەكانی گۆری داریوش لەناو چوون.

فریر دەڵێت لەو کەتیبەیەدا داریوش دەڵێت یەك لە سەختترینی ئەو جەنگانەی کردوومە بۆ گرتنی قەڵای شارێك، ئەو جەنگە بوو. روونە کە دژواری ئەو جەنگە بۆ هۆکاری دژواری قەڵاکە گەڕاوەتەوە کە بە ئامێرە جەنگییەکانی ئەوکات نەدەشکا.

لە رۆژی پازدەیەمی بەهاری ساڵی (٥٤٩ پ. ز) داریوش دەستی بە هێرش بۆ ئەو شارە کرد و لە کاتێکدا مەنجەنیقە بچووکەکان بەردیان هەڵدەدا، داریوش فەرمانی کرد تا مەنجەنیقی گەورە دروست بکەن. گەزنەفۆن دەڵێت: کاتێك خەڵکی دەوروبەری شارەکە گوێبیستی هەواڵی دەورەدانی شاری بەڵخ لە لایەن داریوش بۆ لە ناو بردنی تەلمەن بوون، لە هەموو لایەکەوە بۆ یارمەتی ئەو هاتن، چونکە تەلمەن کاتی دەست بەسەردا گرتنی ئەو وڵاتە هەندێ لە پیاوانی کوشت بوو و تەواوی خەڵکی تاڵان کردبوو.

خانتووس دەڵێت: ئەوانەی بۆ یارمەتی داریوش هاتن، پیاو گەلێکی چاو شین، موو زەرد و باڵا بەرز بوون. ئێستا لەو ناوچەیە کە بیست و پێنج سەدە پێش ئێستا ئەو مروڤە باڵابەرز و چاوشین و موو زەردانەی لێ دەژیان، لە ئەوان هیچ شوێنەوارێك نەماوە. بەڵام لە ناوچەی (پەختونستان) هێشتا لەو ڕەگەزە ماون و دوور نییە ئەو کەسانەی لە ئەوێ دەژین لە نەوەکانی ئەوانە بن کە لە بیست و پێنج سەدە پێش یارمەتی داریوشیان داوە.

ئەو پیاوانەی بۆ یارمەتی تەلمەن هاتن، وتیان ئێمە بۆیە بۆ یارمەتیت هاتین، چونکە ستەمی تەلمەن تەنها بە خەڵك نەوەستا و بزنە کێویشی گرتەوە و لەناوی برد، پێش هاتنی ئەو بزنە کێوی زۆر بوو و لە شاخەکان دادەبەزین و دەهاتنە ناو ماڵەکان، هەروەها مەری کێوی لە وەرزی زستاندا لە ماڵەکاندا دەژیان، بەڵام تەلمەن و سەربازەکانی هەموو ئاژەڵەکانیان کوشت بە بێ ئەوەی بیانخۆن و لاشەکانیان بۆگەن بوون، تەنها پاڵنەر بۆ کوشتنی ئاژەڵەکان لە لایەن ئەوانەوە، خوێن رشتن بوو.

سەردار و مێژوونووسی یۆنانی گەزنەفۆن کە سەدەیەك دوای داریوشی یەکەم سەرەتا لە رێگەی ئاسیای بچووك هاتە ئێران و دواتر لە رێگەی (کەوتووتە باکووری میزۆپۆتامیا) و دیاربکر و ترابزوون (هەموویان شاری کوردستانین) گەڕایەوە، دەڵێت: سی هەزار کەس لە پیاوانی باختەری بۆ یارمەتی داریوش تێکەڵ بە ئەو بوون و وتیان ئەگەر پاشا ڕازی بێت، تونێلێکی درێژ لە ژێر زەوییەوە لێدەدەین و دەچینە ناو شاری بەڵخ.

داریوش هەندێ بینای گەورەی دروستکردبوون یا لە دروستکردندا بوون، بۆیە هەڵکەندنی تونێلێك بۆ ئەوەی لەشکرەکەی بەناویدا بروات بە کارێکی سەخت دانا کە کاتی زۆری

پێویستە، ئەو هەزاران کەناڵی لە ئێران هەڵکەندبوو و بۆیە دەیزانی پێویستی بە هەڵکەندنی چاڵ هەیە تا هەوا بگەیێنێتە ناو تونێڵەکە و ئەگەر هەوای نەگاتێ سەربازەکان دەخنکێن. بێ گومان هەڵکەندنی چاڵەکانیش سەرەنجی تەلمەن ڕادەکێشێت، چونکە هەر کە ڕۆژئاوا ببێت و هەوا فێنك بێت، لە چاڵەکانەوە دووکەلێکی سپی دێتەدەر و سەرنجەکان بۆ لای خۆی رادەکێشێت و تەلمەن دەزانێت سەرگەرمی هەڵکەندنی چاڵن و لەبەر ئەو هۆکارانەی کە تایبەتن بەو کارە، پێشنیارەکەی پەسەند نەکردن.

هاوکات لەگەڵ باراندنی بەرد بەسەر شارەکەدا، داریوش فەرمانیدا سەربازەکانی بە هاوکاری دارتاش و مەنجەنیق سازەکان لە هەندێ شوێنی تەنیشت دیواری شار هەندێ قادرمە و داربەست لە دار دروست بکەن و داربەستەکان دوو نهۆم بن، تا سەربازەکان بتوانن بەسەریاندا سەر بکەون و بچنە سەر دیواری شار. بە درێژایی ئەو کاتەی داربەستەکان دروست دەکران، مەنجەنیقەکان بە رۆژ و شەو پارێزەرانی شاریان لەو شوێنانە بەردباران دەکرد تا نەتوانن رێگر بن لە دروستکردنی داربەستەکان و سەرکەوتنی سەربازان بەناویاندا، چونکە داربەستەکان دوو نهۆم بوون ئەو سەربازانەی لە ژێرەوە سوار دەبوون، پارێزراو بوون لە پێکانیان بە بەرد و تیر.

شەوی بیست و حەوتەمی بەهار واتە دوازدەهەمین رۆژی جەنگ، داریوش ئەفسەرانی لەشکرەکەی داوا کردن و پێیوتن لە گەڵ خۆرهەڵاتدا هێرش دەکەینە سەر شار و ئێوە پێویستە لە یەکەکانتان سەد خۆبەخش ئامادەبکەن، خۆبەخشەکان دەبێت لە نهۆمی سەرەوەی داربەستەکان سواربن تا بتوانن سەر دیوارەکان بکەون و بۆ ئەوەی لە کاتی کەوتن یا پێکان نەمرن، پێویستە قەلغان لەبەر بکەن.

ئەو دەستە سەد کەسیە خۆبەخشانە دەبنە پێشەنگی هێرشی ئێمە بۆ شار و دەبێت سەر دیوار بکەون و لەو شوێنەی سەر دەکەون، شوێنی خۆیان بکەنەوە تا سەربازانی تر بتوانن بە بێ مەترسی لە داربەستەکان سەر بکەون و بگەنە سەر دیوار، دوای ئەوە ئێمە بەبێ پسانەوە توانای ناردنی هێز بۆ سەر دیوار و بەردەوام کردنی هێرش تا کردنەوەی دەروازەکانی شارمان دەبێت.

بە فەرمانی داریوش دوازدە دەستەی سەد نەفەری لە سەربازانی خۆبەخش بۆ سەرکەوتن لە دیواری شار پێکهات و ئەفسەرەکان پێیان وتن: دە کەسی یەکەم لە هەر دەستەیەك کە بتوانن سەر دیوارەکە بکەون، هەریەکە دە دارێك زێر وەردەگرن و دە کەسی دووەمی هەر دەستەیەکیش پێنج داریك زێر بۆ هەمان مەبەست وەردەگرن، دە کەسی سێیەم لە هەر دەستەیەك دوو داریك و ئەوانەی تریش ئەگەر بتوانن سەرکەون هەریەکەیان یەك داریك زێر

وەردەگرن. ئەفسەرەکان دەیانزانی بەشێك لەو سەربازانە لە پێناو دە یا پێنج داریك زێر سەردەکەون و دەکوژرێن و بە وتەی گەزنەفۆن داریوش لە روانگەی بەخشینی دیاری بە سەربازەکان زۆری زیان پێ نەدەگەیشت.

چونکە حەوت داربەست ئامادەکرابوو، لەو شەوەدا حەوت سەد سەرباز زرێیان کردە بەریان و کاسکیان کردە سەریان، ئەوان دەیانزانی رۆژی دواتر و لەکاتی هێرشدا مەنجەنیقەکانیان پاڵپشتیان ناکەن، چونکە لەوانەیە بە بەردی مەنجەنیقەکانیان بکوژرێن، بۆیە ئەوان بۆ گەیشتنیان بۆ سەر دیواری شار دەبوایە تەنها پشت بە خۆیان ببەستن.

ئەوان گورزیان پێبوو، چونکە گورز تاکە چەك بوو کە مەترسی چەکەکانی تر جگە لە تیر و بەردی نەدەهێشت، ئەوان دەیانتوانی بە گورز شمشێرەکان و نێزەکان بشکێنن و دوای سەرکەوتنیان لە دیوارەکان، بەرگریکاران بە تەنها یەك لێدانی گورز بخەن.

لەگەڵ بەرەبەیان خۆبەخشەکان بە بێدەنگی بەرەو داربەستەکان کەوتنەرێ و سەربازەکانی تریش لە دوایانەوە هاتن، تاکە شتێك کە دەیتوانی پارێزەرانی شار لە دەستپێکی هێرش ئاگادار بکاتەوە، وەستانی مەنجەنیقەکان بوو و چیتر دەنگی مەنجەنیقەکان گوێی هەموانی ئازار نەدەدا.

تاکە شتێك کە لەوانەبوو بەرگریکارەکان تێ بگەیێنێت هێرش دەستی پێکردووە، بێدەنگ بوونی مەنجەنیقەکان بوو و چیتر باسکە بەهێزەکانی مەنجەنیقەکان بەریەك نەدەکەوتن، چونکە باسکرا کە بۆ رێگرتن لە تێکشکانی داربەستەکانی لە لایەن بەرگریکارەکانەوە، بە درێژایی شەو مەنجەنیقەکان بەردیان باراندە سەریان.

پارێزەرانی شارەکە دوای سەد خولەك لە وەستانی مەنجەنیقەکان هەستیان کرد کە ئەو بێ دەنگیە نیشانەی هێرشی سەربازەکانی داریوشە بۆ سەریان. چونکە تەلمەن و سەربازەکانی خەلکی سەحرا بوون و ئەو جۆرە جەنگەیان پێشتر نەکردبوو و جەنگی قەڵاگرتنیان نەدەزانی، بەڵام دوای ئەوەی بینیان داربەستەکان بەرزکراونەتەوە، تێ گەیشتن کە سەربازەکانی داریوش دەیانەوێت هێرش بکەن و بۆیە لە هەر شوێنێك کە داربەستی بۆ بەرز دەکرایەوە، ژمارەیەکی زۆر سەربازی لێ کۆدەبۆوە و بەردیان بەسەر هێرشبەرەکاندا دەباراند.

وێرای ئەوەی بەرد دەباری، بەڵام سەربازەکانی داریوش سەردەکەوتن تا بگەنە دوا خاڵی سەرەوەی داربەستەکان و بۆ سەرکەوتن بۆ سەر دیوارەکەش سوودیان لە قولاب دەبینی. ئێرانییەکان نەیاندەتوانی داربەستەکمان بە شێوەیەك دروست بکەن کە بەشی سەرەوەیان بگاتە ئاستی دیوارەکە و سەریشی داپۆشراو بێت، چونکە بەرگریکارەکان بە باراندنی بەرد

دەیانشکاندن و نەیاندەهێشت بەشی سەرەوەی داربەست بگاتە تەنیشت دیوارەکە. بۆیە سەربازەکان ناچاربوون بۆ گەیشتن بۆ سەر دیوارەکە سوود لە قولاب وەربگرن.

بەکارهێنانی قوللاب کە بە زنجیرێك بەسترابوو، کارێکی ئاسان نەبوو و هێزێکی زۆر و خێرایی تەواوی دەویست و لە گەڵ هەڵدانی قوللاب، دەبوایە سەربازەکە بە هەردوو دەست و بە هۆی ئەو زنجیرەی بە قوللابەکەوە بوو، بە خێرایی خۆی بگەیێنێتە سەر دیواری شار، هەرچەندە پارێزەرانی شاریش نەیاندەتوانی بە شمشێر زنجیرەکەی بپسێنن، بەڵام ئەگەر هێرشبەر دواکەوتبایە و بە خێرایی لە دیوارەکە سەرنەکەوتبایە، بەرگریکارەکان بە بەرد لێیاندەدان و هەڵیاندەدانە خوارەوە و ئەو نەیدەتوانی سوود لە گورزەکەی ببینێت کە بە کەمەری هەڵواسرابوو، چونکە بە دەستەکانی لە دیوار سەردەکەوت.

سەربازەکانی تەلمەن کە لە سەر دیوار بوون ئازاد بوون لە شێوازی بەرگری کردن، بەڵام سەربازەکانی داریوش چونکە بە هەردوو دەستەکانیان لە دیوار سەردەکەوتن، لە دوا ساتەکانی سەرکەوتندا لە سەربازێك دەچوون کە چەکەکەی لێ سەندرابێت و یا وەك کەسێك کە دوو دەستەکانی نەبێت.

لە ڕۆژانی سەرەتای جەنگدا هەندێ قادرمەش لە لایەن لەشکری داریوشە ئامادەکرابوون، هەرچەندە ئەو دەیزانی ناتواندرێت سوودیان لێ وەربگیرێت و نەبینرابوو کە هێرشبەرەکان توانیبیان بە هۆی قادرمەوە بگەنە ناو قەڵاکان، بەڵام بۆ سەرگەرم کردنی سەربازەکانی تەلمەن باش بوو و سەربازەکانی ئەو کە دیتیان ژمارەیەکی زۆر سەرباز سەرگەرمی سەرکەوتنن لە دیوار بە هۆی قادرمەکان، لە هەموو شوێنی دیوارەکە بڵاوبوون تا بتوانن ڕێگە لە سەرکەوتنیان بگرن و ئەمەش بۆوە هۆی ئەوەی ئەوان نەتوانن ئەو بەشانەی کە زۆر گرنگن بە تەواوی هێزی لێ دابنێن.

ڕۆژی بیست و حەوتەمی دەستپێکی بەهار کاتێك سەربازە خۆبەخشەکانی داریوش، داربەستەکانیان هێنان و ژمارەیەکی زۆر سەرباز سەرگەرمی سەرکەوتنن لە دیوار بە هۆی قادرمەکانبوون و ئەو کارە وای کرد کە سەربازەکانی تەلمەن لە هەموو شوێنی دیوارەکە بڵاوبن تا ڕێگە لە سەرکەوتنیان بگرن و ئەمەش بۆوە هۆی ئەوەی نەتوانن ئەو بەشانەی کە زۆر گرنگن بە تەواوی هێزی لێ دابنێن و ئەگەر لە هەموو شوێنێك سەربازی لێ نەبێت کە بەرد ببارێنن، سەربازە هێرشبەرەکان دەگەنە ناو شار.

ئەو ڕۆژەی داریوش هێرشی بۆ بەلخ کرد، دانیشتوانی ئەو شارە یارمەتی تەلمەنیان نەدا، شێوازی ژیان و خووی تەلمەن و سەربازەکانی بە شێوەیەك بوو کە خەلکی بەلخ نەیاندەتوانی

لەگەڵیان بگونجێن و ئەو کوشتارە بێ بەزەئیانەی تەلمەن لە کاتی هاتنی بۆ باختەر کردبووی، لە لای خەڵك بێزراوی کردبوو و لەو شارەدا کەس نەبوو کە خزم یا کەسێکی نزیکی لەناو یا لە دەرەوەی بەلخ بەدەست تەلمەن و سەربازەکانی نەکوژرابێت.

ئەگەر لە ناو بەلخ کەسانێکیش ویستبایان یارمەتی تەلمەن بدەن، لەبەر خەڵکی تر نەیاندەوێرا و دەکەوتنەبەر رقی هاوشاریەکانیان و دەکوژران، یا ئەوەندە شەرمەزار دەبوون کە نەیاندەتوانی بەردەوامبن لە ژیان لەو شارە.

چونکە کەس لە بەلخ یارمەتی نەدان و ئەوانیش سەحرانشین بوون و جەنگی ناو قەڵایان نەدەزانی و تەنها بە هۆی شمشێر و نێزە و بەرد، رێگریان دەکرد لە سەرکەوتنی ئەو سەربازانەی داریوش کە زرێیان لەبەردا بوو بۆ سەر دیواری شار، ئەوان نەیان دەزانی ئاوی گەرم و ئاگر بۆ رێگری بە سوودترن و کەس لە دانیشتوانی شاری بەڵخیش ئامادە نەبوو ئەو بابەتەیان بۆ روون بکاتەوە.

ئەوان بە هۆی ئەو ستەمەی لە لایەن تەلمەن و سەربازەکانی لێیان کرا بوو، یارمەتیان نەدان و تەنانەت ئەوانەی دەشیانەویست یارمەتی بدەن، لە ترسی ئەوەی هاوشاریەکانیان تۆڵەیان لێ نەکەنەوە، بەو کارە هەڵنەستان.

ئەو سەربازانەی داریوش کە زرێیان لەبەر بوو، بەردەوام دەهاتن و هەرچەندە ژمارەیەك لە ئەوان کوژران، بەڵام بە هۆی زۆری ژمارەیان سەرەنجام توانیان سەر بکەون بۆ سەر دیواری شار و لە شوێنێکی سەر دیوارەکە پێگەیەك بۆ خۆیان دروست بکەن.

داریوش لە کەتیبەی بێستووندا کە وەك پەرتووکێك وایە و بە سێ زمانی (پەهلەوی هەخامەنشی، عیلامی و بابلی) نووسراوە، دەڵێت:"گرتنی قەلایەك بە رێگەی سەرکەوتن بەسەر دیواردا، کارێکی زۆر سەختە و زیانی زۆر گیانی پێویستە، بەڵام من بەشێك لە قەلاکانم بەو رێگەیە گرت."(٢)

دوای ئەوەی سەربازەکانی داریوش لەسەر دیواری شار پێگەیەکیان بۆخۆیان دامەزراند، داریوش زۆر بە خێرایی کەوتە بەهێز کردنی ئەوێ و زۆری نەخایاند دووەمین پێگە لە رۆژهەڵاتی شار لە لایەن سەربازەکانی داریوش دامەزرێندرا، هەرچەندە ئەوکات خەشایار خۆشەویستترین کوری داریوش بوو، بەڵام بۆ بەشداری لە جەنگ ئەوی نارد بۆ ئەو پێگەیە.

---

(٢) (وەرگێرانی کەتیبەی بێستوون لە کاتی نووسینی ئەم پەرتووکە تەواو نەببوو، لەوانەیە لە داهاتوو بە بەراوورد کردنی هەر سێ نووسینی هەخامەنشی و عیلامی و بابلی ئەو کەتیبەیە شتی تازە دەرکەوێت، رۆژهەڵاتناسان سەبارەت بە ماناکانی هەندێ وشە بیرورِایان جیاوازە. زەبیحوڵڵا)

نەزاندراوە ئەوکاتە و لەو رۆژە کە داریوش (خەشایاری کوری) نارده سەر دیوارەکە، تەمەنی خەشایار چەند بووە و هۆکارەکەشی ئەوەیە کە بەرواری هاوسەرگیری ئاتووسا و داریوش بە دروستی نازانیین و تەنها دڵنیاین داریوش دوای گەرانەوەی لە میسر و سوریا، لەگەڵ ئاتووسای خێزانی کەمبۆجییە هاوسەرگیری کردووە و ئەو کورە لە ئاتووسا هاتبووە دنیا. بەڵام جیاوازی لە بیروڕای مێژوونووسان لە بارەی ساڵی هاوسەرگیری ئەو دووانە هەیە و جیاوازی ساڵی هاوسەرگیریش، راستەوخۆ جیاوازی ساڵی بوونی خەشایاری لێدەکەوێتەوە.

ئەگەر خەشایار لە ساڵی (٥٢١ پ. ز) لە دایك بووبێت، ئەوکاتە بیست و دووساڵی بووە و لەو تەمەنەدا شازادەکان کاری گرنگی وەك فەرمانده‌ی لەشکریان پێ دەسپێردرا، بەڵام لە مێژوودا نەمان دیتووە کە ئەو کات ئەو فەرماندەی لەشکر بووبێت. ئەگەر خەشایار تەمەنی (٢٢) ساڵ بوایە یا دەبوو بە فەرماندەی سوپا و یا داریوش ئەوی لە پازارگاد جێ دەهێشت تا ببێتە جێنشینی ئەو و وڵاتەکانی ژێر دەست بەرێوە ببات، کەواتە تەمەنی شازادە کەمتر بووە، بۆیە داریوش لەگەڵ خۆیدا بۆ باختەری بردووە تا ئەزموونی جەنگ و بەرێوەبردنی لەشکری فێر بکات و بۆیە لەگەڵ خۆی بۆ باختەری هێنا تا ئەزموونەکانی جەنگ فێر ببێت. وێڕای ئەوەی خەشایار خۆشەویستترین کوری داریوش بوو، بەڵام ئەو رۆژە ئەوی نارده سەر دیوارەکە تا لە جەنگدا بەشدار ببێت.

ئەو پێگەیەی لەسەر دیواری رۆژهەڵاتی شار دروستکرا، شوێنێکی ئارام نەبوو و تەنانەت یەك لە دوو ناوچەی پڕ مەترسی ئەوکاتی جەنگەکە بوو، چونکە لەگەڵ ئەوەی تەلمەن هەواڵی ئەو دوو پێگەیەی زانی، بە تەواوی تواناوە هێرشی کردە سەریان تا تێکیان بشکێنێت و لەوێ دووریان بخاتەوە تا نەتوانن بێنە ناو شار.

داریوش دەیزانی کورەکەی بۆ شوێنێك ناردووە کە هەمووکات ئەگەری کوژرانی هەیە و هاوکات ئەوەشی دەزانی کە ئەو تا رووبەرووی مەرگ نەوەستێتەوە ناتوانێت ببێتە خاوەن ئیرادە و دڵی بەهێز و هەر ئەو بابەتەش بۆوە هۆی ئەوەی ئەو لە یەکەمین کەسەکان بێت کە ئەو رۆژە هەنگاوی نایە ناوشار.

تەنها لە سێ لەو حەوت داربەستەی بە فەرمانی داریوش لە شوێنە جیاکانی تەنیشت دیواری شار دروستکران، سەربازەکان توانیان بۆ سەر دیواری شار سەربکەون و پێگەیان لێ دروست بکەن و پێگەی سێیەم لە رۆژئاوای شار بوو، سەربازەکانی تر هەرچەندە لە دیوار سەرکەوتن، بەڵام کوژران.

داریوش بۆ بەهێز کردنی هەرسێ پێگەی رۆژهەڵات و رۆژئاوا و باکوور، وێڕای ناردنی سەربازی زۆر بۆ سەر دیوارەکە، زۆر لەو کەسانەی بۆ یارمەتی لەشکرەکەی هاتبوون نارده سەر دیوار تا لە ئەوێوە لەگەڵ خەڵکی شار پەیوەندی بکەن و بۆ یاخی بوون لە تەلمەن هانیان بدەن.

ئەوان دوای گەیشتنیان بۆ سەر دیواری شار، وێڕای خۆناساندن هاواریان دەکرد و دەیانووت رۆژی تووڵە سەندنەوە لە تەلمەن هاتووە و ڕاپەرن و تۆڵەی ئەو هەموو خەراپەکاری و ستەمەی لێ بکەنەوە. دەنگی ئەوان بۆوە هاندەر بۆ دانیشتوانی شار و لە ماوەیەکی کەمدا چەند پیاوێکی ئازا بوونە سەرکردەی ئەوانی تر و هانیاندان بۆ ڕاپەڕین، بەم شێوەیە لەناو شاریش هێزێك بۆ یارمەتی داریوش دروستبوو و ئەو کارەش barوودۆخی تەلمەنی قورس کرد، هەخامەنشییەکان بە سەرکردایەتی خەشایار لە رۆژهەڵاتەوە هاتنە ناو حەساری شار و تەلمەن کەوتە نێوان دوو هێرش.

خانتووس مێژوونووسی لیدی دەڵێت: ریشی خەشایار هێشتا درێژ نەببوو، بەڵام پرچە درێژە جوانەکەی بە نەرمی بەسەر شانیدا دەئالۆسکا، قەلغانە رەشەکەشی ئەوەندە بە جوانی دروستکرابوو کە گومان دەکرا کەتانی میسری لەبر کردبێت. کوری داریوش کاسکێتەکی رەشی لەسەر بوو کە ئەویش زۆر بە جوانی دروستکرابوو و لە هەر چوار لاوە لێوی هەبوو، ئێرانییەکان بۆ ئەوەی نەکەونە بەر دیدەی دوژمن بۆ تیر هاوێژی بۆ لایان، قەلغان و کاسکەکانیان بە ڕەنگی ڕەش هەڵدەبژارد.

خەشایار لە ریزی پێشەوەی ئەو سەربازانەی گەیشتنە ناو شار بە تەور جەنگی دەکرد و هەندێ لە سەربازەکان بە گورز دەجەنگان و هەندێ بە تەور، کاتێك تەلمەن و سەربازەکان بینیان لە دوولاوە هێرشیان بۆ دێت زۆر ئازایانە کەوتنە جەنگ، بەڵام سەربازە هەخامەنشییەکان بێ پسانەوە دەهاتن و دواتر دەروازەکانیان کردەوە و بەمەش هاتنی لەشکری داریوش خێراتر بوو بۆ ناوشار، بۆیە سەربازەکانی تەلمەن کوژران و ئەوانەی زیندووش مانەوە، گیران. تەلمەن بە برینداری لە هۆش چوو و دواتر گیرا و بردرا بۆ لای داریوش کە هێشتا نەهاتبۆوە ناو شار.

داریوش لە رێگەی وەرگێڕەوە بە تەلمەنی وت: پێم وتی ئەگەر خۆت بەدەستەوە بدەی، ئازارت نادەم و رێگەت دەدەم بۆ هەر شوێنێك دەتەوێت بچی، بەڵام تۆ پێشنیارەکەت پەسەند نەکردم و جەنگت هەڵبژارد و هەندێ لە سەربازانی منت کوشت، بۆیە بە دوو تاوان سزات دەدەم: یەکەمیان ئەوەیە کە پێشنیاری منت پەسەند نەکرد و جەنگت هەڵبژارد و دووەمیان ئەوەیە کە لە من یاخی بووی، بۆیە سزای تۆ بریتییە لە داماڵینی پێست لە جەستەت بە زیندوویی.

دوای ئەوەی شار کەوتە دەست داریوش، تەرمی کوژراوەکانیان گواستنەوە بۆ دەرەوەی شار و ناشتیانن، دواتر داریوش فەرمانی کرد لە ناوەندی شار تەلمەن بە سزای خۆی بگەیێنن، لە مەیدانی

شار تەلمەنیان خستە سەر زەوی و هەر دوو دەست و دوو قاچیان بە چوار نێزە بەستەوە کە لە زەوی چەقێندرابوون و ئەوکات دوو جەللاد کەوتنە لێکردنەوەی پێستی لە جەستەی بە زیندوویی.

تەلمەن ئەوەندە ئازا و دلێر بوو کە لە تەواوی کاتی سزادانەکەی خۆڕاگری کرد و هاواری نەکرد و نەپاڕایەوە، تەنانەت وەك هەندێ تاوانبار داوای نەکرد کە بیکوژن تا لە ئازار ڕزگاری ببێت. دوای ئەوەی بە سزای خۆی گەیشت، تەرمی زیندووی تەلمەنیان بە دیار پاسەوانەکانەوە لە ناوەندی شار بەجێ هێشت تا خەڵك هێرشی نەکەنەسەر و ئەو پیاوە تا ئێوارەی ئەو ڕۆژە زیندووما.

داریوش دوای کوشتنی تەلمەن و ئاسوودە بوون لە کێشەی ئەو، خەشتەرە پاوەن واتە دەسەڵاتداری گشتی بۆ باختەر دیاریکرد و بە پەلە گەڕایەوە، چونکە ئامادەبوونی لە ناوەند و ڕۆژئاوای ئیمپراتوریەتەکەی زەروری بوو.

پێشتر وتمان کە تالیدۆس وڵاتی لیدی داگیرکرد و شاری ساردی سوتاند و وێرانی کرد و دواتر بێ ئەوەی هیچ هێزێك ڕێگری لێ بکات، بەرەو شارەکانی ئاسیای بچووك چوو تا گەیشتە زێی (هالیس) کە ئێستا بە (قزل ئایەرماق) ناو دەبرێت.

داریوش دوای گەڕانەوەی لە باختەر ویستی بەرەو ئاسیای بچووك بڕوات، بەڵام بە هۆی دوو جەنگی بچووك لە ناو ئێران لە ساڵی (٤٩٩ پ. ز) نەیتوانی ئەوکارە بکات و زستان بەسەرداهات و کاتی لەشکر کێشی نەما، لە ساڵی (٤٩٨ پ. ز) نەخۆشی تاعوون لە باشووری ئێران دەرکەوت و زۆر بە خێرایی تەشەنەی کرد و ڕێگەی هەموو کارێکی گرت. ئەوکات لە هەموو جیهان باوەڕ وابوو تاعوون و وەبا، بۆنی تایبەتیان هەیە و هەرکەسێك بتوانێت خۆی لە بۆنەکەیان بپارێزێت لە نەخۆشییەکە دەپارێزرێت، بۆیە هەموان ئەو شوێنانەیان جێدەهێشت کە نەخۆشییەکانی لێ بڵاو دەبۆوە و دەچوونە شوێنە دورەکان.

داریوشیش پایتەختی جێهێشت و دوای چەند جار گۆڕینی شوێنی خۆی، چۆوە ناوچەیەکی شاخاوی لە ناوچەی فارس کە بەدار داپۆشرا بوو و بە (ساکلا) ناو دەبرا. ئەو ناوچەیە تەنها یەك ڕێڕەوی هەبوو و کاتێك ئەو ڕێرەوە دەگیرا کەس نەیدەتوانی هاتووچۆ بکات.

لەو ناوچەیە ئاوی زۆر و میوەی خۆرسك و ڕاو بە ڕێژەی زۆر هەبوو و هەندێ لە دانیشتوانی ئەو شوێنە کشتوکاڵ و پەروەردەی ئاژەڵیان دەکرد.

داریوش و هاورێکانی لەو شوێنە لە رووی پێداویستییەکانی ژیان کێشەیان نەبوو و ئەوەی بۆ ژیانی ئاسایی پێویست بوو دەستیان دەکەوت، بەڵام داریوش هەرکاتێك دەیەویست زانیاری لەمەڕ نەخۆشییەکە وەربگرێت، دەیانووت هێشتا خەلك بە هۆیەوە دەمرن.

ئەو نەخۆشییە لە ناوەڕاستی بەهار دەستی پێکرد و تا کۆتایی هاوین بەردەوامبوو و تەنها لە باشووری ئێران هەفتا هەزار کەسی کوشت و ئەو ژمارەیە تەنها لێکدانەوە نییە و پشتی بەو ئامارە بەستووە کە لە سەردەمی داریوشدا هەبوو، پاشای هەخامەنشی بەردەوام ژمارەی دانیشتوانی وڵاتەکەی دەزانی و لە سەردەمی خەلافەی ئیسلامیدا، خەلیفەکانی عباسی کە لە بەڕێوە بردنی وڵات لاسایی ئێرانیان دەکردەوە، ئامارییان دامەزراند.

تا وەرزی پاییزی نەخۆشی تاعوون بەردەوامبوو و لە گەڵ بارانی پاییزدا کۆتایی هات، خەڵی رۆژهەڵات لە سەردەمانی کۆنەوە ئەزموونیان هەبوو کە لەگەڵ فێنك بوونەوەی ساڵ و هاتنی بارانی پاییز، نەخۆشییەکانی وەك وەبا و تاعوون کۆتاییان دێت. دوای هاتنی وەرزی پاییز داریوش ناوچەی ساکلای بەجێ هێشت و بۆ پایتەخت گەڕایەوە، بەڵام کاتی لەشکرکێشی نەمابوو و داریوش نەیدەویست سەربازەکانی لە سەرمای ئاسیای بچووکدا بخاتە مەترسی و بۆیە دەستی کرد بە کۆکردنەوەی پێداویستییەکانی جەنگ تا لەگەڵ کۆتا هاتنی وەرزی سەرما لە کوێستانەکانی ئازەربایجان و ئاسیای بچووك بکەوێتەرێ، بەڵام لە وەرزی بەهاری ساڵی (٤٩٧ پ. ز) داریوش خۆی نەخۆش کەوت.

کەتزیاس پزیشکی یۆنانی نەخۆشی داریوشی بە کەوتوویی دیار کردووە و ئاریان مێژوونووسیش پێیوایە داریوش تای لێ بووە و پەڵەی سووری لە جەستەی دەرکەوتووە و لە وتەکانی ئاریانیش دەردەکەوێت داریوش هەمان نەخۆشی کەوتوویی لێ بووە.

چونکە کەتزیاس پزیشك بووە نابێت گومانمان لە وتەکەی سەبارەت بە نەخۆشی داریوش هەبێت، بە تایبەتی کە باس لەو دەرمان و چارەسەرانەش دەکات کە بۆ داریوش داندرابوو و دەڵێت:"بۆ دەرمانی داریوشی یەکەم ڕۆژانە تۆرەنجەبینیان[٣] دەدایە و جەستەیان بە کافوور چەور دەکرد، لە رۆژی پێنجەمی نەخۆشییەکەوە گیراوەی بیدیان پێدەدا."

لە دەرمانەکان دەزاندرێت داریوش چ نەخۆشییەکی هەبووە، لە یۆنان و ئێرانی کۆن ئەو دەرمانانە بە دەرمانی سارد دەناسران و بۆ نەخۆشییە گەرمەکان بەکاردەهاتن و نەخۆشی کەوتوویی لە نەخۆشییە گەرمەکان بوو و دەبوایە ئەو دەرمان ساردانەی بۆ بەکاربێت.

(٣) ( گیراوەیەکی دەرمانییە کە لە رووەکی وشترخۆرکە بەرهەم دێت و بۆ نەخۆشی کەوتوویی بەکارهاتووە، وەرگێر بۆ کوردی)

داریوش دوای چاك بوونەوەی ئەوەندە لاواز بوو كە توانای سازدان و بردنی لەشكری نەبوو بۆ ئاسیای بچووك و یۆنان، ئیلتسین پزیشكی تایبەتی داریوش ئاموژگاری بەردەوامی دەكرد كە دەبێت پشوو بدات تا بە تەواوەتی چاك ببێتەوە.

ئیلتسین ناوێكی یۆنانییە و بۆیە هەندێ لە مێژوونووسەكان دەڵێن ئەو پزیشكە یۆنانی بووە، بەڵام بەپێی لێكۆڵینەوەكانی سەدەی رابردوو دەركەوتووە پێش جەنگەكانی نێوان یۆنان و هەخامەنشییەكان، هەندێ لە ئێرانییەكان ناوی یۆنانیان بۆ خۆیان داناوە.

مێژوونووس و رۆژهەڵاتناسی ئەمریكی ریچارد فرای[٤] لەو بارەوە لێكۆڵینەوەی هەیە و دەڵێت دوای دروستبوونی دوژمنایەتی لە نێوان هەخامەنشی و یۆنان، دانانی ناوی یۆنانی لە ئێران كۆتایی هات.

داریوش لە بەهار و بەشێك لە هاوینی ساڵی (٤٩٧ پ. ز) نەخۆش بوو و ناچاربوو پشوو بدات، ئەو نەیدەتوانی بچێتە ئاسیای بچووك و نەشیدەویست لەشكرەكەی بە سەركردایەتی یەك لە ئەفسەرەكانی بنێرێت بۆ ئەو جەنگە، داریوش لە كەتیبەی بێستوون ئەو بابەتە وەك هۆكار باس دەكات و گەزنەفۆن كە سەردارێكی یۆنانی بوو دەڵێت: داریوش بۆ سزادانی یاخی بوان زۆر توند بوو و چاوپۆشی لە سزای تاوانباران نەدەكرد، بەڵام لەو جەنگدا وردبینی دەكرد تا ئەو نەتەوانەی جەنگیان ناوێت لە جیاتی سەركردەكانیان سزا نەدرێن، چونكە دەیزانی خەڵكی ئاسایی جەنگیان ناوێت و نایانەوێت خۆیان بە كوشت بدەن، ئەو دەیزانی سەركردەكانی ناتوانن ئەو وردبینییە بكەن و خەڵكی ئاساییش دەكوژن.

هەروەها داریوش دەیزانی ئەگەر خۆی لە جەنگ ئامادەبێت كۆشش و ئازایەتی ئەفسەر و سەربازەكانی زیاتر دەكات، بۆیە لە هەموو جەنگەكانی دەرەوەی سنووری پاشایەتییەكەی ئامادەدەبوو. ئەو دەچوو بۆ جەنگ تا نەتەوە شكاوەكان لەناو نەبرێن و شارەكانیان وێران نەكرێت، ئەو لە ماوەی پاشایەتیدا هیچ كات شاری دوژمنانی وێران نەكرد[٥] و ئەو كارەی تەنها لە كاتی بەرانبەری كردن و هەروەها دوو شاری سیتەكانی بە هۆی هێرشیان بۆ سەر وڵاتانی ژێر دەسەڵاتی پاشایەتییەكەی وێرانكرد.

---

(٤) (دوای ئەوەی پرۆفیسۆری ئێرانناس (پۆپ) لە ساڵی **١٩٦٩** زایینی مرد، ناوبراو كرایە سەرۆكی دامەزراوەی ئاسیای زانكۆی شیراز، زەبیحوڵڵا)

(**٥**) (زۆربەی پاشا گەورەكانی جیهانی كۆن ئەو شارانەیان وێران نەدەكرد كە بەرگریان نەبوو، داریوشیش بە هەمان شێوە هەر شارێك بەرگری كردبێ وێرانی كردووە، شارەكانی سیتەكان كە كەسیان لێ نەبوو تا بەرگری بكات دوو نموونەی باشی وێرانكاری ئەون، وەرگێر بۆ كوردی.)

لە ساڵی (٤٩٦ پ. ز) لە پازدەهەمین رۆژی بەهار، داریوش و لەشکرکەی بە تەواوی پێداویستی جەنگی بەرەو ئاسیای بچووك کەوتنەرێ. مێژوونووسە یۆنانییەکان وەك نەریتی هەمیشەییان لە بارەی ژمارەی سەربازەکانی داریوش زێدەرۆییان کردووە و دەڵێن: داریوش پێنج سەد هەزار سەربازی پیادە و دووسەد هەزار سەربازی سوار و دەهەزار عارەبانەی جەنگی و دوو هەزار مەنجەنیقی لە ئێرانەوە بەرەو ئاسیای بچووك برد.

ئەو ژمارەیە تەنانەت بۆ ئەو کەسانەی لە بواری سەربازی نازانن جێگەی گومان و زێدەرۆییە. ئەمرۆ کاتێك لەشکرێکی مۆتۆریزە دەکەوێتە جووڵە (٤٠ تا ٥٠ کم) لە جادە داگیردەکات و لە کاتێکدا کە زیاتر لە پازدە هەزار سەرباز نییە، بەڵام ژمارەی ئامێرەکانی گواستنەوەی زۆرن و لە کاتی رۆیشتندا پێویستە مەودایەك بکەوێتە نێوان تانك و ئۆتۆمبێل و عارەبانەکان. بە سەرەنجدان لەو بابەتە دەتواندرێت بە لێکدانەوە بزاندرێت کە لەشکرێکی سوار و پیادەی حەوت سەد و دە هەزار کەسی کە دە هەزار عارەبانە و دوو هەزار مەنجەنیقیان پێ بێت، لە کاتی رۆیشتنیان بۆ مەیدانی جەنگ چ مەودایەك لە رێگاکان دادەپۆشن.

جارێك باسمان کرد کە لە مێژوودا جووڵە پێکردنی هێزی پێنج سەد هەزار کەسی تا سەردەمی ناپلیۆنی یەکەم ئیمپراتۆری فەرەنسا نەبووە و ئامادە و سازکردنی لەشکری پێنج سەد هەزار کەسی رووینەداوە و تەنانەت ناپلیۆنیش کە ئەو ژمارە سەربازەی بۆ رۆسیا برد و هیچ کات نەیتوانی هەموویان لە یەك جەبهە کۆبکاتەوە.

لەشکری داریوش کاتێك بەرێکەوت بۆ ئاسیای بچووك و یۆنان، سەد هەزار یا کەمتربووە لەو ژمارەیە و بۆ ئەم بابەتەش پشتمان بەستووە بە سەرچاوەیەکی مێژوویی کە ئەویش باسکردنی رێژەی گەنمی بەکارهاتوو بۆ یەك رۆژی ئەو لەشکرەیە لە لایەن خانتووسی لیدیەوە، ئەو دەڵێت: لە هەر بنکەیەك پەنجا تەن گەنم بە پێوەری ئێستا هەبووە. ئەگەر گریمان بکەین کە یەك کیلۆ گەنمی جۆری باش بتوانێت دوو کیلۆ نانی لێ ئامادەبکرێت، دەزاندرێت کە ئەو پێوانەیە بۆ تێرکردنی سەدهەزار کەس دەبێت و ناتواندرێت لەشکرێکی حەوت سەد هەزار کەسی بەو پێوانەیە لە گەنم تێر بکرێن.

کاتێك داریوش گەیشتە کرمانشاە، رووبەرووی سەرکێشییەکی چاوەڕاون نەکراوی زێی (قەرەسو) یا بە زمانی یۆنانی (تالیت) بۆوە، هەرکەسێك ئێستا زێی ئارامی و بچووکی قەرەسو ببینێت کە لە هەندێ شوێن تا رادەیەك قووڵە، باوەڕ ناکات ئەو زێیە بچووکە کە بە هۆی رەنگی رەشی ئاوەکەیەوە بە (قرە سو) ناوی دێت، رێگەی لە لەشکری داریوش گرتبێت،

بەڵام لە ساڵی (٤٩٦ پ. ز) باران لە ناوچەی کرماشان (کارامسینی کۆن) بە ڕێژەیەکی زۆر باری و ئەو زێیەی وەك دەریاچەیەکی بچووك لێکردبوو.

گەزنەفۆن دەڵێت: ئاوی ئەو زێیە سەد زەرع بەرز ببۆوە. بێ گوێدان بە زێدەڕۆیی یۆنانییەکان، دەبێت بڵێین ئاوی ئەو زێیە تا ئەو ڕادەیە زیادی کردبوو کە لەشکری داریوشی ناچار بە وەستان کرد.

ئەگەر ئەو سەرکێشییە هەروەك یەك لە سەرکێشییە ئاساییەکانی ئەو زێیە بوبێت، (وەك لە کاتی ڕووداوەکانی سەردەمی ژیانی داریوش باسمان کرد) پاشای هەخامەنشی لە جیاتی ئەو پردانەی ئاو بردبوونی، پردی لەسەر زێیەکە دروست دەکرد و دەردەکەوێت کە سەرکێشییەکە ئەوەندە بەهێز بووە کە داریوش ناچاربووە لە جیاتی ئەوەی پردی لە سەر دروست بکات و بە ڕەچاوکردنی ئەو گرفتە تازانەی بۆی دێنە پێش بە تایبەتی لە شوێنەکانی ئالیك پێدانی ئاژەڵەکان، ڕێگەی لەشکرەکەی بگۆڕێت، بە گریمانی زۆر بەرێگەی ناوچەی ئیلامدا ڕۆیشتووە و لە کرماشان چووتە دەرەوە.

دوای گەیشتنی بە ناوچەی میزۆپۆتامیا، هەرچەندە ماوەیەکی لە بەهار تێپەڕی بوو، بەڵام داریوش خۆی لە بەرانبەر سەرکێشی زێی دیجلە دیتەوە و بەڵام سەرکێشی زێی فوڕات زۆر نەبوو و لەو زێیانە پەڕییەوە و بەرەو باکوور ڕۆیشت تا بە نزیکترین ڕێگەدا بگاتە ئاسیای بچووك.

کاتێك خەتی ڕۆیشتنی لەشکری داریوش دەخرێتە بەرچاو و بە سەرەنجدان لە ئەوەی ئەو دەیویست بچێتە ئاسیای بچووك، لەوانەیە ئەو پرسیارە بێتە پێش کە بۆچی داریوش لە ڕێگەی ئازەربایجانەوە بەرەو ئاسیای بچووك نەچوو و ڕێگەی میزۆپۆتامیای هەڵبژارد؟

هۆکار ئەوە بوو کە لەو وەرزەی داریوش جووڵەی کرد، بە هۆی زستانی سەختی ساڵی (٤٩٧، ٤٩٦ پ. ز) تەواوی ڕێگا شاخاویەکانی ئازەربایجان و ئاسیای بچووك بە بەفر داپۆشراو بوون و داریوش نەیدەتوانی لەشکرەکەی لەو شوێنانەوە تێپەڕبکات تا ئەوکاتەی بەفرەکان دەتوانەوە و ئەوکاتیش نەیدەتوانی عارەبانەکانی لەو لوتکە و لۆفانە بپەڕێنێتەوە. بۆیە بە باشتری زانی لەو ڕێگەیەوە بڕوات بۆ ئەوەی لە ڕووی لەشکریەوە دووچاری کێشە نەیات و بتوانێت عارەبانەکانی ببات کە لە لەشکرە کۆنەکاندا لە جیاتی تانك بوون لە مەیدانی جەنگدا.

## یەکەمین جەنگی هەخامەنشی و یۆنان

سەبارەت بە ساڵی گەیشتنی داریوش بۆ ئاسیای بووك بیروڕای جیاواز هەیە و هەندێك دەڵێن لە بەهاری (٤٩٦ پ. ز) و هەندێك ساڵی دواتر واتە بەهاری (٤٩٥ پ. ز) دیاری دەکەن، بەڵام هەموو ڕایەکان دەڵێن ئەو لە دیاربکرەوە چووتە ناو ئاسیای بچووك.

ئەو لە کاتی تێپەڕبوونی بە بابلدا داوای یارمەتی لێکردن و سەربازی لێوەرگرتن، دواتر لە دیاربەکریش هەندێ لە پیاوانی ئەوێ بۆ یارمەتی ئەو هاتن.

سەربازانی بابل لەگەڵ ژنەکانیان بە ڕێدا دەڕۆیشتن و بوونی ژن لەناو لەشکردا کێشە بوو، بۆیە داریوش فەرمانیدا تا ئەوان وەك پێشەنگی لەشکر لە پێشیانەوە بڕۆن و بەردەوام ئەوان دەبوایە ڕۆژە ڕێ یەك لە لەشکری داریوش دوور بن. داریوش لە کاتی ڕۆیشتن لە شوێنە جیاکاندا بورجی دروست دەکرد و لەو بۆرجانەدا خەڵکی تایبەتی دادەنا تا تا لەکاتی پێویست بتوانێت لەو ڕێگەوە ئاگاداری باری وڵات بێت.

ئاریان دەڵێت: ئەوکاتەی داریوش لە بیزانتیۆم (ئیستانبۆڵی ئێستا) بوو لە ماوەی سێ چوار ڕۆژ هەواڵی ناوچەکانی (کارمانیا، پارس و باختەری) پێدەگەیشت. زاندراوە کە باختەر لە کۆتایی باکووری ڕۆژهەڵاتی هەخامەنشی بوو و کارمانیا (کرمان) لە باشووری ئەو ئیمپراتۆریە، بەڵام داریوش لە تەنیشت گەرووی بۆسفۆر بوو و هەواڵەکانی ئەو شوێنانەی بە ماوەی سێ تا چوار ڕۆژ پێ دەگەیشت. ئەگەر وادابنیین کە ناردنی هێماکانی بێتەل هەندێکات بە هۆی کەشووهەوا تێکدەچێت و بە تایبەتی لە وەرزی زستاندا، پێویستە دان بنیین کە سیستەمی پەیوەندی داریوش بۆ وەرگرتنی هەواڵ و زانیاری لە سنووری ئەو ئیمپراتۆریەتە بەرفراوانەدا بە تەواو و پوختترین سیستەم بزاندرێت و لە سەدەی نۆزدەهەمدا ئیمپراتۆری

فەرەنسا ناپلیۆنی یەکەم کە گومانمان لە پێگەیشتوویی ئەو لە بواری سەربازیدا نەبووە، هەواڵی وڵاتەکەی لە ماوەی چل تا پەنجا ڕۆژ بۆ دەگەیشتە ڕۆسیا.

کاتێك داریوش لە دیاربکر بەرەو لیدی جوولا، لەشکرەکەی بەهێزتر بوو لەو کاتەی لە وڵاتی خۆی کەوتەرێ، چونکە سەربازانی نەتەوەکانی تر پەیوەست ببوون بە لەشکرەکەی. لە ڕۆژی پەنجاهەمی بەهاری ساڵی (٤٩٦ پ. ز) داریوش گەیشتە یەك فەرسەنگی زێی بەناوبانگی هالیس (قزل ئایەر ماق) و لە ئەوێ پێشەنگی لەشکرەکەی هەواڵیان پێدا کە سەربازانی یۆنانی دەبیندرێن و دوای ماوەیەك هەواڵیان بە داریوش گەیاند کە ئەوان دوو ڤالانژ سەربازن.

چونکە جاری یەکەمە لەو بەسەرهاتەدا باسی ڤالانژ دەکەین، بۆ ناساندنی ڤالانژ و سەربازانی یۆنانی بە خوێنەری بەرێز وەك ڕکابەری هەخامەنشییەکان، پێمان باشە کورتەیەك لە بارەی ئەوان باس بکەین. لە یۆنان کە کۆمەڵێك دەوڵەتە شاری هەبوو، لە هەموو دەوڵەتە شارەکانیدا پیاوان لە تەمەنی هەژدە ساڵی دەچوونە ریزی سەربازی و لە هەندێکیان تا سی ساڵی و لە ئەوانی تر تا چل ساڵی و لە وڵاتی (لاسیَ دۆمۆن) کە بە (ئێسپارت) ناسراوە سەربازی تا پەنجا ساڵی بوو و تەنانەت هەندێجار تا شەست ساڵی بوو و دواتر بە سەربازی یەدەگ دەژمێردران.

سەربازی لە هەموو وڵاتەکانی یۆنان بەو شێوەیە بوو کە ماوەی سێ ساڵ هەر پازدە ڕۆژ جارێك و بۆ ماوەی یەك ڕۆژ لە سەربازگە ئامادەدەبوو و لەو ڕۆژەدا ڕاهێنانی سەربازی دەکرد و دواتر مۆڵەت دەدرا و دەکرا بە سەربازی یەدەگ.

لەوانەیە ئەو شێوە خزمەتە سەربازییە بۆ ئێمە و لە ئێستادا جێگەی سەرسوڕمان بێت، بەڵام یۆنانییەکان وەرزشکار بوون و بۆیە لەو بوارەدا گرفتیان نەبوو و لای هەمووان ئاشکرایە کە تەواوی ئەو وەرزشانەی لە سەربازیدا بۆ سەربازێك دەکرێت، تەنها بۆ پەروەردەکردنی جەستەیەتی تا بەرگەی سەختییەکان بگرێت، بەڵام لە یۆنان کورەکان لە تەمەنی دوازدە ساڵیەوە وەرزشیان دەکرد و کاتێك لە هەژدە ساڵی دەبوونە سەرباز، لاوی بە توانا بوون و بە هۆی ئەوەی بەشێك لە وەرزش لە جیهانی ئەوکات هەڵدانی تیر و ڕاکێشانی کەوان و هەڵدانی ڕم بوو، بۆیە ئەوان پێش بوونیان بە سەرباز بەکارهێنانی هەندێ لە چەکەکانیان دەزانی و دوای بوونیان بە سەرباز، پێویستیان بە وەرزش و ڕاهێنان لە سەر چەکەکان نەبوو و ئەو یەك ڕۆژەی لە پانزدە ڕۆژدا بۆیان داندرابوو ڕێگر نەدەبوو لە کارەکانی ڕۆژانەیان.

مێژوونووسی رۆمی پلیین بروای وایە ئێرانییەکان خزمەتی سەربازی لە یۆنانییەکان فێربوون و بەم شێوەیە باسی دەکات کە: لە سەردەمی مادەکاندا خزمەتی سەربازی پێویست نەبوو و دانیشتوانی ولاتەکە زۆر بوو، پاشاکانی ماد و پاشاکانی ئەنزان (یەکێکە لە ولاتە کۆنەکان لە باشووری مادەکان) چەند سەربازیان ویستبوایە دەستیان دەکەوت، بەلام دانیشتوانی یۆنان کەم بوو و ئەوان ناچاربوون خزمەتی سەربازی بکەن تا ئاشنای هونەرەکانی جەنگ کردن بن و لە کاتی پێویست هەموو پیاوەکان بتوانن بێن بۆ جەنگ.

پیاوانی یۆنانی دوای هاتنیان بۆ خزمەتی سەربازی کاری خۆیان تەرك نەدەکرد و لە بەرانبەر خزمەتی سەربازی هیچ یارمەتیان پێ نەدەدرا، بەلام کەرەستەکانی جەنگ لە لایەن هەموانەوە بۆیان دابین دەکرا کە بریتی بوون لە: (کاسکێت، قەلغان، ڕان بەند، ساق بەند، شمشێر، نێزە، گورز، تیر و کەمان) کانزای بەکارهاتوو لە کەرەستە جەنگییەکاندا بریتی بوو لە قەلا، جگە لە شمشێر کە لە دوای زۆر بوونی ئاسن لەو کانزایە دروست دەکرا. یەکەی جەنگی یۆنانی بە (ڤالانژ) ناو دەبرا و لە سەردەمی داریوشی یەکەم لە سێ سەد سەرباز پێکهاتبوو و لە سەردەمی ئەسکەندەری مەقدۆنی و هێرشەکەی بۆ سەر هەخامەنشییەکان گەیشتە هەزار و پێنج سەد کەس.

ڤالانژ وێڕای ئەوەی ناوی یەکەی جەنگی یۆنانییەکان بوو، شێوەی جەنگکردنیشان بوو و بریتی بوو لەوەی ژمارەی سەربازانی ڤالانژ بە گشتی بەیەکەوە چوارگۆشە، بازنە یا سێگۆشەیەکیان پێکدەهێنا و لە ناویدا هەموویان ڕوویان لە دوژمن و پشتیان دەکردە یەکتری و بەو شێوەیە تەنها لە یەك لاوە مەترسیان لە سەر دەبوو. یۆنانییەکان دەیانووت ڤالانژ دیاری خوایە بۆ نەتەوەکەیان تا هیچ نەتەوەیەك نەتوانێت شکستیان بدات و لەناویان ببات، دواتر ئەو وتەیە لە یۆنان ڕۆیشتە ڕۆم و ئەوان دەیانووت خواکان لژیۆنیان داوەتە ڕۆم، لژیۆن یەکەی سەربازی ئەوان بوو و شەش هەزار سەربازی لەخۆ دەگرت.

هەرچەندە ڤالانژ لە سەردەمی داریوشدا تەنها لە سێ سەد سەرباز پێکدەهات، بەلام بە یەکەیەکی جەنگی بەهێز و کاریگەر دەناسران، چونکە وێڕای ئەوەی ئەندامانی ڤالانژ لە کاتی جەنگ بە شێوەیەك دەوەستان کە دوژمن نەتوانێت خۆیان بگەیێنێتە دوایان، کەرەستەی جەنگی باشیان بەکار دەهێنا وەك (زرێ، ران بەند، ساق بەند و کاسکێت) لە زەربەی تیر و شمشیر و نێزە دەیپاراستن. سەربازانی یۆنان ریش و سمێڵیان دەتاشی، بۆیە هەخامەنشییەکان پلاریان لێدەدان، بەلام ئەوان بەردەوام ئازایەتی خۆیان لەجەنگ دەسەلماند و یەك لە بەڵگەکان

بۆ ئازایەتی ئەوان هەر ئەوەبوو کە بە شەش سەد سەرباز دەیانەویست رووبەرووی لەشکری داریوش لە تەنیشت زێی هالیس ببنەوە.[1]

هەر دوو ڤالانژی یۆنانی لە شوێنێك دامەزرا بوون کە رووباری هالیس لە شاخ کۆتایی دەهاتەدەر و دەچۆوە ناو دەشت. داریوش بۆ گەیشتن بە ئەوان دەبوایە سەرەتا لە زێ بپەڕێتەوە، دواتر بچێتە ناو ناوچەی شاخاوی. دوای چوونی بۆ ناوچەی شاخاوی، دەبوایە داریوش بە کەناری ڕاستی زێدا بڕوات و ڕێگەی تری لەبەردەم نەبوو، چونکە کەناری چەپ بە تەنیشت شاخەوە بوو و ڕۆیشتن بەناو ئاویشدا لەو وەرزە و لە پەنجاهەمین رۆژەی بەهاردا ئەستەم بوو، دوای تێپەڕبوون لە ئاویش تەنها ڕێگەی ڕۆیشتنی بە تەنیشت ڤالانژەکاندا دەرۆیشت و داریوش لە جەنگ لەگەڵ ئەوان زیاتر، هیچ چارەی تری نەبوو.ئەو دەربەندەی دەبوایە داریوش لێی بپەڕێتەوە، لە لایەن پلیین بە (دەربەندی لۆرك) و لە لایەن خانتۆس بە (دەربەندی لۆرچ) ناسێندراوە. (بۆ تێگەیشتن لەو بابەتە دەبێت سەرەنج بدەین لە ئەوەی کە لە کاتی وەستانمان ئەگەر ئاوی رووبار بەرەو پێشمان بڕوات و ئێمە ڕوومان لە شوێنی ڕۆیشتنی ئاو بێت، دەستی ڕاستمان دەبێتە کەناری راست و دەستی چەپمان دەبێتە کەناری چەپ).

بێ گومان دوو ڤالانژە یۆنانییەکە کە لە کەناری ئەوبەری زێیەکە بوون لە کاتی دروستکردنی پرد لە سەر ئاوی ئەو زێیە لە لایەن داریوشەوە دەبوونە هۆی دروستبوونی ئاریشە و گرفت، بۆیە داریوش فەرمانی کرد مەنجەنیقەکان لە کەناری چەپی زێ و بەرانبەر یۆنانییەکان ئامادەبکەن و لە کاتی دروستکردنی پردەکە بە شێوەیەك بەردبارانی یۆنانییەکان بکەن کە نەتوانن ببنە مایەی کێشە بۆیان.

لەو شوێنەی داریوش دەیەویست لە ئاو بپەڕێتەوە، گەمیی لێ نەبوو تا سوودی لێ وەربگرێت بۆ دروستکردنی پردەکە و داریش لەو پێدەشتە هەبوو کە زێیەکە لە کاتی دەرچوونی

---

(١) (ڤالانژ لە جەنگ زۆر کاریگەر بوو و هەموو نەتەوەکان و تەنانەت ئێرانیش لاسای یۆنانییەکانیان کردەوە و تا کۆتایی سەدەی حەوتەم سوودیان لێ بینی. موسولمانەکانیش لە جەنگەکانی سەرەتای ئیسلام سوودیان لێوەرگرت و دواتر فەرامۆش کرا تا سەردەمی نوێبوونەوە و دوای ئەو مێژوونووسان، مێژووی رۆم و یۆنانی کۆنیان خوێندەوە و ئەو مێژووە کەوتەبەر دیدەی سەردارانی جەنگ، جارێکی تر ڤالانژ لە مەیدانی جەنگ سوودی لێ وەرگیرا و هەموو سەردارە گەورەکان لە سەدەی هەڤدەهەمەوە تا لە سەدەی بیستەم و بە هۆی زۆر بوونی بەکار هێنانی چەکی گەرم لە جەنگەکانی یەکەم و دووەمی جیهانی سوودی نەما. زەبیحوڵڵا.)

له کوێستان پێی دەگەیشت و داریوش فەرمانی کرد لە ئەو شوێنە ئەو دارانەی بەردار نین ببڕن و بیانهێنن بۆ دروستکردنی گەمی بۆ کارەکەیان.

هەموو سەربازەکانی داریوش کاریان دەکرد، هەندێکیان داریان دەبڕی و هەندێکی تر دارەکانیان دەبرد بۆ بەردەستی دارتاشەکان و ئەوانیش بە خێرایی گەمییان دروست دەکرد، هەموو گەمییەکان سەریان بە ڕێکی داپۆشرابوو تا ئاو نەچێتە ناویان و بەبێ مەترسی پردی لە سەر دروست بکرێت. کار زۆر بە خێرایی بەرێوە دەچوو، چونکە دارتاشەکان و ئەوانەی بە شاگرد کاریان دەکرد و هەروەها سەربازەکان بە شەو و ڕۆژ کاریان دەکرد، بۆیە لە ڕۆژی پەنجا و دووەمی بەهار دەست بە دروستکردنی پرد کرا و پردەکە بەو شێوە بوو کە گەمییەکانیان بە ریز و یەك لە دوای یەك دەخستە ناو ئاو و بە لەنگەری زۆر قورس دەیانبەستنەوە تا ئاو نەیانبات، دواتر گەمییەکانیان بەیەك دەبەستەوە و بە پەتی زۆر قایم لە کەنارەکانیان دەبەستنەوە تا کارەکەیان پتەوتر بێت، ئەوکات تەختەکانی پردەکەیان لە سەر گەمییەکان دادەنا و تەنیشتەکانیشیان پەرژین دەکرد تا سەرباز و عارەبانە و ئاژەڵەکان نەکەون. سەربازە یۆنانییەکان بە دیتنی نزیك بوونەوەی پرد لە کەناری بەرانبەر ویستیان کێشە دروست بکەن و مەنجەنیقەکان بە بەردە سەحراییەکان کەوتنە بۆردمانی ئەوبەری ئاو.

ئەو ساتە وەختە بۆ دروستکردنی پردەکە زۆر بە مەترسی بوو، چونکە مەودای نێوان سەربازانی یۆنانی و پردسازەکان کەم بوو و ئەگەر مەنجەنیقەکان زۆر بە وردبینی و بە ڕێکی بەردبارانیان نەکردبایە، لەوانەبوو بەردە قورسەکان بەر پردەکە یا پردسازەکان کەوتبانە و ئەوانیان کوشتبایە یا زیانیان بە پردەکە گەیاندبووایە.

وەك پلیین دەڵێت لە ئێوارەی ڕۆژی پەنجا و دووەمی بەهار کاری پردسازی تەواو بوو و داریوش فەرمانی کرد تا بە لانی کەم بەشێك لە لەشکرەکەی لە ژێر ڕووناکی مەشخەڵەکان بپەڕنەوە و ئەوبەری پردەکە بپارێزن تا لە شەودا یۆنانییەکان نەتوانن بەشێك لە پردەکە وێران بکەن. مەشخەڵەکانیان پێکرد و بە فەرمانی داریوش سەربازە پیادەکان بۆ پەڕینەوە لە پرد کەوتنەرێ، ئەو شەوە دانیشتوانی لادێکانی ئەوێ دیمەنێکی جوانی لەشکریان دیت کە تا ئەوکات ڕووینەدابوو و بریتی بوو لە پەڕینەوەی لەشکرێك بەسەر پردێکدا کە لەوبەریەوە لەشکری دوژمن هەبوو، مێژوونووسی ناسراو سۆئێتۆن پێیوایە ئەو کارە یەك لە کارە دیارە جەنگییەکانی جیهان بووە.

هەرچەندە مەنجەنیقەکان لە شەودا لە ترسی کوشتنی سەربازەکانی خۆیان بەردبارانیان ڕاگرت، بەڵام یۆنانییەکان هیچ هەوڵیان بۆ ڕێگرتن لە پەڕینەوەی لەشکری داریوش نەدا، چونکە لەشکری داریوش ژمارەیان چەندین بەرانبەر زیاتر بوو لە ڤاڵانژەکانی ئەوان و ئەگەر ئەو شەوە دە هەزار سەربازی داریوش کوژرا بووایە، زەربەی گەورە بەر لەشکرەکە نەدەکەوت و ئەگەر تەنها سەد سەربازی یۆنانی کوژرا بووایە، ئەوا یەك لە سەر شەشی هێزی ئەوان لەناو دەچوو، بۆیە یۆنانییەکان وایان بە باشتر زانی کە لە ڕۆژدا لە گەڵ هەخامەنشییەکان بجەنگن.

سۆئێتۆن دەڵێت: تا بەرەبەیانی ڕۆژی دواتر (واتە تا رووناك بوونەوەی دنیا لە کاتی شەوە کورتەکانی بهاردا)، شەش هەزار سەرباز پەڕینەوە و لە ئەوبەری زێ لە کەناری راست خۆیان ڕێکخست و بە رووناك بوونی هەوا دەرکەوت پەرینەوەی بەشەکانی تری لەشکری داریوش بەبێ مەترسی دەبێت.

(کلاتۆس) فەرماندەی دوو ڤاڵانژی یۆنانی کە دەیەویست لە تەنیشت رووباری هالیس ڕێگە لە لەشکری داریوش بگرێت، لە یەکەم رۆژدا کە لەشکری داریوشی دیت، بە پەلە تەتەرێکی نارده لای (تالیدۆس) فەرماندەی گشتی هێزەکان و پێی ڕاگەیاند کە ژمارەی لەشکری داریوش زۆر لەوە زیاترە کە بیرمان لێ دەکردەوە و بۆیە داوای کرد دەستبەجێ هێزی یارمەتیدەری بۆ ڕەوانە بکات و پێی ڕاگەیاند کە بۆ ڕاگرتنی داریوش پێویستیان بە سی هەزار سەرباز دەبێت.

داریوش بە دیتنی ئەو ژمارە کەمەی هێزی یۆنان، ڕاستەوخۆ زانی فەرماندەکەیان داوای هێزی کردووە و تەنها نەیدەزانی کەی هێزی پێدەگات، بۆیە نەیدەویست لەو شوێنە بوەستێت و کاتی نیوەڕۆ فەرمانی کرد هەواڵ بۆ فەرماندەی یۆنانییەکە بنێرن تا دوو ئەفسەر بۆ گفتوگۆ بنێرێت یا ڕێگە بدات دوو ئەفسەری لەشکری ئەو بۆ گفتوگۆ بچنە لای، کلاتۆس دوو ئەفسەری نارده لای داریوش.

دایوش خۆی لە کەناری ڕاستی زێی هالیس پێشوازی لە ئەفسەرەکان کرد و پێی وتن ئێوە پیاوانی ئازان و تێدەگەن هێزی ئێمە بەرانبەر بە هێزی ئێوە زۆر بەهێزە و ئێوە ناتوانن بە جەنگ ڕێگەمان بگرن، بۆیە باشتر وایە چەکەکانتان ڕادەست بکەن و خۆتان بە دەستەوە بدەن، ئێمەش وەك ئەسیر سەیرتان ناکەین و رەفتارمان لەگەڵتان باش دەبێت، تەنها لەگەڵ لەشکری خۆمان دەتانهێڵینەوە تا پەیوەست نەبن بە دوژمنەکانمان.

دوو ئەفسەرەکە پەیامەکەیان بە کلاتۆسی فەرماندەیان گەیاند و دواتر گەرانەوە و بە داریوشیان گووت کە کلاتۆس وەڵامی داوەتەوە کە سەربازی یۆنانی لە جەنگدا دەکوژرێت،

بەڵام چەکەکەی ڕادەست ناکات و ئەگەر بزانین کەسمان زیندوو نامێنین، جەنگ دەکەین و خۆمان ڕادەست ناکەین.

چونکە داریوش تەنها دەیزانی لە شەش سەد سەربازی یۆنانی زیاتر لە پێش لەشکرەکەی نییە، وێڕای ئەوەی هێشتا سەربازەکانی لە پردەکە دەپەڕینەوە و خۆیان دەگەیاندە ناو دەربەندەکە، فەرمانی هێرشی دەرکرد و دووهەزار سەربازی پیادە هێرشیان بۆ سەر دوو ڤالانژەکە دەست پێکرد. سەربازانی ئەو دوو ڤالانژە بە فەرماندەیی کلاتۆس خەڵکی ئەسینا بوون، بەڵام لە رووی جەنگی وەك سەربازەکانی ئێسپارت بە بایەخ نەبوون و وێڕای ئەوەش ئەو شەش سەد کەسە گەنج و سەرسەخت و ئازا بوون و ئەوان ئامادەبوون بۆ کوشتن و کوژران،. لەوانەیە پرسیار بکرێت کە چ شتێك ئەوانی کەمتر دەکرد لە سەربازەکانی ئێسپارت؟ لە وەڵامدا دەڵێین ئەوان توانای خۆڕاگریان کەمتر بوو لە ئێسپارتییەکان، سەربازانی ئێسپارت بە گشتی هەر لە منداڵیەوە ڕاهێنان پێ دەکرێت تا بەرگەی سەختییەکان بگرن و ئەوە تاکە جیاوازی ئەوان بوو لەگەڵ سەربازانی دەوڵەتە شارەکانی تری یۆنان.

لە ئێسپارت کانێکی بەردی لێ بوو کە دوای شۆڕبوونەوە لە سێ سەد و هەشتا قادرمە دەگەیشتنە ناو کانەکە و یەك لە وەرزشەکانی گەنجانی ئێسپارت هێنانی بەرد بوو لەو کانە بۆ دەرەوە، کە بە درێژایی رۆژ ئەو کارەیان دەکرد، کەسێکی ئاسایی ئەگەر تەنها بۆ یەکجار بەردێکی لە کانەکە هێنابایە و لە دەرەوەی فرێدابایە، بۆ جاری دووەم ئەو کارەی پێنەدەکرا و گەنجانی ئێسپارتی لە بەیانی تا ئێوارە بێ ماندوو بوون بەردەوامبوون لەو کارەیان.

دوو هەزار سەربازی پیادەی داریوش هێرشیان برد بۆ سەر دوو ڤالانژەکە کە ببوونە دوو بازنە و تەنها لە یەك شوێن بەیەك بەسترابوونەوە، هەخامەنشییەکان لە هەر لایەکەوە هێرشیان دەکرد، دەکەوتنە بەرانبەر سەربازی یۆنانی و هەرچەند هەوڵیاندا نەیانتوانی بگەنە پشت ئەوان. داریوش چونکە دەیزانی هێزی خۆی زیاترە لە هێزی یۆنانییەکان، دڵنیا بوو سەردەکەوێت، بەڵام بە زوویی دەرکەوت خۆڕاگری یۆنانییەکان زۆر زیاتر بوو لەوەی داریوش بیری لێ دەکردەوە.

(فرانتز ئال تیم) رۆژهەڵاتناسی هاوچەرخ دەڵێت: کاتێك داریوش دیتی یۆنانییەکان زۆر خۆڕاگری دەکەن، ئەفسەرێکی بە ناوی (ئارت) کە فەرماندەی سەد کەس بوو ڕاسپارد تا لە گەڵ سەد سەربازەکەی هێرش بکاتە سەر خاڵی پەیوەندی دوو ڤالانژەکە، ئەو دەیزانی ئەگەر دوو ڤالانژەکە لەیەك جودا بکرێنەوە، یۆنانییەکان زووتر دەشکێن. ئارت لە شوێنی بەیەك گەیشتنی دوو ڤالانژەکە هێرشی کردە سەر سەربازانی یۆنانی.

سەربازانی یۆنانی قەلغانی گەورە و بازنەیی و شمشێری درێژیان هەبوو و کاتێك ئارت ویستی ئەو دوو ڤالانژە لە یەکتر دابرێت، بینی شمشێری خۆی و سەربازەکانی کورتن، وێڕای ئەوەش ئارت بۆ ئەوەی پێشەنگ بێت و بسەلمێنێت کە پێویستە بەسەر دوژمندا سەرکەوێت هێرشی برد، بەلام تا هێرشی دەکرد شمشێرەکەی بەر قەلغان یا شمشێری یۆنانییەکان دەکەوت و سەربازەکانیشی هەرچۆنێك هێرشیان دەبرد تەنها هەندێکیان دەگەیشتنە بازنەکە و هەرچەندە ئارت بۆ ئەوکارە سەد سەربازی هەبوو، بەلام جەنگ کردنی هەموویان بە یەکەوە، کارێکی ئەستەم بوو و بە ناچاری تەنها هەندێك لە ئەوان دەکەوتنە بەرانبەر سەربازە یۆنانییەکان و دەجەنگان و تێگەیشتنی ئەو بابەتە تا رادەیەك گرفتی هەیە.

(ئان کێ تیل دوو پرۆن) وەرگێری پەرتووکی ئاڤیستا بۆ زمانی فەرەنسی، دەلێت: لە هەر شوێنێك ڤالانژ ریز دەبوو و بازنە یا سێ گۆشە یا چوار گۆشەی پێك دەهێنا، ئەوانەی هێرشیان بۆ ڤالانژ دەکرد، دەبوایە جەنگی تاك بە تاك لەگەڵ یۆنانییەکانی ناو ڤالانژدا بکەن.

کاتێك داریوش فەرمانی بە ئارت کرد تا پەیوەندی دوو ڤالانژەکە بشکێنێت، چاوەڕوانی دەکرد بە زوویی ئەو کارە بکات و نەیدەزانی ئاوا دەبێت. دوای ئەوەی ئارت بۆی دەرکەوت کورتی شمشێرەکانیان هۆیەکە بۆ سەرنەکەوتنیان، بەشێك لە سەربازەکانی نارد تا نێزە بۆ خۆیان و ئەوانی تر بێنن، ئارت نێزەیەکی گرتەدەست و هێرشی برد. ئەو سەربازە یۆنانییەی سەری کەوتە بەر هێرشی ئارت، بە دیتنی نێزەکە بە پەلە خۆی چەماندەوە و رێگەی نەدا نێزەکەی بەرکەوێت و بە پێچەوانەشەوە لە کاتی چەمانەوەیدا شمشێرێکی لە ڕانی ئارتدا و لاقی بە شێوەیەك بڕی کە بەربۆوە و دوای چەند ساتێك ئارت مرد.

سەربازەکانی ئارت بە پەلە تەرمی فەرماندەکەیان گواستەوە و بە ڕقەوە هێرشیان کرد تا پەیوەندی دوو ڤالانژەکە بپچڕێنن، بەلام هەرچەندە نێزەشیان پێ بوو نەیانتوانی شوێنی پەیوەندی دوو ڤالانژەکە بپسێنن و دوو ڤالانژەکە وەك بوونەوەرێکی گیان لەبەر لە بەرانبەر ئەو سەربازانە وەستابوون. هەر چەندە کۆی سەربازەکانی داریوش کە هێرشیان دەکرد دوو هەزار و سەد کەس بوو بە هۆی باری تایبەتی ڤالانژەکان، نەیانتوانی بەوکارە هەستن و سەربازە یۆنانییەکان بکوژن.

چونکە جگە لە تاکتیکی جەنگ کردنی ڤالانژ، سەربازە یۆنانییەکان کاسکێت و قەلغان و ران بەند و قووڵ بەندیان و زرێیان هەبوو و بە دەستەواژەیەکی سادە لە سەر تا پێیان کانزا بوو و کەمتر رێك دەکەوت کە شمشێر یا نێزەی سەربازە هەخامەنشییەکان بە شوێنێکی ئەوان

بکەوێت. یۆنانییەکان کاتێك خۆڕاگریان دەکرد و گیان فیدا دەبوون، لای هەموان و تەنانەت دوژمنەکانیشیان، ئازایەتییەکەیان دەبوونە مایەی ئافەرین و دەستخۆشی.

لە جەنگی دووەمی جیهانیشدا ئازایەتییەکی هاوشێوە لە یۆنانییەکان بینرا و لە ساڵی (١٩٤١ ز) کاتێك هیتلەر فەرماندەی سوپای ئاڵمانن ولاّتانی باڵکانی یەك لەدوا یەك خستەبەر هێرش، تەنها لەشکرێك کە بەرگری کرد یۆنانییەکان بوون و ئەفسەر و سەربازە یۆنانییەکان بە تفەنگ و دۆشکە بەربەرەکانی تانك و فڕۆکەکانی سوپای (ئەشتۆکا) ی ئەڵمانیان کرد و وێڕای ئەوەی فڕۆکە و تانکیان نەبوو، بەلاّم ئازایەتی خۆیان سەلماند و لاشەکانیان لە ژێر چرخی تانکەکان پان بۆوە و بە گیانی خۆیان بەرگریان کرد. ئازایەتی و قارەمانییەتی سەرباز و ئەفسەرە یۆنانییەکان بە رادەیەك سەرەنجی هیتلەری ڕاکێشا کە کاتی تەواو بوونی جەنگ و داگیرکردنی ولاّتەکەیان لە لایەن ئاڵمان، هیتلەر فەرمانی کرد تا ئەفسەرەکانی یۆنانی دەمانچە و شمشێرەکانیان لا بمێنێت و ئازاد بن لە گەڕانیان بەناو ولاّتەکەیاندا.

ئەو بابەتە جێگەی بایەخە، چونکە ئاڵمانەکان دوای داگیرکردنی هەر ولاّتێك، سوپاکەیان هەڵدەوەشاند و ئەفسەرەکانیان دەناردەوە ماڵەوە، تەنها ئەو سوپایانەیان دەهێشتەوە کە ئامادەبوون شان بە شانی سوپای ئاڵمان جەنگ بکەن. بەلاّم بۆ یەکەمجار ئازایەتی سەربازە یۆنانییەکان ئەوەندە سەرەنجی دوژمنی ڕاکێشابوو کە داریوشی یەکەم کە لە سەر پردەکەوە مەیدانی جەنگی تەماشا دەکرد و دەیبینی وێڕای ئەوەی زیاتر لە دوو هەزار سەرباز هێرش دەکەنە سەر ڤالاّنژ، بەلاّم ریزەکانی ئەوان تێك ناشکێت.

ئازایەتی ئەو دوو ڤالاّنژە لەو ڕۆژەدا دەرکەوت و داریوش لەسەر پردەکەوە دەیدیت دووهەزار و سەد سەرباز ناتوانن ئەو دوو ڤالاّنژە لەیەك جیا بکەنەوە. ریزەکانی ڤالانژەکان باریك دەبۆوە بەلاّم نەدەپچرا و کاتێك سەربازێکی یۆنانی دەکوژرا، بە زوویی دوو سەربازەکەی تەنیشت ئەو، لاشەکەیان دەکشاندەوە ناو ئەو بازنەی هەیانبوو و جێگەیان پڕ دەکردەوە. بەلاّم بەرەبەرە ماندوویەتی هێرشی دەهێنا و ئارەقە تەواوی جەستەیانی داگیر دەکرد، ئەوان ئەوەندە سەرگەرمی جەنگ بوون کە تەنانەت کاتێك ئارەقە دەهاتە ناو چاوەکانیان، کاتیان نەبوو کە چاویان پاك بکەنەوە.

سەربازەکانی داریوش زۆر بوون و لە کاتی ماندوو بوون جێگەیان لە لایەن هاوکارەکانیان پڕ دەکرایەوە، بەلاّم یۆنانییەکان نەیاندەتوانی بکشێنەوە و هەروەها نەیاندەتوانی بریندارەکانیان چارەسەر بکەن. کاسکێت و قەلغانی کلاتۆسی فەرماندە لە خوێندا سوور ببوو و هەموان

دەیانزانی بریندارە و لەوانە بوو چەند برینێکی هەبووبێت، بەڵام چونکە برینی کاریگەری بەرنەکەوت بوو، نەدەکەوت و بەرەبەرە تا دەهات توانای کەم دەبۆوە.

پاشای هەخامەنشی بە هۆی ئەزموونی زۆری لە بواری جەنگدا، تێدەگەیشت سەربازانی یۆنانی لە چ دۆخێکدان و لەو رۆژەدا سەربازەکانی تری هەخامەنشیش تێگەیشتن کە ئەوەی یۆنانییەکان دەخات، ماندوو بوونە و نەك مردن، بۆیە فەرمانیدا هەر سەربازێکی یۆنانی کە بریندار دەبێت نەیکوژن. جەنگ لە نیوەرۆی ئەو رۆژەوە دەستی پێکرد بوو و تا ئێوارە بەردەوامبوو و بە پێوەری کاتی ئێستا چوار یا پێنج کاتژمێری خایاندبوو و ئەوکات ماندوویەتی و گەرمای مانگی دووەمی بەهار و ئارەقەی زۆری سەربازە یۆنانییەکان، ئەوەندەی ماندوو کردبوون کە نەیاندەتوانی شمشێرەکانیان بجولێنن و زرێکانیان ڕابگرن و گورز و تەورەکانیان لە دەستە خوێناویەکانیان دەکەوت و کاتێك جەنگ بە کۆتا هات، لەو شەش سەد سەربازە کە دەجەنگان، تەنها سەد و بیست و پێنج سەرباز مابۆوە کە ئەوانیش هەموویان کەم و زۆر بریندار بوون.

داریوش فەرمانیدا کلاتۆسی فەرماندەی یۆنانییەکان بهێنن بۆ لای، تا ئەوکات دۆستایەتی لە نێوان یۆنان و هەخامەنشییەکان هەبوو، داریوش وەك باسکرا ماوەیەك لە رۆژهەڵاتی نزیك مابۆوە و کەمێك یۆنانی دەزانی، بەڵام پێی باشتربوو بە هۆی وەرگێر لە گەڵ کلاتۆسدا بدوێت و پێیوت: ئەی پیاوی ئازا، هەرچەن ئێوە شکستتان خواردووە، بەڵام چونکە خۆت و سەربازەکانت ئەمرۆ نیشانتاندا سەربازی ئازان، ئێوە ئەسیر ناکەم و فەرمان دەدەم تا خواردن و ئاوتان پێ بدەن، پێویستی پشووتان بۆ دابین بکەن و دەتوانن دوای پشوودان، بچن و تەرمی کوژراوەکانتان بنێژن، تا تەرمی ئەو پیاوە ئازایانە نەبێتە خۆراکی ئاژەڵەکان.

ئەو سەربازە یۆنانیانەی زیندوو مابوون ئاو و خۆراکیان پێدرا و برینەکانیان پێچرا، ئەو رۆژە ئەوان سەلماندیانەوە خەڵکانی ئازان و سەربازانی داریوشیش سەلماندیان جوامێرن، لە سەردەمانی دواتر کاتێك خەشایارشا ویستی بچێت و ئێسپارت وێران بکات و خەڵکی ئەوێ هەموو بکوژێت، دیسان ئازایەتی ئەوان بۆوە هۆکاری پەشێمان بوونەوەی خەشایارشا و تەنانەت نەچۆوە ناو خاکی وڵاتەکەشیان. (لە بەشەکانی داهاتوو ئەو بابەتە سەرەنج ڕاکێشە باس دەکرێت.)

سێ رۆژ دوای ئەو جەنگە (کلاتۆسی) فەرماندە بە هۆی برینەکانی جەستەی مرد و هەندێکی تر لە سەربازە یۆنانییەکانیش مردن، داریوش فەرمانیدا یۆنانییەکان ئازاد بکەن تا بتوانن تەرمی فەرماندەکەیان ببەنەوە وڵاتەکەیان و لەوێ بەخاکی بسپێرن.

ئەو ڕۆژەش کۆتایی هات و ڕۆژی پەنجا و چوارەمی بەهار هات، مێژوونووسی ناسراو پلیین دەڵێت: لەشکری داریوش ئەوەندە زۆر بوو کە لەشکری ئەو تا نیوەڕۆی ڕۆژی دواتر لە سەر پردەکە دەپەڕییەوە و خۆی دەگەیاندە ئەو بەری پردەکە.

بە بێ ڕەچاوکردنی ئەو زیدەڕۆییانەی لە پەرتووکی زۆربەی مێژوونووسان سەبارەت بە ژمارەی لەشکرەکانی دەسەڵاتدارانی ئێران دەکرێت، دەتوانین بڵێین پەرینەوەی بەردەوامی لەشکرێك کە بە پردێکدا دەروات کە بەو پەلە و خێراییە دروست دەکرێت و ئەو ماوە زۆرە دەخایەنێت و ڕاستە، چونکە پانی ئەو پردانە کەمە و دەبێت سەرباز و عارەبانە و ئاژەڵەکان بە ئەسپایی بە سەریدا بپەرنەوە و ئاساییە ڕۆژێك یا زیاتر بۆ پەرینەوەی لەشکرێکی ئاوا پێویست بێت(٢)، لە ڕۆژە پەنجا و پێنجەم یا پەنجا و شەشەمی بەهاری ئەو ساڵەدا هەموو لەشکری داریوش یا بەشێکی ئەو لەشکرە پەڕییەوە و گەیشتە خاکی وڵاتی (فری ژی).

بۆ ئەوەی خوێنەری ئازیز ماندوو نەکەین خۆمان لە باسی وردی جوگرافیا پاراستووە و لەم کارەشمان بەردەوام دەبین، بەڵام هەندێکات جوگرافیا بۆ مێژوو وەك ژمارەیە بۆ بیرکاری و بێ ژمارە ناتواندرێت لێکدانەوەی بیرکاریانە بکرێت و مێژوونووسیش بە بێ باسکردنی جوگرافیای شوێنەکان، ناتوانێت باسی ڕووداوەکان بکات. لە ئاسیای بچووك لە سەردەمی داریوشی یەکەمدا پێنج وڵات هەبوو، لیدی یەك لەو وڵاتانە بوو و هەموویان لە ژێردەسەڵاتی هەخامەنشی بوون. ئەگەر لە ڕۆژهەڵات واتە لە ئازەربایجانەوە چووباین بۆ ئاسیای بچووك، سەرەتا دەگەیشتینە وڵاتی (کاپۆدۆسی) و دواتر لە ڕۆژئاوا وڵاتی (فری ژی) هەبوو، زێی قزل ئایەر ماق ئەوانی لەیەکتر جیا دەکردەوە، دواتر باس لە وڵاتەکانی تر دەکەین.

داریوش دوای پەرینەوە لە زێی هالیس و تێپەڕبوونی لە دەربەندی لۆرك، گەیشتە وڵاتی فری ژی کە پایتەختەکەی شارێك بوو بە ناوی (ئەنکور یا ئەن سیر) کە ئێستا بە ئانکارا ناوی

---

(٢) (بەردەوام زەبیحوڵڵا باس لە زێدەڕۆیی مێژوونووسان سەبارەت بە ژمارەی سەربازانی لەشکرەکانی ئێران دەکات، لە کاتێکدا هەر خۆی سوودی لەو مێژوونووسانە وەك سەرچاوە بۆ گێڕانەوەی پەرتووکەکەی دیتووە، لە لایەکی تر خۆی باس دەکات کە لەشکری داریوش لە کاتی بەرێکەوتنی نزیکەی سەد هەزار کەس بووە و لە بابل و دیاربکریش سەربازی وەرگرتووە، کەواتە ژمارەی ئەو لەشکرە بێ گومان لە سەد هەزار کەس زیاتر بووە، وەرگێڕ بۆ کوردی.)

دێت، بەڵام ئانكارای ئێستا لە شوێنی ئەو شارە دروست نەكراوەتەوە و مەودای نێوانیان زۆرە.[٣]

یۆنانییەكان هەروەك چۆن لیدیان داگیركرد بوو، بە هەمان شێوەش وڵاتی فری ژییان داگیركردبوو و داریوش دەیزانی دەبێت بەسەر یۆنانییەكاندا سەركەوێت بۆ دەركردنیان لەو وڵاتە. دانیشتوانی ئەوێ لە رێگەی كشتوكاڵ و پەروەردەی ئاژەڵ دەژیان و كەس هەژار نەبوو و هەموان خاوەن زەوی و ڕەز بوون، دەوتترا لەو وڵاتە خەڵكانێك هەن ژمارەی مانگاكانیان نازانن تا بتوانن هی مەرەكانیان بزانن. ئەو وتەیە ئەگەر بۆ گاكانیش ڕاست نەبێت بۆ مەرەكانیان ڕاست بوو و مێژوونووسی ئاڵمانی (گۆنتێر) دەڵێت:"لە (فری ژی) كەسانێك هەبوون كە ژمارەی مەرەكانی خۆیان نەدەزانی."

لە وەرزی پاییز تەواوی ئەو كاروانانەی لەو وڵاتە تێپەڕدەبوون ترێیان بە خۆڕایی وەردەگرت، چونكە بە هۆی زۆری ڕەزەكانەوە خاوەنەكانیان نەیاندەتوانی هەمووی كۆبكەنەوە. گۆنتێر دەڵێت: لە هەموو ڕەزەكانی ئەو وڵاتە رێژەیەكی زۆر كەپر دەبینرا كە بۆ هەڵواسینی ترێ دروستكرابوون و هێشوەكانی ترێ بە بەنی رووەكی هەڵدەواسران و تا كۆتایی دوو مانگی بەهار دەمانەوە، بەڵام ئەگەر بەنەكان لە خوری و لۆكە و شتی لەو جۆرە بوانە، زوو دەرزین و لەناو دەچوون. تا ئێستاش لەو شوێنانە ئەو شێوە كارە هەر ماوە و بەرچاو دەكەوێت.

بەرهەمەكانی شیرەمەنی ئەو وڵاتە لە جیهانی كۆن بەناو بانگ بوو و گۆنتێر دەڵێت: پەنیری پێستەی فری ژی وەك دیاری دەبرا بۆ رۆم. نەریتی پێستە كردنی پەنیر لە ئێرانەوە رۆیشتووە بۆ ئەو وڵاتە و دواتر بۆ ئەورووپا.

چەژنی گەورەی خەڵكی ئەو وڵاتە لە كۆتایی پاییز و سەرەتای زستان بوو و ئەوان دوای كۆكردنەوەی بەرهەمی پاییزی و گواستنەوەی بۆ ئەنبارەكانیان، مەر و ماڵاتەكانیان لە پێدەشت و شاخەكان دەهێنایەوە و لە ئاغەڵەكانیان دەكردن، هێشووە ترێكانیان كۆدەكردەوە و شەرابیان دەگرتەوە، ئەوجار بۆ ماوەی دە رۆژ واتە بە ژمارەی پەنجەكانی دوو دەستەكانیان (لە

---

(٣) (بە بروای هەندێ كەس ناوی ئەنگور (ترێ) یا داری ترێ لە (ئەنكور) وەرگیراوە، چونكە ئەو شارە لە ناوچەیەكی داپۆشراو بە ڕەز بنیات نرابوو. زانایانی زمانناس ئامۆژگاریمان دەكەن لە روانگەی نزیكی دوو وشە لە یەكتر ناكرێت بە یەك وشە بزاندرێن و بگوترێت وشەی ئەنگور لە ئەنكور وەرگیراوە، بەڵام گومانمان نییە كە ئەنگور لە زمانی فارسیدا وشەیەكی تازەیە و لە ناو دەقە كۆنەكان ئەو وشەیەمان بەرچاو ناكەوێت و دایكان و باوكانی ئێمە وشەی تریان بۆ ئەو میوەیە بەكار بردووە، زەبیحوڵڵا.)

مێژووی مرۆڤ دەوری هەبووە و تا ئێستاش هەر ماوە) ئاهەنگیان دەگێڕا. لە ماوەی ئەو دە ڕۆژەدا کاری دانیشتوانی ئەو وڵاتە بە گشتی خواردن و خواردنەوە و شادی و هەڵپەڕین بوو، ئەو جۆرە جەژنە لە کۆتایی وەرزی کشتوکاڵ دێت و لە ناو تەواوی نەتەوەکانی ڕۆژهەڵات بەرچاو دەکەوێت، جەژنی سەری ساڵی ئەورووپییەکانیش هەر ئەو جەژنەیە کە لە کۆتایی وەرزی کشتوکاڵ بەرپا دەکرێت.

دانیشتوانی فری ژی وەك هەموو ئەو نەتەوانەی کاریان کشتوکاڵە، ئاشتیخواز بوون و دەیانەویست ژیانیان بە ئارامی و خۆشی ببەنەسەر و تا دەستپێکی جەنگەکانی یۆنان و هەخامەنشییەکان، لە ئارامیدا بوون و (کوروش، کەمبۆجییە و داریوشی یەکەم) باجیان لە پاشای ئەوان واتە (ئێستارك) وەرنەدەگرت و ئەو باجەی ئێستارك دەیدا بە پاشاکانی هەخامەنشی تەنها بریتی بوو لەو دیارییانەی لە سەری ساڵ واتە بەهاردا بۆ ئەوانی دەنارد. ئەوانیش لە کاتی جەژنی ساڵانەی ئەو وڵاتە دیارییان دەناردەوە بۆ پاشای فری ژی و لە هەر شێوە هەرەشەیەکی دەوڵەتانی تر دەیانپاراست.

هەر سێ پاشای هەخامەنشی لە بەرانبەر ئەو پارێزگاریەی لەو وڵاتەیان دەکرد، هیچیان لێ وەرنەدەگرتن و لەوانەیە ئەم بابەتە نائاسایی بێتە بەرچاو، بەڵام بەڵگەی ئەو بابەتە مێژووییە لە کەتیبەی بێستووندایە کە داریوش دەڵێت هەندێ لە وڵاتان باجیان لێ وەرنەگیراوە. ئەگەر پێوانەی کارەکانی ئەو سێ پاشایە بکەین، بۆمان دەردەکەوێت ئەوان پاداشتی کارەکانی خۆیان لە ڕەزامەندی ویژدانیاندا دەبینییەوە و ئەگەر کارەکەیان بە جوامێری ناسرابوایە ڕەزامەندی ویژدانیان دەبوو، بەڵام ئەو شێوازە کارە لە دوای ئەوان و لە سەردەمی خەشایارشادا گۆڕا.

زانای بەناوبانگی هندی (کاپادیا) لە پەرتووکە بە بایەخەکەی کە بریتی بوو لە (شیکاری ویندیدادی پەهلەوی) دەڵێت: لە ئایینی مەزداپەرستی بوو کە خاوەن باوەڕی مەزدا پەرستی هەوڵیدا خەڵکانی (گاوەتوو) بکات بە مەزدا پەرست. گاوەتوو کە بەشی یەکەمی (گا) یە و لە کۆندا لە گەڵ هەندێ ناوی ئێرانی هەبووە و بەو نەتەوانە وتراوە کە خاوەن هێزی جەستەیی یا دراوی بووبن.

ئەگەر مەزدا پەرستێك توانیبوایە پاڵەوان یا دەوڵەمەندێك بکاتە پەیرەوی ئایینی خۆیان، چاکەیەکی گەورەی ئەنجامدابوو. بۆیە پلیین دەڵێت: کاتێك داریوش لە دەربەندی لۆرك پەڕییەوە و چۆوە ناو وڵاتی فری ژی، وێڕای ئەوەی دەیزانی سەربازەکانی نافەرمانی ناکەن، بەڵام لە ڕێگەی ئەفسەرەکانییەوە بە سەربازەکانی ڕاگەیاند ئێمە هاتووینە ناو وڵاتێك کە دانیشتوانی

دۆستمانن، بۆیە نابێت کەس لە ئێوە خەڵکی ئەو وڵاتە بکەن بە مەزداپەرست، چونکە لەوانەیە ئەوان پێیان خۆش نەبێت.

پاشاکانی هەخامەنشی وەك نەریت ڕێزیان لە ئایینی خەڵکانی بەرانبەریان دەگرت و بانگەشەی خەڵکیان دەکرد بۆ مەزداپەرستی، بێ ئەوەی زۆریان لێ بکەن و ئەگەر بەو ڕێگەیە ئایینی مەزدایان پەسەندکردبوایە باش بوو و بە پێچەوانەوە زۆریان لێ نەدەکرا.

یۆنانییەکان دوای ئەوەی ئەو وڵاتەیان داگیرکرد، وەك نەریتی هەمیشەییان ویستیان هەموو دانیشتوانی ئەو وڵاتە بێننە سەر ئایینی خۆیان و جگە لەوەش هەندێ نەریتی نەویستراوی خۆیان بەسەردا بسەپێنن، بەڵام ئەوان نە دەیانەویست بچنە سەر ئایینی یۆنان و نە نەریتەکانیان فێر ببن. ئەوان ئایینێکیان هەبوو کە بە وتەی گۆنتێر یەکتاپەرستی بوو و تەنها یەك خوایان هەبوو کە ناوی (مەردۆك) یا (مەردۆخ) بوو.

چونکە ئەوان خوای تاقانەیان هەبوو گۆنتێر ئەوانی بە یەکتاپەرست ناسیوە، بەڵام ئەوان بت پەرست بوون و پەیکەری گەورەی خوا تاقانەکەیان لە پەرستگای سەرەکی لە پایتەخت هەبوو و لە ماڵەکانیش پەیکەری بچووکی ئەو هەبوون. یۆنانییەکان دوای گەیشتنیان بۆ فری ژی، پەیکەرە گەورەکەی مەردۆخیان شکاند و پەیکەری خوایانی خۆیان لە شوێنی ئەو دانا و پێویست ناکات باسی دۆخی دەروونی هاووڵاتیانی فری ژی لە بەرانبەر ئەو بابەتە بکەین کە چاوەروانی چ بڵایەکی گەورە بوون.

قەدەر وابوو دوای هاتنی یۆنانییەکان بۆ فری ژی، وشکە ساڵی هات و بۆوە هۆی کەمبوونەوەی بەرهەمی ئەو ساڵە و گژ و گیا کەمبۆوە، بەو هۆیەوە مانگاکان و مەرەکان بەرەو مردن چوون و ئەوانیش ئەو بەڵا گەورەیەیان لە ئەنجامی نفرینی مەردۆخی خوای وڵاتەکەیان دەزانی کە بە هۆی شکاندنی پەیکەرەکەی بۆ ئەوانی ناردبوو. بەڵام یۆنانییەکان کە بیروڕای خەڵك بۆیان گرنگ نەبوو، نەیانویست وشکە ساڵی بە ئەنجامی شکاندنی پەیکەری مەردۆخ بزانن.

ئێستارکی پاشای ئەو وڵاتە دوای هاتنی یۆنانییەکان بۆ وڵاتەکەی، لەگەڵ بنەماڵەکەی بەرەو باشووری ئاسیای بچووك کۆچی کرد و چۆوە وڵاتێك بە ناوی (کیلیکی) و دوای ئەوەی هەواڵی هاتنی پاشای هەخامەنشی بۆ وڵاتەکەی بیست، کەوتەرێ تا پەیوەندی پێوەبکات. ئەوکات ئێستارك پیاوێکی تەمەن هەفتا ساڵان بوو و چەند کورێکی گەنجی هەبوو.

هەندێ لە مێژوونووسانی سەردەم کە دەزانن هاوولاتیانی فری ژی لە نەتەوەی (هیتی) بوون، دووچاری سەرسوڕمان دەبن لەوەی ئەوان بەرگریان نەکردووە و یۆنانییەکانیان لەناو نەبردووە. چونکە هیتییەکان لە جەنگاوەرترین نەتەوەکانی جیهانی کۆن بوون و لە لێخوڕینی عارەبانەی جەنگی زۆر بە توانا بوون و نەتەوەکانی تر لە ناویان دەترسان. بەڵام نابێت دووچاری سەرسوڕمان بین بۆ ئەو بابەتە، چونکە ئازایەتی نەتەوەکان دەگەڕایەوە بۆ شێوەی ژیانیان و هاوولچاتیانی فری ژی ئاشتیخواز و دوور لە کێشە بوون.

نەتەوە و خێڵە سەحرانشینەکان بۆ دابین کردنی بژێویان دەبوونە جەنگاوەر و هێرشیان دەکردە سەر نەتەوەکانی تر. هێرشی نەتەوەکانی (هۆن، هەپتاڵ و موغول) کە لە سەحراکانی باشووری سیبریا و ئاسیای ناوەڕاست دەژیان، هیچ هۆکارێکی تری جگە لە برسیەتی و کەمی خۆراك نەبوو و ئەگەر یەکساڵ باران نەباری بوایە، کێشەیان دەبوو لە دەستەبەر کردنی خۆراك و ناچار هێرشیان دەکردەسەر نەتەوەکانی تر.

هۆنەکان و موغولوکان دوای ئەوەی لە هەندێ لە وڵاتان دەستیان بە کشتوکاڵ کرد و نیشتەجێ بوون، خوی جەنگاوەریان نەما و بوونە ئاشتیخواز، چونکە یەك لە پێداویستییەکانی کشتوکاڵ و ئاژەڵداری و بازرگانی ئاشتییە. ئەم بابەتە لە جیهانی کۆندا کە هێشتا پیشەسازی نەهاتبوو کایەوە، وەك یاسایەکی گشتی لێهات. هیتییەکان تا ئەو ڕۆژەی پیشەیان کشتوکاڵ و بازرگانی و ئاژەڵداری نەبوو، هەمان خویان هەبوو و دوای گۆڕینی شێوەی دابین کردنی بژێویان، ڕوویان کردە ئاشتیخوازی و ئارامی و عارەبانە جەنگییەکانیان گۆڕی بە عارەبانەی کشتوکاڵی، بۆیە توانای خۆڕاگری بەرانبەر بە یۆنانییەکانیان نەما.

دوای پەرینەوەی لەشکری هەخامەنشی لە دەربەندی لۆرك و گەیشتنیان بۆ وڵاتی فری ژی، دەگەیشتنە هەر شوێنێك دانیشتوانی ئەوێ خۆشحاڵ دەبوون و وەك لەشکری رزگاریکەر چاویان لێدەکردن، چونکە ئاگادار بوون کە لە بابەتە سەپێندراوەکانی یۆنانییەکان بە تایبەتی ئایینەکەیان ڕزگاریان دەکەن.

داریوش دوای ئەوەی گەیشتە فری ژی بە بیستنی ئەو بابەتانەی هاوولاتیانی ئەوێ باسیان دەکرد، زۆر ناراحەت بوو. ئەو بیستی یۆنانییەکان باجی ساڵانە لە خەڵك دەستێنن و هەر کەسێك توانای بەخشینی باجەکەی نەبێت، کێڵگە یا ڕەز و مەڕ و ماڵاتەکەی زەوت دەکەن. داریوش سەبارەت بە هێزەکانی یۆنان پرسیاری کرد و دەرکەوت پێگەی سەرەکی هێزی ئەوان لە ئەنکورە و تێگەیشت کە تا گەیشتنی بە ئەو شارە دووچاری پێکدادانی گەورە لەگەڵ ئەوان نابێتەوە.

شاری ئەنکور (ئەنسیر) شارێکی زۆر قایم بوو و قەڵا و دیواری بەهێزی هەبوو و لە دەورەی خەندەق هەڵکەندرابوو، پێدەچوو نەتەوەکانی ئاسیای بچووك لە ئێرانییەکانەوە فێری هەڵکەندنی خەندەق بووبن، چونکە تا ئەوکات لە ڕۆژئاوا و ڕۆژهەڵات و باکووری ئێران ئەو نەریتە نەبوو، خەڵکی فری ژی و وڵاتەکانی تری ئاسیای بچووك لە دروستکردنی قەڵا زۆر شارەزا بوون و ئەو بابەتە لە لایەن هەموو مێژوونووسان پشتڕاست کراوەتەوە. ئەوان قەڵاتەکانیان لە بەرد و ساروج دروست دەکرد و کونی ئاسوویی و شاقوولێیان تێدا دروست دەکرد تا بە ئاسانی بەرد بەسەر دوژمندا ببارێنن.

ئەو وڵاتە لە جیهانی کۆندا بۆ دروستکردنی کەمان بەناوبانگ بوون، بەڵام سوپای تیرهاوێژیان نەبوو و خانەدانەکانی ناوچەکان وەك هونەرێك تیرهاوێژییان دەکرد، بەبێ ئەوەی لەشکر پێکبێنن. شاری ئەنکور کەوتبۆوە دامێنی چەند گردێك کە دیواری شار بە دەوری هەندێکیاندا دەرۆیشت و هەندێك لەو گردانە بەشێك بوون لە شارەکە. لە جیهانی کۆن تەنها شارەکانی بیزان تیۆم (ئیستانبوڵ) و هەك ماتانە (هەمەدان) نەبوون کە بەسەر گردەکانەوە ئاوا کرابوون، بەڵکو شاری تریش هەبوون کە لە سەر گردەکان بوون و ئەمەش بۆ سوود وەرگرتن بوو لە هەوای خۆشی سەر گردەکان و پارێزراو بوونیان لە لافاو و باشتر کردنی شێوەی بەرگری لە شارەکان.

تالیدۆسی فەرمانڕەوای یۆنان پارێزگاری لە شاری ئەنکوری بە ئەفسەرێك بە ناوی (ئارتادۆس) سپاردبوو و ئەویش هەندێ لە خەڵکی ئەو شارەی بە کەمان و شمشیر و بەردەقانی چەکدار کردبوو، لە هەموو سەردەمێکدا هەندێ کەس لە پێناو پارە دەبنە سەربازی لەشکری داگیرکار و یۆنانییەکانیش مووچەی باشیان بە سەربازەکانیان دەدا و بۆیە کۆمەڵێك لە پیاوانی ئەوێ بوونە سەربازی یۆنان. یۆنانییەکانیش ئەوانیان وەك خەڵکی خۆیان پەروەردەکردبوو و فێریان کردبوون کە چوون ڤالانژ دروست بکەن، بەڵام کاتێك داریوش گەیشتە شاری ئەنکور ئی تر ئەوان دەبوایە لە سەر دیوارەکانەوە بەرگری لە شار بکەن و توانای دروستکردنی ڤالانژیان نەما.

مێژوونووسی ئاڵمانی (هارتمەن) لە بارەی دۆخی شارەکە بەم شێوە دەدوێت:"دیوارێك بێننە بەرچاوتان کە کۆمەڵێك گۆشەی هەبێت و لە باشووری ڕۆژئاوا بەرزییەکەی زۆر بێت و بەشەکانی تر بە بەراورد لەگەڵ ئەو بەشەدا کورتتر بوون و خەندەقێکی پان و قووڵ لە دەرەوە دەورەی شارەکەی دابوو، ئەو خەندەقە کاتێك دەگەیشتە گردەکانی باشووری ڕۆژئاوا کۆتایی دەهات واتە لەوێ خەندەق نەبوو و درێژی دیوارەکە نزیکەی سەد ئەستاد (بیست کیلۆمەتر) بوو."

هەروەها پلین درێژی دیوارەکەی بە سەد ئەستاد دیاریکردووە و دەردەکەوێت ئەو شارە، شارێکی گەورە بووە. بە وتەی هارتمەن لە هەر سەد مەتر لە دیواری شار بورجێك بۆ پارێزگاری هەبووە، کەواتە دووسەد بورج شارەکەیان پاراستووە.

کاتێك داریوش دۆخی پارێزگاری شارەکەی بینی، تێگەیشت ئەگەر لە دیواری شار نزیك بێتەوە ناتوانێت بە ئاسانی لە خەندەقەکە بپەڕێتەوە و لەوانەیە لە کاتی پەڕینەوەدا، تەواوی سەربازەکانی بکەونە بەر ڕێژنەی بەرد و تیر و بکوژرێن. لە یەکەم بینیندا باشترین شوێن بۆ گەیشتن بە دیوار بە باوەڕی داریوش، باشووری رۆژئاوا بوو کە خەندەقی لێنەبوو و دواتر تێگەیشت بە هۆی ئەوەی پارێزەرانی شار شوێنیان زۆر بەرزە، دەبێت زیانی زۆر بەر دەکەوێت تا بگاتە تەنیشت دیوارەکە و لە ئەوێش بۆ سەرکەوتن لە دیوارەکە دیسان زیانی گەورەی دەوێت. لەوانەیە داریوش بەو هۆیەوە رەخنە بکرێت کە چوون سەرکردەیەك نازانێت لە جەنگدا زەرەر و زیانەکان خۆویست نین و بە زۆری دێنە پێش. بەڵام هارتمەن وەڵامی داوەتەوە کە داریوش دەیزانی لە خاکێکدایە کە لە ژێر دەستی دوژمنەکەیەتی و بۆیە هەوڵیدەدا کەمترین کوژرا و زیانی گیانی هەبێت و نەیدەویست پشت بە گریمانی ئەوە ببەستێت کە لەوانەیە دانیشتوانی ئەو خاکە یارمەتی بدەن. بە وتەی هارتمان داریوش ئەوکات چاوی لە یارمەتی هێزی دەریایی هەخامەنشی نەبوو کە لە دەریای مەدیتەرانە بوون و لە داریوش دوور بوون.

یۆنانییەکان دەیانزانی کاریگەرترین ئامڕاز بۆ سەروەری هەخامەنشییەکان هێزی دەریایی ئەوانە، بۆیە دوای ئەوەی ئاسیای بچووکیان داگیرکرد، تەواوی کەشتییە جەنگییەکانی هەخامەنشیان لە بەندەرەکانی ئاسیای بچووك و بیزەن تیۆم لەناو برد، یا گرت و بە کەشتیوانەکانی خۆیان سپاردن و بە شێوەیە لە دەریاکانی (ڕەش و مەرمەرە و سپی) بە گشتی هێزی دەریایی ئەسینا کە گەورەترین دەوڵەتی دەریایی یۆنان بوو، بۆوە سەروەر. بەشێکی کەم لە کەشتییەکانی هەخامەنشی توانیبوویان ڕابکەن بۆ کەنارەکانی قوبرس و لەوێش هەموو کات لە هێرشی کەشتییە یۆنانییەکان بۆ سەریان دەترسان و بە ڕەچاوکردنی ئەو هۆکارانە، داریوش هەوڵیدەدا لەشکرەکەی لە زیان بپارێزێت.

داریوش لەگەڵ خۆیدا مەنجەنیقی بچووکی هێنابوو، دارتاشەکانیش توانای دروستکردنی مەنجەنیقی گەورەیان هەبوو، بەڵام دیواری شار لە بەرد بوو و بۆیە بە بەرد نەدەرۆخا، لە لایەکی تر بەردەکان بەر خەڵکی ئەو شارە دەکەوتن و داریوش ئەوانی بە دۆست دەزانی و نەیدەویست زۆر زیان بە ئەوان بگات.

بۆ گرتنی شار بە کەمترین زیان دوو ڕێگە هەبوو، یەکەمیان هەڵکەندنی تونێل بە ژێر زەویدا بوو و لە رووکاری باشووری رۆژئاوای شار بە هۆی ئەوەی پێکهاتەی زەوی لە بەرد بوو، کارێکی ئەستەم بوو و چەند ساڵ کاتی دەویست. لایەکانی تری شارەکەش بە خەندەق گیرابوو و بەو هۆیەوە دەبوایە تونێلێکی زۆر قووڵیان هەڵکەندبایە، بۆ تونێلی قووڵیش پێویست بوو کۆمەڵێك چاڵ لە تەنیشتەکانی هەڵکەنن تا هەوای پاك بگەیێنێتە ناو تونێلەکە بۆ ئەوەی کرێکارەکان نەخنکێن و ئەوەش سەرەنجی دوژمنی ڕادەکێشا و مەترسی دروست دەکرد و کاتیشی زۆر دەویست.

ڕێگەی دووەم پڕ کردنەوەی خەندەقەکە بوو بە گڵ لە چەند شوێنێکەوە تا سەربازەکان بەسەریدا تێپەڕبن و بگەنە دیواری شار، بۆیە داریوش فەرمانیدا تا بورجی بەرزی جووڵاو دروست بکەن تا دوای پڕ کردنەوەی چەند شوێنێکی خەندەقەکە، سەربازەکانی لە ڕێگەی ئەو بورجانەوە بگەنە بورجەکانی شار و هەندێکی تریش بە قادرمە لە دیوار سەربکەون. سەربازانی داریوش بە هاوکاری لادێ نشینەکانی ئەوێ دەست بەکار بوون و ئەمەش هاوکات بوو لەگەڵ هاتنی چەژنی (باکواس) کە هی یۆنانییەکان بوو.

(باکوس) لای یۆنانییەکان بە خوای شەراب ناسرابوو و ئەوان باوەڕیانوابوو کە ئەو مێوی چاندووە و ترێی خستووتە ناو گۆزە تا ببێتە شەراب. یۆنانییەکان ساڵانە لە رۆژێکی بەهاردا بۆ باکوس جەژنیان دەگرت و لەو رۆژەدا شەرابیان زۆر دەخواردەوە و تەنانەت هەندێکیان لەبەر زۆر خواردنەوەی شەراب دەمردن و لەو جەژنەدا ژن و پیاو بە هۆە خواردنەوەی زۆری شەراب ئاگایان لەخۆ نەدەما و دەکەوتنە ڕابواردن، هەروەها سروودێکی تایبەت بە ستایشی باکووس و شەرابیان دەووت کە زۆر ستایشی ئەوانی دەکرد و تیایدا دەهات کە ئەوەی شەراب دەخواتەوە هەرگیز نامرێت و ژیانی هەتایی دەست دەکەوێت و باکووسیان بە بەخشەندەترین خوا دەزانی و دەیانووت ئەگەر ئەو شەرابی نەدابوایە بە خوایانی ئەلەمپ، ئەوان زیندوو نەدەمان و نەدەبوونە هەتایی و هەمیشەیی.

ئەو سرووده ئەوەندە بە ناوبانگ بوو کە تا ئێستاش هەندێ لە تێکهەڵکێشەکانی ماوە و لە شێوەی (ئوهە... ئۆهە... ئۆهە) دێت و تا ئێستاش لەو وڵاتە ئەوروپیانەی رسەزیان زۆرە، رۆژێك بەناوی جەژنی باکوس هەیە.

ئەو رۆژە سەربازانی یۆنانی لەسەر دیوار و لەناو بورجەکان کەوتنە هەڵپەرین و شادی و شەراب خواردن لەگەڵ ئەو ژنانەی کە لەگەڵیان بوون، ژنەکانیش وەك ئەوان دەیانخواردەوە و

بەیەکەوە سروودیان دەووت، هەندێکات سەربازەکانی داریوش لە خۆشی ئەوان پێدەکەنین و داریوش ئەمەی پێخۆش نەبوو، بەڵام نەیدەتوانی ڕێگربێت لەوکارە. وەك باسمان کرد وڵاتی فری ژی و شاری ئەنکور (ئەنسیر) ڕەزی زۆری هەبوو و بۆیە سەربازە یۆنانییەکان بە ئاسانی شەرابیان دەست دەکەوت.

سەربازەکانی فری ژی کە لەگەڵ یۆنانییەکان بوون، وەك ئەوان کەوتنە خواردنەوەی شەرابی خۆرایی و جەژن لە پێش نیوەڕۆ دەستی پێکرد و تا درەنگانی شەوی خایاند، کاتێك کۆتایی هات کەس چیتر توانای خواردنەوەی نەمابوو و ژنان و پیاوان توانایان نەبوو لە شوێنی خۆیان هەستن. هێشتا نیوەڕۆ نەهاتبوو کە ئەوان سەرخۆش بوون و تا کات بەرەو درەنگتر دەچوو، ئەوان مەستتر دەبوون و گەنجەکان زووتر لە بە تەمەنەکان سەرخۆش دەبوون، هەندێکیان لەکاتی سروود وتنەوە دەکوژانەوە و هەندێ لەکاتی هەڵپەڕین دەکەوتن و خەوی سەرخۆشی دەیبردنەوە، پیرەکانیش وردە وردە توانایان کەم دەبۆوە و دواجار ئەوانیش دەکەوتن.

کاتی ئێوارە بە هۆی هەواڵی گەیشتنی پاشای فری ژی، خۆشی ئۆردووگای هەخامەنشی گرتەوە، ئێستارکی پاشا ڕاستەوخۆ چوو بۆ لای داریوش و ئەویش ڕێزی گرت، ئێستارك کە زانی ئەو ڕۆژە جەژنی باکوسە وتی: ئەی شای شایان[٤] کات بە فیڕۆ نەدات و بە سەربازەکانی بڵێت مەشخەڵەکان پێ بکەن و خۆیان ئامادەبکەن بۆ چوون بۆ ناو شار.

داریوش پرسی: بۆ مەشخەڵ پێ بکەن؟

ئێستارك وتی: بۆ ئەوەی لە ڕێگەی تونێڵەوە بچینە ناو شار و ئەگەر یۆنانییەکان کۆتایی تونێڵەکەیان داخست بێت، لەبەر ئەوەی ئەوان مەستن بە ئاسانی تونێڵەکە دەکەینەوە بێ ئەوەی ئاگادار بن.

ئەوکات داریوش تێگەیشت ئەو شارە وەك زۆرێك لەو شارانەی قەڵایان هەیە، ڕێگەیەکی نهێنی هەیە کە یۆنانییەکان نایزانن و تەنها ئێستارك و کورەکانی ئەو ڕێگەیە دەناسن، لە ڕابردوودا نەریت بوو، کە گەورەی شارەکە تەواوی ئەوکەسانەی دەکوشت، کە لە ڕێگە نهێنییەکە کاریان کردووە، بۆ ئەوەی بە نهێنی بمێنێتەوە و کەس لێی ئاگادارنەبێت.

چونکە درەنگ کەوتن کارێکی باش نەبوو، دەستبەجێ مەشخەڵەکان پێکران و دەستەیەك سەرباز بە ڕێنمایی ئێستارك و کورەکانی بە ڕێگەی تونێڵەکەوە کەوتنەڕێ بۆ ناو شار و لە

(٤) (شای شایان ناوی فەرمی داریوش بووە و لەو کەتیبانەی لە بێستوون بەجێ ماون ئەو ناوە هاتووە، زەبیحوڵڵا.)

ماوەیەکی کەمدا گەیشتن، دوای نزیکەی نیوکاتژمێر هەواڵیان بۆ داریوش هێنا کە سەربازەکان بەبێ ڕێگری گەیشتوونە ناوشار و داوایان کردووە دەست بەجێ سەربازی تر بۆ یارمەتیان بچن تا هێرش بکەن. سەربازانی هەخامەنشی دوای گەیشتنیان بۆ ناو شار، هەموو سەربازە یۆنانییە مەستەکانیان لە یەك شوێن کۆکردەوە و پاسەوانیان بۆ دانان.

بەڵام ئارتادۆسی فەرماندەی یۆنانی کە کاتی گەیشتنی لەشکری داریوش هێشتا تەواو مەست نەبوو، چونکە توانای بەرگری و جەنگکردنی نەبوو، شمشێرە کورتەکەی خۆی بە توندی لە سگی رۆکرد و خۆی کوشت. داریوش بە ئەفسەرەکانی خۆی وت: دوژمنی ئێمە مەستە و توانای بەرگری نییە، بۆیە وەك خەڵکی (زۆرا نی کۆنۆم) وان و نابێت بەد ڕەفتار بین بەرانبەریان، تەنها ئەگەر ئەوان بەرگری بکەن کارەکە پێچەوانە دەبێت.

(زۆرا نی کۆنۆم) یەك لە دروشمە بەناوبانگەکانی داریوش بوو و هەروەك چوون لە کەتیبەکاندا دەڵێت:"منم داریوش شای شایان، کوری وێشتاسبی هەخامەنشی) بە هەمان شێوازیش دەینووسی (زۆرا نی کۆنۆم). ئەو دوو وشەیە لە فارسی کۆن هاتووە و تا ئێستا زۆر دەستکاری نەکراوە و وشەی یەکەم واتە (زۆرا) هەمان (هێز و توانا) دەکات کە لە مانای لاوەکیدا دەبێتە (ستەم) و (نی کۆنۆم) هەمان وشەی فارسی (نمی کنم) واتە (ناکەم) دەکات و بەسەر یەکەوە وشەکە واتای (ستەم ناکەم) دەدات.

ئەو دوو وشەیە لە کەتیبەکانی بێستووندا هەندێ دەستە واژەی تری بەدوا داهاتووە کە بریتین لە (نە بە ملت خود، نە بە بیگانەگان یا خارجیان) واتە (بەرانبەر بە نەتەوەی خۆم و بێگانە و دەرەکیەکان ستەم ناکەم)، ئەو وتەیەی داریوش لەوکاتە وتراوە کە ئەوانەی سەردەکەوتن، چاوی ئەسیرەکانیان کوێر دەکرد یا دەیانکوشتن و کاری توندیان پێدەکردن. لە کەتیبەکانی بێستوون دوو وشەی (کارا) واتە (نەتەوە)[٥] و (ئێران) واتە (نیشتیمان) هەبووە. بە فەرمانی داریوش ژمارەیەکی زۆرتر سەرباز چوونە ناو شار و دواتر داریوش و ئێستارك و

(٥) (لەوانەیە ئەو بابەتە بە شتی ئاسایی بەرچاو بکەوێت، بەڵام لانی کەم هەزار رۆژهەڵاتناس و خاوەن زەوق کاتی خۆیان بۆ دۆزینەوەی مانای کەتیبە بزماریەکان بردەسەر تا بزانن وشە هەخامەنشییەکان واتایان چ بووە، دواجار زانیان (کارا واتە نەتەوە) و (ئێران واتە نیشتیمان)، هێشتاش ئێمە لە کاری رۆژهەڵاتناسەکان بێ نیاز نین و کەسانی وەك پرۆفیسۆر کامیرۆنی ئەمریکی دەبێت بێن و کەتیبەکان بخوێننەوە تا ئێمە وردەکاریەکانی دروستکردنی کۆشکی پێرسپۆلیس و دەسەڵاتی هەخامەنشی بزانین. زەبیحوڵڵا.)

کورەکانیشی چوونە ناو شار و یۆنانییە مەست و بێ هۆشەکان بە بێ ئەوەی هیچ بەرگری بکەن، شاریان بە دەستەوەدا و لەشکری داریوش دەسەڵاتی بەسەردا گێڕا.

جیاوازی بیرورا لە بارەی رۆژی گەیشتنی لەشکری داریوش بۆ شاری ئەنکور هەیە و (فرانتز ئال تیم) ئاڵمانی دەڵێت: لەشکری داریوش لە رۆژی حەفتا و سێیەمی بەهار گەیشتنە ناو شاری ئەن سیر. بەڵام هارتمانی ئاڵمانی دەڵێت: جەژنی شەراب لە رۆژی حەفتایەمی بەهارە و داریوش لەو رۆژە گەیشتووە.

داریوش دوای ئەوەی چۆوە ناو شاری ئەن سیر، ئێستارکی کردە پاشای وڵاتی فری ژی و دەسەڵاتی پێدا تا بە هەریەکە لە کورەکانی پۆستێك ببەخشێت و وتی خەڵکی ئەنسیر دەتوانن سوود لە یارمەتی ئەو بۆ دروستکردنەوەی پەیکەری (مەردۆخ) وەربگرن و ئەندازیارەکانی لەشکرەکەی ڕاسپارد بۆ یارمەتیدانی خەڵك لە دروستکردنەوەی پەیکەری مەردۆخ.

هاووڵاتیانی شارەکە کە پەندیان لە شکاندنی پەیکەری مەردۆخ لە لایەن یۆنانییەکان وەرگرتبوو، بڕیاریاندا پەیکەرەکە ئەوەندە قایم و گەورە دروست بکەن کە ئەگەر جارێکی تر هێرش کرایە سەریان، ئەو پەیکەرە نەشکێت.

داریوش فەرمانی بۆ خەشایاری کوری نارد تا پەیکەرتاشێکی یۆنانی لە پێرسپۆلیس ڕەوان بکات بۆ یارمەتی خەڵکی ئەنکور. (شوارتز) رۆژهەڵاتناسی ئاڵمانی دەڵێت خەشایارشا پەیکەرتاشێکی یۆنانی بە ناوی (توسید) نارد کە لە پێرسپۆلیس کاری دەکرد. کاتێك توسید گەیشت داریوش لەوێ نەمابوو و بەڵام فەرمانی کردبوو بۆ هاوکاریان، توسید بە کاهینەکانی پەرستگای وت ئەگەر بتانەوێت پەیکەرەکە بەهێز بێت، دەبێت لەناو پەرستگاکەدا دروستی بکەن و ئەوانیش پەسەندیان کرد.

توسید فەرمانیدا بەردێکی گەورەیان لە شاخ هێنا، بەردەکە زۆر گەورە بوو و ناچار سەردەرکە و هەندێ لە دیواری پەرستگاکەیان رووخاند تا بتوانن بیبەنە ناو پەرستگاکە، هەروەها هاتنە ژوورەوەی ئەو هۆلەشیان رووخاند کە دەبوایە بەردەکەی لێ بتاشن و سەقفەکەشیان شکاند و بڕیاریاندا سەقفێکی بەرزتری بۆ دروست بکەن.

دوای ئەەی بەردەکە لە ناو پەرستگا دانرا، توسید کە خۆی پەیکەرتاشێکی دەست رەنگین بوو، بەردتاشە ناوچەییەکانی ناچار بە کار کرد و لە سەر ئەو نەخشەیەی کاهینەکان بۆیان دانابوو، تاشینی بەردەکەی بەردەوام کرد و لە ماوەی یەکساڵدا پەیکەرەکە تاشرا و بۆوە

پەیکەری مەردۆك، دواتر کەوتنە جەلایی و لووس کردنی، سەرئەنجام ڕەنگ کرا و بۆوە پەیکەری مەردۆك.

شوارتز دەڵێت توسید پەیکەرەکەی ئەوەندە بەهێز و گەورە دروستکرد کەلەوکات بە دواوە لە هیچ یەك لە جەنگەکان زیانی پێ نەگەیشت و پەیکەری ناوبراو تا سەردەمی ساسانییەکان مایەوە و بەڵام دواتر بە هۆی بوومەلەرزەوە کەوت و لەناو چوو.

## له پایتەختی لیدی

باسمانکرد که له ئاسیای بچووك چەند ولاتێك هەبوون که ئەوکات هەموویان بەردەستی پاشای هەخامەنشی بوون و یەك لەو ولاتانه ناوی فری ژی یەك بوو، داریوش ئەو ولاتەی له یۆنانییەکان ستاندەوە و ئێستارکی کردەوە پاشا، خۆی بەرەو رۆژئاوا رۆیشت تا بچێتە ولاتی توسیدی که له رۆژئاوای فری ژی بوو.

ئەوکات له پاشای ولاتی لیدی ناوی (ئێلیارۆس) بوو که برازای پاشای بەناو بانگ (گرزۆس) بوو، گرزۆس له رۆژهەلات بە قارۆن ناسرابوو و بە دەست کوروش دووچاری شکست هات.

ئێلیارۆس وەك هەریەکە له پاشاکانی ئەو ولاتانەی ژێر دەسەلاتی هەخامەنشی بوون، سەربەخۆیی بەسەر ولاتەکەیدا هەبوو. کاتی هێرشی یۆنانییەکان بۆ سەر شاری ساردی پایتەختی ولاتەکەی، له رۆژئاوای ولات بوو و نەیتوانی بە خێرایی بگاتەوە شاری سارد و یۆنانییەکان ئەو شارەیان گرت و وێرانیان کرد، ئێلیارۆس دەیوویست بچێتە ئێران، ڕێگەکانی لیّ داخرابوون و بە ناچاری چوو بۆ دورگەی قوبرس که بە هۆی بوونی هێزی دەریایی هەخامەنشی، ببوو بە شوێنی ئارام بۆ ئەوانەی له دەست یۆنانییەکان هەلّدەهاتن.

کاتێك هەوالّی وێرانکردنی شاری سارد گەیشتە ئێلیارۆس، ئەوەندە غەمبار بوو که بە بیستنی گریا و ئەوانەی له دەورەشی بوون گریان، چونکه سارد یەك له جوانترین و گەورەترین شارەکانی ئەوکاتی جیهان بوو و دانیشتوانەکەی باوەڕیان وابوو تەمەنی شارەکەیان دە هەزار سالّە.[1]

---

(١) (مێژوونووسانی سەدەی نۆزدەهەم وتەی دانیشتوانی شارەکەیان لەو بارەوە تێکەلّ بەو ئەفسانانە دەزانی که بەردەوام له سەردەمەکاندا له سەر زاری خەلّك هەبوو و گرنگیان پیّ نەدەدا، بەلاّم له دوای سالّی (١٩٥٠ ز) کاری هەلّکەندنیان له ولاتی لیدی کۆن که دەکەوێتە تورکیای ئێستا کرد و له ناوچەی (کاتال هۆیۆك) وێرانەکانی شارێکیان دۆزییەوە که دەگەڕایەوە (٨٠٠٠ پ. ز) و

داریوش دەیزانی شاری سارد وێران کراوە و دانیشتوانەکەی پەرتەوازە بوون و کەس نازانێت چوونەتە کوێ و چییان لێ هاتووە، ئەوکات پرسیار دەکرێت کە ئەی بۆچی داریوش ڕێگەی ساردی گرتەبەر و ویستی ئەوێ بگرێت؟ بە دەستەواژەی ئێستا چونکە پێگەی ئە شارە ستراتیژی بوو چوو بۆ ئەوێ.

هەر لەشکرێك لە ڕۆژهەڵات بۆ ڕۆژئاوا چووبایە یا بە پێچەوانەوە لە ڕۆژئاوا بۆ ڕۆژهەڵات، ناچاربوو شاری سارد داگیربکات و بە پێچەوانەوە دەکەوتە مەترسی داگیرکردنی ڕێگەی پەیوەندی. ئێستاش ئەو ناوچەیەی شاری سارد کەوتووتە ناوی، ئەو گرنگیەی هەر ماوە و لە جەنگەکانی سەربەخۆیی تورکیا و ئەوکاتەی (کەمال ئاتاتۆرك) و (عصمەت ئینۆنۆ) لە گەڵ یۆنانییەکان دەجەنگان، گرنگیە جەنگییەکەی ئەو ناوچەیە دەرکەوت.

ئەگەر داریوش دوای گەیشتنی بە ئاسیای بچووك بەرەو باکوور واتە کەنارەکانی دەریای ڕەش یا بەرەو باشوور واتە بەشێك لە کەنارەکانی دەریای مەدیتەرانە چووبایە، ناچار نەبوو ناوچەی شاری سارد داگیر بکات، بەڵام چونکە دوای هاتنی لە فری ژی ڕاستەخۆ چوو بۆ وڵاتی لیدی، ناچاربوو ئەو ناوچەیە داگیر بکات تا یۆنانییەکان لە ئەوێ دەربکات یا ناچاریان بکات خۆیان بەدەستەوە بدەن و لە لایەکی تر ئاسوودە دەبوو لە بابەتی پشت خۆیەوە و مەترسی پچرانی پەیوەندی بە دواوەی نەدەما.

(ماراکوارتی) ئاڵمانی دەڵێت بۆ ئەو لەشکرەی لە فری ژی بەرەو لیدی یا بە پێچەوانەوە دەڕوات، داگیرکردنی سارد کارێکی ژیارییە و بە وتەی ئەو ئەسکەندەری مەقدۆنی لە کاتی لەشکرکێشییەکی خۆی لە ڕۆژئاوا بۆ ڕۆژهەڵات و لە ئاسیای بچووك بۆیە شاری ساردی داگیر نەکرد، چونکە دوای گەیشتنی بە ئاسیای بچووك ڕێگەی باشوور واتە نزیك کەنارەکانی دەریای مەدیتەرانەی گرتەبەر و لە ئەوێوە گەیشتە میزۆپۆتامیا و ئەگەر داریوشیش ئەو ڕێگەی هەڵبژاردبوایە پێویستی بە داگیرکردنی ناوچەی شاری سارد نەدەبوو.

(ماراکوارت) دەڵێت داریوش بۆیە بە شاری سارددا نەرۆیشت چونکە نەیدەویست دووچاری ناوچە شاخاویەکانی ڕۆژهەڵاتی فری ژی ببێت (پێشتر باسی پەرینەوەی لەشکری کوروشمان لەو

---

دەهەزار ساڵ پێش ئێستا و بۆیە زیدەرۆیی خەڵکی سارد زۆر تێکەڵ بە ئەفسانە نەبووە، چونکە شاری کاتال هۆیاك دەهەزار ساڵ پێش هەبووە. ئەو شارەی (٢٥٠٠) ساڵ پێش ئێستا و لە سەردەمی داریوشدا هەبووە و دواتر بووە بە سارد، تەمەنی هەزاران ساڵ بووە، لە جوانترین شارەکانی جیهان بووە و ئەوکات بووکی جیهانی کۆن بوو و بە دەستی تالیدۆس و سەربازەکانی وێرانکرا. زەبیحوڵڵا.)

ناوچە شاخاوی و سەختە کرد بۆ جەنگی قارۆن) و لەشکرەکەی لەو ناوچە شاخاویانە بخاتە بەردەم هێرشی لەشکری هەخامەنشی یا جەنگاوەرەکانی ناوچەکە و ڕێگەی باشوور بێ مەترسی بوو، لێکدانەوەی ئەسکەندەر دروستبوو و تا گەیشتە میزۆپۆتامیا کەس ڕێگەی نەگرت.

کاتێك داریوش گەیشتە ناوچەیەك کە شاری سارد بەرچاوی پێشەنگی لەشکرەکەی کەوت، چاوەڕوان بوو تا پێشەنگی لەشکرەکەی زانیاری لە بارەی ئەو شارە پێ بدەن و ئەوانیش هەواڵیان نارد کە شارەکە وێران بووە و لە دوورەوە ڕەشایی دیارە کە لەوانەیە لەشکری دوژمن بێت. چونکە رۆژئاوابوون نزیك بوو، داریوش لە تەنیشت ڕووبارێك بە ناوی ساردی بچووك وەستا و ئەو ڕووبارە ئێستاش وەك ئەوکات لە وەرزی هاویندا وشکدەبێت، بەڵام ناوەکەی گۆڕاوە. کاتێك داریوش گەیشتە ئەو شوێنە وەرزی گەرما دەستی پێکرد بوو، بەڵام ڕووبارەکە هێشتا ئاوی هەبوو و سەربازەکانی داریوش دەیانتوانی سوود لە ئاوەکە وەربگرن.

ڕووبارەکە لە شوێنێکەوە دەهات کە گریمانی زۆر دەکرا دوژمن کەنارەکانی داگیرکردبێت، بۆیە داریوش پزیشکەکانی لەشکرەکەی ڕاسپارد تا لە ئەگەری ژهراوی بوونی ئاوەکە دڵنیا بن و دوای ئەوەی ئەوان ئاوەکەیان پشکنی و دڵنیا بوون ژەهراوی نییە، داریوش ڕێگەی بۆ سوود وەرگرتن لە ئاوەکە بە سەربازەکانیدا، وێڕای ئەوەش بەردەوام پزیشکەکان بەردەوام ئاوەکەیان دەپشکنی، چونکە ئاوەکە کەم بوو و ژەهراوی کردنی ئاسان بوو. ئەو رۆژە هیچ سەربازێکی داریوش ئاویان بۆ خواردنەوە نەکوڵاند، چونکە دەیانزانی ئاوی سەرزەوی کوڵاندنی ناوێت.

پێویست ناکات درێژدادری بکەین و دەڵێین داریوش لە بەر مەترسی هێرشی لە پڕی دوژمن، پارێزگاری ئۆردووگاکەی بە چاکی دامەزراند تا بتوانن ئەگەر بەشەو هێرشیان کرایەسەر بەرگری بکەن. ئەو شەوە هەوا گەرم بوو و هەوریش ئاسمانی داگرت و بۆوە هۆی گەرمتر بوونی هەوا، میشوولە هێرشیان دەکردە سەر سەربازەکان و ئاژەڵەکانیان. باسمانکرد کە یۆنانییەکان لە ساڵی (٥٠٠ پ. ز) وڵاتی لیدیان داگیرکرد، بۆیە کاتی پێویستیان هەبوو تا هەندێ لە پیاوانی لیدی بۆ سەربازی ببەن و بە شێوازی پەروەردەی سەربازی یۆنان ئامادەیان بکەن تا بتوانن بە شێوەی ڤالانژ بجەنگن.

لیدی لە سەردەمی کوروشی دامەزرێنەری پاشایەتی هەخامەنشی کەوتەدەست هەخامەنشییەکان و هێشتا زۆر بەسەر ئەوکاتەدا نەرۆیشت بوو تا خەڵکی لیدی ڕابردوویان بیر بچێتەوە، بەڵام رەفتاری باشی کوروش و کەمبۆجییە و داریوش لەگەڵ ئەوان وابوو کە کەس لە ئەوان هەستی بە داگیرکردنی وڵاتەکەی نەدەکرد. خەڵکی لیدی بە هاتنی یۆنانییەکان بۆ

ولاَتەکەیان زۆر دڵگران بوون، چونکە نەتەنها پایتەختەکەیان وێرانکردن، بەڵکو لە ژێر پاڵەپەستووی ئەواندا نەیاندەتوانی خوای خۆیان بپەرستن و تەنها تاقمێکی ئەو ولاَتە کە گاپەرست بوون و لای خەڵك بە تاقمی پەست دەژمێردران، بەو کارە دڵخۆش بوون، هەرچەندە یۆنانییەکانیش ڕێگەیان لە ئەوانیش دەگرت بۆ جێبەجێ کردنی ئایینەکەیان و ناچاریان دەکردن تا خوای ئەوان بپەرستن.

لە هەموو سەردەمەکاندا کاتێك خەڵك ناچار ببنە شوێن کەوتەی ئایینێکی تازە، خەڵکەکە لە رووکار وایان نیشانداوە کە خۆشحاڵن و ئایینی تازەیان پەسەندکردووە و لە ژێرەوەش ئایینی کۆنی خۆیان پەرستیوە، چینی دزێوی شاری لیدی کە گاپەرست بوون، کاتێك گوشاریان خرایەسەر بۆ پەرستینی خودایانی یۆنانی، خۆپارێزیان کرد و لە ناخدا خۆشحاڵ بوون کە یۆنانییەکان هاتن و خوای زۆرینەی خەڵکی ولاَتەکەیان لەناو برد و تۆڵەی ئەوانیان لە خەڵکی لیدی کردەوە.

یۆنانییەکان لە سەرەتای هاتنیان بۆ لیدی نەیانویست هیچ کەس لە ئەوان بکەنە سەرباز و هەستیان بە مەترسی نەدەکرد تا پیاوانی ئەو ناوچەیە بکەنە سەرباز، بەلاَم دوای ئەوەی هەستیان بە مەترسی هێرشی چاوەروان نەکراوی هەخامەنشییەکان کرد بە ناچاری ویستیان سەرباز لەو ناوچانە بگرن. بەلاَم خەڵکی ناوچەکە بانگهێشتی یۆنانییەکانیان بۆ سەربازی پەسەند نەکرد، چونکە نەفرەتیان لە یۆنانییەکان بوو و یۆنانییەکانیش ناچار لە چینی دزێوی شار کە کینەیان بەرانبەر بە زۆرینەی دانیشتوانی ولاَتەکەیان هەبوو، سەربازیان گرت. بۆ گاپەرستەکان سەربازی کردن بۆ یۆنانییەکان نەتەنها باش بوو، بەڵکو بە سوود بوو و ئەوان وێڕای وەرگرتنی مووچەی باش لە یۆنانییەکان، لە کارە پەست و ناخۆشەکانیش ڕزگاریان دەبوو.

تالیدۆس کە بە لەشکرێکی بچووکەوە هاتبۆوە ناو ولاَتی لیدی و لە ئەوێ بە وەرگرتنی هاوکاری لە شارە یۆنانییەکانی ئاسیای بچووك و بە کرێ گرتنیپیاوانی گاپەرست، ژمارەی سەربازەکانی گەیاندە پەنجا هەزار کەس، بەلاَم ئەو پەنجا هەزار کەسە هەموویان پێداویستییەکانی تایبەت بە ڤالاَنژیان نەبوو و بۆیە لە رووی جەنگییەوە زۆر بە بایەخ نەبوون، بەلاَم هەرچییەك بێت تالیدۆس لە گەڵ پەنجا هەزار سەرباز بۆ جەنگی داریوش ئامادەبوو.

ئەو شەوە زۆر گەرم بوو و وتمان هەور بوو و مێشوولە هەبوو، بۆیە بۆ سەربازە هەخامەنشییەکان شەوێکی خۆش نەبوو و نزیك بەرەبەیان و ئەوکاتەی بە هۆی فێنکی

بەرەبەیان مێشوولە نامێنێت، ئەوان خەوتن و فێنکی هەوا میشوولەکانی نەهێشت، بەڵام دەنگی (کووس) کە بۆ ئامادەباشی سەربازی لە لەشکری داریوش لێدەدرا، ڕێگەی پێنەدان بخەون.

لە لەشکری داریوش بۆ لە خەو هەستاندنی سەربازەکان (کوس) یان لێدەدا و دەنگەکانی تر ئەوانی لە خەو هەڵنەدەستاند، هەروەك چوون لە لەشکری ناپلیۆندا بۆ هەستاندنی سەربازەکان تۆپیان دەتەقاند و سەربازەکانی بە هۆی دەنگی تۆپ هەڵدەستان.

لەگەڵ بەرەبەیاندا هەردوو ئۆردووگا بە خێرایی کەوتنە ڕێکخستنی ریزەکانیان و داریوش بە شێوەی کوروش لەشکرەکەی ڕێکخست، واتە دوولای راست و چەپ و دڵی بۆ لەشکرەکەی دیاریکرد و مەنجەنیقەکانی لە بەرانبەر دانان تا لە کاتی پێویست سوودیان لێ بدیترێت. داریوش زانیاری لە بارەی هێزی یۆنانییەکان نەبوو، بەڵام دەیزانی لەشکری ئەو زیاتر و بەهێزترە.

یۆنانییەکانیش ڤالانژەکانیان ڕێکخست و لەپڕ لەناو لەشکری یۆنانەوە دەنگی دەهۆڵ و کوس و زۆرنا هات و داریوش بەو دەنگانە کە نیشانەی هێرشی یۆنانییەکان بوو، دووچاری سەرسوڕمان بوو. پاشای هەخامەنشی بیری نەدەکردەوە کە ئەوان هێرشیان بکەنەسەر، چونکە لەشکری یۆنان لاوازتر بوو لە هی ئەوان، بەڵام دەنگەکان نیشانەی هێرشی ئەوان بوو.

هەخامەنشییەکانیش موزیکی لەشکریان هەبوو و ناوی (ساز)[٢] بوو، ساز یا گروپی موزیکی لەشکری هەخامەنشی پێکهاتبوو لە (کانون[٣]، روود، شمشاڵ، تەپڵ، سەنج و کۆس)، کانون بە شێوەیەك دروست دەکرا کە بتواندرێت هەڵبگیرێت و لەکاتی ڕۆیشتندا لێبدرێت. دوای ئەوەی داریوش هەستی کرد ئەوان هێرش دەکەن، فەرماندەکانی ئاگادار کردنەوە کە ئامادەبن نەوەك هێزی ئەوان زیاتر بێت لە هی ئێمە.

داریوش بۆ خۆی فەرماندەیی دڵی لەشکرەکەی بەرێوە دەبرد و هەرچەندە سەربازەکانی شەوی ڕلبردوو نەخەوتبوون، بەڵام بە بیستنی هەواڵی هێرشی یۆنانییەکان خۆیان ئامادەکرد. ئەو ڤالانژانەی لەشکری یۆنان کە قەلغان و ڕان بەند و پێداویستییەکانیان هەبوو، لە پێشەوەی لەشکری یۆنان دەرۆیشتن و بە نزیك کەوتنەوەیان لە لەشکری هەخامەنشی، مەنجەنیقەکان بەردیان بەسەردا باراندن.

---

(٢) (وشەی ساز کە ئێستا تەنها بۆ یەك ئامرازی موزیك بەکار دێت، ئەوکات بۆ دەستەیەکی موزیك بەکاردەهات، زەبیحوڵلا.)

(٣) (ئامێری موزیکی کانون کە دواتر گۆڕا بە (قانون)، ئەورووپییەکان (ئۆرگانون) یا (ئۆرگ) لە کلیساکانیان لەو ناوە وەرگرت. زەبیحوڵلا.)

گواستنەوەی مەنجەنیقی گەورە قورس بوو، بۆیە بە پارچەکراوی و بە چەندین عارەبانە دەگوازرایەوە و دواتر دەبەستران یا لە مەیدانی جەنگ دروست دەکرا، بۆیە لەشکری داریوش تەنها مەنجەنیقی بچووکیان هەبوو و بەردی بچووکیان بە سەر یۆنانییەکاندا دەباراند، یۆنانییەکانیش بە پەلە قەلغانەکانیان لە سەر سەریان ڕاگرت و بە ڕاکردن خۆیان لە ناوچەی بەردەکان دەرباز کرد و لە دوایین ساتەکان چەند سەربازێکی یۆنانی بەردیان بەرکەوت و بەربوونەوە، بەڵام سەربازەکانی تر مەنجەنیقەکانیان بەجێهێشت و گەیشتنە سەربازەکانی داریوش.

چیتر و دوای ئەوکاتە مەنجەنیقەکان سوودیان بۆ کوشتنی دەستەی یەکەمی سەربازە یۆنانییەکان نەما و ئەگەر رووشیان سووڕاندبان، لەوانەبوو سەربازانی خۆیان بکوژن و بەڵام لەوانەبوو سوودیان لێ وەرگیرا بایە بۆ لێدانی سەربازەکانی تری یۆنان کە لە لای سارد دەهاتن.

ئەزموونی ڤالانژەکانی یۆنانی ئەوەندە بەهێز بوو کە دوای ئەوەی لە ژێر پاڵەپەستۆی بەرد باران ڕایان کرد و زرێکانیان لەسەر سەر گرتبوو، ئارایشیان کە بە شێوەی چوارگۆشە بوو تێك نەچوو.[٤] ئەگەر کۆمەڵە کەسێك ڤالانژێك دابمەزرێنن و چوارگۆشەیەك دروست بکەن و دواتر مەودای دوو سەد یا سێ سەد مەتر ڕا بکەن، کاتێك دەگەن بە گریمانی زۆر ڤالانژەکەیان تێك دەچێت چ جای ئەوەی ئەوان لە ژێر بەردباران بەرەو مەترسی مەرگ بچن. بەڵام ئەو پارێزگاریە جوانە لە دۆخی ڤالانژ لە کاتێکدا لە ژێر بەردباران بوون و سەربازەکانی دوژمن ئامادەبوون بۆ کوشتنیان، تەنها بە هۆی ڕاهێنانە سەربازییەکانی یۆنانەوە نەبوو و دەگەڕایەوە بۆ کەلتووری وەرزشی یۆنانییەکان کە وەك میرات لە باپیرانیانەوە مابۆوە و زاندراوە کە وەزش بەشێك لە ئاییندارى ئەوان بوو.

بۆ زیاتر تێگەیشتن لە جەنگی شاری سارد، پێویستە بە کورتی لە بارەی شێوەی جەنگی ڤالانژەکان بدوێین. ڤالانژی یۆنانی هەندێ کات بازنەیی و هەندێکات لاکێشە، سێگۆشە یا چوارگۆشەیە و چوار گۆشەش چوار رووکاری هەیە و لەوانەیە وابیربکرێتەوە کاتێك کە ڤالانژ چوار گۆشە بێت، تەنها یەك لای دەکەوێتە جەنگ و سێ لاکەی تری لە پشوو دەبن. چونکە تەنها یەك لا رووی لە دوژمن دەبێت، بەڵام یۆنانییەکان هەموو سەربازەکانیان دەخستە جەنگ.

---

(٤) (بێ هۆ نەبوو کە ئەندازیار و زانای بیرکاری و فیزیکی گەورەی یۆنانی ئەرەشمیدۆس دوای دووسەد و پەنجا ساڵ لەو بەرواره دەڵێت من ئەندازە لە ڤاڵانژەکانی یۆنان فێر بووم، ئەو لە ساڵی (٢١٢ پ. ز) واتە نزیکەی سێ سەد ساڵ دوای جەنگی سارد مرد، زەبیحوڵڵا)

بۆ نموونە لە کاتی هاتنی دە ڤالانژ بۆ مەیدانی جەنگ، ئەوان دەکەوتنە نزیك یەك و بەم شێوەیە بەردەوام لای پێشەوە و هەردوو لای ڕاست و چەپ دەکەوتنە جەنگ و لای پشتەوە دەبۆوە هێزی یەدەگ و هەروەها جێگەی ئەو سەربازانەی لە ڕیزی پێشەوە دەکوژران لە لایەن سەربازانی لای ڕاست و چەپ پڕ دەکرایەوە و لە ئاکامدا درێژی ئەو دوو لایە کەم دەبۆوە و چوار گۆشەکە دەبوو بە لاکێشە.

کەواتە لە چوار گۆشەدا بە مەرجێك هێرشی نەکرێتە سەر، تەنها یەك لا ناکەوێتە جەنگ و لاکانی تر لە جەنگدا دەبن. بەلام بە گشتی دوژمنەکانی یۆنان لە هەموو لایەکەوە هێرشیان دەکردە سەر ڤالانژ، چونکە دەیانزانی ئەگەر لە هەموو لایەك هێرشی نەکەنە سەر ناتوانن بیشکێنن.

ئەو رۆژە ڤالانژەکانی یۆنان چوارگۆشە بوون و هەموویان لە دوولاوە پەیوەندیان بەیەکەوە هەبوو، چونکە هەموو سەربازەکانیان قەلغان و ڕان بەند و ساق بەندیان هەبوو، ڤالانژ لە ئاژەلێکی گەورە دەچوو کە دەجوولا و هەرچی لەسەر ڕێگەی بوایە لە ناوی دەبرد، سەربازانی یۆنانی بەرەو پێش دەچوون و شمشێریان دەوەشاند و قەلغانەکانیشیان بە شێوەیەك دەگرت کە ڕێگە لە سەربازی تەنیشتیان نەگرن لە کاتی شمشێر وەشاندن.

ئەوان زۆر بە ڕێکی و لەسەرەخۆیی شمشێریان دەوەشاند و لەوانەیە ئەگەر لەوکاتەدا کەسێك لە ئەوێ بووایە و گوێی لە لێدانی دلیان بگرتایە، دەیبیست کە لێدانی دلیشیان زۆر ئاسایی بوو، چونکە ئەوانەی لە چوارچێوەی سەربازە ئاسنینەکان و بە دەستەواژەی ئەمڕۆ قەلغان لەبەرەکان، هێرشیان کردە سەر سەربازەکانی داریوش هەموویان یۆنانی بوون و ئەزموونی جەنگیان هەبوو و هەرکە یەکێکیان دەکوژرا و دەکەوت، ئەو دوو سەربازە لە تەنیشتەکانی بوون بە خێرایی لەیەکتر نزیك دەبوونەوە و جێگەی ئەویان پڕدەکردەوە و لە تەواوی ریزەکان ئەو کردارە دووپات دەبۆوە و سەربازێك لە دوو تەنیشتەکەوە خۆی دەخزاندەوە ناو شوێنەکەی.

ئەو رۆژە سی ڤالانژی یۆنانی هێرشی کردە سەر لەشکری داریوش و لە هەریەکە لە دڵ و لای راست و لای چەپی لەشکری داریوشدا دە ڤالانژ لە دژی لە جەنگدا بوون، سەرجەم سەربازانی تالیدۆس لەو سی ڤالانژەدا تەنها نۆ هەزار کەس بوون و هەر ئەو ژمارەیە بە هۆی ئارایشی جەنگی بەرزیان، توانیان لەشکری داریوش بخەنە لەرزەوە. داریوش لە هەموو لایەك و تەنانەت لە پشتەوەش هێرشی دەکردە سەر ڤالانژ و لە پشتەوەش سەرباز دەکوژرا، بەلام دەستبەجێ شوێنیان پڕ دەکرایەوە. سەبارەت بەو جەنگە لە لایەن مێژوونووسانی یۆنانی زۆر

بابەت نووسراوە و ئەو جەنگە بە شاكاری لەشكری یۆنان دەزانن، لە ڕاستیشدا لەشكری داریوش لە ئاسیای بچووك لە هەر شوێنێك ڕووبەڕووی یۆنانییەكان بۆتەوە، بەرگری سەرسەخت و دلێرانەی بەرانبەر كراوە و یۆنانییەكان سەرسەختانە جەنگاون، وەرزش یەك لە نەریتەكانی ئایینی زەردەشتییەكان بوو و سەركەوتن بە سەر پایەداری و خۆراگری ئەوان ئاسان نەبوو.

وێڕای ئەوەی ئازایەتی یۆنانییەكان نكۆڵی لێ ناكرێت، بەڵام مێژوونووسە یۆنانییەكانیش زۆر زێدەڕۆییان لە بارەی جەنگەكانی ئاسیای بچووك كردووە و هەندێجار هەندێ بابەتیان باس كردووە كە عەقڵ ناتوانێت پەسەندی بكات، بۆیە باشتر وایە بۆ باسی ئەو جەنگانە گوێ لە نووسەرانی بێ لایەن بگرین.

(ژاك دوڤەن گێمەن) مامۆستای زانكۆی لیژ (لە زانكۆ ناسراوەكانی ئەورووپا) و نووسەری پەرتووكی (ئایین لە ئێرانی كۆن) سوودی لە نووسینی مێژوونووسە بێ لایەنەكان وەرگرتووە[٥]، ئەو دەڵێت: ئەگەر لەو جەنگانەدا خەڵكی ئاسیای بچووك هاوكاری یۆنانییەكانیان بكردایە، ئەستەم بوو داریوش بتوانێت یۆنانییەكان لەو ئاسیای بچووك دەربكات، بەڵام دانیشتوانی ئەو وڵاتانە یارمەتی یۆنانییەكانیان نەدا و هەر كە داریوش دەگەیشتە یەك لەو وڵاتانە، پاشا وڵاتەكە كە هەڵاتبوو، دەگەڕانەوە و دەكەتنە پاڵ داریوش و دەست ڕۆیشتوویی خۆیان لە ناوچەكە بۆ پاڵپشتی داریوش بەكاردەهێنا تا یۆنانییەكان دەربكەن.

ئیلیارۆسی پاشای لیدی كە دوای سەركەوتنی یۆنان بەسەر وڵاتەكەیدا ڕایكردبوو، بە بیستنی هەواڵی گرتنی وڵاتی فری ژی و گیرانی شاری ئەن سیر لە لایەن ئێرانییەكانەوە بە پەلە كەوتەرێ بۆ یارمەتیدانی ئەو و كەوتە پاڵ داریوش، هەرچەندە پاشای لیدی لە جەنگی سارد نەیتوانی هیچ یارمەتی داریوش بدات، بەڵام بۆ دەركردنی یۆنانییەكان لە لیدی هاوكاری كرد.

داریوش كە دیتی شكاندنی ڤاڵانژەكان لە لایەن پیادەی لەشكرەكەی ئەستەمە، فەرماندەی سواركارەكانی خۆی بە ناوی (كولامێش) بانگ كرد و پێیوت: سوارەكانت بخە جووڵە و لە لای ڕاستی منەوە هێرش بكە، لە لای ڕاستی من دە ڤاڵانژی یۆنانی هەیە كە وەك دەبینی

(٥) (ژاك دۆ فەن گیمەن لە مێژوونووسە هاوچەرخەكانە و هەرچی لە سەرەتای كارەكەی تا ئێستا نووسیویەتی سەبارەت بە ئێرانە و چونكە هەر سێ زمانی فەرەنسی و ئینگلیزی و ئاڵمانی دەزانێت، هەندێ پەرتووكی بەو زمانانە واتە هەندێكیان بە ئینگلیزی و هەندێ بە فەرەنسی و چەند دانەیەكیشی بە ئاڵمانی نووسیوە و چاپی كردووە و بۆ ئەوەی خوێنەری بەڕێز ماندوو نەكەین خۆمان لە ناوهێنانی پەرتووكەكانی نادەین. لە پەرتووكەكاندا دیارە كە هەندێكات سوودی لە زانا هاوچەرخە ئێرانییەكانیش وەرگرتووە و ناوی ئەوانی لە پەرتووكەكەدا باس كردووە و زاندراوە كە هەوڵیداوە ئەوەندەی لە تواناداا بووە مێژوو بە سوود وەرگرتن لە سەرچاوە بێ لایەنەكان بنووسێتەوە و نەك بە پشت بەستن بە سەرچاوە یۆنانییەكان، زەبیحوڵڵا)

قەلغانیان لە بەرە و سەربازەکانت دەبێت لەناویان بن، ئەگەر نەتانتوانی بیانکوژن دەبێت بەسەریاندا برۆن و ئەگەر تۆ ئەو دە ڤالانژە لەناو ببەی، منیش ڤالانژەکانی تر کە بەرانبەر دڵ و لای چەپی جەبهەکەم دامەزراون بە باشی گەمارۆ دەدەم.

کولامێش وتی: ئایا دوای ئەوەی ئەو دە ڤالانژەم لە ناو برد کە لە لای راستمانن، بەردەوامبم لە سەر پێشڕەوی یا بوەستم و بگەڕێمەوە؟

داریوش وتی: مەبەستی ئێمە لەناو بردنی دوژمنە و دوای شکاندنی ئەو دە ڤالانژەی بەرانبەر لای ڕاست، ئەگەر زانیت دەتوانی بەرەو پێش بچی، برۆ و دوژمن لەناو ببە، بەڵام ئەگەر زانیت زیانی زۆر بە سەربازەکانت دەگات بگەڕێوە،دوای شکاندنی دە ڤالانژەکە بڕیار بە دەست خۆتە و چوونت پێ باشە وابکە. بە باوەڕی من سەربازە بە کرێ گیراوەکانی ناو لەشکری داریوش بایەخی جەنگیان وەك سەربازانی یۆنانی نییە و لەوانەیە ساق بەند و ڕان بەند و قەلغانیان نەبێت، بۆیە لەناوبردنی ئەوان زۆر ئاسانترە. کولامێش بۆ جێبەجێ کردنی فەرمانی پاشا کەوتەرێ.

کاتێك فەرمانێك لە فەرماندەی لەشکر بۆ ئەفسەرێك دەردەچێت، ئیتر دەسەڵات بەدەست ئەوە چی پێ باشە بۆ جێبەجێ کردنی بیکات و ئەم یاسایە لە کۆنەوە تا ئێستا هەرماوە. کولامێش هەندێ لە سوارەکانی خۆی بە یەدەگ هێشتەوە و لەگەڵ ئەوانی تر کەوتەرێ. بۆ دەستپێکی هێرشی سوارەکان پێویست بوو پیادەکان ڕێگە چووڵ بکەن و ئەمەش کەلێنی دەخستە ڕیزەکانیان و یۆنانییەکان دەهاتنە پێشتر. فەرماندەی لای ڕاست فەرمانی کشانەوەی پیادەکانی بە شێوەی کاتی دەرکرد تا سوارەکان توانای هێرشیان هەبێت و ئەوانیش کشانەوە و ئەوەی چاوەڕوان نەدەکرا روویدا، ڤالانژەکانی یۆنانی بە پەلە بەرەو پێش هاتن و لەوانەیە بیریان کردبێتەوە کە هەخامەنشییەکان شکابن، بەلچام هێرشی سوارەکانی کولامێش ئەوانی ڕاگرت.

لە سەردەمی هەخامەنشییەکان و بە تایبەتی سەرەتاکانی دەسەڵاتیان، ئەوەندە گرنگیان بە پەروەردەی ئەسپ دەدا، ئەوەندە بە پەروەردەی منداڵەکانیانەوە ماندوو نەدەبوون و ئەسپەکانیان لە ناوچەی (نسا) کە بە وتەی مێژووناسان لە پێدەشتی (ماهیدەشتی) کرماشان بووە، پەروەردەدەکرد. لە نسا سێ تیرەی ئەسپ پەروەردەدەکرا کە بریتی بوون لە: (کۆکلان، تەتۆ، حەران یا هەران)، ئەسپی کۆکلان بە (تیرەی ئاسك) ناودەبرا و ئەو ئەسپانە وەك ئاسك خێرا بوون، باڵایان بەرز و لاقیان درێژ و سینگیان پان بوو و لە کاتی هێرشدا بەسەر دوژمن دەکەوتن. تیرەی ئەسپی (تەتۆ) کورت و بەهێز و خۆڕاگر بوون و بۆ بار هەڵگرتن و ڕاکێشانی

عارەبانە بەکار دەهاتن. تیرەی ئەسپی (هەڕان) هەیکەلیان بچووك بوو، بەڵام هەناسەیان قووڵ بوو و بۆ ڕێرۆیشتن زۆر خۆڕاگر بوون و ئەسپی عەرەبی لە هەمان تیرەیە.

ئەسپەکانی لەشکری هەخامەنشی لە نسا گژوگیای تازەیان دەخوارد، بەڵام کاتێك دەهێندران بۆ ناو لەشکر تەنها ئالیکی وشکیان پێدەدان. ئەگەر ئەسپێك کە لای سوارێك بوایە و بە ئازاری گەدە مردبایە، کەمترین سزا بۆ سوارکار ئەوە بوو ئەسپێك بکرێتەوە بە هەمان تەمەن و توانا یا پارەکەی بدات، چونکە نەخۆشی گەدە لە ئەسپدا تەنها لە کاتی خواردنی گیا و خۆڵ بەیەکەوە دروست دەبێت و بۆیە ئەو سزایە بۆ سوارەکەی دیاریکرابوو.

بەکەمی رووبەدا سوارێك ئەسپەکەی خۆی خۆش نەوێت، ئەوان شەوانە پشووی خۆیان تەرخان دەکرد بۆ خاوێن کردنەوە و ئالیك پێدان بە ئەسپەکەی و بۆیە خۆشەویستی لە نێوان ئەسپ و سوارەکە دروست دەبوو. سوارە هەخامەنشییەکانی ئەو رۆژە هێرشیان بۆ سەر لەشکری یۆنان کرد هەموویان ئەسپی کۆکلانی بالابەرزیان پێبوو و نێزەی درێژیان بەدەستەوە بوو. کولامێش بینی یۆنانییەکان هەموویان قەلغانیان لەبەرە و دەیزانی شمشێر یا تیر کاریگەری نابێت لەسەریان و بۆیە بە دروستی زانی بە نێزە هێرشیان بکرێتەسەر، چونکە ئەگەر نێزە نەشیانکوژێت بە دڵنیاییەوە دەیانخاتە سەر زەوی و دواتر ئەو سەربازانەی دەکەوێتە سەر زەوی، بە سمی رەوەی ئەسپەکانی لەشکرەکەی دەکوژران.

هێرشی سوارەکانی کولامێش لە چەند خولەکێکدا توانی هێرشی ڤالانژەکانی یۆنانییەکان ڕابگرێت. هەر یەکە لە سوارەکان نێزەیەکی درێژی بە پێی پێویستی سەردەم بە دەستەوە بوو و وەك تیرێکی قورس و خێرای لێهاتبوو کە لە مەنجەنیقێکەوە دەردەچێت. هەرکە نێزەی سوارە هەخامەنشییەکان بەر سەربازەکانی دوژمن دەکەوت، یەکراست دەیخستە سەر زەوی و دەکەوتنە بەر پێیەکانی ئەسپەکان.

بەڵام یۆنانییەکان تەنها بێ بەرگری نەوەستان و بەپەلە (تالیدۆس) فەرمانی کرد تا نێزەی درێژیان پێبگەیێنن، بەڵام نێزەکان درەنگ گەیشتە دەست ئەوان. سەربازە یۆنانییەکان پێشتر نەیانویست بوو خۆیان بە هەڵگرتنی نێزەی درێژ ماندوو بکەن، چونکە ئەو نێزانە رێگر دەبوو لەوەی بە ئاسانی جەنگ بکەن. سوارە هەخامەنشییەکان هێرشیان دەکردە سەر هەر دە ڤالانژ و پیادەکانیان دەخست و لەناو سەربازە کەوتووەکانی یۆنانی هەبوون کە لە دواساتەکاندا بە شمشێرەکانیان ئەسپەکانیان بریندار دەکرد و سوارەکەیان دەخست و ئەگەر نەکەوتبانە بەر پێی ئەسپەکە، دەکەوتنە جەنگ کردن لەگەڵ سەربازە هەخامەنشییەکە کە پیادە ببوو. ئەو رۆژە

سەربازانی یۆنانی زۆر بە کەمی بە نێزە کوژران و زۆرتر بە کەوتن و ژێرپێ کەوتنی ئەسپەکان مردن یا بریندار بوون و برینەکانیان وابوو کە نەتوانن لە جەنگ بەردەوامبن. سوارە هەخامەنشییەکان وەك لافاوێك بوون کە لە کێڵگەیەك بدات و دوای شەپۆلەکانی لافاوەکە، هیچی شایەنی باس لە ڤالانژەکان نەمایەوە.

ژمارەی سوارەکانی لەشکری داریوش نەزاندراوە و مێژوونووسە یۆنانییەکان دیسان زێدەڕۆییان کردووە و ئەوانیان بە سێ سەد هەزار سوار دیاریکردووە. ئەگەر هەر ئەسپێك لە شەو و ڕۆژێکدا پازدە کیلۆ کای پێویست بێت، ئەسپەکانی لەشکری داریوش (٤٥٠٠) تەن کایان پێویست بووە بۆ هەر ڕۆژێك و ئەو ئالیکە لە وڵاتی بێگانە دابین کردنی ئاسان نییە و گواستنەوەشی لە وڵاتی خۆیەوە بۆ داریوش کارێکی ئەستەم بوو.

گێمەنی ئاڵمانی پێیوایە ژمارەی سوارەکانی بەشداری ئەو هێرشە بوون، وەك ئەوەی گێمەن خۆشی متمانەی بەو ژمارە نەبووبێت، چونکە بۆ لێدانی سێ هەزار سەربازی پیادە ئەو هەموو سوارە بەگەر ناخەن، بەڵام چونکە یۆنانییەکان قەلغانیان لەبەر بوو داریوش دە هەزار سواری نارد و ئەو ژمارەیە دروست دێتە بەرچاو.

سوارەکانی داریوش دوای لەناوبردنی ئەو دە ڤالانژە، هێرشیان کردە سەر پشتەوەی لەشکری یۆنان و لە ماوەیەکی کەمدا جیاوازی توانای ئەوان و ڤالانژە یۆنانییەکان دەرکەوت، ئەوان بۆ پارە ببوون بە سەرباز و نە توانا و نە لێهاتوویی سەربازە یۆنانییەکانیان نەبوو، جگە لەوەش هەستی نەتەوەیی ئەوانیان نەبوو، هەروەها لە ڕووی پێداویستییە جەنگییەکانەوە وەك ئەوان نەبوون و بەرگی ئاسنین یا قەلغانیان نەبوو.

هەندێك لەوان داهاتیان باش بوو و توانی بوویان قەلغان بکرن، بەڵام زۆرینەیان قەلغانیان نەبوو و لەشکرێکی ئاوا ناتوانێت جەنگ لەگەڵ ئەو سوارە ئازایانە بکات. هەندێك لە ئەوان کوژران و هەندێکی تر کەوتنە ژێر دەست و پێی ئەسپەکان و هەندێکیشیان بۆ ئەوەی زیندوو بمێنن، شوێنی خۆیان جێهێشت و هەڵاتن. سوارەکان بێ وەرگرتنی یارمەتی لە پیادەکانی لەشکرەکەیان و لە ماوەیەکی کەمدا توانیان سەربازەکانی ئەو لەشکرەی لای شاری سارد وەستابوون یا لەناو ببەن یا ناچار بە هەڵاتن بکەن، کولامێش بێ یارمەتی پیادەکان توانی سەرکەوێت، بەڵام هێشتا ئەو ڤالانژانەی بەرانبەر دڵ و لای چەپی لەشکری داریوش دەجەنگان، مابوون و تالیدۆس کاتێك زانی بەشی دواوەی لەشکرەکەی شکستیان خواردووە و لەناو چوون، دەستبەجێ فەرمانی کشانەوەی دەرکرد.

خانتۆس مێژوونووسی لیدی دەڵێت ئەوکات (یوو) کەوتەدەست سوڵداتی هەخامەنشی. سەبارەت بە (یوو) ماوەیەك لە نێوان مێژوونووس و لێکۆڵەرەکان جیاوازی هەبوو و هەندێك باوەڕیان وابوو کە لادێ یا شارێکی بچووك بوو لە نێوان شاری سارد و ڤالانژەکانی یۆنانی، بەڵام دوای ئەوەی کەتیبەکانی داریوش و کەتیبەکانی تری هەخامەنشی خوێندرانەوە، زاندرا (یوو) بە مانای قووڵت دێت و مەبەستیان لە خەندەق و کاناڵە.

داریوشی یەکەم لە کەتیبەی میسردا لە بارەی هەڵکەندنی کەناڵی ئەو وڵاتە لە نێوان زێی نیل و دەریای سوور دەڵێت: (ئەو یۆوە بە فەرمانی من هەڵکەندرا.) لێرەدا یوو بە مانای کەناڵ دێت. زاندراوە کەتیبەکانی داریوش بە سێ زمانی (پەهلەوی، عیلامی و بابلی) نووسراون، بەڵام لەو کەتیبەیەدا زمانی میسری ئەوکاتیش هەیە و ئەو کەتیبەیە بۆتە کلیلێك بۆ خوێندنەوەی زمانی ئەوکاتی میسر.

بۆ تێگەیشتن لە مانای (یوو) کە لە نووسینی خانتۆسدا هاتووە، دەبێت بڵێین ئەگەر ئەوکات کەسێك چوو بایە شوێنی شاری سارد کە ئێستا ئاوایی (سێرت کالسی) لێیە و بەرەو ڕۆژهەڵاتی ڕوانیبوایە، دەیدیت زەوی لەو شوێنە تەختە، بەڵام کاتێك چووبایە پێشتر دەیدیت کە شوێنی ئاودڕی کۆن هەیە. نابێت چاوەڕوان بین دوای (٢٥) سەدە دۆخی زەوییەکانی ئەو شوێنە وەك ئێستا مابێت و (ئۆرۆزیۆن) واتە گۆڕانی جوگرافیان دەوروبەری ساردی تێك نەدابێت، ئەو گۆڕانە زەوی بەرزییەکانی نزم و نزمایییەکان تەخت دەکات و زەوییە کشتوکاڵییەکان دەگۆڕێت. دۆخی ئەو ناوچەیە ئێستا وەك دۆخی کاتی خانتۆس نەماوە و چارەنووسی شاری سارد چارەنووسێکی خەراپ بووە و لە مێژوودا زۆرجار وێران بووە و سەرلەنوێ ئاوەدان کراوەتەوە و هەموو جارێك خۆڵی دەوروبەریان بۆ دروستکردنەوەی بەکار هێناوە.

یۆنانییەکان لەساڵی (٥٠٠ پ. ز) ئەو شارەیان وێرانکرد و دواتر لە لایەن ئەسکەندەر و جێنشینەکانی سێ جاری تر وێران کرا و جاری سێیەم (ئان تیۆ کۆس) لە ساڵی (٢١٤ پ. ز) وێرانی کرد، ئەو لە نەوەکانی سەردارێکی یۆنانی بە هەمان ناو بوو کە دوای مردنی ئەسکەندەر بۆوە پاشای سوریا. ئان تیۆ کوسی سێیەم ساردی بە شێوەیەك وێرانکرد کە تەنانەت دیوارەکانی نەمان، بەڵام بە هۆی هەڵکەوتەی بازرگانی ئەو شوێنە، سەرلەنوێ بینا کرایەوە و دواجار لە ساڵی هەفدەی زایینی بوومەلەرزە بە شێوەیەك ئەو شارەی وێرانکرد کە بۆ هەتایە چاك نەکرایەوە.

چارەنووسی ئەو شارە ئەوەندە شووم بووە کە شلیمانی ئاڵمانی دۆزەرەوەی شاری (تروا) یا (ئیلیۆن و هەر گام) لە پەرتووکی (ام معروف) باسی ئەو شارەی کردووە، بەڵام باسی ترواى نەکردووە کە بیست و پێنج ساڵ بۆ دۆزینەوەی ئەو شارە لە بیابانەکانی رۆژئاوای ئاسیای بچووك گەڕابوو. تەواوی ناوەکانی کۆن بە مانا بوون جا بۆ شوێن یا بۆ مرۆڤ بەکارهاتبن و مرۆڤەکانی ئەوکات هیچ ناوێکیان دیاری نەکردووە کە ماناکەیان نەزانیبێت و ناتوانین کاتێك مانای ناوێکی کۆن نەزانین، بە بێ مانای ناو ببەین.

لە تەورات و ئنجیل بە پێی فەرهەنگی ئینگلیزی ئەوکتێبانە کە چاپی بەریتانیایە، هەشت هەزار ناو هەیە کە ناوی شوێن و کەسەکانن و هەموویان مانایان هەیە، ناوی تایبەتی بێ مانا لە تەواوی پەرتووکەکانی عتیق (تەورات و پەیوەستەکانی) و سەردەمی تازە (چوار ئنجیلەکە و پەیوەستەکانیان) نەبووە و هەندێ لە ناوەکان بە ڕادەیەك لەگەڵ کەسەکان یا شوێنەکان دەگونجێن کە ئەو وتەیەی دەڵێت: (الاسماء تنزل من السماء) واتە (ناوەکان لە ئاسمانەوە دێن) بە ڕاست دەگەڕێت.

سەبارەت بە ناوی شاری ساردیش مانای ناوی ئەو شارە دەقاودەق لە گەڵ چارەنووسەکەی دروستە، چونکە وشەی (سارد) بە واتای (ماتەم) دێت.

تالیدۆس فەرمانی پاشەکشەیدا و ئەو بیست ڤالانژەی مابوون، لە درێژایی رۆژهەڵات بۆ رۆژئاوا دەستیان بە کشانەوە کرد، بەڵام لە کاتی کشانەوەش کەسیان پشتیان نەکردە سەربازانی داریوش. ئایا تالیدۆسی فەرماندەی یۆنانییەکان نەیدەزانی سوارەکانی داریوش لە پشتەوەن و بەرەو رووی ئەوان دەچوو؟ تالیدۆس ئەو بابەتەی دەزانی بەڵام دەیەویست بگاتە ئاودڕەکەی پشت خۆی و لە ئەوێوە لەشکرەکەی ڕزگار بکات، بەڵام کاتێك گەیشتە ناو ئاودڕەکە بینی کە هەردوولای باکوور و باشووری لە لایەن سوارەکانی داریوشەوە گیراوە.

کولامێش دوای شکاندنی سەربازە بە کرێگیراوەکانی بەرەی پشتەوەی جەنگگە، تێگەیشت چوون بۆ شاری وێران و سووتاوی سارد لە رووی سەربازی هیچ بایەخی نییە و دەیزانی ئەو سەربازانە ناتوانن لە سارد بۆ خۆیان پێگەیەك بۆ بەرگری بدۆزنەوە، چونکە لە سارد شوێنێك بۆ بەرگری نەماوە و سەربازە یۆنانییە شکست خواردووەکانیش ورەیان بۆ جەنگ نەبوو، بۆیە گەڕایەوە تا لە پشتەوە هێرش بکاتە سەر یۆنانییەکان و کاتێك دیتی ئەوان لە ڕێگەی ئاودڕەکەوە دەتوانن دەرباز بن، باشوور و باکووری ئاودڕەکەی گرت و هەواڵی بۆ داریوش نارد کە بە نیازە هێرش بکاتە سەر یۆنانییەکان.

لەوکاتەدا تەواوی هێزی پیادەی داریوش کەوتبۆوە جەنگ لەگەڵ ڤالانژەکان، بەڵام وەك پێشتر وتمان بە هۆی نەبوونی چەکی ئاگرین، تەنها دوو تا سێ سەرباز دەیانتوانی لە گەڵ سەربازێکی دوژمن جەنگ بکەن و بە پێچەوانەوە ڕێگر دەبوون لەبەردەم یەکتری، بەڵام ئەگەر سەربازەکان زۆر بوانە دەیانتوانی دوژمنەکەیان ماندوو بکەن. سەربازەکانی داریوش ژمارەیان زۆر زیاتر بوو لە یۆنانییەکان و بە نۆرە جەنگیان دەکرد، بەڵام سەربازەکانی تالیدۆس کەم بوون و تا دەهات ماندووتر دەبوون و هێزی یەدەگیشی کە لە پشتەوە بوون لەناو چووبوون و کەس نەبوو بۆ پشوودانی ئەوان بکەوێتە جەنگ.

سەربازە یۆنانییەکان حەزیان لێبوو بەردەوام قەلغانەکانیان لووس و خاوێن بکەنەوە بۆ ئەوەی لە کاتی ریش تاشیندا، ڕۆمەتیان ببینن و لەکاتی جەنگیشدا بریسکەی قەلغانەکان چاوی سەربازی دوژمن ئازار بدات. جگە لەوە حەزیان لێبوو لە سەر کاسکێتەکانیان کاکۆڵ دابنێن و لە کاتی دەست نەکەوتنیدا، پەری کەڵەشێریان دادەنا و دواتر لەکاتی پێشکەوتنی پیشەسازی لە جیاتی پەری سروشتی، پەری دەستکردیان دەخستە سەر کاسکێتەکانیان و لە کاتی ئەو جەنگە سوودیان لە بەنی خوری یا لۆکە دیتبوو بۆ ئەوکارە، بەڵام ئەو رۆژە لە کاسکێتەکانیانەوە تا بەری لاقیان لە خوێندا بوو و قەلغانەکانیان لەبەر خوێنی وشکبوو، چیتر نەدەدرەوشایەوە.

روخساری تەواوی سەربازە یۆنانییەکانی ناو ڤالانژ بە خوێن نەخشابوو و ڕەش ببوو و هەموویان بەیەك شێوەیان لێهاتبوو و جیاوازی لە رووخساری گەنج و پیردا نەمابوو، هەر سەربازێکی یۆنانی دەکوژرا لە ناو ڤالانژەکەدا شوێنی پڕ دەکرایەوە و ڕێگە نەدەدرا شوێنیان چووڵ بێت. لەوانەیە کەوتن و مردن بۆ هەموو سەربازانی ڤالانژ لەو رۆژەدا بە مانای رزگاربوون بووبێت و ئەوان ئەوەندە ماندوو بوون کە لەوانەیە کەس لە نێوانیان نەبووبێت کە ئارەزووی مردن نەکات. ئەوان وەك سەرباز ئازاری برینەکانیان بە لایانەوە گرنگ نەبوو، بەڵام گەرمای هەتاو کە تەواوی جەستەی لەناو ئارەقەدا دەسوتاندن، بۆ ئەوان هەموو کات ئازاری توند بوون و هەموو کات چاوەڕوانی مردن بوون تا کۆتایی بەو ئازارانەیان بێت، بەڵام لەگەڵ هەموو ئەو دۆخە ناخۆشانەشدا بەردەوامبوون لە شمشێر وەشاندن.

لەپڕ سەربازە پیادەکانی هەخامەنشی کە لە رۆژئاواوە جەنگیان دەکرد، پەیوەندی خۆیان لەگەڵ یۆنانییەکان پچڕاند و یۆنانییەکان بە هۆی ماندوویەتی زۆریانەوە، نەیانتوانی بە خێرایی پاشەکشە بکەن و خۆیان دەرباز بکەن، ئەوان کشانەوە تا سوارەکان ڕێگەیان بۆ هێرش بۆ سەر

یۆنانییەکان هەبێت و سوارەکانیش کە لە شاری ساردی وێرانکراوەوە دەگەڕانەوە، هێرشیان کردە سەر ڤالانژەکان.

داریوش کاتێك دیتی یۆنانییەکان توانای خۆڕاگریان کەم بۆتەوە ویستی فەرمانی ڕاگرتنی جەنگ دەربکات، بەڵام کولامێش پەشیمانی کردەوە و وتی بە باوەڕی من ئەوان ئێستا ماندوون و توانای جەنگیان کەمبۆتەوە و ناتوانن تا ئێوارە جەنگ بکەن، ئەگەر بەردەوامبین لە هێرش کردن بۆ سەریان دەتوانین بە ئاسانی لەناویان ببەین، بەڵام ئەگەر جەنگ ڕابگرین و دەست بە دانووستان بکەین، لەوانەیە ئەوان وتووێژ درێژ بکەنەوە تا شەو دەگات و ئەوکات برینەکانیان دەرمان دەکەن و پشوو دەدەن و بۆ بەیانی دوژمنێکی حەساوە و ئامادە بۆ جەنگ دەبن.

ئەم وتەیەی کلاومێش کاریگەری لە داریوش هەبوو و داریوش لە ڕاگرتنی جەنگ پەشیمان بۆوە و دوای هێرشی سوارەکان بۆ سەر ڤالانژەکان، پەیوەندی ڤالانژەکان بەیەکەوە پچرا و لە یەك دوور کەوتنەوە، تا ئەوکات پیادەکان نەیانتوانی بوو بەوکارە هەستن و ڤالانژەکان بە گشتی بەیەکەوە بەرەو پێش یا بەرەودوا دەرۆیشتن، بەڵام هێرشی سوارەکان ئەوانی لێك جیاکردەوە و ئەوجار هەر ڤالانژێك بە جیا لەگەڵ سوارەکان دەجەنگان. دیمەنی کوژرانی بەردەوامی یۆنانییەکان ئەوەندە کاریگەری لەسەر داریوش دانا کە وێڕای ئامۆژگاری ئەفسەرەکەشی، فەرمانی ڕاگرتنی جەنگی دەرکرد و وتی ئەمە چیتر جەنگ نییە و تەنها مەڕ کوشتنەوەیە.

دوای ئەوەی فەرمانی ڕاوەستانی جەنگ گەیشت، یۆنانییەکان لە شوێنی خۆیان دانیشتن و هەندێکیان ڕاکشان و ئەوانەی ڕاکشان، هەندێکیان نەیانتوانی جارێکی تر هەستنەوە و مردن، ئەوان ئەوەندە ماندوو بوون کە نە دەیانتوانی مردووەکانیان ببەنەوە و نە بریندارەکان چارەسەر بکەن.

داریوش وتی پەیوەندی بە ئەو یۆنانیانەوە بکەن کە زیندوو ماون و ڕێکاری ئەسیر بوونیان ئامادەبکەن، بەڵام لە ناو یۆنانییەکاندا تالیدۆسی فەرماندەیان نەدەدۆزییەوە و دواتر لە کاتی خۆر ئاوابوون، لەناو بریندارەکاندا دۆزیانەوە. چونکە فەرماندەی دوژمن نەدۆزرایەوە، دەرکەوت ماوەیەك بوو یۆنانییەکان بە بێ فەرماندە جەنگیان دەکرد.

داریوش فەرمانی کرد برینی بریندارە یۆنانییەکان بپێچن و ئاو بدەن بە تینووەکان و خوردنیش بدەن بە ئەوانەی برسیانە و جارێکی تر ئازایەتی سەربازە یۆنانییەکان کاریگەری خستەسەر پاشای هەخامەنشی و بەزەیی بە ئەسیربووە شکاوەکاندا هاتەوە هەروەها فەرمانی کرد تا ژمارەیەکی زۆر پاسەوان لە مەیدانی جەنگەکە دابنێن تا مردووەکان و ئەو بریندارانەی یۆنانی، کە توانای جووڵەیان نییە لە دەست ئاژەڵەکان بپارێزن و نەهێڵن ببنە خۆراکی ئەوان.

کاتێك پاشای لیدی گەیشتە لای پاشای هەخامەنشی و شاری ساردی بە وێرانی دیت، گریا و وتی: بە داخەوە کە جوانترین شاری جیهان لەناو چوو.

داریوش وتی: من یارمەتیت دەدەم و نامەیەك بۆ مێندرۆ کێلس دەنێرم تا بێت و دەست بکات بە بینا کردنەوەی پایتەختەکەت. میندرۆ کێلس هەمان ئەو ئەندازیارە بوو کە پردی بۆ داریوش دروستکرد لە جەنگی سیتەکان.

کاتێك مێندرۆکێلس هات، نەخشەیەکی بۆ شارەکە دارشت و نەخشەکە دوای گەڕانەوەی داریوش لە شارەکانی ئلسیای بچووك درایە ئەو، لەو نەخشەیەدا درێژی و پانی شاری سارد پەنجا ئێستاد (دە کیلۆمەتر) دەبوو و دوو بابەت لەو شارە هەبوو کە جێی سەر سورمان بوون و بریتی بوون لە بۆریکێشی ئاو و تۆڕی زێراب. سەرسورماتەکەش لەوەوە دێت کە ئەو دوو بابەتە بە کارەکانی ئەو سەردەمە دەزاندرێت نەوەك بە کاری (٢٥٠٠ پ. ز)، لە کاتێکدا لە ی کریتی لە دەریای مەدیتەرانە (کە بەشێکە لە یۆنان) بە پێی ئەو پاشماوانەی بەردەست کەوتوون لە (٣٠٠٠ بۆ ٢٥٠٠ پ. ز) هەردوو بابەت هەبووە.

رۆژهەڵاتناسی فەرەنسی (بێنویست) دەڵێت پێش دەسەڵاتی هەخامەنشییەکانیش لە شارەکانی کەناری دەریای خەزەر تۆڕی زێراب هەبووە، لە وەرزی بەهار ئەوەی لە چاڵەکانی زێراب هەبووە هاتۆتەوە سەر زەوی و ئەوان زێرابیان کردووە تا ئەو پیساییە بگوازرێتەوە بۆ دەرەوەی شار.

لە ناوەڕاستی شار گۆڕەپانێك هەبوو کە پەرستگای خوای خەڵکە لیدی لێ دروستکرا، پەرستگاکە چوار گۆشە بوو و ئەوەندە بەرز بوو کە لە هەموو شوێنێکی ئەو شارەوە دیار بوو و هەموان لە هەموو شوێنێکی شار دەیاندیت. لە هەر چوار لاوە چوار شەقامی شار بە گۆڕەپانەکەوە دەبەسترایەوە و پێش تەواو بوونی شارەکە، لە هەردوولای شەقامەکان بە ڕیز نەمامی ئەو دارانەیان چاند کە لە سارد دەڕوا و پاش چەند ساڵێك کاتێك داریوش ئەو شارەی بە ئاوەدان کراوەیی بینییەوە، زۆر شادمان بوو.

دوای کۆتایی جەنگی سارد، دانیشتوانی شارە یۆنانییەکانی ئاسیای بچووك زۆر ترسان چونکە هاوکاری تالیدۆسیان کردبوو وتا لە گەڵ داریوش بجەنگێت و سەربازیان پێدابوو. یۆنانییەکان نەریتیان وابوو کە دوای سەرکەوتن لە جەنگ شارەکانیان وێران دەکرد و دانیشتوانی وڵاتەکەیان دەکوشت و چونکە نەریتی یۆنانییەکان دوای جەنگ بەو شێوە بوو، دانیشتوانی ئەو شارانەش وایان بیردەکردەوە کە داریوش بە هەمان جۆر لە گەڵ ئەواندا

دەجولێتەوە. بەڵام داریوش یۆنانی نەبوو، هەروەها لە سیاسەتدا بە رووناکبیر و راستی بێن دەناسرا.

یاساناسی فەرەنسی (فرانسوا ژێنی) کە لە سەرەتای سەدەی بیستەم مرد و بیروڕا یاساییەکانی لە هەموو شوێنێك متمانە پێکراوە (بۆ نموونە لە لای مامۆستایانی کولیجی مافی زانکۆی تاران)، نووسیویەتی: داریوشی یەکەم باوەڕی وابوو کە لێبوردەیی نە تەنها خەسڵەتێکە بۆ پاشاکان، بەڵکو هەندێکات بەشێکە لە ئەرکەکانی دەسەڵاتداری. بە هەمان هۆکار مۆنتسکیوی فەرەنسی و نووسەری پەرتووکی (روح القوانين) لێبوردەیی بۆ سەرۆکەکانی دەوڵەتان بە ئەرك لە دەسەڵاتداری داناوە و بەشێك لە پەرتووکەکەی تایبەت کردووە بەو بابەتە.

هەواڵیان گەیاندە داریوش کە خەڵکی شارە یۆنانییەکان لە ترسی کوژرانی پیاوان و ئەسیر کردنی ژن و کورە گەنجەکانیان بە دەستی ئەو لە هەڵاتندان. داریوش فەرمانی بە کولامێشی گەورە ئەفسەر کرد تا بە پەلە بڕوات و پێیان ڕابگەیێنێت کە داریوش ئەوانی بەخشیوە. کولامێش بۆ ئەوەی یۆنانییەکان بزانن کە بۆ جەنگ نەهاتووە، تەنها پێنج سواری لەگەڵ خۆیدا برد و بەرەو شارە یۆنانییەکان چوو و پەیامی داریوشی بە هەموو شارەکان گەیاند، یۆنانییەکان متمانەیان بە ڕاستی بێژی ئێرانییەکان هەبوو و بۆیە تەنها ئەو بەڵێنە بەلایانەوە گرنگ بوو و بڕوایان پێی دەکرد.

ئێراناسی ئاڵمانی (هارتمەن) دەڵێت: داریوش بۆیە دانیشتوانی شارە یۆنانییەکانی ئاسیای بچوکی بەخشی تا کینە لە نێوانیان نەمێنێت و لە نێوان یۆنان و هەخامەنشییەکان جارێکی تر جەنگ روونەداتەوە. بە وتەی هارتمان، داریوش دەیزانی هەر خوێن ڕشتنێك دەبێتە هۆی خوێنڕشتنی تر و پێویستە بۆ بەردەوامنەبوونی خوێنڕشتن لایەنێك لە لایەنەکانی جەنگ بوەستێت.

هیرۆدۆت نووسیویەتی: داریوش شارە یۆنانییەکانی لە ترسان بەخشی، چونکە دوای جەنگی سارد تێگەیشت جەنگ لەگەڵ یۆنانییەکان چەند قورسە.

بەشێك لەو وتەیە ڕاستە، داریوش دوای جەنگەکانی هالیس و سارد تێگەیشت یۆنانییەکان زۆر ئازاترن لەوەی بیری لێ دەکردەوە، بەڵام ئەو لە یۆنانییەکان نەترسا و بەڵگەش هەر نووسینەکانی هیرۆدۆتە سەبارەت بە هێرشی داریوش بۆ یۆنان و چوونی بۆ ئەسینا، ئەگەر ئەو لە یۆنانییەکان ترسابایە ئەو هەنگاوەی هەڵنەدەگرت.

کاتێك داریوش لە شارە یۆنانییەکان نزیك دەبۆوە، دانیشتوانی ئەو شارانە بەبێ هیچ ترسێك، دەروازەکانی شارەکانیان بەروویدا دەکردەوە و کچان جوان و کوڕانی قۆزیان دەناردە پێشوازی داریوش، بەڵکو داریوش ئەوان وەك دیاری وەربگرێت، بەڵام داریوش هیچ یەك لەوانی پەسەند نەکرد. لە شاری (هالیکارناس) خەڵك باوکی هیرۆدۆتیان کردە بەرپرس لە پێشوازی داریوش، بەڵام داریوش وەڵامی بۆ ناردن کە نایەوێت میوانی دانیشتوانی شار بێت و تەنها بۆ مەبەستی ڕێز نواندن بەرانبەر بە خوای خەڵکی شارەکە دێتە پەرستگای شار و هەمان کاری ئەنجامدا.

هالیکارناس یەك بووە لە شارەکانی ژێر دەستی ئێران(٦) و شوێنی لەدایك بوونی زۆرێك لە ناودارانی ئەو کاتی جیهان بۆ نموونە هیرۆدۆتە و هەموو ئەو ناودارانەی ئەوکات و بۆ نموونە هیرۆدۆت بە شوێنکەوتەی ئێران دەژمێردران، بەڵام مێژوونووسە یۆنانییەکان ئەو کارەیان نەکردووە و بە هۆکاری سیاسی ئەو شارەیان بە یۆنانی زانیوە.

گومانمان نییە خەڵکی هالیکارناس لە ڕووی ڕەگەزی و ئایینییەوە لە نەتەوەی یۆنان جیاواز نین، بەڵام لە ڕووی سیاسیەوە ئێرانی بووە و لە ساڵانی دوایی دەسەڵاتی داریوشدا کە ڕەگەزنامە لە ئیمپراتۆریەتی هەخامەنشی برەوی سەند، ئەوانیش بوونە هەڵگری ئەو ڕەگەزنامەیە.

دوای وەرگرتنەوەی وڵاتی لیدی لە یۆنانییەکان، شارە یۆنانییەکانی ئاسیای بچووکیش بەبێ جەنگ ڕادەست بوونەوە و بەخشران، وڵاتەکانی تری ئاسیای بچووکیش ئازاد کران و داریوش وەڵامی بۆ یۆنانییەکان نارد تا بۆ ئازادکردنی ئەسیرەکانیان هەنگاو بنێن و لە بەرانبەر نرخەکانیان بیانکڕنەوە و ئەگەر پارەی کڕینەوەشیان نییە، پێویستە پەیماننامەی ئاشتی مۆر بکەن. ئەسینا پرسیاریان لە مەرجەکانی ئاشتی کرد و داریوش وتی: مەرجمان

---

(٦) (ئەوکات دەوڵەتێك نەبووە بە ناوی ئێران و بە جوگرافیای ئێستای، تەنها ئیمپراتۆریەتی هەخامەنشی هەبوو کە جێگرەوەی مادەکان بوون و وەك نەریتی ئەوکات وڵاتانی تریان داگیر دەکرد و باجیان لێ دەستاندن، دەزانێت هیچ وڵاتێکی ژێر دەستە ڕەگەزنامەی ناگۆڕێت تا هی ئاسیای بچووك بێن بە ئێرانی لە لایەکی تر زەبیحوڵڵا بەردەوام ئەو شارانە بە شارە یۆنانییەکان ناو دەبات. زمانی شاری هالیکارناس فارسی یا هەخامەنشی نەبووە، بەڵام هاوکات بەشێك بووە لە ئاسیای بچووك و مەرج نییە یۆنانی بووبن. وەرگێر بۆ کوردی.)

بۆ ئاشتی ئەوەیە کە هێزی دەریایی هەخامەنشی لە شەش بەندەر لە بەندەرەکانی یۆنان سەربازگەیان هەبێت.

ئەنجوومەنی وڵاتی یۆنان کە پەرلەمانی ئەوکاتیان بوو و سەد ئەندامی هەبوو و کۆیلەکان لەو پەرلەمانەدا نوێنەریان نەبوو، ئەو پەرلەمانە مەرجەکانی داریوشی ڕەتکردەوە.

پەرلەمانی یۆنان ئەوکات لە سەد ئەندام پێکهاتبوو و هەر ئەندامێك نوێنەری دوو سەد هاووڵاتی بوو و ئەو دوو سەد کەسە نوێنەری خۆیان بە باشی دەناسی و نوێنەریش هەر دوو سەد دەنگدەری خۆی دەناسی. بەشێکی زۆر لەو دووسەد کەسە بریتی بوون لە ژن و منداڵ کە بۆ هەڵبژاردنی نوێنەری خۆیان، پەیرەویان لە دەنگی سەرۆك خێزانەکەیان دەکرد.

مێژوونووسی فەرەنسی (ئالبێر ماڵە) نووسیویەتی: هەر دوو سەد هاووڵاتی ئەسینا یەك نوێنەریان بۆ خۆیان هەڵدەبژارد، بەڵام ژن و منداڵ خاوەن دەنگی سەربەخۆ نەبوون و بۆیە هەر نوێنەرێك لە لایەن سی تا چل پیاو دیاری دەکراو هەموانی بە باشی دەناسی و ئەوانیش ئەویان دەناسی و بەردەوام پەیوەندیان بەیەکەوە هەبوو.

سیستەمی دیموکراسی ڕاستەقینە بە مانای دەسەڵاتی گەڵ بۆ گەڵ لەو وڵاتە پەیرەوی دەکرا، چونکە نوێنەر و دەنگدەر بە باشی یەکتریان دەناسی و هەموو دەنگدەرێك بە ئاسانی ئەوەی دەیویست بە نوێنەری خۆی دەووت، بەڵام لە سەردەمی ئێستا بۆ نموونە لە فەرەنسا بە ملیۆنەها دەنگدەر دەنگ دەدەن و بە بێ ئەوەی ئەو کەسەی دەنگی پێدەدەن بۆ تاکە جارێك لە نزیکەوە وتووێژیان لە گەڵ کرد بێت و تەنها ناوی لە ڕۆژنامە دەخوێننەوە.

ڕەتکردنەوەی پێشنیاری داریوش لە لایەن پەرلەمانی ئەسینا وەك ئەوە بوو تەواوی خەڵکی ئەسینا ئەو پێشنیارەیان ڕەتکردبێتەوە، چونکە جیاوازی نەبوو لە نێوان ویستی خەڵکی ئەسینا و پەرلەمانەکەیان.

دەوڵەتە شاری ئێسپارت پاشایەك هەبوو بە ناوی (ئافریداس) و پاشایەکی تر بە ناوی (توات)، (توات) پاشای دووەم بوو و جێ نشینی پاشای یەکەم بوو، بەڵام کوری پاشای یەکەم نەبوو. هەردوو پاشا بە هەڵبژاردن و لە لایەن دانیشتوانی ئێسپارت دیاری دەکران و دانانی پاشای دووەم لەبەر مەترسی کوژرانی پاشای یەکەم بوو لە جەنگ تا ئەگەر ڕووداوی بەم چەشنە ڕوویدا، وڵات بێ پاشا نەبێت. ئێسپارتییەکان وەك ئەسینا پەرلەکانیان نەبوو و لە بەرانبەردا ئەنجوومەنی پیرانیان هەبوو، ئەو ئەنجوومەنە لە بە تەمەنترین کەسانی هەر بنەماڵەیەکی ئێسپارتی پێکدەهات و لەو ئەنجوومەنە دەچوو کە عەرەبە قورەیشییەکان بە ناوی (دار الندوە)

هەیانبوو. بوون بە ئەندام لەو ئەنجوومەنە بە هەڵبژاردن نەبوو و تەنها بە تەمەنترین پیاوی بنەماڵەکە دەبوو بە ئەندام.

ئەنجوومەنی پیران و هەر دوو پاشای ئێسپارتی پێشنیاری داریوشیان ڕەتکردەوە، هەرچەند ئەوان هێزی دەریاییان نەبوو، بەڵام پشتیوانیان لە بەرژەوەندییەکانی دەوڵەتە شارەکانی یۆنان دەکرد. بە بڕوای ئەوان بوونی شەش سەربازگەی دەریایی بۆ هەخامەنشییەکان لە بەندەرەکانی یۆنان، پیلان بوو بۆ داگیرکردنی یۆنان و پێشنیار جەنگ بوو نەك ئاشتی و بۆیە نەدەبوو نەتەوەی یۆنان پەسەندی بکەن.

پێشتر یۆنانییەکان تەواوی هێزی دەریایی هەخامەنشیان لە دەریاکانی (مەرمەرە و ئێژە) کە دەریاکانی ڕۆژهەڵاتی مەدیتەرانە بوون، دەر کردبوو و بازرگانی هەخامەنشییەکان بە تەواوەتی لەو دەریایانە لە ناو چوو بوو، داریوش لە ڕێگەی ئەو پێشنیارەوە دەیەویست دەسەڵاتی هێزە دەریاییەکەی بەسەر ڕۆژهەڵاتی مەدیتەرانە و یۆناندا بچەسپێنێت. هەموو دەوڵەتە شارەکانی تری یۆنان پەیرەویان لە پێشنیاری ئێسپارت و ئەسینا کرد و ڕەتکردنەوەی ئەو پێشنیارە مانای دەستپێکی هێرشی داریوش بوو بۆ یۆنان، بۆیە هیزی دەریایی یۆنان بە درێژایی کەنارە ئاویەکاندا بڵاوبۆوە تا ئەگەر داریوش هێرش بکات، ڕێگە لە هێرشەکەی بگرن.

کاتێك داریوش هێرشی کردە سەر وڵاتی سیتەکان، هێزی دەریایی بەهێزی هەبوو کە بە تەواوەتی پشتیوانیان کرد، بەڵام ئەوجارە هێزی دەریایی نەبوو تا بتوانێت هێرش بکاتەسەر یۆنان و ئەوە تەنها یۆنانییەکان بوون کە وەیاندەزانی بە ڕەتکردنەوەی پێشنیارەکەی، داریوش هێرشیان بۆ دەکات، هەرچەندە داریوش نەیووتبوو ئەگەر مەرجەکەی ڕەتبکرێتەوە هێرش دەکات.

هارتمانی ئاڵمانی دەڵێت: دوای ئەوەی داریوش دەسەڵاتی یۆنانییەکانی لە ئاسیای بچووك نەهێشت، بیری کردەوە کە بە سوود وەرگرتن لەو سەرکەوتنە، بڕیاری سیاسی بەسەر یۆناندا بدات و بۆیە ئەو پێشنیارەی کرد بۆ ئاشتی و دانەوەی ئەسیرەکان، بەڵام دوای ئەوەی یۆنانییەکان مەرجەکەیان ڕەتکردەوە، تێ گەیشت کە تەنها بە هەبوونی لەشکرێکی بەهێز ناتوانێت هێرش بکاتە سەر یۆنان و پێویستی بە هێزی دەریایی هەیە بۆ ئەو مەبەستە. ئەو کێشەیەی ئەوکات داریوش هەیبوو هەمان ئەو کێشەیە بوو کە هیتلەر لە جەنگی دووەمی جیهانی ڕووبەرووی بۆوە، هەرچەندە هیتلەر بەهێزترین لەشکری جیهانی هەبوو، بەڵام نەیدەتوانی بە هۆی نەبوونی هێزی دەریایی لە دەریا بپەڕێتەوە و هێرش بکاتە سەر بەریتانیا.

دوای داگیرکردنی ئاسیای بچووك، هێزی دەریایی یۆنان تەواوی کەشتییە جەنگییەکانی هەخامەنشی لەناو برد و بەشێکی کەمیان توانیان ڕابکەن و لە قوبرس بنکە دابنێن و ئەوانیش ئەوەندە بەهێز نەبوون کە بتوانن پشتیوانی لەشکری داریوش بکەن لە پەرینەوەی بۆ خاکی یۆنان. هۆکارێکی سەرەکی هێرشی یۆنانییەکان بۆ سەر هێزر دەریایی داریوش، بە دەستەوە گرتنی بازرگانی دەریایی ناوچەکە بوو و ئەوان نەیاندەویست بە ئاسانی شەش سەربازگەی دەریایی بۆ داریوش دەستەبەر بکەن.

داریوش بە بیستنی وەڵامی نەرێنی یۆنانییەکان بێ دەنگی نواند و لە بەرانبەردا بە پەلە کەوتە پەروەردەکردنی مەلەوان و دروستکردنی کەشتی جەنگی. گەورەترین هێزی دەریایی یۆنان هی ئەسینا بوو و بەو هۆیەشەوە ئەو وڵاتە بە (ئاتیك) ناویان دەبرد، کاتێك داریوش ویستی هێرش بکاتە سەر ئەسینا تەنها هەفتا ساڵ بەسەر ئەو درەوشاوەییەدا تێپەڕدەبوو.

لە ئەسینا کۆڵان و بازار نەبوو و هەرکەس لە هەر کوێیەکی شار ویستبای خانووی دروست دەکرد، دانیشتوانی ئەسینا لە خەڵکی ئاسیای بچووك فێری دروستکردنی شەقام و کۆڵان بوون. لە سەرەتادا ئەسینا شار نەبوو و تەنها قەڵایەکی بچووك بوو لە سەر گردێك و ناوی (ئاکراپولی) بوو و دواتر لە دامێنی گردەکە خانوو کرا و شار دروستبوو.

لە سەردەمی داریوشی یەکەم گەورەترین بەندەرەکانی یۆنان لە ئەسینا بوون و ئەوان نەتەنها لە کەشتیوانی شارەزا بوون، بەڵکو بڕوایان وابوو کە هێزی دەریایی بەهێز کلیلی سەرکەوتن و خۆشبەختییە، ئەو بیرۆکەیە بەردەوام پشت ڕاست کراوەتەوە و (کارتاژ، ڕۆم، پۆرتوگاڵ، ئیسپانیا، هوڵند و بەریتانیا) گەورەیی و هێزی خۆیان لە دەریاوە بەردەست کەوت. لە ئێستادا کە هێزەکانی ناوەکی و مووشەکی و ئاسمانی جێگەی خۆیان کردووتەوە لە گرنگی هێزی دەریایی تا ڕادەیەك کەم بووتەوە و لە سەردەمانی نزیکدا بینیمان کە بەریتانیا گەورەیی و دەسەڵاتی خۆی بۆ ماوەی یەك سەدە بەسەر جیهاندا سەپاند بە هۆی هێزی دەریایی.

ئەسینا کە هێزی دەریایی بەهێزی هەبوو لە دەریاکان بەو هۆیە بەرگری لەخۆی دەکرد و لە وشکانی هاوپەیمانەکانی پاڵپشتی بوون. دەوڵەتە شارەکانی یۆنان بەردەوام بە پێی هەڵکەوتەی ئەو دەوڵەتە شارە پێویستیان بە هێزی دەریایی و زێر و پارەی ئەو وڵاتە بوو و لە بەرانبەریشدا ئەسینا پێویستی بە پاڵپشتی ئەوان لە وشکانی هەبوو و خۆشیان هێزی وشکانیان هەبوو.

دۆخی ئەسینا (ئاتیك) کە زۆرتر ناوی پایتەخت دەکەوتە سەر وڵات، زۆر لە دۆخی بەریتانیا دەچوو لە سەدەی نۆزدەهەم و نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم لە بەرانبەر ناپلیۆن

و هیتلەر, ئەسینا لە دەریادا زۆر بەهێز بوو و پارەی باشی هەبوو، تەنها یەك خاڵی لاوازی هەبوو و ئەویش دورگەی سالامین بوو. سالامین جەزیرەیەکە لە باشووری رۆژئاوای ئەسینا و تەنها پازدەهەزار دانیشتوانی هەیە، بەڵام لە سەردەمی داریوشی یەکەم دانیشتوانەکەی سەد هەزار کەس بوو و هەر هێزێك سالامینی گرتبایە لە توانای بوو کەنارەکانی رۆژئاوای ئەو وڵاتە بگرێت.

لەو جەزیرەیە جەنگی زۆر روویداوە، زێدەڕۆیی نییە بڵێین هەر بستێك لە خاکەکەی بە خوێنی سەربازێك ئاودراوە، چونکە وەك باسمانکرد ئەویٚ کلیلی کەنارەکانی رۆژئاوای ئەسینا بوو و هەر هێزێك ویستبای ئەسینا بگرێت، هێرشی دەکرد بۆ ئەویٚ و جەنگەکانی ئەو جەزیرەیە بە جەنگەکانی (سالامیس) ناسراون.

دۆخی ئەو جەزیرەیە لە دۆخی دورگەی ئۆکیناوای ژاپۆن دەچوو لە جەنگی دووەمی جیهانی و تەنها جیاوازی ئەوەیە کە دووری ئۆکیناوا زیاترە، لە جەنگی دووەمی جیهانیدا ئەمریکیەکان بیریان کردەوە کە بیٚ گیرانی ئۆکیناوا ناتوانن ژاپۆن بگرن. هەخامەنشییەکانیش بیریان کردەوە کە تاکە رێگە بۆ گرتنی ئەسینا بریتییە لە گرتنی سالامین و دواتر دەرکەوت ئەو باوەڕە دروست نییە، چونکە خەشایاری کوری داریوش ئەسینای گرت بەبیٚ ئەوەی لە سالامینەوە بڕوات.

داریوش توانی پرد لە گەرووی بۆسفۆر دروست بکات و لە رێگەیەوە بچێتە وڵاتی سیتەکان و لەویٚ دوو شار وێران بکات، ئەی بۆچی ئەو کارەی دووبارە نەکردەوە و لە دوای پەرینەوە لە بۆسفۆر لە جیاتی بەرەو وڵاتی سیتەکان بچێت، بەرەو باشوور و ناو یۆنان بچێت و بۆ کاتی خۆی بە سالامۆنەوە کوشت؟

لە وەڵامی ئەو پرسیارە هیرۆدۆت و گەزنەفۆن دەڵێن بە دوو هۆکار داریوش ویستی بە رێگەی سالامۆنەوە بڕوات، یەکەم دەترسا ئەوە بوو کە دوای ئەوەی دووچاری بەرگری یەکجار سەختی ڤالانژەکانی یۆنان بۆوە، دەترسا کە ئەگەر بە رێگەی باشووردا هێرش بۆ یۆنان بکات، لە هەنگاو بە هەنگاوی رێگەکە ئەو بەرگریەی بەرانبەر دەبێتەوە.

ئەگەر خەشایار توانی لە رێگەی باکوورەوە بۆ ئەسینا بچێت، بەو هۆیەوە بوو کە سوودی لەو دووبەرەکی نەتەوە یۆنانییەکان وەرگرت و ئەو ململانێیەی نێوان دەوڵەتە شارە یۆنانییەکان وایکرد کە خەشایار تەنها لە گەرووی تەرمۆبیل دووچاری جەنگ ببێت و لە هیچ شوێنی تر جەنگ روونەدا، بەڵام دەوڵەتە شارە یۆنانییەکان هەر دوازدەیان بۆ جەنگی داریوش هیچ

ناکۆکیان نەبوو، بۆیە داریوش ئەگەر لە ڕێگی باکوورەوە ڕۆیشتبایە بەرەو ئەسینا دەبوایە لە گەڵ هەر دوازدە دەوڵەتە گەورە و بچووکە یۆنانییەکان بجەنگێت و بە ڕێگەی دریاشدا تەنها پێویستی بە گرتنی سالامین بوو بۆ گرتنی ئەسینا.

بۆ تێگەیشتنی تەواو لەو بابەتە، خوێنەری بەرێز دەتوانێت نەخشەی یۆنان بگرێتە بەرچاو و لە هەڵکەوتەی سەربازی ئەو جەزیرەیە بەرانبەر ئەسینا تێ بگات و ببینێت کە ئەو دورگەیە بە چ شێوەیەك بەسەر کەنارە ڕۆژئاواییەکانی ئاتیکدا دەڕوانێت.

ئەمرۆ وێڕای ئەوەی دۆخی ستراتیژی سەربازی بە هۆی بوونی ئامێرە پێشکەوتووەکانی پەیوەندی و هێزی ئاسمانی لە بەرانبەر بیست و پێنج سەدە پێش گۆڕاوە، هەرکەسێك دورگەی سالامین بگرێت تەواوی کەنارە ڕۆژئاواییەکانی شاری ئەسینای پایتەختی یۆنان دەگرێت.

هۆکاری دووەمیش کە هیرۆدۆت و گەزنەفۆن بۆ هێرشی داریوش بۆ سالامین باسیان کردووە، ئەوەیە کە ئەگەر داریوشی یەکەم سالامینی گرتبایە چیتر هێزی دەریایی یۆنان نەیدەتوانی لە کەنارەکانی ڕۆژئاوای ئەسینا بەرگری بکات و تەنانەت یەك کەشتی یۆنانی نەیدەتوانی لەو کەنارانەدا بمێنێتەوە.

هێزی دەوڵەتە شاری ئاتیك لە هێزە دەریاییەکەی بوو و ئەگەر داریوش سالامینی گرتبایە، هێزی دەریایی ئەسینا ناچار دەبوو بە تەواوەتی کەنارە ڕۆژئاواییەکان چووڵ بکات و ئەوکات لە هەنگاوی دووەمدا داریوش ئەسینای دەگرت و تەواوی بەندەر و کارخانەکانی کەشتی سازی ئاتیك دەکەوتنە بەردەستی داریوشی یەکەم.

ئێمە بۆ زیاتر ناسینی دۆخەکە تا ڕادەیەك بە درێژی باسمان لە دۆخی سەربازی و ستراتیژی سالامین کرد تا دەربکەوێت کە بۆچی داریوشی یەکەم بڕیاریدا دورگەی سالامین کە دەکەوتە ڕۆژئاوای ئەسینا و لە سەر ڕێگەی ئەو بوو، داگیر بکات.

مێژوونووسانی سەدەی نۆزدەهەم و بیستەم کە لە بابەتە دەریایی و ستراتیژییەکان بێ ئاگا بوون، دووچاری سەرسوڕمان دەبن کە داریوشی یەکەم کە لە توانایدا بوو لە ڕۆژهەڵاتەوە بچێتە ناو یۆنان، پێداگری دەکرد کە بە دەورەی یۆناندا بسوڕێتەوە و دورگەی سالامین لە ڕۆژئاوای ئەسینا بگرێت و لە ڕۆژئاواوە بپێتە ناو یۆنان. ئەو باسەمان بۆیە هێنایە کایەوە تا ئەو بابەتەی بە درێژایی سەدەی نۆزدەهەم و بیستەم لە بەرچاوی مێژوونوسەکانی یۆنان و ئێرانی کۆن وەك ڕازێك دەردەکەوت و دیار نەبوو، ڕوون ببێتەوە.

داریوشی یەکەم بە درێژایی ساڵانی (٤٩٥ و ٤٩٤ پ. ز) سەرگەرمی دروستکردنی کەشتی و پەروەردەکردنی مەلەوان و جەنگاوەرە دەریاییەکان بوو تا بتوانن لە دەریادا جەنگ بکەن، چونکە وەك دەزانن ئەو سەربازەی لە کەشتیدا دەجەنگێت، لە شوێنێك دەجەنگێت کە جیاوازە لەگەڵ زەوی.

زەوی ناجولێتەوە و جێگیرە، بەڵام کەشتی تەنانەت ئەوکاتە وەستاوە، دەجووڵێتەوە و سەرباز پێویستە لە گەڵ ئەو جووڵانەوەیە ڕابێت تا گێژ نەبێت و نەکەوێت. گۆڕەپانەکانی جەنگی وشکانی پان و بەرینن و گۆڕەپانی جەنگی دەریایی بچووك و سنووردارە و لەو شوێنە بچووکەدا سەدان سەرباز بەیەکەوە دەجەنگن و هەر سەربازێك شان لە شانی سەربازی تر جووت دەکات. لە گۆڕەپانی جەنگی دەریایی، شوێنێك نییە بەناوی دەرەوەی جەنگ و شوێنێك نەبوو کە برینداری بۆ بکشێتەوە و بۆ ئەوەی بریندار نەبێتە ڕێگر، هەڵیدەدەنە ناو دەریا یا دەیکوژن. لە جەنگی دەریایی ئەسیر بێ مانایە و لە کەشتییەکاندا هەموان یەکتر دەکوژن و لایەنی براوە ئەوەیە کە هەموو سەربازەکانی بەرانبەر بکوژێت.

داریوشی یەکەم سەربازەکانی بۆ ئەو جۆرە جەنگانە پەروەردەدەکرد و سەربازەکانی هەموو ڕۆژێك لەسەر کەشتییەکان سەرگەرمی ئەو ڕاهێنانە بوون

کاتێك باس لە کەشتی جەنگی دەکرێت لەوانەیە وەك ئێستا بیر بکرێتەوە کە جیاوازی زۆر بێت لە گەڵ کەشتییە بازرگانییەکان، بەڵام لە ڕاستیدا جیاوازییەکان زۆر کەم بوون و لە کەشتی جەنگیدا ژمارەی سەڵبەچییەکان زۆرتر بوون و لە کەشتی بازرگانی سەڵبەچییەکان کەمترن. گەورەترین جیاوازی کەشتییە جەنگییەکان لەگەڵ کەشتییە بازرگانییەکان ئەوە بوو کە کەشتییە جەنگییەکان سەربازیان دەگواستەوە و بازرگانییەکان بێ سەرباز بوون. کەشتییە جەنگییەکان لە سەردەمی یۆنان و هەخامەنشیدا قەبارەیان زۆر گەورە بوو و لە سەردەمانی دواتردا بچووکتر بوونەوە.

لە سەردەمی نوێبوونەوە (ڕۆنێسانس) و لە نیوەی دووەمی سەدەی پازدەهەم، دەریاوانە پورتۆگاڵی و ئیسپانییەکان بۆ دۆزینەوەی خاکە نەناسراوەکان سوودیان لەو کەشتیانە وەردەگرت کە دوو سەد تا دوو سەد و پەنجا کەسی دەگرت، بەڵام لە سەردەمی یۆنان و هەخامەنشیدا کەشتییەکان هەزار کەسیان هەڵدەگرت و هەندێجار تا هەزار و پێنج سەد کەسیان تێدابوو.

ئەو کەشتییە باریك و درێژ بوون تا ئاسانتر ئاوەکان شەق بکەن و خێرا و ئاسانتر بڕۆن و کەشتییە جەنگییەکانی ناسراو بە (گالێر) کە لە سەدەکانی شازدە و هەڤدەی زایینی

دروستکران و بە تایبەتی دەریاوانە عوسمانییەکان زۆر هۆگریان بوون، لە سەر نموونەی کەشتییە جەنگییە کۆنەکانی هەخامەنشی و یۆنانی دروست دەکران و شێوەی دانیشتنی سەڵبەچییەکان و شێوەی سەڵبەلێدانەکانیان، لێکچووە بە هەمان دۆخ کە لە کەشتییە هەخامەنشی و یۆنانییەکان هەبوو.

کارخانەکانی کەشتی سازی کە بۆ داریوش سەرگەرمی کار بوون لە دەریای مەرمەرە تا نزیك میسر هەبوون و لە ساڵانی نێوان (٤٩٥ پ. ز) تا مردنی داریوش، نزیکەی شەست تا هەفتا هەزار کرێکار کاریان دەکرد. بە وتەی گەزنەفۆن داریوش بۆ هەر کارخانەیەك ماوەیەکی بۆ دروستکردنی کەشتی دیار کرد بوو و هەر یەکەیان ڕاسپێردرابوون تا یەك یا دوو پارچەی کەشتی دروست بکەن و هەندێکیان شەوانەش کاریان دەکرد تا بتوانن بەرهەمیان زیاتر بێت.

شێوازی دروستکردنی کەشتی لەو کارگانە هەر هەمان بوو کە ئێستا لە کارگەکانی گەشتی سازی هەیە و پارچەکانی کەشتی یەك بەدوای یەکدا بەیەکەوە دەلکێندران. پارچەکانی ئێستای کەشتییەکان لە پۆڵان و بە لحیم لەیەك دەبەستران و پارچەکانی کەشتییەکانی ئەوسا لە دار دروست دەکران و دواتر بە بزمار لێك دەدران و دواتر بە کەرەستەی تایبەت رووپۆش دەکران تا زوو لە ناو نەچن.

(هێنری کایزەر) لە جەنگی دووەمی جیهانی و لە ئەمریکا نموونەیەکی بچووکی بۆ کەشتییەکی دە هەزار تەنی دروستکرد و دواتر بە دووسەد پارچەی کرد و بەسەر کارخانەکانی ئەو وڵاتەدا بڵاوکرانەوە تا کەشتیان لە سەر دروست بکرێت و بەم شێوەیە لە کاتەکانی کۆتایی ئەو جەنگە، ڕۆژانە دووسەد کەشتی دە هەزار تەنیان دروست دەکرد.

ئەوکات ئەمریکا لانی کەم سەد هەزار ئەندازیاری لێهاتووی هەبوو، بەڵام نەیانتوانی رێگە چارەیەك بۆ رێگرتن لە کەشتییە ژێر دەریاییەکانی ئاڵمان بدۆزنەوە، بەڵام (هێنری کایزەر) ئەو کارەی کرد و بۆوە هۆی ئەوەی خێرایی دروستکردنی کەشتی لە ئەمریکا رێگر بێت لە شکست و تا ئاڵمانەکان بە هۆی ژێر دەریاییەکانیانەوە زیاتر کەشتیان نوقم دەکرد، زیاتر کەشتی ئەمریکی ئامادەدەبوو.

لە سەردەمی داریوشی یەکەمدا شێوازی کەشتی سازی هەر وەك ئەوەیە کە ئێستا لە ژاپۆن و ئاڵمان و وڵاتەکانی تر هەیە و پێشتر ماکێتیان (نموونەی بچووك) بۆ دروست دەکرد و دواتر کەشتیان بە پێی پارچەکانی ماکێتەکان بەڵام بە پێوەری گەورەتر ئامادەدەکرد و بەیەکیانەوە دەبەستن.

مێژوونووسی بەناو بانگ (ئاریان) لە زمانی کەشتی سازێکەوە دەڵێت، دروستکردنی کەشتی زۆرتر لە دروستکردنی بینایەکی گەورە زەحمەتی هەبوو، لە بینادا ئەگەر ئەندازەکان کەمێك هەڵەیان تێدا کرابایە، شتێکی ئەوتۆ روویندەدا، بەڵام ئەگەر لە کەشتی ئەندازەکان کەموکورتیان تێدا بوایە، ناچار دەبوون دووبارە دروستی بکەنەوە و بۆیە جێگەی سەرسوڕمان نییە کە داریوش بۆ هەندێ کارخانە تەنها دروستکردنی یەك کەشتی ڕاسپاردبوو.

لە زستانی ساڵی (٤٩٤ پ. ز) هێزی دەریایی داریوش بە رادەیەك بەهێز ببوو کە ئەو خۆی بە ئامادەیی بینی بۆ هێرش کردنە سەر یۆنانییەکان و بڕیاریدا تا لە بەهاری ساڵی دواتر واتە (٤٩٣ پ. ز) هێرش بکاتە سەر یۆنانییەکان.

# جەنگی دەریایی سالامین

باسی ئەو جەنگە لە کەتیبەی بێستووندا نییە، چونکە کەتیبەکە لەساڵی (٥٠٠ پ. ز) نووسراوە و جەنگی سالامین لە ساڵی (٤٩٤ یا ٤٩٣ پ. ز) بووە.

داریوش بە هۆی ئەو حەزە زۆرەی بۆ نووسینەوەی کەتیبەکان هەیبوو و حەزی کردووە ڕووداوە گرنگەکانی سەردەمی خۆی بۆ خەڵکانی داهاتوو بنووسێتەوە، بۆیە لەوانەیە ڕووداوەکانی ئەو جەنگەشی لە گەڵ یۆنانییەکان لە کەتیبەکاندا نووسی بێت، بەڵام هێرش بەرەکان هەموو کەتیبەکانی ئێرانیان لەناو بردووە و نەیانهێشتووە کەتیبەکانی تری داریوش بمیننەوە. زاندراوە شوێنی کەتیبەی بێستوون بە شێوەیەك بووە کە دەستی هێرشبەرانی پێنەگەیشتووە، بۆیە لەناو نەچووە.

جەنگی داریوش لە دورگەی سالامین یەکەم جەنگی ئەو دورگەیە کە بە ناوی دورگەکە تۆمار کراوە و بە هۆی شوێنی ستراتیژی ئەو دورگەیەوە، کۆمەڵێك جەنگی تر لەوێ ڕوویداوە کە گرنگترینیان لە مێژووی یۆنانییەکاندا جەنگی خەشایارشای کوری داریوش بووە لەگەڵ یۆنانییەکان لەو دورگەیە و گرنگی ئەو جەنگە دەریاییە لە مێژووی یۆنانییەکان بۆ ئەوان لەوەدایە کە تەواوی هێزی دەریایی خەشایار لەو جەنگەدا لە ناو چوو.

داریوش بۆ هێرشەکەی بۆ سەر سالامین، دورگەی کریتی وەك ناوەند بۆ کۆکردنەوەی هێزی دەریایی خۆی دیارکرد، کریتی لە سەردەمی کوروشەوە لە گەڵ ئێرانییەکان دوست بووە و لە ساڵی (٤٩٤ یا ٤٩٣ پ. ز) پاشاکەی ناوی (تالید) بوو کە دۆستی داریوش بوو و بانگهێشتی داریوشی کرد تا بچێت بۆ بینینی (گابازی) کوران و کچانی ئەو جەزیرەیە[١].

---

(١) (گابازی کچانی کریتی لە هونەرە دیارەکان ژنانی ئەوکاتی دنیا دەژمێردرا و زۆر پێش گابازی ئیسپانیاییەکان دەرکەوت، چونکە ئیسپانیاییەکان بە شمشێر لە مەیدانی گابازیدا گای نێریان دەکوشت، کچە

کەشتییەکانی داریوش دوای ئەوەی دروست و ئامادەدەکران، بەرەو دورگەی کریتی دەرۆیشتن.

ئەو کەشتیانە لە کارگە جۆراوجۆرەکانی رۆژهەلاّتی نزیك دەردەچوون و دوای ئامادەکردنی هەر کەشتییەك، ئەوانیان بە مەلەوان و ئەفسەر و کەرەستەی جەنگی پڕ دەکردن و ئەوکات دەستە دەستە بۆ کریتی رەوانیان دەکردن، چونکە ئەوانەی بە تەنها رەوان دەکران دەکەوتنە مەترسی تووش بوونیان بە هێزی دەریایی یۆنان و نوقم بکرێن.

کاتێك بیردەکەینەوە کە تا چ رادەیەك پێویست بووە رێککاری و عقلمەندی بەکاربێت تا بتواندرێت لە دونیای کۆن هێزێکی دەریایی لە دورگەیەك جێگیر بکرێت، ستایشی ئەو هەموو رێکخستنانە دەکەن.

هاوکات لەگەلّ ئەوەی کریتی بوو بە پێگەی دەریایی داریوش، پارێزگاری لەو جەزیرەیەش لەبەر مەترسی ئاگادار بوونەوەی هێزی دەریایی یۆنان و هێرش کردن بۆی، زۆر پێویست بوو. فەرماندەیی کۆکردنەوە و ئامادەکردنی هێزی دەریایی هەخامەنشی لە دوورگەی کریتی و بردنی ئەو هێزانە بەرەو یۆنان، سپێردرا بە فەرماندەی دەریایی هیست ئەسپ. چونکە هیست ئەسپ چەندین جار لە مەیدانی جەنگ لێهاتوویی خۆی سەلماند بوو و داریوش متمانەی تەواوی بەو هەبوو.

دەریاسالاری هەخامەنشی یەکەم رۆژی هاوین واتە مانگی حوزیرانی بۆ هێرش بۆ سالامین دیاریکرد، چونکە لە زستاندا جەنگی دەریایی دەوەستا و لە بەهاریشدا کەشی مەدیتەرانەی رۆژهەلاّت کە ئەوکات بە ناوەکانی دەریای سوریە یا دەریای میسر یا دەریای سپی ناو دەبرا، هەم زۆر گەرم دەبوو و هەم شەپۆلی بەردەوامی دەبوو، بۆیە سەرەتای هاوین بۆ ئەو جەنگە دیاریکرا. لە سەرتای هاوین هێزی دەریایی داریوش کە پێکهاتبوو لە هەشتا کەشتی گەورە و نزیکەی بیست کەشتی بچووك لە دورگەی کریتی کەوتەرێ.

هەر کەشتییەك تەنها یەك ئەستوونی بۆ ڕاگرتنی چارۆکە هەبوو کە چارۆکەیەکی زۆر گەورەی لێ هەڵدەواسرا. ئەو چارۆگەیە ئەوەندە پان بوو کە کاتێك هەڵدەدرا لە سەرەتا تا کۆتایی کەشتییەکەی دەگرت و تەنها ئەو چارۆکەیە لە کاتی بوونی با بۆ جولاّندنی کەشتییەکە

---

جوانەکانی کریتی لە مەیدانی گابازیدا شمشێریان لانەبوو و بە بێ چەك لەگەلّ گای نێر یاریان دەکرد و بە دەستەکانیان هەردوو قۆچی گایان دەگرت و بەسەریدا بازیان دەدا و تقلّەیان لەسەر لێدەدان و ئیسپانییەکان ئەوکارەیان پێ نەدەکرا، زەبیحوللاّ.)

بەس بوو. بەڵام کەشتییە یۆنانی و ئێرانییەکان بە پلەی یەکەم پشتیان بە سەڵبەلێدان دەبەست و چارۆکە تەنها بۆ یارمەتی سەڵبەچییەکان بوو و لەکاتی جەنگدا چارۆگەکە و بورجە ئاسۆییەکەیان نەوی دەکرد و لە درێژایی کەشتیدا دەیان خەواند، چونکە لەجەنگدا چارۆگە گرفتی دروست دەکرد و بە تایبەتی لەکاتی هەڵدانی ئاگر، زوو ئاگری دەگرت و بۆیە نەوییان دەکرد تا نەسوتێت.

هەرچەندە ئەوکات کەشتییەکان بە گشتی لەدار دروستدەکران، بەڵام زۆر زیاتر لە کەشتییەکانی ئێستا لە بەرانبەر ئاگردا پارێزراو بوون و ئێستا لە کەشتییەکان بە تایبەتی لە نەوت هەڵگرەکان لەوانەیە تەنها یەك بریسکە ئاگر بخاتەوە، بۆیە لەکاتی بارکردنی نەوتدا رووی سەرەوەی کەشتی بە ئەستووری دوو سانتیمەتر بە ئاو دادەپۆشن، لە کەشتییە کۆنەکاندا مەترسی ئاگرکەوتنەوە بە رۆن و نەوت و بەنزین و... هتد نەبوو و تەنها کاتێك تیری ئاگرین دەهات، تیرەکەیان بە مەقاش هەڵدەگرتەوە و هەڵیاندەدایە ناو ئاو تا ئاگرەکە لەناو بچێت. لە کاتی ئاگر کەوتنەوە لە کەشتیدا، هەموو سەرنشینەکانی شوێنە جیاکانی کەشتی بە گشتی نەدەکەوتنە ئازاری گەرما و بە پێچەوانەوە لە کەشتییەکانی ئەو سەردەمە کە لە ئاسن و پۆڵان، هەموو شوێنەکان بە رادەیەك گەرم دەبن کە سەرنشینەکانی ناو کەشتی بۆ رزگاربوونیان لە دەست گەرما ناچارن خۆیان بخەنە ناو دەریا.

بەڵام ژیان لە کەشتییە کۆنەکاندا لەچاو کەشتییەکانی ئەمرۆ زۆر سەخت بوو و کەشتییەکانی ئەوکات لە ژێر دەریایی ئێستا دەچوون و لەناویاندا شوێنی چووڵ دەست نەدەکەوت و سەرنشینەکانی ناو ئەو کەشتیانە وەك ماسییەکانی ناو قوتو بە گشتی بە یەکەوە دەنووسان، هیچ کەس لەناو کەشتییەکانی ئەوکات و تەنانەت فەرماندەی کەشتییەکەش ژیانی تایبەتیان نەبوو و ئاشکرایە کە کاتێك کەسەکان خاوەن ژیانی تایبەت نەبن، جیاوازی لە هەڵسوکەوت و ویستەکان دەبنە هۆکاری کێشە و بێ بایەخترین کێشەکان لەوانەیە تاوان و کوشتنیان لێ بکەوێتەوە. بۆیە لە کەشتییە جەنگییەکانی هەخامەنشی و یۆنانی یاساکان زۆر توند بوون و هیچ پێشیلکاریەك بێ سزا نەدەبوو.

کاتێك لەشکری دەریایی هەخامەنشی لە دورگەی کریتی کەوتەرێ، دەریا سالار هیست ئەسپ فەرمانی کرد تا سێ کەشتی وەك پێشەنگ لە پێشەوە برۆن تا ئەگەر لەشکری دەریایی یۆنانیان دیت، بە ئیشارە ئەوان ئاگادار بکەنەوە و کەشتییەکانی تریش لە ریزی چواریدا

بەدوای یەکدا کەوتنەڕێ و هەر کەشتییەك کە دەکەوتە دوای ئەوی تر، کەمێك لە لای چەپی ئەوی ترەوە دەڕۆیشت تا لە کاتی وەستاندا دووچاری بەریەك کەوتن نەبن.

کەشتییەکان لە دەریادا لە کاتی ڕۆیشتندا لەپڕ دەوەستان و ئێستاش کە لە دەریاکاندا هەزاران کەشتی هەیە، هێشتا دەریا ئەوەندە پان و بەرینە کە کەشتییەکان ناچار نین لەپڕ بوەستن. ئەمرۆ بۆ وەستاندنی لەناکاوی کەشتی لەناو دەریادا، پانکەکانی کەشتی کە لە پشتەوەن بە پێچەوانەوە دەسورێننەوە، لە کۆندا بۆ وەستاندنی کەشتی بە خێرایی، سەڵبەچییەکان بە پێچەوانەوە سەڵبەیان لێدەدا و لە یەك ساتدا جووڵەی کەشتی دەوەستا.

لە سەر ئەستوونی کەشتییەکان (داڵ) هەڵواسرابوو و لە پێشەوەی کەشتیش سەری ئەسپ دروستکرابوو کە هەردووکیان بە ئاڵا و نیشانی ئێران (هەخامەنشی) دەژمێردران. ئاڵای ڕەنگاوڕەنگی هاوشێوەی ئێستاش هەبوون، بەڵام وەك نیشانی نەتەوەیی بەکار نەدەهاتن، بەڵکو لە دەریادا کەشتییەکان لە ڕێگەی بەکارهێنانی هێمای ڕەنگاورەنگ بەیەکەوە دەدوان و چونکە ئەو بابەتە لە مێژووەکانی مێژوونووسە یۆنانییەکاندا هاتووە زۆر بەناوبانگە و سەبارەت بەو بابەتە نادوێین و هەر ئەوەندە دەڵێین کە لە سەرەتای مێژوو واتە مێژووی نووسراو کە ئێستا بەردەستە، ئاڵا ڕەنگاورەنگەکان چ لە وشکانی یا لە دەریا هێماکانی پەیوەندی بوون و بریتی نەبوون لە نیشانە فەرمییەکانی پاشایەتی یا نەتەوەیی.

چونکە لە کەشتییە جەنگییەکان کەس ژیانی تایبەتی نەبوو، بۆیە گرفت نەدەبوو و تەنانەت ئەوان لە رووی پاك و خاوێنیش لە دۆخی باش نەبوون. بەڵام کەشتییە جەنگییەکانی ئێستا بە مانای وشە (ساناتاریۆم) ن و لە هیچ یەك لەو کۆمەڵگایانەی بۆ ژیانی بە کۆمەڵی مرۆڤەکان هەیە، پاك و خاوێنی وەك ناو ئەو کەشتییە جەنگیانە نییە. جل شۆر لە کەشتییەکان هەیە و بە هەڵمیش ئوتوی جلوبەرگەکان دەکرێت و هەر کەس و لە هەرکاتێك بیەوێت دەتوانێت حەمام بکات و هەموو رۆژێك ئەفسەری تایبەت، پشکنین بۆ دەریاوانەکان بە گشتی دەکات لە رووی پاك و خاوێنی.

بەڵام لە کەشتییە کۆنەکاندا ئامرازەکانی پاك و خاوێنی نەبوون و جل شۆر و حەمام نەبوو و کەس لە ژووری تایبەت بە خۆی نەدەنووست و کاتێك کەشتە دەکەوتە جووڵە زۆربەی سەرنشینەکانی کەشتی لەوانە بوو تا گەڕانەوە نەتوانن بەرگەکانیان بۆ یەکجار بگۆڕن یا تەنانەت بیانشوون. ئاشکرایە کە لە کەشتییەکدا کە هەرگیز جەستەیان نەشوون، زیندەوەرە و مێشوولەی جۆراوجۆر دەردەکەون و نەخۆشی وەك تیفۆئیدیش دەردەکەون و هەزاران کەس دەکوژن.

ڕۆماننووسە هاوچەرخەکان کاتێك باس لە کەشتییە جەنگییەکانی ئەوکات دەکەن بە شێوەیەك دەیانناسێنن کە وەك کەشتی فریشتەکان وابوونە و لە تابلۆی وێەکاری (بووتی چێلی) ئیتالیایی بە هێزی با و لە سەر هەورەکان دەجوولێن و فریشتەکان لەناویاندا میوزیك و دەف لێ دەدەن، بەڵام ئێمە مێژوو دەنووسینەوە و رومانووس نیین تا بە شێوەیەك کەشتییە جەنگییەکان بناسێنیین کە بە خوێنەر حەز و ئارەزوو و خۆزگەی بێت کە لە ناو ئەو کەشتیانەدا بژیات.

ئێمە دەڵێین ژیان لە کەشتییە جەنگییەکانی ئەوکات بە بەراورد لە گەڵ ئێستا بۆ ئەوکەسانەی ژیانی ئاساییان هەیە وەك جەهەننەم بوو، بەڵام سەڵبەچی و ئەوان ئەوکات لەگەڵ ئەو ژیانە جەهەننەمییە ڕاهاتبوون. بۆ ئەفسەر و سەرباز و سەڵبەچییەکانی کەشتییە جەنگییەکانی کۆن لەو کەشتیانەدا خۆشی هەبوو، بۆیە زۆرتر رایاندەبووارد و گۆرانی و نوکتەبازییان دەکرد و کەمتر وابوو کە دەنگی پێکەنی لە لایەك بۆ لاکەی تری کەشتی نەروات.

لەو ژیانە جەهەننەمییە تەنها یەك شت رێك و باش بوو و ئەویش خۆراکی ئەوان بوو، چونکە ئەفسەرەکان دەیانزانی تاکە شتێك کە دەبێتە هۆی ورەبەخشین بە سەرباز و سەلبەچییەکان، خواردنی باش و لەکاتی خۆیدایە و ئەوانەی لە کەشتی جەنگیدا بوون جگە لە خواردنی خۆش، هیچ ئارەزوو و ئۆمێدی تریان نەبوو.

ئەوان بۆ جەنگ دەچوون و نەیاندەزانی دوای جەنگ زیندوو دەمێنن یا دەمرن؟ ئەگەر زیندوو مابان لە مووچە زیاتریان دەست نەدەکەوت، چونکە پێچەوانەی سەربازانی هێزی وشکانی هیچ ئامرازێکیان بۆ پاتال کردن نەبوو. لە دەریادا شتێك بۆ تالان دەست نەدەکەوت و لە جەنگدا ئەگەر سەرکەوتوو بووانە لە کەشتی دوژمن هیچیان دەست نەدەکەوت کە بۆ تالان و بردن ببێت.

جەنگەکانی دەریا سەخت و بێ بەزەیی بوون و کەس ئۆمێدی نەبوو کە زیندوو بمێنێت و تەنانەت زۆربەی ئەوانەی زیندوو دەبوون، کەم ئەندام دەبوون و بۆیە تاکە خۆشی بۆ ئەوان تەنها ژەمەکانی خۆراك بوو. ئەفسەرەکانیش هەروەك سەرباز و سەڵبەچییەکان خۆیان بە ئۆمێدی خواردنی باش دڵخۆش دەکرد و لە کەشتییە جەنگییەکانی ئێراندا رۆژانە دووجار خواردنی باش یاسایە دەدرا بە ئەفسەر و سەرباز و سەڵبەچییەکان.

هەڤدە رۆژ دوای ئەوەی کەشتییە جەنگییەکانی داریوش لە دورگەی کریتی جوولان، گەیشتنە گەروویەك کە لە ئەوێوە دەچوون بۆ سالامین، ئەمرۆ ئەو گەروە بە ناوی گەروی (ئەژین) ناودەبرێت و گەروویەکی پان بوو و کاتێك کەشتی بە ناوەراستیدا دەرۆیشتن، بە هۆی پانی گەروەکە کەنارەکانی هەردوو لای نەدەبینرا. دەریاسالاری هەخامەنشی لەکاتی گەیشتنی

بۆ ئەو گەرووە، لە ترسی ئاشکرا بوونی لە لایەن هێزی دەریایی یۆنان کە لەوانە بوو لە ئەوێ بن و هێرشیان بکەنەسەر، خۆی لە نزیك بوونەوە لە کەنارەکان پاراست.

هەروەها لەو گەروی دوو ڕێرەوی ڕۆیشتنی ئاو هەبوو یەکیان تەریب بە کەنارەکانی ڕۆژهەڵات لە باشوور بۆ باکوور دەچوو و ئەوی تر تەریب بە کەنارەکانی ڕۆژئاوا بوو کە لە باکوور بۆ باشوور بوو. کەشتییە بازرگانییەکان لە کاتی هاتووچوو بەو گەروەدا هەوڵیاندەدا سوود لە جووڵەی ئاو لە کەنارەکان وەربگرن تا خێراتر بڕۆن، بەڵام هێزی دەریایی داریوش نەیدەویست خۆی بداتە دەست شەپۆلەکانی ئاو و چونکە کەشتی جەنگی لەو ناوچەی دوژمنی لێ یە، دەبێت جووڵەی بەدەست خۆی بێت. دوای ئەوەی کەشتییە هەخامەنشییەکان گەیشتنە گەرووی ئەژین، تەواوی سەرنشینەکانی کەشتییەکان دەیانزانی ئەگەر ڕاست بڕۆن دەگەنە دورگەی سالامین.

دەریاسالاری ئێرانی دوای گەیشتنی بۆ گەروەکە، چاودێری دوو بەرانبەر زیاد کرد بۆ ئەوەی لە جموجۆڵی یۆنانییەکان بە ئاگابێت، بەڵام دوو ڕۆژی خایاند و هیچ کەشتییەکی یۆنانی دەرنەکەوت، هیست ئەسپ بیری کردەوە کە لەوانەیە یۆنانییەکان بێ ئاگا بن و نەیانزانی بێت هێزێکی گەورەی دەریایی بەرەو ڕوویان دێت.

لە شەوی سێیەمی گەیشتن بە گەرووی ئەژین، هەموان دەیانزانی کە ڕۆژی دواتر دەگەنە سالامین، ئەو شەوە بە هۆی نزیك بوونیان لە سالامین و کەنارەکانی ڕۆژهەڵاتی ئەسینا، کەشتییە هەخامەنشییەکان بە بێ ڕووناکی و چرا دەڕۆیشتن تا دوژمن نەیانبینێت. ئەو شەوە مانگ بەدەرەوە نەبوو و بە هۆی چەند پەڵە هەورێك تاریکی زۆرتر بوو، بۆیە کەشتییەکانی داریوش زۆر وریاتر و هێواشتر دەڕۆیشتن تا بەریەك نەکەون یا لە یەکتر بزر نەبن. شەو کۆتایی هات و بەیانی هات، کەنارەکانی سالامین لە دوورەوە دەرکەوتن، بۆیە دەریاسالاری هەخامەنشی شێوەی ڕۆیشتنی کەشتییەکانی گۆڕی بە شێوەی جەنگی.

تا ئەوکات کەشتییە هەخامەنشییەکان یەك دەستەی پێشەنگیان هەبوو و ئەوانی تر لە چوار ڕیزی بەدوای یەکدا دەجووڵان، بەڵام دوای ئەوە کەشتییەکان بوونە دووبەش، هەفتا کەشتی جەنگی لە پێشەوە دەڕۆیشتن و سی کەشتی تریش بوونە هێزی یەدەگ و لە پشتیانەوە دەهاتن.

کەشتییەکانی ڕیزی پێشەوە مەودای نێوانیان زۆر کەم بوو تا کەشتییەکانی دوژمن نەتوانن بێنە نێوانیان و لە پشتەوە هێرشیان بکەنەسەر.ماوەی پێنج یەکەکی ڕۆژەکەی (چەند کاتژمێرێك) خایاند تا کەشتییەکان ئارایشی تازەی جەنگی خۆیان وەرگرت و بەرەو سالامین

رۆیشتن و بە پێوەری ئەمرۆ دوو کاتژمێر پێش نیوەرۆ کەشتییە جەنگییە یۆنانییەکان دەرکەوتن و ئەوەندە زۆر بوون کە بیر دەکرایەوە دەریا پڕ بووە لە کەشتی جەنگی یۆنانییەکان.

دیمەنی کەشتییە یۆنانییەکان جیاوازی نەبوو لە گەڵ دیمەنی کەشتییەکانی داریوش و لە سەر ستوونەکانیان پەیکەری زێئۆس ( کە ناوەکەی تری ژووپی تێرە) یا پەیکەری (ئاپۆلۆن) کە لە خوایانی یۆنان بوون، هەبوو و بۆ هێزی دەریایی داریوش ئاشکرا بوو کە هێزی دەریایی یۆنان بەهێزترە، چونکە ئەوان سەد و پەنجا کەشتی جەنگییان بۆ ئەو جەنگە هێنابوو، هێزی دەریایی یۆنان لە ڕاستیدا هێزی یەکگرتووی هەموو دەوڵەتە شارە یۆنانییەکان بوو، بەڵام زۆرینەی هی ئەسینا بوون.

لەوانەیە بگوترێت زیاتر بوونی تەنها پەنجا کەشتی بابەتێکی گرنگ نەبووە، بەڵام لە جەنگە دەریاییەکانی کۆندا تەنانەت زۆرتر بوونی دوو کەشتی زۆرە. چونکە کاتێك ژمارەکان یەکسان بووانە، هەر دوو کەشتی بە یەکەوە دەجەنگان و ئەگەر کەشتی زیادە هەبوایە ئەوا هەندێکیان دەبوایە لە گەڵ دوو کەشتی جەنگ بکەن و بە زوویی لەناو دەچوون.

یۆنانییەکان دەیانزانی هێزی دەریایی داریوش لە دورگەی کریتی بۆ جەنگی ئەوان کۆبۆتەوە، بەڵام نەیاندەزانی بۆ هێرش کردن بۆ چ شوێنێك لە یۆنان ئامادەباشی دەکەن، چونکە پێشتر ڕووینەدابوو ئەوان لە خاکی یۆنان هێز دابەزێنن. دوای پەرینەوەی لەشکری داریوش لە گەرووی ئەژین، یۆنان زانی مەبەستی ئەوان هێرشە بۆ سەر سالامین یا یەك لە کەنارەکانی وڵاتی ئاتیك کە ئەسینا پایتەختی بوو.

ئایا ئەو ڕۆژە داریوش لەناو هیچ کام لە کەشتییەکانی لەشکرەکەی بوو؟ ئامادەبوون یا نەبوونی پاشای هەخامەنشیی لەو جەنگەدا و لەو ڕۆژە لە مێژوودا بێ دەنگەی لێکراوە، بەڵام بە گشتی داریوش لە جەنگە دەریاییەکان لە دژی یۆنان لە کەشتییەکاندا نەبووە.

ئامادە نەبوونی داریوش لە جەنگە دریاییەکان لەگەڵ یۆنانییەکاندا بۆ ترسانی ئەو ناگەڕێتەوە و بەڵکو بەرژەوەندی سیاسی و سەربازی ئاوای پێویست بووە کە ئەو لەناو کەشتییەکان نەبێت. جەنگە دەریاییەکان زۆر سەخت بوون و تا دوایین جەنگاوەری ناو کەشتییەك نەکوژرابووایە یا ئەسیر نەبووبایە، نەیاندەتوانی کەشتییەکە داگیر بکەن و ئەگەر داریوشی یەکەم کوژرابایە لە ڕووی سیاسی، مردنی ئەو دەنگدانەوەی گەورەی دەبوو و ئەگەر ئەسیرش کرابایە، یۆنانییەکان دەیانتوانی تەواوی مەرجەکانیان بەسەر هەخامەنشییەکاندا

بسەپێنن لە بەرانبەر ئازادی داریوشدا. بۆیە داریوش بۆ خۆی لە جەنگە دەریاییەکاندا بەشدار نەدەبوو و ئەو ڕۆژە هیست ئەسپ فەرمانەکانی جەنگی دەردەکرد.

هەردوو هێزی دەریایی کە یەکیان لە باکوور بۆ باشوور و ئەوی تر لە باشوور بۆ باکوور دەهاتن و لە یەکتر نزیك بوونەوە و باڵندە دەریاییەکانیش بە تەنیشت کەشتییەکانەوە دەفڕین بەو ئۆمێدەی خواردن لە کەشتییەکانەوە بەربێتەوە ناو ئاو و ئەوان بیخۆن. سەڵبەچیەکانی کەشتییەکانی هەردوولا خواردنی بیانیان خواردبوو، بەڵام چونکە یەکلا بۆوە کە جەنگ دەست پێدەکات شەرابیان دانێ تا بەهێزتر بن، چونکە چارەنووسی کەشتی بەدەست ئەوان بوو.

درێژایی ریزی کەشتییە هەخامەنشییەکان لە ڕۆژهەڵات بۆ ڕۆژئاوا نزیکەی سێ کیلۆمەتر دەبوو و درێژی ڕیزی کەشتییە یۆنانییەکانیش لە هەمان ئاراستەدا نزیکەی پێنج کیلۆمەتر دەبوو و لەوانەبوو لە یەکەم کاتژمێری جەنگدا کەشتییە یۆنانییەکان لە دوولاوە کەشتییە هەخامەنشییەکان دوورە بدەن. سەڵبەلێدان لە کەشتییە یۆنانییەکاندا زۆر ڕێك بوو و ئەوانەی لە دوورەوە جووڵەی ئەوانیان دیبا، دەیاندیت هەموویان لە یەك کاتدا و بەیەکەوە بەرز و نزم دەبنەوە و لە ڕێرۆیشتنی سەربازی دەستەیەك سەربازی زۆر کارامە دەچوو کە لە یەکتر جێ نەدەمان.

لەناو هەموو کەشتییەکاندا سەربازان خۆیان بۆ جەنگ ئامادەدەکرد، ئەوانەی قەلغانیان هەبوو لەبەریان دەکرد و ئەوانەی نەشیانبوو، بەرگی ئاخنراو بە پەرەمووچی باڵندەکانیان دەکردە بەریان، چونکە دەیانزانی لە هێزی زەربەی شمشێر کەم دەکاتەوە. هەموویان بیریان لەوە دەکردەوە کە لەوانەیە کاتی هاتنی شەو زیندوو نەمابن.

هەندێ لە سەربازەکانی داریوش شمشیری درێژی دوو لێویان هەبوو، لەکاتی جەنگ بە دوودەست دەیانگرت و لە سەر سەریان دەسوڕاندەوە و ئەو شمشێرە بەر هەر کەسێك کەوتایە، بێ گومان دەیکوشت. هەندێك لەوان زرێیان بە دەستێك دەگرت و بۆیە شمشێریان بە یەك دەست دەگرت، لەوانەدا هەبوو کە لای باشتر بوو زرێ بەدەستەوە نەگرێت چونکە تا ڕادەیەك توانای بینینی کەم دەکردەوە.

مێژوونووسی ناسراو (گەزنەفۆن) دەڵێت: کاتێك هەخامەنشییەکان دیتیان هێزی دەریایی یۆنان بەهێزترە لە هێزی دەریایی ئەوان، نەدەبوایە جەنگ بکەن و باشتر بوو بکشێنەوە.

بەڵام دوای دەرکەوتنی هێزی دەریایی یۆنان، هیست ئەسپ توانای پاشەکشەی نەبوو، هەڵبەت بە ڕواڵەت بۆ ئەو گرفت نەبوو بە هێما بە کەشتییەکان بڵێت تا هەموویان لە یەك

کاتدا بوەستن و بۆ ئەمەش تەنها پێویست بوو کە سەڵبەکان لە ئاو رۆبکەن و بە پێچەوانە لێیان بدەن تا کەشتییەکان بوەستن و دوای وەستانیش لموزی کەشتییەکە بسورێننەوە و بە دەستەواژەی شۆفێرەکانی ئێستا (بسورێنەوە) و سووراندنەوەی کەشتیش بریتی بوو لە ئەوەی سەڵبەکانیان دەخستەوە ناو ئاو و سەڵبەکانی لایەکی کەشتی لە پێشەوە بۆ دواوە و لایەکەی تریش لە دواوە بۆ پێشەوە لێ بدەن و لە چەند ساتێکدا کەشتییەکە دەسورێتەوە.

بەڵام هیست ئەسپ نەیدەتوانی بۆ پێشگیری لە روودانی ئەو جەنگە لە گەڵ هێزی یۆنانی بسورێتەوە و بگەرێتەوە چونکە لەوکاتەدا با لە باشوور بۆ باکوور دەهات. لەوانەیە وابیر بکرێتەوە کە شنینەوەی با کاریگەری لە کەشتییە جەنگییەکان نییە، چونکە هەموویان بە سەڵبە دەرۆیشتن و چارۆگەیان نەبوو تا با کاریگەر بێت لە سەریان، بەڵامدەبێت سەرنج بدەین کە شنینەوەی با کاریگەری لەسەر شەپۆلەکانی ئاو هەبوو و شەپۆلەکانی لە باشوور بۆ باکوور دەبرد. کاتێك کەشتییە هەخامەنشییەکان بەرەو یۆنانییەکان دەچوون، شەپۆلەکان لە دوایانەوە بوون و بۆ رۆیشتن سوودیان لەو شەپۆلانە دەبینی، بەڵام لە کاتی پاشەکشەدا دەبوایە بە پێچەوانەوەی شەپولەکان برۆن و ئەمەش ئەوانی هێواش دەکردەوە.

پێویست نەبوو هیست ئەسپ فەرمان بە فەرماندەی هەر کەشتییەکی لەشکرەکەی بدات تا چ بکات، ئەوان دەیانزانی هەریەکەیان دەبێت بکەوێتە تەنیشت کەشتییەکی دوژمن و ئەگەر توانی لەناوی ببات، ئەوا بۆ کەشتییەکی تر بڕوات و ئەگەر کەشتی دوژمن لە بەرانبەری نەمابوو، بە پەلە بۆ یارمەتی کەشتییەکی خۆیی بچێت، واتە ئەگەر بینی یەك یا دوو کەشتی خۆیی لە جەنگدان لەگەڵ کەشتییەکی دوژمن، خۆی بە ئەوان بگەیێنێت و هێرش بکاتە سەر کەشتی دوژمن تا ئەو کەشتییەی دوژمن زووتر لە ناو بچێت.

لە جەنگی دەرياییدا نابێت بیربکرێتەوە کە جەنگی دوو یا سێ یا چوار کەشتی لە گەڵ یەك کەشتی دوژمندا بە پێچەوانەی رێساکانی مەردایەتی هەژمار دەکرێت، چونکە بنەما ئەوەیە کە کەشتییە جەنگییەکانی دوژمن زوو لەناو بچن یا نوقم بکرێن.

چونکە ئەو سەردەم نوقم کردنی کەشتییە جەنگییەکانی دوژمن کارێکی دژوار بوو و نوقمکردنی کەشتی ئەوکاتە ئاسان بوو کە بارووت داهێندرا و تۆپ دروستکرا و بە تۆپ کەشتیان تێك دەشکاند و نەقمیان دەکردن و هەندێکات کەشتییەکان بە هۆی تەقینەوەی کۆگای باروت نەقم دەبوون. ئەوکات بارووت و تەقەمەنی و تۆپ نەبوو و کەشتییەکان بە ئاسانی نوقم نەدەبوون و تەنها رێگە بۆ شکاندنی دوژمن کوشتنی تەواوی سەربازەکانی سەر

کەشتییەك بوو و دوای ئەوەی هەموویان دەکوژران یا ئەسیر دەبوون، سەڵبەچیەکان کە جەنگیان نەدەکرد، خۆیان ڕادەست دەکرد و بەم شێوەیە کەشتییەکە داگیردەکرا.

فەرماندەکانی کەشتییەکان دەبوایە تێبکۆشن و ئاگاداربن تا نەکەونە بەر هێرشی زیاتر لە یەك کەشتی دوژمن، چونکە دەگمەن بوو کە کەشتییەك لە جەنگ لەگەڵ دوو کەشتیدا ڕزگاری ببێت و سەرکەوتوو بێت. لە سەردەمی ئێستادا کەشتییەکان ناچار نین لە یەکتر نزیك ببنەوە و لە دوورەوە بە تۆپ و مووشەك و... هتد بەیەکەوە جەنگ دەکەن، بەڵام ئەوکات تاکە ڕێگە بەیەك گەیشتن و پێکەوە نووسانیان بوو و دەبوایە سەربازەکانی یەکتری لەناو ببەن تا سەرکەوتوو بن.

ئەو ڕۆژە بە گەیشتنی کەشتییەکان بە یەکتری، ئیتر دەریا بچووك دەهاتە بەرچاو و ئەوەندە بچووك ببۆوە کە بە وەك ئەستێرەناسەکان دەڵێن (سێبەر بەرچاو نەدەکەوت). دوو جەبهەی دەریایی گەیشتنە یەك و دەنگی بەریەك کەوتنی کەشتییەکان ئەوەندە بەهێز بوو کە وەك دەنگی هەورە بروسکە بوو و سەربازە تازەکان زۆربەیان هەراسان دەبوون و کەم سەربازانی تازەکار هەنە کە بە بیستنی ئەو دەنگانە نەترسن و نەلەرزن.

دوو کەشتی هەریەکەیان جێگەی نزیکەی هەزار سەرباز بوو کە بە هێزی بازووی چوارسەد تا شەش سەد سەڵبەچی دەجولا و ئەو قورساییە لە کاتی بەریەك کەوتن دەنگێکی لێدەهات کە لە چەندین کیلۆمەتر دوورتر دەبیسترا و ئەو دەنگە ترسێنەرە سەربازە تازەکانی ڕادەچڵەکاند. بەڵام یۆنانی و هەخامەنشییەکان ئەو سەربازانەیان نەدەهێنا بۆ ئەو جەنگانە کە تازە هاتبوونە ریزی لەشکر، چونکە هەر سەربازێك پێشینەی جەنگی نەبوایە، لە جەنگی دەریایی زوو لەناو دەچوو.

هەرکە دەنگی بەریەککەوتنی کەشتی وەك هەورە بروسکە دەهاتە بەرگوێ، ئەو دوو کەشتییەی بەریەك کەوتبوون ڕاستەوخۆ و بە پەلە بە زنجیر و قوڵلاب خۆیان بەیەك دەبەستەوە تا شەپولەکانی ئاو لێکیان دوور نەکاتەوە و دواتر جەنگاوەرەکانی هەردوولا هێرشیان بۆ یەکتر دەهێنا و جەنگی بێ بەزەییانە بە گورز و تیر و شمشیر و نێزە دەستی پێدەکرد و ئەمەش گرێدراوی ئەوە بوو کە هەرکەسێك چ جۆرە چەکێك بەکار دێنێت و لە بەکاربردنی کامیان کارامەیە.

بە هەمان شێوەی لە فووتباڵی (تۆپێنە) ئەمڕۆ هەیە کە دەستەیەك لە یاریچییەکان بەرپرسن لە بەرگری و هاوکات هاوکاری یەکترن، لەناو کەشتییە جەنگییەکانی هەخامەنشی و یۆنانیش دەستەیەك لە سەربازەکان بەرگریکار بوون و دەستەیەکی تریش هێرشبەر بوون و هاوکات ئەوان هاوکاری یەکتریان دەکرد. هێرشبەرەکان دەبوایە خۆ هەڵبدەن و خۆیان بگەیێننە ناو کەشتی بەرانبەر

و سەربازەکانیان دەکوشت و بەرگری کارەکانیش بەرپرس بوون لە ڕێگرتن لە هێرشبەران. سەربازانی داریوش ریشیان هەبوو و سەربازانی یۆنانی ریشیان بەردەوام دەتاشی، بۆیە کاتێك هێرشیان بۆ یەکتر دەکرد، ئەستەم بوو لەناو کەشتییەکاندا بە هەڵە یەکتر بکوژن.

دەستەیەك سەربازیش لەناو کەشتییە جەنگییەکان بەردەوام چاودێری سەڵبەچییەکانیان دەکرد و ئاگادار بوون تا یاخی نەبن، سەڵبەچییەکان وەك لە هەندێ لە جەنگەکاندا دەبینرێت سوودیان لە سەرگەرمی سەرباز و ئەفسەرەکان دەبینی و یاخی دەبوون تا لە کارە سەختەکەیان ڕزگاریان ببێت، بۆیە پێش دەستپێکردنی جەنگ هەموویان بە زنجیر لە شوێنی دانیشتنیان دەبەسترانەوە. زنجیرەکە بە شێوەیەك بوو کە یەك لاقی هەریەکەیان لە زنجیردا دەبوو و هەمووشیان بە شێوەی بازنەیی کۆدەکرانەوە دەورەی یەکتر، بەڵام ڕوویدابوو کە سەڵبەچییەکان بە هاوکاری یەکتری زنجیرەکەیان دەکردەوە بۆیە دەستەیەك سەرباز لەگەڵ دەستپێکی جەنگ دەبوونە پاسەوانی سەڵبەچییەکان.

لەناو سەربازەکانی داریوش پیاوێکی خاوەری (خۆراسانی) هەبوو بە ناوی (گە یۆ) کە شمشێری دوو لێوی درێژی پێبوو و لەگەڵ بەریەك کەوتنی کەشتییەکەیان بە کەشتی یۆنانی، بازێکی ئەوەندە بڵندی هەڵدا کە یۆنانییەکان توانای گەڕاندنەوەیان نەبوو. ئەو لە گەڵ گەیشتنی بۆ ناو کەشتی دوژمن، شمشێرە درێژەکەی بە سەر سەریەوە گرت و بە توندی کەوتە خولانەوە بە دەوری خۆیدا، ئەوان ماوەیەکی زۆر ڕاهێنانیان دەکرد تا لە کاتی خولانەوەدا گێژ نەبن.

لەکاتی خولانەوەدا شمشێرەکەی بەر هەر یۆنانییەك دەکەوت برینداری دەکرد و تەنانەت چەند سەرێکی خستە سەر زەوی، شمشێرەکەی ئەو هەم ئامێری بەرگری و هەم هی هێرش بوو. ریشە درێژەکەی لە کاتی خولانەوەدا لەگەڵ شمشێرەکەی دیمەنێکی جوانی پێکهێنابوو. دوابەدوای گەیۆ هەندێ سەربازی ریش درێژیتری هەخامەنشی خۆیان گەیاندە ناو کەشتییەکە و دەجەنگان، بەڵام ئەوان شمشێری ئاساییان پێبوو و توانای بەکارهێنانی شمشێری دوو لیویان نەبوو.

گەیۆ کاسکێتی قەڵایی لە سەر بوو کە دەدرەوشایەوە و قەلغانێکیش کە لە هەمان کانزا دروستکرا بوو لەبەر بوو. ئەو وێڕای ئەوەی بە توندی دەخولایەوە، بەرەو پێش دەرۆیشت و ڕێگەی دەکردەوە و سەربازەکانی هەخامەنشیش بە دوایدا دەهاتنە ناو کەشتی و ئەوانیش

بەدوای ئەودا پێشرەویان دەکرد، ئەو کارەی گەیۆ ئەوەندە ئازایانە بوو کە تا ناوەڕاستی کەشتییەکە توانی بڕوات.

ئاریان دەڵێت: فەرماندەی هێزی دەریایی یۆنان ناوی کۆلۆفیس بوو. گەزنەفۆن لە مێژوونووسانی کۆن و کاپلانی ئاڵمانیش لە هاوچەرخەکانە، ئەو پیاوەیان پێناس کردووە و دەڵێن ئەو پیاوێك بوو تەمەن پەنجا ساڵ و هەندێ لە پرچی وەریبوو، بۆیە سەری دەتاشی. ئەو قەڵەو و بەهێز بوو و ئەو رۆژە لە کەمری بۆ سەرەوە رووت بوو، هەرچەندە سەربازەکانی قەلغانیان لەبەر بوو.

کۆلۆفۆس پەیکەری خودای خوایانی یۆنان واتە زێئۆسی لە سەر کەشتییەکەی هەڵواسیبوو و کەشتییەکەی بە جووڵەیەکی رێکی سەڵبەچییەکان لە پشت کەشتییەکانی خۆیانەوە دەرۆیشت، چاوە تیژەکانی کۆلۆفۆس دۆخی جەنگی دەبینی و دەیەویست بزانێت یۆنانییەکان لە کوێ لاوازن تا هێزی یارمەتیدەریان بۆ بنێیرێت. کۆلۆفس لە کاتی ئاساییدا نەعرەتەی لێدەدا و هەر ئەمرێکی دەردەکرد بە دەم نەعرەتەوە بوو، هەموو ئەو ئەفسەر و سەربازانەی لەبەر دەستی ئەو بوون ئەو نەریتەی ئەویان دەزانی و لە نەعرەتە لێدانەکانی نیگەران نەدەبوون و دەیانزانی ئەو کارەی بابەتێکی سروشتی ئەوە و لە رووی دژایەتی نییە، بە دەست پێکردنی جەنگ کۆلۆفس ئارام دەبوو و چیتر هاواری نەدەکرد و فەرمانەکانی زۆر بە ئارامی ڕادەگەیاند.

کۆلۆفس لە گەڵ وەرزی گەرما لە کاتی جەنگ کردندا لە کەمەر بۆ سەرەوەی خۆی رووت دەکردەوە و دەجەنگا، بەڵام داوای لە سەرباز و ئەفسەرەکانی نەدەکرد ئەو کارەی ئەو ئەنجام بدەن. ئەو تەوربە دەست و بە جەستەیەکی نیوەرووت، خۆی هەڵدەدایە ناوەڕاستی سەربازانی دوژمن و ئەوەندە چالاك بوو کە خۆی لە زەربەکانی شمشێر و تیر و نێزەی دوژمن دەپاراست، بەڵام توانای خۆپارێزی لەو تیرانە نەبوو کە لە کەوان دەردەچوون و کاتێك تیرێکی لەو چەشنە بەر جەستەی دەکەوت، ئەوەندە بە خێرایی و بێ منەتانە تیرەکەی لە جەستەی دەردەهێنا و دووری هەڵدەدا کە ئەفسەر و سەربازەکانی دووچاری سەرسوڕمان دەبوون.

وردە وردە ئەوانەی لە ژێر دەستی ئەو کاریان دەکرد دەهاتنە ئەو باوەڕەی ئەو هەست بە ئازار ناکات، بۆیە نازناوی (بێ ئازار) یان پێ بەخشیبوو. لە ڕاستیدا ئەو هەستی بە ئازار دەکرد بەڵام بۆ ئەوەی ببێتە نموونەی ئازایەتی بۆ هەموان، هاواری نەدەکرد و کاتێك کە زەربەیەکی بەردەکەوت بە سەر خۆی نەدەهێنا.

ئازایەتییە سەرسورهێنەرەکەی ئەو پیاوە بۆوە هۆکار تا رەگەزنامەی ئەسینای پێ بدرێت، هەرچەندە کە خۆی خەڵکی ئێسپارت بوو، بۆیە هاتەناو هێزی دەریایی ئەسینا و بوو بە فەرماندەی هێزی دەریایی ئەو وڵاتە. ژێردەستەکانی دەیانووت خواکان ئەو دەپارێزن، بەڵام ئازایەتییەکەی ئەوی دەپاراست، هەرچەندە ئەو هەرگیز بە شێوەیەك بریندار نەببوو کە برینەکەی ببێتە مایەی مردنی و مرۆڤ هەرچەندە دلێر بێت، ئەگەر زەربەیەك شمشێر بەر سەگ یا سینگی بکەوێت و بیدرێت، بێ گومان دەمرێت.

کولوفس لە منداڵی بە پەروەردەی سەختی ئێسپارت ڕاهێندرابوو، لە ئێسپارت لە هەر پێنج منداڵی کور و کچ کە دەهاتنە سەر دنیا، چواریان بە هۆی راهێنانە سەختەکانی ئێسپارتییەوە دەمردن، بەڵام ئەوەی زیندوو دەما دەبۆوە ژن یا پیاوێکی ئاسنین.

ئەو رۆژە کاتێك چاوەکانی کۆلۆفس کەوتە سەر ئەو کەشتییە یۆنانییەی کە گەیۆ هێرشی کردبوو سەری، بە پەنجە ئیشارەتی کرد تا بەرەو ئەو کەشتییە بچن و لە ماوەیەکی کەمدا کەشتییەکەی وەك تیرێك کە لە کەمان دەردەچێت، بەرەو ئەو کەشتییە چوو. ئەو مەبەستی بوو یارمەتی ئەو کەشتییە یۆنانییە بدات و کەشتییەکەی ئەوەندە بەهێز خۆی بە بەشی پشتەوەی کەشتییە هەخامەنشییەکەدا کە بە تەواوەتی ئەو بەشەی تێکشکاند، ساتێك دواتر کۆلۆفس بە تەورەوە وەك پلینگ بازیدا و بە دوایدا سەربازە یۆنانییەکان کە هەموویان کاسکێتیان لەسەر و قەلغانیان لەبەر بوو، خۆیان هەڵدا و چوونە ناو کەشتییەکە.

شێوەی جەنگکردنی کۆلۆفس تەنها تایبەت بوو بە خۆی و کەس نەیدەتوانی پەیرەوی بکات، ئەو بۆ وەشاندنی تەورەکەی هەموو جارێك بازیدەدا و بە شێوەیەك تەورەکەی دەوەشاند کە یەکڕاست کەسی بەرانبەری دەکوشت. ئەو لە کاتی ئاسایی بەردەوام هاواری دەکرد و هەموان دەنگیان دەبیست، بەڵام لەجەنگدا زۆر ئاسایی و بێ دەنگ بوو و تەنها بەردەوام بازی دەدا. هەندێ لە سەربازانی ئەو کەشتییە جەنگییەی کەوتەبەر هێرشی کۆلۆفس، چوونە ناو کەشتییە یۆنانییەکە و لە ئەوێ سەرگەرمی جەنگ بوون، بۆیە هێزی بەرگری کەشتییە هەخامەنشییەکە لە بەرانبەر کۆلۆفس و سەربازەکانی کەم بوو.

یۆنانییەکانی ئەو کەشتییەی هێرشی کرابوو سەر بە بینینی پەیکەری خودای خواکانیان، زانیان کۆلۆفس خۆی هاتووە بۆ یارمەتیدانیان و بۆیە ورەیان بەرز بۆوە و ئازایانەتر کەوتنە جەنگ کردن، ئەوان توانای لەناو بردنی گەیۆیان نەبوو، بۆیە بڕیاریاندا بە تیر و کەوان لێی بدەن، کۆمەڵێك تیریان ئاراستەی رووخساری کرد و لە ئەنجامدا تیرێك بەرچاوی گەیۆ کەوت و

بیٚ توانای کرد، ساتێك دواتر چاوەکەی تریشی تیری بەر کەوت و کوێر بوو و کەوتەسەر زەوی. سەربازە یۆنانییەکان کە دیتیان کەوتووتە سەر زەوی و هەرکە کەوتەسەر شانۆی کەشتییەکە، یۆنانییەکان لە ترسی ئەوەی هەڵنەستێتەوە بە خێرایی هێرشیان بۆ هێنا و بە شمشێر و تەور هەردوو قاچیان پەڕاند و دڵنیا بوون ئەو پاڵەوانە چیتر هەڵ ناستێتەوە. ئەوان بەو کارە ورەیان بەرز بۆوە و توانیان بەسەر ئەو سەربازانەدا سەرکەون کە لەگەڵ گیۆدا هاتبوونە ناو کەشتییە یۆنانییەکە و ئەوکات هێزی یۆنانی لە هەردوو کەشتیدا یەکیان گرتەوە و کۆبوونەوە.

هەرچەندە سەربازانی هەخامەنشی دەیانزانی دوژمن بەهێزە، بەڵام خۆیان بەدەستەوە نەدا و فەرماندەی کەشتییەکەیان بە هێما و ئاماژە، چەند جارێك داوایان لە هیست ئەسپ کرد تا یارمەتی بدات، بەڵام چونکە تەواوی کەشتییەکانیان لە جەنگدابوون و کەشتییەك نەبوو کە لە جەنگدا نەبێت و بیٚ کار بێت، ئەو نەیتوانی ئەوکارە بکات و پاش ماوەیەك تەواوی ئەفسەر و سەربازەکانی ناو کەشتی کوژران و یا بە رادەیەك بریندار بوون کە توانای هەستانەوەیان نەبوو و لە کەشتییە هەخامەنشییەکە سەربازی ساغ نەمایەوە و تەنها ئەوانە نەبێت کە بۆ پارێزگاری سەڵبەچییەکان داندرابوون، چونکە ئەوان توانای بەرگریان لە بەرانبەر سەربازەکانی دوو کەشتی نەبوو، خۆیان بەدەستەوەدا و کۆلۆفس چەکەکانی لیٚ ستاندن و فەرمانی بە کەشتییەکەی تری یۆناندا تا ئەو کەشتییە لە مەیدانی جەنگ دوورخاتەوە.

ئەو رووداوەی بەسەر ئەو کەشتییە هەخامەنشییە هات بەسەر چەندین کەشتی تریش هات و کەشتییەکان دوای کوژران یا ئەسیر بوونی سەرباز و ئەفسەرەکانیان، لە مەیدانی جەنگ دوور دەخرانەوە. کاتی دوور خستنەوەی کەشتییەکان لە مەیدانی جەنگ، بە فەرمانی یۆنانییەکان تەرمی تەواوی کوژراوەکان لە لایەن ئەسیرەکانەوە دەخرایە ناو ئاو و بە ئەسیرەکانیان وت تا برینی بریندارەکان بپێچن. لە هەموو کەشتییەکان پێداویستی پزیشکی هەبوو و هەر کەشتییەکی هەمامەنشی یەك پزیشکی گشتی و نەشتەرگەر هەبوو و ئەوکات وەك ئێستا پیشەی پزیشکی و نەشتەرگەری نەببوون بە دوو پسپۆری جیا و هەموو پزیشکێك کاری نەشتەرگەریشی دەکرد.

بەڵام پزیشکەکانی لەشکری هەخامەنشی هەموویان سەربازیش بوون و ئەو رۆژە هەندێك لە پزیشك و نەشتەرگەرەکانیش لە کاتی جەنگدا کوژران و بۆیە لە کەشتییەکانیاندا دوای کۆتایی جەنگ کەس نەبوو تا برینی بریندارەکان تیمار بکات و بۆیە یۆنانییەکان ئەسیرەکانیان ناچارکرد تا برینی بریندارەکانیان تیمار بکەن.

یۆنانی و هەخامەنشییەکان لەو جەنگەدا زۆر بێ بەزەییانە جەنگان و بە تەواو بوونی جەنگ هەر دوولا کەوتنە تیمار کردنی برینداره‌کان، چونکە ئەوان هەموویان سەرباز بوون و شەرباز لە مەیدانی جەنگ دەیزانی ئازاری بریندار چییە و ئاگادار بوو لە ئازار و نەهامەتی برینداره‌کانی دوژمن، بۆیە دوای جەنگ بە پێی توانا تێدەکۆشێت تا لە ئازاری سەربازە بریندارە ئەسیرەکەی دوژمن کەم بکاتەوە و ئەو نەتەوانەی وەك ئێران و یۆنان کە خاوەن شارستانییەت بوون، بەرانبەر بە ئەسیرەکانیان هەلسوکەوتی خراپیان نەبوو و دەسەڵاتدارانی هەخامەنشیش لەوکاتدا و (٢٥٠٠) ساڵ پێش بڕیارنامەی ژنێفی تایبەت بە ئەسیرەکانی جەنگ، بریارنامەی تایبەت بە ئەسیرەکانیان هەبوو. بەڵام ئەنجامدانی ڕەفتاری باش لەگەڵ ئەسیرەکان تەنها کاری نەتەوە پێشکەوتوو و خاوەن شارستانییەکان بوو و نەتەوە وەحشییەکان پێچەوانەی ئەوکارەیان ئەنجامدەدا.

دەریاسالاری هەخامەنشی (هیست ئەسپ) کە دیتی دۆخی جەنگ زۆر توندە فەرمانی پاشەکشەی کرد، بەڵام لە جەنگی دەریایی پاشەکشە وەك جەنگی وشکانی ئاسان نییە، چونکە ئەوکاتەی دوو کەشتی بەریەك دەکەوتن بە هۆی قوللابەوە بەیەکتر دەبەسترانەوە تا یەکیان نەتوانێت لە دەست ئەوی تر ڕابکات و بۆ ئەوەی بتوانێت پاشەکشە بکات پێویست بوو ئەو قولاب و زنجیرانە بکرێنەوە، بەڵام قولابەکان لە دیواری کەشتییەکان رووچوو بوون و بە زنجیر بەسترابوونەوە.

کاتێك فەرمانی پاشەکشە دەرچوو، سەربازە هەخامەنشییەکان بە تەور هێرشیان کردەسەر ئەو زنجیرانەی بە قولابەکان بەسترابوونەوە و ئەو زنجیرە قەڵائیانەیان پچراند، بەڵام تەنها توانیان پەیوەندی خۆیان بە کەشتییە یۆنانییەکان بپچرێنن و نەیانتوانی زنجیری ئەو قولابانە بپچرێنن کە لە کەشتییە یۆنانییەکان هەڵدرا بوون و بە کەشتییەکانی ئەوان بەسترا بوون و بە هۆی ئەوەی زنجیرەکانیان لە کەشتییەکانی دوژمندا بوون، پچراندنی زنجیرەکان نەدەشیا. ئەوان بە ناچاری دەستیان کرد بە شکاندنی ئەو شوێنانەی کەشتییەکانیان کە قولابی دوژمنی لەسەر بوو و بە پەلە بە تەورەکانیان ئەو کارەیان دەکرد و بە لێك جیا بوونەوەی دوو کەشتی، بەپەلە خێرایی سەڵبەلێدانیان زیاد دەکرد تا بتوانن لە یۆنانییەکان دوور بکەونەوە و خێرا کردنی کەشتییەکانیش کاری ئەو سەربازانە بوو کە چاودێری سەڵبەچییەکانیان دەکرد.

لە کاتی جەنگدا ئەو سەڵبەچیانەی نافەرمانیان دەکرد بە هیچ شێوەیەك نەدەکوژران، چونکە ئەوان بەشێك بوون لە هێزی بزوێنەری کەشتی و ئەگەر کوژرا بووانە بە هەمان رێژەی

توانای کوژراوەکە لە توانای جوولێنەری کەشتی کەم دەبۆوە، بەڵام بە بەرچاوی ئەوانی تر زۆر بە توندی لێیان دەدا و بۆیە لە کاتی جەنگدا سەڵبەچی تەنبەڵی نەدەکرد و هەر چونێك کە ئەمریان پێ کرابایە، بە هەمان شێوە سەڵبەیان لێدەدا

کاتێك کۆلۆفس هەستی کرد هەخامەنشییەکان دەیانەوێت پەیوەندیان بپسێنن و پاشەکشە بکەن، فەرمانیدا تا رێگە لە پاشەکشە کردنیان بگیرێت، بەڵام هەرچەندە یۆنانییەکان زۆریان هەوڵدا تا رێگە لە پاشەکشەی کەشتییە هەخامەنشییەکان بگرن، بەڵام سی و دوو کەشتی توانیان هەڵێن و لەناو ئەو کەشتیانەش هەندێ سەربازی هێرشبەری یۆنانی هەبوون کە دوای پاشەکشەی کەشتیگەلی هەخامەنشی بە ئەسیر گیران. ئەو کاتەی هیست ئەسپ پاشەکشەی کرد ئێوارە بوو و بە کاتی ئێستا کاتژمێر پێنج بۆ شەش بوو و چونکە مانگی حوزەیران بوو، هێشتا هەتاو لە ئاسماندا دەدرەوشایەوە.

کۆلۆفس بەدوا هەخامەنشییەکان نەکەوت، چونکە بریندار و کوژراویان هەبوو و دەیزانی تەنانەت ئەگەر ئەو کارەش بکات، ناتوانێت پێش ئێوارە جەنگێکی تر ڕێکخاتەوە. بۆیە ئەو کارەی بە بێ سوود زانی و دەشیزانی کە بە دڵنیاییەوە ئەوان لە کەنداوی گەورەی سالامین ڕێگەی خۆیان دەگۆڕن و چراکانیان هەڵناکەن تا نەیان بیننەوە. بە هۆی ئەو تێبینیانە کۆلۆفۆس دەستی لە بەدواکەوتنی کەشتییەکانی دوژمن هەڵگرت و هیست ئەسپ توانی سی و دوو کەشتی جەنگی هەخامەنشی لە لەناوچوون بپارێزێت.

هەموو مێژوونووسانی یۆنانی هاوڕان لەوەی ئەو رۆژە هەخامەنشییەکان بە باشی جەنگیان کرد و تا تەواوی سەرباز و ئەفسەرەکانی کەشتییەك نەکوژران یا بریندار نەبوون و کەس نەما کە بەرگری بکات و ئەوکات کەشتییەکە ڕادەست دەبوو.

هۆکارەکانی شکست هێنانی هەخامەنشییەکان لەو جەنگەدا بە پلەی یەکەم بۆ بەهێزتر بوونی هێزی دەریایی یۆنان دەگەڕایەوە کە پێکهاتبوو لە سەد و پەنجا کەشتی، هێزی هەخامەنشی سەد کەشتی هەبوو و بەم شێوەیە یۆنانییەکان پەنجا کەشتیان زیاتر بوو و ئەو زیاتر بوونە لە سەردەمی تاك بە تاك زۆر بە گرنگ دەزاندرا.

هۆکاری دووەم ئەوەبوو کە سەڵبەلێدانی کەشتییە ئێرانییەکان وەك هی کەشتییە یۆنانییەکان کارایی نەبوو و یۆنانییەکان زۆر رێکتر سەڵبەیان لێ دەدا و بۆیەش زۆرترین سوود لە هێزی بازووی سەڵبەچییەکان دەبینرا و ئەگەر سەڵبەچی بە رێکی سەڵبەکان بەکار نەهێنن،

وەك ئەوە وایە كە دوو ریز ئەسپ لە دوو لاوە بە عارەبانەیەك ببەسترێنەوە و هەرلایەك كارایی وزەی ئەوی تر ناهێڵێت.

هۆكاری سێیەمی ئەو جەنگەش هەر ئەوەیە كە شاعێری ناوداری لاتینی (ڤێرژیل) لە یەك لە شیعرە ناسراوەكانی بە ناوی (ئەنەیید) دەڵێت ئەو كەسەی لە ناو خاكی خۆی و بۆ بەرگری لە نیشتیمانەكەی دەجەنگێت، هێزەكەی زۆر بەهێزترە لە هێزی دوژمنەكەی. ئەو وتەیەی ڤێرژیل بە بنەمای گشتی دانانرێت و زۆر جار نەتەوەیەك بۆ بەرگری لە نیشتیمان دەجەنگێت و شكست دەخوات، ئەگەر لە كاتی هێرشدا هێزی هەر دوو لا یەكسان بێت، هێزی بەرگری لە نیشتیمان ورەی پارێزەران زیاتر دەكات و سەردەكەون، بەڵام ئەگەر هێزی هێرشبەران زیاتر بێت لەوانەیە بەرگریكاران سەرنەكەون. لەو جەنگەدا هێزی بەرگریكار زیاتر بوو و لەناو خاكی خۆشیان جەنگیان دەكرد بۆیە سەركەوتن.

وێڕای هەموو ئەو خاڵانەش نابێت ئازایەتی كۆلۆفسی فەرماندەی یۆنانییەكان لەبیر بكەین و یۆنانییەكان چونكە فەرماندەیەكی ئاوا لێهاتوو و ئازایان هەبوو، تێدەكۆشان تا وەك ئەو دلێر و لێهاتووبن. جەنگی دەریایی سالامین وەك هەموو جەنگەكانی تری دەریایی، زۆر كاریگەری لەسەر باروودۆخی سیاسی و سەربازی یۆنان دانا و داریوشیش كە لە وشكانی هێزی ئەوانی تاقی كردبۆوە، بۆی دەركەوت كە ئەوان لە دەریاش زۆر بەهێزن و پێویستە بە توانای زۆرترەوە بۆ جەنگی ئەوان ئامادەببێت.

دوای شكست خواردنی لە جەنگی سالامین، داریوش وێڕای ڕەخنەگرتن لە هیست ئەسپ كە تا ئەوكات فەرماندەی هێزی دەریایی بوو، لە كارەكەشی لایدا و پێیوت: تۆ فەرماندەی هێزی دەریایی بووی و بەرپرسیاریەتی جەنگت لەدەستدا بوو و لە تواناتدا بوو فەرمانی جەنگ نەدەی، خۆ من لە مەیدانی جەنگ نەبووم تا بزانم چ پێویستە بكرێت، بەڵام تۆ لە ئەوێ بووی و دەتزانی دوژمن بەهێزە یا نا؟ بۆچی كەشتییەكان و سەربازەكانی منت بە لە ناو بردندا.

ڕەخنەی داریوش بەجێ بوو[٢] و لە جەنگی سالامیندا خۆڕاگری و ئازایەتی سەربازەكانی هەخامەنشی بێ سوود بوو و یۆنانییەكانیش دوای ئەو جەنگە، لە ڕێگەی دەریاوە هێزیان

---

(٢) (چەند لاپەڕەیەك پێشتر باس لە گزنەفۆن كرا كە پێیوابوو كاتێك هەخامەنشییەكان دەیانزانی لاوازترن، دەبوایە پاشەكشە بكەن، بەڵام زەبیحوڵڵا پاكانەی بۆ دریاسالار هیست ئەسپ دەهێنایەوە و بە هۆكاری بوونی با كشانەوەی ئەوی بە كارێكی كردەیی نەدەزانی و ئێستاش لەپڕ بەرگری لە ئەوی لەبیر چووتەوە و پاڵپشتی ڕای داریوش دەكات. وەرگێر بۆ كوردی)

بردەوە بۆ وڵاتانی ئاسیای بچووك و شارە یۆنانییەكانیان داگیركرد. ئەو شارانە كە لە لایەن مێژوونووسەكانەوە بە دوازدە شار دیاریكراون، بەردەوام بۆ ئێران و یۆنان بابەتی گرفت و سەرئێشە بوون، چونكە ئەوان ژێردەستەی ئێران بوون و لە رووی نەتەوە و كەلتووریش یۆنانی بوون و دڵیان لەگەڵ ئەوان بوو و ئەمەش هۆكاری جەنگ بوون.

نەزاندراوە دانیشتوانی ئەوشارانە كەی لە یۆنان هاتوونەتە ئەو شوێنە و ئەو شارانەیان دروستكردووە، ئەوان ژێردەستەی ئێران بوون و بۆیە سەربازیان دەدا بە ئێران، بەڵام لە كاتی جەنگەكانی یۆنان و هەخامەنشییەكان ئەوان بە هەر شێوەیەك كە بۆیان دەكرا یارمەتی یۆنانییەكانیان دەدا و تەنانەت لە كاتی هێرشی ئەسكەندەر بۆ ئاسیای بچووك و لە سەردەمی داریوشی سێ هەم (دارای سێ هەم)، سەربازەكانی یۆنانی كە لە لەشكری داریوشی سێیەمدا دەجەنگان، لەپڕ لایەكی مەیدانی جەنگیان بەجێ هێشت و بوونە هۆكاری شكستی داریوش.

دوای ئەوەی هێزی دەریایی هەخامەنشی لە جەنگی سالامین شكستی خوارد و یۆنانییەكان جارێكی تر هێزیان لە ئاسیای بچووك پیادە كرد، دانیشتوانی شارەكانی ئاسیای بچووك بە باوەشی كراوە پێشوازیان كردن و جارێكی تر بە شێوەی كاتی ئەو شارانە لە ژێردەستەیی داریوش دەرچوون.

هیست ئەسپییش دوای لادرانی لە پایەی خۆی، گەڕایەوە بۆ ئاترۆپاتێن كە ئەمرۆ بە ئازەربایجان ناسراوە و لە ئەوێ لە كەناری دەریاچەی چی چەست و لە شاری ورمێ بە خەنجەر گەرووی خۆی بڕی و خۆی كوشت.

لە سەردەمانی تازەشدا دەریاسالاری فەرەنسی (ڤی نۆ) كە فەرماندەی هێزەكانی وڵاتانی یەكگرتوو و ئیسپانیا بوو لە جەنگی (ترا فالكارا) و بە دەستی نێڵسۆنی بریتانی شكستی خوارد. ناپلیۆن بە پێچەوانەی داریوش ئەوی لە پۆستەكەی لانەدا، بەڵام ئەو خۆی نەیدەتوانی بچێتە كۆشك و ناپلیۆن ببینێت و ئەمەی بە كەموكورتی بۆ خۆی دەزانی، بۆیە رۆژێك وەك سركردەیەكی شكاو بە خەنجەر دڵی خۆی پێكا و لە ئەنجامدا مرد.

هاوكات لەگەڵ داگیركردنەوەی شارەكانی ئاسیای بچووك لە لایەن یۆنانییەكانەوە، داریوش كە لە جەنگی دەریایی سالامین و بە هەندێك وتەی تر لە دورگەی كریتی بوو، گەڕایەوە بۆ وڵاتەكەی و نەخۆش كەوت و هەر ئەو نەخۆشییە بۆوە هۆكاری مردنی، بەڵام لە نێوان نەخۆش كەوتن و مردنەكەی چەندین ساڵی خایاند. بەڵام تا ئەمرۆ زانیاریمان نییە كە نەخۆشی داریوش چ بووە، بەڵام گومانمان نییە كە نەخۆشییەكی توند بووە.

پزیشکی داریوش بۆ ئەو نەخۆشییە ناوی (کۆدمان یا کەدمەن) بوو و بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشییەکەی، کاهو و کاسنی دەدا بە داریوش و ڕێگەی خواردنی خواردنە ئاساییەکانی لێ گرت و دەیوت کە پاشا تەنها بۆی هەیە بەو دوو خواردن خۆی تێر بکات و بە ڕێگەی ئەو خۆراکانەوە دەزاندرێت کە نەخۆشی داریوش دەبێت لە جەرگی بووبێت، چونکە ئەو خۆراکانە لە لایەن پزیشکانی کۆنەوە بۆ توانا بەخشینەوە بە جەرگ دەدرانە نەخۆش.

داریوش دوای ئەوەی نەخۆش کەوت، مەردۆنیوسی زاوای کردە فەرماندەی لەشکر تا بچێتە جەنگ بۆ ئاسیای بچووك، مەردۆنیوس هاوسەری خوشکی خەشایار بوو و دەزانیین کە خەشایار کوری داریوش و کچی ئاتووسای کچی کوروشی گەورە بوو. مەردۆنیۆس لە دایکیەوە دەبۆوە نەوەی کوروش و زاوای داریوش بوو و بە پیاوانی ناوداری هەخامەنشی دەناسرا و سەرەرای رەچەلەکەکەی، پیاوێکی ئازا و لە رووی جەستەییەوە بەهێز بوو.

کوروش و کەمبۆجییە و داریوش چونکە فارس بوون واتە خەڵکی ناوچەی فارس بوون، تەنها لە گەڵ فارسەکان هاوسەرگیریان دەکرد و لە ئەوان کچیان دخواست، مەردۆنیۆس خەڵکی مازەندەران بوو و بە فارس دانەدەنرا، بەڵام داریوش کچەکەی بە ئەو بەخشی و ئاتووسای خێزانیشی ڕەزامەند بوو بەو هاوسەرگیریە، ئەمەش دەگەڕایەوە بۆ ئازایەتی و دلێری و وەفاداری ئەو کە بوونە هۆی ئەوەی ئاتووسا و داریوش ئەویان لە فارسێك پێ باشتر بێت.

چونکە مەردۆنیۆس لە کەنارەکانی مازەندەران لەدایك ببوو و لە ئەوێ پەروەردە ببوو، تا ڕادەیەك لە دەریاوانیشی دەزانی، داریوش دوای نەخۆش کەوتنی ئەوی کردە فەرمانڕەوای تەوای وڵاتانی ئاسیای بچووك و فەرماندەی هێزی دەریایی هەخامەنشی لە رۆژئاوا.

داریوش دەیزانی مەردۆنیۆس زانیاری زۆری لە بابەت دەریاوە نییە، بەڵام چونکە ئەو لە بەرێوەبردن زۆر شارەزا بوو، بریاریدا کە فەرماندەیی هێزی دەریایی لە رۆژئاوای پێ بسپێرێت. هێزی دەریایی هەخامەنشی لە جەنگ لە گەڵ یۆنان لە دەریای مەدیتەرانە لە ناو چوو و دەبوایە لەشکرێکی بەهێزی دەریایی دروست بکرێتەوە تا یۆنان شکست بدات، داریوش دەیزانی بۆ دامەزراندنەوەی ئەو لەشکرە پێویستی بە کەسێکە کە لە بواری بەرێوەبردن زۆر کارامە بێت و تەنها هەبوونی زانیاری لەبارەی دەریاوانی بەس نییە.

ئەو رۆژەی داریوش بانگهێشتی مەردۆنیۆسی کرد تا ئەو فەرمانەی پێبدات و پێی بلێت کە پێویستە چ بکات، پێیوت: دان نان بە خاڵە لاوازەکان سەرەتای بەهێز بوونە و پێویستە ئێمە دان بنێین کە یۆنانییەکان دوژمنێکی بەهێزن و ئێمە لە وشکانی دەتوانین بەسەریاندا زاڵ ببین،

بەڵام لە دەریادا ئەوان زۆر بەهێزترن. من پێت ناڵێم لە وشکانی چ بکە، چونکە خۆت پیاوێکی شارەزای لە بواری جەنگ و بە ئەزموونی و دەزانی دوژمنەکەت لە وشکانیدا لەناو ببەی، بەڵام یەکەمجارە کە بۆ جەنگی دەریایی ئامادەکاری دەکەی و ئەزموونت لەو بوارە نییە، بۆیە پێت دەڵێم بۆ جەنگ لە دەریا ئەوەندەی دەتوانی کەشتی دروست بکە و ئامادەیان بکە، هەروەها سەربازانی دەریایی کە لە کەشتییەکان و لە دەریا دەجەنگن، پێویستیان بە پەروەردەکردن و ڕاهێنانی تایبەتییە.

تۆ پێویستە ئەوەندەی دەتوانی کەشتی دروست بکەی تا بە لانی کەم ژمارەیان یەکسان بێت بە ژمارەی کەشتییەکانی یۆنان و ئەوکات دەبێت پشت ڕاست بی کە هێزی تۆ بەهێزترە لە هێزی دوژمن و ئەوجار بچی بۆ جەنگ. بۆ ئەوەی بتوانی چەندەی دەتەوێت کەشتی دروست بکەی، من دوو کروور داریك زێڕ بە تۆ دەدەم و لە گەڵ خۆتی ببە تا بتوانی مووچەی کەشتی سازەکان بدەی.

وەك دەزانی ئێمە لە پاشاکانی ئاسیای بچووك باج وەرناگرین و تا ئەمڕۆش باجمان لە خەڵکی شارە یۆنانییەکانی ئاسیای بچووك وەرنەگرتووە، بەڵام چونکە ئەوان پاڵپشتی یۆنانییەکان دەکەن، پێویستە دوای سەرکەوتنت بەسەریاندا باجیان لێ وەربگری، بەڵام وریابە ئازاریان نەدەی، چونکە تا خەڵك لەوێ نەبن تۆ ناتوانی باجیان لێ وەربگری.

ئەگەر من لە نەخۆشی ڕزگارم ببێت دێم و خۆم دەگەیێنم بە تۆ، بەڵام ئەگەر چاك نەبوومەوە پێویستە دوای ئازاد کردنی شارە یۆنانییەکان، گەورەترین ئامانجی تۆ پێویستە لەناو بردنی هێزی دەریایی یۆنان بێت، چونکە تا ئەو ڕۆژەی یۆنان ئەو هێزە گەورە دەریاییەی هەبێت ئێمە ناتوانین بە سەریاندا زاڵ ببین. گریمان ئێمە لە ڕێگەی گەلی بۆسفۆرەوە هیزمان بردە یۆنان و تا دڵی ئەو وڵاتە ڕۆیشتین، دواتر هێزی دەریایی یۆنان لە ئاسیای بچووك هێرشمان دەکەنەسەر و یەك کەشتی ئێمە ناتوانێت لە دەریاکانی ڕۆژئاوا تێپەڕبێت.

دوای ئەو ئامۆژگاریانە مەردۆنیۆس بە فەرماندەیی سوپایەك بەرەو ئاسیای بچووك بەرێکەوت. دەبێت سەرەنج بدەین کە داریوش بۆ ئاسیای بچووك خەشایاری کوری نەنارد و مەردۆنیۆسی زاوای هەڵبژارد و ئەمەش دوو هۆکاری هەبوو: یەکەم/ داریوش نەیدەویست کورەکەی لێی دوور بکەوێتەوە بۆ ئەوەی ئەگەر بمرێت، لە جێگەی باوکی ببێتە پاشا. دووەم/ دەیزانی خەشایارشا لە بەرێوەبردن وەك مەردۆنیۆس بە توانا نییە و بۆ دروستکردنی هێزێکی گەورەی دەریایی بەرێوەبەرێکی بە توانا پێویستە.

هەر ئەوکاتە وات لە کاتی شکست خواردن لە جەنگی سالامین، بیرۆکەی پەیوەست کردنی دوو دەریای (مەدیتەرانە و فارس) لە مێشکی داریوش چەکەرەی کرد. داریوش ئەوکات سێ هێزی دەریایی هەبوو کە یەکەمیان لە دەریای مازەندەران بوو، دووەمیان لە کەنداوی فارس و دەریای عومان و زەریای هند بوو و سێ هەمیان لە دەریای مەدیتەرانە بوو. هێزی دەریایی مازەندەران بەهێز نەبوو و تەنها ڕێگەی لە چەتەکانی دەریا دەگرت تا هێرش نەکەنەسەر کەنارەکانی مازەندەران.

هێزی دەریایی داریوش لە کەنداو و دەریای عومان و زەریای هند تا رادەیەك بەهێز و گەورە بوو و ئەگەر داریوش توانیبایە ئەو هێزە بگوازێتەوە، ئەوا لە سالامین شکستیان نەدەخوارد و بەهێزتر دەبوون لە هێزی یۆنان، بەڵام داریوش نەیدەویست ئەو کەشتیانەی لەو دەریایانە هەیبوو، بۆ دەریای مەدیتەرانە بگوازێتەوە، چونکە ڕێگای پەیوەندی ئەو دەریایانە نەبوو.

ئایا داریوش نەیدەزانی ئەگەر ئەو هێزەی کەنداوی فارس و دەریای عومان بکەوێتەرێ و کەنارەکانی ئەفریقا بەرەو باشوور ببڕێت و لە کەنارەکانەوە خۆی بگەیێنێتە گەرووی (جبل تارق)، دەگاتە دەریای مەدیتەرانە؟ ئایا ئەو نەیدەزانی کە لە ڕابردوودا هەندێ دەریاوان ئەوکارەیان کردو و لە باشووری ئێران کەوتنەرێ و دوای تێپەڕبوونیان بە دەریاکان تەریب بە کەنارەکانی ئەفریقا خۆیان گەیاندە مەدیتەرانە؟ بۆچی هێزی دەریایی باشووری ئیمپراتۆریەکەی بە هەمان ڕێگەدا نەگەیاندە ئەو دەریایە؟

گریمان داریوش ئەو ڕێگە دەریاییەی نەزانی بێت، خۆ بە هۆی بوونی لەگەڵ کەمبۆجییە بۆ ماوەیەك لە میسر، دەیزانی لە ڕێگەی زەریای هند و دوای بڕینی کەنارەکانی ئەفریقا دەتوانێت بگاتە مەدیتەرانە و لە میسر هەموان ئەو بابەتەیان دەزانی. بەڵام ئەو کارەی نەکرد تا هێزی دەریایی هەخامەنشی بە فەرماندەیی هیست ئەسپ بەهێز ببێت و لە لایەکی تر بوونی هێزی دەریایی لە کەنداوی فارس و دەریای عومان و زەریای هند پێویست بوو یا داریوش بیری دەکردەوە کە کەشتییەکانی پێویستیان بە دوو ساڵ هەیە بۆ بڕینی ئەو ڕێگەیە.

بیرۆکەی دروستکردنی ڕێگەیەکی ئاوی لە نێوان دەریای سوور و دەریای مەدیتەرانە لەوکاتەدا کەوتە ناو مێشکی داریوش و ویستی لە نێوان دوو دەریادا کەناڵێك هەڵکەنێت، بەڵام ئەندازیارەکان ئاگاداریان کردەوە کە ئەو کەناڵە سەد تا سەد و پەنجا ساڵی پێویستە و داریوش تێگەیشت تەمەنی بەشی ئەو کارە ناکات و هەوڵیدا لە ڕێگەی زێی نیل، ڕێگەیەك لە نێوان دوو دەریادا دروست بکات.

ئەوکات زێی نیل بە حەوت لق دەڕژایە ناو دەریای مەدیتەرانە و هیرۆدۆت کە دوای مردنی داریوش لە دایك بووە، هەر حەوت لقی دیتووە و ناوەکانی ئەوانی نووسیون. ئێستا زێی نیل تەنها بە دوو لق دەڕژێتە ناو دەریای مەدیتەرانە.

داریوش لە دوایین لقی رۆژهەڵاتی نیلەوە کەناڵێکی هەڵکەند و ئەو زێیەی بە دەریای سوور بەستەوە و چونکە دەیزانی کەشتی لە ئاوی شیرینی زێ زیاتر لە ئاوی سوێری دەریا دەنیشێت، فەرمانی کرد تا ئەو کەناڵە زۆر قووڵ بکەن و جگە لەوەش فەرمانیدا تا بەردەوام تەواوی لقە رۆژهەڵاتییەکانی نیل کە دەگەیشتنەوە کەناڵەکە، خاوێن بکرێنەوە لە لیتە و پیسی تا قووڵی زێیەکە زیاد بکات و کەشتییە گەورە جەنگییەکانی هەخامەنشی کە لە دەریای قەلزەم یا دەریای مەدیتەران دەهاتنەناو زێی نیل، بتوانن بە زێیەکەدا تێپەڕبن. خاوێنکردنەوەی بەردەوامی هەموو بەشەکانی لقی رۆژهەڵاتی نیل لە لایەن داریوش، هۆکار بوو بۆ زۆر بوونی ماسی بچووکی جۆری (ساردین) لە زاری ئەو زێیە و ئەو ماسییە بچووکە بە رێژەی زۆر ڕاو دەکرا. چونکە خۆراکی ئەو ماسییە لەناو پێکهاتەی لیتەی رووباری نیل بوو و خاوێن کردنەوەی رووبارەکە دەبۆوە تێکدانی لیتە و دەستکەوتنی خۆراکی زۆر بۆ ئەو ماسییە.(٣)

ئەو کەناڵەی بە فەرمانی داریوش هەڵکەندرا بۆ ئەو سەردەمە پانایی باشی هەبوو و دوو کەشتی بەیەکەوە دەیانتوانی لێی تێپەڕبن، ئەو کەناڵە لە میسر نزیکەی چوارسەد و پەنجا ساڵ سوودی لێ وەرگیرا. وەك مێژوونووسان دەڵێن ئەو کەناڵە بە درێژایی دەسەڵاتی هەخامەنشییەکان و دواتر دوای داگیرکردنی ئێران لە لایەن ئەسکەندەر و لە سەردەمی جێ نشینەکانی ئەسکەندەر (کە بە بتالسە ناسرابوون) فەرمانڕەواییان لە میسر دەکرد، هەر هەبووە و تەنانەت لە سەردەمی (کیلیۆپاترای حەوتەم) مابووە و لە بەڵگەنامە مێژووییەکاندا هاتووە کە ئەو بە سواری کەشتی لەو کەناڵەوە رۆیشتۆتە دەریای سوور و هەر بەو کەناڵەشدا گەڕاوەتەوە.

لە یەك لە پاپیرۆسە میسرییەکان کە لە موزەخانەی لوڤەری پاریس پارێزراوە، نووسراوە کە یەك لە فێرعەونەکانی میسر لە نێوان زێی نیل و دەریای سوور کەناڵێکی هەڵکەندووە و کەشتییەکان پیایدا هاتووچۆیان کردووە، کە بە هۆی گرینگی نەدان پێی، بە زوویی لەناوچوو.

---

(٣) (گۆڤاری راوەماسی لە بەریتانیا دەردەچێت و نووسیویەتی دوای دروستکردنی ئاوبەندی گەورەی (سد العالی) لەسەر زێی نیل، بە هۆی خاوێن نەکردنەوەی لیتە و مانەوەی لە پشت ئاوبەند و نەگەیشتنی بۆ زاری زێیەکە، ماسی تا ڕێژەی بیست لە سەدی جاران کەم بۆوە. زەبیحوڵڵا.)

دوور نییە داریوش کەناڵەکەی خۆی هەر بە شوێنی کۆنی ئەو کەناڵەدا بردبێت و بۆیە بە زوویی تەواو بوو و لە کارە ئەندازەییەکان گرفتی بۆ دروست نەبوو، ئەگەر داریوش کەناڵی تازەی هەڵکەندبایە کاتی زۆرتری پێویست دەبوو. ئەو کەناڵە زۆر کاریگەر بوو بۆ بەهێز کردنی هێزی دەریایی هەخامەنشی و تەنانەت ئاسان بوونی داگیرکردنی یۆنان لە لایەن خەشایارشا، بەبێ ترسان لە هێزی دەریایی ئەو وڵاتە بە هۆی ئەو کەناڵەوە بوو.

بابەتی شارە یۆنانییەکانی ئاسیای بچووك لە مێژووی ئێران زۆر گرنگ بووە، بەڵام مێژوونووسە تازەکان زۆر بایەخیان پێنەداون و بەڵگەشمان ئەوەیە کە هیچیان ناوی دوازدە شارە یۆنانییەکە نازانن و بۆ وتنی ناوی ئەو دوازدە شارە، پێویستیان بە گەڕانەوەیە بۆ پەرتووکەکانیان. ناوی دوازدە شارەکان بۆ خوێنەری بەرێز دەنووسین، چونکە لەمەودوا بابەتەکەمان گەیشتووتە مەردۆنیۆس و پێویستمان بە زانینی ناوەکانە. مەردۆنیۆس لەمەودوا دەبوایە باجیان لێ وەربگرێت و لە لایەکی تر ئەو شارانە شوێنی لە دایك بوون و پێگەیشتنی زۆر ناودارانی مێژوو بوون.

لە کەنارەکانی ئاسیای بچووك تەنها دوازدە شار نەبوو و شاری تر زۆر بوون، بەڵام ئەو دوازدە شارە بە پلەکانی یەکەم و دووەم لە گرنگی دەهاتن و بریتی بوون لە: (کەمال سەدوون، هالیکارناس، میلتۆس، دیدی میس، ئابیدۆس، ئاسۆس، لیدۆس، ئەفەسۆس، فیس کەسۆس، تێل مەسۆس، ئۆلیمپۆس و ئیسۆس) هەندێ لەو ناوانە لە ناوی شارەکانی یۆنان خۆی وەرگیرابوون، هەروەك چوون لە کاتی کۆچی بەریتانییەکان بۆ ئەمریکا، ناوی هەندێ لە شارەکانی بەریتانیا بۆ ئەمریکای تازە داندرا.

یەکەم شار واتە (کەمال سەدون) لە تەنیشت گەرووی بۆسفۆر و کەناری رۆژهەڵاتی ئاسیا بوو و دوایین شار واتە (ئیسۆس) لە نزیك سنووری سوریای ئێستا و لە کەناری دەریا بوو. وێرانەکانی ئەو شارانە لە ئاسیای بچووك ماوە و ساڵانە بە لانی کەم دووسەد و پەنجا هەزار کەس بۆ دیتنیان دێن و ئەگەر کەسێك بیەوێت رۆمانێکی مێژوویی بنووسێت، باشترین رۆمان لەسەر سەربردەی ئەوان دەتوانێت بنووسێت.

لە هەندێ لەو شارانە لە سەردەمی هەخامەنشی و ئەشکانی و ساسانییەکان، دەسەڵاتدارانی ئێرانیش فەرمانڕەوا بوون و گۆڕەکانیان لەو شارانە ماوە، بەناوبانگترینیان (مۆزۆڵ) فەرمانڕەوای ئێرانی بووە کە لەگەڵ شاژنە جوانەکەی (ئارتیمیس) دەسەڵاتی شاری هالیکارناسیان بەرێوە بردووە.

مۆزۆڵ لە لایەن خەشایارشای کوری داریوش کرایە فەرمانڕەوای ئەو شارە، بەڵام لە تەمەنی گەنجیدا مرد و دواتر ئارتیمیسی خێزانی بۆوە فەرمانڕەوای شارەکە.

ئارتیمیس بۆ هاوسەرە کۆچ کردووەکەی گۆڕێکی تایبەتی دروستکرد کە بۆوە یەك لە تازەگەریە حەوتەوانەکانی دونیای کۆن و ئەوەندە ناوبانگی دروستکرد کە تەنانەت ئێستاش کاتێك ئەورووپییەکان دەڵێن گۆڕێکی بە شکۆ دروست بکەین، دەڵێن با (مۆزۆلەیەك) دروست بکەین. تەنانەت لە زۆر لە فەرهەنگەکانی وشەدا (مۆزۆلە) بە واتای (گۆری بە شکۆ) دێت و لە هەندێ لە پەرتووکەکاندا نووسراوە کە یەکەمین مۆزۆلە لە هالیکارناسە و هیچ یەك لە ئەوان سەرنجی ناوی ئەو کەسەیان نەداوە کە لە گۆرەکەدایە و نەیاننووسیوە کە مۆزۆلە لە ناوی مۆزۆل وەرگیراوە.

ئارتیمیس خەڵکی ئێران بوو و بۆ سازکردنی مۆزۆلە، سوودی لە نەخشەی کۆشکی پێرسپۆلیس وەرگرت و هەروەك ئەو کۆشکە لەسەر پانە بەردێکی مەزن دروستکرابوو، شاژنە ئێرانیش گۆڕی هاوسەرەکەی لە سەر پانە بەردێکی گەورە کە چل مەتر بەرزتر بوو لە دەورووبەرەکەی، دروستکرد و بینایەکی دروستکرد کە دوای بیست و چوار سەدە، هێشتا جێگەی سەرسوڕمانە و درێژی حەوشەی ئەو بینایە (٢٤٢) مەتر و پانییەکەی (١٠٥) مەترە و ئەستوونی بەرزی بەردین لە شێوەی ئەستوونەکانی پێرسپۆلیس لەو گۆڕە هەیە.

ئێستا لە دانیشتوانی ئاسیای بچووك جگە لە زاناکان و ڕێپێشاندەرانی گەشتیاران، نازانن شارێك بە ناوی هالیکارناس لەو شوێنە هەبووە، جگە لە زانایان و خەڵکی گەشتیار نەبێت و تەنانەت لەسەر نەخشەکانیش ئەو شارە نییە، بەڵام شاری (بۆدرۆم) لە شوێنی ئەوشارەیە و کەوتووتە بەرانبەر دورگەی (کوس) کە شوینی لەدایك بوونی (بوقرات) پزیشکی یۆنانی ناسراو بووە و ئەو شارەش ژێردەستەی ئێران بووە و بەو پێوەرە ئەگەر مایەی سەرسوڕمانیش بێت، بوقرات لە رووی رەگەزنامەوە بە ئێرانی دەژمێردرێت، بەڵام ئەوە ڕاستینەیە(٤).

هەندێ لەو شارانە لە مێژووی ئێران ناوبانگی شومیان هەیە و یەك لەوانیش (ئیسۆس) لە کەناری کەنداوی (ئێسکەندەروونە) کە بە ئاسانی لەسەر نەخشە دەدۆزرێتەوە، لە پێدەشتێکی پەنا ئەو شارە لە گەرمەی جەنگی یۆنان و هەخامەنشییەکان، لەپڕ سەربازانی ئاسیای بچووکی

(٤) (جارێکی تر باس کرا خەڵکی ئەو وڵاتەی لە لایەن وڵاتی دووەمەوە داگیر دەکرێت، ناسنامەی وڵاتی دووەم وەرناگرن و ناسنامەی خۆیان بۆ دەمێنێتەوە و ئەوە هەڵەیەکە کە بە دەستی ئەنقەست زەبیحوڵڵا دەیکات تا زاناکان بە ئێرانی ناو ببات و لەناو ئەوانیشدا بۆقرات. وەرگێر بۆ کوردی)

ناو لەشکری هەخامەنشی جەنگیان بەجێ هێشت و بەمەش ئەسکەندەری نۆزدە ساڵی، بەسەر هەخامەنشییەکان سەرکەوت.

لە نێوان ئەو دوازدە شارەدا هەندێکیان هەبوون کە لە رووی مێژووی ئێرانەوە ناوبانگیان باش بوو و یەك لەوان (ئۆلیمپۆس) بوو کە یۆنانییەکان بە (ئۆلەمپ) شاخی ناسراوی یۆنانی و شوێنگەی خوایانی یۆنانی (بە باوەڕی یۆنانییەکان) ناو دەبرد و فەرمانڕەوا هەخامەنشییەکان ئەو شوێنەیان کردە شوێنی وەرزش، واتە ئۆلەمپیاد لەو شوێنە دروستبوو و ساڵانە یەکجار وەرزشکارە دیارەکانی وڵاتانی ژێردەستی هەخامەنشی لە ئۆلەمپیاد کۆدەبوونەوە و وەرزشیان دەکرد، ئەوکاتانەی پەیوەندی یۆنان و هەخامەنشییەکان باش بوایە، یۆنانییەکان بەشداری پێشبرکێیە وەرزشییەکان دەبوون.

*       *       *

وەك باسمان کرد دوای ئەوەی هێزی دەریایی هەخامەنشی لە جەنگدا شکستی خوارد، شارە یۆنانی نشینەکانی ئاسیای بچووك لە گەرووی بۆسفۆر تا کەنداوی ئێستای ئیسکەندەروونە کەوتە دەست یۆنانییەکان، چونکە هێزی دەریایی یۆنان دەستی بەسەر هەموو کەنارەکانی ئاسیای بچووکدا گرت و بۆ داگیرکردنی ئەو شارانە یۆنانییەکان پێویستیان بە لەشکری وشکانی نەبوو و هەر شارێکیان بە ئاسانی داگیر دەکرد.

بەڵام وڵاتەکانی ئاسیای بچووك ژێردەستی هەخامەنشییەکان بوون و پاشا و دەسەڵاتدارەکانیان لە گەڵ هەخامەنشییەکان دۆست و هاوپەیمان بوون، مەردۆنیۆس دوای ئەوەی گەیشتە ناو خاکی ئاسیای بچووك زانی کە پێویستە لە رێگەی وشکانی هێرش بکاتە سەر شارەکانی ئەوێ و ئەو شارانە داگیر بکات.

ئەگەر مەردۆنیۆس ویستبای بە جیا هێرش بکاتە سەر هەر شارێك، پیویستی بە هێرشی وشکانی و کاتی زۆر بوو، بۆیە هەندێك لە دەسەڵاتدارانی ئەوێی ڕاسپارد تا لە گەڵ خەڵکی ئەو شارانە بدوێن و بەڵێنی پارێزراو بوونی سەر وماڵیان پێ بدەن لە کاتێکدا کە بەبێ جەنگ خۆیان ڕادەست بکەن و بە پێچەوانەوە ئەگەر بەرگری بکەن هەموویان دەکوژرێن و تاڵان دەکرێن. داریوش لە گەڵ شکست خواردوو تەنانەت ئەگەر بەرگریشی کردبایە ئەو رەفتارەی نەدەکرد، بەڵام مەردۆنیۆس پێیوابوو ئەوان هاوکاری دوژمن بوون و پێویستە سزایان بدات.

یۆنانییەکان لە دەریا بەهێز بوون، بەڵام هێزی وشکانیان بۆ ئەو شارانە نەهێنابوو و مەردۆنیۆس توانی هەموو شارەکان بگرێتەوە، بەبێ ئەوەی ناچار بە تالآن یا کوشتار ببێت. بە گەیشتنی لەشکری هەخامەنشی و هاوپەیمانەکانیان بۆ نزیك هەر شارێك و دوای وتووێژ لەگەڵ دانیشتوانی شارەکان، سەربازە دەریاییەکانی یۆنان دەرۆیشتن و شارەکانیش بێ جەنگ ڕادەست دەبوون.

لە سێ شاری (ئابیدۆس، ئەفەسۆس و هالیکارناس) سێ کارگەی گەورەی کەشتی سازی هەبوو کە کاریان بۆ یۆنانییەکان دەکرد، مەردۆنیۆس دەستی گرت بەسەر ئەو کەشتیانەی تەواو نەکرابوون و فەرمانی کرد پەلە بکەن لە دروستکردنی کەشتی زیاتر. هەروەها کارگەیەکی لە شاری (ئەس میرین) یا (ئەزمیر) دروستکرد و کارگەکانی کەشتی سازی کەنارەکانی سوریا بەگەڕ خستەوە.

فەرمانرەوای میسر ڕاسپێردرا تا کەشتی دروست بکات و لە هەندێ شوێن کەشتی بچووکیان سازدەکرد، چونکە کەشتی بچووك دەیتوانی لە زێدا و لە ئاوێك کە قووڵایی کەمتر بێت، بێ گرفت بڕوات و بۆ گواستنەوەی خواردەمەنی و چەك پێویست بوون و کەشتییە گەورەکان وێڕای ئەوەی گەورە بوون ئەوکارەیان پێ نەدەکرا، چونکە نزیکەی هەزار سەرنشینیان هەبوو و تەنانەت لەکاتی خەودا شوێنی تەواویان دەست نەدەکەوت و سەڵبەچیەکان لە پشت سەڵبەکانیانەوە دەخەوتن.

پێویستە ئەو ڕاستییە بڵێین کە لە جیهانی کۆن کەشتی سازی بەرەو دوا رۆیشتەوە. لە سەردەمی هەردوو ئیمپراتۆریەتی یۆنان و هەخامەنشیدا کەشتی دروست دەکرا بە توانی هەزار تەن و ئەو کەشتیانە درێژ و باریك بوون تا توانایان هەبێت بە سەڵبە برۆن.

بەڵام دوای ئەو سەردەمە و لە سەدەی پازدە و سەرەتای سەدەی شازدە و لەکاتێك دەوڵەتانی پورتۆگاڵ و ئێسپانیا بە دوای دۆزینەوەکاندا دەگەڕان، توانای کەشتییەکانیان بۆ دووسەد تا دووسەد و پەنجا تەن کشایەوە. بەڵام دواتر جارێکی تر توانای کەشتییەکان زیادی کردەوە و ئێستا کەشتی بارهەڵگری زۆر گەورە تا توانای نیو ملیۆن تەن و زیاتر دێنە سەر ئاو، زاندراوە تا کەشتییەکان قورستر بن زیاتر لە ئاو رووەدەچن و بۆیە پێویستە بەندەرەکان بۆیان ئامادەبکرێن و لە رابردووشدا ئەو گرفتە هەبووە، بۆیە کەشتی بچووك بە دوور بوو لەو گرفتانە.

فەرمانرەوای هەخامەنشی لە میسر کە ناوی (پی تان) بوو بە داریوشی ڕاگەیاند کە لە باشووری میسر و لە وڵاتی کووش، نەتەوەیەکی ڕەش پێست نیشتەجێن کە پیاوەکانیان لە

پیاوە ئازاکانی جیهان هەژمار دەکرێن و وێڕای ئەو هێزە زۆرەی هەیانە، وەك بەرخۆلەکان لەسەرە خۆن و زوو هۆڤری مرۆڤ دەبن، تەنها بە نانەسك لەگەڵ مرۆڤ رێك دەکەون و هیچی تریان ناوێت و پێموایە بۆ کار کردن لە کەشتییەکان و تەنانەت وەك سەربازیش لە کەشتییەکانماندا لە باشترین پیاوەکانی جیهانن.

داریوش پێشنیاری پی تانی بۆ مەردۆنیۆس نارد و ئەویش پەسەندی کرد و هەندێکیان بۆ سەڵبەلێدان و سەربازی لە کەشتییەکاندا بەکرێ گرت، دوای ئەو بەرواری ڕەش پێستەکان کە هەموویان بەهێز و بە هیکەل بوون، هاتنەناو کەشتییە هەخامەنشییەکان و وەك سەڵبەچی و سەرباز دەستیان بەکار کرد و ئەو ڕووداوە بۆوە هۆکاری ئەوەی هیرۆدۆت کە بە رەچەڵەك یۆنانی و بە شوێنکەوتەی هەخامەنشی دیاری دەکرا، بنووسێت: هەخامەنشییەکان ڕەش پێستەکانیان هێنایە ناو کەشتییەکانیان تا یۆنانییەکان بترسێنن و وایان بیر دەکردەوە کە یۆنانییەکان کۆرپەن لەو شتانە بترسێن.

ئەگەر لە کاتی نووسینی ئەو بابەتەدا هیرۆدۆت مەبەستی قسەی خۆش نەبووبێت و بە ئەنقەست ئەوەی نووسی بێت، دەبێت بگوترێت کە بیرتەسك بووە و تێنەگەیشتووە کە بە کرێگرتنی رەش پێستەکان لە کەشتییە ئێرانییەکاندا لەبەر توانا و هێزیان بووە، نەك بە هۆی پێستەکەیان تا یۆنانییەکان لێ یان بترسن.

وتمان سەڵبەلێدان لە ناو کەشتییەکاندا کارێکی قورس بوو، وێڕای ئەوەش کاتێك ڕەش پێستەکان هاتنەناو هێزی دەریایی هەخامەنشی و لە پشت سەڵبە دانیشتن، چونکە لە وڵاتی خۆیان و لە جەنگەڵدا کاری ئەوەندە قورسیان ئەنجامدا بوو کە زۆر لە سەڵبەلێدان قورستر بوون و لە کاتی سەڵبەلێدان وایان دەزانی کە یاری دەکەن.

گەزنەفۆن دەڵێت: سەربازە ڕەش پێستەکان لە کەشتییەکاندا کاتێك جەنگ دەستی پێدەکرد، پێدەکەنین و یاریان دەکرد. ئەو وتەیە دەرخەری ڕاستینەی ئازایەتی و لێهاتوویی ئەوانە و ئەوان لە وڵاتەکەی خۆیان لە گەڵ ئاژەڵە درندەکان سەرگەرمی جەنگ دەبوون و بە سەریاندا سەردەکەوتن، بۆیە جەنگ لە گەڵ سەربازەکانی مرۆژیان زۆر لە لا ئاسایی بوو.

یەك لە دیاردەکانی سەردەمی داریوش، خزینی وشەکانی میسری و یۆنانی بوو بۆ ناو زمانی فارسی و زمانەکانی بابلی و عیلامی، هەرچەندە ئەو کەتیبانەی لەدوا داریوش بەو سێ زمانە ماونەتەوە زۆر نین، بەڵام کاریگەری ئەو زمانانە لەو کەتیبانە دیارە و تەنانەت تا ئێستاش هەندێ ناوی فارسی بە ناوی میسری و یۆنانی دەزاندرێن.

لە زمانی فارسی هەر وشەیەك بە (س) کۆتایی بێت یۆنانییە و (داریوش) کە لە یۆنانی (داریوس) دێت و (سیرۆس) کە بۆتە (کۆروش[٥]) یۆنانین. لە وشە ناسراوەکانی ئێستا لە زمانی فارسیدا ماونەتەوە و هەموان بە فارسیان دەزانن دەتوانین هەر دوو وشەی (عروس، خروس[٦]) باس بکەین، بنەچەی (خروس) لە ئێران بووە، بەڵام ئەو خوێندنەوەی ئێستا بۆ ئەو دەکرێت یۆنانییە.

بیرکردنەوەیەك هەیە کە دوای داگیرکردنی ئێران لە لایەن یۆنانییەکانەوە ئەو وشانە هاتوونەتە ناو زمانی فارسی، بەڵام لە سەردەمی کوروش و دواتر خەشایارشای کوری و دواتریش دوای هاتنی یۆنانییەکان، زمانی یۆنانی بۆوە زمانی تەختی پاشایەتی و هەموو ئەوانەی دەبوونە کارمەندی کۆشك دەبوایە ئەو زمانە بزانن، بەڵام خەڵکی ئاسایی بە فارسی دەدوان.

دوای سەرکەوتنی ئیسلامیش بە سەر ئێران، ئەمە دووبار بۆوە و ئەوانەی دەیانەویست لە کۆشك کار بکەن دەبوایە عەرەبی بزانن و خەڵکی ئاساییش بە فارسی دەدوان و مایەی سەرسوڕمان نابێت کە بزانین تا سەرەتای سەدەی حەوتەمیش لە هەندێ شوێنی ئێران خەڵك بە زمانی پەهلەوی ساسانی دەدوان و بەڵگەی مێژوویی زۆرن لەو بارەوە و جوگرافی ناسەکانی وەك (ئیبن خوردادیە، ئیبن ڕستە، ئێستەخری و ئیبن فقیە و... هتد) لە پەرتووکەکانیاندا باسی ئەو بابەتە دەکەن.

ووشە میسرییەکانی وەك (کەم، تەبەس، تۆن و ڕەبات) ئەوکات هاتنەناو زمانی فارسی و (کەم) لە فارسیدا گۆڕا بە (قەم)، لە زمانی میسری بە مانای (زەوی ڕەش) دەهات، بۆیە لە ئێران هەموو ئەو شوێنانەی زەوییەکانیان ڕەش بوو بەو ناوە ناسران. ئێمە وشەی (رباگ) بە وشەیەکی عەرەبی دەناسین و بە تایبەتی کە ئێستا بە (گ) عەرەبی دەنووسرێت، بەڵام میسرییە و پێش ئەوەی عەرەبیەکەی بێتە ناو فارسی، میسرییەکەی هات و دواتر لە سەردەمی دەسەڵاتی ئەشکانی و ساسانییەکان و دواتر سەردەمی دەسەڵاتی یۆنان بە سەر

(٥) ( بیروڕایەك لەو بارەوە لە لایەن نووسەر سید کماڵی ابراهیمی لە رۆژنامەی هەولێر ژمارە (١١٠٨) لە (٢٠١١/٧/٣١) لاپەڕەی (١٧) بەشی فەرهەنگ باسکراوە و بە وردی باس لەوە دەکات کە ئەو ناوە کوردییە و لە (کورە ڕەش) هاتووە و دواتر دوچاری سوانی زمانەوانی بووە. وەرگێر بۆ کوردی)

(٦) (عروس واتە بووك و خروس واتە کەڵەشێر، وەرگێر بۆ کوردی)

ئێراندا، دوور کەوتەوە. کاتێك عەرەبەکان هاتنە ئێران، ئەو وشەیەیان لە میسرییەکان وەرگرتبوو و جارێکی تر لە کاتی دەسەڵاتی خۆیان لە میسرییەوە هێنایەوە بۆ زمانی فارسی.

هەڵبەت نابێت ئەو بابەتە لەبیر بکەین کە یۆنانییەکان زۆر پێش ئێرانییەکان لە ئێران، نەریت و رێورەسمەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی فێر بوون. یەك لەو پەرتووکانەی وەك سەرچاوە بۆ وەرگرتنی ئەو بابەتانە لە لایەن یۆنانییەکانەوە هەیە بریتییە لە پەرتووکی (جەنگەکانی ئێران) لە نووسینی هیرۆدۆت، لە ئەو پەرتووکەدا هیرۆدۆت هەرچەندە لایەنگری بۆ یۆنانییەکان هەبووە و لە هەرجێیەك توانی بیتی ئێرانییەکانی شکاندووە، بەڵام دانی ناوە بە ئەوەی یۆنانییەکان (ئارایشی جەنگی، سەرژمێری، تاپۆ[٧] و کولاندنی ئاو تا نەخۆشی دروست نەکات) لە ئێرانییەکان فێربوون.

یەك لەو بابەتانەی پێش داریوش نەبوو و ئەو دایمەزراند دامەزراوەی وەرگرتنی زانیاری بوو. شکستی هەخامەنشییەکان لە جەنگی سالامین زۆر کاریگەر بوو لە سەر داریوش تا خۆی ڕەخنە بکات و دوای ئەوە هەوڵ بدات بەردەوام زانیاری لە بارەی یۆنانییەکان هەبێت، وەرگرتنی زانیاری لە کاتی جەنگ هەمیشە باو بووە، بەڵام لەکاتی ئاشتیدا هیچ دامەزراوەیەك بۆ ئەو مەبەستە نەبووە.

تەنها لەکاتی جەنگدا چەند کەسێك ڕادەسپێردران تا بچن و زانیاری لە بارەی دوژمن وەربگرن و ئەوانیش دەچوون و هەندێ جار سەرکەوتوو دەبوون و هەندێجار هیچیان دەست نەدەکەوت و دەهاتنەوە. بەڵام داریوش بۆ یەکەمجار داریوش هەوڵیدا لەکاتی ئاشتیدا زانیاری لە بارەی یۆنانییەکان وەربگرێت و بۆ ئەو مەبەستە دامەزراوەیەکی دامەزراند کە ناوەندەکەی لە شاری هالیکارناس بوو، کارمەندانی ئەو دامەزراوەیە دەچوونە یۆنان و زانیاریان لە بارەی دۆخی سەربازی ئەوان وەردەگرت، دوای گەڕانەوە لە رێگەی شا و شاژنی ئەو شارە کە ئێرانی بوون، زانیارییەکانیان بۆ داریوش دەنارد.

---

(٧) (هەخامەنشییەکان خۆیان سەرژمێری و تاپۆ لە میسرییەکان فێر بوون و دوای چوونی کەمبۆجییە و داریوش بۆ ئەو وڵاتە، لە لایەن داریوشەوە بیرۆکەکەی هێندرا و تەنانەت کاتی چوونی کوروش بۆ وڵاتی لیدی لە رێگەدا چاوی بە زۆرۆبێڵی جوولەکە کەوت و ئەو باسی سەرژمێری خۆیانی لە پەرەستگاکەیان کرد بوو و دیارە لە رۆژئاوای دەسەڵاتی ئەوان و پێش هەخامەنشییەکان سەرژمێر هەبووە، جگە لە ئەوە بابەتی ڤاڵانژیش کە لە جوانترین ئارایشە جەنگییەکانی ئەوکات بوو زۆر پێش هەخامەنشییەکان لە یۆنان هەبووە و مەرج نییە خەڵك لە ئەوان ئەو بابەتانە فێر بووبن، وەرگێر بۆ کوردی.)

هیرۆدۆت وەك باسمانکرد دوای مردنی داریوش هاتۆتە دونیاوە، بەڵام لە پەرتووکە مێژووییەکەی خۆیدا هەر بابەتێکی لە بارەی دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکان دەدیت بە دەستکەوتی داریوشی دەزانی.

لە سەرەتای دەسەڵاتی هەخامەنشییەکان، کوروش کە دامەزرێنەر بوو و دانەری دەستووری وڵاتەکەی بوو و داریوش بە یاسادانەر دەناسرا و یاسا جۆراوجۆرەکانی بۆ ژیانی ئێرانییەکان دادەنا بەبێ ئەوەی کاری ئاوەدانی وەلا نابێتد. هیرۆدۆت هەر یاسایەکی دیتووە بە هی داریوشی دەزانێت و مرۆڤ کاتێك مێژووی ئەو و مێژوونووسەکانی تری یۆنانی دەخوێنێتەوە، دووچاری سەرسوڕمان دەبیت کە چۆن لە (٢٥) سەدە پێش ئێستا کە لە هەندێ لە وڵاتان مرۆڤ یەکتری دەخوارد، یاساگەلێکی ئاوا دیار لە ئێران دادەنران و جێ بەجێ دەکران. نکۆڵی لەو بابەتە ناکەین کە داریوش بەشێك لەو یاسایانەی لە میسر[٨] بۆ ئێران هێنا، بەڵام لە میسر یاساکان بە شێوازی کۆیلە بوون جێ بەجێ کردن و لە ئێران ئازادانە بوون.

هەموو بینا گەورەکانی میسر بە هۆی کۆیلەکانەوە دروستکران، بەڵام پازدە هەزار کەتیبە کە لە تەختی جەمشید دەست کەوتوون ئەوە دەسەلمێنن کە کاری بیناکردنی کۆشکی پێرس پۆلیس کە هاوتەریب بووە بە کاتی دەسەڵاتی سێ پاشا، یەك کۆیلە کاری تێدا نەکردووە و تەواوی بیناساز، بەردتاش، وێنەکێش و کرێکارەکانی بە مووچەی مانگانە کاریان تێدا کردووە.

هیرۆدۆت کە گەشتی بۆ میسر و ئێران کردووە، دەڵێت: لە وڵاتی میسر خاوەنداریەتی هەموو زەوییە کشتوکاڵییەکان هی فێرعەون و کەسوکاریەتی یا هی پەرستگاکانە و جوتیاران بە گشتی کۆیلەن و بۆ فیرعەون و کەسوکاری و پەرستگاکان کار دەکەن.

لێکۆڵەری ناسراوی ئاڵمانی (تۆماس مەن) کە پێش جەنگی دووەمی جیهانی مرد، دەڵێت: بە درێژایی بیست و چوار دەورە لە پاشایەتی فێرعەونەکان لە میسر، هەموو زەوییە

---

(٨) (لە سەرەتای بەرگی یەکەمی ئەو پەرتووکەدا دەبینین کە کوروش چوون باس لە بوونی یاساکان لە ناو دەوڵەتی ماد دەکات و دەڵێت کە یاساکانی ئەوان نەگۆر و چەسپاو بوون و تەنانەت لە بواری بەرێوەبردنی وڵات و بازرگانی و ..... هتد یاسای مادەکان هەبووە و بەڵێن دەدات کە وەك ئەوان یاسای چەسپاو و نەگۆر دابنێت و و تەنها هەوڵ بدات داب و نەریتە ماندووکەرەکانی کۆشکی ماد نەهێڵێت و لە لایەکی تر داریوش هەندێ یاسا لە میسر فێربووە و لە ئەوێوە هێناویەتەوە بۆ سنووری دەسەڵاتەکەی،ئەمەش ئەو واتایەمان پێ دەدات کە هەخامەنشییەکان یاسا لە مادەکان و لە میسرییەکان فێر بوون، وەرگێر بۆ کوردی.)

کشتوکاڵییەکان هی فێرعەون و کەسوکاری یا هی پەرستگاکان بوون و جوتیاران بە گشتی کۆیلەی فیرعەون و کەسوکارەکەی یا پەرستگاکان بوون.

هیرۆدۆت دەڵێت: لە ئێران کۆیلە نییە و تەواوی ئەو کەسانەی کشتوکاڵ دەکەن، خۆیان خاوەنی زەوی خۆیانن.

باوەڕکردنی ئەو بابەتەی کە داریوش و خەشایارشای کوری خاوەنی زەوی نەبوونە، بۆ ئێمە قورسە و دەپرسین پاشایەك کە خاوەنی کۆشکی پێرسپۆلیس بووبێت، چوون دەیان هەزار دەونم زەوی و باغی نەبووە. بەڵام بەڵگەنامە کۆنەکان دەرخەری ئەو ڕاستییەن کە ئەوان خاوەنی زەوی نەبوون.

لە میسر یاسای سەرژمێری بۆیە هاتە کایەوە تا فێرعەونەکان و کەسوکارەکانیان و کاهینەکانی پەرستگاکان لە ڕێژەی داهات و سامانی خۆیان ئاگادار بن و بزانن چەند کۆیلە دەتوانن بخەنە سەرکار و تاپۆشیان بۆیە دامەزراند تا یەك لە ئەوان زەوی ئەوی تر داگیرنەکات، هەروەها بۆ ئەوەی بزانن دەتواندرێت چەند کۆیلە لەو زەویانە بەکار بخرێن. بەڵام لە ئێران ئەو یاسایانە بۆ ئەوە بوو کە مافی هەموان پارێزراو بێت.

گومانێك نییە کە رژێمی داریوش بە پێی سیستەمەکان رژێمێکی دیکتاتۆر بووە، بەڵام باوەڕە نەتەوەیی و ئایینییەکان ئەو حکومەتەیان بە شێوەیەك نەرم و نیان بوون کە هیچ کەس بە دەست حکومەتەوە نەدەکەوتە ئەزیەت و ئازارەوە و داریوش پشت بە کۆمەڵێك یاسای چەسپاو و بەردەوام کاری دەکرد و یاساکانی بەردەوام لە گۆڕاندا نەدەبوون. بۆیە لێکۆڵەر و زانای سەردەم (ماری ژان مۆڵە) ئەو شێوە دەسەڵاتداریەی بە دەسەڵاتی مەشرووتە دەناسێت و دەڵێت:"کاتێك پاشایەك بە پێی یاسای چەسپاو کار بکات، دەبێت دەسەڵاتەکەی بە مەشرووتە بناسرێت."هەر ئەو لێکۆڵەرە پاشایەتی مەشرووتەی داریوشی لا باشتر بووە لە پاشایەتی مەشرووتەی بەریتانیا و هۆکارەکەش بە باوەڕی ئەو، ئەوەیە کە لە بەریتانیا پەرلەمان هەیە و پەرلەمان بە هەموو ئەو دەسەڵاتانەی کە هەیەتی بۆ فریودانی خەڵکە و ئەوەش پێچەوانەی بەرژەوەندی گشتییە، بەڵام لە دەسەڵاتی داریوش پەرلەمان نەبووە تا خەڵك فریو بدەن.

لەو کاتەی مەردۆنیۆس لە رۆژئاوای ئیمپراتۆریەتی هەخامەنشی سەرگەرمی دروستکردنی هێزێکی گەورەی دەریایی بوو، جارێکی تر سکاکان لە رۆژهەڵات یاخی بوون و دەستەیەك لە ئەوان وێرای تاڵان و کوشتار ئەوەندە لە ئێراندا پێشرەویان کرد تا گەیشتنە (زندەروود یا ژندەروود) کە ئێستا بە (زایەندە روود) ناسراوە و لە باشووری ئیسفەهانە. کاتێك ئەوان هێرشیان کرد و جوتیارانیان کوشت و تاڵانیان دەبرد، داریوشی یەکەم لە ئازەربایجان بوو و

بەپەلە خۆی گەیاندە ئەکباتان. لە (٥٠٠ پ. ز) دۆخی جوگرافیایی ڕۆژهەڵات و باشووری ڕۆژهەڵاتی ئێران جیا بوو لەو دۆخەی ئێستا لەو شوێنانە هەیە.

ئێستا هەورە باراناویەکان لە ئاسمانەکانی ڕۆژهەڵاتی ئێران واتە ناوچەی سیستان و ئاسمانی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئەو وڵاتە ناوەستن و تەنها تێپەڕدەبن، لە کاتێکدا لە (٥٠٠ پ. ز) هەورە باراناویەکان لە ئاسمانی ڕۆژهەڵات و باشووری ڕۆژهەڵات دەوەستان و نەتەنها بارانی باشیان دەباراند، بەڵکو لە بەرزاییەکانیش بفر دەباری و لە شاخەکانەوە، زێیەکان بەرەو ئەو پێدەشتانە شۆڕ دەبوونەوە کە ئێستا بیابانی بێ سوودن لە بواری کشتوکاڵی.

لە چەند ماوەیەك پێش ئێستا کە وێنە گرتن لە ئاسمانەوە بۆ کێشانی نەخشە برەوی گرت، شوێنی وشکبووی ئەو زێیانە دەرکەوتووە کە لە شاخەکان بۆ پێدەشتەکان دێن. هەرچەندە لە ڕۆژهەڵات و باشووری ڕۆژهەڵاتی ئێران باران دەباری و جوتیار و شوانەکان لەو ناوچانە دەژیان و وێڕای ئەوەی ئەو ناوچانە لە ناوچە نیمچە گەرمەکان بوون، بە هۆی بوونی بارانی باش، ئاژەڵداری و کشتوکاڵ پەرەی پێدەدرا و دانەوێڵە و میوە بە فراوانی دەست دەکەوت.

سکرتێری ئەسکەندەری مەقدۆنی پەرتووکێکی لەبارەی گەشتەکەی بۆ ئێران نووسیوە کە یەکێکە لە پڕ بایەخترین پەرتووکەکانی مێژوویی سەبارەت بە ئەو وڵاتە، ئەو نووسیویەتی:"لە بەلوجستان دارەکان بەردەوام گوڵ و مێوەیان هەیە و لەوێ وەرزی زستان نییە."هەر کەسێك گومانی لەو بابەتە هەبێت دەتونێت هەر ئێستا بچێتە بەندەری (چاەبهار) لە بلوجستان و لەوێ گوڵ و میوە لە وەرزی زستاندا ببینێت تا بزانێت ئەوەی ئێسترابوون لە بارەی بلوچستان وتوویەتی ڕاستە.

بەڵام لە باغەکانی میوە، جەنگەڵەکان، کێڵگەکان و لەوەرگە کۆنەکانی بلوجستان، ئێستا شوێنەوارێك جگە لە (چاە بهار) نەماوە. چونکە چەندین سەدەیە کە چیتر هەورە باراناویەکان لە ئاسمانی بلوجستان ناوەستن و با ئەوان بەرەو ڕۆژهەڵات دەبات تا لە شوێنی تر بارانەکەیان بیارێنن.

بە کورتی چونکە ئەوکات ڕۆژهەڵات و باشووری ڕۆژهەڵات ببوونە ناوچەیەکی گەورەی کشتوکاڵی و پەروەردەی ئاژەڵ و نەتەوەی سکاش هەرکات توانیبایان، هێرشیان دەکردە سەر دانیشتوان و باغ و لەوەرگە و کێڵگەکان و تالان و کوشتاریان دەکرد و ئەوەی دەیانتوانی دەیانبرد.

یەك لە مێژوونووسە ئەورووپییەکانی هاوچەرخ لە هێرشی سکاکان بۆ ئەو ناوچەیە دووچاری سەرسوڕمان بووە و دەڵێت: هێرشە بەردەوامەکانی سکاکان بۆ ڕۆژهەڵات و باشووری ڕۆژهەڵات ڕاست نییە، چونکە لەو ناوچەیە جگە لە بیابانی بێ سوود لە رووی کشتوکاڵییەوە، هیچی تری

نییه و شتێك نەبووە تا ئەو نەتەوە بیبەن، بە پێچەوانەوە دەبێت بڵێین سکاکان شێتن کە هێرش دەکەنە سەر ئەو بیابانانەی سوودی کشتوکاڵیان نییە.

ئەو مێژوونووسەی سەردەم نەیزانیوە کە دۆخی ئەوسای ئەو ناوچانە جیا بووە و هەرجارێك کە سکاکان هاتوون، پێداویستی تەواویان دەست کەوتووە و بەردەوامیش پاشاکانی هەخامەنشی و ئەشکانی و دەسەڵاتدارە یۆنانییەکان کە لە ئێران فەرمانڕەواییان کردووە، نەیانتوانیوە رێگر بن لە هێرشەکانیان یا لەناویان ببەن. چونکە ئەوان کاتێك خۆیان بەرانبەر بە لەشکرێکی بەهێز دەدیتەوە، پەنایان دەبردە بەر شاخەکان و خۆیان حەشار دەدا.

داریوش لە ئەکباتانەوە چۆوە پازارگاد و دوای بەسەر کردنەوەی کارەکانی بیناکردنی کۆشکەکە، بە لەشکرێکی گەورە کە هەموو پێداویستییەکی جەنگ و تەنانەت عارەبانەشیان پێبوو، لە ساڵی (٤٩٣ پ. ز) بەرەو سەرزەمینی سکاکان چوو. ئەو دوای گەیشتنی بە زابولێستان بە ڕازاندنەوەی جەنگی بە ناو سەرزەوی سکاکاندا رۆیشت، بەڵام لادێکان بە گشتی چووڵ بوون و فەرمانی دەکرد تا لادێکان وێران بکەن، بۆ ئەوەی دوای گەڕانەوەیان سکاکان سوودیان لێ وەرنەگرن. سکاکان زانیبوویان کە داریوش لەشکرێکی گەورەی هێناوە و ئەگەر ئەوان بەرگری بکەن، لەوانەیە تا دوایین پیاویان بکوژرێن و بۆیە بەرەو شاخەکان چووبوون و لادێکانیان چووڵ کردبوو.

داریوش دە کەس لە سەرکردەکانی خێڵەکانی ناوچەی ئاراخازیای (ئەفغانستانی ئێستا) وەك چاوساغ و رێ پێشاندەر وەرگرت و داوای لێکردن چاوساغی لەشکرەکەی بن و بە ئەوانی وت کە رێپێشاندەری لەشکرەکەی بن تا بتوانن ئەو شاخانە گەمارۆ بدەن کە پەناگای سکاکانن.

ئەو شاخانەی ببوونە پەناگەی سکاکان بە (شاخە رەشەکان) ناودەبران و تا ئێستاش هەر ئەو ناوەیان هەیە، ئەو ناوەش بە هۆی ئەو بەردە ڕەشانەوە بوو کە لە شاخەکە هەبوون و هەموو شاخەکە ڕەش نەبوو. بەشی باشووری رۆژهەڵاتی شاخە ڕەشەکان دەگەیشتە پێدەشتە بەهەشتییەکانی کشمیر و باکووریشیان دەگەیشتەوە شاخەکانی هندۆکۆش.

لە نێوان شاخە ڕەشەکان و شاخەکانی هندۆکۆش هەندێ پێدەشت هەبوون کە هەندێ لە پاتانەکان و ئەفغانییەکان لێیان دەژیان و ئەو نەتەوەیەی پێش ئەوان لە ئەوێ دەژیان لە ناو چوو بوون. پێویستە ئەو بابەتە بزانین کە هیچ یەك لە پاتانەکان و ئەفغانییەکان و ئێرانییەکان

خەڵکی ڕەسەنی ئاسیای ناوەراست نەبوون و ئەوان لە ڕەگەزی ئەورووپی دەژمێردران کە دواتر بە ڕەگەزی هند و ئەورووپی ناسران، چونکە هەندێکیان دانیشتووی هند بوون.

شاخە ڕەشەکان لە باشوورەوە دەگەیشتنە شاخەکانی هیمالایا و لە نێوان هەردوو زنجیرە شاخ، هەندێ پێ دەشتی کشتوکاڵی هەبوون. داریوش بە چاوساغی سەرکردەکانی خێڵە ئەفغانییەکان لە چوار لاوە شاخە ڕەشەکانی گەمارۆدا.

کاتێك دەگوترێت کە گەمارۆی شاخەکانیدا، مەبەست لە ئەوە نییە کە سەربازەکانی بازنەیەکیان بە دەورەی شاخەکاندا دامەزراند و ئەگەر داریوش سەربازەکانی بۆ دە ئەوەندە زیاد بکردایە نەیدەتوانی ئەو بازنەیە بە دەورەی ئەو زنجیرە چیایەدا دروست بکات. پێویستی گەمارۆدانی زنجیرە شاخێك لە لایەن لەشکرێکەوە ئەوەیە کە رێگەکانی هاتووچۆ بۆ شاخەکان بگیرێن و دەزاندرێت دوای گرتنی رێگەکانی چوون بۆ زنجیرە شاخەکان، ئەو کەسانەی لە ئەوێن ناتوانن لە ناوچە شاخاویەکە دەربچن.

سەرۆکەکانی ناوچەکە کە لە لایەن داریوشەوە ڕاوێژیان پێدەکرا بە داریوشیان وت: پێتوانەبێت بە گەمارۆدانی ئەو شاخانە دەتوانی سکاکان لەناو ببەی، چونکە لەو شاخانە مەڕی کێوی زۆر هەیە و سکاکان ئەگەر تا سەد ساڵ لەو شاخانە بمێننەوە، لە رووی خواردن گرفتیان نابێت و گۆشتی مەڕ دەخۆن و لە خوریەکەی جلوبەرگ ئامادەدەکەن و لە چەرمەکەی پێڵاو دروست دەکەن، لە شاخە ڕەشەکان لە هەموو وەرزەکانی ساڵدا کانیاوەکانی ئاو هەن و کێشەی ئاویان نابێت.

داریوش وتی: دوای ئەوەی بە تەواوەتی گەمارۆمدان، ناهێلم ئەوان ئاسوودە بن و بە دوایان دەکەوم و بۆ ئەو مەبەستەش سوود لە ئەو سەربازانەم وەردەگرم کە خەڵکی ناوچە شاخاویەکانن.

سکاکان ئەوەندە ببوونە مایەی تورەیی داریوش کە پاشای هەخامەنشی کە هەمیشە بەرانبەر بە ئەسیرەکان نەرم و نیان بوو لەگەڵ ئەسیرەکاندا، بۆ کەللەسەری سکاکان پاری دیاریکردبوو و وتی: بۆ هێنانەوەی سەری هەریەکە لە سکاکان پێنج لیرەی زێر بە هەر سەربازێك دەدات و هەر ئەفسەرێك کە سەربازەکانی زیاتریان سەری سکاکان هێنابێت، خەڵاتی زیاتریان دەدەمێ و نابێت ژن و منداڵەکان بکوژن. دوای ئەو وتەیە ئەو سەربازانەی داریوش کە لە سەرکەوتنی شاخ لێهاتوو بوون، لە هەر چوار لاوە چوونە ناو شاخە ڕەشەکان. لە شاخە ڕەشەکان جادە نەبوو و سەربازەکانی داریوش لە خەرەند و بزنەرێکانەوە دەبوایە خۆیان بە

سکاکان بگەیێنن. مەڕ و بزنە کێویەکان لە شاخەکاندا بە دوای یەکدا ڕێچکە دەکەن و ڕێگە دروست دەکەن و مرۆڤیش دەبێت سوود لەو ڕێگایانە وەربگرێت.

ئەمرۆکە ئێمە دەزانیین کە ڕەگەزی مەڕی کێوی کە ئێستا بەشێکیان ماڵی بوون، بە لانی کەم لە سەد ملیۆن ساڵ پێش هەبوون و بە درێژایی ئەو ساڵە زۆرانەش مەڕە کێویەکانی شاخە ڕەشەکان بەردەوام بە یەك ڕێگادا دەڕۆیشتوون و سەربازانی داریوش کاتێك توانای ڕۆیشتن بە خەرەندەکانیان نەبوایە، بەو بزنەڕێیانەدا دەڕۆیشتن.

ئاریان دەڵێت: دواکەوتنی سکاکان لە شاخە ڕەشەکان کارێك بوو کە لە توانای لەشکرێکی ئاساییدا نەبوو، چونکە ئەوانەی لە شاخەکاندا دەڕۆیشتن دەبوایە هەموویان بچن. ئەوان نەیاندەتوانی بۆ دروستکردنی خۆراك، مەڕ بکوژن، چونکە بۆ ڕاوکردنی مەڕەکان دەبوایە کەمین بنێنەوە و کاتی زۆری دەویست و سەربازەکانی لەشکرێك لە کاتی جەنگ و دواکەوتنی دوژمن، ناتوانن بۆ دروستکردنی خۆراك کاتیان بە کەمین بکوژن. هەروەها سەربازەکانی داریوش دەبوایە ئاویش لەگەڵ خۆیاندا ببەن و نەیاندەتوانی وەك سکاکان بۆ دۆزینەوەی ئاو خۆماندوو بکەن یا کات بەفیڕۆ بدەن، جگەلەوە کانی بۆ تێر ئاو کردنیان کەم بوو و پێویستیان بە کانی گەورە بوو.

ئاریان دەڵێت: هەندێ لە بەشەکانی شاخە ڕەشەکان بە تەواوەتی وشکە و ئاوی لێ نییە، بەڵام چاوساغەکان ئەوانیان ئاگادار دەکردەوە لە نەچوون بۆ ئەو شوێنانە و دەیانووت تەنانەت مەڕەکان ناچنە ئەو شوێنانە، چونکە مارە ژهراویەکانی ئەوێ نەتەنیا بە مرۆڤەوە دەدەن، بەڵکو لە پێوەدان بە مەڕەکانیش ناوەستن و جگە لە مار لە شاخەکان، ئەژدیهاش هەیە.

ئاریان مەبەستی لە ئەژدیها هەمان ئەو ئاژەڵەیە کە لە ئەفسانەکاندا هاتووە، بەڵام ئێمە ئێستا دەزانین کە ئەو ئەژدیهایەی لە شاخە ڕەشەکان دەژیا، جۆرێکی سەرمازەڵەی گەورە[9] بووە.

سەربازەکانی داریوش چوونە شاخەکان و بەرگەی گەرمای ڕۆژ و سەرمای شەوەکانیان گرت، هەرچەندە ئەوان بە بەن بە یەکتری بەسترابوونەوە، بەڵام هەندێجار بنەکان دەپسان و هەندێکیان بەدەم هاواری زۆر توند دەکەوتنە ناو خەرەندەکان و ورد و خاش دەبوون و کەسیش توانای نەبوو تا جەنازەکانیان

(٩) (لە ساڵی ١٩٦٣ زایینی دەستەیەك لە لایەن گۆڤاری (ژیئۆ گرافیك مەگەزین) کە لە ئەمریکا دەردەچێ چوونە شاخە ڕەشەکان تا وێنە و فیلمی ئەژدیهاکان بگرن، ئەوان توانیان سێ ئەژدیها ببینن و وێنەی ئەوانیان گرت، درێژەی باسەکە و وێنەکان لە ساڵی دواتر واتە ١٩٦٤ زایینی لەو گۆڤارە بڵاو بۆوە و دوای بینینی وێنەکان زاندرا کە پێشینان حەقیان بووە لە ئەژدیها بترسن، هەرچەندە ئەوان پێوەنادەن و ئاگر لە دەمیان دەرناچێت، بەڵام وێنەکانیان ترسناکە، زەبیحوڵڵا.)

بینیێتەوە. هەندێجار بزنە ڕێکان لە تەنیشت هەڵدێرەکانەوە تێپەڕدەبوون و کەس نەیدەتوانی لە ترسان چاو لە خوارەوە بکات، بەڵام ئیتر فەرمانی داریوش بوو و دەبوایە سکاکان لەناو بچن.

کاتێك سکاکان لە لایەکەوە هێرشیان دەکرایەسەر، بۆ لای تر دەچوون و لەپڕ دەیانزانی لەوێشەوە هێرشیان بۆ هاتووە و ناچار دەگەڕانەوە و ڕێگای تریان هەڵدەبژارد. دۆخی ئەوان خەراپتر بوو لە دۆخی سەربازەکانی داریوش کە ڕەبەن بوون، چونکە سکاکان ژن و منداڵ و بە تەمەنیان لە گەڵدا بوو. هەندێ جار لە لایەن سەربازەکانی داریوش ئەوەندە تینیان بۆ دەهات کە بە ناچاری شوێنە بە ئاوەکانیان بەرەو شوێنە وشکەکان جێ دەهێشت و لەوانە بوو ئاویان دەست نەکەوتبایە یا بە ژەهری مارەکان بمردبوانە، هەر جارێك کە سکاکان بەرەو ئەو شوێنە وشکانە دەچوون، چاوساغەکان سەربازەکانی داریوشیان دەگێڕایەوە و بە ئەوانیان دەووت: مەچن بۆ ئەو شوێنانە چونکە ئاوی لێ نییە و ماری زۆرە، تەنانەت هەندێ جار مارەکان ئەوەندە زۆرن کە لە زەوییەك کە تازە بەرهەمی گەنمەکەی دورا بێتەوە، مێروولە ئەوەند زۆر نییە(١٠).

سەرەتا سەربازەکانی داریوش ناچاربوون لەگەڵ خۆیاندا خواردن ببەن، بەڵام دواتر دوای ئەوەی ماوەیەك لە شاخەکان مانەوە دەستیان کرد بە ڕاوی مەرەکان و دواتر ڕاوی ئەو مەڕانە بۆیان ئاسانتر بوو، چونکە مەرەکان لە هەر لایەك کە هەڵدەهاتن دیسان سەربازی داریوشیان دەدیت و ناچار ڕاو دەکران. هەندێ لەو ئاژەڵانە بە ناچاری هەر وەك سکاکان ڕۆیشتنە ئەو شوێنانە کە ئاوی لێنەبوو و هەندێکیشان کە دەیاندیت لە چوار لاوە بۆیان دێن بە ناچاری دەچوونە بەشەکانی ناوەندی شاخ و لەوێ ڕاو دەکران و گۆشتەکانیان دەبرژێندرا و هەندێك لە سەربازەکان بە هۆی دەست نەکەوتنی خوێ، پێدەکەنین و دەیانووت خوێنی مەرەکان وەك خوێیە بۆ گۆشتەکەیان.

هیچ یەك لە مێژوونووسان نەیانتوانیوە باسی ئەو شێوە جەنگەی سەربازانی داریوش و پیاوانی سکا بکات و هەموو ئەو مێژوونووسانەی لەوبارەوە دوواون، تەنها بابەتە گشتییەکانیان نووسیوەتەوە.

داریوش فەرمانی کردبوو جەنگ ئەوەندە بخایەنێت تا تەواوی پیاوانی سکا بکوژرێن و نابێت ژن و منداڵ بکوژن، پەیوەندی تەواوی دەستە سەربازەکان لە شاخە ڕەشەکاندا لە گەڵ پشتەوە هەبوو و بۆیە بەردەوام سەری سکاکانیان بۆ داریوش دەناردەوە و وەك دەزانیین داریوش

(١٠) (ئەو ڕاستییە لە لایەن ئەو لیژنە ئەمریکیەوە دۆزرایەوە کە لە ساڵی ١٩٦٣ زایینی چوونە شاخە ڕەشەکان و لە نووسینەکانیاندا کە لە ١٩٦٤ بڵاوبۆوە دەڵێن ئێمەش خۆمان پاراست لە چوون بۆ ئەو شوێنانەی کە لەشکری داریوش نەیانوێراوە بچن، ئەمەش بە هۆی ژەهری مارەکان بوو و مار لەو شوێنە ئەوەندە زۆرە کە زیندوو مانەوە لە دەست ئەوان ئەستەمە، زەبیحوڵڵا.)

لە تەمەنی لاویەتییەوە سەرکردە بوو و زۆرتر لە ئەوەی پێویست بوو وردبینی بۆ خۆپارێزی دەکرد و نەیدەهێشت پەیوەندی سەربازەکانی بە هێڵەکانی پشتەوە بپسێت.

لە گەڵ هەر دەستەیەك لە سەرە بڕاوەکانی بۆ داریوش دەناردران، ناوی ئەو سەربازانەیان لە سەر ئەو پێستانە دەنووسی کە سەرە براوەکانیان ناردبوو و هەروەها ژمارەی سەرەکانیشیان دەنووسی.

ئاریان و خانتۆس بە نووسینی ئەو بابەتە، پشتڕاستمان دەکەنەوە لە هەبوونی خوێندن بۆ هەموان لە سەردەمی داریوش و ئەوکات نەتەنها ئەفسەرەکان، بەڵکو بەشێك لە سەربازەکانیش خوێندەوار بوون. مێژوونووسەکان ژمارەی سەری بڕاوی سکاکانیان نەزانیوە کە گەیشتووتە داریوش و نەیان نووسیوە چۆن ئەوانیان دەنارد بێ ئەوەی بۆگەن بن. بە گریمانی بەهێز زۆربەی سەرەکان لەکاتی لەناو چوونیان دەگەیشتنە داریوش و وێڕاە ئەوەش پشت ڕاستین کە داریوش نەیتوانی تەواوی پیاوانی سکا لەناو ببات.

بە پێی ئەو ڕاپۆرتەی ئەو دەستە رۆژنامەنووسە ئەمریکیە لە ساڵی (١٩٦٤ ز) نووسیویانە، دەردەکەوێت کە تەنانەت لە شوێنە بە ئاوەکانی شاخە ڕەشەکانیش، سەربازەکان نەیانتوانیوە لە رۆژێکدا زیاتر لە دوو کیلۆمەتر ڕێ ببڕن و هەمان گرفت بۆ سکاکانیش هەبووە و ئەوانەی ژن و منداڵیان پێبوو، نەیانتوانیوە لەو مەودایە زیاتر ببڕن و ئەوانیش وەك سەربازەکانی داریوش، هەندێجار لە شاخ دەکەوتنە خوارەوە و دەکەوتنە ناو خەرەندەکان.

بە هۆی سەختی جەنگ لە ناوچە شاخاویەکاندا، جەنگی سکاکان و سەربازەکانی داریوش تا پاییزی خایاند و ئەوکات سەربازەکانی داریوش هەرچەندە ئاگریان دەکردەوە و لەبەری دادەنیشتن، توانای خۆڕاگرتن لەبەر ئەو سەرمایەیان نەبوو و زۆرجار دەیانووت کە لە وەرزی زستان بەفری زۆر دەبارێت و ریچگەکان دەگرێت و ناتوانین لە شاخەکان دەرچین تا توانەوەی بەفرەکان لە بەهاردا. لە وەرزی زستاندا تەنها مەڕە کێویەکان و جۆرە ئاسکێك بە هۆی خوریە ئەستوورەکانیانەوە لە بەشی باشووری ئەو شاخانە و لە پێدەشتەکان دەژین.

داریوش لە سەر ژمارەی ئەو سەرانەی بۆی هاتبوونەوە، زانی سکاکانی بە چاکی تەنبێ کردووە و ئەوەندە پیاویان کەم بۆتەوە کە توانای هێرشیان نابێت، تەنها ئەگەر کورەکان گەورە بن ئەو توانایەیان بۆ دەگەڕێتەوە. بە هۆی هاتنی وەرزی سەرما پاشای هەخامەنشی فەرمانی کۆتایی جەنگ و کشانەوەی لەشکرەکەی لە ناوچە شاخاویەکانی ڕاگەیاند.

دوای ئەو جەنگە سکاکان تا ئەوکاتەی داریوش زیندوو بوو، هێرشی گەورەیان ئەنجام نەدا و بەڵام دەستیان لە هێرشی بچووك هەڵنەگرت و هۆکارەکەشی بۆ ئەوە دەگەڕایەوە کە ئەوان لەو ڕێگەوە بژێوی خۆیاندەستەبەر دەکرد و لە ڕوانگەی ئەوانەوە ئەو کەسە قارەمان بوو کە زۆرتر توانیبایە خەڵکی خێڵ و نەتەوەکانی تری دراوسێ بکوژێت و بوون و سەرمایەیان تاڵان بکات.

# هۆکاری جەنگ و جەنگی ماراتوون

ماوەیەکە ئەو باسە هاتۆتەکایەوە کە جەنگەکانی یۆنان و ئێرانییەکان لە سەردەمی هەخامەنشییەکان، جەنگی ڕەچەڵەك بووە یا هۆکاری ئابووری و سیاسی هەبووە، چونکە هەندێ لە مێژوونووسانی سەدەی نۆزدەهەم ئێرانییەکان و یۆنانییەکان بە دوو ڕەچەڵەك دەزانن.

دەبێت بزانین کە زانستی ڕەچەڵەك ناسی پێش نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەم بە مانا زانستییەکەیەوە نەبووە، چونکە پێویست بوو زانایان باپیرانی مرۆڤی ئێستا بناسن و ئەوکات ئەوان باپیانی مرۆڤی ئەمرۆیان نەدەناسی. دوای نیوەی دووهەمی سەدەی نۆزدەهەم بەرەبەرە باپیرانی مرۆڤی ئێستا ناسران و زاندرا کە (کرۆمان یۆن) باپیرانی مرۆڤ بووە و (کرۆمان یۆن) ناوچەیەکی فەرانسایە کە ئێسك و پروسکی مرۆڤی سەرەتایی لێ دۆزراوەتەوە و بە پێی گریمانەکان ئەو مرۆڤە نزیکەی پێنج سەد هەزار ساڵ بە بێ ئاگر و ئامێر هەر وەك ئاژەڵەکان ژیاوە و ئەگەر کەشی ئەو کاتی زەوی گەرم نەبوایە ئەو مرڤە لە ناو دەچوو.

زاندراوە مرۆڤی کرۆمان یۆن کە ماوەی پێنچ سەد هەزار ساڵ ژیاوە، ناوەندی تەمەنی بیست ساڵ بووە و لە ژیانی ئەودا شتێك بە ناوی پاك و خاوێنی نەبووە، ئێسکی ناوچەوانی بەرزبوونەوەیەکی لە سەر چاوەکانی پێکهێنابووە کە وەك گولی گوڵە بەرۆژە سێبەری دەکردە سەرچاوەکانی و بە هۆی نەخۆشییە جۆراوجۆرەکان پێش ئەوەی تەمەنی بگاتە بیست ساڵ دەمرد.

دوای ئەو مرۆڤێکی تر لە زەوی هاتەکایەوە کە ناوی ئەو مرڤەیان بە (ئێندرتاڵ) دیاریکرد و بە هۆی ئەوەی ئێسك و پروسکی لە ناوچەیەکی ئاڵمانیا بە ناوی نێندرتاڵ لە نزیك زێی (ڕەن) دۆزرایەوە. ئەو مرۆڤە کە بە پێی لێکدانەوەکان ماوەی سەد و پەنجا هەزار ساڵ ژیاوە پێشکەوتووتر بووە لە مرۆڤی کرۆمان یۆن و ئەو خۆڵەمێشانەی لە تەنیشت ئێسکەکانیان ماوەتەوە دەربڕی ئەو ڕاستییەیە کە ئەوان زانیویانە ئاگر بکەنەوە و سوودی لێ وەربگرن،

مرۆڤی نێندرتاڵیش وەك باوكی واتە مرۆڤی كرۆمان یۆن مرۆڤیان دەخوارد و ئەگەر برسی بوایە و نەیتوانیبوایە ڕاو بكات، مرۆڤی هاوشێوەی خۆی دەخوارد.

لە ناوچەی (كرۆ ئاسی) لە وڵاتی (یوگوسلاڤیا) گوندێك هەیە بە ناوی (كاپیێر مینا)، لەو گوندە ئێسكی پێنج سەد مرۆڤی نێندرتاڵیان دۆزییەوە، كە بە دڵنیاییەوە دەردەكەوت كە ئەوانیان خوارد بوو و خۆڵەمێشیش لە تەنیشتیان هەبوو و مێژووی خوارنی ئەوان دەگەڕایەوە بۆ سی هەزار ساڵ پێش واتە بەر لە دوایین سەردەمی بەستەڵەكی نیوە گۆی باكووری زەوی. ئەو مرۆڤە وێڕای سوود وەرگرتن لە ئاگر، بە هۆی بەردیشەوە ئامێری دروستكردوون و بەستەڵەكی سی هەزار ساڵ پێش ناچاری كردووە بچێتە ئەشكەوتەكانەوە.

زانیاریمان لە مەڕ هۆكاری ئەو بەستەڵەكە نییە و هەر شتێك كە زانایان تا ئێستا وتوویانە تەنها گریمان و بیروڕایە. لە گەڵ دەستپێكی بەستەڵەك لە نیوە گۆی باكووری زەوی، هەموو ئەو ئاژەڵانەی توانای هەڵاتنیان هەبوو بەرەو نیوەگۆی باشوور ڕۆیشتن و نەگەڕانەوە. بەڵام هەندێ ئاژەڵی وەك (مامووت) واتە فیلی گەورەی تووكن و كەرگەدەنی تووكن، كۆچیان نەكرد و سرما لە ناوی بردن، هەموویان مردن و ئێستا دوای سی هەزار ساڵ پاشماوەكانیان لە هەندێ شوێنی نیوە گۆی باكووری زەوی دەدۆزرێتەوە.

هاوكات لە گەڵ ئەو بەستەڵەكە مرۆڤێكی تر دەركەوت كە بە (هۆمو ساپی ئان) ناسراوە و واتای (مرۆڤی زیرەك) دەدات. كەللە سەری مرۆڤی زیرەك زۆر گەورە بوو و یەك كیلۆ و نیو مێشكی تێدا بوو كە لە نزیكەی چواردە ملیارد خانە پێكهاتبوو و ئێسكی قاچی تا رادەیەك ڕاست دەردەكەوتن، بەڵام مرۆڤەكانی (كرۆمان یۆن) و (نێندرتاڵ) قاچیان چەمانەوەی هەبوو. كەس نازانێت ئەو مرۆڤە كە لە سەردەمی بەستەڵەك دەركەوت لە كوێوە هات، چینییەكان دەڵێن لە چینەوە ڕۆیشتووە و خەڵكی ئەندۆنیزیاش پێیان وایە لە دورگەی (جاوە) لە وڵاتی ئەوانەوە هاتووە، بەڵام گومانی بەهێز ئەوەیە كە لە جەمسەری باكوور یا لە باكووری ئاسیاوە بەرەو ئەوروپا ڕۆیشتووە.

ئەو مرۆڤە كە بە گریمان لە جەمسەری باكوور بووە (ئەوكات گەرم بووە) وەك هەموو ئاژەڵەكانی تر لە سەرما هەڵات و لە ئەوروپا لە وڵاتانی ئێستای (فەڕەنسا، ئاڵمان، ئەورووپای ڕۆژهەڵات و باشووری رووسیا) گیرسایەوە، لە ئاسیاش خۆی گەیاندە (ماوەراء النهر و ئێران و قەوقازیا) و هەندێكیان تا بەرەو باشوور تا هندستان ڕۆیشتن. چونكە بە هۆی توندی سەرما ئاژەڵ و خۆراك دەست نەدەكەوت، ئەوان لە هەر شوێنێك مرۆڤی نێندرتاڵیان دەدیت

دەیانکوشت و دەیانخوارد. مرۆڤی نێندرتاڵ نەیدەتوانی لە بەرانبەر مرۆڤی (هۆمۆ ساپی ئان) بوەستێتەوە کە دەزاندرا لە کوێوە هاتووە، چونکە مرۆڤی زیرەك سوودیان لە ئامێرەکان دەدیت و ئەوەندە هۆشیان هەبوو کە توانایان هەبوو خۆیان لە گەڵ سەرما بگونجێنن و بەو شێوەیە ڕەچەڵەکی مرۆڤی نێندرتاڵیان لە ناو برد.

زانایانی سەردەم باوەڕیانوایە کە ئەگەر ئێستا لە سەردەمی پێشکەوتن و ئامێر و بوونی کارەبا و وزەی ناوەکی و... هتد، سەرمایەکی دوورو و درێژی وەك بەستەڵەکی ئەوکات بێت، لەوانەیە مرۆڤ نەتوانێت لە بەرانبەریدا خۆی ڕابگرێت و لەناو بچێت. بەڵام (هۆمۆ ساپی ئان) خۆی پاراست و بە درێژایی ئەو ماوەیە لە ئەشکەوتەکان دەژیا و هەموو ئەو نیگارانەی لە دیواری ئەشکەوتەکان لەو سەردەمە ماوەتەوە هی ئەو مرۆڤەیە کە لە هونەری زانیوە، ئەو نیگارانەی ئەوکات و لە بیست و پێنج تا سی هەزار ساڵ پێش کێشراون زۆر جوانن و هونەرمەندانی ئێستاش ناتوانن رەخنەیان بکەن.

ئەگەر ژمارەی مرۆڤی زیرەك ئەوکات وەك مرۆڤی ئێستا بوایە، نەیاندەتوانی خۆیان بپارێزن و لە ناو دەچوون، بەڵام ژمارەی ئەوان بە گشتی لە سەد کەس تێپەڕی نەدەکرد و ئەو ژمارەیە لە مرۆڤ بۆ بەردەوام کردنی ژیانیان لە ئەشکەوتەکان دەژیان و خۆراکیان دەستەبەر کرد و خواردنی ئەوان بریتی بوو لەو ئاژەڵانەی لە سەرما هەڵدەهاتن بۆ ناو ئەشکەوتەکان. هەر ئەو ڕەچەڵەکەی (هۆمۆ ساپی ئان) بوو کە دوایی بوو بە رەچەڵەکی (هند و ئەورووپی).

ئایا ئەو مرۆڤە لە هەمان سی هەزار ساڵ پێش کۆچی بۆ ئێران کرد یا لە سەردەمانێکی نزیکتر؟ مێژووی سەردەمانی نزیك هیچ دەورەیەکی بەستەڵەکی تر دوای ئەو بەستەڵەکە دەرناخەن تا مرۆڤەکان ناچار بە کۆچ بۆ ئێران و هند بکات و هەندێکات کەش و هەوا لە ئەورووپا سارد دەبوو بەڵام بەو ڕێژەیە نەبوو کە هەموو باکووری ئەورووپا و ئاسیا بخاتە بەستەڵەکەوە.

ئێرانی و یۆنانییەکان لە ڕەچەڵەکی سەرەکی (هۆمۆ ساپی ئان) بوون و لە تیرەی هند و ئەورووپی هەژمار دەکرێن و لە رووی کەللە سەر و باڵا و ئێسك و روخسار جیاوازی لە نێوانیان نییە. ئەگەر دە ئێرانی بە جل و بەرگی یۆنانی لە ئەسینا سورابانەوە، کەس هەستی نەدەکرد کە ئەوان ئێرانین و بە پیچچەوانەشەوە بۆ یۆنانییەکان لە پازارگاد هاوشێوە بوو، تەنها جیاوازییەکان ئەوە بوون کە ئێرانییەکان باڵابەرزتر بوون و ریش و سمێڵیان نەدەتاشی. زاندراوی هەموو لایەکە کە کورتی و بەرزی باڵا بەڵگە نین بۆ جیاوازی ڕەچەڵەکی دوو نەتەوە و بۆیە

دوای ئەوەی ئەسکەندەر ئێرانی داگیرکرد، ئەو یۆنانیانەی هاتبوون لەناو ئێرانییەکاندا توانەوە و بچوکترین جیاوازی لەناویاندا نەبوو. چونکە هەردووکیان لە یەك ڕەچەڵەك بوون، هاوسەرگیری هیچ کاریگەری لەسەر باڵا و روخساریان دانەدەنا.

دوای ئەسکەندەر یۆنانییەکان بۆ ماوەی (١٨٣) ساڵ فەرمانرەوای ئێران بوون و دواجار ئەشکانییەکان دەسەڵاتی ئەوانیان خست، بە درێژایی ئەوکات زمانی فەرمی کۆشکی پاشایەتی یۆنانی بوو و هەر کەس ویستی خزمەتی لە حکومەت و دەربار هەبوایە، دەبوایە زمانی یۆنانی بە باشی بزانێت.

زمانی فارسی هەخامەنشی لەو ماوە درێژەدا چیتر بە زمانی نووسین نەمایەوە، بەڵام هێشتا هەندێ خەڵکی لادێکان بەو زمانە دەدوان و لە شارەکان تەنها زمانی یۆنانی قسەی پێدەکرا.

مێژوونووس و جوگرافی زانی یۆنانی (ئامرینووس) کە لە ساڵی (١٢٥ پ. ز) و لە سەردەمی دەسەڵاتی (سلۆکۆسی پێنجەم) پاشای یۆنانی هاتۆتە ئێران، باسێکی لەمەڕ چۆنێتی قسە کردنی خەڵك بە یۆنانی و پۆشینی جل و بەرگی یۆنانی لە شارەکان ئێران دەکات، بەڵام ئەو لە یەکەم بینیندا نەیتوانیوە جیاوازی بکات لە نێوان کەسێکی یۆنانی لە گەڵ کەسێکی ئێرانی کە پۆششی یۆنانیان لەبەردا بوایە.

ئامرینووس دەڵێت: (کاتێك لە شاری سلۆسی یا سلۆکی بووم بە باشی لە زمانی هەموان تێدەگەیشتم، چونکە بە یۆنانی قسەیان دەکرد، بەڵام کە لە شار دوور دەکەوتمەوە و بۆ دەوروبەر و بۆ لادێ چووم، لە زمانی ئەوان تێ نەدەگەیشتم و ئەوان بە زمانێکی کۆن دەدوان.

لە سلۆسی کۆمەڵێك قوتابخانە هەبوو کە لە هەندێکیان منداڵان وانەیان دەخوێند و لە هەندێکیان بە تەمەنەکان وانەیان دەخوێند و منداڵان خوێندن و نووسینی یۆنانی فێر دەبوون و لە قوتابخانەکانی گەورەکانیش، پەرتووکە یۆنانییەکان دەخوێندران.

لە سلۆسی چەند مەیخانە هەبوو کە شەوانە بە شمشاڵ و ساز ئاوازی یۆنانیان لێدەدا و گۆرانی یۆنانیان دەووت، بەڵام لە لادێکان هێشتا ئاوازە کۆنەکانی ئێران دەخوێندران و من لە سلۆسی و هەك ماتانە و شارەکانی تر هەستم نەدەکرد لە دەرەوەی مەقدۆنیام، چونکە دانیشتوانیان لە رووی روخسار و باڵا وەك ئێمە بوون و بە یۆنانی دەدوان.)

ئامرینووسی یۆنانی خەڵکی مەقدۆنیا بوو و شاری سلۆسی بە پایتەختی فەرمانڕەواکانی یۆنان لە ناوچەی ئێران و میزۆپۆتامیا دادەنرا و نزیك زێی دیجلە و شاری بەغدای ئێستا بوو و تا

سەردەمی لەشکرکێشی ئیسلام مایەوە. هەندێك وابیردەکەنەوە کە ئەو شارە لە سەردەمی ساسانییەکان و دواتر لە سەردەمی ئەشکانییەکان گۆڕا بە (تیسفوون)، بەڵام ئەمە هەڵەیە و تیسفوون یا بە وتەی عەرەب (مەداین) لە هەمان ناوچە دروستکرا بەڵام جیاواز بوو لە سلۆکی.

لە ماوەی دوو سەد و هەڤدە ساڵی دەسەڵاتداری یۆنانییەکان بەسەر ئەو ناوچانەدا، ڕێنووسی فارسی پەهلەوی بە تەواوەتی لەناوچوو و ڕێنووسی یۆنانی شوێنی گرتەوە و لە قوتابخانەکان کاغەزی یۆنانی کاری پێدەکرا کە یۆنانییەکان لە میسر دەیانهێنا، چونکە ئەو ڕووەکەی کە کاغەزەکەی لێ دروست دەکرا و ناوی (پاپی رۆس) بوو، تەنها لە میسر و (تانکانیکا) کە لە ئەفریقیا بوو، دەڕوا و وشەی (کاغەز) کە ئێستا لە زمانی فارسی بەکاردێت وشەیەکی یۆنانییە و دەگەڕێتەوە بۆ ئەوکات و لاتینیشنییە، چونکە لە لاتینی هەر (پاپی رۆس) دەووترێت و هەردوو وشەی (پی پەر) لە ئینگلیزی و (پاپییە) لە فەرەنسی لە وشەی (پاپی رۆس) وەرگیراون.

چونکە ئێرانی و یۆنانییەکان لە یەك نەتەوە بوون، هاوسەرگیری و تێکەڵاو بوونیان گۆڕانی بەسەر ئەو دوو لایەنەدا نەهێنا و ناشبێت جەنگەکانی ئەو دووانە بە جەنگی ڕەچەڵەك دیاری بکرێت. ئەو جەنگانە تەنانەت لەسەر بیروڕای جیاوازیش نەبوون، چونکە دەسەڵاتدارانی هەخامەنشی ڕێزیان لە باوەڕەکانی تەواوی نەتەوەکان دەگرت و ئەو جەنگانە تەنها جەنگی ئابووری و بازرگانی بوون.

مێژوونووسی بەناوبانگی بەریتانی (ئارنۆلد توین بی) و نووسەری پەرتووکی (لێکدانەوەی مێژوو) دەڵێت: (لە سێ هەزار و پێنج سەد ساڵ پێش تا بە ئەمڕۆ مرۆڤەکان لە هەر پازدە ساڵ تەنها یەك جار جەنگیان ڕاگرتووە و لە ساڵەکانی تر بەردەوام لە جەنگدا بوون، واتە لە سێ هەزار ساڵدا تەنها (٢٣٣) سال ئاشتی ئەویش بە شێوەی پەراگەندە لە شێنەکانی جیهان هەبووە و زۆربەی جەنگەکانیش بە هۆی ئابووریەوە بوون، جا لە لایەن خەڵکی برسی بۆ بەدەست هێنانی دانەوێڵە و مێگەلەکان و زێر و پارە بوو بێت یا لە لایەن دەوڵەتانێکەوە بۆ دەست بەسەر داگرتنی ئابووری ناوچەیەك و ئەگەر بە وردی سەرەنج بدەین جەنگەکانی ئێستاش هەر هۆی ئابووریان هەیە.)

لە سەردەمی هەخامەنشییەکاندا بازرگانی ئاسیا و ئەورووپا لە رۆژهەڵاتی نزیك کۆ ببووە و یۆنانییەکان دەیانەویست ئەو بازرگانییە تایبت بە ئەوان بێت و هەخامەنشییەکانیش هەمان نیازیان بوو و لە ئاکامدا ماوەیەکی درێژ لە نێوانیان جەنگی و ناکۆکی هەبوو و تا دواجار بە

هێرشی ئەسکەندەر و رووخاندنی هەخامەنشییەکان و داگیرکردنی ئێران و ناوچەکە لە لایەن یۆنان ئەو کێشە کۆتایی هات.

باسکرا کە مەردۆنیۆس لە لایەن داریوشەوە ڕاسپێرا تا لەشکرێکی بەهێزی دەریایی دروست بکات و لە ساڵی (٤٩٢ پ. ز) ئەو هێزە ئامادەبوو و داریوش مەردۆنیۆسی ڕاسپارد بۆ هێرش کردن بۆ سەر یۆنان و ئەو کات هێزی دەریایی هەخامەنشی ئەوەندە بەهێز بوو کە ئامادەببوو بۆ ئەو هێرشە

داریوش فەرمانی بە مەردۆنیۆس کردبوو کە دوای هێرش بۆ یۆنان، دەبێت هەموو بەندەرەکانی داگیر بکات تا چی تر یۆنان دوای ئەو جەنگە پێگەی بۆ کۆکردنەوەی کەشتییەکانی نەبێت. ئەرکی تری مەردۆنیۆس لە ناو بردنی تەواوی کەشتییە یۆنانییەکان بوو لە هەر خاڵێك لە دەریاکانی رۆژئاوا واتە ئەو دەریایانەی دەکەوتنە نێوان رۆژهەڵاتی ئەورووپا و رۆژئاوای ئیمپراتۆریەتی هەخامەنشی و بریتی بوو لەو دەریایانە: (دەریای ڕەش، دەریای ئێژە، دەریای مەرمەڕە و دەریای مەدیتەرانە). هێزی دەریایی مەردۆنیۆس لە مانگی پێنجی ساڵی (٤٩٢ پ. ز) ئامادەبوو و بڕیاریدا لە گەلی داردانێل بپەڕێتەوە و هێزەکانی لە خاکی یۆنان پیادە بکات.

لە بەڵگەنامە مێژووییەکان و کەتیبەکانی ئێراندا هیچ باس لە ژمارەی کەشتییەکانی مەردۆنیۆس نەکراوە، بەڵام یۆنانییەکان باس لە سێ سەد کەشتی دەکەن و ئەگەر زێدەرۆییان نەکرد بێت، دەبێت پشت ڕاستی بکەینەوە کە لە ڕاستیدا هێزێکی بە ڕاستی بەهێز بووە و بۆیە یۆنانییەکان نەیانتوانیوە ڕێگە لە گەیشتنیان بۆ کەنارەکانیان بگرن. هێزی وشکانی مەردۆنیۆس کە هەفتا هەزار سەرباز بوو لە کەنارەکانی یۆنان لە ناوچەیەك دابەزی کە بە (گالی پولی) ناسرابوو و بە هۆی جەنگەکانی یەکەمی جیهانییەوە ناسرا. لە جەنگی یەکەمدا هێزی هاوپەیمانان هاتن تا لە رێگەی دابەزاندنی هێز لەو ناوچەیە، هێرش بکەنەسەر عوسمانییەکان و ئیستانبوڵی پایتەختیان داگیر بکەن، بەڵام فەرماندەی بەرگریکارەکانی ئەو شوێنە (مصتەفا کەماڵ پاشا) پەنجا و حەوت هەزار سەربازی بەریتانی و ئۆستورالی لەناوبرد و ناچاری کردن ئەو شوێنە بەجێ بهێڵن. بەڵام لە مانگی ئەپریلی ساڵی (٤٩٢ پ. ز) کاتێك مەردۆنیۆس سەربازەکانی بە پاڵپشتی هێزی دەریایی لەو جەزیرەیە داگرت تا بەرەو ناو یۆنانیان ببات، رووبەرووی بەرگری نەبۆوە.

مەردۆنیۆس دەبوایە لە باشوور بۆ باکوور، درێژایی جەزیرەکە ببڕێت تا بگاتە ئەو شوێنەی لێیەوە دەگەیشتە یۆنان، ئەو جەزیرەیە لە شێوەی لاکێشەیەکی باریکی لە باشوور بۆ باکوور

درێژ بۆتەوە و  سێ لای ئاوە، بە هۆی بەرزەخێك بە یۆنان بەستراوەتەوە و لە کۆنیش بەشێك بوو لە یۆنان.

یۆنانییەکان دەیانزانی ئەگەر بیانەوێت ئەو شەوە و لە کاتی دابەزینی هێزەکانی مەردۆنیۆس ڕێگەیان لێ بگرن، توانای ئەو کارەیان نابێت، بەڵام ئەو بەرزەخەی نیمچە دورگەی گالی پولی بە یۆنان دەبەستەوە بریتی بوو لە گەل بەرێکی ناخۆش کە پانتاییەکەی زۆر کەم بو و یۆنانییەکان لەو شوێنە بە دروستکردنی ڕێگریەکان و دانانی هێزی باش دەیانتوانی ڕێگربن لە هاتنی هەخامەنشییەکان بۆ ناو دڵی یۆنان.

پانایی ئەو گەلبەرە کە نیمچە دورگەی گالی پولی بە یۆنان دەبەستەوە تەنها نیو فەرسەنگ بوو و یۆنانییەکان بەر لە گەیشتنی لەشکری مەردۆنیۆس، لەو شوێنە دیوارێکی بەردینیان دروستکرد و لە کاتی گەیشتنیاندا، بەرد و تیریان بەسەر سەربازەکانی مەردۆنیۆسدا باراند. کاتێك باس لە دابەزاندنی هێز دەکرێتەوە، لەو سەردەمەدا تەنها بیرمان بۆ ئەوکارە لە ڕێگەی دەریاوە دەچێت و خوێنەر یا بیسەر وای بۆ دەچێت کە ئەو هێزە لە ڕێگەی دەریاوە هاتووە. لە کاتێکدا کە ئەو خۆدەرخستنە سەربازییە رابردووی زۆری هەیە و دابەزاندنی هێز لە دورگەی گالی پولی لە لایەن مەردۆنیۆس یەك لەو خۆدەرخستنانەیە.

سەربازە هەخامەنشییەکان قەلغانی گەورەی داری گەزیان پێ بوو و بەرەو دیوارەکە دەڕۆیشتن، داری گەز بە پێچەوانەی دارە گەورەکانی تر پانایی کەمی هەبوو و بۆیە پارچەکانی ئەو دارەیان زۆر بە پوختی لێکدەدا بە شێوەیەك کە لە ناو دارەکاندا دەروویەك نەدەما و دەیانکردە قەلغان، ئەو دارە زۆر پتەو و ڕەقە و بەرگەی زەربەکانی نێزە و شمشیری دەگرت و کێشی قەلغانەکەش کەم بوو.

فەرماندەی لەشکری یۆنان ناوی (ئامیداس) و خەڵکی ئێسپارت بوو و لەشکرەکەشی لە نەتەوە جیاکانی یۆنان پێکهاتبوو. مێژوونووسە یۆنانییەکان لە تەواوی باسەکانیان لەمەڕ یۆنان و هەخامەنشییەکان، بەردەوام ژمارەی لەشکری خۆیان بە کەمتر باس دەکەن و لەو جەنگەدا دەڵێن نۆ هەزار و دوو سەد کەس ئامادەبووە کە دوو سەد کەسیان خەڵکی ئێسپارت و هەزار کەسیان هی ئەسینا بوون، هەشت هەزاریش هی دەوڵەتە شارەکانی تری یۆنان بوون کە لەناویاندا مەقدۆنییەکان زۆرتر بوون. یۆنانییەکانی کۆن تەنها کاتێك مەترسی دەرەکیان لە سەر هەبوایە، یەکگرتوو دەبوون و ئەوکات جارێکی تر مەترسی هەخامەنشییەکان ئەوانی یەکگرتوو کردەوە.

سەربازانی مەردۆنیۆس لە پشت قەلغانەکانیانەوە لە دیواری بەردین نزیك بوونەوە و یۆنانییەکان بەردیان بەسەردا باراندن. کۆتایی هەردوو لای دیوارە بەردینەکە ئاو بوو و پێدەچوو ئەو دیوارە لە رۆژەکانی پێشتر ئامادەکرابێت، چونکە یۆنانییەکان نەیاندەتوانی بە یەك رۆژ ئەو دیوارە ئامادەبکەن.

بە دیتنی دیوارەکە مەردۆنیۆس تێگەیشت بۆچی یۆنانییەکان لەکاتی دابەزینی هێزەکەی لە کەشتییەکان بەرگریان نەکردووە، ئەو زانی ئەوان دوای دروستکردنی ئەو دیوارە بە زەروریان نبینیوە کە کاتی دابەزینی هێزی هەخامەنشی لە کەشتییەکان، خۆیان بخەنە بەر مەترسی بەردی مەنجەنیقی ناو کەشتییەکان و لایان باشتر بووە کە لە سەر ئەو دیوارە بەرگری بکەن.

مەردۆنیۆس دۆخی دیوارەکەی خستەبەر چاو و تێگەیشت کە دابەزاندنی مەنجەنیقەکان لە کەشتییەکان بۆ هێرش کردنە سەر دیوارەکە کارێکی بێ سوودە و بەردبارانکردنی ئەو دیوارە تەنها دەبێتە هۆی رژاندنی هەندێ بەردی تر بەسەر دیوارەکەدا. بۆ پەرینەوە لەو دیوارە لە رێگەی هێرشی راستەوخۆ، چارەیەك لەوە زیاتر نەبوو کە سەربازەکانی مەردۆنیۆس بە ناو بەردەکاندا سەرکەون و خۆیان بگەیێننە لاکەی تری دیوارەکە.

بەڵام ئەگەر مەردۆنیۆس دەیتوانی لەو دیوارە بپەرێتەوە، لانی کەم دەبوایە نیوەی سەربازەکانی بە کوشت بدات و زاوای داریوش پێویستی بە سەربازەکانی خۆی هەبوو و دەیزانی دوای پەرینەوەی لە دیوارەکە، لەوانەیە لە شوێنە جیاکانی یۆنان تا گەیشتن بە پایتەخت دووچاری جەنگ ببێتەوە، بۆیە بە باشی زانی دیوارەکە بە پشتدا بخات و فەرمانی کشانەوەی نیوەی سەربازەکانی دەرکرد.

بە بینینی دیمەنی کشانەوەی نیوەی سەربازەکانی هەخامەنشی، یۆنانییەکان تێگەیشتن مەبەستی ئەوان پاشەکشە نییە و دەیانەوێت پیلانێك جێ بەجێ بکەن، ئەگەر هەموو سەربازەکانی مەردۆنیۆس کشابانەوە، دەزاندرا کە هەخامەنشییەکان لە جەنگ پاشگەز بوونەتەوە و بەڵام چونکە بەشێك لە ئەوان لەو شوێنە مانەوە، بۆیان روون بۆوە کە پیلانێك هەیە.

بۆ تێگەیشتن لە مەبەستی مەردۆنیۆس دەبێت وادابنێین کە دورگەی (گالی پولی) بەرانبەر بە ئەورووپا وەك بوتڵێك وایە کە تەنها لە رێگەی گەروەکەیەوە پەیوەندی بە ئەورووپاوە هەیە و ئەو گەروە لە دەست یۆنانییەکان بوو و مەردۆنیۆس جارێکی تر نەیدەتوانی هێزەکانی بە رێگەی دەریا بباتە پشت یۆنانییەکان.

مەردۆنیۆس نیوەی سەربازەکانی بەرەو باشووری جەزیرەکە کشاندەوە تا سواری کەشتیان بکات و ئەوانی تری هێشتەوە تا یۆنانییەکان نەزانن نیازی چییە، لە لایەکی تر دەیزانی ئەگەر هەموو هێزەکەی بکشێنێتەوە، یۆنانییەکان دوای دەکەون و دەبنە گرفت بۆی. ئەگەر تەواوی سەربازەکان کشابانەوە، یۆنانییەکان ئەوانیان بە ترسنۆك دەزانی و دوایان دەکەوتن و ئەوەندەی توانیبایان لێیان دەکوشتن.

مەردۆنیۆس پێش ئەوەی پاشەکشە بە نیوەی سەربازەکانی بکات، بە ئەو ئەفسەرانەی وت کە لە ئەوێ دەمانەوە: من نیوەی سەربازەکان دەبەم و لە رێگەی دەریاچەوە لە پشت ئەوان هێزەکەم دادەبەزێنم، ئەوکات دوو گریمان هەیە: یەکەم ئەوان تێدەگەن و بۆ ئەوەی دەورە نەدرێن، دەکشێنەوە و رێگەمان دەکەنەوە یا نازانن و ئێمە بە ئاسوودەیی دادەبەزین. ئەگەر گریمانی یەکەم روویدا ئێوە بەدوایان بکەون تا دەگەنەوە بە هێزەکانی من و لە ئەگەری دووەمیشدا، من لە پشتەوە لە یۆنانییەکان دەدەم و ئێوەش لە پێشەوە لە دیوارەکە بپەرنەوە و بە زوویی یۆنانییەکان لەناو دەبەین.

ئەو رۆژە مەردۆنیۆس نەیتوانی سەربازەکانی سواری کەشتییەکان بکات و شەوی (٤٩٢/٥/٢٢ پ. ز) ئەو کارەی کرد تا بۆ بەیانی بکەوێتەرێ، بەڵام رۆژی دواتر دەریا با و تۆفانی هەبوو و سورانەوەی مەردۆنیۆس بە دەوری ئەوێدا کارێکی مەترسیدار بوو و لەوانە بوو ببێتە هۆی نوقم بوونی تەواوی کەشتییەکانی و لەناوچوونی سەربازەکانی.

فەرماندەکانی کەشتییەکان وتیان ئێمە لەو تۆفانەدا بەرپرسیاریەتی کەشتییەکان لە ئەستۆ ناگرین و ناتوانین لە گەروەکە بسورێینەوە و بچینە ئەودیوی گالی پولی و لە تۆفانەدا نابێت لە کەنارەکان دوورکەوینەوە. ئەگەر ئێمە لە دەریا بین سوود لە بای پێچەوانە وەردەگرین، بەڵام کاتێك کەشتییەکان وەستاون ناتوانین چارۆگەکانیان هەڵدەین و بکەوینەرێ، چونکە بە بوونی ئەو بایە کەشتییەکان بەرەو وشکانی دەجووڵێن نەك بەرەو دەریا.

مەردۆنیۆس گوێی بۆ هۆکارە هونەریەکەی ئەوان گرت و تا رۆژی (٥/٢٣) وەستا و سەربازەکانیش لە کەشتییەکاندا مانەوە و ئەوکات دەریا ئارام بوو، چارۆگەکان هەڵدران و سەڵبەلێدان دەستی پێکرد و ئەوان جوڵان بەرەو شوێنی مەبەست. درێژی جەزیرەکە زۆرە و پانییەکەی کەمە، بۆیە ئەو رۆژە و شەوەکەشی کەشتییەکانی مەردۆنیۆس رێگەیان بڕی تا بە لای باشووردا بە دەورەی جەزیرەدا سوڕانەوە و نیوەڕۆی رۆژی (٥/٢٤) ئەوان گەیشتنە جەهەننەمی ئەو جەزیرەیە واتە شوێنی دابەزینیان.

ئامیداس بە بینینی کەشتییەکان مەبەستی ئەوان تێگەیشت کە دەیانەوێت پشتیان بگرنەوە و بۆیە فەرمانی پاشەکشەیدا و دیوارەکەی جێهێشت و ئەوانیش بەدوایان کەوتن. ئەو دەیەویست ڕێگە لە دابەزینی هێزەکانی مەردۆنیۆس بگرێت، بەڵام بۆ ئەم مەبەستە دەبوایە لە کەناری دەریا بوەستێت و بجەنگێت و ئەوکات لەهەر دوولاوە هێزی هەخامەنشی دەگەیشتن و هێرشیان بۆ دەکرد، بۆیە هێزەکەی برد و کشایەوە و هەردوو هێزی مەردۆنیۆسیش بەیەك گەیشتنەوە.

گەزنەفۆن دەڵێت: کاتێك ئامیداس هێزەکەی بەرەودوا کشاندەوە بە ڕێگەی جارچییەکانییەوە بانگی ڕادەهێشت و دەیوت: هاونیشتیمانیان نیشتیمان لە مەترسیدایە، وەحشییەکان قاچیان خستووتە ناو خاکی ڕاستەقینەی یۆنان، ئەوەی توانای هەڵگرتنی نێزە یا شمشێری هەیە پێویستە چەك هەڵبگرێت و ئامادەی جەنگ بێت و ئێمە پێویستە ئەوان بکوژین یا بیانکەینە ناو دەریا. دروشمی (هاونیشتیمانی نیشتیمان لە مەترسیدایە) یەکەمجار لە یۆنان بیسترا و (٢٢) سەدە دواتر لە فەرەنسا و لە شۆرشی ئەواندا بیسترایەوە و لەوانەیە تا ئێستاش هەندێ کەس هەبن کە پێیان وابێت ئەو دروشمە دروشمێکی فەرەنسیە، بەڵام ئەو دروشمێکی یۆنانییە.

بە بیستنی ئەو دروشمە تەواوی پیاوانی یۆنان لە هەموو دەوڵەتە شارەکانییەوە هاتن بۆ جەنگ و ئەوەندە بە جۆش بوون بۆ جەنگی هەخامەنشییەکان کە بە وتەی ئەو مێژوونووسە پەرلەمانی وڵات بۆ ئەوەی دانەوێڵە و خواردەمەنی کەم نەبێتەوە، هەندێ یاسایان دەرکرد کە بە پێی ئەو یاسایانە هەندێ جووتیار و پیشەوەر نەتوانن بچنە جەنگ و بۆ دەستەبەر کردنی پێداویستییەکانی یۆنان بمێننەوە. لە یۆنان ئەوکات کاری بە زۆر تەنها بۆ کۆیلەکان بوو و سیستەمی یۆنان دیموکراسی بوو و کارکردن بە دڵخواز بوو بەو مەرجەی پێچەوانەی یاسا نەبێت، بەڵام پەرلەمانەکانی یۆنان بە ناچاری ئەو بڕیارەیان ڕاگەیاند.

تا ئەوکات لە یۆنان کاری بە زۆری تەنها بۆ کۆیلەکان هەبوو و وڵاتانی یۆنان بە سیستەمی دیمۆکراسی بەرێوە دەچوون و هەر کەسێك ڕێگە پێدراو بوو تا هەر جۆرە کارێك کە حەزی پێدەکات ئەنجام بدات و بە هۆی هێرشی ئێران، پەرلەمانی یۆنان ناچاربوو کە یاسای کاری بە زۆری پەیرەو بکات تا جوتیاران و پیشەگەرەکان بەردەوامبن لەکار و حەزی چوون بۆ جەنگ ئەوان لە کار ڕانەگرێت.

گەزنفۆن دەڵێت: ئەو پیرەمێردانەی کە سەربازی نەیدەگرتنەوە، چەکیان بە دەستەوە گرت و گەیشتنە لای پیاوانی تر، بەڵام هەندێیان زۆر پیر بوون و لە مەیدانی جەنگدا ببوونە بار بەسەر ئەوانی تردا و دەبوایە لاوەکان ئاگایان لێ بوانە، بۆیە ئەوانیان گەڕاندنەوە و پێیان وتن لە ماڵ بن باشترە تا لە جەنگ. کچە لاوەکانیش کە منداڵیان نەبوو و هێشتا هاوسەرگیریان نەکردبوو، چەکیان بەدەستەوە گرت و خۆیان گەیاندە لای پیاوەکان لە مەیدانی جەنگدا.

ئەو بەشە لە وتەکەی گەزنەفۆن ڕاستە، بەڵام تەنها ئەو کچانەی وەرزشکار بوون ڕۆیشتن بۆ جەنگ و بە پێی گێڕانەوەکان کە مێژوو شایەتیان بۆ دەدات تەنها کچانی ئێسپارت وەرزشکار بوون و لە ئۆلەمپیادەکانی وەرزشی بەشدار دەبوون و نەنووسراوە کە کچانی دەوڵەتە شارەکانی تری یۆنان وەرزشکار بووبن، کچە ئێسپارتییەکان پێش هاوسەرگیری وەك پیاوان دەجولانەوە و دواتر کەس ئەوانی لە ئۆلەمپیادەکان نەدەدیتەوە. بەو شێوەیە بە وتەی گەزنەفۆن لە یۆنان ئەوەی توانای جەنگی هەبوو لە ژن و لە پیاو، خۆی بۆ جەنگ ئامادەکرد. گەزنەفۆن مێژوونووسێکی بە ئەدەب بووە و ئێرانییەکانی بە ناوی خۆیان ناو دەبرد، بەڵام هیرۆدۆت وێڕای ئەوەی لە رووی سیاسی شوێنکەوتەی هەخامەنشییەکان بوو، بەڵام لە هەموو بەشەکانی مێژوو جگە لە پەرتووکی (جەنگەکانی ئێران) ئەوانی بە (بەربەر) واتە وەحشی ناو بردووە، دەبینین کە ئەو بە ناو (باوکی مێژووە) ئەوانی بە وەحشی ناساندووە[1].

بە وتەی مێژوونووسانی یۆنانی لە هەموو وڵاتە یۆنانییەکان کە ئەوکات (١٧) وڵاتی گەورە و بچووك بوون، ژن و پیاو بۆ جەنگ ئامادەبوون و پێویستە بزانیین کە پێش ئەوکات نزیکەی پەنجا وڵات بوون. هەندێ لەو وڵاتانە تەنها شارێك بوون و بە وتەی یۆنانییەکان (سیتە) واتە شار و دەوروبەرەکەی بوون و سەربەخۆیی خۆیان هەبوو، بەڵام دواتر ژمارەی ئەو وڵاتانە کەم بۆوە و هەندێکیان بوونە بەشێك لە ئەوانی تر و وڵاتی گەورەتر هاتنەوەکایەوە.[2]

---

(١) (زەبیحوڵڵا بۆ زۆربەی بابەتەکانی پەرتووکەکەی پشتی بە هیرۆدۆت بەستووە و بە زۆری زۆردار دەیەوێت بە ئێرانی بناسێنێت، بەڵام هەر ماوە ماوە هێرشێکی توندی دەکاتەسەر و نازاندرێت ئەو هەموو هێرشانەی بۆ چییە. وەرگێڕ بۆ کوردی)

(٢) (زەبیحوڵڵا کاتێك باس لە ژمارەی زۆری لەشکری هەخامەنشی دەکرێت بە زێدەڕۆیی و ناراستی دەزانێت، لە کاتێکدا تەواوی خاك و دانیشتوانی یۆنان ئەوکات کەمتر بووە لە یەك لەسەر پێنجی سنووری ئیمپراتۆری هەخامەنشی و دانیشتوانەکەشی هیچ کات نەگەیشتووتە یەك لەسەر دەی ئەو سنوورە و بە مەبەست ژمارەی دانیشتوانی یۆنان ئەوەندە زۆر دەردەخات، وەرگێڕ بۆ کوردی.)

هەرچەندە دانیشتوانی وڵاتانی یۆنان کەم بوو، بەڵام چونکە هەموو ژن و پیاوەکان ئامادەبوون بۆ جەنگ و بەرەو مەیدانەکانی جەنگ چوون، دەبێت لەشکرەکەیان گەورە بوو بێت. مێژوونووسە ئەوروپییەکان باوەڕیان وایە ئەوکات کە جەنگ لە نێوان هەخامەنشی و یۆنانییەکان بەردەوامبوو و سەردەمی داریوشی یەکەم بوو، دانیشتوانی یۆنان جگە لە مەقدۆنیا نزیکەی دوو ملیۆن و نیو بووە و مەقدۆنیاش یەك ملیۆن و نیو بووە و بە یەکەوە چوار ملیۆن کەس دەکات.

کەواتە ئەوکاتەی مەردۆنیۆس و لەشکرەکەی چوونە ناو یۆنان، دانیشتوانەکەی نزیکەی چوار ملیۆن کەس بووە. پێویست بە باس ناکات کە بڵێین لە هەر کومەڵگایەکدا هەندێکان مندالن و هەندێکیش ژن و پیاوە بە ساڵاچووەکان یا ژنە خاوەن مێرد و منداڵەکانن کە ناتوانن بچنە جەنگ. ئەگەر پەسەند بکەین لە کۆی چوار ملیۆن دانیشتوانی یۆنان، سێ ملیۆن و نۆ سەد هەزار کەس لەو ژمارەیە لە منداڵ و ژنی خاوەن منداڵ و بە تەمەنداچوو و پەککەوتە و... هتد پێکهاتبوو.

دەکرێت بگوترێت سەد هەزار یۆنانی بۆ ئەو جەنگە ئامادەبوون، بەڵام سەیر لەوەدایە کە ژمارەی سەربازەکانی لەشکری یۆنان بە وتەی مێژوونووسە یۆنانییەکان هەر نۆ هەزار و دووسەد کەسە کە لە گالی پولی رێگەیان بە لەشکری هەخامەنشی گرتبوو. ئەوەی لەمە بەدوا باسی دەکەین لە بارەی جەنگێکە کە لە مێژوودا بە جەنگی ماراتوون ناو دەبرێت و مێژوونووسەکانی یۆنان زۆر باسیان لێوە کردووە، بەڵام لە بەڵگەنامە ئێرانییەکان هیچی لەبارەوە نەهاتووە و تەنها لە یەك لە کەتیبە لاوەکیەکانی بێستوون باسی لێوە کراوە و وەك ئاشکرایە بێستوون کۆمەڵێك کەتیبەی لێ یە کە یەکیان سەرەکیە و ئەوانی تر لاوەکین و لەو کەتیبە لاوەکیەدا کە پرۆفیسۆر کامیرۆنی ئەمریکی خوێندوویەتییەوە داریوش دەڵێت: لەشکری من لە یۆنان گەڕایەوە.

لە بارەی جەنگی یۆنان و هەخامەنشییەکان جیاوازی هەیە و مێژووی کۆن دەستپێکی ئەو جەنگەی بە سەرەتای هاوینی ساڵی (٤٩٠ پ. ز) دەست نیشان کردووە. لە باسی ئێمەدا دوو ساڵ زووترە و لە ئاپریلی (٤٩٢ پ. ز) لەشکری مەردۆنیۆس لە نیمچە دورگەی گالی پولی دابەزیوە و بە پێی مێژووی دابەزینی ئەو لەشکرە لەو بەروارە، دەبێت جەنگی ماراتۆن لە سەرەتای هاوینی ساڵی (٤٩٢ پ. ز) روویدابێت. ئەو جیاوازییە کە روویداوە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵنامەی یۆنانی کە چەندین جار گۆڕانی بەسەردا هاتووە و ناسراوترین گۆڕان کە بە سەریدا هاتووە یەکیان لە سەردەمی حکومەتی (ژووڵ سیزار) لە رۆم بووە و ئەوەی تر لە سەردەمی حکومەتی قشە (گریگۆری سیزدەهەم) پاپای کاتۆلیکی جیهان بووە کە لە ساڵانی (١٥٧٢ تا

١٥٨٥ ز) پاپا بووە. ساڵنامەی یەکەم بە ناوی ئەو کەسەی گۆڕیویەتی واتە (ژووڵ سیزار) و ئەوەی تر بە ناوی بگۆڕی دووەم (گریگۆری) ماوەتەوە.

لێرەدا نامانەوێت خوێنەر ماندوو بکەین بە باسی ئەو گۆڕانکاریانەی لە ساڵنامەدا روویداوە و تەنها ئەوەندە دەڵێین ئەو جیاوازییە لە ساڵی جەنگەکەدا دەگەڕێتەوە بۆ گۆڕانگاری ساڵنامەی یۆنانی و دیسان دەڵێین مێژووی کلاسیك بەرواری ئەو جەنگەی بە ساڵی (٤٩٠ پ. ز) دیاریکردووە. خۆزگە داریوش مێژووی ئەو جەنگەی وەك جەنگەکانی تری خۆی دەنووسییەوە و لە ناو بەرددا بۆ نەوەکانی داهاتووی ئێرانی بەجێ دەهێشت و ئەمرۆ ئێمە دەمانتوانی لە سەر ئەو بەردانە سەبارەت بە جەنگی ماراتۆن زانیاری وەربگرین.

کاتێك لەشکری هەخامەنشی دەستی بە جووڵە کرد، ئەنجوومەنی ئەسینا و ئەنجوومەنی ئێسپارت دەستیان بە کووبوونەوە کرد تا فەرماندەی لەشکرەی یۆنان بگۆڕن. ئامیداس پیاوێکی ئازا بوو و لە مردن نەدەترسا، بەڵام بێ ئاگایی ئەو بەڵگە بوو بۆ ئەوەی کە تەنها ئازایەتی بۆ فەرماندەیەك بەس نییە و پێویستە زیرەکیشی هەبێت و ئامیداس ئەوەندە تێگەیشتنی نەبوو کە لەوانەیە لەشکری هەخامەنشی لە پشت ئەو و لە ڕێگەی دەریا دابەزێت.

بەم شێوەیە هەر دوو ئەنجوومەنی یۆنان و ئێسپارت ئەویان لە سەرۆکایەتی لەشکر لادا و سردارێکی ئەسینایی ناسراو بە (میل تی یاد) کرا بە فەرماندەی لەشکری یۆنان بۆ پێشگیری لە لەشکری هەخامەنشی.

ئەوکاتەی میل تی یاد کرا بە فەرماندەی لەشکری یۆنان، پیاوێك بوو کە تەمەنی لە سەرووی پەنجا ساڵ بوو و بە دەستەواژەکانی ئەمرۆ ئەویان بۆیە کرد بە سەرلەشکر، چونکە شارەزا بوو لە بواری تاکتیکە جەنگییەکان. یەکەم ئیشی میل تی یاد دوای بوونی بە فەرماندەی لەشکر ئەو بوو کە ژنەکانی ناردنەوە بۆ ماڵەکانیان و وتی بوونی ژنەکان لە مەیدانی جەنگ لە جیاتی ببێتە هۆی بەهێز بوونی لەشکر، دەبێتە هۆی بێ سەر و بەرەیی و بۆ بەرگری بەرانبەر بە ئێرانییەکان تەنها پیاوان بەسن.

پێویستە باس لەو خاڵە بکەین کە سەبارەت بە بوونی داریوشی یەکەم لە یۆنان جیاوازی هەیە و هەندێ لە مێژوونووسانی رۆمی و یۆنانی نووسیویانە کە داریوشی یەکەم لەو جەنگە بووە و هەندێکی تریش کە یۆنانی نەبوون، نووسیویانە ئەو لە ئەوێ نەبووە و مەردۆنیۆس جەنگەکەی بەرێوە بردووە.

یۆنانییەکان دەڵێن لەو جەنگەدا تەواوی لەشکری هەخامەنشی لەناو چوو و بەم شێوەیە نازاندرێت کە چوون داریوش باس لە گەڕانەوەی لەشکرەکەی دەکات و مەردۆنیۆس چی بەسەر هاتووە. لە سەرچاوە یۆنانییەکان باسی ئەو جەنگە بەم شێوەیە دەکرێت: هەر کە (میل تی یاد) بۆوە فەرماندەی لەشکری یۆنان، تەواوی خەڵکی یۆنانی بۆ کاری بە زۆر داواکرد و ژن و پیاوانی ناچار بە دروستکردنی دوو دیواری بەرز و درێژ لە ناوچەی (بەئۆتی) کرد، بە شێوەیەك کە ئەو دوو دیوارە لە باکوور و باشوور ناوچەی بەئۆتی بگرنەخۆ و لەشکری ئێران دوای هاتنی بۆ ناو ئەو دەشتە توانای ڕۆیشتن بۆ باکوور یا باشووری نەبێت. لە ئاکامدا ئەو لەشکرە کە دەیەوێت خۆی بگەیێنێتە ئەسینا، ناچارە بە ناوچەی زەلکاوەکانی دەشتی بەئۆتی دا بڕوات و کاتێك گەیشتە ناو زوونگاوەکان، لە ناو دەچێت.

ئەو ناوچەیە بە پێی ئەوەی مێژوونووسە یۆنانییەکان باسی دەکەن لە باکووری ڕۆژهەڵاتی ئەسینا بووە و ئێستا ئەو شوێنە بەشێکە لە دەریا و ئەسیناش لە کەناری دەریا بووە و بەم پێیە مێژوونووسە یۆنانییەکان لە بابەتی ئەو زەلکاوانی هەڵە بوون و ئەوەش جێگەی سەرسوڕمانە و چوون دەتوانیین پەسەند بکەین کە ئەو مێژوونووسانە هەڵە بکەن؟ تەنها ئەگەر بڵێین ئەوان لە یۆنان لە دایك نەبوونە و ئاگاداری دۆخی جوگرافی ئەو ناوچەیە نەبوونە[٣]، ئێستا ئەو ناوچەیە زەلکاوی لێ نییە و زەلکاوەکان وشکبوون و تەنها جەنگەڵ و شاخی لێیە.

لە مێژووە یۆنانییەکاندا هاتووە، ئەوکاتەی یۆنانییەکان لەشکری هەخامەنشیان لە ماراتۆن شکستدا، شوانێکی گەنجی هەژدە ساڵان لە گوندی ماراتۆنەوە بەرێکەوت و جەنگەڵ و شاخ و زەلکاوەکانی بڕی و خۆی گەیاندە ئەسینا و هەواڵی سەرکەوتنی گەیاندە پەرلەمانی یۆنان. شوانەکە لە لادێی ماراتۆن کە لە زەوی وشکدا بوو کەوتەڕێ و شاخ و زەلکاوەکانی بڕی و گەیشتە ئەسینا، کەواتە ئەو شوێنەی ئەو شوانەی لێ بوو و لەشکری هەخامەنشی تیایدا شکا، زەلکاو نەبوو و ئەو گوندە ئێستاش ماوە و نزیك سێ هەزار کەس دانیشتوانییەتی و بژێویان بە کشتوکاڵ و چنینی بەڕە و شتی تر دابین دەبێت.

---

(٣) (زەبیحوڵڵا زۆر باس لە گۆڕانی جوگرافیای جیهان و بە تایبەتی ئێران لە (٢٥) سەدەدا دەکات و بۆ نموونە باسی زابولێستان دەکات کە ئاوەدان و سەوز بووە و ئێستا بۆتە بیابان، خۆ ئاساییە ئەو دۆخە بۆ زەلکاوەکانی یۆنانیش روویدابێت، چونکە زوونگاو زۆر ئاسان وشکدەبێت یا ئەگەر دەریا پێشرەوی بکات ئەوا داگیریان دەکات و دەبنە بەشێك لە دەریا. وەرگێر بۆ کوردی.)

ڕاستی جوگرافی و مێژوویی بەو شێوەیە و گومانمان لێ نییە کە ماراتۆن لە باکووری ڕۆژهەڵاتی وڵاتی ئاتیکە نەك لە باکووری ڕۆژهەڵاتی شاری ئەسینا.

ماراتۆن یەك لە وڵاتە سەربەخۆکانی یۆنان بوو کە تەنها چەند کیلۆمەترێکی چوار گۆشە زیاتر نەبوو و ئەو ناوبانگە دەگەڕایەوە بۆ ئەوەی لەو ناوچەیە پەرستینی هێرکوڵی پاڵەوانی ئەفسانەیی دەستی پێکرد و بۆ شوێنەکانی تری یۆنان چوو. دوای ماوەیەك ئەو وڵاتە و دوو دراوسێکانی بە ناوەکانی (تری کۆری تۆس) و (پرۆ بالین تۆس) کۆنفیدراڵیەتیان پێکهێنا و سێ وڵاتەکە یەکیان گرت، بە بێ ئەوەی زیان بە سەربەخۆیی ناوخۆیی خۆیان بگەیێنن. کاتی نزیك بوونەوەی لەشکری هەخامەنشی لە ماراتۆن، ئەو دەوڵەتە یەك لە سێ یەکگرتووەکان بوو کە بە یۆنانی بە (تت را پۆلیس) ناسرابوو. لە نێوان ئەو سێ وڵاتە و ئەسینا شاخێك هەبوو بە ناوی (پان تە لیکۆس) و دوای تێپەڕبوون لەو شاخە دەگەیشتنە کۆمەڵە گردێك کە بەرزاییەکانیان کەم بوو و بە ناوچەی (دیاکریا) دەناسرا.

لە داوێنی ئەو گردانە جەنگەڵ و لە خوارتریش زەلکاو بوو. دوای تێپەڕبوون لە ناوچەی (دیا کریا) شاری ئەسینا بوو، واتە لە نێوان شاری ماراتۆن و ئەسینا شاخێك هەبوو و نازانین ئەو دوو دیوارەی بە فەرمانی میل تی یاد (میل تیاریس) دروستکران کەوتبوونە کوێ، چونکە دەبوایە ئەو دوو دیوارە کەوتبوانە باشوور و باکووری دیاکریا تا لەشکری هەخامەنشی ناچاربێت بەرەو زەلکاوەکان بڕوات، بەڵام لەشکری هەخامەنشی لە ماراتۆن شکستی هێنا و نەیتوانی بگاتە ئەو ناوچەیە تا بەرەو زەلکاوەکان بڕوات.

لەوانەیە خوێنەری بەرێز بەو شیکردنەوانە ماندوو ببێت، بەڵام بە پێویستمان زانی بۆ روونکردنەوەی ئەو جەنگە باسی بکەین تا دڵنیا بین لە ئەوەی جەنگی ماراتۆن بەو شێوەیە کە یۆنانییەکان باسی دەکەن، روونەداوە. بە وتەی مێژوونووسە یۆنانییەکان ئەو جەنگە گەورەترین سەرکەوتن بووە و لە مێژووی ئەو وڵاتە سەرکەوتنی ئاوا نەبووە و پێچەوانەکەشی لە مێژوودا شکستی لەوە خراپتر بۆ هەخامەنشییەکان ڕوونەداوە، بەڵام ئەم سەرکەوتنە یۆنانییە و شکستە هەخامەنشییە لە گەڵ ڕاستینەی مێژوویی کە بۆخۆیان نووسیویانە ناگونجێت.

ئەوان دەڵێن لەشکری ئێران لە ناوچەی زەلکاوەکان تێکشکاوە و شوێنی شکستی لەشکری هەخامەنشیش بە نزیك ماراتۆن دەزانن، بەڵام لەو شوێنە نە لە ڕابردوو و نەئێستا زەلکاو نەبووە و شوانەکەش کە بە ڕاکردن هاتووە، دوای تێپەڕین لە شاخی (پان تەلیکۆس) گەیشتە ناوچەی زەلکاوی دیاکریا و ئەوجار گەیشتە ناو ئەسینا.

جگە لەو راستینە جۆگرافیاییە، تەرمی کوژراوەکانی یۆنان لە جەنگی ماراتۆن لە نزیك ئەو گوندە ناشتراون و بە هۆی دوو بینا، شوێنی ئەوان وەك یادگار هێشتراوەتەوە کە یەك لەو دوو بینایانە لە سەرەوەی گۆڕی کوژراوەکان و ئەوەی تر لە سەر گۆڕی (میل تی یاد) یا (میل تی یادس) درووست کراون و ئەو دوو بینایە دەرخەری ئەوەن کە گۆڕەپانی جەنگ نزیك ماراتۆن بووە نەك لە ناوچەی زوونگاوەکانی (دیاکریا). بێ سوود نییە کە بگوترێت ئەو بینایانەی باسکران لە سەر گۆڕی (١٩٢) سەربازی ئەسینایی کە کوژراون دروستکراوە.

واتە لەو جەنگە مەزنە کە هەموو پیاوانی یۆنان چەکیان تێدا هەڵگرت بۆ پێشگیری لە لەشکری هەخامەنشی و هاتن بۆ گۆڕەپانی جەنگ، تەنها (١٩٢) سەربازی یۆنانی کوژران، لە کاتێکدا ئەوان دوو هەزار سەربازیان لە نیمچە دورگەی گالی پولی هەبوو و دوای ئەوەش هەموو پیاوانی ئەسینا چەکیان گرتەدەست، پێویستە ژمارەی سەربازانی ئەسینایی زۆر زۆر بووبێت و وتمان کە یۆنانییەکان دوای ئەوەی هەموو پیاوانیش چەکیان گرتەدەست، دیسانیش ژمارەی لەشکری یۆنانیان بە (٩٢٠٠) سەرباز باس کردووە کە لەو ژمارەیەش دوو هەزاریان ئەسینایی بوون.

ئایا دەتواندرێت باوەڕ بکرێت لە جەنگێکی ئاوا گەورەی وەك جەنگی ماراتۆن کە بەو شێوەیە لە مێژووی یۆنان باسی کراوە، تەنها (١٩٢) سەرباز کوژرابێت؟ بینایەکی تری یادگاریش هەیە کە بە ناوی کوژراوەکانی تر بیناکراوە، بەڵام ژمارەی کوژراوەکانی نەتەوەکانی تری یۆنانیش بە رادەیەك نییە کە مرۆڤ بیربکاتەوە لە ئەوێ جەنگی گەورە روویداوە، چونکە ژمارەی کوژراوەکانی نەتەوەکانی تر و کۆیلەکانیشیان لە دوو سەد کەس تێپەڕناکات و ئەسینایییەکان کوژراوەکانی خۆیان لە کوژراوەکانی نەتەوەکانی تر جیاکردۆتەوە، چونکە دەمارگیریان بەرانبەر بە کوژراوەکانی خۆیان هەبووە.

ئێمە باسی جەنگی ماراتۆن بەو شێوەیە کە لە مێژووە یۆنانییەکاندا هەیە، دەخەینە باس، بەڵام دەڵێین بە پێی ڕاستینە مێژووییەکان یۆنانییەکان خۆیان جەنگی ماراتۆنیان لەکەدار کردووە و جەنگەکە بەو شێوەی یۆنانییەکان نووسیویانە، روویندەداوە و لەشکری هەخامەنشی لە زەلکاوەکانی دیاکریا روونەچوون و داریوشی یەکەمیش بە گریمانی زۆر لەو جەنگە نەبووە. زەلکاوەکاندا.

ئەوەی بە دروست دێتە بەرچاو بریتییە لە ئەوەی جەنگ لە نێوان بەشێك لە هێزی هەخامەنشی و یۆنانییەکان روویداوە. دوور نییە مەردۆنیۆس پێش ئەوەی لە گالی پولی بۆ

ئاتیك بچێت، پێشەنگی لەشکرەکەی ڕەوان کردبێت و ئەوان لە ماراتۆن گەیشتبنە لەشکری یۆنان و بەهۆی کەمی ژمارەیان تا دوایین کەسیان کوژرابێت، تەنانەت دوور نییە کە هەندێ لە سەربازەکان گەیشتبنە ناوچەی زەلکاوی دیاکریا و لەوێ لەناو چووبن، بەڵام ئەستەمە تەواوی لەشکری هەخامەنشی لە ماراتۆن لەناو برابێت.

ئێستا بۆ ئەوەی خوێنەرەکان سەبارەت بە جەنگی ماراتۆن زانیاری وەربگرن، ئێمە جەنگی ماراتوون بەو شێوەیە کە لە مێژووە یۆنانییەکاندا هاتووە باس دەکەین، بەڵام ئۆمێد دەکەین هەندێك کەس وابیرنەکەنەوە کە کونکەر لە خەشخاش (جۆرە رووەکێکە) دەدەین، چونکە جەنگی ماراتۆن ئەوەندە بەناوبانگە کە دوای بیست و پێنج سەدە هێشتا ناوی لەناو نەچووە و لە تەواوی وڵاتان و تەنانەت ئێرانیش غاردانی ماراتۆن ماوە و مێژوونووسەکانی رۆژئاوا ئەو جەنگە بە گەورەترین سەرکەوتنی یۆنان بەسەر هەخامەنشییەکاندا دەزانن.

پێش ئەوەی باسی جەنگی ماراتۆن وەك یۆنانییەکان باسیان کردووە، بخەینە بەردیدەی خوێنەری بەرێز، پێویستە دوو خاڵ باس بکەین: یەکەم ئەوەیە کە لە نێوان خودی یۆنانییەکاندا جیاوازی هەیە لە بارەی جەنگی ماراتوون. دووەم ئەوەیە کە هەندێك کەس دەڵێن داریوش لەو جەنگەبووە و هەندێکیش باوەڕیان وایە کە ئەو لە جەنگی ماراتۆن نەبووە.

وەك مێژوونووسە یۆنانییەکان دەڵێن لەشکری هەخامەنشی بە فەرماندەیی داریوشی یەکەم یا مەردۆنیۆسی زاوای هاتنە ئیالەتی بەئۆتی، چونکە دوو دیوار باکوور و باشووری ئەو ناوچەیەی گرتبوو، لەشکرەکە کە ژمارەیان دوو کرور بوو بەرەو رێگاکە رۆیشتن.

رێگاکە زۆر پان نەبوو، بەڵام بۆ پەرینەوەی لەشکرێکی ئاوا گەورە باش بوو و پاش ماوەیەك لە رۆیشتنی لەشکر بەناو ناوچەی بەئۆتیدا، عارەبانەکان لە لیتەی زەلکاوەکاندا چەقین و ئەسپەکان تا سینگیان کەوتنە ناو ئەو لیتەیە، سەربازەکانی هەخامەنشیش تا سەر و سینگیان کەوتنە ناو ئەو قور و لیتەیە و هاوکات سەربازانی یۆنان کە لە سەر هەر دوو دیوارەکە و لە باکوور و باشووری لەشکری هەخامەنشی بوون، لە هەردوو لاوە دەستیان کرد بە هاویشتنی بەردی فەلاخەن و نێزە و تیر و تیری مەنجەنیق بۆ هەخامەنشییەکان و لەو کاتەی ئەوان بۆ ساتێکیش دەرفەتی خۆ رێکخستنەوەیان بە سەربازانی داریوش نەدەدا، زیئۆسی خودای خوداکانیش تورە بوو و بارانێکی بەهێزی نارد و ناوچەی نێوان هەردوو دیوارەکە بۆوە زێێك و لافاوێکی گەورە هەستا و هاوکات هەندێك لە سەربازە یۆنانییەکان لە پێشەوە واتە لە رۆژئاواوە هێرشیان کرد.

پێش ئەوەی بەردەوامبین لە گێڕانەوەی جەنگەکە، خاڵە لاوازەکانی ئەو گێرانەوە دەخەینەروو:

ڕەخنەی یەکەم ئەوەیە کە ئەگەر عارەبانە و سوارکارەکان و سەربازە پیادەکانی پێشەوە لە لیتەی زەلکاوەکە رووچوون، بۆ ئەوانی تر نەوەستان؟ ئایا دەکرێت پەسند بێت کە ئەوانەی لە دواوە دەهاتن ئەوەندە نەزان بوون کە بە دیتنی نوقم بوونی ئەوان نەوەستن؟ گریمان دوو کروور سەربازی هەخامەنشی، دوو هەزار سەرباز لە لیتەکە رووچووبن، ئەوانی تر لە ڕۆیشتن بۆ ناو زەلکاوەکان دەوەستان و ڕێگەی خۆیانەوە دەگەڕانەوە.

ڕەخنەی دووەم ئەوەیە کە بە وتەی یۆنانییەکان لەشکری هەخامەنشی یەك ملیۆن کەس بووە و ئەگەر بە ریزی دەکەسی بڕۆیشتبن، شەو و ڕۆژێك بۆ پەرینەوەیان پێویست بووە، چوون هەموویان لەو لیتە و زەلکاوەدا چەقیون و لەناو چوون؟ بۆ تێپەڕبوونی هەر دە کەس نزیکەی چوار چرکە پێویشتە و بۆ ڕۆیشتنی یەك ملیۆن کەس زیاتر لە چوار شەو و ڕۆژ پێویستە و چوون لەشکری یەك ملیۆن کەسی هەخامەنشی توانیان لە یەك ڕۆژدا لەو ڕێگەیە بپەرنەوە و تا دوایین کەس نوقمی زەلکاوەکە بن.

ڕەخنەی سێیەم ئەوەیە کە دوای بارانی توند و هاتنی ئەو لافاوە توندە، سەربازە یۆنانییەکان چوون توانیان لە لای ڕۆژئاوای ئەو لەو ڕێگەیەوە هێرش بکەنە سەر سەربازانی داریوش؟ چونکە ئەو لیتە و لافاوەی بۆ سەربازانی هەخامەنشی بۆوە مایەی گرفت، بۆ ئەوانیش دەبوونە گرفت و نەیاندەتوانی وەك چوون لە وشکانی جەنگ دەکەن ئاوا جەنگ بکەن.

ئەوجار بەردەوام دەبین لە باس کردن ئەو جەنگە و ئەو جیاوازییەی لە ڕای یۆنانییەکان لە بارەی ئەو جەنگە هەبووە و لە ناو خۆیانەوە بۆ هەموو جیهان بڵاو بۆوە، کە بە گشتی بەم شێوازەیە:

لەشکری ئێران بەرەبەیان هاتە ناوچەی بەئۆتی، چونکە دوو دیوار لە باشوور و باکووری ئەو لەشکرە هەبوو، نەیاندەتوانی نە بەرەو باشوور و نە باکوور بچن، ماوەیەکی کەم دوای نیوەڕۆ جەنگی توند لە نێوان سەربازە یۆنانییەکان کە قەڵغانی قەڵاییان لەبەر بوو و سەربازەکانی ئێران دەستی پێکرد و هێشتا ڕۆژ بە کۆتا نەهاتبوو کە تەواوی سەربازانی ئێران لە ناوچەی بەئۆتی لە ناو چوون. ئەوکات میل تی یاد فەرماندەی لەشکری یۆنان کەسێکی وەك خۆبەخش ویست بۆ گەیاندنی هەواڵی ئەو سەرکەوتنە بۆ پەرلەمانی ئەسینا.

لە کاتی هاتنی لەشکری هەخامەنشی بۆ ناوچەی بەئۆتی لە نزیك شاری ماراتۆن، پەرلەمانی ئەسینا کۆبوونەوەی دەست پێکرد بوو و نوێنەرانی گەل لەو پەرلەمانە بڕیاریان دابوو بەردەوامبن تا ئەوکاتەی ئاکامی جەنگ دەردەکەوێت و میل تی یاد فەرماندەی لەشکری یۆنان دەیزانی کووبوونەوەی پەرلەمانی ئەسینا بەردەوامە.

کورێکی گەنج بە ناوی (میل تیس) کە شوان بوو، بڕیاریدا وەك خۆبەخش هەواڵی سەرکەوتنی لەشکری یۆنان بەسەر لەشکری هەخامەنشی بگەیێنێتە ئەسینا، میل تی یاد چەند وشەیەکی لە سەر پارچەیەك لە (تیماچ) نووسی و لوولیدا و دایە دەست لاوە شوانەکە، لاوەکە دەستی بەڕاکردن کرد و لە شاخی پان تێلیکۆس و جەنگەڵ و ناوچەی زەلکاوەکانی دیاکریا تێپەڕبوو و گەیشتە ناو ئەسینا و بەرەو ئەو شوێنە چوو کە نوێنەرانی گەل لێی کۆببوونەوە.

ئاشکرایە کاتێك لاوەکە دەست بە ڕاکردن دەکات، چونکە نزیك کۆتایی رۆژ بوو، بە زوویی تاریکی دەهات و بەڵام چاوی تەواوی ئەو کەسانەی لاون و لە سەحرا دەژین لە تاریکی شەودا دەبینێت و بە سوود وەرگرتن لە رووناکی ئەستێرەکان رێگای خۆی دەبینێتەوە، لە تاریکی شەودا بەر بەردەکان (لە ناوچەی شاخاوی) ناکەوێت و بە دارەکانیش (لە ناو جەنگەڵ) ناکەوێت و تەنانەت لە ناوچەی زەلکاوی دیاکریاش شارەزایە و دەزانێت بە کوێدا بڕوات و لە لیتەکان رووناچێت.

شوانە لاوەکە چۆوە ناو پەرلەمانی ئەسینا و ئەو نووسراوەی لای بوو دایە دەست سەرۆکی پەرلەمان و هاواری کرد (سەرکەوتن.... سەرکەوتن) و ئەوکات کەوتە سەر زەوی و هەڵنەستایەوە، چونکە بە هۆی ڕاکردنی بەردەوام مرد.(٤)

بە وتەی یۆنانییەکان تەنها داریوش لەگەڵ هەندێ لە پاسەوانەکانی کە ئەویان دەپاراست و لە گاردی جاوید بوون، توانی هەڵ بێت و نەکوژرێت.

ئەو مێژوونووسە یۆنانیانەی دەڵێن مەرۆنیۆس فەرماندەی لەشکری هەخامەنشی بوو، دەڵێن تەنها مەردۆنیۆس لەگەڵ ژمارەیەکی کەم لە پارێزەرەکانی لە مەیدانی جەنگ ڕزگاریان بوو و تەواوی ئەفسەر و سەربازە هەخامەنشییەکان لە ویلایەتی بەئۆتی لەناو چوون و کۆمەڵێکیان لە لیتەکان رووچوون و هەندێکیش بە دەست سەربازەیۆنانییەکان

(٤) (ئێستاش بەشدار بووان لە ڕاکردنی ماراتۆن، مەودای زیاتر لە (٤٢) کیلۆمەتر واتە مەودای نێوان جەنگگە و پەرلەمانی ئەسینا، ڕادەکەن بۆ ئەوەی یادی ئەو لاوە شوانە بەرز ڕابگرن، زەبیحوڵڵا.)

کوژران و زیانەکانی یۆنانیش لە جەنگەکەدا تەنها (١٩٢) سەربازی ئەسینا و (٢٠٠) سەربازی تری یۆنانی مردن.

ئەگەر لەشکری هەخامەنشی دوای ئەوەی هاتنە ناوچەی بەئۆتی یەك ملیۆن سەربازی هەبوو، بۆچی هەوڵیان نەدا دیوارەکانی باشوور و باکوور برۆخێنن و خۆیان لەو ناوچە زەلکاوە ڕزگار بکەن، لە دۆخێکدا کە جەنگ لە بەیانی تا ئێواری بەردەوامبوو و لەشکری هەخامەنشی دەرفەتی تەواویان بۆ ئەو کارە هەبوو؟ خۆ یۆنانییەکان دیوارەکانیان لە ئاسن دروست نەکرد بوو تا هەخامەنشییەکان نەتوانن وێرانیان بکەن و دەزانین کە ڕووخاندن ئاسانترە لە دروستکردن و لە ماوەیەکی کەمدا دەیانتوانی درز بخەنە ناو دیوارەکان و خۆیان لە لافاو و لیتە ڕزگار بکەن.

لە بابەتە سەیرەکانی ئەو گێڕانەوەیە ئەوەیە کە ئەو لەشکرە گەورەیەی هەخامەنشی بۆ هیچیان لە لایەن یۆنانییەکانەوە بە ئەسیر نەگیران و وەك دیارە لەشکرێك کە لە لیتە ڕووبچێت زۆرتر ئەسیر دەدات تا ئەو لەشکرەی لە وشکانی دەجەنگێت، بەڵام میل تی یاد فەرماندەی لەشکری یۆنان نەیتوانی لەو جەنگەدا ئەسیریان لێ بگرێت و لەوە سەیرتر ئەوەیە ئەوان هیچ دەستکەوتێکیان لەو جەنگە دەست نەکەوتووە کە تەنانەت ئەوەندەی پێشەنگی لەشکرەکە بێت.

لەکاتێکدا کە لەشکرێکی یەك ملیۆن کەسی لەناو دەچێت، دەستکەوتی جەنگی زۆر دەست سەرکەوتوو دەکەوێت و گریمان نیو ملیۆن سەرباز لە لیتە ڕووچووبن، خۆ دەبوایە دیسان کەلوپەل و چەکەکانی نیو ملیۆن کەسیان دەست کەوتبایە..

لە ناو ئەو دەستکەوتانەی کەوتەبەر دەستی یۆنانییەکان[٥]، شتێك هەبوو کە تەنانەت ناتوانین بیریش بکەینەوە چ بوو و بۆیە دەڵێین نەخشەیەکی جوگرافی کە لە سەر پەرەیەکی کانزایی هەڵکەندرا بوو، کەوتە دەست یۆنانییەکان و میل تی یاد دوای ئەوەی ئەو نەخشەیەی بردە ئەسینا و نیشانی زانا یۆنانییەکانیدا، بۆوە هۆی سەرسوڕمانی هەموان، چونکە لەو نەخشەیەدا جیهان بە شێوەی بازنەیی وێنە کرا بوو. یۆنانییەکان وێنەی زەویان بە لاکێشەیەك دەکرد کە درێژییەکەی لە ڕۆژهەڵات بۆ ڕۆژئاوا دوو ئەوەندەی پانییەکەی لە باکوور بۆ باشوور بوو.

تەنانەت دوای ئەوەی (هۆکاتووس) گەشتیاری بەناو بانگی یۆنانی دە ساڵ لە جیهاندا گەشتی کرد کە دەیکردە ماوەی نێوان (٥١٠ بۆ ٥٠٠ پ. ز) و پەرتووکێکی لە بارەی

---

(٥) (لە پاراگرافی پێشتر زەبیحوڵڵا بە دڵنیایی باس دەکات کە یۆنانییەکان لەو جەنگە نەیانتوانیوە هیچ دەستکەوتی جنگیان هەبێت و بۆیە لەو ڕوانگەوە وتەکانی ئەوانی بە درۆ دەخستەوە و کەچی ئێستا باس دەکات کە لەناو دەستکەوتەکاندا نەخشەیەك هەبووە، وەرگێر بۆ کوردی)

جوگرافیا نووسی بوو، نەخشەیەکی زەوی لە گەڵ پەرتووکەکە دانابوو کە دیسان زەوی و دەریاکان بە شێوەی تەخت دانرابوون.

بەڵام لەو نەخشەیەی دوای جەنگی ماراتوون لە هەخامەنشییەکانەوە دەست یۆنانییەکان کەوت، وێنەی هەرسێ کیشوەری ئاسیا و ئەفریقا و ئەورووپا لە گەڵ تەواوی دەریاکانی دەورەیان بە شێوەی بازنەیی کرابوو و هەستی بەدوادا گەڕانی زانا یۆنانییەکانی ورووژاند.

بوونی ئەو نەخشەیە لە لەشکری هەخامەنشی دەرخەری دوو بابەت بوو: یەکەم ئەوە بوو کە هونەرە جەنگییەکان لە لەشکری هەخامەنشی ئەوەندە پێشکەوتبوو کە ئەوان وەك هەریەکە لە لەشکرەکانی ئێستا ئەوەندە پێشکەوتوو بوو کە بە نەخشە دەجوولان، هەڵبەت نابێت نەخشەیەك لە (٥٠٠ پ. ز) لە رووی وردبینی و دروستییەوە وەك نەخشەکانی ئێستا هەژمار بکرێن، چونکە ئەوکات زانیاری لە بارەی هێڵەکانی پانی و درێژی جوگرافیا نەبوو تا نەخشەکان زۆر وردبن، لەگەڵ ئەوەشدا بوونی نەخشە لە لەشکری هەخامەنشیدا بەڵگەی پێشکەوتنی سەربازی و جەنگی ئەو سەردەمە بووە.

بابەتی دووەم کە ئەو نەخشەیە پشت راستی دەکردەوە ئەوە بوو کە هەخامەنشییەکان هەرچەندە ئەوکات زانیاریان لە بارەی هەبوونی کیشوەرەکانی ئەمریکا و ئۆستورالیا نەبووە (یا بە گریمانی بەهێز هەیانبووە)، بەڵام زانیویانە کە نەخشەی زەوی بازنەییە و سنووری هەرسێ کیشوەری ئاسیا و ئەفریقا و ئەورووپا و دەریاکانی ئەوانیان بە شێوەی بازنەیی کرد بوو.

سەد و پەنجا ساڵ دوای جەنگی ماراتوون، گەشتیاریکی خەڵکی (مارسیی) کە دەکەوێتە باشووری فەرەنسا، هەوڵیدا خۆی بگەیێنێتە جەمسەری باشوور و سەرکەوتوو نەبوو لە گەیشتنی بە جەمسەری باکوور و لە جیاتی ئەو توانی بگاتە دورگەی (گروو ئایلەند) و ئەو دورگەی دۆزییەوە و لە شوێنێکی ئەو جەزیرە کە ئێستا بە (توولە) ناسراوە (ئێستا ناوەندی ڕادارەکانی ئەمریکایە بۆ چاودێری جەمسەری باکوور) لەنگەری گرت. ئەو دوای گەڕانەوەی لە سەفەرەکەی نەخشەیەکی کێشا کە چوارلای چەماوە بوو و وتی پێموایە زەوی خرە. بەڵام زانایانی ئەوکات زەویان بە تەخت دەزانی و ئەو بابەتە دەستکەوتی ئێرانییەکان بوو کە لە پێنج سەدە پێش زایێن دەیانزانی زەوی خڕە.

سەرکەوتنی ماراتوون ئەوەندە یۆنانییەکانی خۆشحاڵ کردبوو کە ماوەی پەنجا رۆژ لە هەموو شوێنەکانی وڵات ئاهەنگیان گێڕا و بۆ یەکەمجار لە مێژووی یۆنان وەك سوپاس بۆ ئەو سەرکەوتنە دووسەد کۆیلەیان ئازاد کرد و ڕەگەزنامەی یۆنانیان پێدان، تەرمی شوانە لاوەکەیان

لە نزیك ئەسینا و لە گەڵ کوژراوەکانی جەنگەکە ناشت و لەسەر گۆڕەکەی بینایەکیان کرد. دوای ئەوەی میل تی یادیش مرد بردیان لە نزیك ماراتوون ناشتیان و بینایان لەسەر گۆڕەکەی دروستکرد و بیناکان تا ئێستا ماون.

جەنگی ماراتوون ئاکامێکی تریشی هەبوو و تا ئەوکات وشەی (وەحشی) لە لایەن یۆنانییەکان بۆ ئێرانییەکان بەکاردەهات و بەم جەنگە ئەوان بوونەوە (مرۆڤ) و میل تیادیس دوای سەرکەوتنی ماراتۆن وتی: سەرەنجام زانیمان ئێرانییەکانیش مرۆڤن و دەتوانین بەسەریاندا زاڵ بین.

ئەو ڕستە جارێکی تر و دوای (٢٠) سەدە لە لایەن (پۆڵی پینجەم) پاپای کاتۆلیکی جیهان (لە ساڵانی ١٥٦٦- ١٥٧٢ ز) هاتەوە سەر زمان. پۆلی پێنجەم دوای ئەوەی بوو بە پاپا، هەموو هێزی خۆی خستەگەر تا عوسمانییەکان بشکێنێت و بۆیە تەواوی وڵاتانی کاتۆلیکی ئەورووپای بۆ جەنگی عوسمانییەکان یەکگرتوو کرد و ئەو هێزە لە ساڵی (١٥٧١ ز) لە ناوچەیەك بە ناوی (لپانت) لە گەڵ هێزی عوسمانییەکان کەوتە جەنگ و دوای جەنگێکی توند، هەموو کەشتییە جەنگییەکانی عوسمانی یا ئەسیر و یا نوقم بوون و کاتێك هەواڵی سەرکەوتن بە پۆڵ واتە پاپای پێنجەم درا وتی: سەرەنجام ئێمە زانیمان کە تورکە عوسمانییەکان مرۆڤن و دەتوانین بەسەریاندا سەرکەوین.

ئەوە داستانی جەنگی ماراتوون بوو بەو شێوەیەی کە عقل و لێکدانەوە نیشانی دەدات(٦) و بەو شێوە کە مێژوونووسە یۆنانییەکان نووسیویانە و عقل و لێکدانەوە دەڵێت کە جەنگی ماراتۆن تەنها جەنگێك بووە لە نێوان پێشەنگی لەشکری ئێران و یۆنانییەکان و ناکرێت بەدەر لە کەمی ژمارەی کوژراوەکانی یۆنان، ئەستەم بوو کە داریوش یا مەردۆنیۆسی زاوای ئەو

(٦) (لەو بەشەدا دەبوایە بە جوانی باسی جەنگەکە کرابایە بەڵام لە جیاتی باس کردن، ڕەخنە کردن و بەلارێدا بردن هەبوو و ئەوەندەی شتی لاوەکی باسکراوە، هەرگیز باسی دروستی جەنگەکە نەکراوە. زۆربەی مێژوونووسەکان ژمارەی یەك ملیۆنیان باس نەکردووە و تەنها بەشێکی زۆر کەم نەبێت، بەڵام دیارە بە مەبەستی تایبەتی زەبیحوڵڵا بەردەوام ئەو بابەتە باس دەکات تا لە قەبارەی جەنگەکە کەم بکاتەوە و زاندراوە بەردەوام لەشکرەکانی هەخامەنشی کە لە وڵات دەرچوون لە سەرووی سەد و سەد و پەنجا هەزار کەس بوونە. باشتر وابوو زەبیحوڵڵا ناوی سەرچاوەکانی ئەو باسانەی لە بارەی ئەو جەنگە نووسراون خستبایەروو و وەك خۆی باسی کردبایە و دواتر رەخنەی کردبان تا خوێنەر بزانێت جەنگەکە بە تەواوەتی چوون بووە. وەرگێڕ بۆ کوردی.)

بتوانن بە لەشکرێکی یەك ملیۆنی ڕێگە لە کیشوەری ئاسیا بۆ یۆنان ببڕن و لە وڵاتانی یۆنانی خۆراکیان بۆ دابین بکرێت.(٧)

لە لایەکی تر ئەگەر یەك ملیۆن سەربازی هەخامەنشی بە تەواوی پێداویستی و کەرەستەی جەنگی لە یۆنان لە ناو چووبایە، داریوش لەوانەبوو لە ڕوووی سەربازی و جەنگییەوە نەتوانێت تا چەندین ساڵ دواتر خۆی بۆ جەنگ ئامادەبکات، بەڵام هەر ساڵی دواتر داریوش ئامادەی جەنگ بۆوە.

تا ئەوکاتەی مەترسی هەخامەنشییەکان هەبوو، یۆنانییەکان یەکگرتوو بوون و بە نەمانی دوایین سەربازی هەخامەنشی لە خاکی یۆنان، ناکۆکیە بەردەوامەکانیان سەری هەڵدایەوە و دوای جەژنە پەنجا ڕۆژییەکە، مەقدۆنییەکان کە سەربازیان زیاتر بوو لەو جەنگەدا، داوای قەرەبۆیان لە ئەوانی تر کردەوە و ئەسینا پەسەندی کرد تا دەستکەوتەکانی جەنگ بدرێتەوە ئەوان، بەڵام مەقدۆنیا ئەوە ڕێژەیەی لە بەرانبەر بە زیانەکانی خۆی زۆر پێ کەم بوو و داوای کرد کە پێویستە نەتەوەکانی تری یۆنان زیانەکانی ئەو بە زێرەکانی خۆیان بدەنەوە.

ئەسینا وەڵامیاندایەوە کە ئەوان ئەرکی نەتەوەیی خۆیان جێ بەجێ کردووە و ئەو کەسەی ئەرکی نیشتیمانی جێ بەجێ بکات نابێت چاوی لە قەرەبۆ بێت. بەڵام مەقدۆنیا وەڵامیان دایەوە کە ئاتیك و ئێسپارت و وڵاتانی تر، نیشتیمانی ئێمە نین تا سەربازەکانمان گیانیان بۆ ببەخشن و نەتەوەی مەقدۆنیا زیانەکانی بەرکەوتوون و بە ڕادەیەك جیاوازییەکان توندبوونەوە و وڵاتانی یۆنانی کە هاوپەیمانی ئەسینا بوون، خۆیان بۆ جەنگ لەگەڵ مەقدۆنیا ئامادەکرد.

---

(٧) (بە پێی نووسینی هەندێ مێژوونووسە کۆنەکان، فەرماندەی لەشکری ئێران لەو جەنگە (واتیس) بووە، نەك مەردۆنیۆس. زەبیحوڵڵا)

# کۆشکی شووش و هەڵکەندنی کەناڵی داریوش

چونکە بابەتەکانی ناوخۆیی یۆنان بابەتی باسی ئێمە نین، باس لەو جەنگانە ناکەین کە لە نێوان یۆنانییەکاندا دوای جەنگی ماراتوون روویداوە.

دوای جەنگی ماراتوون لە سەردەمی دەسەڵاتی داریوشی یەکەم، رووداوی تری گرنگ روویداوە کە یەك لە دیارترینیان دروستکردنی کۆشکی شووش بووە، ئەو کۆشکە لە شاری شووش دروستکراوە و یەك لە گەورەترین کۆشکەکانی دنیای کۆن بوو.

سەرچاوەی بیناکردنی کۆشکی شووش لە گەڵ سەرچاوەی دروستکردنی پێرسپۆلیس یەك بوو و داریوش هەر ئەو نەخشانەی بۆ کوشکی پێرسپۆلیس بەکارهاتن، بۆ دروستکردنی شووش بەکاری بردن و تەنها سادەتر بوو و بەردتاشی و پەیکەرسازی تێدا نەکرابوو.

ژمارەی ستوونە بەردینەکانی کۆشکەکە شەست ستوون بووە و هەمان بەرزی ستوونەکانی کۆشکی پێرسپۆلیسیان هەبووە و مێژوونووسە یۆنانییەکان زۆریان باس کردووە. کۆشکی شووش هۆڵێکی گەورەی هەبووە و شەست ستوون و پێنج سەد ژوور و کۆمەڵێك حەوشەی هەبووە و چونکە هیچ ئاسەوارێکی نەماوە، مێژوونووسە ئەوروپییەکان بە ئەفسانەیان داناوە، بەڵام سەبارەت بە کۆشکی پێرسپۆلیس چونکە ئاسەواری مابوو نەیانتوانی رەتی بکەنەوە.

دەستەیەك لە شوێنەوارناسانی فەرەنسی بە سەرۆکایەتی (ژان پێرۆ) کە کاری هەڵکەندنیان لە شووش بۆ دۆزینەوەی ئاسەواری کۆشکەکە دەکرد، سەرەنجام توانیان بناغەی شەست ستوونی هۆڵە گەورەکە بدۆزنەوە، هەروەها کەتیبەیەکیان دۆزییەوە کە لە لایەن داریوش نووسرابوو و دەریدەخست کە ئەو کۆشکە و پێرسپۆلیس لە یەك کاتدا دەست بە دروستکردنیان کراوە و بابەتێکی تر کە لە کەتیبەکەدا دەردەکەوێت ئەوەیە کە لە کاتی دەستپێکردنی کۆشکەکە بابی داریوش (وێشت ئەسپ یا هیست ئەسپ) و باپیری (ئیرشام یا ئیرشاما) زیندوو بوونە.

ئەو کەتیبەیە وەك تەواوی کەتیبەکانی تری داریوش بەو رستەیە (منم داریوش شای شایان، کوری ویشت ئەسپی هەخامەنشی) دەست پێدەکات و دواتر تیایدا هاتووە (بە پاڵپشتی یەزدان ئەو بینایە دروست دەکەم تا بۆ ئەو کەسانە بمێنێتەوە کە دوای من لەو وڵاتە دەسەڵاتدار دەبن و دوا لە خەڵکانی داهاتوو دەکەم، هەرگیز هەوڵی وێرانکردنی نەدەن.)

ژان پیرۆی فەرەنسی دەڵێت: (ئەو کۆشکە وەك کۆشکی پێرسپۆلیس ئەوەندە باش دروستکرابوو کە ئەگەر وێران نەکرابایە، ئێستاش وەك بیست و پێنج سەدە پێش نویێ دەهاتە بەرچاو.)

کۆشکی پێرسپۆلیسیش کە لە لایەن ئەسکەندەری مەقدۆنی وێران کرا ئەگەر وێران نەکرابایە، ئێستاش وەك سەردەمی داریوش نویێ دەهاتە بەرچاو و بە وتەی ژان پیرۆ کۆشکی شووشیش بە دەستی ئەسکەندەر وێران کراوە و بەردەکانیشی بۆیە نەماون، چونکە بۆ دروستکردنی بینای تر بەکارهێنراون.

مانەوەی بەردەکانی کۆشکی پێرسپۆلیس دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی دوای ئەسکەندەر و لە سەردەمی ساسانی و ئەشکانییەکاندا، ئێرانییەکان بانگەشەیان دەکرد کە ئەو بینایە ئاگرخانە بووە و ئاگرخانەش لای دەسەڵاتداران پیرۆز بوو و خۆیان دەپاراست لە لەناو بردنی بەردەکان یا بەکار هێنانیان لە بینای تردا. لە سەدەکانی دواتر بۆ ئەوەی زیاتر وێران نەکرێت، ئێرانییەکان دەیانووت ئەوە (تەختی سلێمان) و بارەگای ئەو پەیامبەرە بووە، چونکە لای عەرەبەکان رێز و گەورەیی هەبووە، بۆیە بەرد و ئاسەوارەکانیان ماوە و بە پێچەوانەوە تا ئێستا وەك کۆشکی شۆش تەنانەت بەردێکی نەدەما.

داریوشی یەکەم دوای ئەوەی هەواڵی شکستی لەشکرەکەی خۆی لە یۆنان بیست، بڕیاریدا دووباری لەشکرکێشی بۆ ئەو وڵاتەدا بکات. بەڵام لە میسرەوە هەواڵێکی ترسناك هات و بریتی بوو لە هێرشی ڕەش پێستەکان بۆ ئەوێ، ڕەش پێستەکان کوشتاریان لە خەڵکی میسر کردبوو و تەنانەت (دادافەر) کە ئێرانی و فەرمانرەوای میسر بوو، بە دەستی ئەوان کوژرابوو.

لە پەرتووکەکانی سەردەمی عەتیقدا هاتووە کە هەندێ جار میسر دووچاری بەڵا دەبوو و ئاوی نیل وەك خوێن سوور دەبوو و لە ئاسمانەوە (وزغ)[1] دەباری، بەڵام نەیاننووسیوە کە گەورەترین بەڵا هێرشی ڕەش پێستەکان بووە بۆ میسر. ئەوان زۆرجار لە سەردەمی فێرعەونەکان و لە سەردەمی ژێر دەستەیی میسر بۆ هەخامەنشی و یۆنانییەکان، هێرشیان دەکردەسەر ئەو وڵاتە.

---

(١) (وزغ جۆرە گیانلەبەرێکە کە تا رادەیەکی زۆر لە بۆق دەچێت و لە کوردیدا لە هەندێ شوێن بە وەزەق ناو دەبرێت. وەرگێر بۆ کوردی.)

ئەوان لە باشووری ناوچەی کۆش دەهاتن و ئاشکرایە کە ڕەش پێستەکان ئەوکاتەی لە ناوچەی کۆش دەجوولاّن، سەرەتا هێرشیان دەکردە سەر ئەو ناوچەیە و تالاّن و کوشتاریان دەکرد و دواتر میسریان دووچاری تالاّن و کوشتن دەکرد، ولاّتی کۆش ئێستا بە (سوودان) ناوی دێت و دەکەوێتە باشووری میسر. ئەوان بە درێژایی زێی نیل تالاّن و کوشتاریان دەکرد تا دەگەیشتنە باکووری میسر و ئەگەر هێزێك لە میسر دروست دەکرا تا ڕێگە لە ڕەش پێستەکان بگرێت، ڕەشەکان بە ڕێی خۆیاندا دەگەڕانەوە و بە پێچەوانەوە لە میسر دەمانەوە.

لە سەرەتای مێژووی میسر واتە لەگەڵ دەستپێکی یەکەم زەنجیرەی پاشایەتی فیرعەونەکان، (تا کاتی داگیرکردنی میسر لە لایەن هەخامەنشییەکان، ٢٤ زنجیرەی فیرعەونەکان دەسەلاّتدار بوون) بەردەوام فێرعەونەکان هەوڵیانداوە ڕێ لە هێرشی ئەو ڕەش پێستانە بگرن کە لە باشووری کۆشەوە دەهاتن و دواتر تێگەیشتن تەنانەت دیواریش ناتوانێت ڕێگەیان لێ بگرێت، چونکە ئەوان لە دیوارەکە دەسوڕانەوە و بۆ ڕێگرتن لەوان دیوارێك دروست بکەن کە سەرێکی لە ڕۆژهەلاّتی ئەفریقا بە زەریای هند و سەرەکەی تری لە ڕۆژئاوا بە زەریای ئەتلەس ببسترێتەوە. فیرعەونەکانی میسر نەیاندەتوانی دیوارێکی لەو چەشنە دروست بکەن، بۆیە هێرشی ڕەشەکان بەردەوام دەبوو.

(هاوارد فاستی) ئەمریکی لە بیوگرافیای حزرەتی موسا (ع) نووسیویەتی: کاتێك حزرەتی موسا لە خزمەتی سەربازی بوو، فێرعەون ڕایسپارد تا بچێتە باشووری ولاّتی کووش و ڕەشەکان تەنبێ بکات و ئەویش ڕۆیشت و ئەوکارەی کرد.

فرعەونەکانی میسر توانایان نەبوو ڕێگە لە هێرشی ڕەشەکان بگرن و بۆیە دوای هەر هێرشێك ئەوانیان تەنبێ دەکرد و ئاشکراشە کە تەنبێ کردنی خێڵە ڕەش پێستەکان کە لە باشووری کۆش دەهاتن لە لایەن فیرعەونەوە چییە، ڕەشەکانیش کاتێك هێرشیان دەکرد بۆ میسر، نەتەنها ژن و پیاویان دەکوشت، بەڵکو لە کوشتنی منداڵێنی شیرخۆریش خۆیان نەدەپاراست.

کاتێك داریوش والی میسر بوو، سەربازگەیەکی گەورەی لە باشووری کووش ڕادەگرت کە عارەبانەی جەنگیشی لێبوو، بۆ ئەوەی ڕێگر بن لە هێرشی ڕەشەکان کە هەرگیز کاتەکانی دیار نەبوو. بەلاّم (دادافەر) کە والی میسر بوو ئەو کارەی نەکرد، بۆیە میسر کەوتەبەر هێرش. ڕەشەکان لە ڕێگای زێی نیل و وشکانییەوە بەرەو باکوور بەرێکەوتن و ژمارەیان ئەوەندە زۆر

بوو کە کاتێك دەگەیشتنە شوێنە بچووکەکان، تا دوایین دەنکە گەنم و باقلەیان دەخوارد (میسرییەکانی کۆن باقلەیان زۆر دەچاند).

لە سەردەمانی کۆندا ناوچە گرنگە کشتوکاڵییەکانی میسر بریتی بوون لە بەشەکانی باکووری ئەو وڵاتەو لە باشووری میسر کشتوکاڵ پەرەی پێنەدرابوو. لە باکوور ئەوەندە گەنم و جۆ و باقلە و لۆکە دەچاندرا کە هەموو وڵاتانی دەورەی دەریای مەدیتەرانە کە دراوسێی میسر بوون، خۆراك و دانەوێڵەی پێویستیان لە ئەویٚ دەستەبەر دەکرد و لە تەواوی ئەو وڵاتانە بۆ دروستکردنی جل و بەرگ سوود لە لۆکە و کەتانی ئەو وڵاتە دەبیندرا.

کاتێك ڕەشەکان گەیشتنە ناوچە کشتوکاڵییەکانی باکووری میسر، کۆگاکانی دانەوێڵەی باشووریان لە ناو نەبردبوو، چونکە خۆیان برسی دەبوون. ئەوان هەر کەسێکیان بینی، کوشتیان و دادافەریش یەك لە کوژراوەکان بوو. دانیشتوانی میسر بە بیستنی هەواڵی هێرشی ڕەشەکان هەڵنەهاتن، بەڵام دانیشتوانی وڵاتەکانی تر کاتێك ئەو هەواڵەیان بیست هەڵاتنیان پیٚ باشتر بوو. هۆی هەڵنەهاتنی خەڵکی میسر ئەوە بوو کە دەترسان دوای هەڵاتن، گۆریان دەست نەکەوێت و تەرمەکانیان مومیایی نەکرێت.

هەر میسرییەك لە تەواوی تەمەنیدا پاشکەوتی دەکرد تا لە کاتی مردنی ئەو پاشکەوتە ببێتە تێچووی مومیایی کردن و گۆر دروستکردن بۆی و یەکەمجار کە لە میسر بانك دروستکرا بۆ هەڵگرتن و پاراستنی ئەو پاشکەوتانە بوو. میسرییەکان لەو بڕوایەدا بوون کە ژیانی ئەو دنیایەیان تەنها کاتییە و ژیانی داهاتوو لە جیهانی تر یەکجارەکییە، بەڵام بەو مەرجەی مۆمیایی بکرێت و لە گۆڕ بنرێت. کەسێکی میسری بەبیٚ زێدەڕۆیی لە تەواوی تەمەنیدا تەنها بۆ ئەوە دەژیا کە بمرێت و هیچ بەدبەختییەکی لەوە بە ترسناکتر نەدەزانی کە بیٚ گۆڕ بمێنێتەوە و مۆمیایی نەکرێت.

چونکە خەڵك دەترسان بێگۆر بمێننەوە، دەمانەوە و دەکوژران. ئەگەر دەسەڵاتدارێکی باش لەو وڵاتە هەبوایە دەیتوانی سوود لەو خۆڕاگریەی ئەوان وەربگرێت و سوپایەکی باشیان لیٚ ئامادەبکات و هێرشی ڕەشەکانیان پیٚ بشکێنێتەوە، بەڵام ئەو دەسەڵاتدارە لە میسر نەبوو و بۆیە میسرییەکان کەوتنە بەر لێشاوی کوژران و ئەوەندە دەکوژران کە دامەزراوەکانی مومیایی بۆ مومیایی کردنیان ڕانەدەگەیشتن و بە ناچاری دەیانخستنە ناو زێی نیل و دەبوونە خۆراکی تیمساحەکان.

کاتێك هەواڵی هێرشی ڕەشەکان و نەبوونی بەرگریکار بە داریوش گەیشت زۆر غەمناك بوو، چونکە ئەو ماوەیەك لە میسر ببوو و دۆخی ئەوێی دەزانی و دەیزانی بە هۆی هێرشی ڕەشەکان لە ئەوێ چ بە سەر خەڵکی میسر هاتووە و وتی: دادافەر شانسی باشی هەبوو کە بە دەست ڕەشەکان مرد، ئەگەرنا خۆم بە شێوەیەك سزام دەدا کە ببێتە پەند بۆ هەموو دەسەڵاتدارێك.

کاتێك هێرشەکە بۆ سەر میسر ڕوویدا، لە میسر سەرگەرمی هەڵکەندنی کەناڵی داریوش بوون کە زێی نیلی بە دەریای قەلزەم دەبەستەوە و یەك لە کارە زۆر گەورەکانی ئەو بوو. ئەگەر نەخشەی زێی نیل لە باکووری میسر بخەینە بەردیدەمان و مەودای نێوان ڕۆژهەڵاتیترین لقی ئەو زێیە و دەریای قەلزەم بزانین، تێدەگەین تەنانەت بە ئامێرە مێکانیکیەکانیش هەڵکەندنی زۆر قورسە چ جای ئەوەی ئەوکات بە پاچ و بێڵ هەڵدەکەنرا و خۆڵەکەی بە پشتی مرۆڤ و ئاژەڵەکان دەگوازرایەوە.

داریوش تەنها لە هەڵکەندن و دەردانی خۆڵەکە گرفتی بۆ دروست نەبوو و ئەندازیارە میسرییەکانیش لە نەخشەکە دژی وەستان و پێیان وابوو ئاوی دەریای قەلزەم دێتە میسر و میسر نوقم دەبێت، سەرسوڕمان لەوەدایە کە لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەمیش کاتێك (فردینان دۆلێسپێس) ویستی کەناڵی سوئێز هەڵکەنێت کە دەریای مەدیتەرانە و قەلزەمی بەیەك دەبەستەوە، هەندێك لە ئەندازیارە میسرییەکان بە هەمان شێوە پێیان وابوو کە ئاوی دەریای مەدیتەرانە میسر نوقم دەکات.

جگە لە ڕەخنەی ئەندازیارە میسرییەکان، کاهینەکانی میسری کۆنیش دژی هەڵکەندنی کەناڵی داریوش بوون، چونکە پەرستگایەك دەکەوتە سەر ڕێگای کەناڵەکە و بۆ هەڵکەندنی کەناڵەکە چارەیەك جگە لە ڕووخاندنی ئەو پەرستگایە نەبوو و بە پێچەوانەوە دەبوایە کەناڵەکە لەو شوێنە دووچاری چەمانەوە ببێت و ئەوکات لە هەر دوولاوە دەگەیشتە تاشەبەردەکان و هەڵکەندنی ئەوەندە قورس دەبوو کە ساڵانێکی زۆری دوادەکەوت.

داریوش بۆ وەرگرتنی ڕەزامەندی ئەوان پەرستگایەکی گەورەتر لەو پەرستگایەی لە نزیك ئەو شوێنە و لە سەر تێچووی خۆی دروستکرد و پێشکەش بە کاهینەکانی کرد. هەڵکەندنی ئەو کەناڵە یەك لە پیلانە سەرەکی و گەورەکانی داریوش بوو و جگە لە سوودی ئابووری، سوودی ستراتیژیشی هەبوو و دەبۆوە هۆی کۆکردنەوە کەشتییە پەرت و بڵاوەکانی هەخامەنشی لە دەریاکانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا لە یەك ناوچە، هەروەها کەشتییە بازرگانییەکان کە لە

بەندەرەکانی باشووری ئێرانەوە دەهاتن دەیانتوانی لە ڕێگەی ئەو کەناڵەوە بۆ هەموو بەندەرەکانی ئەورووپا بڕۆن.

هێرشی ڕەشەکان جگە لە زیانە خەراپەکانی، پرۆژەی کەناڵەکەشی پەکخست. ڕێگەکانی گەیاندنی هەواڵ و زانیاری لە سەردەمی دایوش ئەوەندە بەهێز بوو کە داریوش لە ماوەی شەش رۆژدا تەواوی هەواڵەکانی زانی، ئەمە لە کاتێکدا کە ئەگە ویستبای لە ڕێگەی کاروانەکانەوە ئەو هەواڵانە بزانێت، پێنج تا شەش مانگی پێویست بوو. داریوش بڕیاریدا خۆی بڕواتە میسر و کۆتایی بەو کارەساتە بهێنێت، بەڵام هاوکات لەگەڵ ئەو کارەساتە، ڕووداوێکی تری ناخۆش بۆ داریوش هاتە کایە کە بریتی بوو لە یاخی بوونی کورە گەورەکەی کە ناوی (ئارتۆبازان) یا (ئارتۆبازانس) بوو.

داریوش تا تەواو بوونی کۆشکی شووش لە ساڵی (٤٨٨ پ. ز) جێنشینی خۆی دیاری نەکرد، هەرچەندە ئەوکاتانەی لە وڵات نەدەبوو خەشایار کە کوری بچووکی بوو کارەکانی دەوڵەتی بەڕێوەدەبرد، بەڵام ئەو جێنشینییە بە شێوەی کاتی و نافەرمی بوو. لە ساڵی (٤٨٨ پ. ز) خەشایاری کوری کە (لە ئاتووسای کچی کوروش بوو) بە فەرمی کردە جێنشینی خۆی و دوای ئەوە گومان نەما کە لە دوای ئەو ئارتۆبازانی کورە گەورەی نابێتە پاشا و خەشایار پاشای هەخامەنشی دەبێت.

گومان نییە ئاتووسا کاریگەری لە دانانی خەشایار بە جێنشین لە لایەن داریوشەوە زۆر بووە و ئەو خزمەتانەی پێشکەشی ئەوی کردبوو تا بە دەسەڵات بگات لە بریاردانی داریوش بۆ دانانی خەشایار بە جێنشینی فەرمی خۆی زۆر کاریگەر بوو و داریوش بە دانانی خەشایار بە جێنشین، ویستی وەڵامی چاکەی ئاتووسا بداتەوە لە پاڵپشتی کردنی بۆ بوونی بە پاشا.

چونکە بۆ وەلانانی ئارتۆبازان لە شازادەی جێنشین هیچ پاساوێکی نەبوو، بۆیە داریوش وتی ئارتۆبازان پێش ئەوەی ببم بە پاشا لە دایك بووە و خەشایار دوای بوونم بە پاشا، لە لایەکی تر خەشایار کوری ئاتووسایە کە کچی کوروشی پاشای پێشووی وڵات بووە، بۆیە خەشایارم کردە جێنشین. ئارتۆبازان ئەوکات ساتراب و بە وتەی هەخامەنشییەکان (خەشترە پاوەن) بوو لە ئازەربایجان و ئەو بریارە زۆر کاری تێکرد و بریاری داریوشی بە ستەمێکی مەزن بەرانبەر بە خۆی دانا.

ئەگەر داریوشی یەکەم لە ژیاندا نەبوایە، ئارتۆبازان خۆی بە پاشا دەناساند، بەڵام داریوش لەوە مەزنتر بوو، کە لە کاتی ژیانیدا ئەو بتوانێ ئەو کارە بکات و چونکە نەیدەتوانی ئەو

جیاوازییە پەسەندبکات لە فەرمانی بابی یاخی بوو. داریوشی یەکەم دەیزانی دڵی ئارتۆبازانی بریندار کردووە، بۆیە نافەرمانی ئەوی زۆر بچووك نیشاندا و چاوپۆشی لە سزادانی کرد.

وتمان لە سەردەمی پاشایەتی داریوشی یەکەمدا ئەگەر یەك لە دەسەڵاتداران یا ساترابەکان (پارێزگار) لە پاشا یاخی بووبایە، سزای قورسی وەك داماڵینی پێستی لەشی بە زیندوویی یا دوو پارچە کردنی بە سەردا دەدرا و ئارتۆبازانیش یاخی ببوو لە بەجێ هێنانی فەرمانی پاشا و دەبوایە بەو شێوەیە سزا بدرێت، بەڵام داریوش نەیدەویست کورە گەورەکەی سزا بدات و چاوەڕوان بوو کات لە غەمە گەورەکانی کورەکەی کەم بکاتەوە و سارێژی برینەکانی دڵی بکات و بۆ خۆی پەشیمان ببێتەوە و بێتەوە بۆ لای باوکی. بەڵام ئارتۆبازان هێرشی کردە سەر کوردستان و داگیری کرد و ئامادەکاری دەکرد تا هێرش بکاتە سەر کارامیسین (کرماشان).

داریوش ویستی کوردستانیش بکاتە بەشێك لە حکومەتی کورە گەورەکەی و چاوپۆشی لەوکارەی بکات، بەڵام ئەو بابەتە بۆوە بنێشتە خۆشەی سەر زاری ئەوانەی تا ئەوکات توانای قسەکردن لە بەرانبەر داریوشیان نەبوو و ویستیان سنووری دەسەڵاتیان جیا بکەنەوە و خۆیان بە سەربەخۆ ڕابگەیێنن و جگە لەمەش داریوش بیری لە دوای مەرگی خۆی و کاتی پاشایەتی خەشایاری دەکردەوە و دەیزانی دوای ئەو، جەنگ لەسەر دەسەڵات لە نێوان دوو برا دەست پێ دەکات و تا یەکیان نەکوژرێت کۆتایی پێنایەت. ئارتۆبازان نەیتوانی کرماشان داگیر بکات، چونکە داریوش هێزی زیادەی ناردبۆوە ئەوێ و لە بەرانبەردا ئارتۆبازان هێرشی کرد بۆ ئاسیای بچووك و بڕیاریدا تەواوی وڵاتەکانی ئەوێ تا دەگەیشتە دەریای ڕۆژئاوا داگیر بکات، بەڵام دیسان سوودی نەبوو. داریوش دەیزانی ئەگەر لە گەڵ کورە گەورەکەی نەجەنگێت، دوای مردنی و لە سەردەمی جێنشینەکەیدا، ئیمپراتۆریەتی گەورەی هەخامەنشی پارچە پارچە دەبێت.

گەزنەفۆن دەڵێت: دوای ئەوەی لەشکری ئێران لە ماراتوون شکستی خوارد، داریوش بۆ هێرش بۆ سەر یۆنان نەخشەیەکی چوار ساڵەی خستەروو و بڕیاریدا لە ماوەی چوار ساڵدا هێزی وشکانی و دەریایی ئەوەندە بەهێز بکات کە یۆنان نەتوانێت بەرگەی بگرێت.

بەڵام هێرشی ڕەشەکان و یاخی بوونی کورەکەی بۆوە هۆی ئەوەی داریوش بەشێك لە هێزەکانی بۆ میسر بنێرێت و خۆشی بە فەرماندەیی هێزێك بۆ جەنگی کورە گەورەکەی بڕوات. کاتێك داریوش بە لەشکرەکەیەوە بۆ باشووری ئێران چوو، کورە گەورەکەی لە (سین دژ) بوو و دوای هێرشە بێ ئاکامەکەی بۆ ئاسیای بچووك هاتبۆوە ئەو شوێنە کە ئێستا بە (سەنندج) ناسراوە. (سین) لە زمانی پەهلەوی هەخامەنشی یەك بووە لە ناوەکانی هەتاو و دواتر بە هۆی

جیاوازی زاراوەکان گۆڕا بە (شین) و تەواوی ئەو پێشگرانەی (سین) کە لە شارەکانی ئێران دەدیترێن، واتای هەتاو دەدەن.

مێژوونووسی ناودار ئاریان سەبارەت بە (سین دژ) دەڵێت: قەڵایەك بووە کە لە ناو دەشتێکی دەورەدراو بە شاخەکان دروستکرابوو و ئێرانییەکان باوەڕیان وابوو کە (دا ئاە وە) دروستی کردووە.

(دا ئاە وە) وشەیەکە کە لە زمانی فارسی گۆڕاوە بە (دێو). قەڵای (سین دژ) زۆر قایم بوو، بۆیە هەموان باوەڕیان وابوو مرۆڤ ناتوانێت ئەو قەڵایە دروست بکات و دێو دروستی کردووە، لە ناو قەڵاکە چەندین بیری ئاوی لێبوو و ئەگەر خۆراکی تەواو لەناو کۆشکەکە هەڵگیرابوایە، تا ماوەیەکی نادیار توانی بەرگری و مانەوە لەو قەڵایەدا ئاسان دەبوو. دیوارەکانی ئەوەندە بەهێز بوون کە هیچ مەنجەنیقێك نەیدەتوانی وێرانی بکات و ئەوەندەش بەرز بوون، کەس نەیدەتوانی بەسەریاندا سەرکەوێت.

ئاریان دەڵێت: ئێرانییەکان باوەڕیان وابوو کە لە کۆندا دێوێکی گەورە بۆ ماوەی هەزار ساڵ لەو قەڵایەدا بەرگری لە بەرانبەر ڕەچەڵەکە جیاکانی مرۆڤ کرد. بەڵام بە وتەی ئاریان ئەو ئەفسانەیە راست نییە و قەڵای سین لە لایەن (ئایشتوویگۆ) پاشای بەناو بانگی ماد دروستکراوە و بۆ دروستکردنی ئەو قەڵا بەردینەش سوودی لە ئەسیرە ئاشوورییەکان وەرگرتووە.

ئارتۆبازان لە ئازەربایجان گوێ بیست بوو داریوشی باوکی و لەشکرەکەی بۆ جەنگی ئەو دێن و پێشبینی دەکرد کە سەردارەکانی ناوچەی ئازەربایجان بە فەرمانی داریوش جەنگی ئەو دەکەن. ئەو نەیدەتوانی بچێتە ئاسیای بچووك، چونکە ئەوانی کردبۆوە دوژمنی خۆی، بۆیە بڕیاریدا خواردەمەنی و ئالیکی تەواو لە سین دژ دابین بکات و لە گەڵ کۆمەڵێك لە سەربازەکانی کە جیاوازی بیروڕا لە بارەی ژمارەی ئەوان هەیە، پەنای بردە بەر ئەو قەڵایە.

داریوش دوای هاتنی بۆ کوردستان، قەڵاکەی گەمارۆدا و هەندێ لە سەربازەکانی لەوێ جێهێشت و بەرەو ئازەربایجان رۆیشت و پاشماوەکانی دەسەڵاتی کورەکەی لەوێ لەناوبرد و دڵنەوایی دەسەڵاتدارانی ئاسیای بچووکی کرد تا بزانن هێرشی کورە گەورەکەی فەرمانی ئەو نەبووە. ئەوانیش وەڵامیان دایەوە کە پاشای هەخامەنشی بە باشی دەناسن و دەزانن ئەو چاوتێبڕینی بەرانبەر وڵاتەکانیان نییە و ئارتۆبازان سەربەخۆ ئەو هێرشەی کردووە.

ئاریان ئەو وتانەی سەرەوە باس دەکات و زیاتریش باس دەکات و دەڵێت: داریوش کۆمەڵێك دیاری بۆ دەسەڵاتدارەکانی ئاسیای بچووك نارد و ئەوانیش بە هەمان شێوە دیارییان بۆ داریوش ناردەوە. دواتر داریوش گەڕایەوە بۆ کوردستان و ئەفسەرێکی بە ناوی (ئۆلۆس) یا (ئۆلۆش) ڕاسپارد تا قەڵاکە بگرێت و بە ئۆلۆشی وت: هیچ قەڵایەك نییە کە هەندی خاڵی لاوازی نەبێت، لە هەندێ لە قەڵاکان ئاو نییە و تینویەتی ئەوانەی ناو قەڵا ناچار دەکات خۆ بەدەستەوە بدەن، لە هەندێ قەڵا دیوارەکان سستن و زوو وێران دەکرێن و لە قەڵاکانی تریش، بە هۆی ئەوەی زەوی قەڵاکە لە خۆڵە دەتواندرێت کەناڵێك بە ژێر زەویدا لێ بدرێت و بە هۆیەوە بگەنە ناو قەڵاکە.

هەروەها وتی: ئێرە دەشتە نەك شاخ و ئەگەر نەتتوانی بە هێرشی ڕاستەوخۆ ئەو قەڵایە بگری، دەتوانی کەناڵ هەڵکەنی و لە ڕێگەی کەناڵەکە بچیە ناو قەڵاکە. لە لایەکی تر ئێرە کوێستانە و لە وەرزی زستاندا کەش و هەوا زۆر سارد دەبێت و لە ئێستاوە بۆ سەربازەکانت خانوو دروست بکە تا ناچار نەبی سەربازەکانت بگەڕێنییەوە و گەمارۆی قەڵاکە هەڵگری. دوای گرتنی قەڵاکە، ئارتۆبازان بکوژە و سری بۆ من بنێرە، هەرچەندە ئەو کوری منە بەڵام کورێك شمشێر بەرانبەر باوکی ڕابگرێت، پێویستە بمرێت.

ئۆلۆس وتی: یەك تکام هەیە.

داریوش وتی: چ تکایەکت هەیە.

وتی: گۆشت و ئێسکی من بە نانی هەخامەنشییەکان پەروەردەکراوە و ناتوانم شازادەیەکی هەخامەنشی بکوژم، تکا دەکەم من لە کوشتنی کورەکەت ببەخشە و دوای ئەوەی دەستگیرم کرد، دەینێرم بۆ پاشای خۆم و پاشا خۆی دەزانێت لە بارەی ئەو چ بڕیارێك دەدات.

داریوش بیری کردەوە کە ئەو ڕاست دەکات و ناتوانێت شازادەیەك بکوژێت بۆیە فەرمانی کرد دوای ئەوەی ئارتۆبازان دەستگیر دەکاتن ڕەوانەی لای پاشای بکات. دواتر داریوش سێ دژی بە جێ هێشت و چۆوە شووش و لەوێ نەخۆش کەوت، نەخۆشییەکەی درێژ بۆوە و چونکە لە ژیانیدا کەسێکی ڕاستی بێ بوو، فەرمانیدا تا لە (نەقشی رۆستەم) گۆڕی بۆ هەڵکەنن. قەبرەکەی ئێستا لەو شوێنەیە بەڵام هیچ تابووتی لێ نییە و چوار ستوونی هەبووە و لە ناو بەرد هەڵکەنراوە.

بەردتاشەکان بە چەکوچ و قەڵەمی پۆڵا ئەو گۆڕەیان هەڵکەند، چونکە ئەو بەردەی بۆ ئەو و پاشاکانی تری هەخامەنشی گۆڕی تێدا هەڵکەنرا، تەنها بە پۆڵا هەڵدەکەندرا و بۆیە دەبێت پەسەندی بکەین کە لە سەردەمی داریوش زانیاریان لەمەڕ پۆڵا و ئاسن هەبووە و بە

پێچەوانەوە نەیاندەتوانی ئەو بەردە سەختانە هەڵکەنن و لە ناو ئەواندا بۆ داریوش گۆڕ هەڵکەنن. ئەوکات نەریت بوو کە مردوویان دەخستە تابووت و تابووتەکەیان دەخستە گۆڕەوە. داریوش داوای کرد تا تابووتی لە بەرد بۆ دروست بکەن و دوای مردنی بیخەنە ناو ئەو تابووتە بەردینە و سەری تابووتەکە بگرن. لە سەردەمانی دواتر شێوەی ناشتنی مردوو لە ئێران گۆڕا و ئەوان کە زەردەشتی بوون، خاکیان بە پاك دەزانی و بۆیە تەرمی مردووەکەیان لەسەر شاخێك دادەنا تا گۆشتەکەی لەناو دەچوو و تەنها ئێسك دەمایەوە، ئەوکات ئێسکەکانیان دەناشت، بەڵام لە سەردەمی هەخامەنشییەکان و پێشتر، مردووەکانیان بە تابووت دەناشت.

هەندێ کەس باوەڕیان وابووە چونکە گۆڕی داریوش و دەسەڵاتدارانی تری هەخامەنشی لە ناو بەرد بووە، بۆیە تەرمی داریوش و ئەوانی تریش بە هەمان شێوە ناشتراوە. واتە سەرەتا تەرمەکەیان بردووتە سەر شاخ تا گۆشتەکەی لەناو چووە و ئێسکەکانی ماون، بەڵام ئاوا نییە و چونکە داریوش دووربین بوو، بۆیە گۆڕەکەی لە شاخ و لەناو برد هەڵبژارد تا لە داهاتوو، لە دەست دوژمنانی زنجیرەی هەخامەنشی بپارێزرێت و بەداخەوە نەپارێزرا و تابووتەکەی کە ئێسکەکانی ئەوی تێدابوو بردرا و کەس نازانێت ئایا ئێسکەکانیان ناشتوون یا لە بیابانێك فرێیانداون.

کوروشیش کە ئێستا گۆڕەکەی ماوە بە تابووت نێژراوە و پاشاکانی تری هەخامەنشیش بە هەمان شێوە بوون و بە گشتی مردووەکانیان بە سێ جۆرە تابووتە (بەردین، گڵێن و دارین) دەناشتن[٢]. خانەدانەکان بە تابووتی بەردین و ئەوانی تر بە تابووتی گڵێن یا دارین دەنێژران. مردوو بەبێ زێر و کەرەستە گرانبەهاکان دەنێژران و سەیر لەوەدایە کە لە ناو ئەو هەموو بۆنانەی هەبوون، کافووریان پێدا دەکردن وەك ئەوەی بیانزانیبێت کافوور خەسڵەتی دژە پیسی هەیە.

جگە لە مێژوونووس و پزیشکی یۆنانی کەتزیاس کە ماوەی بیست ساڵ لە کۆشکی هەخامەنشیدا پزیشك بووە، کەسی تر باسی نەخۆشی داریوشی نەکردووە و ئەو دەڵێت: داریوش خوارنە چەور و پڕ لە ڕۆنەکانی زۆر پێخۆش بوو و نەخۆشییەکەشی بریتی بوو لە هەوکردنی جەگەر.

بە پێی یاسا پزیشکیەکانی ئێستا ئەو بابەتە ڕاست بێت چونکە خواردنی چەوری زۆر، جەگەر بێ توانا دەکات و داریوش کە خۆراکە چەورەکانی زۆر پیخۆش بووە، ئەو نەخۆشییەی گرتووە و ئەوە هەمان ئەو نەخۆشییەیە کە بۆقرات کە دوای مردنی داریوش هاتۆتە دونیاوە بە

---

(٢) (لە کۆتایی ساڵی ١٣٤٨ هەتاوی بەرانبەر بە ١٩٦٩ زاییێنی لە لایەن ئیدارەی باستانناسی ئێرانەوە هەواڵی دۆزینەوەی گۆڕستانێك گەیشت کە دەگەڕایەوە بۆ هەزار ساڵ پێش زاییێن و مردووەکان لە تابووتی گڵێیندا بوون، زەبیحوڵڵا.)

یەك لە نەخۆشییە گەرمەكانی دادەنێت، واتە یەك لەو نەخۆشیانەیە كە بە هۆی گەرمییەوە دروست دەبێت و ئەو بیرۆكەیەی بۆقرات سەبارەت بە ساردی و گەرمی و شێ و ماندوویەتی تا ڕابردوویەكی نزیكیش پەسەند بوو.

ئەگەر بوقرات ویستبایە نەخۆشی داریوش بناسێنێت، دەیوت كە ئەو دووچاری نەخۆشییەكی گەرم بووە و ئێمە ئەمڕۆ نەماندەزانی نەخۆشی ئەو چ بووە، بەڵام كەتزیاس وێڕای ئەوەی پزیشكی یۆنانی دەزانی لە پزیشكی ئێرانیش بهرەمەند بوو و بۆیە دەیتوانی نەخۆشی داریوش بە روونی بزانێت و شتێكی تر كە نیشان دەدات دیاریكردنەكەی كەتزیاس نابێت نادروستبووبێت ئەوەیە كە نەخۆشی داریوش درێژەی كێشا و نەخۆشی جەرگ لەو نەخۆشیانەیە كە درێژە دەكێشێت.

بۆ چارەسەركردنی داریوش هەندێ پزیشك لە میسر و بابل و ئاسیای بچووك هێندران، هیچ یەك لە ئەوان نەیانتوانی چارەسەری پاشای مەزنی هەخامەنشی بكەن، بەڵام پێیان دەیوت چارەسەر دەبێت. داریوش لە رێگەی كۆتری نامەبەر پەیامی بۆ تەواوی خەشترە پاوەنەكان نارد تا لە شووش ئامادەبن و دوای ئەوەی هاتن، فەرمانی كرد لە رۆژی دیاریكراودا هەموو سەركردەكانی دەوڵەت و لەشكر و هەروەها هەندێ لە زانایانی ئایینی ئەوكات و شازادەی جێنشینیشی بانگ كرد و فەرمانی كرد تا خۆشنووسێك بۆ نووسینەوەی وتەكانی ئامادەبێت.

دوای ئامادەبوونیان لە ژوورەكەی و رێگە پێدانیان بۆ دانیشتن، بە دەنگێكی كز وتی:

(پزیشكەكان پێم دەڵێن كە چارەسەر دەكرێم، بەڵام من دەزانم كە دەمرم، چونكە باشترین پزیشك بۆ زانینی مردن و ژیان، نەخۆش خۆیەتی و ئەو لە تەندروستی خۆی دەزانێت كە دەمرێت یا زیندوو دەمێنێت.

داریوش نەختێك وەستا تا نووسەرەكە بتوانێت ئەوەی وتوویەتی بینووسێت و ئەوكات بەم شێوە دوا:

ئێستا كە من ئەو جیهانە جێ دەهێڵم، بیست و پێنج وڵات لە ژێر دەستی ئیمپراتۆریەتی هەخامەنشین[٣] و لە هەموویان پارەی ئێمە كاری پێدەكرێت و ئێرانییەكان لەو وڵاتانە رێزیان لێدەگیرێت و دانیشتوانی ئەو وڵاتانەش لە ئێران ڕێزیان لێ دەگیرێت.

---

(٣) (لە كەتیبەی بێستوون باسی (٢٣) وڵات كراوە، بەڵام لە سەرە مەرگدا باسی (٢٥) وڵات كراوە، زەبیحوڵلا.)

دیسان داریوش کەمێك بێ دەنگ بوو تا نووسەر بتوانێت وتەکانی بنووسێتەوە و دواتر بەردەوامبوو و وتی:

جێنشینی من خەشایار پێویستە وەك من بۆ پارێزگاری لەو وڵاتانە تێ بکۆشێت و بۆ ئەمەش پێویستە دەست نەخاتە ناو کارە ناوخۆییەکانی ئەو وڵاتانە و ئایین و باوەڕەکانیان ڕێز لێ بگرێت. ئەوکات ڕاستەوخۆ رووی لە خەشایار کرد و بە خۆشنووسەکەی وت ئەوەی بە کورەکەمی دەڵێم، بینووسە و بەم شێوە دوا:

ئێستا کە من ئەو جیهانە بەجێ دەهێڵم، تۆ خاوەنی دوازدە کروور داریك لە زێری کە لە گەنجینەی پاشایەتیدایە و ئەو زێڕە یەك لە پایەکانی دەسەڵاتی تۆیە، چونکە هێزی پاشا تەنها لە شمشێرەکەیدا نییە و هەبوونیش پایەیەکی گرنگە و دەبێ بزانی کە بەردەوام پێویستە ئەو خەزێنەیە پرتر بکەی و لێی کەم نەکەیەوە. من ناڵێم لەکاتی پێویست لەو گەنجینەیە هەڵمەگرە، چونکە نەریت وایە کە لە کاتی پێویست زێر لە خەزێنە دێتەدەر و لە نزیکترین دەرفەتدا دەخرێتەوە شوێنی خۆی.

دایکت ئاتووسا مافی لەسەر من هەیە و بەردەوام ڕەزامەندی ئەوت لا گرنگ بێت و بزانە ئەگەر یارمەتییەکانی ئەو نەبوایە، لەوانەبوو کە من نتوانم ببمە پاشا و تۆش لەدوای من ببی بە پاشا.

ئێستا براکەت ئارتۆبازان لە قەڵای سین دژ گەمارۆ دراوە و من ئۆلۆسی ئەفسەرم کردووتە بەرپرس لە گرتنی قەڵاکە و گرتنی ئەو، دوای ئەوەی ئەویان دەستگیر کرد و بۆ لای تۆیان هێنا، براکەت مەکوژە و لە یەك لە قەڵاکانی دابنێ و پێویستییەکانی ژیانی بە شێوەیەك بۆ دابین بکە کە شیاوی ژیانی شازادەیەك بێت و ڕێگە بە ژن و منداڵەکانی بدە تا لە گەڵ ئەودا بژین، بەڵام ڕێگە مەدە تا لە قەڵاکە دەربچێت و دووبارە یاخی ببێتەوە و بۆت ببێتە مایەی ماندووبوون و ناراحەتی. داریوش جارێکی تر لە قسە کردن وەستا و دوای ئەوەی نووسەر وتەکانی نووسییەوە، وتی:

دە ساڵە من سەرگەرمی دروستکردنی سایلۆکانی گەنمم و شێوەی دروستکردنی سایلۆی بەرز و بازنەیی لە میسر فێربووم، چونکە ئەو سایلۆیانە بەردەوام هەوا گۆرکێیان لێدەکرێت مێش و مێرۆلەکان ناتوانن بچنە ناوی و دانەوێڵەکان بێ ئەوەی لەناو بچن بۆ ماوەی چەندین ساڵ لەوێ دەپارێزرێن. دوای مردنی من پێویستە تۆ لە دروستکردنی سایلۆکان بەردەوامبین تا ئەوکاتەی بەردەوام بەشی دوو تا سێ ساڵ دانەوێڵەی یەدەگت لە سایلۆکان هەبێت و هەموو ساڵێك پێویستی خۆراك لە سایلۆکان تەواو بکە و دواتر دانەوێڵەی تازە بکە سایلۆکانەوە و بەو

شێوەیە تەنانەت ئەگەر دوو یا سێ ساڵ بەسەر یەکەوەش وشکەساڵی هەبێت، تۆ پێویستت بە دانەوێڵە نابێت.

داریوش جارێکی تر وەستا و دوای ئەوەی وتەکانی نووسرایەوە، وتی: هیچ کات دۆست و نزیکەکانت لە پۆستە گرنگەکانی وڵات دامەنێ و تەنها دۆستایەتیان بۆ تۆ بەسە، چونکە ئەگەر ئەو کارەت کرد و ئەوان ستەمیان لە خەڵکی کرد و سوودی نابەجێیان لە دەسەڵاتەکەیان وەرگرت، ناتوانی ئەوان سزا بدەی چونکە لە گەڵ تۆدا دۆستن و تۆ ناچاری رەچاوی دۆستایەتی بکەی.

ئەو کەناڵەی من ویستم لە نێوان دەریای سوور و زێی نیل دروست بکەم، هێشتا تەواو نەبووە و تەواو بوونی ئەو کەناڵە لە رووی بازرگانی و سەربازی زۆر گرنگە[٤] و پێویستە ئەو کەناڵە تەواو بکەی و پێویستە گومرگی تێپەربوونی کەشتییەکان لەوێ ئەوەندە زۆر نەبێت کە کەشتییەکان نەرۆیشتن بەو شوێنەیان لاباشتر بێت.

ئێستا من لەشکرێکم بۆ میسر ناردووە تا لەو ناوچەیەی دەسەڵاتی هەخامەنشی ئاسایش و یاسا دەستەبەر بکات، بەڵام دەرفەتم نەبوو تا لەشکرێك بۆ یۆنان بنێرم و پێویستە تۆ ئەو کارە بە کۆتا بێنی و بە لەشکرێکی زۆر بەهێزەوە هێرش بکە بۆ یۆنان و ئەوان تێبگەیێنە کە پاشای هەخامەنشی دەتوانێت تاوانباران بە سزای خۆیان بگەیێنێت.

ئامۆژگاری تری من بۆت ئەوەیە کە هەرگیز درۆزن و کاسەلێس لە خۆت نزیك مەکەوە، چونکە هەردووکیان بەڵان بۆ پاشایەتی و بێ بەزەیی ئەوان لە خۆت بە دوور بگرە. هیچ کات فەرمانبەرانی دیوان زاڵ مەکە بەسەر خەڵکدا و بۆ ئەوەی ئەو کارە روونەدات و ئەوان زۆر پەیوەندیان لەگەڵ خەڵکدا نەبێت. یاسایەکم بۆ باج دارشتووە کە پەیوەندی بەرێوەبەرانی باج و جەماوەری زۆر کەم کردووتەوە و ئەگەر پارێزگاری لەم یاسایە بکەی و بەم شێوە پەیوەندی ئەوان لە گەڵ خەڵکدا زۆر نابێت.

ئەفسەر و سەربازەکانی لەشکر رازی بکە و لە گەڵیان بەد رەفتاری مەکە، ئەگەر لە گەڵیان خەراپ بووی ئەوان ناتوانن کاردانەوەی هاوشێوەیان هەبێت، بەڵام لە مەیدانی جەنگدا تۆڵەت لێدەکەنەوە، تەنانەت ئەگەر تۆڵەکە بە نرخی ژیانیان بێت و تۆڵەکەش بریتییە لەوەی ئەوان لە کاتی جەنگ، هیچت بۆ ناکەن و خۆیان رادەست دەکەن تا تۆ شکست بخۆی.

---

(٤) (ئەو کەتیبەی لە کەناڵی نێوان دەریای سوور و نیلدایە لە کاتی داریوش هەڵواسرا، بەڵام کەناڵەکە دوای مردنی ئەو تەواو بوو. زەبیحوڵڵا.)

بابەتی خوێندن و نووسین کە من دەستم پێکرد، بەردەوام بکە و لێ بگەڕێ بەردەست و پەیرەوەکانت خوێندەواربن تا زیاتر بزانن و تێبگەن، چونکە تا زانین و تێگەیشتنی ئەوان زیاتر بێت، تۆ بە متمانەی زیاتر دەتوانی پاشایەتی بکەی. بەردەوام لایەنگری ئایینی مەزداپەرستی بە، بەڵام هیچ نەتەوەیەك ناچار مەکە تا پەیرەوی لە ئایینی تۆ بکات و بەردەوام لەبیرت بێت کە هەموان دەبێت لە پەیرەوی کردنی ئایینەکانیان ئازادبن.

دوای ئەوەی من مردم، تەرمەکەم بە جوانی بشوو و بەو کفنەی کە خۆم دابینم کردووە دام پۆشە و لەناو گۆرم بنێ، بەڵام گۆرەکەم دامەخە تا هەر کاتێك ویستت بتوانی بچیە ناو گۆرەکەم و تابووتە بەردینەکەم لەوێ ببینی و بزانی من پاشایەکی بەهێز و باوکی تۆ بووم و فەرمانڕەواییم بەسەر بیست و پێنج وڵاتدا کرد و دواجار مردم. تۆش وەك من دەمری، چونکە هەموو کەس دەمرێت چ درك هەڵکەن بێت و یا پاشایەك بێت کە وەك من پاشایەتی بەسەر بیست و پێنج وڵاتدا کردبێت، ئەگەر تۆ هەرکات دەرفەتت هەبوو سەرلە گۆرەکەم بدەی و بێیە ناوی و تابووتەکەم ببینی، لەخۆ بایی بوون نایەتە جەستەت. بەڵام کاتێك زانیت لە مردن نزیك دەبیەوە فەرمان بدە تا گۆرەکەم دابخەن و وەسیەت بکە تا کورەکەت گۆڕی تۆ بە کراوەیی بهێڵێتەوە تا بتوانێت تابووتی تۆ ببینێت.

ووریا بە و خۆ بپارێزە تا هیچ کات نەبیە سکالاکار و دادوەر و ئەگەر سکاڵات لە کەس هەبوو، ڕەزامەند ببە تا دادوەرێکت هەبێت و بڕیار بدات، چونکە ئەگەر سکالاکار بۆ خۆشی دادوەر بێت، ستەم دەکات.

هیچ کات دەست لە ئاوەدانکردنەوە هەڵمەگرە، چونکە ئەگەر دەست هەڵبگری وڵاتەکەت بەرەو وێرانی دەچێت. چونکە بەپێی ڕێساکان ئەگەر وڵات ئاوەدان نەبێتەوە بەرەو وێرانی دەچێت و سەرەتاکانی کارت پێویستە هەڵکەندنی کەناڵەکانی ئاو و دروستکردنی جادە و شارەکان بێت. بەخشندەیی و لێبوردن لەبیر مەکە و بزانە بەرزترین خەسڵەتی پاشایەك دوای دادپەروەری پێویستە بەخشندەیی و لێبوردن بێت. بەڵام لێبوردن تەنها ئەوکاتەیە کە کەسێك بەرانبەر بە تۆ هەڵەی کرد بێت و ئەگەر بەرانبەر بە یەکی تر هەڵەبکات و تۆ بیبەخشی، ستەمت کردووە و مافی خەڵکی ترت خواردووە.

لەوە زیاتر هیچ ناڵێم و ئەو وتانەم بە ئامادەبوونی ئەو کەسانەی لێرەن کرد تا بزانن پێش مردنم، من ئەو ئامۆژگاریانەم کردووە و ئێستاش برۆن و بە تەنها جێم بهێڵن، چونکە هەست دەکەم مردنم نزیك بۆتەوە.)

داریوشی یەکەم تا دە رۆژ دوای وەسیەتەکەی زیندووما و دواتر مرد. لەو مێژووە ئێرانیانەی جێی متمانەن و بریتین لە کەتیبەکان، بەرواری مردنی داریوش نەهاتووە و سەرچاوە یۆنانییەکانیش دەڵێن لە پاییزیساڵی (٤٨٦ پ. ز) مردووە و رۆژەکەیان دیاری نەکردووە.

کەتزیاس دەڵێت: پێش ئەوەی تەرمی داریوش بشوون و کفنی بکەن، خەشایارشای کوری لە سەر تەختی پاشایەتی دانیشت و بە پاشابوونی ئەویان ڕاگەیاند و ئەو راگەیاندنە بە سەد و یەکجار لێدان لە تەپڵ ڕاگەیێندرا.

کەتزیاس باس ناکات کە بۆچی سەد و یەکجار تەپڵیان لێداوە، بەڵام دەزانین کە لە ئاڤیستادا (١٠١) جار ناوی مەزدا هاتووە، بۆیە پاشاکانی کۆن لە کاتی بوونیان بە پاشا و دانیشتنیان لە سەر تەختی دەسەڵات، بەو ژمارەیە تەپڵیان دەکوتا.

لەوانەیە ڕەخنە بکرێت کە ئاڤیستا پەرتووکی ئایینی ئەوکاتی ئێران نەبووە و لە وەڵامدا دەڵێین بەڵێ و وەك لە باسی ژیانی داریوشی یەکەمدا وتمان یەك لە کارە گەورەکانی داریوش ئەوە بوو کە فەرمانی کرد تا ئاڤیستایان لە زمانی باختەری وەرگێڕا بۆ سەر زمانی فارسی هەخامەنشی تا هەرکەسێك خوێندنی ئەو زمانە دەزانێت، توانای خوێندنەوەی هەبێت. نەریتی تەقاندنی (١٠١) تۆپ لە شادییە گەورەکاندا لەو نەریتەوە ماوەتەوە، هاویشتنی بیست و یەك گوللە تۆپیش لە لای ئێرانییەکان لە ئاڤیستاوە هاتووە و دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی ئاڤیستا بیست و یەك بەشە.

کەتزیاس دەڵێت: بۆیە خەشایار پێش شووشتن و کفن کردنی باوکی لە سەر تەخت دانیشت، تا ڕابگەیێنێت دەسەڵاتداری کارێکە پشووی تێدا نییە و دوای ڕاگەیاندنی دەسەڵاتی ئەو، موزیك ژنەکان و دەنگ بێژەکان سروودی ماتەمیان ژنی و خوێند و نەریتی ئێرانییەکان بوو کە لە پرسە گەورەکاندا سروودی ماتەم لێ بدەن و بخوێنن.

ئەو نەریتە تا سەردەمی ساسانییەکان مایەوە و لە سەردەمی ساسانییەکاندا ماتەمی فەرمی ئێران بە ناوی (سووگ سیاوش[٥]) ناسرا، واتە سروودی ماتەمی سیاووش و لەوانەیە لە داهاتوو لێکۆڵەرەکان ئاوازی ئەو سروودە بدۆزنەوە، چونکە هەندێ لە ئاوازە ئێرانییەکان کە بە شێوەی نۆتەی موزیك دەنووسرانەوە لە کەلێساکانی ئەرمەنییەکاندا ماون.

دوای ئەوەی دەنگی سروودی ماتەم دەنگی هات، خەشایار و نزیکەکانی جلی ماتەمیان کردە بەریان کە سپی بوو، ئەوکات ڕەنگی سپی هێمای ماتەم بوو و دوای هەخامەنشییەکان

(٥) (سوگ سیاوش دوو وشەی فارسیە و واتای پرسەی سیاووەش دەدات، وەرگێر بۆ کوردی.)

که دەسەڵات کەوتە دەست ڕەچەڵەکێکی تری ئێرانی بە ناوی (پارت) یا (پرپو) ڕەنگی بەرگی ماتەمینی گۆڕدرا بە ڕەنگی ڕەش.

لە نووسینەکەی کەتزیاس بابەتێکی تریش دەردەکەوێت کە لە سەردەمی هەخامەنشییەکاندا تەرمی مردوویان شووشتووە، بەڵام تەرمی مردوویان لە ئاوێك کە لە بەری ڕۆیشتبا نەدەشووشت و بروایان وابوو ئەمە تاوانە و بە باوەڕی ئەوان ئەو ئاوە پاکە و جەستەی مرۆڤ پیسە و نابێت ئاوەکەی پیێ پیس بکرێت.

دوای ئەوەی تەرمی داریوشیان شووشت، لە تابووتی بەردینیان هاویشت و سەرەکەیان داخست و بۆ سەر شاخی بەرز، بەرەو گۆڕەکەی لە نزیك (تەختی جەمشیدی) ئێستا بردیان و بە ئامراز گەلێك بردیان کە لە بینای تەختی جەمشید بۆ جووڵاندنی شتی قورس بەکارهاتووە، تابووتی بەردینی قورسیان بردە سەر شاخ و لە گۆڕەکەی خۆیان هاویشت و بەم شێوەیە پاشایەتی یەك لە گەورەترین پاشاکانی هەخامەنشی کۆتایی هات و دەسەڵاتی کورەکەی دەستی پێکرد.

لەو بابەتە کە داریوش بە یەك لە گەورەترین پاشاکان دادەنیین، زێدەڕۆییمان نەکردووە و دوای خەشایاری کوری داریوش، هەندێ لە پاشاکان تەنها سەرگرمی کۆشکی ژنەکانیان بوون تا بەڕێوەبردنی وڵاتە پان و بەرینەکەیان. دەزانین داوەری لە بارەی کارە گەورەکانی پیاوانی دیار بەپێی سەردەمەکان جیاوازە، چەنگیز بە وتەی هەندێ مێژوونووسان یەك لە دیارترین پیاوەکانی مێژوو بووە و لە ڕاستیشدا تەنها خوێن ڕێژ بووە[٦].

مێژوونووسە کۆنەکان گەورەیی پاشاکانیان تەنها لە روانگە جەنگ و جیهانگیریەکانیاندا بینیوە و ئەم بابەتانەش بەلای ئێمەوە پەستن. بەڵام گەورەیی داریوش بۆ ئەو کارانە دەگەڕێتەوە

(٦) (داریوش لە سەردەمی دەسەڵاتداری خۆیدا ٢٤٢ یاخی بوونی لە ئیمپراتۆریەتەکەی دامرکاندۆتەوە و دەیان جەنگی تری ئەنجامداوە و تەنانەت تا خاکی ئەورووپاش بۆ جەنگ چووە، زۆر شاری وێران و زۆر کەسی کوشتووە، دەکرێت بگوترێت ئەوەی لە بواری جەنگ و کوشتار کردوویەتی لە هی جەنگیز ئەگەر زیاتر نەبێت کەمتر نییە و ئەگەر جەنگ و کوشتار پێوەری چاك و خەراپە بێت بۆ هەردووکیان وەك یەکە، بەڵام پێوەر بۆ مەزنی کەسەکان لە گەڵ سەردەمی خۆیانە و ناکرێت بە پێوەرەکانی ئەمرۆ کەسەکان هەڵسەنگێنین و لە روانگەی زەبیحوڵڵا داریوش کە فارس بووە لە پێشترە و لە روانگەی خەلکێکی ئەورووپیش کە بێلایەنانەتر بیر دەکەنەوە، لەوانەیە چەنگیز لە پێشتر بێت، بەڵام ئەوەی گرنگە بریتییە لەوەی ئەو پاشایانەی بەردەوام بیریان لە جەنگ و فراوان کردنی دەسەڵاتیان کردووتەوە لەوکات تا ئێستا، ناچاربوونە بەردەوام تاوان و کوشتار بکەن و داریوش و جەنگیزیش بەدەر نین لەم یاسایە و تەنانەت زۆر کەس شێوەی بە دەسەڵات گەیشتنی داریوش بە شێوەیەکی زۆر جیاواز لەوەی زەبیحوڵڵا باس دەکات، دەگێرنەوە و دەڵێن هیچ کۆدەنگیەك نەبووە بۆ دیاریکردنی بە پاشا، وەرگێر بۆ کوردی.)

که (٢٥) سەدە پێشتر کردوویەتی و جێی دەستخۆشین. لەناو کارە دیارەکانی داریوش سزای توند بوو بۆ تاوانباران کە بۆ هەندێکیان دوولەت کردن و بە زیندوویی پێس لێ داماڵین بووە.

داریوش وێڕای هەمو کارە گەورەکانی، نەیدەتوانی لە نەریتەکانی ئەو کات دەست هەڵگرێت و ئەو کات باوەڕی خەڵك وابوو کە سزای تاوانبار تا توندتر بێت زیاتر بۆ خەڵك دەبێتە پەند و بڕوایان بە چاك بوونی تاوانبار نەبوو، لەگەڵ ئەوەشدا سزای دوولەت کردن و پێست داماڵین تەنها بۆ ئەو کەسانە بوو کە ناپاکیان لەگەڵ پاشادا دەکرد و بۆ تاوانبارانی تر، سزای سووکتر هەبوو.

داریوشیش وەك کوروش هەندێ دامەزراوەی دامەزراند کە تا ئێستاش لە ئەفریقا دانەمەزراون و کاتێك باسی پێگەیشتوویی ئەو و کوروش دەکەین، ناتوانین یەکیان بە لە پێشتر بزانین، چونکە کارەکانی هەردووکیان بە پێوەرەکانی ئێستا دیار و گەورەن. بناغەی پاشایەتی هەخامەنشی لە لایەن ئەو دوو کەسە پتەو کرا و دامەزراوەکانیان تا دوارۆژی پاشایەتی هەخامەنشی مانەوە.

داریوش بۆ دانانی یاسا باشتر بوو لە کوروش و بۆ جێبەجێ کردنیان هەندێ دامەزراوەی دانا تا دوای مردنیشی ئەو یاسایانە بمێنن. سەبارەت بە تەمەنی داریوش جیاوازی لە بیروڕاکاندا هەیە و هەندێك بە (٦٣) و هەندێك بە (٦٥) و هەندێکیش تا تەمەنی (٧٣) ساڵ باسیان کردووە.

## خەشایارشا و یاخی بوونی بابل

لە کۆندا لە رۆژهەڵات کەمتر روویدەدا کە یەك لە دەسەڵاتداران بە مردنی ئاسایی بمرێت و بۆ جێنشینەکەی گرفت روونەدات، گرفتەکان زۆرتر لە لایەن ئەو کەسانەوە بوو کە لە سەردەمی پاشای کۆچ کردوودا لە ترسان بێ دەنگ دەبوون و بە هاتنی پاشای تازە، بە بیانۆی لاوی و بێ توانایی پێیان وابوو کە دەتوانن سەرکێشی بکەن و یاخی دەبوون تا ئەو لە تەختی پاشایەتی لابدەن.

بەڵام دوای ئەوەی خەشایار بوو بە پاشا تەنها برا گەورەکەی لێی ڕاست بۆوە، بەڵام لە بەرانبەردا بابل یاخی بوو و هاوکاتیش دەسەڵاتی ڕەشەکان لە میسر بەردەوامبوو.

خەشایارشا برایەکی هەبوو کە یۆنانییەکان بە (ئاکاە ماناش) ناویان بردووە و بەپێی زانینی ئێمە هەمان (هەخامەنش) بووە. ئەو کوری ئاتووسای دایکی خەشایار بوو و دوای ناشتنی باوکی، بە خەشایاری وت: ئەگەر رەزامەندی بنوێنی، من دەچم بۆ سین دژ و لە گەڵ ئارتۆبازان دەدوێم و لەو قەڵایە دەری دەهێنم.

خەشایار وتی: ئەگەر تۆ بچیە ئەوێ، بە هۆی ئەوەی لە دایك و باوکی منی، لەوانەیە ئارتۆبازان تۆ بکوژێت.

هەخامەنش وتی: ئەو من ناکوژێت، چونکە لە منداڵییەوە منی خۆش ویستووە و بڕوای پێ بووم، بەڵام دوای ئەوەی من لە سین دژ بیهێنمەدەرەوە، تۆش نابێت ئەو بکوژی. خەشایار وتی: چوون ئەو لە قەڵاکە دەردەهێنی.

هەخامەنش وتی: ماری ژەهراوی بە قسەی خۆش لە کون دێتەدەرەوە و منیش دەتوانم بە قسە ئارتۆبازان ڕازی دەکەم و لە قەڵاکە دەیهێنمە دەرەوە، بەو مەرجەی بە دەستی خۆت بنووسی و بەڵێن بدەی کە ئەو ناکوژی و لە زیندانی ناکەی.

خەشایار وتی: بیستت کە یەك لە وسیەتەکانی باوکمان ئەوە بوو کە دوای دەستگیر کردنی، نابێت ئارتۆبازان بکوژم.

هەخامەنش وتی: ئارتۆبازان ئەو وەسیەتەی نەبیستووە، بۆیە تا دەست و خەتی تو نەبینێت بڕوا ناکات کە تۆ نایکوژیت و لە زیندانی ناکەیت.

خەشایار دوو نووسراوی بە دەستی خۆی لە سەر پێستە نووسی، یەکیان بۆ ئۆلۆس فەرماندەی لەشکری ئێران لە دەورەی سین دژ و ئەوی تر بۆ ئارتۆبازان. لە نووسراوی یەکەم فەرمانی بە ئۆلۆس کردبوو تا رێگەی براکەی بدات بۆ چوونە ناو قەڵاکە و وتوویژ لە گەڵ ئارتۆبازان.

لە نامەی دووەمدا بەڵێنی بە ئارتۆبازان دەدا کە ئەگەر دەست لە یاخی بوون هەڵبگرێت و لە قەڵای سین دژ بێتەدەر و لە داهاتووشدا یاخی نەبێتەوە، چاوپۆشی لە سزاکەی دەکات و نایکوژێت و لە زیندانی ناکات و تەنانەت پلە بە ئەو دەدات و وەك جاران بە ساتراب دادەنرێتەوە.

هەخامەنش هەردوو نامەی لابوو و بەرەو سین دژ چوو و نامەی یەکەمی گەیاندە دەست ئۆلۆس و ئەویش دوای خوێندنەوەی نامەکە، فەرمانی کرد جار بدەن کە هەخامەنش برای ئارتۆبازان هاتووە و دەیەوێت بێتە ناو قەڵا و لەگەڵ براکەیدا گفتوگۆ بکات.

ئارتۆبازان لەو هەزاران سەربازەی گەمارۆی قەڵاکەیان دابوو، تێگەیشت بابی مردووە و ئاساییش بوو زانیبیتی خەشایار بۆتە پاشا لە جیاتی داریوش، لە هاتنی هەخامەنش بە دوو هۆ خۆشحاڵ بوو: یەکەم چونکە ئەوی خۆشدەویست. دووەم بیری دەکردەوە براکەی دەبێت هەواڵی تازەی بۆ هێنابێت و بە پێچەوانەوە ماندوو بوونی رێگای نەدەدا بە خۆی و داوای هاتنە ژوورەوەی قەڵاکەی نەدەکرد. بۆیە لە رێگەی یەك لە سەربازەکانی وەڵامی جارچییەکەی دایەوە کە هەخامەنش بەخێر بێت و بۆی هەیە بێتە ناو قەڵاکە.

ئارتۆبازان دەترسا ئەگەر دەرگای قەڵا بۆ هاتنەژورەوەی هەخامەنش بکاتەوە، سەربازەکان دەرفەت وەربگرن و بێنە ناو قەڵاکە، بۆیە بە هۆی دوو پەتەوە کەژاوەیەکیان ناردە خوارەوە و هەخامەنێش سەرکەوت و هەڵیانکێشایە ناو قەڵاکە و بردیان بۆ لای براکەی. هەردوو برا باوەشیان لێکدا و یەکتریان ماچ کرد و دواتر بە وتەی ئاریان یەکەم ڕەستە کە لە زاری هەخامەنش دەرچوو، ئەوە بوو: (ئەی ئارتۆبازان ڕازی مەبە بنەماڵەی هەخامەنشی لەناو بچن.)

ئارتۆبازان بە سەرسوڕمانەوە وتی: من چیم کردووە کە بۆ بنەماڵەی هەخامەنشی ببێتە مەترسی؟

هەخامەنش وتی: ئەو کارەی تۆ بۆوە هۆی ڕاپەرینی میسر و بابل، بەیانیش هەموو دەسەڵاتدارانی ئاسیای بچووك و سوریا و دواتر دەسەڵاتدارانی رۆژهەڵاتی ئیمپراتۆری یاخی دەبن و بەم شێوەیە بنەماڵەکەمان لەناو دەچێت.

ئارتۆبازان وتی: من تەنها مافی خۆم دەوێت و هیچم بۆ لەناو بردنی بنەماڵەی هەخامەنشی نەکردووە.

هەخامەنش وتی: ئەو مافەی تۆ دەتویست، لە باوکمانت دەویست و دەتگووت کە تۆ بکاتە جێنشینی خۆی، بەڵام بابمان مردووە و داواکەت پووچ بۆتەوە، چونکە کەس سکالای لە مردوو نییە و پشت راستیشم کاتێك بابم زیندوو بوو، تۆ هیچ داوایەکت لە خەشایاری برامان نەبوو.

ئارتۆبازان وتی: ڕاستە من داوام لەو نەبوو و لە بەرانبەر باوکم سکالاکار بووم.

هەخامەنش وتی: ئێستا خەشایار پاشایە و تۆ دەزانی پاشایەتی بە رێگەی سۆزداریەوە دەست ئێمە ناکەوێت، ئەستەمە پاشایەك دەست لە پاشایەتی هەڵبگرێت و تۆش ناتوانی ئەو ناچاربکەی دەست لە پاشایەتی بکێشێتەوە، چونکە لەو قەڵایەدا دەورەت گیراوە و رێگای چوونە دەرەوەت نییە و خەشایاریش دەورەی قەڵاکە چووڵ ناکات، تەنانەت ئەگەر پەنجا تا سەدساڵیش لێرە بمێنییەوە، چونکە دەزانێت تۆ داواکاریت بۆ تاج و تەختی پاشایەتی.

ئارتۆبازان بێ دەنگی هەڵبژارد و هەخامەنش بەردەوامبوو: من نازانم لەو قەڵایەدا چەندەت خۆراك پاشکەوت کردووە، بەڵام هەرچەندێك بێت کۆتایی دێت و ئەگەر تەواویش نەبێت، بە سەر دەچێت و مێش و مێروو لە ناوی دەبەن و رۆژێك تۆ و پیاوەکانت لەو قەڵایە بەردینەدا برسی دەبن و رێگەیەکتان لە مردن یا ڕادەست بوون زیاتر بە دەستەوە نابێت.

ئارتۆبازان وتی: هیچ رێگەیەکم نییە لە خۆڕاگری زیاتر، تەنانەت ئەگەر بزانم لە برسان دەمرم.

هەخامەنش وتی: تۆ رێگای ترت هەیە و چارەسەرت ئەوەیە دەرگای قەڵاکە بکەیەوە و لێرە دەربچیت.

ئارتۆبازان وتی: ئەوکات خەشایار بە زیندوویی پێستی من لە جەستەم دادەماڵێت، بە تایبەت کە تازە بۆتە پاشا و بە پێویستی دەزانێت بە کردەوەیەکی بێ بەزەییانە، هەمووان بترسێنێت.

هەخامەنش وتی: بۆ نەتبیستووە کە باوکمان پێش مردن، وەسیەتی کردووە ئەگەر خەشایار تۆی گرت، نابێت بتکوژێت.؟

ئارتۆبازان وتی: کاتی مردنی باوکم لەو قەڵایە بووم و ئاگاداری وەسیەت نیم، بەڵام گریمان ئەو وەسیەتەی کرد بێت، خەشایارشا دوای ئەوەی لەو قەڵایە دەردەچم، لە قەڵایەکی تردا زیندانیم دەکات و من تا کۆتایی تەمەنم لە زیندان دەبم.

هەخامەنش وتی: ئەگەر بەڵێن بدەی دوای دەرچوونت لەو قەڵایە جارێکی تر یاخی نابیتەوە، وەك جاران دەبیتە ساترابی یەك لە ویلایەتەکانی ئیمپراتۆریەتی هەخامەنشی.

ئەوکات نامەکەی خەشایاری دایە دەست و ئارتۆبازان خەتی خەشایاری ناسیەوە و دڵنیا بوو کە ئەگەر ڕادەست بێت نە دەکوژرێت و نە زیندانی، چونکە ئەستەم بوو دەسەڵاتدارانی هەخامەنشی بەڵێن بدەن و پێچەوانەی بەڵێنەکە بجولێنەوە، بەڵام ئارتۆبازان بیری لە پیاوەکانی کردەوە و وتی: من لەو قەڵایە تەنها نیم و کۆمەڵە پیاوێکیش لەگەڵ مندان و وەك من یاخی بوون و ئەگەر لەو قەڵایە دەربچن هەموویان دەکوژرێن، بۆیە دەبێت من لە بارەی ئەوانیشەوە متمانە بکەم کە ئەوان لە کاتی دەرچوونیان ناکوژرێن و زیندانی ناکرێن.

هەخامەنش وتی: من بەڵێنت پێدەدەم کە خەشایار ئەوانیش دەبەخشێت.

ئارتۆبازان وتی: بڕۆ و نامەیەکی تر بێنە کە تیایدا هاورێکانم بەخشرابن و من بتوانم دوای ئەوەی بوومە ساتراب ئەوانیش لەگەڵ خۆمدا ببەم و لە پۆستە حکومییەکانی ئەویَ کاریان پیَ بدەم.

هەخامەنش وتی: من نامەیەك لە خەشایار وەردەگرم کە هەموویان ببەخشێت، بەڵام ناتوانم بەڵێنت پیَ بدەم کە ئەو رەزامەندی دەنوێنێت بۆ بردنی ئەوان لەگەڵ خۆتدا.

هەخامەنش زیاتر لە چەند کاتژمێرێك لە قەڵاکەدا نەمایەوە و بە هەمان شێوە کە هاتبۆوە ناو قەڵاکە، چوو دەرەوە و بە خێراترین ئامێری گواستنەوە خۆی گەیاندە خەشایارشا و دیسان دوو نامەی لێوەرگرتەوە، یەکیان بۆ ئۆلۆس و ئەوی تر بۆ ئارتۆبازان.

خەشایار بۆ ئۆلۆسی نووسی بوو: چونکە ئارتۆبازان و هاورێکانی خۆیان ڕادەست دەکەن، دەکەونە بەر بەخشینی پاشا و پێویستە دوای هاتنەدەریان لە قەڵاکە بەرێزەوە لەگەڵیاندا بجولێنەوە، ئارتۆبازان دێت بۆ پایتەخت و هاورێکانی دەچنەوە بۆ ویلایەتەکانی خۆیان.

خەشایار لە نامەی دووەمدا بۆ ئارتۆبازانی نووسی بوو: هاوڕێکانی بە گشتی لە لایەن پاشاوە بەخشراون و دەتوانن بۆ هەر شوێنێك ئارەزوو دەکەن بچن و تەنها نابێت لە گەڵ تۆدا

بێن. بەو شێوەیە هەخامەنشی برا بچووك توانی کۆتایی بەو یاخی بوونە بێنێت و ئارتۆبازانیش دوای ئەوەی لە قەڵای سین دژ دەرچوو، ڕۆیشت بۆ پایتەخت و ماوەی چل ڕۆژ لەویٚ مایەوە و نیشانیدا نایەوێت یاخی ببێتەوە و دەیەوێت بە ڕاستگۆییەوە خزمەت بکات.

خەشایارشا بۆ ئەوەی نیشانی بدات کە متمانەی بە ئەو هەیە، ئەوی کردە سەرکردەی ئەو لەشکرەی بۆ بابل دەچوو تا دڵنیای بکاتەوە کە متمانەی بەو هەیە و هەخامەنشیش دوای ئەوەی یاخی بوونی ئارتۆبازانی کۆتایی پێهێنا، کرایە فەرماندەی ئەو لەشکرەی بۆ میسر دەچوو و دواتریش بۆوە فەرمانڕەوای میسر.

هیرۆدۆت دەڵێت: هۆکاری ڕاپەرینی دانیشتوانی بابل دەگەڕایەوە بۆ سەردانێکی خەشایار بۆ بابل لەو کاتەی تەنها شازادەی جێنشین بوو، گوایە لەو سەردانەدا بیٚ ڕێزی بەرانبەر بە خوایانی بابل کردووە و ئەوانیش دەیانووت ناتوانین بەر فەرمانی کەسێك بن کە بیٚ ڕێزی بەرانبەر خواکانیان کردووە.

کەتزیاس ئەو وتەیەی هیرۆدۆت ڕەت دەکاتەوە و دەڵێت: تەنانەت ئەگەر خەشایار ویستی بیٚ ڕێزی بەرانبەر بە خوایانی بابلیشی هەبوو بێت، نەیدەتوانی ئەو کارە بکات.

لە سەردەمی داریوشدا هەرکەسێك بیٚ ڕێزی بەرانبەر بە خودای نەتەوەیەك کردبایە دەکوژرا، بابلییەکان خۆیان دەیانتوانی ئەو کارە بکەن، چونکە لە لای داریوش ئەو بابەتە بە کارێکی ناوخۆیی دادەنرا و بە پێی پرنسیپەکانی حکومەتەکەی، دەستی نەدەخستە ناو کارە ناوخۆییەکانی وڵاتە ژێردەستەکان. بەڵام ئەگەر ئێرانییەك یا سریانییەك یا یەکی خەڵکی لیدی بیٚ ڕێزی بەرانبەر خوای بابل کردبایە، دەکوژرا.

کەتزیاس دەڵێت: خەشایار دەیزانی ئەگەر بیٚ ڕێزی بەرانبەر خوایانی بابلی بکات بە فەرمانی باوکی دەکوژرێت، چونکە ئازادی و ڕێزگرتن لە ئایین و بیروڕا لەو وڵاتانەی لە ژێردەستەیی هەخامەنشییەکان بوون یەك لە پایە سەرەکیەکانی سیاسەتی ئەو ئیمپراتۆریەتە لە سەردەمی داریوش بوو. بە پێی نووسینی کەتزیاس بابل بۆیە ڕاپەری، چونکە پاشای بابل بیری کردەوە کە دوای مردنی داریوش دەتوانن لە دەسەڵاتی پاشای تازەی هەخامەنشی ڕزگاری ببێت.

داریوش دوای ئەوەی دەسەڵاتی بە سەر هەر وڵاتێکدا دەگرت، کەسی بە سەر دانیشتوانی وڵاتەکەدا نەدەسەپاند تەنها ئەگەر پاشاکەی یاخی نەبووبایە و هەمیشە پاشای وڵاتەکەی وەك خۆی دەهێشتەوە و وڵاتەکەی پیٚ دەسپارد. لە بابل پاشایەك بە ناوی (کوت رابی) دەسەڵاتدار بوو و کاتێك زانی داریوش مردووە، لە ماوەی یەك ڕۆژدا تەواوی ئەو ئێرانیانەی کوشت کە لە

ئەویٚ بوون و دار و نەداریانی داگیرکرد، ئەوان هەموویان یا بازرگان و یا پیشەگەر بوون. یاخی بوونەکەی کوت رابی بۆ خەشایار زۆر قورس بوو و کوژراوەکانیش بیٚ تاوان بوون و هیچ گرفت و خەراپەیان بەرانبەر بابلییەکان نەبوو.

لە سەردەمانی کۆندا بە پێچەوانەی سەردەمی ئێستا کە هەندیٚ ولآت پەنابەر وەردەگرن، ئەوکات باو نەبوو کە خەلّك کۆچ بکات بۆ ولآتی تر و دانیشتوانی ولآتێك نەدەچوون بۆ مانەوە لە ولآتی تر و تەنها لە کاتێکدا هێرشبەر بووانە یا بە ڕاسپاردەی پاشاکانیان دەچوون ولآتی تر و ئێرانییەکانی بابلیش بە پالّپشتی کوروش و دواتر داریوش لە ئەویٚ بوون و کارگەی پیشەیی یا شوێنی بازرگانیان بۆ خۆیان دامەزراند بوو و لەپڕ بوونە قوربانی کوت رابی.

هۆکاری کوژرانی ئێرانییەکانی بابل بە فەرمانی کوت رابی نەدەگەڕایەوە بۆ ئەوەی خەلّکی بابلیان ئازار دابێت، بەلّکو کوت رابی فەرمانی کوشتنی ئەوانی بە هۆی مەزداپەرست بوونیان دەرکردبوو و ئەو نەیدەتوانی ڕەزامند بێت بە ئەوەی خەلّکێك لە ولآتی ئەو بژین و خوایانی ئەو نەپەرستن، بۆیە لێرە تێدەگەین کەسانێکی وەك کوروش و داریوش کە ڕێزیان لە ئایینی نەتەوەکانی تر دەگرت لە رووی بیرکردنەوە و کۆمەلآیەتییەوە چەند پێشکەوتووتر بوون لە خەلّك و دەسەلآتدارانی تری سەردەمی خۆیان.

ئەگەر بە لاپەڕەکانی مێژوودا بچێنەوە، لە سەرەتای مێژوو تا سەدەی هەڤدەهەم هیچ پاشایەك لە هیچ ولآتێك نەیتوانیوە بەرگەی ئەوە بگرێت کە خەلّکێك هەبن لە ولآتی ئەو و ئایینی ئەو نەپەرستن و ئەو خەلّکەی لە یەك ولآتدا دەژیان دەبوایە بە دلّنیاییەوە ئایینی پاشای ئەو ولآتە پەسەند بکەن و بە پێچەوانەوە دەکوژران، تەنها یەهودییەکان بۆیان هەبوو ئایینی خۆیان بپەرستن و ئەوەش دەگەڕایەوە بۆ ئەوەی لە رۆژهەلآت بۆ رۆژئاوا تەواوی دەسەلآتداران، ئەوانیان بە خەلّکی خۆیان نەدەزانی. بەلآم هەر کەس بە هاوولآتی خۆیان داندرا بوایە بۆی نەبوو جگە لە ئایینی پاشاکەی ئایینی تر هەلّبژێرێت. تەنانەت لە گەرمەی سەدەی هەڤدەهەمی میلادی پاشای فەرانسە (لۆیی چواردەهەم) کە کاتۆلیك بوو، فەرمانی دەرکردنی تەواوی پرۆتستانتەکانی لە ولآتەکەیدا و نەیتوانی پەسند بکات کە لە ولآتەکەیدا هەندیٚ خەلّك هاوئایینی ئەو نەبن.

ئەگەر هەندێکات دەسەلآتداران هەندێکات ڕێگەیان دەدا هەندیٚ لە شوێنکەوتووەکانیان ئایینێك جگە لە ئایینی ئەویان هەبێت، لە ترسان بووە و زانیویانە ئەو خەلّکانەی هەلّگری

ئاییني ترن، له دەرەوەی وڵات پاڵپشتیان هەیە بۆ نموونە ئەو کریستیانانەی لە تورکیا لە سەردەمی عوسمانییەکاندا ژیاون.

ئەو ڕۆژەی خەشایارشا ویستی ئارتۆبازانی برای بە فەرماندەیی لەشکرێك بنێرێتە بابل، پێی وت: دوای سەرکەوتن بە سەر بابلدا، بە وردی ژمارەی ئەو ئێرانیانەی لە بابل کوژراون بزانە و لە بەرانبەر هەر یەکەیاندا پێنج لە خانەدان و کاهینەکانی بابلی بکوژە، بەڵام وریابە لە لایەن خۆت و ئەفسەرەکانت هیچ بێ ڕێزییەك بەرانبەر خوایانی بابل نەکرێت.

ئارتۆبازان بەرەو بابل کەوتەڕێ و لە زێی (ایران شهر) یا (دل ایران شهر) کە ئێستا بە (دیجلە) و سەردەمێك بە (ئەروەند ڕوود) ناودەبرا، پەڕییەوە و نزیك زێی (پالاد ڕوود یا فالاد ڕوود) کە ئێستا بە فوڕات ناسراوە کەوتەوەڕێ و لە ئەوێ وەستا، چونکە زانیاری پێ درابوو کە پاشای بابل لەشکرێکی بەهێزی بۆ ڕاگرتنی ئەو ناردووە و ئارتۆبازان ئەو شوێنەی لێی وەستابوو بۆ جەنگ کردن بە عارەبانە جەنگییەکان پێ باش بوو.

لە ڕابردوو و لە باسی کوروش و کەمبۆجییە و داریوشدا باسمان کرد کە لە ڕیزی لەشکری هەخامەنشی یەك لە کاریگەر و سەرەکی ترین چەکەکان، عارەبانەی جەنگی بوو کە لە سەرەتادا لەو وڵاتانەی دەکەوتنە تورکیای ئێستا دروستکران. بەڵام وەك چوون بەریتانییەکان تانکیان دروستکرد و ئاڵمانەکان بە باشی سوودیان لێوەرگرت، ئاواش هیتییەکان عارەبانەیان دروستکرد و هەخامەنشییەکان بە باشی سوودیان لێ دیت.

کەتزیاس نووسیویەتی کە تایەی عارەبانەکانیان لە ئاسن دروست دەکرد. ئەو بە باشی توانیویەتی ئاسن و کانزاکانی تری ئەوکات لێك جیا بکاتەوە، چونکە باسی قەلغانی کردووە کە لە قەڵا دروستکراوە. دەست نەکەوتنی پاشماوەی ئاسنی سەردەمی هەخامەنشییەکان، هۆکار نییە بۆ نەبوونی ئەو کانزایە لەوکاتدا و دەزاندرێت کە ئاسن لەبەر ژەنگ هێنان زوو لەناودەچێت.

پێ دەچێت خاڵی بەهێزتر بوونی عارەبانە جەنگییەکانی هەخامەنشی بەرانبەر بە ئەوانی تر بگەرێتەوە بۆ ئەوەی ئەوان تایە و داسەکانیان لە ئاسن دروست دەکرد. ڕوونە کە تایەکە بە گشتی لە ئاسن نەبووە و تەنها ناوەندی تایەکە و چوار دەورەی داری تایەکەیان بە ئاسن داپۆشی بووە و داسەکانیش کە لە پێشی عارەبانەکان دەبەستران، لە ئاسن بوون و بە شێوەیەك تیژ دەکران کە ئەگەر عارەبانە خێرا ڕۆیشتبایە و داسەکە بەر قەدی دارێکی ئاسایی کەوتبایە، دارەکەی دەبڕیەوە.

شوفێرەکانی ئەو عارەبانانە لە سەردەمی هەخامەنشییەکان لە لای خەڵك بە خاوەن رەسەن دەناسران و وەك پالەوانانی وەرزش لەناو خەڵکدا رێزیان لیَ دەگیرا و بە (یالێ) ناویان دەبرا، ئەو وشەیە دواتر سواو و بۆوە (یل، لە نووسینی فارسی) کە مانای (یەل) بە کوردی دەکاتە (پاڵەوان). ئەگەر بەڵگەنامەکانی ئێرانی کۆن دەمان لەوانە بوو زانیبامان عارەبانەکان جۆرەکانیان چ بووە و لە چ تاقم و دەستەیەکدا رێکدەخران بۆ جەنگ.

ئەگەر بەڵگەنامەکانی کۆنی ئێران مابووانە، ئەمرۆکە دەمانزانی کە بەشە جیاوازەکانی عارەبانە جەنگییەکان لە لەشکری هەخامەنشیدا هەڵگری دەستەواژەی جیابوونە بۆ خۆدەرخستنە جۆراوجۆرەکان (مانۆری سەربازی) و هەر بەشێکی عارەبانە و هەریەکە لە ئەسپەکان و هەریەك لە سەرنشینەکانیان ناوی تایبەتی هەبووە و بەڵام تەواوی بەڵگەنامەکانی سەردەمی هەخامەنشی کەوتنە دەست ئەسکەندەر.

بوونی عارەبانە جەنگییەکان دەگەڕێتەوە بۆ ماوەیەکی زۆر پێش هەخامەنشییەکان و لە یەك لە پاپیرۆسە میسرییەکان کە لە موزەخانەی لۆڤەری فەرەنسایە، دەردەکەوێت کە (١٢٥٠ پ. ز) نەتەوەی هیتی عارەبانەی جەنگیان هەبووە و هاڤارد فاستی ئەمریکی لە بیوگرافیای حزرەتی موسادا نووسیویەتی کە موسا لە لاویەتیدا فەرماندەی عارەبانە جەنگییەکانی لەشکری فیرعەون بووە و سەردەمی موسا (١٠٠٠ پ. ز) بووە. بەڵام لە هیچ سەردەمێك وەك سەردەمی هەخامەنشییەکان سوودی لیَ وەرنەگیراوە و لە مەیدانی جەنگدا کاریگەر نەبووە.

تاکە کەموکوڕی ئەو چەکە ئەوە بووە کە لە هەموو شوێنێك نەدەتواندرا بەکار بخرێت و تەنها لە شوێنە تەختاییەکاندا نەبێت نەدەتواندرا بە باشی سوودی لیَ ببینرێت، بۆیە ئارتۆبازان دوای ئەوەی زانیاری لە بارەی ناردنی لەشکر لە لایەن (کوت ڕابی) پێگەیشت، وەستا و ئەو شوێنە تەختەی هەڵبژارد کە بۆ بەگەرخستنی عارەبانەکان باش و بە سوود دەردەکەت.

خانتوس دەڵێت: ئەو شوێنەی لەشکری ئارتۆبازان لێی وەستایەوە تا زێی فوڕات شەست ئەستاد دووربوو و بە زانینی ئەوەی هەر ئەستادێك دوو سەد مەتر بووە، واتە نێوان لەشکری هەخامەنی و زێی فۆرات دوازدە کیلۆمەتر بوو و هەر بە وتەی هەمان مێژوونووس درێژایی ئەو مەودایە لە لایەن لەشکری ئەو داگیرکرا تا رێگەی ئاوی لیَ نەگیرێت. ئەو دەیزانی بابل لە باشوورە بۆیە لەشکری بابل لە باشوورەوە بە درێژایی زێیەکەدا دێت و لە هاتنیاندا پێویستیان بە ئاو دەبێت. ئارتۆبازان شەو و رۆژێك لە ئەویَ مایەوە و رۆژی دواتر هەواڵیان پێدا کە لەشکرێك لە باشوورەوە دێت.

ئارتۆبازان خۆی بۆ هێرش سازدا و بە فەرماندەی عارەبانە جەنگییەکانی وت: مانۆری عارەبانەکانی ئێمە ئەوە بێت کە لە سەرەتادا خۆیان بخزێننە نێوان زێیەکە و لەشکری بابل، بۆ ئەوەی بتوانن سەربازەکانی لەشکری بابل بەرەو پیادە و سوارەکانی ئێمە بەرێ بکەن و ئەوکات لە رۆژهەڵاتەوە سوار و پیادەکانمان هێرش دەکەنە سەر هێزی بابل و عارەبانەکانیش لە رۆژئاواوە هێرش دەکەن، ئەوکات بابلییەکان رێگە چارەیەکی زیاتریان لە کوژران یا خۆ بەدەستەوەدان نابێت.

هەرکە لەشکری بابل نزیك بوونەوە، عارەبانەکانی ئارتۆبازان بە درێژایی زێی فۆرات و لە بەردەوامی رێرەوی ئاو بەرەو باشوور کەوتنەرێ و ئەوندە خێرا دەرۆیشتن کە یەکەکانی پێشەوەیان لە تۆزدا ون بوون و لە هەمان کات کە عارەبانەکان بەرەو باشوور دەرۆیشتن، سوارە و پیادەکانی هەخامەنشی لە لای رۆژهەڵاتەوە لە لەشکری بابل نزیك بوونەوە و لەشکری ئارتۆبازان کە پێکهاتبوو لە لای راست و لای چەپ و دڵی لەشکر و هێزی یەدەگ لە لەشکری بابل نزیك دەبۆوە.

لەشکری بابل تەنها پیادە بوو و سوارە و عارەبانەی جەنگیان نەبوو و بەڵام ژمارەیەکی زۆری چوارپێ بۆ گواستنەوەی بار سوودیان لێ وەرگیرابوو و ئەفسەرەکانی بابل سوار بوون. ئارتۆبازان بێ ئەوەی ئاگاداری دۆخی عارەبانەکانی بێت کە کەوتبوونە نێوان زێی فۆرات و لەشکری بابل، هێرشی پیادەی بۆ سەر بابلییەکان دەست پێکرد و ئەوەندەی نەبرد لە شێوانی ریزی بابلییەکانەوە زانی کە عارەبانەکانی بە توندی هێرشیان کردووە.

خانتۆسی لیدی دەڵێت: عارەبانەکان کاتێك زانیان مەودایان خستووتە نێوان بابلییەکان و زێیەکە و سەربازە بابلییەکان ناگەنە زێیەکە تا لە رێگەی ئاوەوە پاشەکشە بکەن، بە خێرایی ئەسپەکانیان بەرەو رۆژهەڵات دەسوڕاندەوە و رێرەوی عارەبانەکانیان دەگۆڕی، جووڵەی عارەبانەکان بە شێوەیەك رێکوپێك بوو کە وادەزاندرا هەموویان پارچەی جەستەی یەك کەسن و بە فەرمانی یەك کەس دەسورێنەوە و هەر کە رووی ئەسپەکان کەوتە رۆژهەڵات، عارەبانەکان بەرەو سەربازە بابلییەکان کەوتنەرێ و بە شێوەیەك دەجووڵان کە لە نێوانیاندا هیچ کەلینێك نەبێت.

شۆفێرەکانی عارەبانەکان بێ ئەوی لە یاسا فیزیکیەکانیان زانی بێت کە بۆ زانستی ئێستا دەرکەوتوون، دەیانزانی تا خێراتر برۆن خۆراگری لە بەرانبەریان دژوارتر دەبێت و لە خێرایی زۆری عارەبانەکاندا، داسەکانیان هەموو شتێك دەبڕێت و ئەگەر سەربازانی دوژمن بە داسەکان نەمرن، لە ژێر سمی ئەسپەکان و تایەی عارەبانەکان دەمرن. خەڵکانی کۆن دەیانزانی بۆ رێگرتن

لە هێرشی عارەبانەکان پێویستە ئەسپەکانیان بکوژرێن و هەموو جۆرەکانی چەکیان تاقی دەکردەوە و دەزاندرا باشترین چەك بۆ ئەو کارە نێزەی درێژە کە سگی ئەسپەکانی دەدڕی و ئەو ئاژەڵە چیتر نەیدەتوانی بەردەوامبێت لە ڕۆیشتن و دەکەوت، کەوتنی ئەسپ دەبۆوە هۆی ڕاگرتنی عارەبانە تەنانەت ئەگەر بە شێوەی کاتیش بێت. شۆفێری عارەبانەکانیش کاتێك یەك لە ئەسپەکانیان دەکەوت، دەبوایە بە پەلە نیر و ئاوساری دەپچراند تا تەرمی ئەسپە مردوو یا بریندارەکە نەبێتە ڕێگر لە جووڵەی ئەسپەکانی تر.

بۆ ئەنجامدانی ئەو کارە دەبوایە یەك لەو کەسانەی لە عارەبانەکەدا بوون، خۆی هەڵداتە سەر پشتی یەك لە ئەسپەکانی تر و ئەو جار نیر و ئاوساری ئەسپی بریندار یا کوژراو ببڕێت و ئەو هەرچەندە خێرا بووایە لە پێنج تا دە چرکەی دەویست تا لاشەی ئەسپی بریندار یا کوژراو لە عارەبانەکە دابڕێت و ئەسپەکانی تر بەردەوامبن لە جوولاندنی عارەبانەکە و لەو پێنج یا دە چرکەیەدا سەربازانی دوژمن ئەسپەکانی تریان دەکوشت و عارەبانەکە بو تەواوەتی لە کار دەکەوت. بەڵام ئەگەر خێرایی عارەبانەکان زۆر بووایە، سەربازەکانی دوژمن دەرفەتیان نەدەبوو تا بە نێزە یەك یا چەند ئەسپ بکوژن و عارەبانەکە بوەستینن. جگە لە نێزە ئامێری تر بۆ پێشگرتن لە هێرشی ئەسپەکان بریتی بوو لە تیر و بەرد بارانی ئەسپەکان بە هۆی کەمان و بەردەقانی و کاتێك تیرێك لە ئەستۆ یا سینگ یا سگی ئەسپێك دەچەقی، ئەو ئاژەڵەی دەخست و ئەگەر زەربەی بەردیش بەر ناوچەوانی کەوتبایە، ئەو ئاژەڵە چیتر توانای ڕۆیشتنی نەدەبوو.

کاریگەرترین چەك دژی عارەبانەکان بریتی بوو لە ئەوەی لە سەر زەوی شوێنی دژی عارەبانەکان دروست بکرێت یا لە سەر ڕێیان زەوی هەڵبکەندرێت یا زنجیر دابندرێت بە شێوەیەك کە لاقی ئەسپەکانیان لێ گیر ببێت و بکەونە زەوی و تایەی عارەبانە نەتوانێت لە زنجیرەکە تێپەر ببێت، بەڵام بەکارهێنانی ئەو کەرەستانە پێویستی بەوە بوو کە لەشکری بەرگریکار بزانێت عارەبانە جەنگییەکان لە کام لاوە هێرش دەکات و بۆ نموونە لە باکوورەوە دێت یا لە ڕۆژهەڵات.

هەروەها لەشکری بەرگریکار دەبێت کاتی پێویستی هەبێت تا ئەو ڕێگریانە لە سەر زەوی لە پێش عارەبانەکان دروست بکات و بابلییەکان دەرفەتیان بۆ ئەو کارانە نەبوو و هەر کە بە لەشکری هەخامەنشی گەیشتن، کەوتنە بەر هێرشی عارەبانە جەنگییەکان.

گوشاری عارەبانە جەنگییەکان، لەشکری پیادەی بابلی لاواز کرد و هەندێك لە ئەوانی کوشت و چونکە پیادەکانی هەخامەنشیش لە ڕۆژهەڵاتەوە دەهاتن، بابلییەکان کەوتنە نێوان

دوو بەرە و لە دوو لاوە لێیان دەدرا و ریزەکانی بابلییەکان لە هەندێ شوێن لێك ترازا و لەو ناوچانەی لێکدابرابوون، عارەبانەکانی ئارتۆبازان کە لە رۆژئاواوە دەهاتن و پیادەکانێ کە لە رۆژهەڵاتەوە دەهاتن بە یەك گەیشتن و لە ئاکامدا لەشکری بابل بۆوە چەند پارچەی لە یەك جیا و هەر یەك لەو بەشانە بە تەواوەتی لە لایەن لەشکری ئارتۆبازان گەمارۆ دران.

سەربازە بابلییەکان هەوڵیاندا خۆیان لەو گەمارۆیە ڕزگار بکەن و لە سێ شوێن سەرکەوتوو بوون و توانیان دوای کوشتنی ئەسپەکان و لە کارخستنی عارەبانەکان، خۆیان بگەیێننە فورات و بە مەلەکردن بپەڕنەوە بۆ کەنارەکەی تری فۆرات کە پارێزراو بوو، بەڵام لە شوێنەکانی تر هەوڵەکانیان بۆ رزگارکردنی خۆیان بێ سوود بوو و دوای ئەوەی هەندێکیان کوژران، ئەوانی تر بە ناچاری خۆیان ڕادەست کرد و هەر ئەو رۆژە جەنگ کۆتایی هات. خانتۆس دەڵێت: حەوت هەزار سەرباز و ئەفسەری بابلی بوونە ئەسیری ئارتۆبازان.

ئێمە وابیردەکەینەوە کە چونکە کوت رابی پاشای بابل ئێرانییەکانی دانیشتووی بابلی کوشتن، دوای ئەوەی سەربازە بابلییەکان خۆیان بەدەستەوەدا، چارەنووسێکی ترسناك چاوەڕێیان بوو. بەڵام هەخامەنشییەکان لەگەڵ ئەسیرەکاندا بە باشی مامەڵەیان دەکرد، تەنانەت ئەگەر پاشاکانیش بەرانبەر شوێن کەوتووەکانی ئەوان مامەڵەیان خەراپ بووبێت.

هەروەك چوون سەدەی بیستەم ناتوانێت شانازی جاڕی گەردوونەیی مافی مرۆڤ بە خۆی بگرێت کە نووسیویەتییەوە و ئەو راگەیاندنە لە لایەن کوروش نووسراوەتەوە، بە هەمان شێوە بۆ رێککەوتن نامەی نێودەوڵەتی تایبەت بە ئەسیرەکانی جەنگیش ناتوانێت شاناز بێت.

ئەو سەردەم تەنها لە ئێران لە گەڵ ئەسیرەکان مامەڵەی باش دەکرا[1] و لە شوێنەکانی تر ئەسیرەکان دەبوونە کۆیلەی ئەو کەسەی بە ئەسیر دەیگرتن و ئەوان توانایان هەبوو کە ئەسیرەکان بکوژن یا بفرۆشن یا کاریان پێ بکەن و چونکە کارەکانی کشتوکاڵ و دەرهێنانی کانەکان کاری سەخت بوون، کاری کشتوکاڵیان پێ دەکردن یا ناچاریان دەکردن لە کانەکان کار بکەن، مامەڵەی باشی ئێرانییەکان لەگەڵ ئەسیرەکان وای کرد تا نەتەوەکانی تریش وەك وەڵام بۆ ئەوان، مامەڵەی باش لە گەڵ ئەسیەکانیاندا بکەن.

---

(١) ١(لە جەنگی سالامین باسکرا کە ژمارەیەك لە سەربازەکانی هەخامەنشی بوونە ئەسیری یۆنانییەکان و هەندێك لە ئەوان بریندار بوون و پزیشکە هەخامەنشییەکان کوژرا بوون، لە ئەوێ زەبیحوڵڵا باس دەکات کە یۆنانییەکان فەرمانیان کرد تا چارەسەری برینداەکانی ئەوان بکرێت، هەروەها باسی مامەڵەی ئەوان لەگەڵ ئەسیرەکان دەکات کە پێچەوانەی وتەکانی ئێستان، وەرگێر بۆ کوردی.)

دوای شکستی لەشکری بابل لە کەناری فورات، رێگەی لەشکری هەخامەنشی بۆ بابل بۆوە. پێش گەیشتنی لەشکری ئارتۆبازان بۆ بابل، پاشای بابل کوت رابی ئاگادار بۆوە لە شکستی لەشکرەکەی و بڕیاریدا بەرگری بکات، بە خەڵکی شارەکەی وت مەترسی گەمارۆدرانی شار هەیە و ئەوەندەی دەتوانن خۆراك بێننە ناو شار و هەرچی لە دەوروبەری شار دەست دەکەوت گواستیانەوە بۆ ناو شار و هاوکات دیوارەکانی شاریشیان نۆژەن کردەوە تا بەرگەی هێرشەکانی هەخامەنشی بگرێت.

گەمارۆدانی ئەو شارەی لە دوو لای زێ بینا کراوە قورسترە لە گەمارۆی ئەو شارەی لە وشکانییە، چونکە هێرشبەر سەرەرای ئاگاداربوونی لە وشکانی پێویستە ئاگاداربێت تا لە رێگەی زێیەکەوە یارمەتی بە ئەوان نەگات. ئارتۆبازان کۆمەڵە گەمییێکی خستە ناو ئاو بۆ ئەوەی شەو و رۆژ چاودێر بن تا سەرباز و چەك و خۆراك لە دەرەوە نەگاتە ناو شار و خەڵك نەتوانن لە کەناری ڕاست بۆ چەپ برۆن و بە پێچەوانەوە. هەموو ئەو رووبارانەی ئاوانەیان داخستن کە ئاوی زێیان بۆ ناو هەر دوو لای شار دەبرد، بەڵام لە هەموو ماڵەکانی شار چاڵی ئاو هەبوو و دانیشتوانی شار ئەو چاڵانەیان لێ دابوو تا لە هاویندا ئاوی فێنك بخۆنەوە.

خەڵکی بابل لە زستاندا بە ئاوی ساردی زێی فورات، چاڵەکانیان پڕ ئاو دەکرد و تا مانگی سێ یەمی بەهار کە هەوا گەرم دەبوو، پێویستیان بە چاڵە ئاوەکان نەبوو و ئەوکاتیش ئەو ئاوە ئەوەندە فێنك بوو کە وەدەزاندرا بەفری تێدایە. جگە لە چاڵە ئاوەکان کە لە زستاندا ئاویان تێدا هەڵ دەگیرا، خەڵکی بابل دەیانتوانی بیری ئاو لێ بدەن، چونکە ژێر زەوی ئەو شارە وەك هەر شارێکی تر کە لە کەناری زێ بێت پڕ ئاو بوو و بەم شێوەیە دانیشتوانی بابل لە گرفتی بێ ئاوی نەدەترسان، بەڵام ئەگەر دەورە گیران درێژەی هەبوایە لە نەمانی خۆراك دەترسان.

کاتێك شاری بابل بە تەواوەتی لە لایەن هێزی هەخامەنشی گەمارۆ درا، بە وتەی هیرۆدۆت فاڵ گرەوەیەك مزگێنی بە دانیشتوانی شارەکەدا کە لەو دۆخە نەترسن، چونکە ماوەی گەمارۆکە زۆر ناخایانێت. کوت رابی پاشای بابل ئەو غەیب بێژەکەی بانگ کرد و پرسیاری لێکرد: بۆچی ماوەی گەمارۆ دانەکە درێژە ناکێشێت.؟

غەیب بێژووتی: ئەستێرەکان دەڵێن هەخامەنشییەکان زوو دەست لە گەمارۆکەمان هەڵدەگرن.

پاشا وتی: پێویستە هۆکارێك بۆ ئەو کارە هەبێت تا هەخامەنشییەکان دەست لە گەمارۆ هەڵ بگرن.

ئەستێرەناسەکە (فالْ گرەوە) وتی: ئەستێرەکان هۆکارەکەیان بە من نەوتووە.

پاشا وتی: ئایا ئەوان پێیان وتووی کە هەخامەنشییەکان کەی بە دروستی لە گەمارۆدانەکە دەکشێنەوە.

ئەستێرەناسەکە وتی: ئەوان بە دروستی ئەو بابەتەیان بە من نەوتووە، بەڵام من بە لێکدانەوەکانی خۆم دەزانم ئەوان ئەو پەڕی تا دوو مانگی تر دەکشێنەوە.

پازدە رۆژ دوای گەمارۆی شارەکە لە لایەن ئارتۆبازان، سەرکێشی ئاوی فوڕات دەستی پێکرد، ئەو زێیە بە شێوەی ئاسایی لە مانگەکانی سەرەتای بەهار ئاوەکەی زیاد دەبوو و هۆکارەکەشی توانەوەی بەفری شاخەکان بوو. بەڵام هەندێکات لە وەرزی بەهار و هەندێ کات لە زستان سەرکێشی دەکرد و ئاوەکەی زیاد دەبوو و هۆکارەکەشی بارینی بارانی زۆر بوو لە سەرچاوەکانی ئەو زێیە و ئەوکات زێیەکە توانای گلدانەوەی هەموو ئاوەکەی نەدەبوو و ئاو لە هەر دوو لای زێیەکە سواری کەنارەکان دەبوو و بە ناو سەحرادا بڵاو دەبۆوە.

لەو ساڵەدا کە لەشکری هەخامەنشی گەمارۆی بابلی دابوو، ئاوی زێ وردە وردە زیادی کرد و لە کاتژمێرەکانی سەرەتادا ئارتۆبازان لە زیاد بوونی ئاو نەترسا، بەڵام ئاوی زێ تا دەهات زیاد دەبوو و ئاشکرا بوو کە سەرکێشی ئاو نائاساییە. هەندێکات سەرکێشی فورات و دیجلە بە یەکەوە دەبوو، چونکە سەرچاوەکانی هەر دوو زێ زۆر لە یەکتر دوور نەبوون و هەندێ کات بەجیا و هەندێ کات بەیەکەوە سەرکێشیان دەکرد و ئەو ساڵە فۆرات بە تەنها سەرکێشی کردبوو.

لە یەکەم گەمارۆدانی بابل لە سەردەمی دەسەڵاتی کوروشدا هەموو شتێکمان لە بارەی دۆخی ئاوی فۆرات پێش گەیشتنی بۆ ناو شار و لە ناو خودی شارەکە و دوای دەرچوون لەو شارە باس کرد و هەروەها وتمان ئەو شارە درێژاییی چەند بوو.

ئارتۆبارزان کاتی گەمارۆدانی بابل دووچاری هەمان ئەو گرفتانە بۆوە کە رووبەرووی کوروش ببوونەوە و ئارتۆبازان بە ناچاری لە گەمارۆدانی دەوروبەری شار پاشگەز بۆوە.

یەك لە خەسڵەتەکانی ئەو شارانەی لە کۆندا لە کەناری زێیە گەورە و درێژەکاندا دروست دەکران ئەوە بوو کە درێژی شارەکە زۆر دەبوو و ئەمەش دوو هۆکاری هەبوو، یەکەم ئەوە بوو کە ئامرازەکانی گواستنەوەی زێ وەك بەلەم و گەمی، هاتووچووی خەڵکیان ئاسان دەکرد و خەڵك لە رۆیشتن بە پێ ماندوو نەدەبوون.

دووەم ئەوەیە کە هەر کەسێك توانی بایە لە تەنیشت زێ خانوو دروست بکات دەیتوانی باغێك بۆ خۆی بچێنێت. ئەو ڕاستییە بە تایبەتی لە وڵاتانی گەرم هەبوو کە ئاویان کەم بوو و خەڵك کە بەردەوام پێویستیان بە ئاو هەبوو لەکەناری زێیەکان خانوو و باغیان دەکرد و سوودمەند دەبوون لە ئاوەکەی. چونکە تەنیشت رووبار لە دەرەوەی شار بە زەوی بێ خاوەن دەناسرا، بۆیە بۆیان هەبوو دەست بەسەر پارچە زەوییەکدا بگرن و بیکەنە باغ.

ئێستا کاتێك دەبیستین درێژی شاری بابل لەو کاتەی لە گەمارۆی کوروشدا بوو سی کیلۆمەتر بووە، دووچاری سەرسوڕمان دەبین، بەڵام کاتێك دەڵێن لە سەردەمی خەلیفەکانی عباسیدا درێژی شاری بەغدا بە پێ پێنج رۆژە رێ بووە، دووچاری سەرسوڕمان نابین بەرانبەر بە درێژی بابل لە بیست و پێنج سەدە پێش ئێستا.

خەلیفە عباسیەکان (٣٧) کەس بوون و زیاتر لە (٥٠٠) ساڵ دەسەڵاتدار بوون، لە ماوەی دەسەڵاتیاندا هەریەکە لە ئەوان و بازرگان و ئەمیر و سەردارەکان، باغێك و کۆشکێکی لە دەوروبەری شار دروست دەکرد و بەو شێوەیە درێژی ئەو شارە لە هەردوو لای دیجلەدا زیادی کرد و گەیشتە رادەیەك کە لە کاتی گەیشتنی کاروانێك بۆ بەغدا، دەبوایە پێنج رۆژە رێی بروات (ئەوکات هەر کاروانێك ڕۆژانە چوار تا پێنج فەرسەنگ واتە (٢٤ تا ٣٠) کیلۆمەتر رێگای دەبڕی) تا لە دەوروبەری شاری بەغدا دەربچێت. بەڵام لە (٥٠٠ پ. ز) کاروانەکان لە یەك رۆژ زیاتر بە ناو بابلدا نەدەرۆیشتن و لیێ تێپەر دەبوون.

لەو ساڵەدا کە زێی فۆرات بە تەنها سەرکێشی کردبوو، ئاو لە رێرەوی زێیەکە دەرچوو و گەیشتە ناو شاری بابل و هاوکات هەموو ئۆردووگاکانی سەربازە هەخامەنشییەکان نوقمی ئاو بوون و چونکە هێشتا ئاو هەر سەردەکەت، ئارتۆبازان بینی ئەگەر لە گەمارۆی شار بەردەوامبێت تەواوی کەرەستە جەنگییەکانی لەناو دەچن و سەربازەکانی دەخنکێن، بۆیە بە ناچاری دەستی لە گەمارۆی شاری بابل هەڵگرت و لە دەوروبەری کشایەوە و دانیشتوانی شارەیش کە خۆیان لە گەمارۆ بەدوور بینی، بە پەلە لە شار دەرچوون تا دووچاری مردن نەبن.

دەگوترێت زیگۆڕات بابلی بۆیە بۆرجە بەناو بانگەکەی بابلی (کە ناوەکەی تری باغە حەوت نهۆمییەکانی بابل بوو) دروستکرد تا ئەو کاتانەی ئاوی زێی فۆرات سەرکێشی دەکرد و هەموو شوێنێکی دەگرتەوە، بتوانێت لەو بورجەدا نیشتەجێ ببێت و لە مەترسی نوقم بوون پارێزراو بێت.

ئاو بە رادەیەك سەركەوت كە ئارتۆبازان ناچاربوو سنووری بابل جێ بهێڵێت و لە ترسی سەركێشی **دیجلە**، تەریب بەو زێیە بەرەو دواوە بكشێتەوە، چونكە لەوانە بوو لەشكرەكەی لە نێوان دوو زێدا لە ناو بچێت و لانی كەم كەرەستە جەنگییەكانی لەناو دەچوون.

بەڵام وەك باسمان كرد ئەوكات كە مانگی سێی بەهار بوو تەنها فورات سەركێشی كرد و **دیجلە** ئاسایی بوو، ئەو دوو زێیە ئەوكات بە جیا دەڕژانە ناو كەنداوی فارس و زێی (**شط العرب**)[٢] دروست نەببوو و دواتر بە هۆی سەركێشییە بەردەوامەكانی ئەو دوو زێیە لەو شوێنەی ئێستا فورات و **دیجلە** دەگەنە یەكتر. هەندێ زوونگاو دروستبوون و دواتر ئەو زوونگاوانە وشكنەبوون و بوونە هۆی بەیەكەوە لكانی یەكجارەكی ئەو دوو زێیە. فالگرەوەی بابلی (تێلێن بی) بە هۆی پێشبینییەكەی سەبارەت بە كشانەوەی لەشكری هەخامەنشی لە دەورەی بابل، لای دانیشتوانی بابل بە ڕادەیەك ڕێزی زیادی كرد كە گەیشتە پلەی خواكان و كوت رابی سەرۆكایەتی (رصدخانە) كە یەك لە گەورەترین كارەكانی وڵاتەكەی بوو بەو سپارد.

ئارتۆبازان ڕاپۆرتی سەركێشی زێی فوراتی بۆ خەشایاری برای نووسی و وتی: ئێستا من لە بابل دوور كەوتوومەوە، بەڵام پێشەنگەكانم زانیاریم سەبارەت بە سەركێشی فوڕات دەدەنێ و دەڵێن ئاو بەرەو كەمی دەڕواتەوە، دیارە كە سەركێشییەكە كۆتایی هاتووە و ئەوجار ئاو دەكشێتەوە. بەڵام من ناتوانم دەست بەجێ بگەڕێمەوە، چونكە زەوی بۆتە قوڕ و عارەبانە و مەنجەنیق و ئەسپ و پیادەكانمان لە قوڕ ڕۆدەچن، بەڵام لەگەڵ وشكبوونەوەی زەوی دەگەڕێمەوە و بابل گەمارۆ دەدەمەوە.

سەركێشی فورات وێڕای لەشكری هەخامەنشی، بابلییەكانیشی دووچاری دەردەسەری كرد بوو و هەندێ خانووەكانی وێرانكرد بوون و دانیشتوانی ئەو خانوانە بە ناچاری هەڵات بوون تا نەمرن و دوای گەرانەوەیان بۆ ناو شار دیتیان خانوویان نەماوە و چونكە هانایەكیان نەبوو جگە لە كوت رابی، چوون بۆ لای ئەو و داوای چارەسەریان كرد تا ڕێگەیەكیان بۆ چارەسەر بۆ دیاری بكات و كوت رابی وتی: ئەگەر لەشكری هەخامەنشی نەگەڕێتەوە، من یارمەتی ئێوە دەدەم بۆ دروستكردنەوەی خانووەكانتان، بەڵام ئەگەر بگەڕێتەوە ئەوەندەمان كار دەبێت كە ناتوانین سەرگەرمی خانوو كردن ببین.

---

(٢) (ئەو دوو زێیە لە شاری قورنەی پارێزگای بەسرە دەگەنە یەكتری و (**شط العرب**) پێكدێنن زەبیحوڵڵا.)

چونکە جارێکی تر تێلێن بی پێشبینی کرد بوو، پاشای بابل لە ئەوی ویست تا لە ئەستیرەکان پرسیار بکات کە ئایا هەخامەنشییەکان دەگەڕێنەوە یان نا؟ ئەویش لە وەڵامدا وتی لەشکری ئەوان دێتەوە و بۆیە کوت ڕابی بە پەلە کەوتە کۆکردنەوەی خۆراك و پتەوتر کردنی هێزەکانی.

دیواری بابلیان ئەوەندە بەهێز دروستکرد بوو کە بەو سەرکێشییە گەورەی ئاو هیچ شوێنێکی تێك نەچوو بوو، بە فەرمانی پاشا ئەو کەسانەی خانووەکانیان وێران ببوو بە شێوەی کاتی لە ماڵی خەڵکی تردا نیشتەجێ کران تا خانووەکانیان بۆ دروست دەکرێتەوە، دوای وشکبوونەوەی زەوی جارێکی تر لەشکری ئارتۆبازان هاتەوە و گەمارۆی شارەکەی دایەوە، بەڵام ئەوجارە کوت ڕابی لەشکرەکەی نەنارده پێشیان.

گەزنەفۆن دەڵێت: عارەبانەکانی لەشکری ئێران پاشای بابل کوت رابییان زۆر ترساند بوو و دەترسا ئەگەر لەشکری تر بنێرێت، وەك ئەوەی پێشوو لە ناو ببرێت و بۆیە وای پێ باشتر بوو لە پشت دیوارەکان پەنا بگرێت تا ئارتۆبازان ماندوو دەبێت و لەشکرەکەی دەگەڕێنێتەوە.

ئارتۆبازان دوای ئەوەی بۆ جاری دووەم گەمارۆی بابلیدا، وەڵامی بۆ پاشای بابل نارد: من لە لایەن خەشایار پاشای هەخامەنشی کە برای خۆمە ناردراوم تا بابل داگیر بکەم و تۆ دەستگیر بکەم و بۆ لای پاشات بنێرم تا بە هەر شێوەیەك ویستی سزات بدات. دەزانم تۆ متمانەت بە دیوارە بەرز و بەهێزەکەی شار هەیە و پێتوایە ئێمە هیچ کات ناتوانین بە سەر دیوارەکەدا زاڵ بین و بیێنە ناوشار، بەڵام ئەو دیوارە سەردەمی کوروشیش هەبوو و نەیتوانی ڕێگر بێت لە هاتنە ناوەوەی لەشکری هەخامەنشی و هەر بە هەمان شێوە کە کوروش ئێرەی داگیرکرد، منیش پایتەختەکەت داگیر دەکەم.

ئەگەر بەبێ جەنگ خۆت ڕادەست بکەی، من بەڵێنت پێدەدەم کە لای پاشای خۆم داوای بەخشینت بۆ دەکەم تا سزات نەدات و ئازارت پێ نەگەیێنێت، تۆ دەزانی ئێمەی ئێرانی کاتێك بەڵێن دەدەین درۆ ناکەین و بەجێی دەگەیێنین، تەنانەت بەڵێنت پێدەدەم کە ئەگەر بەبێ جەنگ خۆت ڕادەست بکەی و پەشیمانی دەربڕی و بەڵێن بدەی هیچ کات دژی پاشای هەخامەنشی یاخی نەبیەوە، خەشایار بە داوای بەخشینی من، پاشایەتیت پێ دەبەخشێتەوە و تۆ لە داهاتوودا پاشای بابلی و کورەکەشت دوای تۆ پاشا دەبێت. بەڵام ئەگەر بەرگری بکەی و من ناچاربکەی تا بەجەنگ بێمە ناو شار، دوای هاتنم بۆ ناو شار وەك ئەسیرێکی ئاسایی لەگەڵ تۆدا مامەڵە دەکەم و ڕەوانەت دەکەم بۆ پایتەخت تا سزا بدرێی و دوای مردنی تۆش کورەکەت

نابێتە پاشای بابل و تەواوی بوونی تۆش داگیر دەکەم. ئەگەر تۆ پیاوێکی خاوەن عقل بی، پێشنیاری من کە بە سوودی تۆیە پەسەند دەکەی و خۆت ڕادەست دەکەی.

کوت رابی وتی: بۆ من مردن لە کۆیلایەتی باشترە و ناتوانم کۆیلەی خەشایارشا بم.

ئارتۆبازان وتی: ئەگەر تۆ کۆیلەی پاشای هەخامەنشی بوایەی، داریوش دەسەلاتی تۆی بە فەرمی نەدەناسی و دوای مردنی باوکیشم ئەگەر بەرانبەر پاشا یاخی نەبووبای، ئەویش دەسەلاتی تۆی بە فەرمی دەناسی. ئەو پیاوەی هەڵگری ناو و نیشانی سوڵتانە، کۆیلە نییە.

کوت رابی وتی: هەر کەسێك بەرفەرمانی یەکی تر بێت، کۆیلەی ئەو کەسەیە.

ئارتۆبازان وتی: گریمان وابێت، تۆ کە کۆیلەی داریوش بووی، بۆچی ناتەوێت کۆیلەی کورەکەی ببی؟

کوت رابی وتی: داریوش پیاوێکی مەزن بوو، لە کاتێکدا کە خەشایارشا بچووکە و نابێت پاشایەکی وەك من بەرفەرمانی منداڵێك بێت کە هێشتا بۆنی شیری خاو لە زاری دێت. بەم شێوەیە گفتوگۆ بۆ ڕادەست بوونی کوت رابی بەبێ جەنگ، کۆتایی هات و ئارتۆبازان خۆی بۆ دەورە دانی بابل بۆ ماوەیەکی درێژ ئامادەکرد.

دیواری بابل لە بەرد دروستکرا بوو و بەدەر لە ئەفسانەکان و ئەو زێدە رۆییانەی لە بارەیەوە کراون، دیوارێکی بەرز و بەهێز بوو کە لە ناویدا کونی ئاسۆیی و شاقووڵی هەبوو کە لە کونە شاقووڵیەکانەوە دەکرا ئاگر و ئاوە گەرم بەسەر سەربازاندا ببارێندرێت، بەردی مەنجەنیقەکان کاریگەری لەو دیوارە نەبوو و لەشکری هێرشبەر دەبوایە بە هۆی بورجی بەرزی جوولاو خۆی بگەیێنێتە سەر دیوارەکە.

لە ڕاستیدا دیواری بابل دوو قەلا بوو کە یەکیان بابلی رۆژهەلات و ئەوی تر بابلی رۆژئاوای دەپاراست، واتە دیوارێك ئەو بەشەی شاری دەپاراست کە لە کەناری رۆژئاوای فورات بوو و دیوارەکەی تر ئەو بەشەی شاری دەپاراست کە لە کەناری چەپی شار واتە کەناری رۆژهەلات بوو و ئەگەر ئاتۆبازان لایەکیشی گرتبایە لایەکەی تر دوای گەمارۆ بەردەوام دەبوو لە جەنگ و دەبوایە هەر دوو لا داگیر بکرێت.

پێویستە بزانین کاتێك کوروش ئەو شارەی گرت، لە لای زێیەکەوە دیواری نەبوو و ئەگەر کەسێك لە زێیەکەوە رۆیشتبایە دەیتوانی بچێتە ناو شار یا وەك هیرۆدۆت بە هەڵە وتبووی ئەگەر کەسێك رێرەوی ئاوەکەی بگۆریبایە دەیتوانی لە رێگەی وشکانی بچێتە ناوشار، بەلام لە سەردەمی کوت رابی کەس نەیدەتوانی لە رێگەی ئاوەکەوە بچێتە ناو شار. هەموو ئەو جۆگە و

ئاوانەی لە فورات دەهاتنە ناو بابل و کێڵگەکانیان پێ ئاودەدرا یا خەڵکی ئاویان لێ دەخواردنەوە، لە باکوور واتە سەرەوەی شارەوە دەهاتن و دۆخی فۆراتیش بە شێوەیەك بوو کە نەدەتواندرا ئاوی فۆرات بکرێتە سەر خانووەکان.

مێژوونووسە یۆنانییەکان دەڵێن ئارتۆبازان هەوڵیدا ڕێرەوی فورات بگۆڕێت و لە ڕێگەی ڕێرەوە وشکبووەکەی بچێتە ناوشارەکە، بەڵام ئەوکاتیش کە لە وشکانییەوە دەرۆیشت دووچاری دیوارەکان دەهات و نەیدەتوانی بچێتە ناوشار، بۆیە بیری لە هەڵکەندنی دوو تونێل بە ژێر دیوارەکەدا کردەوە کە یەکیان بۆ ڕۆژهەڵاتی بابل و ئەوی تر بۆ ڕۆژئاوای بابل بڕوات و سەربازەکانی لەو تونێلانەوە بچنە ناوشار. ئەو دەیزانی خزاندنی لەشکرێك بۆ ناو شارێك لە ڕێگەی تونێلێکی تەنگ و تاریك و درێژەوە کارێکی ئەستەمە و پێویست بوو بۆ تێپەڕبوونی لەشکر دالانێك هەڵکەندرابوایە.

ئارتۆبازان گومانی نەبوو پاشای بابل لە هەڵکەندنی دالانەکان ئاگادار ببێتەوە، بەڵام دەیزانی ناتوانێت هیچ بەرانبەر ئەوانە بکات کە تونێلەکەیان هەڵدەکەند تا ئەو کاتەی سەری دالانەکە لە ناو شاردا دەردەکەوێت. ئەو دەیزانی لە شەودا دەنگی هەڵکەندنی ئەو دالانە بە پاچ دەگاتە بەرگوێی دانیشتوانی شار، هەروەها دەیزانی لەو هەواکێشانەی بۆ دالانەکە دیاری دەکرێت لە شەودا هەڵمی سپی دێتەدەر و بە تایبەتی لەو شەوانەی مانگە شەودا وەك دووکەڵێکی سپی دەکەوێتە بەرچاوی بەرگریکارانی شار. بەڵام هیچ چارەی نەبوو لە هەڵکەندنی دوو تونێلێ زیاتر، چونکە ئەگەر بە بورجی بەرزی جووڵاو یا قادرمی ویستبایان لە دیوارەکە سەرکەون، هەموو سەربازەکانیان دەمردن بەبێ ئەوەی سوودی هەبێت و هیچ سەربازێکی بتوانێت بچێتە ناو شارەکە. بەرگریکارەکانی شار هەموو کەرەستەیەکی بەرگریان هەر لە مەنجەنیقەوە تا ئاوی گەرم هەبوو تا لە ڕێگەی کونە شاقوولیەکانی دیوارەکەوە بەسەر هێرشبەرانیدا بکەن. ئەگەر بە قادرمە یا بورجی جولاو هێرشیا کردبایە هەموویان دەکوژران، چونکە لە هەموو شوێنەکانی دیوارەکە (تەرەم)(٣) هەبوو.

تەرەم بۆ فرێدانەوەی ئەو سەربازە هێرشبەرانەی دەگەیشتنە سەر دیوار زۆر کاریگەر بوو و سەربازی بەرگریکار بە جووڵاندنی تەرەم دەیتوانی لە یەك تا سێ سەرباز لە دیوارەکە بخاتەوە خوارەوە، بێ ئەوەی بکەوێتە بەر مەترسی چەکی هێرشبەران و ئارتۆبازان دەیزانی سەربازەکانی

---

(٣) (تەرەم ئامێرێکی دارینی زۆر قورس و لوولەیی بوو کە دوو مەتر و نیو درێژ بوو و لە سەر پایە بوو، کاتێك پاڵ دەدرا لە دیوارەکە دوور دەکەوتەوە و دووبارە دەگەڕایەوە شوێنی خۆی، زەبیحوڵڵا).

ئەگەر بگەنە سەر دیواری شار، دووچاری زەربەی تەرەم دەبن و بۆیە هەڵکەندنی تونێڵی پێ باشترین چارە بوو.

کەتزیاس دەڵێت: ئەو کەسانەی تونێڵەکەیان هەڵدەکەند دەیانزانی دووچاری شوێنی بەرداوی لە ژێر زەوییەکە نابن و تونێڵەکە بە ئاسانی هەڵدەکەندرێت.

ئەوان زانیارییەکانی ئێستایان سەبارەت بە زەوییەکانی ناوەڕاست و باشووری ناوەڕاستی میزۆپۆتامیا نەبوو کە بە هۆی نیشتنەوەی ئاو دروستبوونە و تێکەڵەیەك لە بەردی ورد و درشتی زۆری تێدایە، بەڵام لەو زەویانەدا تاشە بەردی لێ نییە. بەڵام بە پێی ئەزموونی خۆیان وەك چوون دەیانزانی تەنها بە یەك چاولێکردن بزانن ئەو شوێنە ئاوی ژێر زەوی لێ هەیە یان نا، بەو شێوەیەش دەیانزانی کە تاشە بەردی گەورە لە خاکی ئەو ناوچەیە هەیە یان نا. تەنها دەیانزانی کاتێك دەگەنە ژێر دیواری شار دەگەنە ئەو بەردانەی بناغەی دیواریان پێدانراوە و ئەو بەردانەش گەورە نەبوون و لە توانایاندا بوو کە بە کولێنگەکانیان لایان بدەن.

کەتزیاس نووسیویەتی کە ئارتۆبازان بڕیاریدا ئەو تونێڵانە بە پانی و بەرزی (شەش هەنگاو) هەڵکەندرێن کە ئەگەر هەر هەنگاوێك نیومەتر بێت، بە پێوەری ئێستا بەرزی و پانی تونێڵەکان سێ مەتر دەکات. بە پێی وتەی کەتزیاسی یۆنانی هەڵکەندنی ئەو دوو تونێڵە لە هاوینی ساڵی (٤٨٥ پ. ز) دەستی پێکرد و لە دەستپێکەوە کرێکاران شەو و ڕۆژ کاریان دەکرد و تونێڵچییەکانیش بە پێی ئەو نەریتەی لە هەڵکەندنی کارێزدا هەیە، هەر کە مەودایەکیان هەڵدەکەند کونێکی گەورەی ستوونیان بۆ سەرەوە لێدەدا تا لەوێوە هەوا و ڕووناکی بۆیان بێت. ئەوان بەبێ بوونی مەترسی لە کەمبوونەوەی هەوا لەناو تونێلەکە، بە ڕۆژ ڕووناکی دەرەوەیان بۆ دەهات و بە شەو لە ژێر ڕووناکە چراکاندا کاریان دەکرد.

کاتێك سەرکێشی ئاوی فورات لەشکری هەخامەنشی ناچار بە کشانەوە کرد، کوت رابی پاشای بابل چەند کەسێکی وەك نێردراو بە کەشتی نارد بۆ (ئاشوور) و داوای یارمەتی لە دەسەڵاتدار و ئەمیرەکانی ئەو ناوچەیە کرد.

ئاشوور بریتی بوو لە بەشی باکووری میزۆپۆتامیا کە لە سەردەمی ئیمپراتۆریەتی مادەکان لە ئێران، حکومەتە بەناوبانگەکەیان لە لایەن مادەکانەوە رووخێندرا و لەناو چوو و دوای ئەو بەروارە ئاشوورییەکان کەوتنە ژێردەستەیی مادەکان و دواتر هەخامەنشییەکان و لە سەردەمی سێ پاشای یەکەمی هەخامەنشیدا کارێکیان نەکرد کە پێچەوانەی ویستی پاشا بێت، بەڵام دوای مردنی داریوش یەك لە ئەوان کە ناوی (شێلێن سەر) بوو یاخی بوو، داریوش

ئەفسەرێکی بە ناوی (ئۆلۆس) ڕاسپارد تا سەرکوتی بکات و شێلێن سەری ئاشووری هەڵات. هەر ئەو کاتە نێردراوەکانی پاشای بابل گەیشتنە ناو ئاشوور و داوایان لە پاشا و دەسەڵاتدارە ناوچەییەکان کرد تا یارمەتیان بدەن و بەڵام هیچ یەك لە دەسەڵاتدارانی ئەو ناوچەیە نەیانەویست هاوکاری کوت رابی بکەن و یا لە پاشای ئێران دەترسان.

کوت رابی لە بابل چاوەڕوانی هاتنەوەی نێردراوەکانی بوو و بە هۆی درەنگ هاتنەوەیان بیری دەکردەوە کە ئەوان لەگەڵ لەشکرە ئاشوور دێنەوە و نەیدەزانی ئۆلۆس ئەفسەری ئێرانی ئەوان دەستگیر کردووە و لەو بارەوە ڕاپۆرتی بۆ خەشایار ناردووە و هەواڵی بە ئارتۆبازانیش گەیاندووە کە کوت رابی داوای یارمەتی لە ئاشوورییەکان کردووە و ئەوانیش یارمەتی نادەن و ئەگەر ویستی یارمەتیدانیشیان هەبوایە، من ڕێگەم نەدەدان و بە دووری نازانم پاشای بابل داوای یارمەتی لە شوێنی تر کرد بێت.

دوای گەیشتنی نامەی ئۆلۆس، ئارتۆبازان چاودێری زیاتر کرد تا کەس یارمەتی نەنێرێت بۆ کوت رابی و بۆ لەشکرەکەی نەبێتە مایەی دەردەسەر، تا ئەوکات هەڵکەندنی تونێڵەکان بەردەوامبوو و کەس گرفتی بۆ دروست نەکردبوون.

دەورەی بابل بە شێوەیەك گیرابوو کە هیچ شت و کەسێك توانای هاتووچووی نەبوو، ئەو سەربازانەی هەخامەنشی کە پاسەوانی زێ بوون بە ڕۆژ کەمتر دەردەکەوتن تا نەکەونە بەر هێرشی مەنجەنیقی بەرگریکارانی شاری بابل، بەڵام کاتی شەو بێ ترس بە زێیەکەدا هاتووچۆیان دەکرد، کوت رابی دەیزانی ئارتۆبازان تونێڵ هەڵدەکەنێت و چونکە هیچ جموجۆڵی نەبوو، دڵنیا بوو کە لە ڕێگەی تونێڵەوە هێرش بۆ شارەکەی دەکات.

هاوینی گەرم و وشکی بابل تەواو بوو بێ ئەوەی سەربازە هێرشبەرەکان زۆر بە دەست گەرماوە شەکەت بن، چونکە ئەوان بە ڕۆژ دەیانتوانی مەلە بکەن و فێنك ببنەوە و شەوانەش ئەو سەربازانەی پاسەوان نەبوون، بە هۆی فێنك بوونی شەو دەیانتوانی بنوون.

ئارتۆبازان نەیدەزانی لە شەوانی پاییز بە شێوەی ئاسایی سێ تا چوار کاتژمێر ئاسمانی بابل تەماوی دەبێت، بەڵام کوت رابی لە هەوای تەماوی شارەکەی خۆی ئاگادار بوو و بڕیاریدا لە یەکەم شەوی تەماویدا کە شار تاریك دەبێت لە شار بێتەدەرەوە و هێرش بکاتە سەر هەخامەنشییەکان و ئەگەر بتوانێت بە شێوەی کاتی تونێڵەکان کوێر بکاتەوە.

ئەوکات تەقەمەنی نەبوو تا بە ئاسانی تونێڵەکە بتەقێننەوە و ئەو کەسەی ویستبای تونێڵێك خەراپ بکات دەبوایە لە شوێنێکەوە یەك لە ئەستونەکانی تونێڵەکە بڕۆخێنێت و ئەوەش بە پاچ و

بێڵ دەکرا و کاتی تەواوی پێویست بوو تا ئەو کارە بکەن. بە پلەی یەکەم مەبەستی کوت رابی لە هاتنەدەر لەشار، لەناو بردنی لەشکری هەخامەنشی بوو و ئەگەر نەیتوانی بایە بەو کارە هەستێت، هەوڵی کوێر کردنەوەی تونێڵەکەی دەدا. وەك ئەوەی بزانێت ئەگەر لەشکرەکە لەناو نەبات، ئارتۆبازان دیسان تونێڵەکان لێ دەداتەوە یا تونێڵی تازە هەڵدەکەنێت.

لەشکری پاشای بابل بە پێی لێکدانەوەکانی مێژوونووسە تازەکان لە شەوی (٤٨٥/١١/٣ پ. ز) لە هەر دوو بەشی رۆژهەڵات و رۆژئاوای بابل هاتنەدەرەوە و دەرکەوت وێڕای بوونی چاودێری توندی سەربازانی هەخامەنشی بەسەر شارەکەوە، هەردوو بەشی رۆژهەڵات و رۆژئاوای بابل لەوانەیە بە هۆی ئاڵای رەنگاورەنگ ئاگاداری یەکتر بووبن. هەندێك لە سەربازەکانی لەشکری پاشای بابل لە کاتی دەرچونیان لە شار پاچ و بێڵیان پێ بوو و دوای ئەوەی لە شار هاتنەدەر، دەیانتوانی بە جۆرێك لە فیکەلێدان لەو شەوە تەماویە یەکتری بدۆزنەوە.

لە بەشێك لەو لێکۆڵینەوەیەدا کە لە بارەی کوروش بوو باسمان کرد کە ئەو هونەرەکانی جەنگی داهێنا و لە لایەن ئەو پتەوکردنی ئۆردووگای سەربازەکان لە شەودا ڕاسپێردرا و بۆ تێگەیشتن پێویستە چەند وشەیەك باس بکەین. هەر ئەو ئامۆژگاریانەی کوروش بوون کە دواتر لە رۆم بۆوە (لژیۆن) و کاتێك لژیۆنێکی میسری کە لە شەش هەزار سەرباز پێکدەهات ئەگەر بۆ یەك شەویش بوایە، ئۆردووگاکەیان دەکردە قەڵایەك لە بەر مەترسی پەلاماری لەنەکاو.

ئۆردووگای سەرەکی ئارتۆبازان بەهێز بوو، بەڵام بەشەکانی تری ئۆردووگاکە لاواز بوون و بۆ تێگەیشتنی ئەو بابەتە هەندێ باسی دەکەین. لە رابردوودا کاتێك لەشکرێك شارێکی گەمارۆ دەدا، بازنەیەك لە سەربازەکان پاسەوانی شاریان دەکرد و ئەوانی تر لە چەند شوێنێکی دەورەی شاردا، ئۆردووگایان دادەنا و چاوەڕوان دەبوون. شێوەی دابەشبوونی لەشکرەکە بە سەر ئۆردووگاکان واتە ژمارەی ئۆردووگاکان پەیوەست بوو بە ژمارەی دەروازەکانی شار. هۆکاری بڵاو نەکردنەوەی سەربازانی هێرشبەر بە دەورەی شاردا لە لایەن فەرماندەکەیان، دەگەڕایەوە بۆ ئەوەی نەیدەویست سەربازەکانی لە کارێکی بێهودەدا ماندوو بکات و دەیزانی هەرکاتێك پێویست بوایە دەیتوانی لە یەك یا چەند ئۆردووگایەکەوە، سەربازەکانی بگەیێنێتە ناو شار.

لەشکری ئارتۆبازان دوو ئۆردووگای سەرەکی لە رۆژهەڵات و رۆژئاوای شار هەبوو و پاسەوانەکانیش دوو بازنەیان بە دەورەی شارەکەدا پێکهێنابوو. دوو ئۆردووگا سەرەکیەکە بەهێز بوون، بەڵام شوێنی پاسەوانەکان بەهێز نەبوون و لە هەر شوێنێك سەربازەکانی بابل هێرشیان دەکردەسەریان، لە ناویان دەبردن. سەربازەکانی هەخامەنشی لە تەمدا یەکتریان

نەدەدیت و بە هاوار کردن یەکتریان دەدۆزییەوە و هەندێکیان پێش ئەوەی هاوار بکەن، دەکوژران.

ئارتۆبازان لە ئۆردووگای رۆژهەڵات بوو و لە بەر ئەوەی دەوروبەری خۆی نەدەدیت بڕیاریدا ئۆردووگاکەی خۆی بپارێزێت و هەمان بیریش بۆ (هۆرمەرد) فەرماندەی ئۆردووگاکەی تر هاتە پێش. ئەو بیری کردەوە کە تەواوی پاسەوانەکانی دەورەی شار بە دەست لەشکری کوت رابی کە لە شار هاتۆتەدەر کوژراون و ئەگەر سەربازەکانی بۆ یارمەتی ئەوان ببات، چونکە هیچ نابینن، تەنها بە کوشتیان دەدات و ئەگەر نەشکوژرێن بە شێوەیەك بڵاو دەبن کە یەکگرتوویی ئۆردووگاکە لەناو دەچێت، بۆیە بە باشی زانی لە ئۆردووگا بمێنێتەوە تا سەربازەکانی نەکوژرێن و لەشکرەکەی بڵاو نەبێت.

هۆرمەرد دەیزانی کاتێك کوت رابی بیەوێت هێرش بکات، دەبێت هێرش بکاتەسەر هەردوو ئۆردووگا و ئەگەر هەردوو ئۆردووگا ئامادەی بەرگری بن، ئەوا کوت رابی ناتوانێت سەرکەوتووبێت. بۆیە لە جیاتی بڵاوکردن و بە کوشت دانی سەربازەکانی لە هەوای تەماوی شەدا، بڕیاری بەهێزتر کردنی بەرگریدا و فەرمانی کرد تا ئەوەندەی دەتوانن مەشخەڵ پێبکەن، بۆ ئەوەی ئەگەر سەربازەکان نەیانتوانی یەکتریش ببینن بە رووناکی مەشخەڵەکان شوێنی هاوکارەکانیان بزانن.

ماوەیەکی پێچوو تا بابلییەکان گەیشتنە ئۆردووگای رۆژئاوای هەخامەنشییەکان و ئەوکاتەی گەیشتن تەم کەم ببۆوە و پێچەوانەی ئەوەی بیریان دەکردەوە، هەخامەنییەکان نەتەنها ئامادەبوون، بەڵکو ئاگریشیان پێکردبوو و بە دیتنی بابلییەکان بە فەرمانی فەرماندەکانیان، عارەبانە جەنگییەکان کەوتنەرێ و داسەکانیان وەك گەنم سەربازە پیادەکانی بابلیان دەبڕیەوە و بابلییەکان خۆیان بۆ بەرگری لە بەرانبەر عارەبانەکان ئامادە نەکردبوو، بۆیە ئەوانەی دەستەی یەکەم کوژران و ئەوانی تر بەبێ هیچ بەرگریەك هەڵاتن. کوت رابی کە یەکەمجار بە دەست عارەبانە جەنگییەکان شکستی خواردبوو، پێشبینی نەدەکرد لەوکاتەدا سەربازانی هەخامەنشی ئامادەبن و چاوەڕوان بوو ئەوان لە خەودا بن. کوت رابی وایدەزانی ئەگەر ئەوان بۆ جەنگیش ئامادەبن، لەو شەوە تەماویەدا هیچیان پێناکرێت و لەناو دەچن، هەموو ئەو سەربازە بابلیانەی هێرشیان کردبۆوە سەر ئۆردووگای رۆژئاوا یا کوژران و یا هەڵاتن و بایەخی جەنگیان نەما، لە کاتێکدا کە هۆرمەرد تەنها عارەبانەکانی بەگەڕ خستبوون.

دوای ئەوەی هۆرمەرد مەترسی هێرشی دووبارەی بابلییەکانی نەما، هەندێ لە عارەبانەکانی لە ئۆردووگاکە هێشتەوە تا ئەگەر هێرشی بابلییەکان دووبارە ببێتەوە، کەرەستەی بەرگری هەبێت و دواتر هەندێ لە سوارەکانیشی کە ئامادەبوون بۆ جەنگ لە گەڵ عارەبانەکانی تر برد و بەرەو ئۆردووگای ئارتۆبازان چوو کە لە رۆژهەڵات بوو تا ئەگەر فەرماندەکەی پێویستی بەو بێت، یارمەتی بدات.

ئارتۆبازان کە فەرماندەی لەشکرەکە بوو، خۆی بۆ جەنگ ئامادەکرد بوو بەڵام سوودی لە عارەبانەکانی وەرنەگرتبوو. کاتێك هۆرمەرد گەیشتە ئۆردووگای رۆژهەڵات بینی کە جەنگ لە نێوان پیادەکانی بابل و سەربازەکانی هەخامەنشی بەردەوامە و لە ئەوێ گاومەردی (کیومەرس) برای کە (ئەرتشتار، واتە سەرپەرەشتیاری یەکەیەکی عارەبانە جەنگییەکان) بوو، ڕاسپارد تا یارمەتی ئارتۆبازان بدات و وتی لە پشتەوە هێرش بکە بۆ سەر بابلییەکان و لە ناویان ببە و ئاگاداری ئارتۆبازان بکە کە هاتووی بۆ یارمەتیدانی ئەو.

ئەوکات هورمەرد بە دوو عارەبانە گەڕایەوە بۆ ئۆردووگای رۆژئاوا و بڕیاریدا دەرفەت لە کیس نەدات، چونکە زانی دەروازەکانی شار کراوەن و دەتوانێت هێرش بکات و شارەکە داگیر بکات، ئەو لە گەڵ تەواوی پیادە و سوارە و عارەبانەکانی کە لە ئۆردووگای رۆژئاوا هەیبوو بەرەو شار کەوتەرێ و لە دەروازە رۆژئاواوە چۆوە ناو شار و هەندێ عارەبانە و سواری وەك پاسەوان لە ئەوێ هێشتەوە تا بابلییەکان دایان نەخەن.

هۆرمەرد بێ ئەوەی رووبەرووی بەرگری ببێتەوە، رێگەکانی ناو شاری بڕی و خۆی گەیاندە کۆشکی کوت رابی و ویستی بە پەلە ئەویش داگیربکات، بەڵام دەرگای ئەرك داخرا بوو و پاسەوانەکان لە سەر دیوارەوە دەیان پاراست، بۆیە گەمارۆی کۆشکەکەیدا و رۆیشت تا شوێنەکانی تری شار بگرێت و دەروازەی رۆژهەڵاتی شاریشی داگیرکرد کە کراوە بوو، سێ عارەبانە کە ئەسپی زۆر باشیان لەسەر بوو نارد تا مژدەی داگیرکردنی شارەکە بە فەرمانەی لەشکر بگەیێنن.

لە ئۆردووگای رۆژهەڵات گاومەرد لە پشتەوە هێرشی کردە سەر بابلییەکان و بە پێکردنی مەشخەڵ ئارتۆبازانی ئاگادار کردەوە لەوەی بۆ یارمەتیدانی ئەو هاتووە، ئارتۆبازان لە وەرگرتنی مژدەی یارمەتی خۆشحاڵ بوو و فەرمانی بە ئەفسەرکان کرد بە سەربازەکان بڵێن لە ئۆردووگای رۆژئاواوە هاتوونەتە یارمەتیمان و سەربازەکان بە بیستنی ئەو هەواڵە هێرشی

بەهێزیان کرد، سەربازەکانی بابل کە هێرشیان بۆ هات و لە پشتەوەش هەر لێیان دەدرا دووچاری شکست هاتن و هەندێکیان کوژران و هەندێکیان ئەسیر بوون و ئەوانی تریش هەڵاتن.

گاومەرد بە هێرشی عارەبانەکانی خۆی بازنەی گەمارۆی لەشکری پاشای بابلی لە دەوروبەری ئۆردووگای ڕۆژهەڵات تێك شکاند و ئەوکاتەی دوایین سەربازی بابلی ئەسیر دەکرا یا دەکوژرا، سێ عارەبانەیەکەی هەڵگری پەیامی داگیرکردنی بابل گەیشتن و هەواڵیان گەیاند کە هۆرمەرد بابلی گرتووە و هەموو شار لە ژێردەستی ئەودایە و تەنها کۆشکی پاشایەتی ماوە و ئەوێش لە گەمارۆدایە.

ئەو دەرکەوتن و ئازایەتییەی هۆرمەرد ئەوەندە سەرەنج ڕاکێش و چاوەڕوان نەکراو بوو کە ئارتۆبازان سەرەتا بڕوای نەکرد و سەرنشینەکانی سێ عارەبانە مژدە گەیێنەرەکەی داوا کردن و پرسیاری تەواوی لێکردن و ئەوانیش دڵنیاییان دایە کە گومان نییە لە داگیرکردنی بابل لە لایەن لەشکرەکەیانەوە. وەك وتمان ئارتۆبازان دەیەویست بە هۆی دوو تونێڵەوە کە هەڵی کەندبوون شاری بابل داگیر بکات و پاشای بابلیش دەیەویست ئەگەر بتوانێت دوو تونێڵەکە وێران بکات، فەرماندەی لەشکری هەخامەنشی هیوادار بوو کۆتایی ئەو دوو تونێلە لە کۆتایی پاییز ببەسترێتەوە بە بابلی ڕۆژهەڵات و بابلی ڕۆژئاوا، بەڵام ئامادەباشی هۆرمەرد لە ئەو شەوەدا لە رووی فکری و لە کیس نەدانی کات، بەردەوامبوون لە سەر هەڵکەندنی تونێلەکەی ڕاگرت و بۆوە هۆی داگیرکردنی بابل.

بەیانی ڕۆژی دواتر ئارتۆبازان ڕاپۆرتی شێوەی داگیرکردنی بابل و ڕووداوەکانی ئەو شەوەی بۆ خەشایار نووسی و زۆر بە پیاوانە گرنگی خزمەتە گەورەکەی هۆرمەردی باس کرد و وتی سوود وەرگرتن لە دەرفەت و داگیرکردنی شار بیرۆکەی هۆرمەرد بوو و ئەو بە ڕێگەی گاومەردی برای ئۆردووگای ڕۆژهەڵاتی رزگارکرد و هەم توانی بابل داگیر بکات.

پێش ئەوەی باس لە داگیرکردنی کۆشکی پاشایەتی بابل بکەین دەبێت بڵێین نامەی ئارتۆبازان بۆ خەشایاری برای بە رادەیەك خزمەتی هۆرمەردی کرد کە خەشایار بڕیاریدا جگە لە ئەوەی هۆرمەرد بکاتە فەرمانڕەوای بابل، ئاڵایەکی (درەفش) پێ بەخشی و هۆرمەرد لەو کات بە دواوە بۆی هەبوو بۆ هەر شوێنێك رۆیشتبایە ئاڵاکە لە پێشییەوە لە لایەن یاوەرەکانی هەڵبگیرایە و ئەو ئاڵایە بە وتەی کەتزیاس بریتی بووە لە سەری ئەسپ. ئەوکات لە سەردەمی هەخامەنشییەکان ئەو ئاڵای رەنگاو رەنگانەی ئێستا نەبوون و ئاڵای دەسەڵاتدارە گەورەکان و فەرماندەکانی لەشکر زۆرتر سەری ئاژەڵەکانی وەك (گا و کەلەشێر و ئەسپ) بوون و وەك

تایبەتمەنی دەسەڵاتدارەکان بوو و دەبۆوە نیشانی بنەماڵەیی بۆ ئەو کەسەی وەریدەگرت، ئەو نەریتە لە ئێرانەوە چوو بۆ ئەورووپا و نیشانی بنەماڵە و سەرکردەکان و شەوالیەکانی ئەورووپا بە فەرمی لە ئێرانییەکان وەرگیراوەتەوە.

ئەگەر هۆرمەرد لە شەوی (٤٨٥/١١/٣ پ. ز) سوودی لە دەرفەت نەدیتبایە و شاری نەگرتبایە، نەدەزاندرا ئارتۆبازان کەی لە ڕێگەی هەڵکەندنی تونێڵ توانای گرتنی ئەو شارەی دەبێت، چونکە پارێزەرانی شار ئاگاداری هەڵکەندنی تونێلەکان بوون و کاتی گەیشتنی بۆ ناو شار یا کوێریان دەکردنەوە و یا بە هاوێشتنی ئاگر و بەرد، دووکەڵێکی وایان دروست دەکرد کە سەربازە هەخامەنشییەکان نەتوانن بێنە دەر لە تونێڵەکە.

هەڵکەندنی تونێڵ کارێکی قورس بوو، بەڵام چوونە ناو شاریش بەو ڕێگەیەوە گرفتی زۆری هەبوو و کەمتر ڕوویدابوو کە هێرشبەرێك بتوانێت لە ڕێگەی تونێڵەوە شارێك داگیر بکات. وێرای ئەوەش دەبێت ئەوە پشت ڕاست بکەینەوە کە چوونە ناو شار لە ڕێگەی تونێل ئاسانترە تا لە ڕێگەی کەناڵی زێراب وەك ئەوەی لە جەنگە دووەمی جیهانی لە شاری (وارشۆ) ڕوویدا. چونکە ئەوانەی لە ڕێگەی زێرابەوە دەچوونە ناو شار ئەگەر بچوکترین برین لە دەستەیان دروست ببوایە، دووچاری نەخۆشی هەوکردنی خوێن دەبوون و دەمردن، بەڵام ئەوە چاوەڕوانی ئەو کەسانە نەبوو کە بە تونێڵدا دەڕۆیشتن.

ئارتۆبازان دوای گەیشتنی بۆ ناو شاری بابل لە ڕێگەی جارچییەکانەوە، جاڕی لێ خۆش بوونی گشتی ڕاگەیاند و وتی ئەو لێ خۆش بوونە تەنها ئەوانە ناگرێتەوە کە تاوانیان بەرانبەر لەشکری هەخامەنشی کردووە و دواتر فەرماندەی لەشکری هەخامەنشی هەروەك کورووش، دوای سەرکەوتنی بەسەر بابلدا بەرەو پەرستگای خوای گەورەی شار ڕۆیشت و بەرانبەر پیکەری خوای گەورەی بابلییەکان، بە پێی نەریتی خۆیان و بابلییەکان ڕێزی نواند.

کۆشکی پاشایەتی لە ڕۆژی (١١/٣) کە ئارتۆبازان چۆوە پەرستگا، گەمارۆ درابوو و ئەو ڕۆژە ئارتۆبازان کاری گرنگتر لە داگیرکردنی ئەرکی پاشایەتی هەبوو، لە لایەکی تر دەیزانی پاشای بابل لە کۆشکەکەیەتی و ژمارەیەکی کەم پاسەوانی هەیە و لەناو کۆشکەکەی گەمارۆدراوە و لە لایەن کوت ڕبییەوە هیچ مەترسی نییە تا ناچاربێت ئەو ڕۆژە ئەو کۆشکە داگیر بکات. پاشای بابل تا ئەوکاتەی خاوەن لەشکر بوو، بۆ ئارتۆبازان مەترسی بوو، بەڵام شەوی پێشتر لەشکرەکەی لەناو چوو و سەرباز و ئەفسەرەکانی یا کوژران یا ئەسیر کران و یا هەڵاتن. گریمان ئەو لەگەڵ پارێزەرەکانی لە کۆشك دەردەچوو و هێرشی دەکرد، تەنها

دەسکەوتی کوژرانی خۆی و پارێزەرەکانی دەبوو و بۆیە ئارتۆبازان پێی باشتر بوو کە دەرمانی بریندارەکان بکات و مردووەکان بەخاك بسپێرێت، هەروەها لەشکرەکەی کە تا ئەوکات لە سەحرا بوون لە ناو شار جێ بکاتەوە و داگیرکردنی کۆشکی پاشایەتی بخاتە رۆژێکی تر.

خەڵکی بابل بە بیستنی فەرمانی لێخۆش بوون زۆر دڵشاد بوون، چونکە سەرەتا وایاندەزانی کە لەشکری هەخامەنشی هەموویان دەکوژێت و کور و کچانیان بە ئەسیر دەگرێت. کوروش دوای ئەوەی بۆ ماوەیەك بابلی گەمارۆ دابوو، دوای ئەوەی چۆوە ناو ئەو شارە، کەسی نەکوشت و ماڵی کەسی داگیر نەکرد، بەڵام پێش ئەوەی کوروش بێتە ناو بابل، پاشای بابلیش کەسی لە ئێرانییەکان نەکوشبوو (هەرچەندە ئەوکات هیچ ئێرانی لەو شارە نەدەژیان). بەڵام وەك باسکرا کوت رابی پاشای بابل هەموو ئەو ئێرانیانەی کوشت بوون کە لەو شارە بوون.

ئەرکی سەرلەشکری هەخامەنشی لەو رۆژەدا بریتی بوو لە ناسینی کاهین و خانەدانەکانی بابل، چونکە خەشایارشا ڕای سپارد بوو تا لە جیاتی هەر ئێرانییەك کە بە دەستی کوت رابی کوژراوە، پێنج لە خانەدان و کاهینەکان بکوژێت و سەرەتاش دەبوایە کوت رابی بکوژێت، ئارتۆبازان ناچاربوو فەرمانی پاشا جێبەجێ بکات، جگە لە ئەوە خۆشی پێی وابوو کە بکوژی ئێرانییەکان نابێت بێ سزا بمێننەوە.

ئەو رۆژە بڕیاردرا کەس تا دوا ئاگاداری هیچ کەس بۆی نییە لە شار بڕواتەدەر و ئارتۆبازان ناوی تەواوی خانەدان و کاهینەکانی بابلی بیست. ئەوەی خەشایار بە ئارتۆبازانی وتبوو فەرمان بوو و پاشاکانی ئەوکات لەو جۆرە فەرمانانەیان دەدا و بەردەستەکانیش دەبوایە جێبەجێیان بکەن. بۆیە ئارتۆبازان بۆ جێبەجێ کردنی ئەو فەرمانە سەرەتا دەبوایە لێکۆڵینەوە بکات، ئەو رۆژە ئەفسەرە ئێرانییەکان دوای پرسیار لە ژن و منالی ئێرانییە کوژراوەکان بۆیا دەرکەوت کە (١٩٢) کەس کوژراوە و بڕیری کوژرانیان بەبێ ئاگاداری ئەوان لە لایەن کوت رابییەوە دەرچووە و تەنانەت ناتواندرێت خانەدان و کاهینەکانیش سەرکۆنە بکرێن کە بۆ رێگەیان لەکارەی کوت رابی نەگرتووە، چونکە ئەوانیش دەرفەتی داوای لێخۆش بوونیان بۆ ئەوان نەبووە و لەنەکاو بیستوویانە کە بە فەرمانی کوت رابی ئەو ئێرانیانە کوژراون.

ئارتۆبازان کوری داریوش کە بە پەروەردەی کوروش و نەریتی داریوشی بابی گۆش کرا بوو، بۆی دەرکەوت کوشتنی کاهینە پلە یەکەکان و خانەدانەکانی بابل لە بەرانبەر کوژرانی (١٩٢) ئێرانی ستەمێکی گەورەیە و بۆ جێبەجێ کردنی فەرمانی خەشایاری برای جگە لەوان دەبوایە کاهینە پلە دوو و پلە سێیەکانیش بکوژن. خەشایارشا بێ ڕەچاوکردنی بارودۆخی بابل و بێ

هەبوونی زانیاری لەبارەی کوشتنی ئێرانییەکان، ئەو بڕیارەی دابوو و ئارتۆبازان بیری کردەوە کە ئەگەر ئەو فەرمانەی جێبەجێ بکات، نەتەنها ستەمێکی گەورە دەکات بەڵکو لای خەشایارشاش بەرپرس دەبێت.

ئارتۆبازان ڕاپۆرتێکی لەو بارەوە بۆ خەشایار نارد و بۆی شی کردەوە کە کاهینەکان و خانەدانەکانی بابل بەرپرس نین لەو کارە و تەنانەت ئاگاداریش نەبوون و دوای ئەوەی تاوانەکە ئەنجام دراوە، لێی ئاگادار بوونەوە و جگە لە کوت رابی کەس لەو کارە بەرپرس نییە.

ناردنی ئەو ڕاپۆرتە لە لایەن ئارتۆبازان بۆ خەشایار، دەرخەری ئەو ڕاستییەیە کە دەسەڵاتدار و سەردارەکانی هەخامەنشی ئەگەر زانیبایان فەرمانی پاشا هەڵەیە، دەیانتوانی جێبەجێ کردنەکەی ڕابگرن و شی کردنەوە بدەن بە پاشا.

ئەو بابەتە نابێت بە بچووك بزاندرێت چونکە ئەوکات و لە وڵاتانی تر ئەگەر پاشا فەرمانی هەڵەی دەرکردبایە، سەردارەکان نەیاندەتوانی ڕایبگرن و ئەگەر ئەو کارەیان کرد بایە، خۆیان دەکوژران. بەڵام لە ناو هەخامەنشییەکان ئەو کارە ڕێ پێدراو بووە و ڕوونکردنەوەی ئارتۆبازان بۆ پاشا بەپێی ئەو بنەمایە بووە و نەگەراوەتەوە بۆ ئەوەی کە ئارتۆبازان برا گەورەی خەشایار بووە و زۆر ئازا بووە، بۆیە ئەو کارەی کردووە.

دوو ڕۆژ دوای ناردنی ڕاپۆرتەکەی ئارتۆبازان سەبارەت بە خانەدان و کاهینە پلە یەکەکانی بابل بۆ پاشای هەخامەنشی، ئەرکی پاشایەتی گیرا و کوت رابی و تەواوی بنەماڵەکەی ئەسیر کران، هەرچەندە ئەو ئێرانییەکانی کوشت و دواتر لە بەرانبەر لەشکری هەخامەنشی خۆڕاگری کرد و شاری بەدەستەوە نەدا، بەڵام ئارتۆبازان لەگەڵ ئەو و بنەماڵەکەی بەرێزەوە جووڵایەوە و ئەمەش بە دوو هۆ بوو، یەکەم ڕاگەیاندنی ڕێزگرتن لە ئەسیرەکان کە لە شانازییەکانی هەخامەنشییەکان بوو و دووەم ئارتۆبازان شازادە بوو و دەیزانی پێویستە هەموو کاتێك ڕێز لە دەسەڵاتداران بگیرێت، هەرچەندە کوت رابی ئەسیر بوو.

کوت رابی پیاوێکی باڵابەرز و قەڵەو بوو، ڕەنگی رووخساری کەمێك سوور و ریشی درێژ بوو، پیش و ناوەڕاستی سەری رووتابۆوە، دوای ئەوەی ئەسیر بوو لە ئارتۆبازانی پرسی: چ لە من دەکەی؟

ئارتۆبازان وتی: هەر شتێك پاشای هەخامەنشی فەرمانی لەسەر بدات.

کوت رابی وتی: بە پاشای هەخامەنشی ڕابگەیێنە هەرچی زێر و گەوهەری لە خەزێنەدا هەمە، دەیدەم بە ئەو ئەگەر ئازادم بکات.

ئارتۆبازان وتی: ئەو زێر و گەوهەرەی لە خەزێنەکەتدا هەتبوو، هەمووی بە دەسکەوتی جەنگ دەژمێردرێت و لە لایەن منەوە دەستی بەسەردا گیراوە بۆ پاشای ئێران.

کوت رابی وتی: من لە باکوور و ناوەند و باشووری بابل زەوی زۆرم هەیە و ئەگەر پاشای ئێران من ئازاد بکات و دەرفەتی زیندوو بوونم بدات، هەمووی دەدەم بە تۆ.

ئارتۆبازان وتی: هەموو ئەو زەویانە لە لایەن پاشای هەخامەنشی داگیردەکرێن و هەرچی هی تۆ بێت لە ماڵی گوێزەرەوە و نەگوێزەرەوە دەبێتە هی ئەو.

کوت رابی وتی: ئاگاداری بکەوە کە ئەگەر من ئازاد و زیندوو بم، دەبم بە یەك لە باشترین و بە وەفاترین خزمەتکارەکانی.

ئاتۆبازان وتی: سەبارەت بە تۆ ڕاپۆرتێکم بۆ پاشای هەخامەنشی ناردووە و چاوەڕوانی وەڵامم، تا ئەو وەڵامەم پێ نەگاتەوە ناتوانم هیچیتر لە بارەی تۆ بۆ ئەو بنووسم.

ئارتۆبازان بێ ئەوەی بیشارێتەوە نیشانی ئەو پیاوەیدا کە نایەوێت لە پاشای هەخامەنشی داوای لێ خۆش بوونی بۆ بکات، چونکە بە بڕوای ئەو کوت رابی تاوانبار بوو و دەبوایە لە سێدارە بدرێت، ئەگەر ئەو داوای لێ خۆش بوونی بۆ ناردبوایە، وەك ئەوە بوو خۆی داوای لێ خۆش بوونی بۆ بکات.

وەڵامی خەشایار گەیشت و فەرمانی کرد بوو لە گۆڕەپانی ناو شار و بە ئامادەبوونی هەموو بابلییەکان، بە دەست ئەو جەللادانەی ئێرانییەکانیان کوشتووە، بە زیندوویی پێستی لێ دابماڵن و دەستدرێژی نەکەنەسەر کەسی تر.

کەتزیاس دەڵێت ڕۆژی (٤٨٥/١٢/٢ پ. ز) بڕیارەکە بەسەر کوت رابیدا جێبەجێ کرا و لە سێ ڕۆژ پێش ئەو بەروارەوە بانگەشە بۆ کۆبوونەوەی خەڵك لە شوێنی سزاکە دەکرا، ئەو ڕۆژە هەرکەسێك توانی کاری خۆی جێهێشت و لە ئەوێ ئامادەبوو. چەند ڕۆژ زووتر لە ناوەڕاستی مەیدانەکە شوێنێکی وەك شانۆیان ئامادەکردبوو کە لە زەوی بەرزتر بوو و چوار داریان بە شێوەی ستوونە چەقاندبوو و هەموان لە شوێنی خۆیانەوە دەیانتوانی ئەو شوێنە ببینن.

لە ئەو شوێنە چوار داریان لەسەر زەوی بەستبۆوە و دوای ئەوەی چەند کاتژمێرێك لە ڕۆژ تێپەڕی، کوت رابی هێندرا بۆ ناو مەیدانەکە و بردیانە سەر شانۆیەکە و هەر دوو دەست و هەر دوو قاچی بە شێوەیەك بە دارەکان بەسترایەوە کە جەستەی هەڵواسرا بوو و لە نێوان ئەو و زەوی مەودایەك کەوتەوە، ئەوکات لە لایەن دوو جەللاد کە بە فەرمانی خۆی ئێرانییەکانیان کوشتبوون، دەستکرا بە داماڵینی پێست لە جەستەی و هەرچەندە کوت رابی هاواری دەکرد و

دەپاڕایەوە کە بە زەربەیەکی شمشێر سەری بپەڕێنن تا ئەشکەنجەکەی کۆتایی بێت، گوێیان لێ نەدەگرت[٤].

کاتێك پێست داماڵین لە جەستەی کوت رابی تەواو بوو، دەست و قاچیان کردەوە و لە سەر شانۆکەیان دانا، بەڵام ئەوکات کوت رابی نە دەیتوانی بجولێت و نە دەنگی لێوە دەهات و هەر ئەو شەوە مرد.

دوای ئەوەی کوت رابی کوژرا، خەشایارشا فەرمانی کرد تا ئارتۆبازان بگەڕێتەوە و هۆرمەردی کردە فەرمانڕەوای (خەشتەرە پاوەن) بابل، بەڵام چونکە لە لەشکرەکانیدا پێویستی بە هۆرمەرد بوو، فەرمانیدا تا ئەویش بگەڕێتەوە و کورە گەورەکەی کوت رابی کرایە فەرمانرەوا و بابل بۆوە وڵاتێکی ژێر دەستەی ئێران.

سەبارەت بە مێژووی داگیرکردنی بابل و ماوەی دەورە گرتنی لە لایەن ئارتۆبازان، لە ناو مێژوونووسان بیروڕای جیا هەیە، هەندێکیان ماوەی دەورە گرتنەکە بە ساڵێك و تەنانەت هەندێکیان بە دوو ساڵیان باس کردووە و مێژووی داگیرکردنی بابل بە پاییزی (٤٨٣ پ. ز) دیاری دەکەن. بەڵام سەبارەت بە هۆرمەرد و شەوە تەماویەکە و شێوەی گرتنی شارەکە و سزای کوت رابی، هیچ جیاوازی نییە.

---

(٤) (بێ ئەوەی پەسەندی هەموو کردەوەکانی پێشینان بکەین، دەڵێین ئەو جۆرە سزایە ناخۆش و ترسناکانە لە نەریتی دەسەڵاتدارە کۆنەکان بووە و وەك چۆن لە سەدەی بیستەم پاڵپشت بە یاساکانی جەنگ بە بومبی ناوەکی لە دوو شار درا و لەو شارانەدا تەنانەت مناڵانی ساواش سووتان. زەبیحوڵڵا.)

# جووڵە بەرەو یۆنان

باسمانکرد کە لە ساڵانی کۆتایی تەمەنیدا، داریوشی یەکەم هەوڵێدەدا بۆ تووڵە سەندنەوەی شکستی لەشکرەکەی لە جەنگی ماراتوون، لەشکرکێشی بۆ یۆنان بکات و تەمەن ڕێگەی ئەو کارەی پێ نەدا. دوای مردنی داریوش، خەشایاری کوری هەوڵیدا ئەو هەوڵەی باوکی بە ئاکام بگەیێنێت و فەرمانی بە تەواوی دەسەڵاتدار و فەرمانرەوایانی ژێر دەستی ئیمپراتۆریەکەی کرد تا لەشکر کۆبکەنەوە و بیان نێرن بۆ ئازەربایجان تا لە ئەوێوە بچنە وڵاتی لیدی لە ئاسیای بچووك.

خەشایار دەیزانی بۆ ئەو جەنگە پێویستی بە هێزی دەریایی بەهێز هەیە بۆیە ئارتۆبازانی برای بۆ ئەو ئەرکە ڕاسپارد و پارە و زێری پێویستی خستە بەر دەستی. ئارتۆبازان زانیاری لە مەڕ بابەتە دەریاییەکان نەبوو، بەڵام بەرێوەبەری باش بوو و ژمارەیەك فەرماندەی کەشتی ئێرانی و نەتەوەی تر وەك ڕێپێشاندەر لە گەڵ ئەودا بوون، تا ئاگاداری بکەن چ جۆرە کەشتییەك دروست بکات کە لە جەنگەکاندا سوودیان لێ بدیترێت.

ئێمە چونکە سەبارەت بە چۆنێتی دروستکردنی کەشتی لە سەردەمی دەسەڵاتی داریوش شی کردنەوەماندا، لێرە دووبارەی ناکەینەوە، چونکە بنەماکانی دروستکردنی کەشتییەکان تا سەرەتای سەدەی پازدەهەم بە ڕادەیەکی زۆر نەگۆڕا و دوای ئەوە گۆران کەوتە ناو دروستکردنی کەشتییەکان.

بەڵام پێویست بگوترێت کە فەرماندە دەریاییە ئێرانییەکان و فەرماندەکانی کە خەڵکی وەڵاتە ژێر دەستەکانی ئیمپراتۆریەتی هەخامەنشی بوون و لە لەشکری ئەوان خزمەتیان دەکرد و لێرە بە نائێرانی ناویان دەبەین، ئەوجارە ئەو وانەیەیان وەرگرت کە لە چاك کردنی کەشتی زۆر گەورە واتە کەشتی هەزار تەنی خۆیان بپارێزن تا بە هۆی سەڵبە و چارۆگە بە خێرایی بکەوێتەوە جووڵە، هێزی سەرەکی بزوێنەر لە کەشتییەکاندا سەڵبە بوو و ئەوان زانستی تایبەت

به چارۆگەیان نەدەزانی تا سوودی زۆرتر لە جوولەی کەشتی تێدا ببینن و کەشتییەکانیان تەنها دوو میلی دەریایی لە کاتژمێرێکدا بە هۆی چارۆگە دەرۆیشت، لە سەدەی هەڤدەهەم ئەو زانستە پێشکەوت و تواندرا کەشتی بچووك دروست بکرێت کە لە کاتژمێرێکدا بە هۆی چارۆگە نزیگەی پازدە میلی دەریایی لە یەك کاتژمێردا ببڕێت. لە سەدەی هەژدەهەم کەشتییە ئاساییەکان لە کاتژمێرێکدا (٧ تا ١٠) میلی دەریاییان لە کاتژمێرێکدا دەبڕی، بەڵام کەشتییە گەورە و قورسەکان ئەو سوودەیان هەبوو کە دەیانتوانی ژمارەیەکی زۆرتر سەربازی هەڵبگرن و ئەگەر دوژمن هاتبایە ناو ئەو کەشتیانە، بە هۆی ئەوەی سەربازی زۆریان تێدا هەبوو، زووتر دەتواندرا سەربازەکانی دوژمن لە ناو ببرێت.

ئەو جارە ئارتۆبازان بە ڕێنمایی فەرماندە ئێرانی و نائێرانییەکان دروستکردنی کەشتی بچوکی بە سەر کەشتی گەورەدا بە پەسەندتر زانی، بەڵام دەستی لە دروستکردنی کەشتی گەورە هەڵنەگرت، چونکە ئەو قەڵا گەورە و لەبن نەهاتووانەش زەرووری بوون. ئەمجارە نەتەنها لە کەنارەکانی دەریای مەدیتەرانە، لە کەنارەکانی کەنداوی فارسی و دەریای عومان و دەریای سندیش کەشتی بۆ لەشکری ئارتۆبازان دروست دەکرا، چونکە کەناڵی داریوش لە نێوانی زێی نیل و دەریای سوور کراوە بوو و کەشتییەکانی ئەو شوێنانەش بە ئاسانی دەیانتوانی بگەنە دەریای مەدیتەرانە و بەرانبەر بە یۆنانییەکان هێزێکی مەزنی دەریایی ئامادەبکەن.

هەندێ لە مێژوونووسە کۆنەکانی یۆنان دەڵێن خەشایار چونکە بە نیازی هێرش بۆ یۆنان بوو، هاتووچووی کەشتییە بازرگانییەکانی ئەوانی بۆ بەندەرەکانی ئاسیای بچووك یاساغ کرد بوو و ئەو بابەتە ڕاست نییە و خەشایار تا ئەو رۆژەی گەیشتە ناو یۆنان، نە ڕێگەی لە هاتنی کەشتی یۆنانی بۆ بەندەرەکانی سنووری هەخامەنشی گرت و نە ڕێگر بوو لە هاتنی یۆنانییەکان بۆ سنوورەکەی. تەنانەت ئەوکاتەی سەربازانی هەخامەنشی و یۆنانی لە جەنگدا بوون، هەزاران کرێکاری یۆنانی لە بیناکردنی کۆشکی پێرسپۆلیسدا کاریان دەکرد. هەر ئەوکاتەی خەشایار سەرگەرمی دروستکردنی کەشتی بۆ جەنگی یۆنان بوو، بە وتەی (دەی نوون) کە لە سەردەمی ئەسکەندەردا ژیاوە، زانایانی یۆنانی بەردەوام سەفەری ئێرانیان کردووە و خەشایار پێشوازی کردوون و هەروەها لە سەردەمی هەخامەنشییەکاندا بەردەوام ڕێگا بۆ شاعێر و نووسەر و زانا یۆنانییەکان کراوە بووە و ئەوان زوورتر لە یۆنان گرنگیان بە زاناکانی ئەوان داوە. بە وتەی (گی دۆشمەن گەیمەن) کە مامۆستای مێژووی ئێرانە لە زانکۆی (ژێنۆ)، سەردەمی هەخامەنشییەکان سەردەمی هەڵاتنی زانا یۆنانییەکان بووە بۆ ئێران.

لە سەردەمی خەشایار نەتەنیا لە ئێران بەڵکو لە تەواوی سنووری ژێردەستی هەخامەنشییەکاندا تەنانەت یۆنانییەك نەکەوتە بەر ئازار و ئێمە ئەمرۆ ئەو بابەتە بە ئەستەم دەزانیین، بەڵام نووسینەکانی مێژوونووسانی وەك (دەی نوون و کەتزیاس) کە خۆیان یۆنانی بوون، ئەو راستییە پشت راست دەکەنەوە.

دوازدە شاری یۆنانی کە لە ئاسیای بچووك بوون کە لە رووی ئایین و رەگەزەوە یۆنانی بوون و لە تەواوی سەردەمانی جەنگی خەشایار و یۆنان، تەنانەت نەکەوتنە بەر سنووردار کردن، چ جای ئەوەی ئازار بدرێن. لە هەمان سەردەم لە شارە یۆنانییەکانی وەك (میلەتۆس و لبە دۆس و ئابیدۆس) شانونامەی دژی ئێران دەنووسرا و نمایش دەکرا و هەخامەنشییەکانیش رێگەیان لێ نەدەگرتن. خەشایارشا جیاوازی دەنواند لە نێوان ئەو یۆنانیانەی کە شوێن کەوتەی بوون و ئەو یۆنانیانەی لە یۆنان دەژیان و هەروەها ئەو یۆنانیانەی بە میوان دەناسین کە لە ئێران دەژیان.

کەتزیاس دەڵێت: داریوش لە نامەیەکدا بۆ هۆرمەرد دەڵێت دانیشتوانی شارە یۆنانییەکانی ئاسیای بچووك وەك دانیشتوانی وڵاتانی ئاسیای بچووك لە سەربازی بەخشراون و لە شوێنکەوتوانی منن و نابێت بە چاوی دوژمن سەیریان بکرێت. خەشایار سەربازی لە دانیشتوانی ئاسیای بچووك نەدەگرت، بەڵام ئەوانەی خۆبەخشانە دەهاتن پەسەند دەکران، زۆرجار خەڵکی ئەوێ خۆبەخشانە بوونەتە سەرباز.

کاتێك هۆرمەرد خەشایاری ئاگادار کردەوە لە گەیشتنی هەموو سەربازەکان بە تەواوی ساز و بەرگی سەربازییەوە بە وڵاتی لیدی و جێگیربوونیان لەو وڵاتە، خەشایار کورەکەی خۆی داریوشی بە جێنشین ڕاگەیاند و لیژنەیەکی باڵای دیاریکرد تا لە کارەکان یارمەتی داریوشی بچووك بدەن و خۆی بەرەو لیدی کەوتەرێ. داریوشی بچووك چارەنووسێکی ڕەشی هەبوو و دوای کوژرانی داریوش دەبوایە ببێتە پاشا، بەڵام کوژرا و چونکە (ئەردەشیری درێژ دەست) لە مردنی ئەو سوودمەند دەبوو و خەڵك وتیان ئەو بەشدار بووە لە کوشتنی و دوای کوژرانی براکەی، ئەردەشێر بوو بە پاشا.

خەشایار دوای گەیشتنی بە لیدی، ڕاستەوخۆ فەرماندەیی لەشکرەکەی وەرگرت و بەرەو یۆنان کەوتەرێ، مێژوونووسان بە گشتی ژمارەی ئەو لەشکرە بە دوو ملیۆن تا هەشت سەد هەزار دیاری دەکەن و هیچ مێژوونووسێك نییە باس لە هەشت سەد هەزار سەرباز کەمتر بکات. هەروەها ژمارەی کەشتییەکانی هێزی دەریایی خەشایاریشیان بە هەزار و پێنج سەد

کەشتی دیاریکردووە و چونکە خەڵك کەمتر لە بابەتەکانی وشکانی زانیاریان لە بارەی بابەتەکانی دەریا هەیە، دەبێت نەختێك سەبارەت بە ئەو هەزار و پێنج سەد کەشتییە بدوێین.

ئەوکات درێژی کەشتییە بچووك و خێراکان بە پێوەرەکانی ئەمرۆ دەگەیشتە سی مەتر و ئەگەر هەزار و پێنج سەد کەشتی لە دەریادا لە پشت یەك ریز بگرن و برۆن، ریزێك بە درێژایی سەد و هەشتا کیلۆمەتر دروست دەکەن، چونکە بەپێی یاساکانی هێزی دەریایی کاتێك کەشتییەکان دەکەونە پشت یوکتر دەبێت هەر کەشتییەك لە دەریا بە لانی کەم سێ ئەوەندەی درێژییەکەی لە کەشتی تر دووربێت، کە بە پێوەری ئێستا نەوەد مەتر دەکات و ئەگەر (١٥٠٠) کەشتی لە دوایەك ریز ببوانە، درێژی ئەو لەشکرە دەریاییە دەگەیشتە (١٨٠ کم) و مەودای نێوانیان (١٣٥ کم) و کەشتییەکان (٤٥ کم) بوونە و ئەگەر کەشتییەکانی هەخامەنشی بە دە ریز رۆیشتبان، درێژییەکەیان دەبۆوە (١٨ کم).

ئەوکات وەك باسکرا کەشتییە جەنگییەکان بە سەڵبە دەرۆیشتن و ئەگەر گریمان بکەین کە لە هەر کەشتییەکدا تەنها بیست جووت سەڵبە هەبوو بێت و هەر سەڵبەیەك بە پێنج کەس بجولێندرێت، لە هەر کەشتییەك (٢٠٠) کەس سەڵبەی لێداوە و بە گشتی دەکاتە (٣٠٠٠٠٠) کەس، ئەگەر هەندێ کەشتی دوو ریز سەڵبەچیان بوبێت ئەو ژمارەیە دەبێتە (٤٠٠٠٠٠) کەس و لە کەشتییە سێ ریزەکان ئەو ژمارەیە دەگاتە (٦٠٠) کەس و ئەگەر تەنها دوو سەد کەسەکە هەژمار بکەین ئەوکات دەبێت بڵێین جگە لە سەربازەکان، سێ سەد هەزار سەڵبەلێدەر لە کەشتییەکان کاریان دەکرد و فەرماندەی هێزی دەریایی چۆن دەتوانێت خواردن بۆ سێ سەد هەزار کەس دابین بکات کە بەردەوام کار دەکەن، چونکە ئەگەر ئەوان ئەوان تێر نەکرابان و برسیان بووایە نەیاندەتوانی سەڵبە لێ بدەن، چونکە هەر جارێك کە ئەوان سەڵبەیان دەخستە ناو ئاو و بەهێزەوە پاڵیان دەدا وەك ئەوە بو کە پاڵەوانێکی بەرز کردنەوەی قورسایی، قۆرساییەکی زۆر بەرز بکاتەوە. پالەوانی بەرز کردنەوەی قورسایی لە سەردەمی ئێستادا رۆژانە لە دە تا بیست جار قۆرسایی بەرز دەکاتەوە و دواتر پشوو دەدات، بەڵام سەلبەچییەکانی کەشتییە کۆنەکان لە بەیانی تا شەو و لە کاتی پێویستیشدا شەو و رۆژ بەردەوامبوون لە سەڵبەلێدان و جەستەیان بەردەوام خۆراکی پێویست بوو و بە پێچەوانەوە کاریان پێ نەدەکرا.

فەرماندەی ئەو هێزە نەیدەتوانی لە یەك کاتدا سێ سەد هەزار سەڵبەچی تێر بکات و هاوکات خۆراك بۆ ئەفسەر و سەربازەکانی ناو کەشتییەکان دابین بکات، سەڵبەچی وەك بزوێنەری کەشتی بوو و بەشداری جەنگ نەدەبوون، بەڵام سەرباز و ئەفسەرەکان لە هەموو

کەشتییەکاندا دەجەنگان. جگە لە بابەتی دابین کردنی خۆراك، فەرمان گەیاندن بە هەزار و پێنج سەد کەشتی جەنگی لە دەریا و لە کاتی جەنگدا ئەوەندە سەخت بوو کە بە کارێکی ئەستەم دەزاندرا، چونکە پێداویستی بۆ گەیاندنی فەرمان بۆ ئەو کەشتیانە ئەوە بوو کە فەرماندەی پەیوەندی بە ئەوانەوە بەردەوامبێت.

ئەزموونی جەنگە دەرياييەکان تەنانەت لە جەنگی دووەمی جیهانی دەری خستووە کە زۆر جار فەرماندەی هێزی دەریایی بە شێوەی کاتی پەیوەندی لە گەڵ کۆمەلێك لە کەشتییەکانی نامێنێت و پێشتر ئەو بابەتە توندتر بووە، بۆ نموونە لە جەنگی یەکەمی جیهانی هێشتا بێتەل باش نەبوو و هەندێك جار بە هۆی بێ تەل نەدەتواندرا وشەکان وەك خۆیان بنێردرێن و بۆیە رووداوی سەیر و پێکەنیناوی لێ دەکەوتەوە و هەندێك جار لە کاتی ناردنی پەیام نەیاندەتوانی وشەکان وەك خۆی بگوازنەوە و کێشەی دەنايەوە. بۆ نموونە لە وشەی (تۆپ) تەنها (ت) گواسترايەوە و دوو وشەکەی تری نەگواسترايەوە و ئەو کەم و کوريە بۆوە هۆی رووداني رووداوێکی پێکەنیناوی کە بەم شێوە بوو:

(لە ساڵی (١٩١٤ ز) واتە پێش جەنگی یەکەمی جیهانی، سەرۆك کۆماری فەرەنسا (پوانکارێ) بۆ بە سەر کردنەوەی هێزی دەریایی چوو و بڕیار درا دوای دیتنی یەکەکان و نمایشی کەشتییە جەنگییەکان، نانی نیوەرۆ لە کەشتی (سەرداری دەریا) بخوات. بێ تەلی سەرۆك کۆمار بەیانی ئەو رۆژە ئەو وشانەی بە فەرەنسی گەیاند (پێرە پارێ ك) واتە (ك ئامادەبکەن). بێ تەلەکە وشەکانی سەرەتای بە دروستی ناردبوو و دەرنەدەکەوت کە (ك) بە واتای چ وشەيەکە.

ئەفسەرەکانی کەشتی سەرداری دەریا هەرچەندە هەوڵیاندا نەیانتوانی وشەکە بە تەواوی وەربگرن و بە ناچاری هەر شتێك لە ناو کەشتییەکە بە وشەی (ك) دەستی پێدەکرد ئامادەیان کرد بۆ نموونە (کلاو، کاغەز،... هتد) و سەرەنجام کەشتی سەرۆك هات و بە پەلە دەریاسالاری فەرەنسی لە فەرماندەی کەشتی سەرۆکی پرسیار کرد (ك) بە چ واتايەك دێت کە ئێوە بێ پسانەوە دەتانووت بۆ سەرۆکی ئامادەبکەين و و ئەويش وتی:"سەرۆك خواردنی کاسوولەی[(١)] پێ خۆشە و وتمان بۆی ئامادەبکەن."

---

(١) (کاسووله خواردنێکی فەرەنسيە، بە تاس کەباب دەچێت و بە گۆشتی کەروێشك ئامادەدەکرێت ئەگەر کەروێشك دەست نەکەوت بە گۆشتی گۆلك ئامادەی دەکەن. زەبیحوڵڵا)

ئەو ڕووداوە کە لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم روویدا و بۆوە هۆی گاڵتەی زۆرێك لە ڕاگەیاندنەکان، نموونەیەکە لە گرفتەکانی پەیوەندی ناو دەریا لە گەڵ تەواوی کەشتییەکان. لە پێنج سەدە پێش زایێن فەرماندەیی هەزار و پێنج سەد کەشتی جەنگی لە دەریادا ئەستەم بوو و بە تایبەتی لە دەریای مەدیتەرانە و دەریا بەربلاوەکانی ئەو کە دەبوونە گۆڕەپانی جەنگی هەخامەنشی و یۆنان، ئەوکات ئەستەم بوو کە فەرماندە بتوانێت لەگەڵ هەموو کەشتییەکانی لە پەیوەندی بێت.

کەشی دەریای مەدیتەرانە بەردەوام لە گۆران دایە و تەم و هەورە نەویەکانی سەری رێگرن لە ئاستی بینین و لەوانە بوو کە فەرماندەی هێزی دەریایی بە هۆە هەور و تەمەوە نەتوانێت بەشێك لە کەشتییەکانی ببینێت و ئەو نیشانانەی ئەوان رەوانی دەکەن ببینێت و نیشانەکانیش بریتی بوون لە ئالاّ رەنگاورەنگەکان.

لە ئەفسانەکاندا دەکرا هەزار و پێنج سەد کەشتی لەیەك کاتدا و بە شکاندنەوەی یەك ئالاّ بە جوولە بخرێن یا لە جوولە ڕابگیرێن، بەلاّم لە مەیدانی جەنگی مەدیتەرانە و دەریاکانی تر دەرچونی هەزار و پێنج سەد کەشتی ئەستەمە و لەوانەیە ئەگەر ئەو هێزە بە دە یا پازدە بەش دابەش بکرایە دەتواندرا سەرکردایەتیان بکرێت و هەر بەشێك بە تەنها بێتە ناو جەنگ. بەلاّم لە ڕاستیدا هیچ دەریاسالارێکی خاوەن ئەزموون نەیدەتوانی بەرپرسیاریەتی بردنی ئەو ژمارە کەشتییە بۆ مەیدانی جەنگ بگرێتە ئەستۆ. ئەگەر ئەو ژمارەیەش بە دە تا پازدە بەش کرابوایە، لەوانەبوو هەر بەشێك بە جیا بتوانێت بێتە ناو جەنگ.

لە ساڵی (١٩٤١ ز) چەند کەشتییەکی جەنگکەری بەریتانی کە ئامێری پەیوەندی بەهێزیان هەبوو، ڕاسپێردران تا کەشتی جەنگی (بێسمارکی) ئالّمانی لە ناو ببەن، هەرچەندە هێشتا نێرەرە تەلەفزیۆنییەکان لە کەشتییەکاندا نەبەسترابوون، بەلاّم ئەو کەشتییە جەنگی و کەشتی شکێنانەی بەریتانیا لە روانگەی پەیوەندییەوە بیٚ کەموکوری بوون. وێڕای ئەوە لەکاتی بەدوا کەوتنی کەشتی بێسمارکدا بۆ ماوەی تەنها بیست خولەك پەیوەندی یەك لە کەشتییە بریتانییەکان بە ئەوانی تر نەما و چی نەمابوو کە ببێتە هۆی ڕوودانی کارەسات، هەرچەندە کاتەکە کورت بوو و لە کۆتاییدا ئەوان توانیان کەشتی بێسمارك نوقمی ئاو بکەن، بەلاّم ئەو ڕووداوە کە تەنها ونکردنی یەك کەشتی بوو لەوانەبوو ببێتە هۆی ونبوونی کەشتی بێسمارك و ڕوودانی کارەسات و ئەمە لە کاتێکدا بوو کە ئەو بیٚ تەلە بەهێزانەی کەشتییە بەریتانییەکان هەبوون.

ئەو بابەتانەمان باس کرد تا بسەلمێنین ئەو مێژوونووسە یۆنانیانەی باس لە بردنی (١٥٠٠) کەشتی و بەکار بردنیان لە لایەن خەشایارەوە دەکەن، هیچیان لە بابەت کەشتیوانی و دەریا نەزانیوە و بە پێچەوانەوە ئەو ژمارەیان نەدەنووسی. سەبارەت بە ژمارەی سەربازانی خەشایاریش کە (٨٠٠٠٠٠) نووسراوە، دەبوایە بزانن بردنی ئەو ژمارە سەربازە لە لایەن خەشایار بۆ یۆنان و دابین کردنی خۆراك بۆیان لەناو وڵاتی دوژمن، ئەستەمە و ناکرێت.

بە وتەی هیرۆدۆت و کەتزیاس، خەشایارشا لە بەهاری ساڵی (٤٨٠ پ. ز) لە لیدی بەرەو یۆنان کەوتەرێ. هەر فەرسەنگێك لە رێگای چوون و گەڕانەوەی لە لایەن مێژوونووسان تۆمار کراوە و باسی کراوە و ئەگەر ئێستا ئێمە وردی بنوێنین و بەو رێگایەدا بڕۆین هەڵە ناکەین، چونکە مێژوونووسەکان زۆر بە ئەمانەتداریەوە و وردتر لە هەر جوگرافی ناسێك لە کاتی باسکردنی سروشتی ئاسایی یۆنان و ئاسیای بچووك، ناوی لادێ و شار و شاروچکەکانیان نووسیوە. بەڵام لەبارەی ژمارەکان و هەندێ بابەتی هەخامەنشییەکان بە ئەنقەست هەڵەیان کردووە و بۆیە وشەی هەڵە بەکاردەهێنین، چونکە لەکاتی خوێندنەوەی پەرتووکی کەسێکی وەك (هیرۆدۆت یا گەزنەفۆن) دەردەکەوێت کە چەند زانا و دانا و سەنگین بوون و ئەو کەسانە ئەگەر بە ئەنقەست نەبێت ئەفسانە تێکەڵ بە مێژوو ناکەن.

هیرۆدۆت لە تەواوی مێژووەکانی خۆی، ڕستەکانی ژمارە کردووە تا رێگە لە ڕستەی نەخوازراو بۆ چوونە ناو مێژوو بگرێت و تەواوی ئەوانەی پاراگرافەکان ژمارە دەکەن ئەو بابەتە لە ئەو فێر بوون. کەواتە ئەگەر مرۆڤێکی بەو رادەیە زانا و سەنگین، زێدەرۆیی بکات یا ئەفسانە بهێنێتە ناو مێژوو، بە دڵنیاییەوە بۆ بچووك کردنەوەی ئێرانییەکان و بە ئەنقەست بووە.

بۆ نموونە بە وتەی هیرۆدۆت ئەو سەربازە ئیرانییەی لەگەڵ خەشایار هاتە یۆنان، کەسێکی تێك چرژاو بە سەر و پرچی نارێك و بەرگی کۆن بووە و بەڵام خوێندەواری هەبووە، لە کاتێکدا کە تەنانەت ئەفسەرە یۆنانییەکان خوێندەواریان نەبوو جگە لەوانەی خوێندبوویان (هەڵبەت بە وتەی هیرۆدۆت هەموو سەربازە ئێرانییەکان خوێندەوار نەبوون). هیرۆدۆت دەڵێت لەشکری خەشایار لە بەهاری ساڵی (٤٨٠ پ. ز) کەوتەرێ و لە سەر رێگای یۆنان و لە وڵاتی لیدی تەواوی دار میوەکانیان شکاندن بۆ ئەوەی میوەکانیان بخۆن، بەڵام هیرۆدۆت کاتێك ئەو درۆیە[٢] دەکات بیر ناکاتەوە لە وڵاتێکی وەك لیدی کە تا ڕادەیەك سارد بوو، لەو وەرزەدا

(٢) (وەك ئەمانەتداری وشەکانمان وەك خۆی وەرگێراوە و بە ڕای ئێمە بەکارهێنانی وشەی بەو شێوە بۆ کەسێکی مەزنی وەك هیرۆدۆت ناڕەوایە، وەرگێر بۆ کوردی.)

دارەکان بەریان نەگرتووە. ناوی وڵاتی لیدی نەماوە بەڵام ئەو خاك و وڵاتە ماوە و دیارە کە میوەکان لە هاوین و هەندێکیان لە بەهار پێدەگات و دیسان ئەگەر خەشایار لەو وەرزەدا کەوتبایەرێ، لەوانەبوو پەسەند بکرێت کە سەربازە ئێرانییەکان بۆ خواردنی میوە دارەکانیان شکاندبێت. بەڵام هیرۆدۆت خۆی دەڵێ: (خەشایار لە پازدە ڕۆژ دوای دەستپێکی بەهار بەرێکەوت) و لەو وەرزە لە تەواوی لیدی یەك داری میوە نەبوو.

دیسان ئەو مێژوونووسە یۆنانییە دەڵێت: (لە سەرەتای شەو تا بەرەبەیان خەشایار و ئەفسەرە بەرزەکانی سەرگرمی خواردنەوە و ڕابواردن دەبوون.) و لە شوێنی تر دەڵێت: (لە گەڵ خۆرهەڵاتدا، ئەو عارەبانەی پەیکەری هەتاوی دەگواستەوە دەکەوتەرێ و خەشایارشاش لە تەنیشتییەوە سواری ئەسپ دەبوو.)

گوێزەرەوەی هەتاو بریتی بوو لە عارەبانەیەك کە پەیکەری هەتاویان لەناویدا دادەنا و لە پێش دەسەڵاتدارە هەخامەنشییەکان دەڕۆیشت و ئایا دەکرێت پەسەندی بکەین کە سەردارێکی جەنگ کە فەرماندەی گشتی لەشکرە، بەو هەموو ئەرکانەوە کە فەرماندەیەکی گشتی هەیەتی لە ئێوارە تا بەیانی سەرگەرمی خواردنەوە و ڕابواردن بێت و لەگەڵ بەرەبەیانیش بتوانێت سواری ئەسپ ببێنت.

نامانەوێت بڵێین خەشایار و ئەفسەرەکانی لە مەیخۆر و خۆشگوزەرانەکان نەبوون، بەلام چوون کەسێك شەو تا بەیانی بخواتەوە، دەتوانێت بە ئاسانی سواری ئەسپ بێت و کارەکانی خۆی بەرێوە ببات و بابەتەکە ئەوەندە روونە کە پێویستی بە شیکردنەوە نییە. یەکەم مەرج بۆ بەرێوەبردنی لەشکرێك لە مەیدانی جەنگ یا لە هەر شوێنێکی تردا، ئەوەیە کە فەرماندەی گشتی خۆی لە خواردنەوە بپارێزێت و ئەو بنەمایە لە هەموو سەردەمەکاندا بەرپا بووە و تەنانەت لە جەنگی دووەمی جیهانی هەندێ سەرکردە بۆ ماوەی سێ ساڵ دەمیان بۆ مەی نەبردبوو.

بە وتەی هیرۆدۆت ئەو سەربازە ئێرانییەی لەگەڵ خەشایار چووە یۆنان، پیاوێکی ناشیرین و دواکەوتوو بوو و جلوبەرگی نارێك و پیس بوون، بەڵام ئەو پیاوە درۆزن نەبوو و بە پێی ئەو پەروەردەیەی لە منداڵییەوە هەیبوو، ڕێك دەڕۆیشت و سەری بەرز ڕادەگرت. ڕاستە بە فەرمانی خەشایار ئەسینای وێرانکرد، بەڵام چاوی لە ناموسی کەس نەکرد و ئاوەکانی پیس نەکردن و هیچ دارێکی نەشکاند. هیرۆدۆت ئەو سەربازە ئێرانیانەی لەگەڵ خەشایار چوونە ناو ئەسینا بە ترسنۆك باس کردووە و ناڵێت ئەو ترسنۆکانە چوون توانیان پیاوە ئازاکانی یۆنانی بشکێنێت و

تەنها بەڵگەی بۆ ئەو شکستە ئەوەیە کە لەشکری خەشایار ژمارەیان یەکجار زۆر بوو و لە سەرووی هەشت سەد هەزار سەرباز بوون.

(جۆن بارت) ئەمریکی باوەڕی وایە ئەو لەشکرەی لەگەڵ خەشایار چوو بۆ یۆنان، هەشتا هەزار کەس بووە و ئەو بیرۆکەیە دروست دێتە بەرچاو، چونکە جگەلەوەی گواستنەوەی لەشکری ئاوا گەورە لە ئاسیاوە بۆ یۆنان گرفتی گەورەی هەیە، خەشایار پێویستی بە گواستنەوەی هەشت سەد هەزار سەرباز بۆ یۆنان نەبووە.

بە هۆی لەشکرکێشی داریوشی یەکەم بۆ یۆنان وتمان کە دانیشتوانی دەوڵەتە شارە یۆنانییەکان بە یەکەوە نزیکەی دوو ملیۆن و نیو بوو کە ملیۆن و نیویکی لە مەقدۆنیا بوون و مێژوونووسەکان ئەو ژمارەیان پێ زۆرە و پێیانوایە دانیشتوانیان زۆر کەمتر بووە و ئێسپارت تەنها سی هەزار کەس و ئەسیناش تەنها هەفتا هەزار کەس بووە و بۆیە خەشایار بۆ جەنگی ئەو وڵاتە بچووکانە پێویستی بە لەشکری هەشت سەد هەزار کەسی نەبووە.

یەك لەو بابەتانەی بۆتە جێی گاڵتەجاری هیرۆدۆت، قەلغانە دارین و گەورەکانی ئێرانییەکان بووە کە بە باوەڕی ئەو نیشانەی دواکەوتوویی ئەوان بووە و لە کاتێکدا قەلغانی دارین سووکتر بووە و توانای پارێزگاری لە تیر و شمشیر و نێزە پتر بووە و لە گەرمای هاوینیشدا بە پێچەوانەی قەلغانە کانزاییەکان گەرم نەدەبوو و نەدەبۆوە هۆی ئازاردانی هەڵگری قەلغانەکە و کاتێك پێویستیان پێ نەمابایایە، فرێیان دەدا و هیچ خەمیان لە فرێدانەکەی نەدەخوارد.

هیرۆدۆت بە هۆی ئەو شەلوارەکانیانەوە کە لە شێوەی شلواری کوردی بوو، سەربازە ئێرانییەکانی بە ناشیرین باس کردووە و ڕاستە بە پێی پێوەرەکانی جوانی لە یۆنان، ئەوان ناشیرین بوون، بەڵام ئەوان بە هۆی باوەڕە ئایینییەکانیان کە مەزدا پەرست بوون، پێیانوابوو مەزدا هەموو نێرینەکانی لە مرۆڤ و ئاژەڵ بە جوانتر لە مێیینەکان ئافراندووە، بۆیە دانانی ریش و سمێڵیان بە جوان دادەنا.

سەربازە یۆنانییەکان شلواری درێژیان لەپێ نەدەکرد و شلواری ئەوان کورت و تا سەر جۆکیان بوو، قەیتانی پێڵاوەکانیان زۆر بە جوانی لە قاچیان دەئاڵاند و مووەکانی قاچیشیان زۆر بە جوانی دەتاشی، بۆیە قاچیان سپی دەردەکەت. تیشێرتە کورت و جوانەکانیشیان کە قەلغانیان لەسەر دەبەست، زۆر لە لبادی بەر سەربازە ئێرانییەکان جوانتر بوو و قەیتانی قەلغانەکانیش وەك قەیتانی پێڵاوەکانیان سپی بوو، چونکە ئەوان دەیانزانی چۆن چەرم بە ڕەنگی سپی لێ بکەن. سەربازە یۆنانییەکان کاسکێتی پەرداریشیان دەکردە سەریان و ئەویش

جوانتری دەکردن و هیرۆدۆت هەر یەك لەوان بە جوانترین لە جۆری خۆی دەناسێت. روخسار و دەرکەوتەی سەربازە یۆنانییەکان جوانتر بوو لە سەربازە ئێرانییەکان و لەوەدا وتەکانی هیرۆدۆت دروستبووە.

وشەیەکی تری نابەجێی کە لە مێژووەکانی هیرۆدۆت سەبارەت بە سەربازە ئێرانییەکان بەرچاو دەکەوێت ئەوەیە کە ئەوان وەك درندە و کەمتیارەکان لاشەی دوژمنەکانیان وەك وەحشییەکان لاشەکانی دوژمنیان پارچە پارچە دەکرد و هەر پارچەیەکیان بۆ شوێنێك هەڵدەدا، بۆ نموونە لاشەی کوژراوەکانی جەنگی تێرمۆبیلێ (کە دواتر باسی دەکەین) پارچەپارچە کرابوون و لاشەی لئۆنیداس پاشای ئێسپارت و فەرماندەی سەربازە ئێسپارتییەکانیش پارچە پارچە کراوە و پەرش و بڵاوکراوە. ئەمە بە هیچ شێوەیەك راست نییە و رێز گرتن لە مردوو یەکێکە لە نەریتەکانی ئێرانییە کۆنەکان.

خەشایار و پێش ئەویش داریوش، ڕکابەرەکانی خۆیان بە توندترین شێوە سزا دەدا و دوولەتیان دەکردنن یا پێستیان بە زیندوویی دادەماڵین، بەڵام بێ رێزییان نەدەکرد بەرانبەر بە لاشەی کوژراوەکان لە مەیدانی جەنگدا.

گۆڕی لئۆنیداس پاشای ئێسپارت و فەرماندەی سەربازە ئێسپارتییەکان لە یۆنان لەو شوێنەیە کە لەگەڵ خەشایاردا جەنگان و تا ئێستاش ماوە، لئۆنیداس و سێ سەد سەربازی ئێسپارتی کە لە گەڵ ئەودا کوژران بە ڕەزامەندی خەشایار لەو شوێنە ناشتران، کاریگەری ئازایەتی ئەوان بە سەر خەشایار بۆوە هۆکاری بەخشینی خەڵکی ئێسپارتی لە لایەن خەشایار شا و ئەگەر ئەوان لاشەکانیان لەت لەت کردبایە، چۆن ئێسپارتەکانیان لەبەر ئەوان دەبەخشی.

هەر ئەوکات یۆنانییەکان کەتیبەیەکیان لە سەر گۆڕی لئۆنیداس و سەربازەکانی نووسی کە دوای دوو هەزار و چوار سەد ساڵ هەر ماوە و هەر کەسێك بە تەرمۆپیلدا بڕوات دەیبینێت و لێی نووسراوە: (ئەی رێبوار، کاتێك گەیشتییە ئێسپارت بە هاونیشتیمانییەکانمان بڵێ ئێمە لە پێناو ئەنجامدانی ئەرکەکانمان لێرە کوژراین.)

ئەو کەتیبەیە بە ڕەزامەندی خەشایار لەو شوێنە نووسراوە و ئەگەر خەشایار لاشەی لئونیداس و سەربازەکانی لەت لەت کردبایە و پەرش و بڵاوی کردبان، ئایا ڕەزامەندی بۆ نووسین و دانانی کەتیبە لەو شوێنە دەکرد؟

رێسایەکی گشتی لە مەیدانی جەنگ هەبووە کە لایەنەکانی بەشدار لە جەنگ بێ رێزی بەرانبەر بە لاشەی کوژراوەکانی یەکتری نەکەن و ئەوەش دەگەڕایەوە بۆ ئەوەی هەر دوو لا لە

بە یەك رادە لە مەترسی ئازار و ئەزیەت و ترسی مەیدانی جەنگدا بوون و هەر سەربازێك دەیزانی سەربازی دوژمن وەك ئەو دەکەوێتە بەر کوشتن و ئازار و دوای کوژرانی سەربازی دوژمن، بێ ڕێزیان بەرانبەر بە لاشە مردووەکەی نەدەکرد، چونکە ئەگەر بێ ڕێزیان بەرانبەر لاشە مردووەکەی کردبایە، دوای کوژرانیان بێ ڕێزی بەرانبەر بە لاشەکەیان دەکرایەوە.

بێ ڕێزی بەرانبەر بە کوژراوەکان و پارچە کردنیان، بەردەوام لە لایەن ئەو کەسانەوە کراوە کە سەرباز نەبوونە و تەنانەت خێڵە وەحشییەکانی ئەفریقاش بێ ڕێزیان بەرانبەر بە لاشەی کوژراوەکان نەدەکرد و لەت لەتیان نەدەکردن، تەنها لە هەندێ لە خێڵەکان لە دوای سەر کەوتن لە جەنگدا ژنەکانیان کە بەشداری جەنگ نەدەبوون، دەهاتن و گوێ و لووت و هەندێ شوێنی مردووەکانیان دەبڕی و ملوانکەیان لێ دروست دەکردن و لە ملیان دەکرد.

پارچە کردنی مردووەکان لە مەیدانی جەنگدا کاری سەرباز نییە و خەشایارشا کە سەرباز بوو دەستووری پارچە کردنی سەربازە ئێسپارتییەکانی نەدەدا. ئەو وێڕای ئەوەی سەرباز بوو، پاشایەکی بەتوانای سەردەمی خۆی بوو و تێدەگەیشت کە بۆ پیاوێکی مەزن و بەهێز، زۆر ناشیرینە کە برواتە جەنگی لاشە بێ گیانەکان و پارچە پارچەیان بکات.

هەرچەندە هیرۆدۆت بە ئەنقەست هەندێ لە ڕووداوە مێژووییەکانی بە ئەنقەست نووسیوەتەوە، بەڵام لە مێژووەکانیدا زۆر خاڵی گرنگ و بە سوود هەیە سەبارەت بە لەشکرکێشی خەشایارشا بۆ یۆنان، تەنها بەداخەوە لە کاتی باسی هاتنی خەشایار بۆ ناو یۆنان لەپڕ ئەو بەشەی مێژوو تەواو دەبێت و هیرۆدۆت باس ناکات کە بۆ ئەو بەشەی تەواو نەکردووە و ئێمەش ئەمرۆ زانیاریمان نییە کە هیرۆدۆت بۆ ئەو بەشەی باس نەکردووە.

کاتێك خەشایار بەرەو یۆنان کەوتەرێ تەمەنی (٣٤) ساڵ بوو. ئاتووسا کە ژنی دووەمی داریوش و کچی کوروش بوو، هەشت کوری لە داریوش هەبوو و گەورەترینیان خەشایار بوو، ئارتۆبازان کوری یەکەم ژنی خەشایار بوو. ناوی براکانی خەشایار لە مێژووەکانی دنیادا هەیە و لە کاتی پێویست و بەپێی ڕووداوەکان ناویان دەبەین.

کاتێك خەشایار گەیشتە دەریا بڕیاریدا پردێك بۆ پەراندنەوەی لەشکرەکەی دروست بکات و لێی بپەڕێتەوە، ئەگەر هێزی دەریایی هەخامەنشی وەك یۆنانییەکان وتوویانە ژمارەی هەزار و پێنج سەد کەشتی هەبایە، خەشایار ناچار نەدەبوو پردێك بۆ مەبەستی پەرینەوەی سەربازەکانی دروست بکات. چونکە ئەگەر هەر کەشتییەك لە هەر کەرەتێك تەنها سەد سەربازی گواستبایەوە، چونکە پانی گەرووی داردانێڵ زۆر نییە، هێواشترین

کەشتی لەو ڕۆژە درێژانەی بەهاردا بەلانی کەم دوو کەرەتی دەکرد و بەم شێوەیە لەشکری داریوش ئاسانتر دەپەڕییەوە و پێویست نەبوو بۆ مەبەستی پەڕاندنەوەی لەشکرەکەی پرد دروست بکات و کاتی خۆی بەفیڕۆ بدات.

ئەو بابەتە گرنگە باس بکرێت کە شوێنی دروستکردنی پردی داریوش و پردی خەشایار بۆ ڕۆیشتن لە ئاسیا بۆ ئەورووپا بە هەڵە وەربگرین. داریوشی یەکەم کاتێك بۆ جەنگی سیتەکان دەرۆیشت لە گەرووی بۆسفۆر پردی دروستکرد و خەشایار لە (گەرووی داردانێڵ) پردی دروستکرد، بەڵام لە ڕاستیدا ئەو نەیدەتوانی سەربازەکانی لە ئاسیا بۆ ئەورووپا بە کەشتی بگوازێتەوە و ئەگەرنا پردی دروست نەدەکرد و دروستکردنی پردی خەشایار لە سەر گەرووی داردانێڵ سەختتر بوو لە پرد دروستکردنی داریوشی یەکەم لە سەر گەرووی بۆسفۆر. چونکەلە گەرووی داردانێڵ جووڵەی ئاو خێراترە لە گەرووی بۆسفۆر.

لە گەروەکانی داردانێڵ و بۆسفۆر بە بەردەوامی دوو ئاراستە بۆ ئاو هەیە کە یەکیان بۆ باشوور و ئەوەی تر بۆ باکوورە، جووڵەی ئاو لە باشوور بۆ باکوور لە کەنارەکانی ئەورووپایە و ئەوەی تریش لە کەنارەکانی ئاسیایە و بۆیە لە کۆنەوە هەر بەلەم یا کەشتییەك کە لەو گەروانە لە باشوور بۆ باکوور چوو بێت، لای چەپی گرتووە و ئەوەی بۆ باشووریش چووبێت بە پێچەوانەوە بووە و لە ئێستانبوڵ هەموو بەلەمەوانەکان دەڵێن ڕێگەی گەروەکان لە لای چەپەوەیە.

ئەو کەسانەی حەز بە ئەفسانە دەکەن و بە باشتر لە مێژووی دادەنێین، نووسیویانە ئەو کاتەی داریوش دەیویست لە داردانێڵ بپەڕێتەوە، تۆفان دەستی پێکرد و ئەویش بە رادەیەك تورە بوو کە فەرمانی کرد بە قامچی لێی بدەن تا تۆفانەکەی دەریا دامرکێنێتەوە و کەشتییەکان بتوانن لە گەرووی داردانێڵ بپەرنەوە و بۆ ئەوەی ئەو ئەفسانەیەش وەك ئەفسانەی هەڵگەڕاندنەوەی ئاوی فورات لە لایەن کوروش لە ناو بچێت، هەندێ باسی ئەو بابەتە دەکەین:

یەکەم هەرچەندە تۆفان بەهێز بێت لە داردانێڵ شەپۆلی بەهێز دروست ناکات، چونکە دۆخی جوگرافی و سروشتی داردانێڵ بە شێوەیەکە کە جەزیرەکانی هەر دوو لای ئەو گەروە، شێوە شەپۆل شکێنێکی سروشتیان دروستکردووە و ڕێگرن لە هاتنی شەپۆلە بەهێزەکانی دەریاکانی باکوور و باشوور بۆ ناو گەرووی داردانێڵ و هەرچەندە تۆفانەکان بەهێزتر بن، لە ئاوەکانی بەندەرەکان شەپۆلی بەرز دروست ناکەن، چونکە موج شکێنەکان ڕێگە لە

شەپۆلەکانی دەریا دەگرن و بۆیە کاتێك دەریا تۆفاناوی بێت، تێپەڕبوونی کەشتییەکان لە گەرووی داردانێڵ بێ مەترسیە.

دووەم خەشاریار نەیدەویست سەربازەکانی بە کەشتی لەو گەروە بگوازێتەوە تا لە هاتنی تۆفان لەو دەریایە تورە ببێت و بەڵکو دەیویست پرد لە گەروی داردانێڵ دروست بکات.

سێ هەم بە وتەی هیرۆدۆت ئەوکات پیاوانی پەنجا و دوو نەتەوە لە لەشکری خەشایاردا بوون و ناکرێت خەشایار ئەوەندە نەزان بووبێت کە بە قامچی لە دەریای دابێت، بە تایبەتی کە ئاو یەك لەو چوار ماددەیە کە پیرۆزن و لای ئێرانییەکان بایەخی زۆریان هەبوو. ئەوەی لای مێژوونووسەکانی کۆنی یۆنان وەك قامچی لێدان هاتۆتە بەرچاو یا ساختە کراوە، بریتی بووە لە (برسۆم[٣]) لێدان لە سەر ئاوی دەریا.

لای ئێرانییە کۆنەکان نەریت بووە کە کاتی پەرینەوە لە زێ یا گەروویەکی ئاوی (برسمیان) لە ئاوەکە داوە، ئەمەش وەك پیرۆز کردنی پەرینەوەکە بووە و بۆ لێدانی ئاوەکە نەبووە.

خەشایار بۆ دروستکردنی پردەکە سوودی لە ئەندازیارەکانی لەشکرەکەی و ئەندازیارە ناوچەییەکان وەرگرت و هەموان پێیانوابوو کە پردەکە لە شوێنی پانتر دروست بکرێت، چونکە تا گەروەکە تەسکتر بێت جووڵەی هەردوو ئاراستەی ئاو خێراتر دەبێت. دوای لێکۆڵینەوە و دیتنی چەندین نەخشە، خەشایار ئەو نەخشەیەی پەسەندکرد کە (ئابیدۆس) لە ئاسیا بە (سێس تۆس) لە ئەورووپا دەبەستەوە.

لە مێژووەکانی کۆندا هاتووە کە خەشایار بۆ دروستکردنی پردەکە، بەلەمەکانی خستە تەنیشت یەك و تەختەیان خستە سەریان و لەیەکتریان بەستنەوە و ماوەی حەوت شەو و ڕۆژ لەشکری خەشایار لە پەرینەوەدا بوو. بەڵام لە ڕاستیدا لە جیاتی بەلەم، گەمیی سەر تەختیان بەکار هێنا کە هەریەکەیان چل تەن قورساییان بوو. ئەندازیارەکان بە ڕادەیەك بە وردی کاریان کرد کە پێش تەواو بوونی پردەکە پاشای هەخامەنشی دەیزانی کە هەر گەمییێك چەندە قورسایی ڕادەگرێت و کۆی پردەکەش چەند قورسایی ڕادەگرێت. ئێمە وابیردەکەینەوە کە لێکدانەوە ئەندازەییەکان لە بینا و پرد

---

(٣) (برسۆم وشەیەکی فارسیە و بریتییە لە چەند قەدێکی رووەك کە لە ئێرانی کۆن لە کاتی رێورەسمە ئایینییەکان بەکار دەبرا و ئێمە ئەو قەدە رووەکانەمان لە تەواوی سککە کۆنەکانی نیشتیمانی پێشینمان بینیوە و ئەگەر ئێستا سککەیەکتان لەبەر دەستە سەیری بکەن و دەبینن ئەو دەستە رووەکە کە دەورەی شێر و هەتاوی ناو پارەکە یا نرخی پارەکیداوە، ماوە و ئەوە بە برسۆم ناو دەبرێت. زەبیحوڵڵا.)

و... هتد لە داهێنانەکانی ئەو سەردەمەیە، بەڵام لە سەردەمانی باستاندا کاتێك ئەو کارانەیان دەکرد، هەموو لایەنە ئەندازەییەکانیان ڕەچاو دەکرد.

لێکۆڵەری سەردەمی ئەمریکی (جوون پارت) کە مێژووی تەرمۆپیلی نووسیوەتەوە، دەڵێت: سێ سەد گەمیی سەر تەخت کە هەریەکەیان چل تەنی توانا هەبوو لە تەنیشت یەکتر دانا و نێوانی هەر دوو گەمی سێ مەتر بوو و پانی گەمییەکانیش چوار مەتر بوو.

جوون پارت بیرۆکەی هەندێك مێژوونووس ڕەتدەکاتەوە کە پێیانوایە پردەکە (٨٠٠ م) درێژ بووە و دەڵێت بە پێوەرەکانی ئەمڕۆ درێژی ئەو پردە بە لانی کەم (٢١٠٠ م) بووە، چونکە سێ سەد گەمییان لە داردانێڵ بەکار هێناوە و هەر گەمییێك چوار مەتر پان بووە و پانی گەمییەکان دەکاتە هەزار و دوو سەد مەتر و مەودای نێوانیشیان سێ مەتربووە کە ئەویش نۆ سەد مەتر دەکات، بە گشتی دوو هەزار و سەد مەتر دەکات. هەر کەسیش ڕەخنەی لەو پێوانەیە هەیە، دەتوانێت بچێت و لە نێوان (ئابیدۆس و سێس تۆس) پانی داردانێڵ بپێوێت و تا بزانێت پانی ئەو گەروە لە ئەو شوێنە چەندە.

گەمییەکانیان بە شێوەیەك دانابوو کە درێژی گەمییەکان کەوتبۆوە ئاراستەی باکوور بۆ باشوور و پانیان لە ئاراستەی ڕۆژهەڵات بۆ ڕۆژئاوا بوو. قووڵی ئاو لە شوێنە جیاجیاکانی داردانێڵ لە یەکتر جیا بوو و لەو شوێنی خەشایارشا پردەکەی دروست دەکرد، قوولی گەروەکە بە پێوەری ئەمڕۆ بریتی بوو لە دوو سەد مەتر.

لەوانەیە پرسیار بکرێت خەشایار کە پردی لەسەر گەروی داردانێڵ دروست دەکرد، چ کاری بە قووڵی ئەو دەریایە بوو؟ لە وەڵامدا دەڵێین چونکە ناچاربوو بۆ ڕاگرتنی گەمییەکان لەنگەر بخاتە ناو ئاوەکە تا جێگیریان بکات و ئەگەر ئەوکارەی نەکردبایە ئەو شەپۆلانەی ئاو یا جوولەی ئاو لە لایەك بۆ لایەکەی تری دەبرد و لە ماوەیەکی کەمدا لەناوی دەبرد.

ئێستا هیچ کەشتیوانێك لە قولایی دوو سەد مەتردا کەشتییەکەی ڕاناگرێت و (لەنگەر ) ناخات، چونکە بۆ لەنگەری لەو چەشنە پێویستی بە زنجیری ئەستوور کە دوو سەد مەتر بێت هەیە و ئەو زنجیرەش زۆر قورسە و لەوانەیە هەڵکێشانەوەی ئاسایی نەبێت و بزوێنەری تایبەت بە هەڵکێشانەوەی ئەو لەنگەرە و زنجیرە ئەو توانایەی نابێت تا هەڵیبکێشێتەوە، بەڵام خەشایار ناچاربوو بۆ هەر گەمییێك دوو لەنگەر لە دواوە و لە پێشەوە دابنێت تا زەربەکانی ئاو و بەردەوامی جووڵەی شەپۆلەکان نەبنە هۆی لار بوونەوەی گەمییەکان و لەنگەرەکانیش بە پەتی ئەستوور و بەهێز ببستنەوە، تا پردەکە لە شەپۆل و کاریگەریەکانی شەپۆلەکان بپارێزێت.

جوون پارت دەڵێت: گەمییەکان دەبوایە بە شێوەیەك لە تەنیشت یەکتر دابندرێن کە سەرەتا و کۆتاییان لە باکوور و باشوور بێت و هەریەکەیان لەگەڵ یەکتر لە پشتەوە تەریب بن و مەودای نێوانیشیان لە سێ مەتر نە کەمتر و نە زوورتر بێت.

ئەو گەمیانە دەبوایە لە شوێنێك دابنرێن کە ئاو لە جووڵەدا بووایە و کاتێك دەیانەویست گەمییەکە بێ جووڵە بکەن، دەبوایە هەر دوو لەنگەر بە یەکەوە هەڵدەنە ناو ئاو تا گەمییەکە خوار نەبێت و گەیشتنی لەنگەرەکانیش بۆ ژێر ئاو ماوەیەکی دەویست. ئەو کەسانەی لەنگەرەکانیان دەهاویشت، دەبوایە بە وردی پێوانەی بکەن تا لەنگەرەکە لەو شوێنەی پێویستە بگاتە ژێر ئاو و بزانن ئەکاتەی لەنگەرەکە مەودای پێویستی بریوە دروست ئەوکاتە بێت کە گەمییەکەی بێ جووڵە کردووە و بەو شێوەیە گەمییەکەش لەو شوێنەی پێویستە بوەستێت و ئاشکراشە کە هەردوو لەنگەری پشت و پێشەوە بەیەکەوە دەبوایە هەڵبدرایە ناو ئاو و بە پێچەوانەوە گەمییەکان لار دەبوون.

چونکە لە ناوەڕاستی داردانێڵ هیچ جووڵەیەکی ئاو بە ئاراستەکانی باکوور و باشوور نەبوو، بۆیە لە ناوەڕاستی پردەکە بۆ هاتووچۆی کەشتییەکان ڕێگەیەکیان هێشبۆوە و گەمییەکانی ئەو بەشەی پردەکە لەنگەریان نەبوو و کاتێك کەشتییەك ویستبای تێپەر ببێت، گەمییەکانی ئەو بەشەیان بۆ تەنیشتەکان دەجووڵاند و دواتر بۆ شوێنی خۆیان دەگەڕاندنەوە.

جوون پارت دەڵێت: ئەو کەشتی و گەمیانەی دەیانەویست لە باکوور بۆ رۆژئاوا و لە باشوور بۆ باکوور برۆن، کاتێك دەگەیشتنە پردەکە دەبوایە بوەستن تا نۆرەیان دێت، چونکە بەریوەبەرانی پردەکە نەیاندەتوانی گەمییەکان بۆ هەر کەشتییەك لابدەن و دووبارە دایبنێنەوە و چاوەروان دەبوون کە ژمارەیان بگاتە سەد دانە و ئەوجار ڕێگەیان بۆ دەکردنەوە.

بە وتەی جوون پارت پانی ئەو پردە حەوت مەتر بووە و هەردوو تەنیشتەکانی پەرژین کرابوو و دارەکانی سەر پردەکە زۆر بە ڕێکی داندرابوون تا ئەسپ و عارەبانەکان لە کاتی رۆیشت لە دوو لاتەنیشتەکانەوە نەکەونە خوارەوە و بە رادەیەکیش بە وردبینییەوە دارەکانی سەر پردەکەیان بەیەکەوە لکاندبوو کە کاتێك عارەبانە و ئەسپ و پیادەکان دەرۆیشتن، هەر وەك ئەوە بوو لە جادەیەکی تەخت و ڕێك برۆن و سمی هیچ ئەسپێك و تایەی هیچ عارەبانەیەك دووچاری کەند و قۆڵت نەدەهاتن، لە شەودا پردەکە بە مەشخەڵەکان رووناك دەکرایەوە و بە شەویش هاتووچوو لە سەر پردەکە وەك رۆژ هەبوو، پردەکە زۆر بە باشی دروستکرابوو و ئەگەر یۆنانییەکان لە دوای گەڕانەوەی هەخامەنشییەکان لەناویان نەبرد بووایە، تا سەردەمانێکی زۆر

دەمایەوە و یۆنانییەکان بە تایبەتی پردەکەیان لەناو برد چونکە رێگر دەبوو لە کەشتیوانی ئازادانە لە گەروی داردانێلۆ.

تا ئەوکاتەی پردەکە لە کەنارەکانی ئەورووپا نزیك نەببۆوە، تا ڕادەیەك بە ئاسانی دروست دەکرا و جگە لە گرفتە تەکنیکییەکان، هیچ گرفتی تر بۆ پردەکە نەدەهاتە پێش. بەڵام بە نزیك بوونەوەی لە ئەورووپا، یۆنانییەکان بۆ ئەوەی رێگربن لە دروستکردنی ئەو پردە، بە بەردی مەنجەنیق و بە تیر و نێزە کەوتنە گرفت نانەوە و بە ڕادەیەك پرد سازەکانیان دایە بەر بەردان کە بەردەوامبوونیان لەکار ئەستەم بوو و ماوەی دوو رۆژ کاری پردەکە وەستا.

پێشتر وتمان خەشایار نەیدەتوانی لەشکرەکەی بە کشتی بپەڕێنێتەوە، بەڵام لەبەر باسکردنی پردەکە نەکەوتینە سەر باسکردنی هۆکاری ئەو بابەتە. خەشایار لەشکرێکی گەورەی دەریایی دامەزراند کە یۆنانییەکان بە هەزار و پێنج سەد کەشتی باسیان کرد، بەڵام دووچاری چەکی تازەی یۆنانییەکان بۆوە کە بریتی بوو لە کەشتییەکی باریك و درێژ کە سەری پێشەوەی تیرێکی گەورەی ئاسنی هەبوو و ئەو کەشتییە ئەوکات کاری کەشتی شکێنەکانی ئێستای دەکرد.

ئاریان دەڵێت: کارەکانی پاشای هەخامەنشی کە بۆ بەهێز کردنی لەشکری دەریایی خۆی دەیکرد، ئاشکرا بوون و دەگەیشتنە یۆنانییەکان و ئەوان دەیانزانی ئەو دەیەوێت هێزێکی دەریایی گەورە دروست بکات تا بە پاڵپشتی ئەو هێزە هێرش بکاتە یۆنان و لەشکری خۆی بگەیێنێتە خاکی ئەوان. چونکە پاشای هەخامەنشی رێگایەکی نەبوو جگە لەوەی لە رێگەی دەریاوە بێت، بۆیە یۆنانییەکان هەوڵیاندا هێزی دەریایی خۆیان بەهێزتر بکەن و بۆ نوقم کردنی کەشتییەکانی خەشایار، کەشتی سووك و خێرای تایبەتیان دروستکرد کە لە پێشەوەی لووتێکی ئاسنین یا قەڵایی بەهێزی هەبوو.

لە هەریەکە لە کەشتییە سووك و خێراکانی یۆنانی کۆمەڵێك سەربازی گیان فیدا و هاوشێوەی فرۆکەوانە کامیکازەکانی ژاپۆن (لە دوایین ساڵی جەنگی دووەمی جیهانی) هەبوون و گیان فیدا بوون، کاریان ئەوە بوو کە بە خێرایی زۆر خۆیان بە کەشتییەکانی پاشای هەخامەنشیدا بکێشن تا بە یەك زەربە کەشتییە سەرباز هەڵگرەکە بشکێنن و ئەو کەشتییە نوقمی ئاو بکەن.

ئاریان دەڵێت: دەریا پیماکانی یۆنانی بە بەردەوامی ئاگادار بوون و هەستیان ڕادەگرت تا بزانن کەی کەشتییە سەرباز هەڵگرەکانی هەخامەنشی دەجووڵێن، تا خۆیان پێدا بکێشن و

نوقمیان بکەن. ئەوانەی لە کەشتییە بە لووتەکانی یۆنان بوون بیریان لە ژیانی خۆیان نەدەکردەوە و تەنها دەیانەویست کەشتییە سەرباز هەڵگرەکانی خەشایار نوقم بکەن.

ئەو رۆژەی خەشایار لە لیدی کەوتەرێ بڕیاریدابوو کە لەشکرەکەی بە هۆی کەشتییەکانی لە دەریا بپەڕێنێتەوە، بەڵام هەواڵیان پێگەیاند کە یۆنانییەکان بۆ نوقم کردنی کەشتییە سەرباز هەڵگرەکانی ئەو، کەشتی تایبەت و لووتداریان دروستکردووە و خەشایار بۆ بەرگری لە بەرانبەر ئەو کەشتیانە هیچ کەشتی تایبەتی نەبوو و هیچ یەك لە کەشتییە جەنگییەکانی ئەو توانای ڕکابەریان لەگەڵ ئەو کەشتییە تازانەی یۆنان نەبوو و لە کاتێکدا کە کەشتی جەنگی بۆیە دروست دەکرێت تا لەگەڵ کەشتییەکانی تردا بجەنگێت.

دۆخی خەشایار لەوکاتەدا لە دۆخی هیتلەری سەرۆکی ئاڵمان دەچوو کاتێك لە جەنگی دووەمی جیهانی دەیەویست هێرش بکات بۆ بەریتانیا، ئەو دەیزانی ئەگەر بیەوێت سەربازەکانی خۆی بە هۆی کەشتییەوە بگەیێنێتە ناو بەریتانیا، لەوانەیە بە هۆی هێزی دەریایی بەریتانیاوە نەتوانێت تەنانەت یەك سەرباز بگەیێنێتە ناو خاکی بەریتانیا.

خەشایارشا دەیزانی ئەگەر بە هۆی کەشتی سەرباز هەڵگرەکانی هێزەکانی بپەڕێنێتەوە بۆ یۆنان، لەوانەیە یەك سەربازی بە زیندوویی نەگاتە ئەوبەری ئاو و ناو خاکی یۆنان و هەموویان نوقم دەبن.

پانی ئەو ئاوەی فرەنسا و بەریتانیا لێك جیا دەکاتەوە زۆر بوو و هیتلەر نەیتوانی پرد لە سەر ئەو ئاوە دروست بکات و لەشکرەکەی لەو پردە بپەڕێنێتەوە، بەڵام پانی داردانێڵ کەم بوو و خەشایار توانی پرد لە نێوان کەنارەکانی ئابیدۆس لە ئاسیا و سێس تۆس لە ئەورووپا دروست بکات.

یۆنانییەکان کەشتی تایبەتیان بۆ نوقم کردنی کەشتییە سەرباز هەڵگرەکانی هەخامەنشی و لەناو بردنی سەربازەکانیان دروستکرد و لەوانەیە ئەو پرسیارە بە میشکماندا بێت کە بۆچی ئەو خۆبەخشانەی لە کەشتییە بە لوتەکانی یۆنانیدا بوون، رێگریان لە دروستکردنی پردەکە نەکرد و رێگەیندا تا هەخامەنشییەکان هەر دوو کەناری ئاسیا و ئەورووپا بە هۆی پردەکە بەیەکەوە ببەستنەوە؟

ئاریان وەڵامی ئەو پرسیارەی داوەتەوە و دەڵێت: لە تەواوی ئەو ماوەیەی پردی داردانێڵ دروست دەکرا، کەشتییە جەنگییەکانی هەخامەنشییەکان لە هەر دوو لای باکوور و باشوور لە شوێنێك دەوەستان و نەیان دەهێشت کەشتییە بە لووتەکانی یۆنان یا هەر کەشتییەکی تر ببێتە

مایەی کێشە بۆ پردسازەکان بتوانێت بگاتە ناو ئەو ناوچەیە و کاتێك یەك لەو کەشتیانە بە هۆی کەشتییە یۆنانییەکانەوە نوقم دەکرا، بەپەلە کەشتییەکی تر شوێنی دەگرتەوە.

لێرە وتەیەکی گەزنەفۆن مێژوونووسی ناسراوی یۆنان هەیە کە لەگەڵ عەقڵمەندیدا کۆکە و بریتییە لە: خەشایار دەیتوانی بەبێ چاك کردنی پرد لە داردانێڵ بپەڕێتەوە و ئەو پردەی زیاتر بۆ ناوبانگ دروستکرد تا بگوترێت ئەو وڵاتانی ژێر دەستی خۆی لە ئەورووپا بە وڵاتانی ژێردەستی لە ئاسیا بەستەوە، چونکە خەشایار دەیەویست دەوڵەتە شارە یۆنانییەکان بکاتە بەشێك لە خاکی ژێر دەسەڵاتی خۆی.

هۆی ئەوەی ئەو وتەیەی گەزنەفۆن بە عقلانی دەزانین ئەوەیە کە خەشایار وەك چوون کەشتییە جەنگییەکانی بۆ پارێزگاری لە پردەکە ە هەردوولای باکوور و باشووری داردانێڵ دانابوو، دەیتوانی ئەوان بۆ پارێزگاری لە پەرینەوەی سەربازەکانی بە هۆی کەشتییە سەرباز هەڵگرەکانییەوە دابنێت و ناوچەیەکی هێمن بۆ پەرینەوەیان دابین بکات و بەم شێوەیە تا دوایین سەربازی لەشکرەکەی لە ئاسیاوە دەچۆوە ئەورووپا و بە هەمان شێوە کە لە کاتی دروستکردنی پردەکە رێگریان کرد لە گەیشتنی کەشتییە بە لووتەکانی یۆنانی بۆ پردەکە، بۆیە دەکرێت بگوترێت وتەی گەزنەفۆن لە بارەی ئەوەی ئەو پردە تەنها بۆ بابەتە سەربازییەکان نەهاتۆتە کایەوە و خەشایار بە دروستکردنی ئەو پردە رۆژهەڵات و رۆژئاوای لەیەك بەستەوە. ئەو بابەتانەمان خستەروو تا هۆکارەکانی دروستکردنی ئەو پردە بزانین و ناکرێت بگوترێت کە ئەگەر بە ئاسانی لەشکری خەشایار توانیبوایە بە کەشتی لە ئاو بپەڕێتەوە بە بێ بوونی پرد، تەنها بۆ ناو و ناوبانگ ئەو هەموو ناخۆشی و سەختییەی دروستکردنی پردی لە ئەستۆ نەدەگرت یا خود لە دوای سەرکەوتن بەسەر دوژمندا و لە ئاسوودەیی ئەو پردەی بۆ ناو بانگ دروست دەکرد.

نابێت بڵێین دوای (٢٥) سەدە نازانین بۆچی خەشایار بڕیاری دروستکردنی پردی داردانێڵیدا، چونکە ئەو هۆکارانەی سەرکردەیەکی سەربازی ناچار بە بڕیار وەرگرتن دەکات لە رابردوو و لە ئێستا هەریەکە و ئەو هۆکارانەی سەرکردەی کارتاژەکان (ئانی باڵی) ناچارکرد تا رێگاکەی بگۆڕێت و لە ئیسپانیاوە بچێتە ناو رۆم (ئیتالیا)، هەر هەمان ئەو هۆکارانەش بوونە هۆی گۆڕینی رێگای ئاڵمانەکان و لە دوو جەنگی یەکەم و دووەمی جیهانی لە بلژیکەوە چوونە فەرەنسا. هەرچەندە ماوەی نێوان جەنگی کارتاژەکان و رۆمەکان لەگەڵ ئاڵمانەکان لە جەنگە جیهانییەکاندا نزیکەی (٢٢) سەدە بوو، بەڵام هۆکارەکان هەمان ئەوە بوو کە پێویستە لەو

شوێنەوە هێرش بکرێتە سەر دوژمن کە تیایدا ئامادەی بەرگری نییە. ئەمڕۆ بۆ نموونە ئەگەر سەردارێك بیەوێت لە گەروی جەبل تارق لە نێوان ئەفریقا و ئەورووپا لەشکرەکەی بپەڕێنێتەوە، ئەوەندە کە بتوانێت لە کەشتی بۆ ئەو مەبەستە سوود وەردەگرێت و ئەگەر نەیتوانی بە کەشتی لە گەروەکە بپەڕێتەوە، هەوڵ دەدات پرد دروست بکات. لە گەڵ ئەوانەدا عقل و بابەتی ستراتیژی پێمان دەڵێن کە خەشایارشا توانای پەڕاندنەوەی لەشکرەکەی بە هۆی کەشتییەوە نەبووە، بۆیە پردی لەو ناوچەیە دروستکردووە.

ئەگەر لە بارەی هۆکارەکانی سازکردنی پردەکە جیاوازی لە بیروڕاکان هەبێت، لە بارەی هونەری دروستکردنی ئەو پردە هیچ جیاوازی نییە و هەموو لێکۆڵەر و مێژوونووسەکان بە شاکارێکی هونەری گەورەی دونیای کۆنی دەزانن.(٤)

هەردوو ئاراستەی پێچەوانەی ئاو هیچ کاریگەری لە پردی داردانێڵ نەبوو و عارەبانە جەنگییەکانیش کاتی تێپەڕبوونیان هیچ کێشە نەبوون بۆی. پردەکە بەردەوامبوو لە دروستکردن تا گەیشتە نزیك سێس تۆس و بە وتەی مێژوونووسان لەوێ یۆنانییەکان بە تەواوی ئەو چەکانەی هەیانبوو کەوتنە ڕێگرتن لە دروستکردنی پردەکە و بە وتەی ئەوان لەو شوێنە جەنگێکی سەیر لە نێوان سەربازەکانی هەردوولادا کە بە کەشتی خۆیان گەیاندبوو ئەو شوێنە، دروستبوو.

یۆنانییەکان دەیانزانی ئەگەر پردەکە تەواو ببێت، هەخامەنشییەکان دەوڵەتە شارەکانیان دەخەنە بەر هێرش، زۆر مەردانە بەرگریان دەکرد و هەرچەندە لە تەواوی مەنجەنیقەکانی

---

(٤) (لە ساڵی ١٩٥٥ زایینی لە گۆڤاری لایڤی ئەمریکیدا زنجیرە وتارێك لە بارەی پەیوەندییەکانی ئێران و یۆنان نووسرا کە بەشێکیان تایبەت بە لەشکرکێشی خەشایار بۆ یۆنان بوو، تابلۆیەك لە گەڵ ئەو باسە بڵاوکرایەوە کە جێگەی ڕامان بوو و لە تابلۆکەدا سەربازانی خەشایاری نیشان دەدا کە لە پردی داردانێڵ دەپەڕنەوە و تابلۆکە بە ڕەنگە سروشتییەکانی کاتی خۆی وێنە کرابوو. گۆڤارەی لایڤ نووسی بووی درێژی و پانی و بەرزی و ڕەنگەکانی پردەکە و جلوبەرگی سەربازەکان و چەکەکانیان و ... هتد لە لایەن گۆڤارەکەیان دراوە بە وێنەکێش تا وێنەی بکات. ئەو گۆڤارە پشتراستی کرد بۆوە کە ئەو پردە لە شاکارەکانی کۆن بووە و ئەگەر ئێستا دروست بکرێتەوە بەو جوانییە نابێت. ئەو پردە تەنها بەهێز و پان و درێژ و جێگیر نەبوو، بەڵکو جوانیش بوو و لە کاتی شەودا کاتێك مەشخەڵەکانی سەر پردەکە پێدەکرا و وێنەکەیان لە ناو ئاودا دەدرەوشایەوە و بە وێنەی ڕێگایەکی نورانی لە نێوان دوو کیشوەری ئاسیا و ئەورووپا دەردەکەوت و جوانی پردەکەی زیاتر دەکرد لە ئەوەی لە ڕۆژ هەبوو. زەبیحوڵڵا.)

هەخامەنشی کە لە سەر کەشتییەکان بوون، بەردیان بەسەردا دەباری، بەڵام پاشەکشەیان نەدەکرد و هەخامەنشییەکان ناچاربوون دوایین سەربازی یۆنانی کە لە ئەوێ بوو بکوژن تا بتوانن پردەکە تەواو بکەن.

بەڵام کەتزیاس ئەو جەنگ و بەرگریە بە راست نازانێت و پێیوایە پاشای وڵاتی (خێرسۆنز) بەرانبەر یۆنانییەکان ناپاك بوو و رێگەی بە خەشایاردا تا پردەکە تەواو بکات. خێرسۆنز یەك لە دەوڵەتە شارەکانی یۆنان بوو کە ئێستا (گالی پوولی) شوێنی گرتووتەوە و سێس تۆس کە کۆتایی پردەکەی لێ بوو دەکەوتە ئەو وڵاتەوە. دوور نییە وتەی کەتزیاس ڕاست بێت، چونکە ئەگەر خەشایار پێشبینی جەنگی قورسی لە سێس تۆس کردبایە، لە جیاتی ئەو جەنگە بۆ دروستکردنی پردەکە ئەنجام بدات بۆ دروستکردنی سەربازگەیەك لەو سێس تۆسی ئەنجام دەدا تا ببێتە ناوەندی جەنگ لەگەڵ یۆنان.

بە زانینی ئەوەی خەشایار لە کاتی هێرش بۆ یۆنان زۆری سوود لە کێشە ناوخۆییەکانی یۆنانییەکان وەرگرت، ئەو وتەیەی کەتزیاس دروست دێتە بەرچاو و ئەگەر یۆنانییەکان کێشەیان لەناو خۆیاندا نەبوایە، لەوانەیە خەشایار توانای هێرشی نەبوایە و یا نەیتوانی بایە سەرکەوێت.

کاتی هێرشی خەشایار بۆ یۆنان، پاشای هەندێ لە وڵاتەکان هیچیان نەکرد و تەنها چاوەروان بوون و لەوانەشە پاشای خێرسۆنێزیش یەك لەو پاشایانە بووبێت و بە هۆی ئەوەی هیچی نەکرد پردی داردانێڵ تەواو بوو. بەڵگەیەکی نزیك بۆ ڕاستی وتەی کەتزیاس لە بارەی خێرسۆنێز ئەوە بوو کە دوای گەیشتنی لەشکری خەشایار بۆ ناو خاکی یۆنان، ئەوان دووچاری جەنگ و پێکدادان نەبوون.

ئەگەر پاشای خێرسۆنز لەگەڵ پاشای هەخامەنشی یەکگرتوو نەبوایە، دوای ئەوەی سەربازەکانی هەخامەنشی هاتنە ناو خێرسۆنز، دەبوایە جەنگی سەخت لە نێوان هەخامەنشی و یۆنانییەکان روویدابووایە و  روونەدانی جەنگیش بەڵگەیە بۆ ئەوەی پاشای ئەو شوێنە دەستی لەگەڵ هەخامەنشییەکان تێکەڵ کردووە و هۆکار بووە بۆ ئاسان بوونی پەرینەوەی ئەوان لەو شوێنە تەنانەت ئەگەر جەنگی گەورەشی لێکرابێت.

## لەشکری هەخامەنشی لە یۆنان

ئەوەی لەو بەشەدا هاتووە، پوختەیەکە لە دووهەزار لاپەڕە لە لێکۆڵینەوەکانی پرۆفیسۆر (ئاندریۆ رۆبێرت بارن) مامۆستای مێژووی یۆنان لە زانکۆی (گلاسکۆ) لە بەریتانیا کە لەوانەیە بەرهەمی هەموو لێکۆڵینەوەکانی ناوبراو بێت لە تەواوی تەمەنی. ئەو یەك لە لێکۆڵەرەکانی هاوچەرخی مێژووی کۆنی ئێرانە و وەك هەریەکە لە (گێرشمەن، ماریژان مۆلە، هێرتزفێلد، ریچارد فرای و ئۆلەم ئۆستید) کوێرانە پەیرەوی لە مێژوونووسە کۆنەکانی یۆنان نەکردووە، ئەوان تێکۆشاون تا بە پێی ئەو بەڵگەنامانەی لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەم لە ژێر خاك دەرهێندراون و بە سوود وەرگرتن لە مێژووە کۆنەکان، مێژوو بنووسنەوە.

ئەو لێکۆڵینەوە قەبارە گەورەیەی ئەو مامۆستایە لە بارەی جەنگەکانی خەشایارشا و سەرکردەکانی تری هەخامەنشی لە گەڵ یۆنان، لە ڕاستیدا گەنجینەیەکی پڕ لە زانیارییە کە تا ئێستا ئێمە لێیان بێ ئاگا بووین و هۆکاریش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی ئێمە سەرچاوە سەرەکییە یۆنانییەکانمان بەردەست نەبوون و مێژوونووسە ئەورووپییەکانیش، یۆنانییەکانیان بە نەتەوەیەکی پێشکەوتوو و شارستانی و ئێرانییەکانیان بە وەحشی زانیوە و هیرۆدۆتیان بە خوای مێژوو ناساندووە و پێیان وابووە نووسینەکانی بریتین لە پەرجوو(وەحی) و پێویستە بێ مەرج پەسەندبکرێن، بەڵام پرۆفیسۆر بارن دەڵێت:

(هیرۆدۆت دوو خاڵی لاوازی هەبووە، یەکەم ئەو تەنانەت بە ئەندازەی سەربازێکی ئاسایی لە کاروباری جەنگی نەزانیوە و دووەم ئەو هۆکاری ڕووداوە مێژووییەکانی نەنووسیوەتەوە و مێژوویەك کە هۆکاری نەنووسرابێت هیچ جیاوازی لە گەڵ ئەفسانەدا نییە، چونکە سوودی لێ وەرناگیرێت.)

دواتر پرۆفیسۆر بارن دەڵێت: هیرۆدۆت ژمارەی ئەو سەربازانەی لەگەڵ خەشایاردا هاتوونەتە یۆنان بە (٥٢٨٣٢٢٠) پێنج ملیۆن و دوو سەد و هەشتا و سێ هەزار و دووسەد و بیست نەفەر دیاریکردووە و دەڵێت جگە لەو سەربازە یۆنانیانەی لە لەشکرەکەی بوون لە بیست و نۆ نەتەوە سەربازی هێناوە، هەر یەکە لەو نەتەوانە لەشکرەکەیان شەست هەزار کەس بووە و کۆی دەکاتە (١٧٤٠٠٠٠) یەك ملیۆن و حەوت سەد و چل هەزار سەرباز، سێ سەد هەزار سەربازی یۆنانیشی هەبووە.

بە وتەی هیرۆدۆت، خەشایارشا هەشتا هەزار سەربازی سوارەی هەبووە، هەروەها بیست هەزار وشتر سوار لە خزمەت لەشکرەکەی بوون و دەهەزار کەسیش گاردی جاویدی تایبەت بە خۆی بوون. هیرۆدۆت ژمارەی کارگوزارە دەریاییەکانی خەشایار بە (٥٤١٦١٠) پێنج سەد و چل و یەك هەزار و شەش سەد و دە کەس دیاریکردووە و سەرجەمی ئەو ژمارانە دەبێتە (٢٦٩١٦١٠) دوو ملیۆن و شەس سەد و نەوەد و یەك هەزار و شەش سەد و دە کەس. ئەگەر ئەو ژمارانە هەموویان ڕاست بن دیسان بۆ ژمارەی یەکەم کە (٥٢٨٣٢٢٠) کەسە زۆری دەمێنێت.

بەڵام هیرۆدۆت دەڵێت لە ناو لەشکری خەشایاردا دوو ملیۆن و شەش سەد هەزار ژن و شوفێر و خزمەتکار هەبووە و ژمارەکە دوو بەرانبەر زیاد دەکات و دەیگەیێنێتە (٥٢٨٣٢٢٠) کەس و بیست و چوار سەدەیە ئەورووپییەکان ئەو ژمارانەیان وەك پەرجوو وەرگرتووە و دەڵێن نیوەی ئەو ژمارەیە لەگەڵ خەشایاردا چوونە یۆنان و نیوەیان سەربازی تەواو بوونە.

بە پێی نووسینەکانی پرۆفیسۆر بارن، ژنراڵی بەریتانی (سێر فێردریك مۆریس) لە ساڵی (١٩٢٠ ز) لە گەڵ دوو هەزار سەرباز دوای گەیشتنی بۆ یۆنان، هەمان ڕێگای بڕیوە کە خەشایار پیایدا ڕۆیشتووە بۆ ئەسینا و دەڵێت: (هەرچەندە ئێمە دوو هەزار کەس زیاتر نەبووین و لە هەندێ شوێن کەوتینە کێشەی بێ ئاوی و ناچار ئاوی پێویستمان بۆ خواردنەوە لە گەڵ خۆمان هەڵگرت.) کەواتە خەشایار چوون توانی لەشکرێکی پێنج ملیۆن کەسی لە وەرزی بەهار و هاویندا بەو شوێنەدا ببات، بێ ئەوەی گرفتی ئاوی هەبێت و باس لە خواردن و ئالیکیش ناکەین کە هەر ئەستەمە لە یۆنان بۆ ئەو ژمارەیە دەست بکەوێت و پرۆفیسۆر بارن دەڵێت: لە هەبوونی بیست و نۆ نەتەوە لە لەشکری خەشاریاردا (جگە لە ئەو یۆنانیانەی شوێن کەوتەی هەخامەنشی بوون) گومانێك نییە، بەڵام هیرۆدۆت بە هەڵە بیری کردووتەوە کە هەموو ئەو بیست و نۆ نەتەوەیە خاوەن لەشکری شەست هەزار کەسی بوونە.

لەوانەیە لەشکری ئازەربایجان شەست هەزار بوو بێت، بەڵام لە سنووری ئیمپراتۆریەتی هەخامەنشی هەندێ نەتەوە ژمارەیان نەگەیشتووتە سەد هەزار کەس و بێگومان ئەو نەتەوانە ناتوانن شەست هەزار سەرباز ئامادەبکەن.

بارن پێیوایە توسیدید کە لە هیرۆدۆت گەنجترە و لە سەردەمی ئەودا ژیاوە، ڕاستگۆترین مێژوونووسی یۆنانی کۆنە. بەڵام توسیدید سەبارەت بە جەنگەکانی یۆنان و هەخامەنشی هیچی نەنوسیوە و تەنها هەندێ جار پەراوێزی نووسیوە و ئەو بە پلەی یەکەم نوسەرەوەی ڕووداوە ناوخۆییەکانی یۆنان و بە تایبەتی جەنگەکانی ناوخۆی ئەو وڵاتەی بووە. بارن هەڵەیەکی تری هیرۆدۆت و مێژوونووسە یۆنانییەکانی لە بارەی خواردنی لەشکری هەخامەنشی ڕاست کردووتەوە، خواردنی سەرەکی سەربازانی یۆنان نان بووە، بۆیە ئەوان نانیان بە خواردنی سەرەکی هەخامەنشییەکانیش دیاریکردووە. بەڵام گۆشت بریتی بووە لە خواردنی سەرەکی هەخامەنشییەکان.

بە پێی بەڵگەنامە مێژووییەکان ئێرانییەکان زۆر پێش ڕۆمییەکان زانیویانە گۆشتی کوتراو (بە دەستەواژەی تازە سۆسیس و کاڵباس) ئامادەبکەن، ڕۆمییەکان گۆشتی ئەو مرۆڤانەیان بەکاردەهێنا کە لە سەلیب دەدران و سەیریان لە ناو دەکرد تا بۆنی مرۆڤ نەمێنێتەوە، بەڵام ئێرانییەکان گۆشتی گایان بۆ ئەو مەبەستە بەکاردەهێنا. کاڵباس و سۆسیس زوو بۆگەن دەبوون و لەشکری هەخامەنشی نەیدەتوانی بۆ ماوەی زۆر بەکار بهێنێت، بۆیە هەخامەنشییەکان بە ناچاری گۆشتی سوێرکراویان بەکاردەهێنا و ئەو گۆشتە تەنها یەك گرفتی هەبوو کە لە وەرزی گەرمادا سەربازەکانی تینوو دەکرد.

بەشە گۆشتی هەر سەربازێکی هەخامەنشی ڕۆژانە بە پێوەری ئەمرۆ سەدو پەنجا گرام بوو و هەندێ کات دوو سەد گرامیشیان دەدا و گۆشتەکەش بریتی بوو لە کالباس و سۆسیس یا گۆشتی سوێرکراو، بەڵام سەرەتا تا ئەوکاتەی کاڵباس و سۆسیس تەواو دەبوو، گۆشتی سوارکراویان نەدەدانێ. خاڵێکی تر کە پرۆفیسۆر بارن باسی دەکات کە لە ئێران دوو ڕەگەز لە کەرەکێوی هەبوون و یەکیان ڕەگەزی گەورە و ئەوەی تر ڕەگەزی بچووك (ڕەگەزی گەورەی کەرەکێوی لە ئێران لە لایەن دانیشتوانی ناوچەکەوە بە گور ئەسپ ناو دەبرێت) سوودیان لە ڕەگەزی کەرەکێویە گەورەکان وەردەگرت لە ڕاکێشانی عارەبانەی جەنگی، ئەوان بە تواناتر بوونە لە ئەسپ بۆ ئەو کارە و توانای بەرگریان بۆ برسیەتی و تینوویەتی زۆر بووە، ئەسپ هەر کە برسی یا تینوو ببوایە توانای ڕاکێشانی عارەبانەی نەدەدما.

دۆزینەوەیەکی تری ئەو پرۆفیسۆرە سەبارەت بە کاسکێت و قەڵغانی بەشێك لە سەربازە هەخامەنشییەکان بووە کە لە دار بوونە، ئەو کاسکێت و قەڵغانانە هاوشێوەی جۆرە کانزاییەکانیان بوونە و تا رادەیەك ئەرکی ئەوانیان بەجێ دەگەیاند، بەڵام لە ئەوان سووکتر بوون، کاسکێتە دارین و کانزائیەکان بە گشتی هەریەکە لە چوار پارچە دروست دەکران و بە هۆی چەرم لەیەکتر دەبەستران تا سەر و ملی سەرباز لە زەربەکانی شمشێر و نێزە و تیر بپارێزن.

زانیارییەکی تری بارن لە بارەی لەشکری خەشایار، بوونی یەکەیەکی کەمەند هاوێژ بووە و ئەوان پەتی باش و بەهێزیان پێبوو کە لەناو ژێیەکانیدا ئاسن چنرابوو و ئەوان تەنها بە سواری ئەسپ دەجەنگان و نەیاندەتوانی بە پیادە جەنگ بکەن، ئەوان بە ڕادەیەك لە هاویشتنی ئەو پەتە بە توانا بوون کە لە کاتی هاویشتنیدا ڕاستەوخۆ یەك لە سەربازە پیادەکانی دوژمنیان دەگرت و سەربازی گیراو هەرژەندە بە شمشێر و نیزە هەوڵی پچڕاندنی پەتەکەی دەدا نەیدەتوانی بە هۆی کانزای ناویەوە بیپسێنێت.

بە وتەی بارن و گێرانەوە لە مێژوونووسە یۆنانییەکان، لە لەشکری خەشایار یەکەیەك هەبوو کە پێکهاتبوو لەو کەسانەی سزادرابوون بە دورخستنەوەیان لە نیشتیمان و ناردنیان بۆ جەزیرەکانی کەنداوی فارس و خەشایار بەڵێنی بە ئەوان دابوو ئەگەر بە باشی جەنگ بکەن، رێگەی گەڕانەوە بۆ نیشتیمانیان پێدەدات، لەمە بەدوا بەرەبەرە ئەو زانیاریانەی بارن دۆزیوێتییەوە دەخەینە بەرچاوتان.

پرۆفیسۆر بارن ناوی زۆرێك لە سەردارانی هەخامەنشی هێناوە کە ئەوجار دەیانخەینەروو و لەوانەیە کە خوێنەر ماندوو بکات و پێشتر ئەو ناوانە لە مێژووەکاندا نەنووسرابن، بەڵام ئازایەتی ئەوان لەو جەنگانەدا کە هەندێکیان لە ئەوێ کوژراون، ناچارمان دەکات ناویان بێنین.

یازدە کوری داریوشی یەکەم کە یەکیان خەشایارشا بوو لە گەڵ لەشکری هەخامەنشی کەوتنەرێ و بە وتەی هیرۆدۆت هەریەکەیان فەرماندەی یەکەیەکی سەربازی بوون کە بە وتەی ئەو هەریەکەیەك شەست هەزار کەس بووە و بە باوەڕی ئێمە ئەو یەکانە هەموویان کەمتر بوون لە شەست هەزار کەس.

ئەو سەردارانەی کە کوری داریوشی یەکەم بوون و لە ئاتووسای کچی کوروشی گەورە بوون، ئەم ناوانەیان هەبوو:

یەکەم/ (هەخامەنش) فەرمانڕەوای میسر کە لە جەنگی یۆنانییەکان فەرماندەی سوپای حەوتەم بوو.

دووەم/ (ماسیس تە) فەرمانرەوای باختەر کە لە جەنگی یۆنانییەکان فەرماندەی سوپای هەشتەم بوو.

سێیەم/ (هیست ئەسپ) فەرمانرەوای ناوچەی سکاکان و فەرمانداەی سوپای شەشەم بوو و نابێت لە گەڵ هیست ئەسپی فەرماندەی پێشووی هێزی دەریایی ئێران تێکەڵ بکرێن.

داریوشی یەکەم ئەوکاتەی لە ژیاندا بوو، هاوسەرگیری لە گەڵ کچێکی تری کوروش (واتە خوشکی ئاتووسای خێزانی) کرد کە ناوی (ئارتیس توون) بوو و لە ئویش دوو کوری هەبوو کە بەشداری ئەو جەنگە بوون و ناویان بریتی بوو لە:

چوارەم/ (ئارشام) فەرمانرەوای عەرەبستان کە فەرماندەی سوپای حەڤدەهەم بوو لە جەنگی یۆنان.

پێنجەم/ (گۆبریاس) فەرمانرەوای کایۆفرۆکی کە دەکەوتە ولاتی تورکیای ئێستا، فەرماندەی سوپای بیستەم بوو لە جەنگی یۆنان.

لە ژنی یەکەمی داریوشی یەکەمیش کە ناوی (واسام) بوو، ئەم کوڕانەی بەشداری جەنگەکەیان کرد:

شەشەم/ (ئارتۆبازان) کە لە سەردەمی باوکیدا لە پێناوی جێنشینی لە دژی باوکی ڕاپەری و ئەو پیاوە لە یۆنان بووە و پرۆفیسۆر بارن نەیزانیوە پلەی ئەو لەو جەنگەدا چ بووە.

حەوتەم/ (ئاریابیژەن) فەرمانرەوای ناوچەی کاسپیان (قەزوین) و فەرماندەی بەشێکی هێزی دەریایی بوو لە جەنگی یۆنان.

هەشتەم/ (ئارشامەنێش) فەرمانرەوای جەزیرە یۆنانییەکانی ژێر دەسەلاتی هەخامەنشییەکان لە ئاسیای بچووك بوو و فەرماندەی سوپای چوارەم بووە لە جەنگی یۆنان.

کورێك کە لە (پارمیس) کە یەکی تر بوو لە ژنەکانی داریوشی گەورە و لە جەنگی یۆنان بەشدار بوو و بریتی بوو لە:

نۆیەم/ (ئاریا مەردۆسێس) فەرمانرەوای ناوچەی صوور لە لوبنانی ئێستا و فەماندەی سوپای بیست و پێنجەمی لە یۆنان لە ئەستۆ بوو.

داریوشی گەورە لە گەڵ کچی براکەی کە ناوی (فراتاکۆن)(٥) بوو هاوسەرگیری کرد و چەند منداڵێکی لە ئەویش بوو یەك لە ئەوان لەو جەنگە بەشدار بوو کە بریتی بوو لە:

---

(٥) (هەخامەنشییەکان وەك فیرعەونەکانی میسر سڵیان لە هاوسەرگیری لەگەڵ خوشك، ژن خوشك، پور و برازا و ... هتد خۆیان نەکردووتەوە، کوروش هاوسەرگیری لە گەڵ پوری واتە خوشکی دایکی بە ناوی (ئیمی تیس) کرد کە کچی ئاستیاژ (زەحاك) بوو و کەمبۆجییە هاوسەرگیری لە گەڵ ئاتووسای خوشکی کردو و

دەیەم/ (ئابرۆکۆماس) فەرماندەی سوپای چوارەم بوو  لە یۆنان.

پرۆفیسۆر بارن  لە لێکۆڵینەوە پوخت و سەرەنج راکێشەکەیدا سەبارەت بە رۆیشتنی هەخامەنشییەکان لە گەڵ خەشایارشا بۆ یۆنان، دەڵێت لە سەرچاوەیەکدا بینیویەتی کە ئابرۆماکس برایەکی دووانەی هەبووە و برا جمکەکەی ناوی (هی پر ئانتس) بووە و ئەوان ئەوەندە لێك چوو بوونە، کە کەس نەیتوانیوە لە یەکتر جیایان بکاتەوە و کاتێك ئابرۆماکس رۆیشت بۆ جەنگی یۆنان براکەشی لە گەڵ خۆیدا برد. ئەو دە برایەی کە بە خەشایارەوە دەبوون بە یازدە و بەشداری جەنگی یۆنانیان کرد، لە روانگەی هەخامەنشییەکان گەورەترین پلەیان هەبوو، چونکە هەم کوری داریوش و هەم برای پاشا بوون.

بە وتەی پرۆفیسۆر ئاندریۆ بارن لەو جەنگەدا شەست و پێنج لە سەردارانی هەخامەنشی بەشدار بوونە و بۆ ئەوەی خوێنەر ماندوو نەکەین خۆمان لە ناساندنیان دەپارێزین و تەنها دەڵێین هەندێ لە برازاکان و خوشکە زاکانی خەشایارشا و دوو لە خەزوورەکانی (بابی دوو لە ژنەکانی) بەشداری جەنگ بوون و هەندێکیان لەو جەنگە کوژران و لە ئەوێ نێژران، بارن توانیویەتی شوێنی گۆری هەندێکیان دەستنیشان بکات و لەوانەیە ئەگەر لە داهاتوودا لەو شوێنانە هەڵکەندن بکرێت، ئیسك و پروسکی سەرداره هەخامەنشییەکان و لەوانەشە پارچەکانی جلوبەرگیان بدۆزرێنەوە، چونکە ئەوان بە جلوبەرگەوە دەنێژران. هەروەها ئەو دەڵێت لە مەیدانی جەنگدا هیچ شازادەیەك جیاوازی نەبوو لەگەڵ سەربازێك و وەك یەکتری لە جەنگدا بەشدار دەبوون و لە هەردوو لایان دەکوژران، بۆیە هەندێك لە شازادەکان لە مەیدانی جەنگدا کوژران.

دوای گەیشتنی خەشایار بۆ خاکی ئەورووپا، وەك باسکرا ئەوان چوونە ناو وڵاتی (خێرسۆنێز) کە پاشای ئەو وڵاتە یا هاوپەیمانی خەشایار بوو و یا بەرگری لە پێش ئەودا نەکرد و دواتر گەیشتنە ناو دەوڵەتە شارێکی تری یۆنانی بە ناوی (بی ساڵ تایی). لە کۆندا نەریت وابوو کە کاتێك پاشایەکی بەهێز دەهاتە ناو خاکی پاشایەکی بێ هێز، پاشای وڵاتە بێهێزەکە دەهاتە پێشوازی و بە پێی توانای خۆی پێشوازی دەکرد و ئەو پێشوازییە بە واتای بەرفەرمان بوون بەرانبەر پاشای گەورە دەژمێردرا.

---

دواتریش دوای مردنی کەمبۆجییە، بەردیەی برای هاوسەرگیری لەگەڵ ئاتووسا کرد و دواجار ئاتووسا بۆوە خێزانی داریوش. داریوش دوو کچی کوروشی کردن بە هاوسەری خۆی کە بریتی بوون لە (ئاتووسا و ئارتیس توون) و دواتر هاوسەرگیری لە گەڵ کچی برای خۆی واتە (فراتاکۆن) کرد و بەو شێوە بەردەوامبوون. وەرگێر بۆ کوردی.)

کاتێك خەشایار گەیشتە ناو خاکی (بی سال تایی) چاوەڕوان بوو پاشای ئەوێ پێشوازی بکات، بەڵام ئەو نەیدەویست بەرفەرمانی خەشایار بێت و ڕای کردە شاخەکان، هەر شەش کورەکەی ئەو کە بچوکترینیان شازدە ساڵی بوو، چوونە پێشوازی خەشایار و ئامادەیی خۆیان بۆ خزمەتی ئەو دەربڕی. دوای ئەوەی لەشکری خەشایار ڕۆیشت و ئەو خاکەی بە جێ هێشت، پاشای بی سال تایی لە شاخ گەڕایەوە و زانی کە کورەکانی چوونە پێشوازی پاشای هەخامەنشی و ئەویان بە وڵاتەکەیاندا تێپەڕاندووە، فەرمانی کرد تا شیشی ئاسنی گەرمکراویان خستە سەر چاوی هەر شەش کوری و هەر شەشیان کوێر کردن و تەنانەت بەزەیی بە کورە بچووکەکەیدا نەهاتەوە کە تەنها شانزدە ساڵی بوو و کەوتبۆوە ژێر کاریگەری براکانی و بەو کارە هەستابوو.

دوای (بی سال تایی) خەشایار شا گەیشتە دەوڵەتە شاری (سات رائی) کە ئەویش لە دەوڵەتە شارە یۆنانییەکان بوو و بۆ ئەوەی نەبینە مایەی ماندووکردنی خوێنەری بەڕێز و خۆمان لە دووبارە بوونەوە بپارێزین، هەموو ئەو وڵاتانەی لەمە بەدوا ناویان دێت بە وڵاتانی یۆنانی ناو دەبەین کە کەوتوونەتە سەر ڕێگەی خەشایارشا لە کاتی ڕۆیشتنی بەرەو ئەسینای پایتەختی یۆنان یا لە کاتی گەڕانەوەی بەو ڕێگەیەدا. پاشای ئەوێ پیاوێکی بەساڵا چوو بوو کە لە تەواوی وەرزەکانی ساڵدا پێستەی مەڕی لەبەر دەکرد و هەندێ لە دانیشتوانی وڵاتەکەی بەردەوام لە شاخ دەژیان و ژیانیان لە سەر مەڕداری بوو، لە شیری مەڕ پەنیر و ڕۆنیان دروست دەکرد و جلوبەرگ و پێڵاویان لە پێست و خوری مەڕ دابین دەکرد. پاشای ئەو وڵاتەش ڕۆیشتە شاخ و لای خەڵکە ئاژەڵدارەکانی خۆی مایەوە.

پرۆفیسۆر بارن لە زمانی مێژوونووسە کۆنەکانی پێش هیرۆدۆت وەك (ئۆزۆن خەڵکی دەوڵەتە شاری ساموس)، (دیۆفۆس لە دەوڵەتە شاری پرۆکنووس)، (ئۆدەمۆس لە دەوڵەتە شاری پارۆس) و (هێکانایوس لە دەوڵەتە شاری میلتۆس) دەڵێت: هۆکاری ئەوەی خەڵکی وڵاتی سات رائی لە شاخەکان دانەدەبەزین بۆ ئەوە بوو کە دەترسان مەڕەکانیان ببنە نێچیری شێرەکان کە لە دامێنی شاخەکان و پێدەشتەکانی دامێنی شاخەکان دەژیان.

لە بوونی شێر لەو ناوچەیە گومانمان نییە و هیرۆدۆت و گەزنەفۆنیش باسیان لێ کردووە کە لە سەردەمی ئەواندا شێرەکان لە وڵاتی سات رائی دەژیان و بێ جێ نییە کە بڵێین لە نێوان لێکۆڵەرەکانی هاوچەرخدا کە لێکۆڵینەوەیان سەبارەت بە جەنگەکانی یۆنان و هەخامەنشی کردووە، جگە لە بارن کەسی تر سوودی لە مێژوونووسەکانی پێش هیرۆدۆت کە لە سەرەوە

ناویان هاتووە، وەرنەگرتووە و لەوانەیە دەستیان نەگەیشتبێتە ئەو سەرچاوانەی ئەوان یا زمانی کۆنی یۆنانیان نەزانیبێت. بە هەر حاڵ پاشای سات رائی رۆیشت و خۆی گەیاندە شوێن کەوتووە مەردارەکانی.

لە شەوی شەست و پێنجەمی بەهار شێرەکان هێرشیان کردە سەر پشتەوەی لەشکری خەشایار کە پێداویستییە یەدەگەکانیان دەگواستەوە کە بریتی بوون لەو شتوومەکانەی ئەوکاتە لەشکر پێویستی پێنەبوو و دواتر پێویستی دەبوون و بە هۆی وشترەکانەوە کە هێواش دەرۆیشتن دەگواسترایەوە. لە لەشکری هەخامەنشی بەردەوام وشتر و ئەسپەکانیان لە یەك جیادەکردەوە و بە هۆی هێواش رۆیشتنیان، وشتەرەکان شەو یا نزیکی نیوەشەو دەگەیشتنە مەنزڵگای لەشکر. ئەو شەوە وشترەکان لە تاریکیدا کەوتنەبەر هێرشی شێرە درندەکان و ئەوەندە لەپڕ ئەو هێرشە روویدا کە ئەو سەربازانەی لە گەڵ وشترەکان بوون، شلەژان و نەیاندەزانی چ بکەن و وشترەکانیش هەرچەندە باریان پێبوو، بەڵام لە ترسان کەوتنە ڕاکردن.

شێرەکان دوای ڕاوکردنی هەر وشترێك، دەیاننەڕاند و دەنگیان بەرز دەبۆوە و ترسی زیاتر دەکرد، شێرەکان دوای کوشتنی وشترەکان سکیان دەدڕاندن و ئەو شەوە ژمارەیەك لە وشترەکان بوونە خۆراکی شێرەکان و خەشایار کە ئەو بابەتەی بیست، فەرمانی کرد تا بەشی پشتەوەی لەشکر لە شەودا بە مەشخەڵەوە رێ بکەن، چونکە شێر لە ئاگر دەترسێت و لە رۆژیشدا هێرش ناکاتە سەر لەشکر، تا ئەو کاتەی لەشکری هەخامەنشی ئەو وڵاتەیان جێ هێشت بەردەوام مەترسی هێرشی شێرەکان هەبوو.

دوای تێپەربوونی لەشکری خەشایار لە وڵاتی سات رائی، رۆیشتنی لەشکر بە هۆی جەنگەڵەکان و ریچگا نارێکەکانەوە قورس بوو و عارەبانە جەنگییەکان نەیاندەتوانی لە دارە گەورە و بچووك و زۆرەکان ئەو جەنگەڵانە تێپەر بن. بۆیە خەشایار فەرمانی کرد تا دەستەیەك سەرباز وەك جادەساز لە پیچشەوەیان برۆن و شوێنە ناخۆشەکانی جادە تەخت و چاك بکەن و هەروەها فەرمانی کرد تا کرێ بە خەڵکی ناوچەکە بدەن بۆ ئەو کارە و لەو رۆژە بە دواوە لەو ناوچەیە کە ئەوکات و ئێستاش بە (تراس) ناو دەبرێت، جادەسازی دەستی پێکرد.

هەندێ کات و لە هەندێ شوێن لەشکری داریوش ناچاربوو بە شێوەی کاتی لەو ناوچانەی نیمچە زەلکاوی و ئاوی وەستاویان هەبوو، بوەستن و ئەوکات میشوولەکان ئازاریان دەدان و سەربازە هەخامەنشییەکان رووەکێکی وشکیان بە ناوی (شەنبەلیلە) دەسوتاند و میشوولەکان لەبەر دووکەڵی ئەو رووەکە هەڵدەهاتن و سەربازەکان ئاسوودە دەنووستن.

له رۆژی حەفتا و پێنجەمی بەهاری ساڵی (٤٨٠ پ. ز) لەوکاتەی لەشکری هەخامەنشی بە ناوچەیەکی نیمچە زوونگاوی لە دەوڵەتە شاری (تراس) دا دەرۆیشتن، هەندێ بەراز کە لە ترسی ئەوان هەڵات بوون، هێرشیان کردە سەر ناوەڕاستی لەشکرەکە و چەند سەربازێکیان بریندار کرد و ئەوانیش هەندێ لە بەرازەکانیان کوشت و پارچەیان کردن تا لە کاتی وەستانی لەشکر بیانبرژێنن و بیانخۆن.

هێزی دەریایی هەخامەنشی تەریب لە گەڵ کەنارەکان و لەشکرەکەیان دەجووڵان و شەوانەش لە هەر شوێنێك کە لەشکر وەستابوایە لەنگەریان دەگرت، تەنانەت ئەگەر کەنداوی بچووکیشی لێ نەبوایە و ئەمەشیان بۆ پاراستنی لەشکر دەکرد و دەترسان لەپڕ یۆنانییەکان لە دەریاوە هێرش بکەنەسەر لەشکرەکەیان. لەو شوێنانەی کەنداوی لێ نەبوو، هێزی دەریایی ناچاربوون لە شەو تا بەیانی ئێشك بگرن و لە لایەکەوە بۆ لای تر بچن تا کەشتییەکانیان بەر وشکانی نەکەون و ئەو کاتانە بۆ سەڵبە لێدەرەکان و سەربازە دەریاییەکان زۆر سەخت بوو.

پرۆفیسۆر بارن دەڵێت: تەنانەت ئێستا کە کەشتییەکان زۆر گەورەن و لەنگەری هەندێکیان دەگاتە پێنج تەن، ناتوانن لەو ناوچانە کە کەنداوی لێ نییە بوەستن، چونکە بە وەستانی کەشتییەك لەو کەنارانە کە کەنداوی نییە، هێرشی شەپۆلەکان بۆ سەریان دەست پێدەکات و هێزی شەپۆلەکان ئەوەندە زۆرە کە دەتوانن لەنگەرەکە لە قولایی ئاو دەربێننەوە و کەشتییەکە بخەنە جووڵە و بە کەنارەکانی ئاوەکەیدا بدەن. ئاشکرایە کە کەشتییەکانی ئەو کات کە بچووکتر بوون بە ئاسانی دەبوونە یاری شەپۆلەکانی ئاو و بە کەنارەکانیاندا دەدان، بۆیە کەشتیوانەکان ناچاربوون لە سەرەتای شەو تا بەیانی لە یەك ناوچەی بچووکدا بۆ خۆپارێزی هاتووچۆ بکەن و نەخەون، رۆژی دواتریش چونکە شەوەکەی نەخەوتبوون، ناچار هێواش دەرۆیشتن.

تێپەرینی لەشکری خەشایار لە ناوچەی تراس درێژ بۆوە، چونکە جادەسازەکان بەردەوام سەرگەرمی کار بوون و بە وتەی بارن، ئەوان چل و پێنج رۆژیان پێچوو تا توانیان وڵاتی تراس ببڕن و بگەنە ناو مەقدۆنیا و ئەو رێگایەی ئەوکات بڕیان نزیکەی چوارسەد و هەشتا کیلۆمەتر بوو و لەشکری هەخامەنشی ئەوکات نزیکەی دە کیلۆمەتریان لە رۆژێکدا دەبڕی. باشترین کات بۆ هێرشی یۆنانییەکان بۆسەر ئەو لەشکرە ئەوکاتە بوو، بەڵام ئەوان ئەوکارەیان نەکرد و نەبوونە مایەی دەردەسەری بۆ ئەوان.

هەرچەندە ئەو جادانە کاتی بوون، بەڵام دواتریش سوودی بۆ ناوچەکە هەبوو و هیرۆدۆت بەو جادانەدا ڕۆیشتووە و دەڵێت: ئێستاش جادەکانی خەشایارشا بۆ ڕۆیشتنی ڕێبوارەکان و عارەبانەکان باشن.

خەشایار بە بێ هیچ بەرگریەك گەیشتە مەقدۆنیا و چۆوە ناو یەکەم شار کە لە سەر ڕێگا بوو و ناوی (ئامفی پۆلیس) بوو، هیرۆدۆت دەڵێت: کاتێك خەشایار بەبێ بەرگری گەیشتە ئەو شارە وەك سوپاسگوزاری بۆ خوایان لە بەرانبەر نەبوونی بەرگری، فەرمانی کرد تا حەت کور و حەوت کچی هەرزەکار لە دانیشتوانی ناوچەکە بە زیندوویی لە گۆر بنێن.

بارن مامۆستای زانکۆی گلاسکۆ دوو ڕەخنەی لەو وتەیە هەیە و دەڵێت: ڕەخنەی یەکەم پەیوەندداره بە خوایان و بارن دەڵێت: چونکە هیرۆدۆت زیاتر لە خوایەکی پەرستیوە، بیری کردووتەوە خەشایاریش وەك ئەو زیاتر لە خوایەکی هەیە، بەڵام خەشایار یەکتاپەرست بووە و تەنها ئاهورامەزدای پەرستیوە. رخنەی دووەمی زانا بەریتانی لە بارەی ناشتنی هەرزەکارەکانە بۆ سەپاسگوزاری و بارن دەڵێت لە مەزدا پەرستیدا کوشتنی خەڵك تاوان بووە و تەنها تاوانبارانیان دەکوشت. لە هیچ سەرچاوەیەکی تری مێژوویيدا نەهاتووە خەشایار یا پاشایەکی تری هەخامەنشی بۆ سوپاسگوزاری بەرانبەر بە خودای خۆی، هەرزەکاران یا خەڵکی تریان کوشتبێت و دیسان بارن دەڵێت:

(بۆ من باسکراوە کە ئامیس تیس خێزانی خەشایارشا دوای ئەوەی پیر بوو و خەشایار ڕووی تێ نەدەکرد، حەوت کور و حەوت کچی هەرزەکار و خانەدانی ئێرانی بە زیندوویی ناشت تا سەرەنجی هاوسەرەکەی بۆ لای خۆی ڕابکێشێتەوە، ئەو وتەیەش بۆ من بێ بنەمایە و وێڕای پێچەوانە بوونی لە گەڵ باوەڕە ئایينییەکانی ئێرانییە کۆنەکان، کارێکی عاقلانەش نییە، چونکە هیچ ژنێکی بە ساڵا چوو بەو ڕێگەیە یا هیچ ڕێگەیەکی تر گەنج نابێتەوە.)

لە ناو سەربازەکانی خەشایار لە ساڵی (٤٨٠ پ. ز) سەربازێکی سی ساڵان هەبوو کە پاسەوانی خەشایار بوو و بەردەوام لە گەڵ ئەودا بوو و ناوی (ئارتاخیس) بوو، ئارتاخیس زۆر باڵابەرز و بەهێز بوو و کاتێك دەوەستا سەری دەگەیشتە ڕاستی پشتە کۆمەکانی وشتر و لە دەشت دەکەوتە دوای کەری کێوی و بە دەست دەیگرتن، هەروەها کاتێك دەوەستا بە بەنێك لە دوو ئەسپیان دەبەست تا ئەسپەکان ئەو ڕابکێشن و ئەویش نەیدەهێشت ئەسپەکان بجووڵێن.

مامۆستای مێژوو لە بەلژیك (ژان دۆشێن گەیمەن) دەڵێت: بوونی پیاوی ئاوا باڵا بەرز لە ئێرانی ئەوکات شتێکی ئاسایی بوو و ئێرانییەکان بە گشتی باڵابەرز بوون و دوای هێرشی

نەتەوەکانی تر و بە تێکەل بوونیان لەگەڵ ئەو نەتەوانەی کورتە باڵا بوون، باڵایان کورت بۆتەوە.

لە لەشکری خەشایاردا کەس توانای ملانێ لەگەڵ ئارتاخیسی نەبوو و کاتێك ئارتاخیس لە پڕ پێدەکەنی دەنگی ئەوەندە گەورە بوو کە دەوروبەرەکەی دووچاری ڕاچلەکان دەهاتن. کاتێك خەشایار گەیشتە دەوڵەتە شاری (ئاکانتۆس) کە خەڵکەکەی کورتەباڵا بوون، خەڵکی ئەوێ چاویان لەسەر ئارتاخیس هەڵنەدەگرت کە ئەوەندە درێژ بوو.

پایتەختی دەوڵەتەشاری ئاکانتۆس هەر هەمان ناوی هەبوو و کاتێك خەشایار بۆ شەو لە ئەوێ مایەوە، ئارتاخیس هەستی بە بێ هێزی دەکرد و داوای لە فەرماندەی پاسەوانەکانی خەشایار کرد تا مۆڵەتی بدات ئەو شەوە لە پشوودا بێت و بۆ بەیانی ئەو ڕۆژە هەواڵیان بە خەشایار گەیاند کە ئارتاخیس مردووە و ئەویش بە سەرسوڕمانەوە داوای لە پزیشکەکان کرد تا بزانن چ نەخۆشییەك لە یەك شەودا مرۆڤ دەکوژێت؟ چونکە ڕۆژی پێشتر ئەو تەندروستی باش بوو.

پزیشکەکان وتیان: جگە لە نۆبەی دڵ یا مێشك هیچ نەخۆشییەکی تر نییە لە شەوێکدا مرۆڤ بکوژێت.

خەشایار وتی: بڕۆن و پشکنین بۆ تەرمەکە بکەن و بزانن کە هۆکاری مردنەکەی چییە؟

پزیشکەکان لاشەی ئارتاخیسیان پشکنی و بۆیان دەرکەوت کە دووچاری نۆبەی دڵ نەهاتووە و وتیان: بە دووری ناوانین ژەهر خواردوو کرابێت، بەڵام نازانین بە چ جۆرە ژەهرێك. گەزنەفۆن دەڵێت: خەشایار فەرمانی کرد تا لاشەی ئەو پاڵەوانە بدڕن و گەدە و ڕیخووڵەی بپشکنن تا بزانن بە کام ژەهر، دووچاری مردن بووە. ئەو وتەیە نیشاندەری ئەوەیە کە لە ئێرانی کۆندا، شەق کردنی جەستەی مرۆڤ بۆ دیتنەوەی هۆکاری مردنی هەبووە. دوای شەق کردنی سینگی ئەو پاڵەوانە و ئەنجامدانی پشکنین بۆی، دیسان پزیشکەکان نەیانتوانی جۆری ژەهرەکە دەستنیشان بکەن و خەشایار فەرمانیدا تا لاشەی ئارتاخیس بنێژن و لە سەر گۆڕەکەی خانوویەك دروست بکەن و دانیشتوانی ناوچەکەش هەندێ قوربانیان بۆ ئەو پاڵەوانە کرد.

دوای ئەوەی لەشکری ئێران لە ئاکانتۆس تێپەڕبوون، گەیشتنە دەشتێك بەناوی (ئاخیۆس) و خەشایارشا فەرمانیدا لە تەنیشت زێی (ئاخیۆس) بوەستن. بە خەشایاریان وت ئەوە ئەو زێیەیە کە (هۆمێر) شاعێری یۆنانی پێش ئەوەی کوێر ببێت باسی لێوە کردووە و وتوویەتی جوانترین زێی جیهانە و وەسیەتەی کردووە دوای مردنی لە کەنار ئەو زێیەی بنێژن و بێ گومان

گۆڕەکەی لە ئەوێیە، بەڵام چونکە یۆنانییەکان بەرانبەر شاعیرەکەیان بە وەفا نەبوون، ئێستا شوێنەواری نەماوە.

خەشایار سێ ڕۆژ لە کەناری ئەو زێیە مایەوە و دەستەیەك لە کوران و کچانی ژنیاری مۆزیك و دەنگ بێژ هاتنە لای و هەندێ لە بەشەکانی (ئیلیاد) واتە جەنگنامەکەی (هۆمێر) یان بۆ وت و خەشایار کاتێك زانی هۆمێر دوای نابینا بوونی، ناچاربووە گەدایی بکات و بە دەنگی بەرز وتوویەتی: ئەی خەڵکینە من ئەو کەسەم کە جەنگنامەی ئیلیام نووسیوە. زۆر ناراحەت بوو.

هیرۆدۆت دەڵێت: خەشایار دیمەنەکانی سروشتی زۆر پێ جوان بوون و بۆیە ئەو سێ ڕۆژە لە کەناری زێی ئاخیۆس مایەوە، تا چێژ لە دیمەنەکانی ببینێت.

پێش ئەوەی خەشایار بکەوێتەرێ و ئەو زێیە جێ بهێڵێت، فەرمانی کرد دەستەیەك لە سەربازان و هەندێك لە ئەندازیاران بۆ دوو مەبەست لە پێشیانەوە برۆن، مەبەستی یەکەم زانینی ژمارەی هێزەکانی یۆنان لە گەلی (پەتریا) و مەبەستی دووەم خۆشکردنی ڕێگای ئەو گەلیە بوو. ئەو گەلیە بەردەوام لە رووی سەربازییەوە گرنگ بووە، لە ساڵی (١٩٤١ ز) لەشکری یۆنان بەرگریەکی ئەوەندە بەهێزیان لەو گەلیە کرد کە لەشکری هیتلەر ترسان لە یۆنان دووچاری شکست ببنەوە و بۆیە دوای سەرکەوتن لە یۆنان، هیتلەر فەرمانی کرد ئەفسەرە یۆنانییەکان بە شمشێر و دەمانجەکانیانەوە بگەڕێن.

ئەو گەلیە جگە لە گرنگی لە رووی سەربازی، بە شوێنێکی پیرۆز دەناسرا و گرنگی ئایینیشی هەبوو، چونکە کەوتبۆوە تەنیشت شاخی ئەلەمپ واتە شوێنگەی خوایانی یۆنانیدا تێدەپەڕی. ئەلەمپ تەنها یەك شاخ نییە و بریتییە لە زنجیرە شاخێك کە لە ئاراستەی باکووری ڕۆژئاوا بۆ باشووری ڕۆژهەڵاتە و نزیکەی هەشتا کیلۆمەتر درێژ دەبۆوە. ئەمرۆ درێژایی شاخەکانی ئەلەمپ کەمترە لە ئەوکات، چونکە بە تێپەڕبوونی بیست و پێنج سەدە هەندێ لە گردەکانی لەناو چوون و ئەو کردارەی بە سوانی زەوی ناسراوە و هەندێ لە گردەکان لەناو دەبات و جێگەکەیان لووس دەکات و هەندێ لە گردەکانی ئەلەمپیش لووس بوون. بەڵام لە سەردەمی خەشایارشادا درێژی ئەو گەلیەی هەشتا کیلۆمەتر بوو و دەربەندی پەتریا لە ڕۆژئاوای ئەو شاخانەوە دەڕۆیشت و چەند لقێکی هەبوو و کۆمەڵێك لقی لێ دەبۆوە، بۆیە مێژوونووسەکان بە گەلیەکانی پەتریا ناویان بردووە.

لێرەوە دەبێ بزانین ناکۆکیە ناوخۆییەکانی یۆنانییەکان بوونە یەك لە هۆکارە گرنگەکانی شکستی یۆنانییەکان لە خەشایارشا. ئەسکەندەر پاشای ئەو کاتی مەقدۆنیا پیاوێکی یۆنانی بوو و شانازی دەکرد بەوەی کە خوایانی ئەلەمپ تاجی پاشایەتی مەقدۆنیایان خستووتە سەری، ئاشکرایە کە ئەو ئەسکەندەرە جیایە لە ئەسکەندەری مەقدۆنی کە دوو سەدە دواتر هاتە سەر تەخت.

هیرۆدۆت ئەو ئەسکەندەرە بە پاشا ناو نابات و تەنها بە بەکرێگیراو ناوی دەبات، چونکە ئەوی بە بەکرێ گیراوی خەشایارشا زانیوە. گەزنەفۆن دەڵێت: ئەسکەندەر پاشای مەقدۆنییە بەرفەرمانی خەشایار بووە و زنجیرە شاخەکانی ئەلەمپ و دەربەندی پەتریا لە خاکی وڵاتی مەقدونیا دابوون.

خەشایارشا دوای گەیشتنی بۆ مەقدۆنیا دەبوایە متمانەی هەبێت و بە ئاسوودەیی بچێتە ناو وڵاتێك کە پاشاکەی خۆی بە بەرفەرمانی ئەو دەزانێت، بەڵام کەوابوو بۆچی خەشایارشا یەك لەسەر سێی لەشکرە پیادەکەی و هەندێ ئەندازیاری نارد بۆ گەلیەکانی پەتریا تا بزانێت ئەو گەلیە لە ژێردەستی یۆنانییەکانە یا خود نا؟

لە وەڵامدا دەڵێین خەشایار متمانەی بە ئەسکەندەر نەبوو کە ناپاکی لێ ناکات و نابێتەوە هاوکاری یۆنانییەکان، چونکە هەرچەندە ئەو بەرفەرمانی نواندبوو، بەڵام ئەسکەندەر یۆنانی بوو و هەموو باپیرانی یۆنانی بوون و پشتی لە یۆنانییەکان کرد بۆ خەشایار، بۆیە خەشایار نەیدەتوانی بڕوا بەو بکات کە بۆ کەسێکی بێگانە دەست لە هاوکاری نەتەوەکەی هەڵبگرێت، ئایا ئەو کەسەی هاودەستانی بۆ بیگان دەفرۆشێت، ناتوانێت خەشایاریش بفرۆشێت و دەستی هاوکاری بۆ یۆنانییەکان درێژ بکاتەوە؟ بەڵام دەبێت بزاندرێت کە لە یۆنانی کۆن یەکگرتوویی سیاسی نەبوو و ئەو پەنجا دەوڵەتە شارەی لەوێ هەبوون، هەموویان خۆیان بە سەربەخۆ و وڵاتەکانی تریان بە بیگانە دەناسی و وەك ئێستای ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بوون، ئێستا لە ئەمریکا هەرکەسێك سەبەتەیەك سێو یا پرتەقاڵ لە ویلایەتێك بۆ یەکی تر ببات دەکەوێتە بەر بەدواداچوونی یاسایی و لە یۆنانی ئەوکاتیش بە هەمان شێوە بوو.

هاووڵاتییەکی مەقدۆنی یەکی ئەسینایی یا ئێسپارتی بە بیگانی دەژمارد و ئەوان تەنها چوار ساڵ جارێك و بە هۆی یاریەکانی ئۆلەمپیادەوە لە یەکتر نزیك دەبوونەوە و هەستیان بە هاو ڕەچەلەکی دەکرد، ئەو کەسەر ئۆلەمپیادەکانی یۆنانی داناوە کەسێکی عاقل بووە و ئەو بابەتەی زانیوە کە جگە لەو ڕێگەیە ناتوانێت یۆنانییەکان لە یەکتر نزیك بکاتەوە. بەڵام جەنگی هەخامەنشییەکانیش توانی هەندێك لە ئەوان یەکگرتوو بکات، پێش ئەو مێژووە

یۆنانییەکان بەردەوام بەربەرەکانیان لەگەڵ یەکتردا هەبووە و تەنانەت لە یەکەمین ئۆلەمپیاد لە ساڵی (٧٧٦ پ. ز)جەنگ لە مەیدانی ئۆلەمپیاد روویدا و ژمارەیەك یاریزان و هاندەر کوژران و بەڵام دوای ئۆلەمپیاد کەشی ئاشتی و خۆشی گەرایەوە بۆ نێوانیان.

هیرۆدۆت ئەسکەندەر بە بەکرێ گیراو و ناپاك لە قەڵەم دەدات و دەڵێت: ئەو رۆژانە خەشایاری ئاگاداری دەکردەوە لە ژمارەی سەربازەکانی نەتەوەکانی یۆنان و رۆژێك نەبوو کە تەتەری ئەو ناپاکە نەگاتە لای خەشایار. هەروەها دەڵێت: پێش ئەوەی خەشایار نزیك شاخی ئەلەمپ و گەلی پەتریا بکەوێتەوە کە دەکەوێتە رۆژئاوای ئەو زنجیرە شاخانە، لەشکرێکی بەهێزی یۆنانی لە ئەوێ بوون تا رێگە لە خەشایار و لەشکرەکەی بگرن و ئەسکەندەر هەندێ هۆکاری بۆ کشاندنەوەی ئەوان دۆزییەوە و لەشکری یۆنانی ناچارکرد تا بکشێنەوە و ئەوێ چووڵ بکەن.

بە گشتی ئەسکەندەر خۆی بە وەفادار بۆ یۆنان دەردەخست و لە ڕاستیدا لەگەڵ خەشایارشادا یەکگرتوو بوو و لە لاپەڕەکانی داهاتوودا دەبینین کە تەنانەت لە نێوان ئێسپارتی و ئەسینابیەکانیش یەکگرتوویی تەواو نەبوو، لە کاتێکدا کە هەردووکیان زیاتر لە نەتەوەکانی تری یۆنان دەیانویست جەنگی هەخامەنشییەکان بکەن و لە یۆنان دەریان بکەن.

ئەو سەربازانەی خەشایار لە پێشەوە ناردبووینی لە گەڵ سەربازانی یۆنانی دووچاری جەنگ نەبوون و تەنها لە گەڵ ئەندازیاران کەوتنە تەخت کردن و خۆش کردنی رێگاکە، چونکە یۆنانییەکان لەوێ نەمابوون و ئەوان هەواڵیان بۆ خەشایار نارد کە دەتوانێت فەرمانی جووڵەی لەشکرەکەی بدات.

خەشایار دەیزانی شاخەکانی ئەلەمپ نزیکن و وێڕای ئەوەی ئەو مەزدا پەرست بوو و خوایانی شاخی ئەلەمپی نەدەپەرستین، بەڵام بە هۆی خوایانی یۆنانەوە تۆزێك ترسا بوو. شاخی ئەلمپ لە ئێرانی کۆندا ناسرابوو و ئەوان دەیانزانی خوایانی یۆنان لەو شاخانەن و وێرای ئەوەی باوەڕیان بە خوایانی یۆنان نەبوو، بەڵام ناوبانگی ئەو شاخانە ئەوانی ناچار بەرێز لە بەرانبەریان دەکرد و کاتێك خەشایار بە لەشکرەوە کەوتەرێ، پاشای هەخامەنشی لە پیاوێك دەچوو کە دەروات بەرەو شوێنێکی پیرۆز و گەورە تا بیبینێت.

رۆژێك پێش گەیشتنیان بە شاخەکانی ئەلەمپ، لەشکری خەشایار وەستان و بە وتەی ئاریان ئۆردووگایەك بە درێژی بیست مایڵیان (٣٢ کم) دامەزراند، ئەو وتەیەی ئاریان پێدەچێت زێدەرۆیی تێدا بێت و هیچ سەرکردەیەکی زانا ئۆردووگای بەو درێژییە دروست

ناکات، چونکە پارێزگاری لەو ئۆردووگایە ئەستەمە و هەموو ئۆردووگایەك بێ گومان دەبێت لە شێوەی چوارگۆشە و بازنە و سێ گۆشە بن تا بتواندرێت بەرگریان لێ بکرێت و تەنها لەو شوێنانەی لایەکیان ئاو یا شاخ و شتی سروشتی بێت ئاساییە و فەرماندەی زانا دەزانێت دەکەوێتە بەر هێرش.

ئاریان دەڵێت: لە خێوەتگای خەشایارشادا جە لە شا و شازادەکان و ئەفسەرکان بۆ کەسی تر خێوەت نەبوو و سەربازەکان لە ژێر ئاسمان دەنووستن.

پرۆفیسۆر بارن دەڵێت: بە هۆی هاوین و وەرزی گەرما و نەبوونی مەترسی لە بارینی باران، سەربازەکان پێیان خۆشتر بوو لە دەرەوە بخەون و خێوەتەکانیان لە پشتەوەی لەشکر هەڵ بگیرێت، چونکە بەو شێوەیە ئەوان جەستەیان ئاساییتر دەبوو و بەیانیانیش کاتیان بە کۆکردنەوەی خێوەتەوە نەدەگیرا.

رۆژی دواتر کە بە وتەی پرۆفیسۆر بارن رۆژی سەدو پەنجا و یەکەمی ساڵی (٤٨٠ پ. ز) بوو، پاشای هەخامەنشی شاخی ئەلەمپی دیت و لە ئەسپەکەی دابەزی و لە بەرانبەر خوایانی یۆناندا سەری چەماندەوە و رێزی بۆ نواندن، چونکە پاشا هەخامەنشییەکان هەرچەندە مەزدا پەرست بوون، بەڵام رێزیان لە خوایانی نەتەوەکانی تر و تەنانەت دوژمنەکانیشیان دەگرت و سەریان بۆ دادەنواندن.

چەند کەس لە دانیشتوانی مەقدۆنیا کە هاورێی خەشایار بوون بە سەرسوڕمانەوە وتیان: ئایا دەتوانین پرسیارێکت لێ بکەین.

خەشایار وتی: پرسیار بکەن.

مەقدۆنییەکە وتی: بینیم شای شایان ئەمرۆ کاتێك شاخی ئەلەمپی بینی، رێزی نواند و سەری دانەواند، ئایا شای شایان باوەڕی بە خوایانی ئەو شاخەیە کە رێزیان لێ دەگرێت؟

خەشایار وتی: من بڕوام بە ئەوان نییە، بەڵام خۆم باوەڕم بە بوونی ئایین هەیە و هەموو ئایینەکان رێز لێ دەگرم و هەموو ئایینێك مایەی چاکە و چاکسازین بۆ مرۆڤەکان.

ئەو رۆژەی خەشایار پەڕییەوە ناو خاکی یۆنان، یۆنانییەکان لە ئەسینا کە دەکەوێتە باشووری یۆنان (بەڵام کۆتا باشوور نییە) لە پەرینەوەی لەشکری هەخامەنشی ئاگادار بوونەوە.

پێش ئەوەی هەخامەنشییەکان بگەنە یۆنان لە ئەوێ کەسایەتییەکی سیاسی هەبوو بە ناوی (ئاریس تید) کە نابێت لە ئاریس تیدی فەیلەسوف بە یەك کەس بزاندرێن. ئەو لە یۆنان و

ئەسینا بە پیاوێکی سەیر دادەنرا، چونکە خزمەتگاری نەبوو و ئیشەکانی بۆ خۆی دەکرد و لە یۆنان هەموان نۆکەر و کۆیلەیان هەبوو و کەس بۆ خۆی کاری خۆی نەدەکرد.

ئاریس تید لە وڵاتێکی وەك ئەسینا بە کەسێکی (ئایدیالیست) ناسرابوو، چونکە ئەو بابەتانەی ئەو باسی لێوە دەکردن لە لای خەڵك هاتنەدی ئەوان ئەستەم بوو و تەنها لە خەیاڵدا دەگونجان. بۆ نموونە دەیوت: کۆیلایەتی دەبێت کۆتایی پێ بێت و ئەوانیش لە هەموو روویەکەوە دەبێت لەگەڵ ئەوانی تر یەکسان بن و ئەوانیش وەك ئەسیناییەکانی تر کە ڕەگەزنامەیان هەیە دەبێت شتێك وەربگرن.

کاتێك بیسترا هەخامەنشییەکان بۆ هێرش کردنەسەر وڵاتەکەیان سەرگەرمی بەهێز کردنی هێزی دەریایین، ئاریس تید داوای کرد مانگانەی یۆنانییەکان ببڕێت کە لە کانی زیوی (لۆریۆم) دابین دەکرا و لە بەهێز کردنی هێزی دەریایی یۆنان خەرج بکرێت، بیرۆکەکانی ئارس تید بە رادەیەك بۆ خەڵکی یۆنان ناخۆش بوو کە پێش هێرشی خەشایارشا بۆ یۆنان، ئەویان لە وڵات دوورخستەوە و دوورخستنەوە سزای ئەو پیاوە سیاسیانە بوو کە لێیان تورە دەبوون.

پاشای ئەسینا پیاوێك بوو بە ناوی (تێمیستۆکێل) و ئەو دەیگووت: وتەکانی ئاریس تید تەنها لە وڵاتێك دەگونجێ کە دانیشتوانی تەنانەت لە خوایانیش بەرزتر بن، چونکە لەناو خوایانیشدا جیاوازی و گەورە و بچووکی هەیە و خودای خوایان ئامادە نییە هیچ خوایەکی تر بە هاوشانی خۆی بزانێت، لە وڵاتێك کە دانیشتوانەکەی خۆپەرست و خۆبەزل زان و چاو برسی بن، کۆیلایەتی هەر دەمێنێت و هیچ کات ئەو رۆژە نایەت دانیشتوانی ئەسینا و وڵاتانی تر یەکسان بن، لە ژیاندا دەبێت بەدوا ڕاستی بکەوین نەك خەیاڵ. تێمیستۆکێل پیاوێکی رئالیست بوو و باوەڕی وابوو ناکرێت لەوکاتەدا کۆیلەکان هەمان مافی خەڵکی ئەسینایان هەبێت.

لە ساڵی (٤٨٠ پ. ز) کاتی هێرشی خەشایارشا بۆ یۆنان، هێشتا ئەفلاتوون نەهاتبۆوە دنیا تا بیروڕاکانی لە بارەی (مدینە الفاچلە) بنووسێت و (٥٣) ساڵ دواتر لە دایك بوو، بەڵام تەنانەت ئەویش کە لە (مدینە الفاچلە) کۆمەڵگەیەکی ئایدیالیستی پەروەردەدەکرد تا هەموان تیایدا بەختەوەر بن و کەس هەژار نەبێت و هەموو بەساڵاچووەکان مووچەیان هەبێت، نەیتوانی کۆیلە و خزمەتکارەکانی ئازاد بکات. ئەو کۆیلەکانی بۆ بەردەوامی ژیانی یۆنان بە پێویست دەزانی و هەرکەسێك نووسینەکانی خوێندبێتەوە، دەزانێت ئەفلاتوون کۆیلە و خزمەتکارەکان بە کەسانێکی کەمتر لە خەڵکی ئەسینا دەناسێت.

دوای گەیشتنی لەشکری خەشایار بۆ یۆنان، تیمیستۆکیل وتی نابێت ڕێگە بدەین هەخامەنشییەکان لە ئەسینا نزیك ببنەوە و پیش گەیشتنیان بە باشووری یۆنان، پێویستە بچین و لە باکوور ڕێگەیان بگرین، تا جەنگ لە وڵاتێکی تر بێت نەك لە وڵاتەکەمان. تاکتیکی ئەو وەك تاکتیکی بەریتانییەکان بوو لە سەدەی نۆزدە و نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم و پێیان وابوو پێش ئەوەی دوژمن بگاتە ناو خاکی بەریتانیا دەبێت لە ناو ببرێت، چونکە دوای گەیشتنیان بە کەنارەکانی بەریتانیا جەنگ لەناو بەریتانیا دەبێت و شارەکان و دامەزراوە کشتوکاڵی و پیشەسازییەکان لەناو دەچن.

تیمیستۆکیل پێشنیاری کردبوو تا دە هەزار سەرباز کە هەموویان کاسکێت و قەلغان و هەموو پێداویستی جەنگیان هەبێت، بچن و لە باکووری مەقدۆنیا پێش بە لەشکری هەخامەنشی بگرن. بەڵام دوو گرفت بۆ ئەو بیرۆکەیە هەبوون، یەکەمیان ئەسینا بە تەنها توانای ئامادەکردنی دەهەزار سەربازی نەبوو و دەبەایە هەموو دەوڵەتە شارەکانی تری باشووری یۆنان سەرباز ئامادەبکەن و هەر یەکەیان تێچووی جەنگەکەش بە پێی ڕێژەی سەربازەکانی بدات، دووەم سەربازانی ئەسینا و دەوڵەتە شارەکانی تر بڕوایان وابوو کە باکوور وڵاتی تری لێیە و نیشتیمانی ئەوان نییە، ئەوان دەبێت لە وڵاتی خۆیان بەرگری بکەن و پێویست ناکات بچنە ئەوێ بۆ بەرگری. جگە لەوە ئەو وڵاتانە ئامادە نەبوون تا یەك کەس بکەن بە فەرماندەی خۆیان و ئێسپارتییەکان خۆیان بە خاوەنی ئەو مافە دەزانی کە فەرماندەی تەواوی سوپاکە بن، چونکە هێزی بازوویان زیاتر و شمشێر وەشاندنیان باشتر بوو لە ئەوانی تر و سەربازە ئێسپارتییەکان لە یۆنان بێ هاوتا بوون.

تیمیستۆکیل دەیوت: لە جەنگدا تەنها هێزی بازوو و شمشێر لێدان نییە کە فەرماندەیی لەشکرێك بەڕێوە دەبات و ئەگەر بڕیار بێت فەرماندەیی لەشکر لەسەر ئەو بنەمایانە بێت، ئەوا دەبێت تەواوی سەردار و ئەفسەرەکان لە نێوان ئەو کەسانە دیاری بکرێن کە هێزی بازوویان زۆرە و بە باشی شمشێر دەوەشێنن. بەڵام دەزانین زۆربەی سەردارەکان لەو کەسانەن کە هێزی بازوو و شمشێر وەشاندنیان وەك پێویست نەبووە و لە بەرانبەردا زیرەك و داهێنەر بوونە و توانای گواستنەوەی خێرا و بڕیاردانی بە پەلەیان هەبووە و بەو خەسڵەتانە لە جەنگدا سەرکەوتوون.

پرۆفیسۆر بارن مامۆستای مێژووی یۆنان دەڵێت: یۆنانییەکانی باشوور و نەتەوەکانی ئەسینا و ئێسپارت وایان بیردەکردەوە کە خەشایار زانیاری نییە لە بارەی بارودۆخی ڕێگاکانی

یۆنان و ئەو ناوەندانەی ئاوی فراوانیان لێ دەست دەکەوێت و ئەو شوێنانەی دەتوانێت بۆ لەشکرکەی خۆراکی لێ بکرێت، بەڵام ئەو زانیاری لە بارەی هەموو ئەو ڕێگایانە هەبوو کە دەبوایە پێیاندا بڕوات و هەروەها هەموو ناوەندەکانی ئاو و شوێنەکانی خۆراکی دەناسی و نەخشەی ڕێکردنی لەشکرەکەی لای خۆی بوو، ئەو نەخشەیە بە پێی زانیارییەکانی ئەو کەسانەی خەشایار دەیناردن و یا بەهۆی ئەو زانیاریانەی کە خودی یۆنانییەکان دەیان نارد، ئامادەکرابوو.

بە پێی نووسینەکانی بارن و پشت بەستن بە مێژووە کۆنەکانی یۆنان، خەشایار یەك ساڵ پێش جووڵەی لەشکرەکەی هەندێ سیخوری ناردووە بۆ یۆنان و ئەوان لەگەڵ خێڵەکانی ئەوێ ڕێك کەوتوون تا لە کاتی هاتنی خەشایاردا، خۆراکی پێویست بۆ لەشکرەکەی دابین بکەن. بەڵام داریوش نەدەبوایە چاوەڕوان بێت تا ئەوان بێنە ریزی لەشکرەکەی و لە گەڵ لەشکری یۆنان بجەنگن. سیخورەکانی خەشایار ئەو زانیاریانەی دەستیان دەکەوت لە ڕێگەی ناوەندی لەشکرەکە لە لیدی بۆ خەشایاریان دەنارد.

کاتی باسکردنی جەنگی ماراتوون کە هەخامەنشییەکان یا پێشەنگی لەشکرەکەیان شکستی خوارد، باسمان کرد کە یۆنانییەکان نەخشەیەکی لەشکری داریوشیان دەست کەوت و دەرکەوت ئەوان ئەوکاتیش نەخشەیان دەکێشا. ئەستەمە ئەوان زانیاریان لە بارەی هێڵەکانی زەوی هەبووبێت و لە گەڵ ئەوەشدا نەخشەکانیان بە سوود بوون، چونکە ڕێگەی لەشکری هەخامەنشی لە نەخشەی خەشایار بە شێوەیەك بوو کە لە هەر شوێنێك دەیتوانی دووری خۆی بەرانبەر ئاو دیاری بکات و دەیزانی مەودای نێوانیان لەگەڵ ئەسینا چەندە.

بارن دەڵێت هەرچەندە لە سەردەمی خەشایار و تیمیستۆکیلدا پۆلیسی نهێنی و دامەزراوەی هاوچەشن نەبووە تا سیخورەکانی خەشایار بدۆزنەوە و سزایان بدەن، بەڵام وێڕای ئەوەش هاتنی ئەو سیخورانە فیداکاری پێویست بوو، چونکە یۆنانییەکان ئاگادار بوون کە هەخامەنشییەکان سەرگەرمی ئامادەکردنی پێداویستی جەنگن بۆ هێرش کردن بۆ یۆنان و روخساری ئێرانییەکانیش بە شێوەیەك بوو کە دەناسران.

ئەوان ریش و سمێڵیان دادەنا و یۆنانییەکان بە پێچەوانەی ئەوان ریش و سمێڵیان دەتاشی و جلوبەرگی پیاوە ئێرانییەکان هەرچەندە وەك جلوبەرگەکانی یۆنانییەکان درێژ بوون، بەڵام شێوەیان لە یەکتر زۆر جیاواز بوو و روونیشە کە مەبەستمان لە جلوبەرگی درێژی یۆنانی، جلوبەرگی خەڵکی سیڤیل و ئاساییە و نەك سەربازی. هەموو سیخورەکانی هەخامەنشی

دەیانزانی ئەگەر بگیرێن لەوانەیە بکوژرێن، بەڵام خۆبەخشانە بەو کارە هەستابوون و ڕۆیشتبوون بۆ یۆنان و لە ڕاستیدا خۆبەخشی مەرگ بوون.

به ڕای هەندێ کەس هەموو سیخورەکان وەك (خاوەن ئاژەڵ) چوون بۆ یۆنان و لە هەموو دەوڵەتە شارەکانی یۆنان کە دەکەوتنە سەر ڕێگە و دەوروبەری ڕێگەی هاتنی خەشایار بڵاوبوونەوە و کەس گرفتی بۆ دروست نەکردن، چونکە لە یۆنان خاوەن ئاژەڵەکان پارێزراو بوون و تەنانەت دوای هێرشی خەشایاریش بۆ یۆنان، ئەوان پارێزراو بوون و یۆنانییەکان ڕێزیان لێ دەگرتن. هەر یەکە لەو بە ناو خاوەن ئاژەڵانە کۆمەڵێك کەسی لەگەڵ خۆی بردبوو و بە دەوڵەتە شارەکانی یۆناندا بڵاوی کردبوونەوە.

خەشایار دەگەیشتە هەر یەك لەو دەوڵەتە شارانە، سیخورەکان و هاوڕێکانیان دەهاتن و لەگەڵ ئەو دەکەوتن و هەموو ئەو زانیاریانەی دەستیان کەوتبوو، دەیاندایە دەست خەشایار و دواتر ئەو زانیاریانەی پێویست بوون دەخرانە سەر نەخشەکە و ئەوانی تریش هەڵدەگیران تا لە کاتی پێویست کاریان پێ بکرێت، سیخورەکان و ئەوانەی لە گەڵیاندا بوون نەتەنها زانیاریان بۆ خەشایار وەردەگرت، بەڵکو لە وڵاتەکانی باکووریش سەرگەرمی پرۆپاگەندە بوون.

پروپاگەندەکانی ئەوان لە وڵاتانی باکووری یۆنان پەرەی گرتبوو و لە سەر بنەمای دوو تەوەر بوون، یەکەم بێزراو کردن و دابڕینی هەر دەوڵەتە شارێك بەرانبەر بە ئەوی تر و بە تایبەتی دەوڵەتەکانی باشووری یۆنان کە ناوەندی هونەر و زانست و نیشتیمان پەروەری یۆنان بوون، دووەم دانیشتوانی ناوچە جیاوازەکان لە جەنگ بێزراو بکەن و بڵێن کە پاشای هەخامەنشی نایەوێت لەگەڵ هیچ یەك لە نەتەوەکانی یۆنان بجەنگێت، چونکە هیچ یەك لە دەوڵەتە شارەکانی یۆنان خەراپەیان لە دژی نەکردووە و تەنها نەتەوەی ئەسینا بەرانبەر بە پاشای هەخامەنشی خەراپەیان نواندووە و هێرشیان کردووتە سەر ئاسیای بچووك و شاری ساردیان سووتاندووە و وێرانکردووە، ئەگەر پاشای هەخامەنشی لەشکر بێنێت بۆ سەر یۆنان، تەنها بۆ ڕۆیشتنە بۆ ئەسینا و بۆ مەبەستی جەنگ نییە لەگەڵ نەتەوەکانی تر.

پرۆپاگەندەچییەکانی هەخامەنشی بۆ بێزراو کردنی ئەسینا لە بەر چاوی نەتەوەکانی باشووری یۆنان، دەیانووت: ئەسینا هیچ کات بۆ نەتەوەکانی یۆنان لە ئازار و ئەزیەت زیاتر نەبووە و تەنها لە کاتی مەترسیدا، باسی لە یەککگرتوویی نەتەوەیی و ڕەگەزی لەگەڵ ئێوە کردووە و هاواری کردووە کە (ئەی یۆنانییەکان ئازایەتی بنوێنن و هەستن بەرگری لە وڵاتەکەتان بکەن) لە کاتێکدا مەترسی لەسەر نەتەوەکانی تر نییە و تەنها مەترسی لەسەر ئەسینایە.

ئەسینا لە کاتی ترسدا نەتەوەکانی تری دێتەوەیاد و دەڵێت شمشێر بگرنە دەست و دوای تەنگانەش نەتەوەکانی تریان لەیادنابێت و خانەدانەکانی ئەسینا دەوڵەمەندی وڵاتەکەیان تەنها بۆ خۆشی خۆیان خەرجدەکەن و تا ئێستا تەنانەت یەکجاریش یارمەتی نەتەوەکانی تری یۆنانیان نەداوە.

ئەو پڕۆپاگەندانە کاریگەری تەواویان هەبوو و خەڵکی باکووری یۆنان نەیانویست لەگەڵ خەشایاردا بجەنگن و تەنانەت ئەوانەی دوودڵیش بوون، دوای هاتنی لەشکری هەخامەنشی کە دیتیان ئەوان پارەی ئەو خۆراکانە دەدەن کە دەیانکرن، دوودڵیان فرێدا و بڕیاریاندا لەگەڵ خەشاریاردا نەجەنگن. ئەوەی مێژوونووسانی ڕۆژئاوا لە بارەی پروپاگەندەی نێوان یۆنان و هەخامەنشی نووسیویانە، دەریدەخات ئەو بابەتەش شتێك نییە کە لە سەدەکانی هاوچەرخدا هاتبێتەکایەوە و دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمانی کۆن.

خەشایارشا داهێنەری ئەو جۆرە پڕۆپاگەندەیە نەبووە، بەڵکو کوروشی دامەزرێنەری زنجیرەی هەخامەنشی ئەو کارەی پێش ئەو کردووە و پێش ناردنی لەشکرەکەی بۆ هەر جەنگێك (بۆ ئەو نەتەوانەی خاوەن شارستانییەت بوون نەك نەتەوەی وەك سکاکان)، هەندێ کەسی دەنارد تا پروپاگەندە بکەن و بڵێن: پاشای هەخامەنشی لە گەڵ دانیشتوانی وڵات ناجەنگێت و تەنها دەیەوێت سەرکردەکانی وڵاتەکانیان لا بدات و ئەو پروپاگەندانە کاریگەریان دەبوو لە بارودۆخی جەنگ.

*        *        *

ئەگەر بمانەوێت ڕایەکی بابەتیانە لە سەر جەنگی هەخامەنشی و یۆنانییەکان بدەین، دەبێت بڵێین کە هیچ یەك لە نەتەوەکانی یۆنان نەیانویستووە لەگەڵ هەخامەنشییەکان بجەنگن، جگە لە ئەسینا و ئێسپارت و ئەوان یۆنانییەکانیان هاندەدا و ئەوانیان ناچار دەکرد تا لەگەڵ هەخامەنشییەکان بجەنگن.

هۆکارەکەشی بریتی بوو لە ئەوەی ئەسینا دەیانزانی خەشایارشا تەنها بۆیە هاتۆتە یۆنان تا ئەسینا وێران بکات، چونکە وتمان ئەسینابییەکان شاری سارد پایتەختی لیدی کە لە وڵاتە بەرفەرمانەکانی هەخامەنشی بوو، سووتاند و وێرانیان کرد.

هەروەك پرۆفیسۆر بارن نووسیویەتی مەبەستی خەشایار تەنها وێرانکردنی ئەسینا لە تۆڵەی شاری سارد نەبوو و دەیەویست بە وێرانکردنی ئەو شارە، بازرگانی رۆژهەڵاتی ئەورووپا لە یۆنانەکان بستێنێتەوە. ئەسینا لە دەریاوانیدا لە هەموو دەوڵەتەشارەکانی تر لە پێشتر بوون و بەهێزی ئەوان بۆ هەخامەنشییەکانی کێشە بوو و بۆیە دەیانەویست لەناویان ببەن و دەست بگرن بە سەر بازرگانی رۆژهەڵاتی ئەورووپادا.

بە گەیشتنی لەشکری خەشایار بۆ خاکی یۆنان، پەرلەمانی ئەسینا بڕیارنامەیەکی دارِشت کە ئەو خاڵانەی خوارەوەی لەخۆ گرتبوو:

(١) هەر یۆنانییەك خۆی ڕادەستی دوژمن بکات، ناپاکی کردووە و دوای ئەوەی دوژمن شکستی خوارد، سزا ددرێت.

(٢) یۆنانییەکان بەرانبەر بە دوژمن دەبیت سیاسەتی زەوی سووتاو پەیرەوی بکەن و هەر شتێك کە دوژمن بتوانێت سوودی لێ وەربگرێت، دەبێ لەناوی ببەن و یەك دەنکە گەنم و مەرێك و یەك پیاڵە شەراب نابێت بۆیان بەردەست بێت.

(٣) هەموو پیاوانی یۆنانی دەبێت ئامادەی بەرگری بن لە وڵاتەکەیان و کاریان بەجێ بهێڵن و بەرەو جەنگی دوژمن بڕوات تا لە خاکی یۆنانی دەربکات.

بەڵام ئەو یاسایە کە بابەتی بەرچاوی تێدابوو، لەبەر ئەوەی لە پەرلەمانی ئەسینا دەرچووبوو لای نەتەوەکانی تری یۆنان پەسەندنەبوو و ئەوان دەیانووت گەنم و مەڕ و شەرابی خۆمان بۆ ئاسوودەیی خانەدانەکانی ئەسینا لەناو نابەین و پێداویستییەکانی ژیانمان لەناو نابەین. تا خەشایار زیاتر لە ناو خاکی یۆناندا پێشرەوی دەکرد واتە بەرەو باشوور دەرۆیشت، نەتەوەکانی باکووری یۆنان زیاتر بەبێ بەرگری خۆیان ڕادەست دەکرد و تەنانەت هەندێ لەو خێڵانەی لە کوێستانەکان دەژیان و ئەسینا چاوەروان بوو بەرگری بکەن، خۆیان بە دەستەوەدا.

لە یۆنان پەرستگایەك بە ناوی دۆڵفی هەبوو کە (فالْ گرەوەیەکی) تێدابوو و خەڵك بۆ وەرگرتنی زانیاری لەبارەی داهاتوویان سەردانیان دەکرد و ئەو بەناوی خوایانی یۆنان وەڵامی دەدانەوە و خەڵکیش باوەڕیان وابوو وتەکانی ئەو، وتەی خوایانی یۆنانن.

خەڵك لەو فالگرەوەیان پرسی تا لە خوایانی یۆنان پرسیار بکات: ئایا یۆنانییەکان لەو جەنگەی لە پێشیانە سەردەکەون یا نا؟

خواکان لە وەڵامدا وتیان: هەخامەنشییەکان سەرکەوتوو دەبن.

دووباره خەڵك لە ڕێگەی غەیب بێژلە خوایانی یۆنانیان پرسی: بۆچی هەخامەنشییەکان سەردەکەون؟

خوایانی یۆنان وەڵامیان دایەوە: چونکە هەخامەنشییەکان یەکگرتوون و یۆنانییەکان بە یەکەوە ناکۆکن.

کاتی خوێندنەوەی چیرۆکی جەنگی خەشایار و یۆنان، ئەوەی لە هەموو شتێك زیاتر جێگەی سەرسوڕمانە ئەوەیە کە یۆنانییەکان وێڕای هەموو ئەو مەترسیانەی هەبوون، ناکۆکیەکانیان نەخستە لاوە و یەکگرتوویيان هەڵنەبژارد، هەڵەی ئێمە لەوەدایە کە پێمان وایە هەموو ئەوان و یا هەموو ئەورووپییەکان یەك نەتەوەن و چونکە هەموویان خوایانی شاخی ئەلەمپیان دەپەرستی. هەڵەی ئێمە لەوەدایە کە پێمانوایە ئەورووپییەکان هەموویان یەك نەتەوەن، چونکە هەموویان کریستیانن.

ئایا لەساڵی (١٩٣٣ ز) کە هیتلەر بوو بە سەرۆك وەزیرانی ئاڵمان تا ساڵی (١٩٣٩ ز) کە جەنگ دەستی پێکرد، نەتەوەکانی ئەورووپا هەستیان بە مەترسی نەدەکرد؟ ئەگەر لە ساڵی (١٩٣٣ ز) مەترسیەکانی ئاڵمان بۆ نەتەوەکانی ئەورووپا ئاشکرا نەبوون، خۆ لە ساڵەکانی (١٩٣٧. ١٩٣٨ ز) کە هیتلەر ئۆتریشی داگیرکرد و چیکوسلوڤاکیای دابەشکرد بە تەواوەتی ئاشکرابوو کە هیتلەر مەبەستی هێرشە بۆ وڵاتانی تر، بەڵام نەتەوەکانی ئەورووپا وێڕای ئەوەی ئەو مەترسیەیان بە چاوی خۆیان دەبینی، بەرانبەر بە ئاڵمان یەکگرتوو نەبوون و هەر نەتەوەیەك تەنها بیری لە خۆی دەکردەوە و دەیویست بە شێوەیەکی لیَ بێت کە ئاگری جەنگ نەگاتە ئەو. دۆخی یۆنانیش لەو کاتەی خەشایارشا گەیشتە ناو ئەو وڵاتە، لە ڕوانگەی یەکگرتوو نەبوون بە دۆخی نەتەوەکانی ئەورووپا لە سەردەمی هێرشی گەورەی هیتلەر دەچوو.

هەرچەندە نەتەوەکانی یۆنان یەك ئایینیان هەبوو، بەڵام نە یەك نەتەوە بوون و نە یەك ڕەگەزیان هەبوو و هەر نەتەوەیەك تەنها دەیویست باغ و کێڵگە و کانەکانی خۆی بپارێزێت و بەلایەوە گرنگ نەبوو چ بە سەر ئەوانی تردا دێت و ئایا ئەوان دەمێنن یا لەناو دەچن. سیستەمی بەڕێوەبردنی حکومەتیش لە تەواوی دەوڵەتە شارەکاندا لەگەڵ یەکتر جیابوو و بە پێچەوانەی بیرکردنەوەکان لە هەموو شوێنەکان دیموکراسی نەبوو و تەنانەت لە ئەسینا کە لە ڕووی پێشکەوتنی سیاسی بە پێشکەوتووترین وڵات دەناسرا، دیموکراسی ڕاستەقینە[٦] نەبوو و

(٦) (سیستەمی دەوڵەتەشاری یۆنانی بۆ خۆی دیموکراسیەتی یۆنان بووە کە هەر شارێك توانیویەتی گەورەیی و دەسەڵاتی خۆی هەبێت و لە ئەسینای (٢٥) سەدە پێش هەموو هاووڵاتیان جگە لە کۆیلە مافی بەشداری سیاسیان هەبووە و ئەمە بۆ ئەوکات لوتکەی پێگەیشتنی سیاسی بووە و هیچ گومان لەو بارەوە نییە،

کۆیلەکان کە زۆرینەی دانیشتوانی وڵاتەکە بوون مافی سیاسیان نەبوو، هەندێ لە دەوڵەتە شارەکان پاشای تاك رەویان هەبوو و هەر چونێکی ویستبای ئاوا لە گەڵ خەڵکەکەی رەفتاری دەکرد. هەندێکیشیان لە لایەن ئەنجوومەنێك لە خانەدانەکان بەرێوەدەبرا و یەك دەستە لە خانەدانەکان وڵاتیان بەریوەدەبرد.

ئێسپارت لە رووکاردا سیستەمی دیموکراسی هەبووە، بەڵام لە ڕاستیدا بە ئەنجوومەنێکی خانەدانی بەرێوەدەبرا، چونکە تا ئەو رۆژەی ئێسپارت ئەنجوومەنی هەبوو ، بە خانەدانەکان بۆ ئەنجوومەنی وڵاتەکە هەڵدەبژێردران و ئەوان ئەوەندە کاریگەریان هەبوو کە گەنجەکان نەیان دەوێرا تەنانەت ڕایەك بە پێچەوانەی ڕای ئەوان بڵێن.

ئەو بڕیارەی پەرلەمانی ئەسینا دەریکرد، لە لایەن نەتەوەکانی یۆنان پابەندی نەبوون و لە هیچ شوێنێك خەڵك گەنم و مەڕ و شەڕاب و روونی زەیتونی خۆیان لە ناو نەبرد و باغەکانیان وێران نەکرد تا سەربازە هەخامەنشییەکان لە بەرەکانیان نە خۆن. سەربازانی هەخامەنشیش لە هیچ شوێنێك ئازاری خەڵکیان نەدا و خەسارەتیان پێ نەگەیاندن.

پێش ئەوەی خەشایار وڵاتی مەقدۆنیا بەجێ بهێڵێت و بگاتە وڵاتی (تسالی) کە کەوتبۆوە باشووری مەقدۆنیا، هەندێ لە خەڵکی تسالی چوون و لە فاڵ گرەوەکەی پەرستگای دۆلفیان ویست تا لە خوایانی یۆنان بپرسێت: چوون دەتوانن خەشایار نەرم بکەن و ڕازی بە ئاشتی بکەن و ئایا باشتر نییە بۆ ئەو مەبەستە کورانی قۆز یا کچانی شۆخی پێشکەش بکەن؟

خوایان وەڵامیان دایەوە: خەشایار نەفرەت لە کوڕانی قۆز دەکات، بەڵام کچی شۆخی خۆشدەوێت و لە کاتی جەنگدا نایەوێن، چونکە ئەگەر ئەو کچی شۆخی لا بێت، تەواوی لەشکرەکەی کچیان دەوێت.

گەورەکانی تسالی وتیان: ئەی چوون دەتوانین وابکەین کە ئاشتی بکات و جەنگمان لەگەڵدا نەکات؟

---

ئێستاش پاش (٢٥) سەدە زۆرن ئەو وڵاتانەی ناتوانن مافی گەلەکانیان بدەن و یەك لەو وڵاتانەش ئێرانە کە بە فەرمی ئێرانی بوونیان ڕاگەیاندووە، بەڵام لە ڕاستیدا شیعەچییەتی و فارس بوون بنەمای گەورەییە لە وڵات و بە درێژایی مێژووەکەسی وێڕای بانگەشەی زۆریان بۆ پێگەیشتوویی وڵاتەکەیان، نەیتوانیوە ببێتە خاوەن سیستەمی دیمۆکراسی، وەرگێر بۆ کوردی)

خوایان وەڵامیان دایەوە: بچنە پێشوازی و لە بەر دەمیدا مەڕێك سەر ببڕن، ئەو ئاشتیتان لەگەڵدا دەكات. خەڵكی باكووری تسالی هەمان كاریان كرد و بە مەڕێكەوە چوونە پێشوازی خەشایار و مەڕەكەیان لەبەر پێی خەشایاردا سەربڕی و ئەویش ئاشتی لە گەڵدا كردن.

وولاتی تسالی كە دواتر خەشایارشا دوای تێپەڕبوون لە مەقدۆنیا چۆوە ناوی، تەنها یەك وڵات نەبوو و چەند دەوڵەتە شارێكی تێدا بووە كە یاساكانی یەكتریان لا پەسەند نەبوو، بەڵام هەموویان كە دەیان بیست باكووری تسالی چوونە پێشوازی و مەڕیان سەربڕیوە، هەمان كاریان دەكرد و ئاشتیان لە گەڵ خەشایار دەكرد. كاتێك هەواڵی ئاشتی كردنی هەر شار یا دەوڵەتە شارێك لە گەڵ خەشایار دەگەیشتە ئەسینا، ڕاستەوخۆ ئەسینا تورەیی زیادی دەكرد و ئەوانیان بە ناپاك بەرانبەر یۆنان دەناساند و دەیانووت دوای ئەوەی جەنگی ئێمە و هەخامەنشی تەواو بێت، هەموو ئەو ناپاكانە سزا دەدەین.

لە ناو ئەسینا یاسای ئامادەباشی گشتی لە لایەن ئەنجوومەنی ئەسیناوە ڕاگەیاندرا و دەقە یۆنانییەكەی كە یەك لە بەڵگەنامە گران بەهاكانی جیهانە كە تا ئێستا ماوە. شێوەی نووسینی یاساكە هەمان ئەو شێوەیە كە لە هەموو بەڵگەنامە یۆنانییەكاندا هاتووە و پێدا هەڵدانی تێدایە كە ئێستا پەسەند نییە و ئەوكات لە یۆنان بە پێویست دەزاندرا و هەموو بەڵگەنامەكان دەبوایە بەو شێوە بنووسرێن. دەزانین ئەگەر دەقی بەڵگەنامەكە بخەینەروو، خوێنەر بە هۆی ناوی شوێن و كەسەكان و ناو و پێداهەڵدانی خودایانی یۆنان و... هتد بە تەواوی ماندوو دەبێت و بۆیە تەنها چەند دێڕێك لە سەرەتا و چەند دێڕێك لە كۆتایی دەقەكە لە خوارەوە هاتووە:

(.... با بە نەگوتراوی نەمێنێتەوە كە لێرە كە پەرلەمانی ئەسینایە، تیمیستۆكیل كوری ئێئۆ كێلس كە خەڵكی ناوچەی فەراروونیە پێشنیاری كرد كە ئەو شارە واتە ئەسینا كە پارێزەرەكەی خواوەندی ئێمە (ئاتێنە) یە پێویستە بەرگری لێ بكرێت و ڕێگە بە بەربەرەكان (مەبەست هەخامەنشییەكانە) نەدرێت كە هەنگاو بنێنە ناو ئەو خاكە پیرۆزە و ئەو شارە پیرۆزی لە لایەن خوایانەوە پێ بەخشراوە، بە پیسی ئەوان ئاڵودە ببێت.)

(.... تۆ ئەو پیاوەی داس یا ڕەندەت (واتە جووتیار و دارتاش) بە دەستەوەیە، هەستە و تۆ ئەو كەسەی گۆچانت بە دەستەوەیە (خانەدانەكانی ئەسینا گۆچانیان هەڵدەگرت) ڕاپەڕە و كاتی هاتووە تا بۆ خوایان و ئەسینا جەنگ بكەی و ئەوە تۆی كە بۆ پارێزگاری لە خوایان و ئەسینا خۆت فیدا دەكەی.)

لەو فەرمانەدا کە ژمارەیەکی زۆر ناوی تێدا هاتووە، فەرمان کراوە تەواوی پیاوان بچنە جەنگ و هەموو کارەکان بە ژنان بسپێرن و ژنەکان لە جیاتی پیاوان کشتوکاڵ بکەن و دارتاشی و ئاسنگەری و... هتد بە ژنان بسپێردرێت و تەواوی پیاوان لە سەرۆك کۆمار تا دوایین کۆیلە جگە لە بەساڵاچووان و نەخۆشەکان کە توانای جەنگیان نییە، چەك بە دەست بگرن و تەنانەت ئەوانەی بە هۆی تاوانی سیاسی لە وڵات دەرکراوە، بگەڕێندرێنەوە و بۆ ئەو جەنگە خۆیان ئامادەبکەن و مەبەست لە دەرکراوە سیاسیەکان لە نیشتیمان، تاوانبارانی سیاسی بوون کە ئەوانیان لە ئەسینا دەرکرد بوون.

وەك دیارە لەو فەرمانەدا هەموو کۆیلەکانیش بۆ خزمەتی سەربازی و جەنگ داوا کراون و هەموو کۆیلەکان جگە لە کۆیلە ژنەکان پێویستە بچن بۆ مەیدانی جەنگ. لەو فەرمانەدا فەرمانی خۆکۆکردنەوەی هێزی دەریاییش دەرچووە و تەواوی کەشتییە جەنگییەکانی ئەسینا ئەرکی جەنگیان پێ سپێردرا.

هاوکات وێڕای ئەوەی ئەو فەرمانە بانگهێشتی گشتی بوو، بە هاندەری نیشتیمانی بۆ خەڵکی یۆنان دەژمێردرا تا داستان تۆمار بکەن و کۆتایی فەرمانەکە بەم ناوەرۆکە هاتووە:

(بەربەرەکان بکوژە و لاشەکانیان بخە ناو دەریا و رێگە مەدە یەك کەسیان بە زیندوویی بگەرێتەوە و تەنانەت ئەگەر بۆ گێرانەوەی چیرۆکی نەنگی خۆشیان بێت بۆ ئەوانی تر و... )

نازانیین دوای پیتی (و) چیتر هاتووە، چونکە بەشی کۆتایی ئەو جارنامەیە لەناو چووە و ئێمە وەرگێڕاوی ئەومان لە لێکۆڵینەوەکانی پرۆفیسۆر بارن مامۆستای زانکۆی گلاسکو وەرگرتووە.

پرسیار دەکرێت ئایا ژنانی یۆنانی توانای بەرێوەبردنی کارەکانی کشتوکاڵ و پیشەوەریەکانی وڵاتەکەیان هەبوو و دەیانتوانی لە جیاتی پیاوەکانیان ئەو کارانە بکەن؟ پێمانوایە ئەو کارانە بۆ ژنە خانەدانەکان ئەستەم بوون و ئەوان نەیاندەتوانی دروێنە و جووت و ئاسنکاری و... هتد بکەن و ئەو فەرمانە بۆ کۆیلە ژنەکان بووە کە پێشتریش تەواوی کاری پیاوان شارەزا ببوون، ئەو کارانە بە گشتی بۆ ئەو کەسانەی ئەزموونیان تیایاندا نییە زۆر سەختە.

هەموو پیاوانی ئەسینا لە کاتی ئاشتیدا خزمەتی سەربازیان ئەنجامدابوو و بۆ جەنگ پەروەردەکرا بوون، بەڵام پەروەردەی ئەوان وەك پەروەردەی پیاوانی ئێسپارت (لاکە دەموون یا لاسە دەموون) نەبوو.

پەروەردەی سەربازی پیاوانی ئێسپارت بەرزترین شێوەی پەروەردەی سەربازی بوو لە جیهان و ئەوان بە شێوەیە پەروەردەدەکران کە لە مەیدانی جەنگدا ماندوو نەبن، شمشێر و تەور

وەشاندن زوو مرۆڤ ماندوو دەکات و بۆیە زۆربەی لەشکرەکانی ئەوکات پەروەردەیان لە سەر بنەمای ماندوو نەبوونی سەربازەکانیان و توانای بەرگەگرتنی چەندین کاتژمێر لە وەشاندنی شمشێر و تەور و گورزیان بوو.

لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمدا (کلۆس وێتز) ئالّمانی دەیوت: هەموو بابەتێك لە جەنگدا پێشبینی کردنی ئاسانە، تەنها پێشبینی کردنی ئەو ماندووبوونە ئاسان نییە، کە رووبەرووی سەربازەکان دەبێتەوە. ئەمە لە کاتێکدا کە لە سەردەمی کلۆس وێتز چەکی سەربازان گۆڕا بوو بە تفەنگ و تۆپ و وەك جاران شمشێر و تەور و... هتد نەبوو، کە پێویستی بە توانای جەستەیی زیاتر هەیە.

بەڵام ئەگەر پەروەردەی سەربازی پیاوانی ئەسینا وەك هی پیاوانی ئێسپارت بەرچاو نەبوو، بەڵام لە بەرانبەردا ئەوان ئەوەندە وەرزشیان دەکرد کە ئەو کەموکورتییەی پڕ دەکردەوە و لە مەیدانی جەنگدا زوو ماندوو نەدەبوون. لە ئەسینا کۆیلەکان لە کاتی ئاشتی بۆ خزمەتی سەربازی نەدەبردران، ئەمەش بۆ رێگرتن لە یاخی بوونیان بوو، یاخی بوونی کۆیلەکانی رۆما لە سەدەی یەکەمی زایینی بە ڕابەری (ئێسپارتاکۆس) دەگەڕایەوە بۆ ئەوەی هەندێ لە کۆیلەکان بۆ کارەکانی (سیرك) پەروەردەکرابوون تا بتوانن شمشێر بە باشی بوەشێنن و بەم کارەش بازووەکانیان بەهێز بوو و توانای یاخی بوونیان هەبوو، سەرەنجام یاخی بوون و کۆیلەکانی تریش چاویان لە ئەوان کردەوە.

دانیشتوانی ئەسینا تێگەیشتووتر بوون لە رۆمییەکان و بەو شێوەیە نەیانهێشت کۆیلەکانیان توانای یاخی بوون و ئامادەکردنی لەشکریان هەبێت. تێزارەکانی رۆسیا لە سەردەمی ئیمپراتۆریەتی رۆسیادا هەمان شێوازیان بەرانبەر بەو وڵاتە موسوڵمانانە بەکارهێنا کە داگیریان کرد بوون و ببوونە بەشێك لە خاکی رۆسیا، هەرچەندە یاسای خزمەتی سەربازی گشتگیر بوو، بەڵام ئەوانیان بۆ سەربازی نەدەبرد و موسوڵمانەکان وایان بیردەکردەوە کە ئەو کارەی تێزارەکان بۆ چاکەیە لەگەڵیاندا. لە کاتێکدا ئەوان بەو هۆیە هونەرە جەنگییەکان فێر نەدەبوون و نەیاندەتوانی لە دژی تێزارەکان ڕاپەرن و سەربەخۆیی خۆیان وەربگرن، ئەو بابەتە لە لایەن (کێرنسکی) سەرۆکی حکومەتی کاتی روسیا لە دوای رووخانی ئیمپراتۆریەتی رۆسیا لە ناو بیرەوەریەکانیدا نووسراوەتەوە.

باسمان لە بوونی پەرستگایەك بە ناوی دۆلفی لە یۆنان کرد کە لە ئەوێ فالّ گرەوەیەك هەبوو کە بە بروای یۆنانییەکان پەیوەندی لەگەڵ خودا هەبوو و خەڵکی یۆنان لە رێگەی ئەو

روویان دەکردە خودایان و لە ڕووداوەکانی ئایندە ئاگادار دەبوون. چونکە ئەو پەرستگایە لە مێژووی جەنگەکانی هەخامەنشی و یۆنان کاریگەری هەبووە، پێویستە نەختێك زوورتر باسی ئەو پەرستگایە بکەین.

لە ڕاستیدا لەو پەرستگایە تەنها یەك غەیب بێژ نەبوو و ئەوان دەستەیەك غەیب بێژبوون و هەر یەکەیان چەند قوتابی هەبوو کە بۆ داهاتووی ئەو کارە پەروەردەی دەکردن. لە پەرستگای دۆلفی پێنج دەستە لە کاهینەکان دەژیان و مەبەستمان ژیان لەناو پەرستگاکە نییە، ئەوان لەو پەرستگایە خزمەتیان دەکرد و لە دەوروبەری دەژیان. ئەو پەرستگایە لە خەڵکی یۆنان و بە تایبەتی لە هەندێك لە دەوڵەتە شارەکانی یۆنان باجیان وەردەگرت کە بریتی بوون لە: (هەموو ناوچەی پلۆپۆنز کە شەش دەوڵەتە شاری باشووری یۆنان بوون، ئەسینا، تسالی و ئێسپارت)، ئەوان دەبوایە یەك لەسەر بیستی داهاتیان بدەن بەو پەرستگایە و نەتەوەکانی دەوڵەتە شارەکانی تریش بە جیاوازی (سی یەکێك) یا (چل یەکێك) و (پەنجا یەکێك) باجیان دەبەخشی. باسکرا کە یۆنانییەکان وێڕای ئەوەی جیاوازی لە نێوانیان هەبوو، بەڵام هەموویان یەك ئایینیان هەبوو و بۆیە هەموان باجیان بە پەرستگای دۆلفی دەدا.

هەموو کاهینەکانی پەرستگای دۆلفی دەوڵەمەند بوون و بە درێژایی تەمەنیان کارێك جگە لە خواردن و خواردنەوە و بەهرەمەند بوون لە پێداویستییەکانی ژیانیان نەبوو. ئەوان بۆ ئەوەی دەوڵەمەندی و ژیان و خۆشی خۆیان لەدەست نەدەن، نەیاندەویست نەتەوەکانی یۆنان جەنگی هەخامەنشییەکان بکەن و جگە لەوە دڵنیا بوون هەخامەنشییەکان ڕێگە لە ئایینی ئەوان ناگرن و خەشایاریش وەك هەریەکە لە داریوشی یەکەم و کوروش لایەنگری ئازادی ئایینە.

چونکە کاهینەکانی پەرستگای دۆلفی حەزیان بەو جەنگ لە گەڵ هەخامەنشییەکان نەدەکرد، بە یاسا ئایینییەکانیان کە لە لایەن خوداکانیان دەردەچوو دژایەتی هەر کردەوەیەك بۆ جەنگ لە دژی هەخامەنشییەکانیان دەکرد. کاهینەکان پێش ئەوەی خەڵکی (تسالی) پرسیاریان سەبارەت بە جەنگ لە گەڵ خەشایاردا لێ بکەن، نوێنەرێکیان ناردە لای خەشایار و وتیان کە ئەوان حەزیان بە جەنگ لە گەڵ ئەو نییە و ئەوەندەی بتوانن هەوڵ دەدەن خەڵکی یۆنان لە ڕێگەی ئاشتییەوە لە گەڵ خەشایار ڕابهێنن و نەتەوەکانی یۆنان هاندەدەن تا جەنگ لە گەڵ پاشای هەخامەنشی نەکەن.

بەو هۆکارەوە کە باسکرا لەو ڕۆژەوە کە خەشایار هاتە یۆنان تا ئەو ڕۆژەی گەڕایەوە، هەر یۆنانییەك دەچۆوە پەرستگای دۆڵفی و پرسیاری جەنگی دەکرد، جوابی نەرێنی وەردەگرت. بە

گریمانی زۆر ئەگەر پەرستگای دۆلفی بانگەشەی جەنگی بکردایە، دەیتوانی تەواوی نەتەوەکانی یۆنان بە شێوەیەك یەك بخات کە هەموان لە دژی خەشایار بجەنگن و ئەوکات یەك سەربازی لەشکری هەخامەنشی نەیدەتوانی بگەڕێتەوە بۆ ولاتەکەی.

پرۆفیسۆر بارن یەك لە هۆکارەکانی سەرکەوتنی خەشایار بە ناڕازی بوونی پەرستگای دۆلفی بەرانبەر بە جەنگ دەزانێت و دەڵێت: لە لایەن خەشایارەوە زێر یا هەر دیارییەکی تر بۆ کاهینەکانی پەرستگای دۆلفی نەناردرا و ئەوان خۆیان لە ترسی لەکیس چوونی زێر و دەوڵەمەندییەکانیان، دژی جەنگ بوون.

کاتێك هەواڵ هات کە خەشایارشا دەیەوێت لە گەرووی داردانێل (هێلسپۆنت) بپەڕێتەوە و بێتە ناو خاکی یۆنان، تیمیستۆکیل (تیمیستۆکیلس) سەرۆکی ئەسینا، نێردراوێکی نارده لای (گلۆن) پاشای (سیراکۆز) و داوای لێ کرد لە جەنگی ئەودا یارمەتی بدات.

گلۆن لە مێژووەکانی ئێمە بە ناوی (جبار سیراکۆز) هاتووە و ئەو ناوە تایبەت بەو نییە و زۆر ناوی تر ئەو پێشگرەیان وەرگرتووە کە بە مانای (ستەمکار) دێت و ئەو ناو و نیشانە بۆ هەندێك لە دەسەڵاتدارانی یۆنانی گونجاو نییە، چونکە نە گلۆن ستەمکار بوو و نە هەندێك لە دەسەڵاتدارانی تر کە ناویان لە مێژووەکاندا هاتووە و ئەو نیشانەیان پێ دراوە، لە ڕاستیدا یۆنانییە کۆنەکان ئەو پاشایانەی بەبێ پەرلەمان واتە سیستەمی دیموکراسی دەسەڵاتیان گیراوە بە ناوی (تیران) ناو بردووە و ئەو وشەیە چۆتە ناو زمانە ئەوروپییەکان و مانای (جەبار) واتە ستەمکاری وەرگرتووە.

ئەوکات سیراکۆز کە لە دورگەی سیسیل لە باشووری ئیتاڵیا بوو، دەوڵەتە شارێکی یۆنانی بوو و لە ساڵی (٧٣٣ پ. ز) لە لایەن یۆنانییەکان دامەزرا و دواتر کوچبەرێکی زۆری یۆنانی بۆ چوو و کاتی هاتنی خەشایار ئەوێ بە دەوڵەتە شارێکی یۆنانی دادەنرا. هاوکات لەگەڵ چوونی ئەو نێردراوە بۆ سیراکۆز، فاڵ گرەوەکانی پەرستگای دۆلفی وتیان: خوایان ناردنی نێردراو بۆ وەرگرتنی یارمەتی لە سیراکۆزیان لا پەسەند نییە. هەروەها ئەوان فەرمانی ئامادەباشی گشتیان ڕەتکردەوە و وتیان خوایانی یۆنان پەسەندیان نەکردووە و تەنانەت گەڕانەوەی دوورخراوەکانیشیان بە پێچەوانەی ویستی خوایان زانی.

لە جارنامەکەی ئەسینادا هاتبوو تەواوی دوورخراوەکان بێنەوە و ئەوان لەوە دەترسان دوورخراوەکان ببنە هاوکاری لەشکری خەشایار، هەندێکیشیان هەروایان کرد و دواتر لە لایەن ئەسینا و ئێسپارت بە بێ ئامادەبوونی خۆیان فەرمانی لە سێدارەدانیان درا. پەرستگای دۆلفی

هاتنەوەی ئەوانیشی پێچەوانەی ویستی خوایان زانی و ئەمەش بە سوودی خەشایار شکایەوە، چونکە لە ئەنجامدا ئەوان نەدەگەڕانەوە بۆ ئەسینا و چەکیان هەڵنەدەگرت و ژمارەی ئەوانەی خەشایار لەگەڵیاندا دەجەنگا کەمتر دەبۆوە.

دوای جارنامەی ئامادەبوونی گشتی بۆ بەرگری لە یۆنان، هەندێ لە دەوڵەتە شارەکانی تری یۆنانیش ئەو کارەیان ئەنجامدا و ئەسینا بۆ جووڵاندنی هەستی نیشتیمانی خەڵك، بانگەشەی کرد کە پێویستە یەك کەس فەرماندەیی ئەو لەشکرە بکات تا یۆنانییەکان لە ناکۆکی دەربچن و ئەگەر ئەو کارە نەکەن، بێ گومان سەرناکەون.

هەڵبژاردنی فەرماندەیەك بۆ لەشکری یەکگرتوو گرفتی تێکەوت، چونکە هیچ یەك لە نەتەوەکانی یۆنان نەیان دەویست فەرماندەیی ئەوانی تر بکات.

ئەسینا پێشنیاریان کرد هەموو لایەك لە ژێر فەرماندەیی گلۆن پاشای سیراکۆز بن و ئێسپارت پەسەندیان نەکرد و وتیان: گلۆن وڵاتێکی تیرانە، واتە سیستەمی دیمۆکراسی نییە و ئێمە کە وڵاتەکانمان دیموکراسین، نابێت لە ژێر فەرماندەیی گلۆنێك بین. گرفتی دووەمیش ئەوەبوو کە ئەگەر لەشکری یۆنان یەکگرتوو بوو، لە چ شوێنێك بێت بۆ جەنگ کردن. ئەسینا پێشنیاریان کرد ڕێڕەوی ڕۆیشتنی لەشکری ئێران لەبەر چاو بگیرێت و لەو ڕێڕەوەدا ناوچەیەکی شاخاوی دیاری بکرێت تا جەنگی تیادا بکەن، چونکە لە ناوچەی شاخاویدا نەبێت ناتوانن بەرگری بکەن.

هیرۆدۆت کە باس لە هاتنی لەشکرێکی پێنج ملیۆنی هەخامەنشییەکان بۆ یۆنان دەکات، دەڵێت لەشکری خەشایار لە ڕووی ئەسپ سوار و عارەبانە جەنگییەکان بەهێزتر بوون لە لەشکری یۆنان، بە زانینی ئەو ڕاستییە کە عارەبانە جەنگییەکان و ئەسپ سوارەکان لە پێدەشتە تەختەکان باشتر دەتوانن بجەنگن، یۆنانییەکان بێ گوێدانە زۆری سەربازە هەخامەنشییەکانیش، توانای جەنگ لە پێدەشتەکانیان نەبوو.

ئەو ژمارەیەی هیرۆدۆت و مێژوونووسانی تر نووسیویانە زێدەڕۆیی تێدایە و لەشکری خەشایار لە هەشتا تا سەد هەزار کەس دەبوو و لەگەڵ ئەوەشدا هەر ئەو لەشکرە هەشتا تا سەد هەزار کەسیە زۆر بەهێزتر بوو لە لەشکری یەکگرتووی یۆنان و لە کاتی پێویستدا ژمارەی سەربازانی نەتەوە جیاوازەکانی یۆنان دیاری دەکەین. بێ ئەوەی لە جەنگدا پسپۆڕ بین و زانیاریمان لە بارەی جەنگەوە هەبێت، دەزانین لەشکری بچووکی یۆنان بەبێ هەبوونی ئەسپ و عارەبانەی جەنگی، نەیدەتوانی لە پێدەشتەکاندا جەنگی لەشکری گەورەی هەخامەنشی بکات و یۆنانییەکان بۆ ڕێگرتن لە پێشڕەوی لەشکری خەشایار تەنها چارەیان جەنگکردن بوو لە ناوچە شاخاویەکان.

ئەو پیلانەی سەرۆکی کۆماری ئەسینا نەخشەی بۆ دانابوو، بریتی بوو لە ڕێگرتن لە لەشکری خەشایار لە ناوچەیەکی شاخاوی کە ڕێگەی تێپەرینی سەخت بێت، چونکە لەو جۆرە ناوچەیە لەوانە بوو هەخامەنشییەکان ناچاربن پەنا بوو سوار بوونی کەشتی ببەن تا ناوچە شاخاویە سەختەکە ببڕن و لەو کاتەدا هێزی دەریایی یۆنان ڕێگەیان بگرێت و نەهێلێت ئەوان سواری کەشتی بن یا سەربازەکانیان بگەیێننەوە وشکانی و پیادەیان بکەن.

بۆ تێگەیشتن لەو بابەتە پێویستە بگوترێت کە لەشکری خەشایار لەو ڕۆژەوە کە هاتنە ناو یۆنان تا ئەو ڕۆژەی گەیشتە ئەسینا بەردەوام لە نزیکی کەنارەکان دەڕۆیشت و بە پێوەری ئێستا هیچ کات زیاتر لە پەنجا کیلۆمەتر لە دەریای ئیژەی ڕۆژهەلاتی یۆنان دوورتر نەدەکەوتەوە و تەنها ئەو کاتە نەبێت کە لەشکرەکەی بە کەناری شاخی ئەلەمپدا ڕۆیشت. هاوکات هێزی دەریایی هەخامەنشی بەردەوام تەریب بە ئەوان لە دەریادا دەڕۆیشت تا ڕێگری بکات لە هێرشی یۆنانییەکان لە دەریاوە بۆ سەر هەخامەنشییەکان و بۆیە بەردەوام پەیوەندی لە نێوانیان هێزی دەریایی و لەشکری وشکانیدا هەبوو.

هەرچەندە هەخامەنشییەکان لە جەنگی ماراتوون بە دەست یۆنانییەکان شکستیان خوارد، بەلام ئەوان ترسیان لە هێزی وشکانی یۆنان نەبوو و تەنها ترسیان لە هێزی دەریایی ئەو ولاتە هەبوو، چونکە ئەزموونیان هەبوو کە هێزی دەریایی یۆنان و لە ڕاستیدا هێزی ئەسینا بەهێز بوون و فەرماندە و مەلەوانی ئازایان هەبوو و ئەوان لە جەنگە دەریاییەکان سەرسەخت و چاونەترس بوون، بۆیە خەشایار بیری دەکردەوە کە ئەگەر هێزی دەریاییان پالپشتی هێزی وشکانی نەکات و بە دەستەواژەی فەرەنسی و بەریتانییەکان لە سەردەمی ئێستا، لەوانە بوو یۆنانییەکان لە دەریاوە هێز دابەزێنن و لە پشتەوە هێرش بکەنە سەر هەخامەنشییەکان.

لەوانەیە ڕەخنە هەبێت لە ئەوەی لەشکری ئێران بەردەوام بە کەناری دەریادا دەڕویشت و خۆی ناچار بە ڕۆیشتن بە ناوچە سەخت و شاخاویەکان دەکرد و بۆچی ڕێڕەوی خۆیان نەدەگۆڕی و بە دەشتەکانی ڕۆژئاوای یۆناندا نەدەڕۆیشتن، تا لەشکرەکەیان خێرا و ئاسوودەتر بڕوات و لە مەترسی لەشکری دەریایی یۆنانیش پارێزراو بێت؟

لە وەلامدا دەگوترێت ئەوان ناچاربوون تەریب بە کەنارەکاندا برۆن، چونکە لە دەشتەکانی ڕۆژئاوای یۆنان ئاوی پێویست بۆ لەشکرەکەیان دەست نەدەکەوت و بە ناچاری بۆ دەستەبەر کردنی ئاو دەبوایە بەو ناوچە شاخاویانەدا برۆن. بۆیە لەشکری ئەوان ناچاربوو بە ناوچە شاخاوی و سەختەکاندا برۆن کە پڕ ئاو بوون و دەکەوتنە ڕۆژهەلاتی یۆنان و تەریب بە

کەنارەکان و وێڕای ئەوەش ئەوان چەند جارێك ناچار بە هەڵگرتن و گواستنەوەی ئاو لە گەڵ خۆیاندا بوون.

پیلانی ئەسینا بریتی بوو لە رێگرتن لە لەشکری هەخامەنشی لە ناوچە سەختە شاخاویەکان و دروستکردنی هەندێ بەربەستی سروشتی تا ئەوان نەتوانن لەو ناوچەیە بپەرنەوە و هاوکات هێزی دەریایی یۆنانیش رێگەی دەگرت تا لەشکری خەشایار نەتوانێت سواری کەشتی ببێت و ئەوان لەشکری خەشایارین ئەوەندە ڕادەگرت تا زستان و وەرزی سەرما بێت و ئەوان لە بەر سەما و نەبوونی خۆراك هەموویان بمرن و لەناو بچن.

لەشکری خەشایار لە هەندێ شوێن بە هۆی خەراپی جادەکان و مانەوەیان بۆ چاك کردنیان، لە رۆیشتنیان لە باکوور بەرەو باشووری یۆنان دواکەوتن و ئەوکاتەی ئەسینا بڕیاری رێگرتنیانی لە ناوچەیەکی شاخاویدا، هاوین لە نزیك کۆتایی بوو. یۆنانییەکان دەیانزانی ناوچە شاخاویەکانی رۆژهەڵاتی وڵاتەکەیان زۆر سارد دەبێت، هەرچەندە لە دەریا نزیکن و ئەو شوێنانە نابێت لە زستاندا سارد بن. پیلانی ئەسینا لە پیلانی ئیمپراتۆریەتی رۆسیا لە (١٨١٢ ز) و یەکێتی سۆڤیەت لە (١٩٤١ ز) بۆ لەناو بردنی لەشکرەکانی ناپلیۆن و هیتلەر ئەنجامیاندا و ئەوانیان لە وەرزی زستان لەناو برد.

ئێستا زاندراوە سەرمای ساردی ئەو ناوچانە بە هۆی کاریگەری دابەزینی پاڵەپەستۆی هەوای ساردی رۆسیایە بەرەو باشوور دەبێت و ئەوکات یۆنانییەکان زانیاریان لە بارەی ئەو بابەتە سروشتییە نەبوو و تەنها بە ئەزموون بۆیان دەرکەوت بوو کە لە وەرزی زستاندا ناوچە شاخاویەکانی رۆژهەڵات زۆر سارد دەبن و هەخامەنشییەکان لەوانەیە تەواوی خۆراکەکانی خۆیان تەواو کرد بێت، بۆیە لە برسان و لەبەر سەرما لەناو دەچن و ئەگەر توانیبایان ئەو نەخشەیە جێبەجێ بکەن، لەشکری خەشایاریان لەناو دەبرد.

ئەو پیلانە دەبوایە لە گەلیەکانی پەتریا ئەنجام درابوایە و ئەوکات هەخامەنشییەکان نەیاندەتوانی بە سوود وەرگرتن لە کەشتییەکانیان بەربەستەکە بەجێ بهێڵن. شاخەکانی ئەلەمپ لەو ناوچەیە لە کەناری دەریای ئێژە وەك دیوارێکی بەرز بوون و کەشتییەکان بە هۆی شەپۆلە بەهێزەکانەوە نەیاندەتوانی لەو شاخانە نزیك بکەونەوە و تێك دەشکان. لە هیچ شوێنێکی جیهاندا کەشتییەکان ناتوانن لە کەنارە بەردینەکانی شاخێك نزیك ببنەوە، تەنانەت ئەگەر کەنداو یا دەرزیشی هەبێت و تێك دەشکێت.

ئەگەر یۆنانییەکان لە گەلی پەتریا پێشیان بە هەخامەنشییەکان گرتبایە و ڕێگەی دەرچوونی ئەوانیان لەو دەربەندە گرتبایە، ئەوان نەیاندەتوانی لە ئەویٚ سوود لە کەشتییەکانیان وەربگرن و خۆیان رزگار بکەن، چونکە نەیاندەتوانی خۆیان بگەیێننە کەنارەکانی رۆژهەلاٚت و دواتر زستان دەهات و لەو گەلیەدا لە سەرمان و لە برسان دەمردن و ئەگەر نەیان ویستبایە لەناو بچن، چارەیەکیان نەبوو جگە لە گەرانەوە بەو ڕێگەیەدا کە پیایدا هاتبوون.

یۆنانییەکان ئەو گەلیان داگیرکردبوو، بەلاٚم وەك بینیمان ئەسکەندەر پاشای مەقدۆنیا یۆنانییەکانی ناچارکرد تا ئەو گەلیە بەجیٚ بهێلٚن و دوای ئەو گەلیە لەیەك شوێنی تر لە کەنارەکانی رۆژهەلاٚتی یۆنان، دیواری بەردین نەبوو تا رێگە لە نزیك بوونەوەی کەشتییە جەنگییەکانی ئێران بگرێت.

پێش ئەوەی یۆنانییەکان لە ناوچەی شاخاوی پێش بە لەشکری هەخامەنشی بگرن، ئەسینا سیٚ کەسی بۆ پەرستگای دۆلٚفی نارد تا غەیب بێژەکەی پەرستگاکە پێیان بلٚێت کە ئاکامی جەنگی ئەسینا لە گەلٚ هەخامەنشییەکان چی لیٚ دێت؟

ئەوکات فالٚ گرەوەکە کەسێك بوو بە ناوی (ئاریس تۆنیك) و وەلاٚمی گەلی ئەسینای بەم شێوەیە دایەوە: (بەداخەوە... بۆ لێرە دانیشتوون و بۆ هەلٚ ناستن تا هەلٚ بێن... هەموو شوێنێك ئاگرە و هەموو شوێنێك دەسوتێنێت و جۆگەلەکانی خوێن بەرێوەن، تا کات ماوە ڕابکەن.)

ئەو وەلاٚمە نیشاندەری ئەوە بوو کە ئەگەر یۆنانییەکان لە گەلٚ هەخامەنشییەکان جەنگ بکەن، شکست دەخۆن و پیاوانیان دەکوژرێن و شارەکان دەسوتێن و وێران دەبن. جارێکی تر پەرستگای دۆلفی بۆ پارێزگاری لە دەولٚەمەندی و بوونی خۆیانن یۆنانییەکانیان ترساند و ناراستەوخۆ پالٚپشتی خەشایاریان کرد. ئەو سیٚ کەسە بە بیستنی ئەو وەلاٚمە خەراپە، بە سەختی شێوان و وتیان چوون دەتوانین بگەرێینەوە بۆ ئەسینا؟

پرۆفیسۆر بارن کە ئێمە ئەو رووداوانەمان لە لێکۆلٚینەوەی ئەو سەبارەت بە جەنگی خەشایارشا لە یۆنان، دەرهێناوە ئاوەها دەدوێت دەلٚێت: لە نێوان کاهینەکانی پەرستگای دۆلٚفیدا کاهینێك بە ناوی (تیمۆن) هەبوو کە لە ئەوانی تر نیشتیمان پەروەرتر بوو و کاتێك نێردراوەکانی ئەسینای بەو ڕادەیە بە بیٚ ئومێدی دیت، پێی وتن برۆن و چەند لقێك لە داری (غەر) و داری زەیتوون بێنن و سەر لە نویٚ وەرنەوە بۆ پەرستگا و داوای لیٚ خووش بوون بکەن، تا پەرستگا پێشبینی باشتر بۆ یارمەتی ئێوە بکات.(٧) ئەوان رۆیشتن و لقی زیتونیان هێنا و هاتنەوە و داوای پێشبینی باشتریان لە زیئۆسی خوای

(٧) (لە کۆندا لقی داری زەیتوون و غەر نیشانەی ئاشتی و ئارامی خۆشبەختی بوون، زەبیحوللاٚ.)

خوایەکانیان و خواکانی تریان کرد. بەڵام هەرکەسێك جاری دووەم بۆ بابەتێك سەردانی پەرستگای کرد بایە، وەڵامێکی وەردەگرت کە پێویستی بە شیکار هەبوو. غەیب بێژ بۆ ئەوەی بتوانێت لە گەڵ خواکان پەیوەندی بکات، دەچۆوە جیهانی خەڵوەت و ئەوکات هەندێ شتی دەووت کە بەشێك لە ئەوان تێگەیشتنیان نەدەکرا و هەروەك ئەمڕۆ کەسانێك لە ئەورووپا هەن کە ئەنجیل لێکدەدەنەوە، ئەو کاتیش لە یۆنان کەسانێك هەبوون کە ئەو وەڵامانەیان شیکار دەکرد و ماناکانیان دەردەهێنا.

ئێستا ئێمە بە ئاسانی دەزانن کە بۆچی کاتێك بابەتێك بۆ جاری دووەم دەبرێتە بۆ پرسیار کردن، غەیب بێژەکەی پەرستگای دۆلفی هەندێ بابەتی دەووت کە پێویستیان بە شیکار بوو. چونکە غەیب بێژ لە جاری یەکەمدا ئەو شتانەی پێویست بوو بگوترێت بە زوبانی سادە وتوویەتی و جاری دووەم نەیدەتوانی وتەی یەکەمی بە تەواوەتی ڕەت بکاتەوە و تەنها دەیتوانی هەمواری بکاتەوە و بە ناچاری شتێکی دەووت کە ئەگەر پێچەوانەکەی چەسپا، لۆمە نەکرێت کە بۆچی غەیب بێژییەکەی ڕاست نەبوو.

غەیب بێژەکەی پەرستگای دۆلفی چووە خەلوەتەوە و هەندێ شتی وت کە پرۆفیسۆر بارن لە یرنانی کۆن بەو شێوەیەی وەرگێڕاون: (کاتێك شوێنەکانی تر گیران تۆ هەڵێ، بەڵام تۆ ئەی سالامیس، دیوارە دارینەکانت پەناگایە بۆ ئەو کاتەی داسی کاکوت بە جووڵە دەکەوێت.)

سێ نێردراوەکان گەرانەوە ئەسینا و وەڵامەکەیان گەیاندە تیمیستۆکیلی سەرۆك و ئەویش وەڵامەکەی لە پەرلەمان خستەروو و چونکە کەس لە ماناکەی تێ نەگەیشت، فەرمانیان کرد تا دوو شیکەرەوەی ئەو وتانە بێن بۆ پەرلەمان و بۆیان ڕوون بکەنەوە.

ئەوان هاتن و ئەوەی غەیب بێژەکەی پەرستگای دۆلفی وتبووی، خستیانە بەر شیکار و ئەو مانایەیان دەرهێنا: مانای (ڕابکە) ئاشکرایە و پەرستگای دۆلفی دەیوت کاتێك هەخامەنشییەکان شوێنەکانی تریان گرت و پێشرەویان کرد، لەشکری ئەسینا پێویستە پاشەکشە بکات، بەڵام سەبارەت بە (ئەی سالامیس دیوارە دارینەکانی تۆ پەناگەن) ئەو شیکارەیان کرد کە مەبەستی پەرستگا ئەوەیە کە : (کەشتییە جەنگییەکانی ئەسینا پەناگەن بۆ ئەو کەسانەی لە دەست لەشکری خەشایار پاشەکشە دەکەن) و مانای (ئەو کاتەی داسی کاکوت بە جووڵە دەکەوێت) وا لێکدرایەوە کە لە ناوەڕاستی هاویندا ئەسینا دەتوانێت ئۆمێدی بە سەرکەوتن هەبێت.) چونکە داسی کاکوت لە ناوەڕاستی وەرزی هاوین بۆ دروێنە دەکەوتە جووڵە و چونکە ئەوکات هاوێن لە تەواو بوون بوو، شێکەرەوەکان وتیان ئەسینا لە هاوینی ساڵی داهاتوودا دەتوانێت سەرکەوێت.

له شیکەرەوەکان پرسیار کرا ئەو سەرکەوتنە لەکوێ دەست یۆنانییەکان دەکەوێت؟ ئەوان وەڵامیاندایەوە و وتیان ئاساییە کە لە سالامین دەبێت.

دورگەی سالامین لە دەروونی یۆنانییەکاندا بیرەوەری باشی بەجێ هێشت بوو و لە کەنارەکانی ئەو جەزیرەیە بوو کە هێزی دەریایی هەخامەنشی لە ناو برا و بەو شێوەیە فاڵی دووەم فاڵی یەکەمی ڕەش کردەوە و جێگەی ئەوی گرتەوە. هەردوو شێکەرەوەکانی فاڵ گرتنەوە سەرۆکی ئەسینا و ئەندامانی پەرلەمانیان دڵنیا کردەوە کە لە هاوینی داهاتوو لە سالامین سەرکەوتن دێت و لە ئەوێ بۆ جارێکی تر کەشتییە جەنگییەکانی ئەسینا بە سەر هێزی دەریایی هەخامەنشیدا سەردەکەون.

سەرۆکی ئەسینا بە هۆیەکانی ڕاگەیاندن و پرۆپاگەندەی ئەوکات داوای لە نەتەوەکانی یۆنان کرد تا بۆ جەنگی ئێران و بە وتەی ئەو بەربەرەکان یارمەتی بدەن و هێز کۆبکەنەوە. هەندێ لە نەتەوەکان لە باکوور ببوونە دۆستی خەشایار و نەدەتواندرا یارمەتی لە ئەوان وەربگیرێت، بەڵام نەتەوەکانی باشوور هێشتا لەشکری خەشایاریان پێ نەگەیشتبوو و بۆیە داوای یارمەتی لە ئەوان کرد.

وردبوونەوە لە یارمەتی وڵاتە یۆنانییەکان بێ سوود نییە و دەریدەخات کە ئەوان بە چ هێزێکەوە بەشداری ئەو جەنگە بوونە و لە لایەکی تر دەریدەخات کە خەشایار پێویستی بە لەشکرێکی پێنج ملیۆن کەسی نەبووە بۆ جەنگ کردن لە گەڵ یۆنان.

گەورەترین یارمەتی کە پێشکەش بە ئەسینا کرا لە لایەن وڵاتی (ئارکادی) بوو کە لە باشووری یۆنان بوو و تا ڕادەیەك لە رووی پانتاییەوە گەورە بوو، چەند دەوڵەتە شارێکی لەخۆ دەگرت و سەرجەمی ئەو دەوڵەتە شارانە (٢١٢٠) دوو هەزار و سەد و بیست سەربازیان نارد. وڵاتێکی تری باشووری بە ناوی (کۆرێنت) کە ئەویش چەند دەوڵەتە شارێك بوو، چوار سەد سەربازیان بۆ یارمەتی ئەسینا نارد و (فیلۆس) تەنها دوو سەد سەرباز و (ئێسپارت) سێ سەد سەرباز کە لە لاپەڕەکانی داهاتوو زۆرتر باسیان دەکەین.

هیرۆدۆت دەڵێت سەرجەمی ئەو سەربازانەی یۆنانییەکان بۆ رێگرتن لە لەشکری خەشایار لە وشکانی کۆیان کردەوە، بریتی بوون لە چوار هەزار سەرباز. بەڵام لێکۆڵینەوەکانی مێژوونووسە هاوچەرخەکان دەریدەخەن کە ئەو ژمارەیەی هیرۆدۆت وەك ژمارەکەی سەبارەت بە لەشکری خەشایار بێ رەخنە نییە و بەڵام ژمارەی سەربازەکانی یۆنانی کە دەیانەویست پێش بە لەشکری هەخامەنشی بگرن لە چوار هەزار کەس زیاتر بووە و بەڵام دوور نییە چوار هەزار لەو سەربازانە (هۆپ لیت) بووبن.

هۆپ لیتەکان لە رووی پێداویستی جەنگییەوە لە پێشتر بوون لە سەربازانی تر و کاسکێت و قەلغان و زرێیان دەکردە بەریان و تا رادەیەك ئاسن پۆش بوون و دیارترین سەربازانی یۆنان بوون، سەربازە ئاساییەکان نەیاندەتوانی قەلغان بکەنەبەریان و ران بەندی لە رانیان بکەن و مەبەست ئەوەیە کە ناتوانن بەو بەرگە کانزاییانەوە بجەنگن و ئاسن پۆش بوون پێویستی بە راهێنانی بەردەوام هەبوو و ئەگەر سەربازێکی ئاسایی قەلغانی کردبایە بەری، و ران بەندی بەستبایە و هاتبایە مەیدانی جەنگ، نەیدەتوانی چەند خولەکێك زیاتر جەنگ بکات و ماندوویەتی ئەو بەرگە کانزاییانە دەیخست.

بەپێی ئەو لێکۆلینەوانەی بەم دواییانە روویدا مێژوونووسەکان بروایان بۆ دروستبوو کە ئێسپارتەکان هەزار سەربازیان بۆ جەنگی خەشایار ناردووە، نەك سێ سەد سەرباز و بەلاّم سێ سەد کەسیان هۆپ لیت بوون واتە ئاسن پۆش بوون. سەربازەکانی تر کاسکێتیان لە سەر و قەلغانیان لە بەر نەبوو و بۆ پارێزگاری لە خۆیان لە بەرانبەر زەربەکانی تیر و شیر و تەور تەنها زرێیان پێ بوو، بەلاّم چونکە بەردەوام وەرزشیان دەکرد لە رووی سەربازییەوە گرنگ بوون و دەیانتوانی بەرگەی ماندوو بوونی گۆرەپانی جەنگ بگرن و ئێمە لەمرۆدا کاتێك ماندوویەتی سەربازان کە چەکی ئاگرینیان لایە لە مەیدانی جەنگدا دەبینین، دەتوانیین لێك بدەینەوە کە لە کۆندا کە ئامێرەکانی جەنگی ئەوکات چەکی سارد بوون و دەبوایە چەندین کاتژمێر بێ پسانەوە شمشێر بوەشێنن یا بێ پسانەوە تەور بوەشێنن، سەرباز لە مەیدانی جەنگ چەندە ماندوو دەبێت.

بە سەرنجدان لەو ژمارەیەی هیرۆدۆت لە بارەی سەربازانی یۆنانی وتوویەتی ئەوە لەبەرچاو رەت دەکرێتەوە و دەبێت بزاندرێت کە ژمارەی ئەو سەربازانەی یۆنان کە دەیانەویست لە وشکانی بجەنگن، چەند سەرباز بووە.

پرۆفیسۆر بارن دەلێت: ژمارەی ئەو سەربازە یۆنانیانەی کە بۆ پێشگیری لە لەشکری هەخامەنشی کۆکرانەوە لە نێوان دوازدە تا بیست هەزار کەس بوون.

# جەنگی تەرمۆبیل

پێش ئەوەی باسی ئەو جەنگە گەورەیە کە لە نێوان دوو لەشکری یۆنان و هەخامەنشی ڕوویداوە بکەین، پێویستە هەندێ خاڵ باس بکەین و دواتر بچینە سەر بابەتەکانی ئەو جەنگە.

یۆنانییەکان لە زانستە جەنگییەکان لە هەخامەنشییەکان لە پێشتر بوون و ئامێرەکانی پەیوەندیان باشتر بوو، ئەوان لە شەو و لە ڕۆژدا دەیانتوانی لە جیاتی قسە کردن، تەنها بە ئیشارە و ئاماژە ئەوەی دەیانەوێت لە بەرانبەرەکەیان بگەیێنن. لە ڕۆژدا ئامرازی پەیوەندی ئەوان ئاڵا ڕەنگاوڕەنگەکان و ئاوێنە بوو و لە شەودا بە هۆی ڕووناکی پەیوەندیان دەکرد.

لە لەشکری خەشایار پەیوەندی نێوان ئەفسەر و سەربازەکان وەك پەیوەندی (باب و کور) وابوو، بەڵام لە لەشکری یۆنان ئەو پەیوەندییە وەك پەیوەندی خوایان و بەندەکانیان وابوو.

لە لای لەشکری خەشایار خۆراك زۆر گرنگتر بوو تا لە لای یۆنانییەکان و بە پێچەوانەی ئەوەی مێژوونووسان دەڵێن ناپلیۆن ئیمپراتۆری فەرانسە یەکەم کەس نەبووە کە گرنگی خۆراکی بۆ لەشکر لە ڕێپێوان و جەنگدا بۆ دەرکەوت و یەکەم کەس کوروش بووە کە زانی خۆراك بۆ ورەی سەربازەکان لە جەنگ و ڕۆیشتندا چەندە بە بایەخە. لەوانەیە ناپلیۆن یەکەم کەس بوو بێت کە دەڵێت: لەشکر بە هۆی گەدەیەوە دەجووڵێت. بەڵام یەکەم کەس کە ئەو بابەتەی بە کردەوە کرد، کوروش بوو و داریوش و خەشایاریش پەیرەویان لێ کرد.

بە پێی لیکۆلینەوەکانی پرۆفیسۆر بارن مامۆستای زانکۆی گلاسکۆ، (پۆلیانۆس) مێژوونووسی یۆنانی دەڵێت: هەخامەنشییەکان هەندێ عارەبانەیان پێ بوو کە مەنجەڵی گەورەیان دەگواستەوە و لە کاتی ڕۆیشتنی عارەبانەکەدا لەو مەنجەڵانەدا خواردنیان بۆ سەربازەکان ئامادەدەکرد.

ئەوەی پۆلیانۆس دەڵێت هەر هەمان ئەو بابەتەیە کە ئێستا لە لەشکرەکانی ئەورووپا و بە وەرگرتن لە زاراوەی فەرەنسیەکان بە (ڕۆڵمان) ناوی دەبەن و بریتییە لە کێشتخانەی گەرووکی لەشکر و لە گەشتی سەربازی یا لە جەنگدا، هەموان خواردن لەو کێشت خانانە وەردەگرن.

پۆلیانۆس دەڵێت خەشایاریش خواردنی خۆی لەو عارەبانانە وەردەگرت و بۆ ئەو خواردنی تایبەتی لە کاتی گەشتی جەنگی یا لە جەنگدا ئامادە نەدەکرا. بەڵام ناپلیۆن لە جەنگدا خواردنی سەربازەکانی نەدەخوارد و خواردنی تایبەتیان بۆ ئامادەدەکرد.

جلو بەرگ و کەرەستە سەربازییەکانی یۆنانییەکان بە تایبەتی ئەوانەی هۆپ لیتەکان باشتر بوون لە هی سەربازە ئێرانییەکان. سەربازەکانی هەخامەنشی پێیان خۆش نەبوو (ساق بەند و ڕان بەند و قەلغان و... هتد) لە مەیدانی جەنگدا ببەستن چونکە خێرایی ئەوانی کەم دەکردەوە و قورسی دەکردن، بەڵام سەربازە هۆپ لیتەکان زرێیان دەکردە بەریان و کەمتر بە زەربەکانی تیر و شمشێر بریندار دەبوون.

لەشکری یۆنان ئەسپ سوار و عارەبانەی جەنگیان نەبوو و یۆنانییەکان هۆگر نەبوون بە سوار و عارەبانە جەنگییەکان، بەڵام لەو جەنگە گەورەیەی کە پاشای هەخامەنشی لە تەرمۆبیل لە گەڵ یۆنانییەکان کردیان، سوارەکان و عارەبانەکانی لەشکری هەخامەنشی لەو ناوچە شاخاویە بەکار نەبران.

پرۆفیسۆر ئاندریۆ رۆبێرت بارن مامۆستای سەدەی پێشوو لە زانکۆی گلاسکۆ دەڵێت: بۆ ئاگادار بوون لە جەنگی هەخامەنشییەکان و یۆنانییەکان لە تەرمۆبیل پێویستە باسی هیرۆدۆت وەلا بنێین، چونکە ئەوەی هیرۆدۆت لەو بارەوە دەیلێت مێژوو نییە و بەڵکو ئەفسانەیە و پرە لە گەورە کردنی یۆنانییەکان و بچووك کردنەوەی هەخامەنشییەکان.

هیرۆدۆت نووسیویەتی: لە جەنگی تەرمۆبیلٚ پێنج ملیۆن سەربازی هەخامەنشی کە لە گەڵ خەشایاردا هات بوونە ناو یۆنان، هەموویان کۆیلە بوون و جلوبەرگیان کۆنە بوو، لەو جەنگەدا ئەفسەرەکانی هەخامەنشی بە قامچی لە سەربازەکانیان دەدا و بۆ پێشەوەیان دەناردن و هەندێ لە کۆیلەکان پێش ئەوەی بگەنە شوێنی جەنگ، بە هۆی زەربەکانی قامچییەکانەوە توانایان نەدەما و بێ هۆش دەبوون. دیسان هیرۆدۆت دەڵێت دوو رۆژ پێش جەنگی تەرمۆبیل ئاسمان نەراندی و دەنگی هەورە تریشقە هات و نەتەنها سەربازەکان، بەڵکو ئەفسەرەکانی هەخامەنشیش لە ترسان کەوتنە سەر زەوی و بە دوو دەست روخساریان داپۆشی و خەشایار خۆی حەشاردا و بە پێی وتەی هیرۆدۆت، سەربازە هەخامەنشییەکان کاتێك چاویان دەکەوت بە سەربازە یۆنانییەکان دەکەوتنە لەرزە.

بەڵام ڕاستی پێچەوانەیە و سەربازە باڵا بەرزەکانی هەخامەنشی کاتێك سەربازە کورتە باڵا یۆنانییەکانیان دەدیت وەك ئەوە بوو کە منداڵ ببینن، بەڵام دەیانزانی ئەوان دلێر و ئازان و

سەرکەوتن بە سەر ئەواندا ئاسان نییە. لە لەشکری هەخامەنشی تیر و کەمان هاوێژ زۆر بوون و بە باشی و خێرایی تیریان دەهاویشت، بەڵام یۆنانییەکان لە جیاتی تیر و کەمان کە خێراتر بوو، زەرگیان دەهاویشت و ئەگەر ئامانجەکە نزیك بوایە بە باشی دەیان پێکا. چەکی دڵ خوازی یۆنانییەکان شمشێر و نێزە بوو و سوودیان لە بەردەقانی و دیسکیش وەردەگرت و ئەگەر دیسك لە نزیکەوە لە لایەن کەسی بەهێز هاویشترا بوایە و بەر سەر یا سینگی بەرانبەر کەوتبایە، یەکسەر دەی خست و چەکی دڵ خوازی هەخامەنشییەکان شمشێر و تەور بوو و سوارەکانیشیان گورزیان بەکار دەهێنا کە لە دەستیاندا چەکێکی ترسێنەر بوو.

هەخامەنشی و یۆنانییەکان هەردووکیان مەنجەنیقیان هەبوو و یۆنانییەکان بە (بام مێکانیك) ناویان دەبرد و هەر ئەو وشەیەی مێکانیکە کە دواتر گۆڕا بە مەنجەنیق. لە ئێران بە مەنجەنیق دەوترا ( سەنگ باد) یا (باد سەنگ) و پێش هێرش بۆ سەر دوژمن بەکاردەهات و کاری تۆپی ئێستای ئەنجام دەدا و بە هەمان شێوە کە لە ئەمرۆدا پێش هێرش کردن بۆ جەبهەی دوژمن بە تۆپ لێیان دەدرێت تا دووچاری شلەژان بن و لە رابردوودا ئەوانیان دەخستە بەر مەنجەنیق و بە هاوێشتنی بەردە گەورە و قورسەکان دەیانترساندن.

هیرۆدۆت لە نووسراوەکانیدا هەندێ کات ئێرانییەکان بە (کۆیلە بەربەریەکان) و هەندێ جار بە (خوێن خۆرە وەحشییەکان) ناو دەبات، بەڵام ئایا نەتەوەیەکی وەحشی بۆ پەرینەوەی لەشکرەکەیان دەتوانن بە ئاسانی جادەیەکی وەك جادەی خەشایار لە یۆنان دروست بکەن؟ ئایا نەتەوەیەکی خوێن خۆر دوای سەرکەوتنی بەسەر ولاتێکی تردا هەمو دانیشتوانی ناکوژێت؟ یا تالانیان ناکات و دەست درێژی ناکاتە سەر ناموسیان؟ لەو رۆژەوە کە لەشکری هەخامەنشی هاتە یۆنان تا رۆژی گەڕانەوەی لە وشکانی تەنانەت یەك یۆنانی بریندار نەکرا، چ جای ئەوەی بکوژرێت.

ئەو ماوەی لەشکری هەخامەنشی هاتە ناو یۆنان تا گەیشتنی بە تەرمۆبیلێ چەند مانگی پێچوو، لەو ماوەیەدا لەشکری هەخامەنشی لە کۆمەڵێك وڵاتی یۆنانی تێپەربوو و رووینەدا کە ئەو لەشکرە بۆ دەستەبەر کردنی پێداویستییەکانی، دانوێڵە یا ماڵاتی کەس بە زۆر داگیر بکات و ئایا لەشکرێکی وەحشی دوای ئەوەی هاتە ناو وڵاتێکە بێگانە بەو شێوەیە هەڵسوکەوت دەکات.

ئەو بابەتانەمان تەنها بۆ رۆنکردنەوەی سووکایەتی زۆری هیرۆدۆت بەرانبەر بە هەخامەنشییەکان لە نووسینەکانیدا خستەروو کە بۆ بچووك کردنەوەی ئەوان کردوویەتی. ئەوجار دەچینە سەر باسی جەنگی تەرمۆبیلێ کە جەنگێکی لەیاد نەچووە لە مێژووی

هەخامەنشی و یۆنان و دوای **٢٥** سەدە ئەوەندە وەردەکاری بەردەستە کە پێدەچێت لە ڕابردووی نزیکدا روویداوە و لە جەنگە هاوچەرخەکانە.

وەك باسمانکرد یۆنانییەکان بە باشیان زانی لەناوچەیەکی شاخاوی ڕێ لە لەشکری ئێران بگرن، هەروەها وترا کە باشترین شوێن شاخی ئەلەمپ بوو کە یۆنانییەکان ئەو شوێنەیان بەجێ هێشت و لەشکری ئێران لەوێ تێپەڕبوو و چونکە نەیانتوانی لە شاخەکانی ئەلەمپ ڕێگە لە هەخامەنییەکان بگرن، بڕیارياندا تا لە تەرمۆبیلێ لەشکری خەشایار رابگرن و وایان وانی کە لەشکری خەشایار لە شاخ بێ توانایە و نەیان دەزانی کە زۆرێك لەو لەشکرە خەلکی ناوچە شاخاویەکانن و ئەو کەسەی لە شاخ لە دایك بووە و لە ئەوێ گەورە بووە، کاتێك خۆی لە شاخ ببینێت ناترسێت.

ئەگەر ئێستا سەفەر بۆ تەرمۆبیلێ بکەین، تەواوی ئەو شتانەی لەوێن جگە لە ڕێگای شەمەندەفەر و ئەو کلێسایەی دوای هاتنی ئایینی کریستیان لە ئەوێ بیناکراوە و جادەکان، هەموو شتێکی تەرمۆبیلێ وەك ئەوە دەبینین کە لە سەردەمی جەنگی یۆنان و هەخامەنشی بینیومانە. تەرمۆبیلێ لە سەردەمانی کۆنەوە بە هۆی هەبوونی کانی ئاوی گەرم ناسرابوو و ئەو نەخۆشانەی ئازاری کەمەر و قاچ و ئازاری جومگەکانیان هەبوو، دەرۆیشتن بۆ ئەوێ و هەر رۆژێك بۆ ماوەی چەند کاتژمێرێك لە ئاوی گەرمدا دەمانەوە و ئازارەکانیان یا چاك دەبوو و یا کەم دەبوونەوە. لە مێژوودا دەبینین کە کاتێك یەکەمین ئۆلەمپیاد لەو شوێنە و لە سەدەی حەوتەم پێش زایێن بەرێوەچوو، لە یۆنان خەڵك بۆ چارەسەر دەرۆیشتن بۆ تەرمۆبیل و دەیانووت کە ئاوی گەرمی تەرمۆبیل ئازارەکانی کەمەر و قاچ و جومگەکان و برینەکانی سەر پێست سارێژ دەکات.

ئێستاش لە یۆنان وەك بیست و پێنج سەدە پێش ئەمرۆ و لە هەمان ناوچە خەڵك بۆ چاك بوونی ئازارەکانی نەخۆشی (ئارترێت) کە زۆرتر ئازارەکانی کەمەر لەو جۆرەن و (رۆماتیسم) سوود لە هەمان ئەو کانییە ئاوە گەرمە وەردەگرن و لە مێژووشدا دەبینین کە بوقرات ئەو نەخۆشانەی دووچاری ئازاری پشت و جومگەکان دەبوون، دەنارده ئەو شوێنە و دەیوت تا زیاتر لەو کانییەدا بمێننەوە، چاکتر دەبن.

ئەو کەسەی بۆ چارەسەر دەهاتە تەرمۆبیلێ تا خۆی چارەسەر بکات لە باکوور هەندێ شاخی دەدیت کە بەرزییان لە هەشت سەد مەتر تێپەری نەدەکرد و لە باشووریش هەندێ لە شاخەکان تا دوو هەزار و دوو سەد مەتر بەرز بوون و ئەو کەسە شاخەکانی باکووری وشك و بێ دار دەبینی،

بەڵام شاخەكانی باشوور داری زۆریان لێ بوو و لە شاخەكانی باكوور هیچ نێچیرێك نەدەبیندرا و بە پێچەوانەوە لەوانەی باشوور بزنە كێوی دەژیا و ڕاوچییەكان بۆ ڕاوكردنیان دەهاتن.

جادەیەكی تا ڕادەیەك پان لە ناوەراستی شاخەكان تێپەر دەبوو و لە باكوورەوە بە شێوەی مارپێچ یا لۆفەكان بەرەو باشووری رۆژهەڵات دەروات، ئەو جادەیە لە مێژووی ئێران و یۆنان بە ناوی (تەرمۆبیل) ناسرا و مێژووی دنیا ئەو جادەیە تەرمۆبیل ناونا، لە كاتێكدا كە ئەو ناوە هی كانییەكانی ئاوی گەرمی ئەو شوێنە بوون كە خەڵك بۆ چارەسەر دەهات و جەستەی تیایاندا دەشووشت.

ناوچەی تەرمۆبیل بە پێی نەخشەی جوگرافی لە رۆژهەڵات بۆ رۆژئاوا نۆ مایل واتە زیاتر لە چواردە كیلۆمەتر پان بوو، بەڵام ئەو ناوچەیەی بۆوە پێگەی جەنگی یۆنان و خەشایار تەنها سێ مایڵ واتە (٤٨٠٠ م) پان بوو و لای رۆژهەڵاتی ئەو شوێنە بریتی بوو لە كەنداوی (مالیان) و لەو كەنداوە لە ئاوی دەریا، خوێ بەرهەم دەهێندرێت.

لە لای چەپی ئەو ناوچەیە هەندێ شاخ بە بەرزایی (٢٠٠ تا ٦٠٠ م) و لە باشووری رۆژئاواش دەریاچەیەكی وەرزی هەبوو كە لە بەهاردا پڕ ئاو بوو و لە كۆتایی هاویندا وشكدەبوو. جادەی لۆفاویەكەی تەرمۆبیل لە باكوور بۆ باشوور دەرۆیشت و كەوتبۆوە تەنیشت زێی (ئازوویۆس) كە لەو وەرزەی خەشایار گەیشتە ئەو شوێنە، هێشتا ئاوێكی باریكی لێوە دەهات و لە بەشی خوارەوەی دەچۆوە ناو دەریا.

ئەو رێبوارەی ئێستا بە ناوچەی تەرمۆبیلدا بڕوات و لە باكوور بۆ باشوور بچێت، كاتێك دەگاتە گۆڕی سەربازە ئێسپارتییەكان، لە لای چەپی خۆی واتە لە رۆژهەڵات، دەریا بە باشی دەبینێت واتە لە نێوان ئەو و دەریا بەربەستێك نییە. بەڵام (٢٤) سەدە پێش رێبوارێكی هاوشێوە تەنها لە هەندێ شوێن كە شاخی كەم بەرزایی لێ بێت، دەتوانێت دەریا ببینێت.

ئەو خاڵانە و هەروەها شەپۆلەكانی ئاومان پێویستە لەبیر بێت تا تێ بگەین بۆچی لە جەنگی تەرمۆبیلێ خەشایارشا پاشای هەخامەنشی سوودی لە لەشكرە دەریاییەكەی وەرنەگرت كە تەریب بە ئەوان لە دەریادا دەجووڵان. سوان بۆوە هۆی لەناو چوونی هەندێ لەو شاخانەی كە خوڵیان زۆر بوو و بۆیە ئێستا ئەو رێبوارەی بەو ناوچەیەدا دەروات زەوی لە هەندێ شوێن لە تەنیشت دەریا بە تەختی دەبینێت و بیردەكاتەوە كە كاتی جەنگی تەرمۆبیلیش زەوی لەو شوێنە تەخت بووە. وێڕای ئەوەش لە ساڵی (١٩٤١ ز) كە ئاڵمان هێرشیان كردە یۆنان، یەك هێز لە سەربازانی بەریتانیا لە بەشێكی ئەو رێگایە كە بە (دەروازەی ناوەڕاست) ناسراوە و بە هۆی بۆردمانی فرۆكەكانی (ئێشتوكای) ئاڵمانی لە ناو چوون، چونكە رێگەی هەڵاتنیان نەبوو.

هیرۆدۆت دەڵێت ناوی تەرمۆپیل تازەیە و لە رابردوو ئەو شوێنەیان بە (ئانۆپاییا) ناو بردووە. لە یۆنانی کۆندا شوێنێك لە تەرموبیلیان بە (دەروازەی ناوەڕاست) ناو دەبرد و مەترسیدارترین شوێنی دەربەندی تەرمۆپیل بوو و لەو شوینە زێی (ئازۆپۆس) بە ناو خەرەندێك بە قوولایی حەفتا مەتردا تێپەڕدەبێت و ئەو کەسەی لە باکوورەوە دێت، ئەو خەرەندە لە رۆژهەلاتی خۆی دەبینێت و دەبێت دوو کیلۆمەتر رێگە ببڕێت تا بتوانێت لەو ناوچەیە بپەرێتەوە. ئەو خەرەندە تا ئێستا ماوە، بەلام بە مەبەستی پانکردنی جادە بەشێك لە خەرەندەکەیان لە خوارەوە بۆ سەرەوە سەنگپۆش کردووە و سەریان خستووە و لە ئاکامدا پانی جادە کە لە سەرەوەی خەرەندەکەوە دەروات، زۆرتر بووە..

ئەو کەسەی لە دەروازەی ناوەڕاست رۆیشتبایە، دەبوایە درێژی رێگاکە ببڕێت تا بتوانێت لەو دەروازەیە دەربچیت و لەوە زیاتر نە لە ڕاست و نە لە چەپ رێگەی تر نەبوو. لە لای ڕاست واتە رۆژئاوا (ئەگەر لە باکوورەوە برۆین) بە بەرزی نزیکەی دوو سەد مەتر شاخێکی بەرداوی و ستوونی هەبوو و لە لایەکەی تر وات لای لادیّ، بە هەمان بەرزی شاخێکی لیّ بوو و ئەگەر کەسێك توانیبای بە ئامرازێك لە خەرەندەکە بپەرێتەوە، خۆی لە بەرانبەر شاخێکی سەرکەشدا دەدیتەوە و نەیدەتوانی رزگاری ببێت.

لە وەرزی بەهاردا ئاوی زێی ئازۆپۆس زیاد دەبوو و لە رۆیشتنی ئەو ئاوە بە ناوەراستی خەرەندەکەدا دەنگێکی ترسناك دەهاتە گویّ و رێبواران لە بیستنی دەنگی ئاو کاتێك بەو خەرەندە قوولّەدا دەروات، دەترسان. بەدەر لە سەختی رێگا، دیمەنی دەروازەی ناوەڕاستیش ترسێنەر بوو و شاخە بەردینە تاریك و تا رادەیەك رەشەکان کە لە دوو لاوە بۆ لای ئاسمان بەرز ببوونەوە، رێبوارەکانیان دووچاری ترس دەکردەوە و بە هۆی بەرزی شاخەکانە و کەمی پانی خەرەندەکە، لە بەرەبەیان و ئێوارە هەتاو ئەو گەلیە تاریك دەهاتە بەر چاو و هەتاو نەدەگەیشتە ناو ئەو گەلیە و تەنها نیوەرۆکان هەتاوی لێدەدا.

لە دەروازەی ناوەڕاست دەریا دیار نەبوو، چونکە ئەو شاخەی کەوت بۆوە رۆژهەلاتی ئەو دەروازەیە کەلێنی تێدا نەبوو و دوای تێپەڕین لە دەروازەی ناوەراست، جادەکە پان دەبوو و هەندیّ کەلێن لە شاخەکان دەردەکەوت کە لە ئەوانەوە دەتواندرا دەریا لە رۆژهەلات بدیترێت.

ئەگەر ئێستا دەستەیەك سەرباز بە چەکی گەرم بەرگری لە دەروازەی ناوەڕاست بکەن، لەوانەیە بتوانن یەك هێز لە هێرشبەران لەناو ببەن، بەلام ئەوسا چەکی گەرم نەبوو و بەرگریکاران دەبوایە بە تیر و کەوان لە ئەویّ بەرگری بکەن و لە جادەیەکی باریك کە لایەکی

شاخە و لاکەی دیکەی خەرەندە و بە وتەی پرۆفیسۆر بارنی بەریتانی هێرشبەر و بەرگریکار لەو گەلیە وەك یەك وان، مەودای ڕۆیشتنی تیریش کەمە و لەو گەلیەشدا گرفتی نەبوونی جێگا هەیە، چونکە شوێن نییە تا بتوانرێت تیرهاوێژەکان خۆیان بڵاو بکەن و بە ناچاری گۆڕەپانی تیرهاویشتن سنووردار دەبێت.

پرۆفیسۆر بارن گۆڕەپانی جەنگە تەرمۆبیلی بینیوە و دەڵێت: دۆخی شاخەکان لە دەروازەی ناوەراست لە دوو لای دەربەند بە شێوەیەك بوو و هەیە کە تێرهاوێژانی هەردوولا نەیاندەتوانی خۆیان بگەیێننە سەر تاشە بەردەکان و لە ئەوێوە دوژمن بدەنە بەر تیر و تەنها ئەوانە نەبێت کە توانای تایبەتیان بۆ سەرکەوتن لە بەردەکان هەبوو و بۆیە من وەك بارن ناتوانم ئەو وتەیەی یۆنانییەکان کە گوایە سەربازانی یۆنان سەر شاخەکان کەوتوون و بەردیان باراندووتە سەر سەربازانی خەشایار و سەد هەزاریان لێ کوشتوون، پەسەند بکەم، چونکە ئەگەر بەو شێوەیە بوایە لەشکری خەشایار لەو دەروازەیە لەناو دەچوون و نەیاندەتوانی خۆیان بگەیێننە ئەسینا.

بە وتەی بارن لەوانەیە هەندێ سەربازی یۆنانی توانیبیان لە بەردەکان سەرکەون و لە بەرزایی (١٠ تا ٢٠) مەتریەوە بەرد ببارێنن بە سەر لەشکری خەشایاردا، بەڵام ئەو بەردبارانە بە هۆی سەختی شوێنەکان و سەختی لێك جیاکردنەوەی بەردەکان سنووردار بووە و ئەوەندە زۆر نەبووە کە زیانێکی باش بە لەشکری خەشایار بدەن.

فەرماندەی دەستەی سەربازە ڕێ پشکنەرەکانی خەشایار (ئاناڤس کوری ئۆتانس) بوو کە برازای خێزانی خەشایارشا و لە نەتەوەی (ماد) بوو کە ئێستا دەکەونە باکووری ڕۆژئاوای ئێران واتە (ئازەربایجان و کوردستان و کرماشان) و سەربازەکانیشی هەموو لەو نەتەوە بوون و هەموویان لە باشترین شاخەوانەکانی لەشکری هەخامەنشی دەژمێردران. ئەوان پێش ئەوەی بچنە ناو گەلی تەرمۆپیل، لە هەر دوو لاوە سەر شاخەکان کەوتن و لە باروودۆخەکەیان ڕوانی و تێگەیشتن کە ئەو گەلیە بە سەربازە یۆنانییەکان گیراوە. ئانافس بۆ ئامادەکردنی ڕاپۆرتێکی دروست لە بارەی دەروازەی ناوەڕاست و ژمارەی سەربازانی دوژمن، فەرمانی بە سەربازەکانی کرد تا زیاتر لە ناو گەلیەکە بچنە پێش و بزانن ژمارەی ئەو سەربازانەی ئەو دەربەندەیان گرتووە چەند دەبێت.

ئەوان تا شوێنێك ڕۆیشتن کە دەیانتوانی تەواوی دەربەندی تەرمۆبیل لە ناوچەی دەروازەی ناوەراست ببینن و بە ئانافسیان وت بە لێکدانەوەی ئێمە پێنج هەزار سەربازی یۆنانی ئەو گەلیەیان گرتووە و بەڵام نە ئەسپ و نە عارەبانەمان نەبینی و لە بەرانبەردا مەنجەنیقی زۆرمان

بینی. ئاناڤس وتی: خۆم دەبێت بچم و پێداویستی و کەرەستەی جەنگی دوژمن ببینم. ئەوکات ئەو کە پەتێکی بە کەمەریەوە بوو لە سەرەتای دەربەندەکە لە ناوچەی دەروازەی ناوەراستەوە لە تاشەبەردێك سەرکەوت و سێ کەسی تر کە هەریەکەیان بە پەت بە ئاناڤس و ئەوانی تر بەسترابوونەوە لە دوای ئەو لە بەردەکان سەرکەوتن و ماوەیەك بە ناخۆشی رێگەیان بۆ لوتکە بری و ئانافس بۆ ساتێك چاوی لە خەرەندەکە هەڵنەدەگرت.

دوای سێ کاتژمێر لە بڕینی رێگا، ئاناڤس ئەوەی پێویست بوو ببینێت دیتبووی و ویستی بگەرێتەوە و لەپڕ وتی: شتێکی سەرەنج راکێش دەبینم و بەڵام پێش ئەوەی بتوانێت بڵێت چی دیتووە، قاچی لە سەر بەردێك خزی و بەربۆوە، بەربوونەوەکە ئەوەندە توند بوو کە ئەو پەتەی بە هۆیەوە بە کەسی دووەم بەسترا بوو، پچرا و بە خێرایی کەوتەناو خەرەندەکە و لە بەربوونەوەکەی دەنگێکی ترسناك هات و ئەو سەربازانەی لە گەڵی بوون زانیان مردووە، بۆیە گەڕانەوە تا ئەوەی دیتوویانە بۆ پاشای هەخامەنشی بگێرنەوە.

خەشایار لە سێ سەربازەکەی پرسی: ئایا ئاناڤس نەیووت ئەو شتە بە بایەخەی بینیویەتی چییە؟ ئەوان وەڵامیان نەخێر بوو. چونکە ئاناڤس کەوتە خوارەوە، خەشایار ڕاپۆرتی تایبەت بە دەروازەی ناوەڕاستی لە سەربازەکان وەرگرت و تێگەیشت کە پێنج هەزار سەرباز تەواوی ئەو گەلیەیان داگیرکردووە و بۆیە تەنها دوو رێگەی لە پێش بوو تا لەو گەلیە تێپەر ببێت:

یەکێك ئەوە بوو کە هێرش بکاتەسەر بەرگریکارانی گەلیەکە و ئەگەر پێویست بوو هەموویان لەناو ببات تا بتانێت لەو گەلیە دەربچێت و رێگەی دووەم بریتی بوو لە ئەوەی سەربازەکانی سواری کەشتی بکات و ئەو گەلیە بەجێ بهێڵێت و دواتر سەربازەکان دابەزێنێتەوە و دیسان لە وشکانی رێ ببڕن. بەڵام بە وتەی هەموو مێژوونووسان کە پرۆفیسۆر بارنیش پشت ڕاستی کردووتەوە، ئەوکات گەرمەی دەست پێکرنی شەپۆلاوی بوونی دەریای ئیژەی رۆژهەڵاتی یۆنان بوو و کەشتییەکانی خەشایار بۆ ئەوەی بەر تاشەبەرد و شاخەکانی کەنار دەریا نەکەون، لەوێ دوور کەوتبوونەوە و ئەو ناوچەیەش کەنداوێکی نەبوو تا کەشتییەکان لێی بوەستن و بتوانن سەربازەکان سوار بکەن، لە لایەکی تر هێزی شەپۆلەکان زۆر بوو و ئەگەر سەربازەکان توانی بایانە سواریش ببەن، ئەوا بە هۆی شەپۆلەکان هەموو کەشتییەکان بەر شاخەکان و تاشە بەردەکان دەکەوتن و تێکدەشکان و سەربازەکانیشی لەناو دەچوون.

ئامانجی سەرەکی خەشایار لە جووڵاندنی کەشتییەکانی تەریب بە ڕێرەوی لەشکرەکەی بریتی بوو لە ئەوەی لە کاتی پێویست سەربازەکانی سواری کەشتییەکان بکات تا لە ڕێگریەکان بە دوور بکەونەوە، بەڵام لەو کاتەدا کە بە تەواوەتی پێویستی بوو سەربازەکانی بگوازێتەوە، نەیتوانی ئەوان بباتە ناو کەشتی.

بە وتەی مێژوونووسەکان لە ڕۆژی سەد و نەوەد و پێنجەمی ساڵی (٤٨٠ پ. ز) واتە پازدەهەمین ڕۆژی مانگی یەکەمی پاییز، فەرمانی هێرش بۆ ئەو شوێنە لە لایەن خەشایار دەرکرا و فەرماندەیی ئەو کارە بە ئەفسەرێك بە ناوی (تیگرانس) کە هەخامەنشی بوو سپێردرا. ئەو فەرمانی پێکرا تا لە گەڵ سەربازە مادەکان بچێت بۆ دەروازەی ناوەڕاست و هێزەکەی لەو یەکانەی خوارەوە پێکهات بوو:

١) بەتالیۆنی ئارناکس واتە (بەتالیۆنی قەراماج).

٢) بەتالیۆنی ئێسپانتایا واتە (بەتالیۆنی ئەو شوێنەی ئێستا بە ورمێ ناو دەبرێت).

٣) بەتالیۆنی کازاکا واتە (بەتالیۆنی مەراغە).

٤) بەتالیۆنی پراسیا واتە (بەتالیۆنی ئەو ناوچەی ئێستا بە خەمسە ناسراوە).

٥) بەتالیۆنی نێسانی کەمپی واتە (نسا و نسانی کەمپی وشەی یۆنانین و کەمپ بە مانای ئۆردووگا دێت، واتە ئۆردووگای نیسا).

٦) بەتالیۆنی ئەکباتانە واتە (بەتالیۆنی هەمەدان).

٧) بەتالیۆنی ئاترۆپاتێن واتە (بەتالیۆنی ئاشوورپات یا ئازەرپاد کە ئازەربایجانی ئێستا و زیاتر بە ئازەربایجانی باکوور دەووترێت).

٨) بەتالیۆنی سین دژ واتە (یا پارچەی هەتاو کە ناوی پایتەختی کوردستان واتە سەننەدژ بوو).

ئەو بەتالیۆنانە لەشکری مادیان پێکدەهێنا و دەبوایە دەروازەی ناوەڕاست بگرن و تاکە ڕێگەیان کوشتنی یۆنانییەکان و خۆ بە کوشتدان تا داگیرکردنی ئەو گەلیە درێژە بوو. لە گەڵ خۆر هەڵات جەنگ دەستی پێکرد و دەروازە تەرمۆپیلێ وەك ژنراڵ گۆردۆنی بەریتانی لە پەرتووکەکەی بەناوی (دیسان پەرینەوە لە ئانۆپاییا) دەڵێت، هەشت یارد پان بوو و بۆیە ئەوەندە پان بوو کە بتواندرێت تیایدا جەنگ بکرێت.

سەربازەکانی ماد کە ریشیان درێژ و دەمووچاویان بە هەتاو و ڕێپێوان سووتا بوو، لە کاتێکدا کە قەلغانی دارینی گەورەیان پێ بوو، شمشێریان دەوەشاند. پێچەوانەی تێروانینی خەڵك، کاتێك سەربازە مادەکان گەیشتنە ئەوێ لە جیاتی سەربازە ئێسپارتییەکان، سەربازانی

(تیّس پی) لە ئەویّ بەرگریان دەکرد. ئەوان ژمارەیان هەزار سەرباز بوو و لە یەکەکانی (هۆپ لیت) بوون واتە بە سەربازە پلە یەکەکانی یۆنان هەژمار دەکران و باشترین جلوبەرگ و پێداویستی جەنگیان هەبوو. سمێڵ و ریشیان بە تەواوی تاشی بوو و چونکە زۆر رێپێوانیان نەکردبوو، روخساریان نەسووتابوو و لە دوورەوە سپی دەچوو و بۆ سەربازە مادەکان وەك ئەوە بوو کە لە گەڵ دەستەیەك مێر منداڵ جەنگ بکەن.

یۆنانییەکان توانیبوویان لە دامێنی شاخەکە چوار شوێن بۆ هەڵدانی مەنجەنیق دروست بکەن و لەو شوینانەوە بەردیان بە سەر لەشکری خەشایاردا دەباراند و هەر بەردێك کە بەر سەربازیك دەکەوت، دەی خست و چیتر نەیدەتوانی هەستێتەوە. هەخامەنشییەکانیش مەنجەنیقیان هەبوو بەڵام نەیاندەتوانی ئەو مەنجەنیقانە لەکار بخەن.

تیگرانس فەرماندەی لەشکری ماد وتی: چونکە دیارە بەردەکان لەیەك شوێن دەکەونە خوارەوە، هەموو سەربازەکان ئەو شوێنە چووڵ بکەن کە بەردەکانی لێ دەکەوێت و کەس لە ئەویّ نەبێت. بەو شێوەیە چیتر بەرد بەر کەس نەکەوت. چونکە یۆنانییەکان نەیاندەتوانی مەودای مەنجەنیقەکانیان بگۆڕن تا بەر سەربازەکانی خۆیان نەکەوێت.

هێشتا کاتژمێرێك لە جەنگ تێپەڕنەببوو کە دەرکەوت وەرزش لە پەروەردەکردنی سەربازانی یۆنانی چەند کاریگەرە، سەربازە یۆنانییەکان بیّ ئەوەی هەست بە ماندوو بوون بکەن شمشێریان دەوەشاند و سەربازانی خەشایاریش شمشێرەکانیان نەوی دەکردەوە و دەکشانەوە تا دەستیان پشوو بدات.

هیرۆدۆت دەڵێت: کاتێك خەشایارشا بە پێی هەواڵەکان تێگەیشت سەربازەکانی ناتوانن ئەو بەرگریەی یۆنانییەکان دەیکەن، تێك بشکێنن، سواری ئەسپ بوو و خۆی گەیاندە دەروازەی تەرمۆپیل تا هۆکاری بە درنگ کەوتنی گرتنی ئەو دەربەندە بزانێت، ئەو سواری ئەسپێکی سپی ببوو و تاجێکی زێڕی لە سەر بوو و چەترێك لە قوماشێکی زێرینی لە سەر ڕاگرتبوو تا هەتاو ئازاری نەدات و گورزێکی بە دەستەوە بوو کە هێمای پاشایەتی بوو. بەڵام ڕاستی ئەوە بوو کە خەشایار لە جەنگدا تاجی نەدەکردە سەری و هەتاوی پاییزیش ئەوەندە تینی نەبوو کە ناچار بە هەڵگرتنی چەتر ببێت.

پرۆفیسۆر بارن دەڵێت لە رۆژی یەکەمدا خەشایار نزیك دەربەندەکە نەکەوتەوە و تەنها گوێی لە ڕاپۆرتەکان دەگرت و فەرمانی دەدا تا ئەسیر لە یۆنانییەکان بگرن، بۆ ئەوەی بتوانن زانیاریان لە بارەی ئەو هێزەیان کە لە بەشی پشتەوەی دەربەندەکەیە، لیّ وەربگرن. خەشایار بە

پێی ڕاپۆرتی سەربازەکانی خۆی دەیزانی یۆنانییەکان چەند سەربازیان لەناو گەلیەکە هەیە، بەڵام نەیدەزانی ئەوان لە باشووری ئەو گەلیە واتە لە پشتەوە، هێزەکانیان چەند دەبێت.

یۆنانییەکان زۆر سەرسەختانە بەرگریان دەکرد و کاتێك سەربازێکی هۆپ لیت لە پێشەوە دەوەستا، سەربازێکی تر لە پشتییەوە دەوەستا و هەخامەنشییەکان نەیاندەتوانی بەرگری ئەوان تێك بشکێنن. کاتێك سەربازێکی یۆنانی دەکوژرا یا بە شێوەیەك بریندار دەبوو کە نەتوانێت بەرگری بکات، ئەوانی تر ئەویان لە پێشەوە دەکشاندەوە و لە دەربەندەکە دەیانکشاندەوە و خۆیان جێیان دەگرتەوە. هەخامەنشییەکانیش بۆ ئەوەی شوێنیان بۆ جەنگکردن هەبێت، کوژراوەکانیان لە ئەوێ دەگواستەوە.

ڕۆژی پاییز کورتە و زوو کۆتایی هات و سەربازە مادەکانی لەشکری خەشایار نەیانتوانی بچنە ناو دەربەندەکە و بیگرن، خەشایار تێگەیشت ئەوانەی لە دەربەندەکە بەرگری دەکەن لە سەربازە باشەکانی یۆنانن و داوای کرد تیگرانس بێتە لای و پێی وت: ئەمرۆ ڕۆژی تاقی کردنەوە بوو و ئێمە تا ئێستا لە گەڵ سەربازانی تێس پی نەجەنگاوین و من سەرزەنشتت ناکەم بە هۆی ئەوەی نەتتوانی دەربەندەکە بگری، بەڵام ئەگەر بەیانی نەتوانی هەموو دەربەندەکە یان بەشێکی بگری، هەرچەندە تۆ لە بنەماڵە هەخامەنشییەکانی بەڵام فەرماندەیی لەشکری مادت لێ وەردەگرمەوە.

تیگرانس وتی: هۆی ئەوەی ئەمرۆ توانای پێشرەویمان نەبوو، هەروەك پاشا وتی ئەوە بوو کە لە بەرانبەرمان سەربازی کارامە هەبوون و دواتریش من نەمویست لە ڕۆژی یەکەمی جەنگدا ژمارەیەکی زۆر لە سەربازانی پاشا فیدا بکەم.

خەشایار وتی: ئێمە توانای مانەوەی زۆرمان لێرە نییە و پێویستە بپەڕینەوە و بە پێچەوانەوە دووچاری سەرمای زستان دەبین، ئێمە تەنها یەك بەربەستی سروشتیمان لە پێشە کە ئەو دەربەندەیە و ئەگەر لێرە تێپەڕ ببین ڕێگەمان کراوەیە تا دەگەینە ئەسینا. بۆیە بەیانی هێرش بکە و گوێ بە ژمارەی کوژران و زیانەکان مەدە و ئەگەر زانیت بە چەکی ئاسایی ناتوانیت ئەو کارە بکەی، بەردەقانی هاوێژ و کەمەند هاوێژەکان بنێرە پێشەوە و بە هەر شێوەیەك بێت دەبێت تۆ بەیانی بەلانی کەم نیوەی ئەو دەربەندە بگری.

تیگرانس وتی: من بەیانی فەرمانی پاشا جێبەجێ دەکەم، یا خۆم و تەواوی سەربازەکانم فیدا دەکەم.

بە وتەی پرۆفیسۆر بارن لە فەرمانی خەشایارشا لەمەر ئەوەی پێویستە فەرماندەی لەشکری ماد رۆژی دواتر لانی کەم نیوەی دەربەندەکە داگیر بکات، بابەتێك هەبووە کە مێژوونووسەکانی دونیای کۆن درکیان پێ نەکردووە. ئەو بابەتە بریتی بووە لەو ڕێگەیەی کە ئەگەر پیایدا بڕۆن، دەتوانن تەرمۆپیل پاش بڕ بکەن و بە وتەی بارن، خەشایار زانیاری لە بارەی نهێنییەکانی ئەوێ هەبووە.

هیرۆدۆت وایدەردەخات کە کاتێك هەخامەنشییەکان گەیشتنە تێرمۆپیل، یۆنانییەکان دەمیان داخست و هیچیان لە بارەی ئەو ڕێگا نهێنییە نەدرکاند کە هەبوو و ئەو سەربازە یۆنانیانەی ئەسیریش دەبوون، بەرگەی هەموو ئازارێکیان دەگرت تا باس لەو ڕێگایە نهێنییە نەکەن کە ئەگەر پیایدا رۆیشتبانە، پاش بڕی دەربەنی تەرمۆبیلیان دەدا. دانیشتوانی ناوچەکە لە جووتیار و شوان و... هتدیش نەیانووت و خۆیان پاراست لە نیشاندانی ڕێگە نهێنییەکەی تەرمۆپیل بە هەخامەنشییەکان و نەیانهێشت بزانن ئەو ڕێگا نهێنییە لە کوێیە، دواجار یەك لە یۆنانییەکان ناپاکی کرد و ئەو شوێنەی بە هەخامەنشییەکان وت و لە ئاکامدا ئەوان توانیان لەو دەربەندە تێپەر بن.

ئەگەر باسی ناپاکی بێت دەبێت ژمارەیەکی زۆر لە یۆنانییەکان بە ناپاك بزانین، چونکە وێڕای ئەوەی دەسەلاتداران یا سەرۆکەکانی دەوڵەتە شارەکانی یۆنان لەشکریان هەبوو، بەڵام کەس پێشی بە لەشکری خەشایار نەگرت و ئەوەش لەو ڕوانگەوە نەبوو کە نەیانویستووە بۆ نەتەوەکانی تری یۆنان بجەنگن و دەیانووت کە هەخامەنشییەکان جەنگیان لە گەڵ ئێمە نییە تا لەگەڵیان بجەنگین و هەرکەس دەیەوێت لە گەڵ هەخامەنشییەکان جەنگ بکات بۆ بۆخۆی بیکات و هەر لەو جەنگەدا کە لئۆنیداسی پاشای ئیسپارت و سێ سەد سەربازەکەی خۆیان فیدا کرد، پاشای پێشووی ئێسپارت (ماراتۆس) پێش هەخامەنشییەکان کەوتبوو و ڕێی پێشان دەدان بۆ جەنگی یۆنانییەکان[1].

بە بڕوای پرۆفیسۆر بارن، خەشایار دەیزانی ڕێگەیەکی نهێنی لەو گەلیە هەیە کە لە ناوەڕاستییەوە دەست پێ دەکات و ئەگەر ئەو بتوانێت تا ناوەڕاستی ئەو دەربەندە بگرێت، دەیتوانی لەو ڕێگە نهێنییە بڕوات. ئاناڤس کە لە گەڵ سێ کەس بۆ شاخەکە رۆیشت و هاواری کرد شتێکی سەرەنج ڕاکێش دەبینم، هەر ئەو ڕێگەیەی ناوەڕاستی دەربەندەکەی بینی بوو،

(١) (ڕاستە پێوەری جیا بۆ ناپاکی هەیە، بەڵام بە گشتی هەموو ئەوانەی دەستی دوژمن بۆ ناو خاکی نیشتیمانەکەیان ڕادەکێشن یا بەرگری ناکەن لە کاتێکدا توانای بەرگریان هەیە، ناپاکن بەرانبەر نیشتیمانەکەیان و پێویست ناکات زەبیحوڵڵا بۆ ئەو بابەتەش پاساو بهێنێتەوە، وەرگێر بۆ کوردی.)

بەڵام مەرگ ڕێگەی نەدا تا بە لانی کەم ئەوەی بینی بووی بە هاورێکانی بڵێت و لە شاخ کەوتە خوارەوە[٢].

ئێستا تێدەگەین بۆچی پاشای هەخامەنشی فەرمانی بە فەرماندەی لەشکری ماد کرد تا ڕۆژی دواتر بە هەر شێوەیەك بێت نیوەی دەربەندەکە بگرێت. خەشایار هەر ئەو شەوە فەرماندەیەکی تازەی دیاریکرد و پێیوت تا ڕۆژی دواتر بێ گوێدان بە ڕووداوەکانی ئەو ڕۆژە بچێت و لە گەڵ چەند کەسێکی تر لە شاخ سەربکەوێت و دەست بە دۆزینەوە بکات و بزانێت ئەو ڕێگەیەی لە ناوەڕاستی دەربەندەکە دەست پێدەکات، لە کوێ دەست پێ دەکات و بارودۆخی چییە؟

لەگەڵ ڕووناك بوونەوەی دنیا، ڕۆژی دووەمی جەنگ دەستی پێکرد و دوو لە کورەکانی داریوش بە ناوەکانی (ئاریابیژەن و ئارشامەنێش) هاتن و بە تیگرانسیان وت کە دەیانەوێت بەشداری جەنگ بن، ئەو بە بینینی ئەو دوو شازادەیە لە سەرەتا وایزانی هاتوون تا بە لەشکرەکانیانەوە بەشداری جەنگ بکەن. ئەوان هەڵەکەیان بۆ ڕاست کردەوە و وتیان: مۆڵەتمان لە پاشا وەرگرتووە تا وەك سەربازی تۆ لە جەنگدا بەشدار ببین.

تیگرانس وتی: ئێوە کورانی داریوش و برایانی پاشان، من لێهاتوویی ئەوەم نییە فەرماندەی ئێوە بم.

ئاریابیژەن وتی: تۆ سەردارێکی ئازای و ئەگەر لە بەر دەستی تۆدا بجەنگین بۆ ئێمە نابێتە کەمی.

تیگرانس وتی: ئایا پاشا ئاگادارە ئێوە بە نیازن بە تەنها و بێ سەربازەکانتان بەشدار بن؟

ئاریابیژەن وتی: ئەمرۆ دوای ئەوەی پاشا لە خەو هەستا، چووینە خزمەتی تا مۆڵەتمان بدات بە تەنهایی لە جەنگدا بەشدار ببین. پاشا پرسیاری کرد ئایا ئێوەی شازادە بەبێ سوپا و سەربازەکانی خۆتان دەتانەوێت بەشداری جەنگ بن.

ئارشامەنێشی برام وتی ئەی پاشا، ئێمە لە پایەبەرزترین کەسانی وڵاتەکەمانین و پێویستە شانازی بەشداری لەو جەنگەمان بەرکەوێت، فیداکاری لە جەنگ لە ئەستۆی ئەو کەسانەیە کە لە بەرزترین پایەکانی پەیرەوانی تۆ بن و نابێت تەنها پیرەمێرد و بێ تواناکان بەشداربن لەو جەنگەدا.

---

(٢) (مێژوو گێرانەوەی ئەو بابەتانەیە کە ڕوویانداوە و شیکار کردنیشیان کارێکی باش و سروشتییە تا خوێنەر و لێکۆڵەر بگەنە ئاکامی باش و بزانن ڕاستی چوون بووە. بەڵام ناکرێت شیکار بگاتە ئەو ڕادەیە کە دوای مردنی کەسێك، لە خۆمانەوە بڕیار بدەین چی لە دڵیدا بووە. وەرگێر بۆ کوردی)

پاشا بیرۆکەی ئێمەی پەسەندکرد و وتی پێش ئەوەی برۆن بۆ جەنگ، پێویستە جێنشین بۆ خۆتان لەناو سوپاکانتان دیاری بکەن چونکە لەوانەیە نەگەڕێنەوە. ئێمەش جێنشینەکانی خۆمان دیاریکرد و ئێستا هاتووین تا بەشداری جەنگ بین و دەمانەوێت لە ریزی پێشەوە بین.

تیگرانس وتی: ئەگەر ئێوە لە ریزی پێشەوە بن و هیچتان بە سەر بێت من چ وەڵامی پاشا بدەمەوە؟

ئارشامەنێش وتی: چونکە پاشا خۆی مۆڵەتی داوین تا بەشداری جەنگ بین، بە هۆی بوونی ئێمە لە ریزی پێشەوە ئێوە سەرزەنشت ناکات.

ئاریابیژەن و ئارشامەنێش وەك هەریەکە لە شازادەکانی تری هەخامەنشی باڵابەرز بوون، بەڵام نەك زۆر بەرز و ئەو رۆژەش وەك جلوبەرگی جەنگیان وەك هەر شازادەیەکی تر کردبۆوە بەریان. هەر دوو شازادە کاسکێتی زێرینیان لەسەر بوو کە لە دووبەش پێکهاتبوو و دەتواندرا بەشێکی ببێتە پۆششی روخساریان، بەڵام کاسکێتەکان لە زێر نەبوون، چونکە زێر زۆر قورس دەبوو و لەوانەبوو گەیشتبایە دوو کیلۆگرام.

ئەو زرێیەی لە بەر ئەوان بوو لە قەلا دروستکرا بوو، ئەو کانزایە چونکە نەرم بوو لە گەڵ مسیان تێکەڵ دەکرد تا پتەوتر ببێت و ئەو کانزایە بە هۆی سووکیەوە بۆ دروستکردنی زرێ زۆر سوودی لێ وەردەگیرا و لە هەمانکاتدا ساق بەند و ڕان بەند لە کانزای سووکتر دروست دەکران. زرێی ئەو دوو برایە بە ڕەنگێکی تاریك دەردەکەوت، بەڵام هەموو بەشەکانی تری چەکەکانیان وەك کاسکێتەکانیان لە دوورەوە زەرد دەچوو و دەبریسکانەوە.

هەریەکە لەوان شمشێرێك و تەورێکیان پێ بوو، بەڵام قەلغانیان نەبوو، چونکە وایان بیردەکردەوە کە بە بێ قەلغان باشتر دەتوانن بجەنگن. هەردووکیان لە سەرەتای لاویەتی بوون و تازە موویان لێ دەهات و ئاریابیژەن بیست و دووساڵان و ئارشامەنێش بیست ساڵی بوو و وەك هەموو شازادە هەخامەنشییەکان برۆکانیان کەوانەیی و چاوەکانیان گەورە و ڕەش و مژورکەکانیان درێژ و چەماوە بوون.

پێش ئەوەی جەنگ دەست پێبکات، تیگرانس بە سەربازەکانی وت: شەوی ڕابردوو دوای کۆتایی جەنگ پاشا داوای منی کرد و وتی ئەمرۆ دەبێت ئەو دەربەندە لە لایەن ئێمەوە داگیر بکرێت و ئەگەر نەتوانین هەمووشی داگیر بکەین، بەلانی کەم نیوەی دەبێت بگرین.

من بە پاشام وت ئەگەر ئەمرۆ نەتوانین لانی کەم نیوەی دەربەندەکە بگرین بە زیندوویی ناگەڕێینەوە، چونکە من لە رووم نایەت بچمەوە خزمەت پاشا. بۆیە بە ئێوە دەڵێم کە ئەمرۆ

دەبێت بە لانی کەم نیوەی دەربەندەکە بگرین و بۆ ئەو کارەش نابێت لە هیچ شتێك سڵ بکەینەوە. وەك دەبینن ئەمرۆ دوو لە برایانی پاشا کە گەورەییان بەسەر هەمووماندا هەیە هاتوون و بەشدار دەبن لەو جەنگەدا و داوایان لە من کردووە کە لە ریزی پێشەوەی جەنگ دابندرێن، کاتێك ئەو شازادە گەنج و قۆزانە ئامادەی گیان بەخشین بن، ئێمە نابێت لە بەخشینی گیانمان سڵ بکەینەوە.

دوای تەواوبوونی وتەکانی تیگرانس، سەربازێك کە بە هۆی تەمەنی زۆریەوە مۆڵەتی بە خۆیەدا وەڵامی ئەو بداتەوە، بە قسە هات و وتی کەس لە فیدا کردنی گیانی بە گومان نییە، بەڵام مەیدانی جەنگ پانتایی زۆر کەمە و لایەك دوژمن و لایەك شاخ و لایەك خەرەندی زۆر قووڵە. لە گەڵ ئەوەشدا هەمووومان ئەمرۆ تێدەکۆشین تا دوژمن لەو دەربەندە لابدەین و ئەوێ داگیر بکەین.

لە شەوی پێشوو ئەو سەربازە یۆنانیانەی لە دەروازەی گەورە بوون تا بەیانی ئاگریان کردەوە، چونکە لەو ناوچە شاخاویە هەوا سارد بوو و ئەوان لە ترسی هێرشی لەپڕی هەخامەنشییەکان نەیاندەتوانی بخەون، لە گەڵ هاتنی بەرەبەیان سەربازەکانی تسی پی کە تا ئەوکات بێدار بوون بۆ پشت دەربەندەکە گواسترانەوە و دەستەیەك لە سەربازەکانی ئەسینا کە ئەوانیش لە سەربازانی هۆپ لیت واتە زرێ پۆش بوون، راسپێردران تا لە دەروازەی دەربەندەکە پێش بە هەخامەنشییەکان.

باسمان کرد کە لە شەوی ڕابردوودا خەشایار فەرماندەی تازەی بۆ دۆزینەوەی رێگا دیاریکرد و ئەو دەبوایە بچێتە شاخ و هەموو شوێنێك ببینێت. ئەو جگە لە ئەرکە سەرەکیەکەی، فەرمانی پێکرا بوو تا چوار مەنجەنیقە یۆنانییەکەی رۆژی پێشوو لەناو ببات کە هەخامەنشییەکانیان خستبۆوە کێشەوە. ئەو پێش سەرکەوتنی لە شاخ ئەو دەستە سەربازەی کۆکردنەوە کە لە گەڵ ئەودا دەچوون و تورەکەیەکی دایە هەریەکەیان تا بەردێك یا ئەگەر بتوانن دوو بەردی گەورەی بخەنەناو، ئەو دەیزانی بەردە بچووکەکان ئەگەر لە شاخەوە هەڵبدرێن بۆ سەر مەنجەنیقەکان یا ئەوانەی کاریان پێدەکەن، لەوانەیە کاریگەریان نەبێت، بەڵام بەردی گەورە کە لە لوتکەی شاخەکانەوە دەکەون دەتوانن مەنجەنیقەکان تێك بشکێنن و ئەگەر نەشیان شکێنێت، بە دڵنیاییەوە مەنجەنیق چییەکان دەکوژێت.

هێشتا جەنگ دەستی پێ نەکردبوو کە دەنگی گەورەی وەك تریشقەی هەور لە ناو دۆڵەکە هات، چونکە سەربازەکانی دەستەی دۆزینەوە بەردە گەورەکانیان بە سەر مەنجەنیق و مەنجەنیق هاوێژەکاندا

بەرداوەتەوە. هاواری ترسناك لە ناو دەربەندەکە هەستان و هەر بەردێك کە بەر کەسێك دەکەوت، دەست بەجێ دیکوشت یا ئەوەندەی بریندار دەکرد کە توانای هەستانەوەی نەدەبوو و فەرماندەی دەستەکە پێش دەست پێکردنەوەی جەنگ توانی هەر چوار مەنجەنیقەکە بشکێنێت و بەو شێوەیە مەنجەنیقە یۆنانییەکان چیتر نەبوونە کێشە بۆ سەربازانی لەشکری خەشایار.

ئاریابیژەن و ئارشامەنێش لە ریزی پێشەوەی سەربازانی لەشکری خەشایار هێرشیان کرد و لە هەردوو لا و پشت ئەوانەوە چەند سەربازێکی تر بە شمشیرەوە بەرەو پێش چوون، بەڵام شازادەکان بە تەورەوە کەتنە هێرش بردن، چونکە رۆژی پێشتر زانیبوویان کە یۆنانییەکان زۆر سەرسەختانە دەجەنگن و بۆیە پێیان وابوو کە زەربەکانی تەور ئەوان زووتر دەخات. تەوری هەر دوو برا لە جۆری تەورە کۆنەکان بوو و سەری گەورە و پانی ئاسنینی هەبوو و زەربەکانیان بۆ سەربازەکانی ئەسینا مەترسیدار بوون و ئەگەر بەر ئەو شوێنانەی لەشیان کەوتبایە کە پۆشراو نەبوون، سەربازەکان دەکەوتن و هەڵنەدەستانەوە.

ئاریابیژەن و ئارشامەنێش بە زەربە بەهێزەکانی تەورەکانیان رێگەیان کردەوە و لە گەڵ خۆیاندا و لە هەر دوو لا و پشتیانەوە هەندێ سەربازی تریان هێنایە پێش، باڵای بەرزی هەر دوو شازادە لە پێشرەوی ئەواندا کاریگەر بوو و لە هەموو جەنگەکاندا ئەوانەی باڵایان بەرز بوو ئاسانتر بە شمشێر و تیر و تەور لە بەرانبەر سەربازە کورتەکاندا دەجەنگان. سەرەرای باڵا بەرزەکەیان، بەرگە سەربازییەکەشیان لە پێشرەوی ئەوان کاریگەر بوو، چونکە بەرگی سەربازی ئەوان جگە لە جومگەکانی شان و ئەژنۆ و باسك، هەموو شوێنەکانی تریان پۆشراو بوو و شوێنێك نەبوو شمشێری دوژمنی بەر بکەوێت و تەواوی زەربەکان بەر کانزاکە دەکەوتن و کاریگەریان نەدەبوو. تەنانەت روخساریشیان بە کاسکێتەکانیان داپۆشرا بوو و رێگەی لە هەر زەرەرێك بە تایبەتی بە چاوەکانیان دەگرت. بەرەبەرە ئەو دوو شازادە باڵابەرزە بۆ یۆنانییەکان وەك خێو دەهاتنە بەرچاو، چونکە نەیاندەتوانی بەسەریاندا زاڵ بن.

لە هەردوولای دوو شازادەکە، سەربازەکانی ماد بە زەربەی شمشێر و نێزەکانیان یۆنانییەکانی ئەسینایان دەخست و هاوسەنگەرەکانیان جێیان دەگرتنەوە، بەڵام ئەو دوو گەنجە بە باڵای لە شکان نەهاتووە دەچوونە پێش و لە گەلیشیاندا سەربازی تر دەهاتن. بەڵام وێڕای بەرەو پێش چوونی هەر دوو شازادە، لە پڕ ماندوویەتی تەور وەشاندن لە ئەواندا دەرکەوت و دەستەکانیان ماندوو بوون، لە کاتێکدا کە سەربازەکانی ئەسینا هەستیان بە ماندوو بوون

نەدەکرد و ئەو ڕۆژەش وەك ڕۆژی پێشتر کاریگەری وەرزشی بەردەوام دەرکەوت و زاندرا کە یۆنانییەکان جەستەیان بە شێوەیەك ڕاهێناوە کە بێ ماندوو بوون شمشێر دەوەشێنن.

لە پڕ کەمەندێك بەرەو رووی ئارشامەنێش هەڵدراو و لە گەرووی کە کاسکێتی لە سەر بوو، گیر بوو و ئەویش بە هۆی کاسکێتەکە نەتەنها هەستی بە خەنکان تەنانەت بە ئازاریش نەکرد و چونکە تەوری لە دەستدابوو، بانگی ئاریابێژەنی کرد تا کەمەندەکەی بۆ بپسێنێت و پێش ئەوەی فریای ئەو کارە بکەوێت، لەبەر گوشاری کەمەندەکە کەوتە سەر زەوی و چەند سەربازێکی یۆنانی ڕایانکێشا و بردیان. هەرچەندە شازادە بەهێز بوو، بەڵام نەیتوانی خۆی ڕزگار بکات بۆیە لەوکاتەی ڕایان دەکێشا تەورەکەی بەردا تا بتوانێت بە شمشێرەکەی بەنەکە بپسێنێت، بەڵام شمشێر کەوتبۆوە ژێر جەستەی و چونکە ڕایان دەکێشا نەیتوانی دەست بباتە ژێر خۆی و لە کالانەکەی دەربکات.

ئاریابێژەن کە بینی براکەی ڕادەکێشن و دەیبەن، بە توندی هێرشی کرد، بەڵام یۆنانییەکان پێشیان گرت و بە ناچاری هاواری بۆ سەربازانی لەشکری ماد کرد کە براکەم لە سەر زەوی ڕادەکێشن و دەیبەن، برۆن و براکەم بێننەوە، سەربازەکان زۆر هەوڵیاندا ڕێگری لەو کارە بکەن، بەڵام بە هۆی بەرگری توندە ئەسینایییەکان بێ سوود بوو.

لەو کاتەی شازادەی هەخامەنشیان لەسەر زەوی ڕادەکێشا و دەیان برد و ئەویش هەوڵی ڕزگاربوونی دەدا، سەربازێکی یۆنانی زەربەیەکی توندی بەو گورزەی لە دەستیدا بوو لە کاسکێتەکەیدا و زەربەکە ئەوەندە بەهێز بوو کاسکێتەکەی قوپاند و ئارشامەنێش بەو هۆیەوە بێ هۆش بوو و لە هەوڵدان کەوت و ئەوکاتە شازادەی هەخامەنشی کەوتبۆوە نێوان یۆنانییەکان و تا ئەوکات ڕووی لە زەوی بوو، یۆنانییەکان سوراندیانەوە سەر پشت. یۆنانییەکان ئەوەندە ڕقیان لێ بوو کە پێش ئەوەی کاسکێتەکەی لاببەن و بزانن کێ یە، یەکیان بە خەنجەر هێرشی بردە سەر و لە شوێنی نێوان کاسکێت و قەلغانەکەیەوە، دەماری ملی بە چەند جووڵەیەکی خێرای خەنجەرەکە بڕی و کوشتی و خوێن لە بۆشایی نێوان زرێ و کاسکێتەکەیەوە دەرچوو.

دوای ئەوە سەربازێکی تری ئەسینا کاسکێتەکەی لە سەری لادا تا بزانێت ئەو پیاوەی ئەو هەموو یۆنانییەی کوشت کێ یە و چاوە ڕەشەکانی شازادە ئارشامەنشی بینی، هەرچەندە چاوەکانی شازادەی هەخامەنشی کراوە بوو، بەڵام ئەو سەربازە یۆنانیانەی ئەویان دەبینی زانیان کە مردووە، ئەوکات پەتی کەمەندەکەی کردەوە تا بتوانێت کاسکێتە گرانبەهاکەی داگیرکرد و

ئەو قەلغانەکی قەڵاییشی لەبەردا بوو کە ئەویشیان خاوەنداری کرد و ئەوکات لاشەی شازادە ئازایە هەخامەنشییەکەیان هەڵدایە ناو خەرەندەکەوە.

دوای کۆتایی هاتنی جەنگ، لاشەی شازادەیان لە خەرەندەکە دەرهێنایەوە و چونکە کوری داریوشی یەکەم و برای خەشایار بوو، لاشەکەیان ناردەوە بۆ ئێران تا لە ئەوێ لە گۆر بنرێت.

تیگرانس فەرماندەی ئەو لەشکرەی ئەرکی گرتنی دەربەندی تەرمرپیل هەبوو زۆر دەترسا، چونکە شەوی پێش بەڵێنی بە خەشایار دابوو یا نیوەی دەربەندەکە دەگرێت و ئەگەر نەیتوانی بە زیندوویی ناگەرێتەوە. سەربازەکانی ئەسینا بە توندی بەرگریان دەکرد و تیگرانس دەیزانی بۆ ئەوەی بتوانێت بچێتە ناو دەربەندەکە پێویستە هەموو سەربازەکانی ئەسینا کە لە دەروازەکەن بکوژێت.

ئەو داوای ئاریابێژەنی کرد و وتی: ئەی شازادە، ئێمە تا تەواوی سەربازە ئەسیناییەکان نەکوژین ناتوانین بگەینە ناو دەربەندەکە و من بۆ کوشتنی ئەوان بیرۆکەیەکم هەیە.

ئاریابێژەن وتی: بیرۆکەکەت چییە؟

تیگرانس وتی: ئەگەر توانیبامان عارەبانەکانمان بێنینە ناو ئەو دەربەندە کۆتاییمان بە بەرگری ئەوان دەهێنا، بەڵام رێگەکە بە شێوەیەکە ناتوانین عارەبانەکان بهێنین و دەبێت ئەوان پیادە بکەین و لە ئەوێیان تێپەرێنین، من بیرم کردووتەوە کە دیوار لە نێزەی درێژ دروست بکەین و هەریەکە لە دیوارانە بە دوای دیوارەکەی تردا هێرش بکات، دەمەوێت داوا لە تۆ بکەم کە یەك لەو دیوارە نێزانە دروست بکەی و وەك تاقی کردنەوە هێرش بکەی.

ئاریابێژەن وتی: پێم بڵێ ئەو دیوارانە چوون دروست دەکەی تا من ئەو کارەت بۆ بکەم؟

تیگرانس وتی: من بیرم کردووتەوە کە چوار ریز لە سەربازانی ئێمە بە نێزە درێژەکانیانەوە دیوارێك پێك بهێنن بە شێوەیەك کە ریزی یەکەم بە نیوە دانیشتوویی و ریزی دووەم تۆزێك بەرزتر لەوان و ریزی سێیەم بەرزتر لە دووەم و ریزی چوارەمیش هەستنە سەر پێ و هێرش بکەنە سەر یۆنانییەکان. ئەو چوار ریزە کە بە چوار شێوە ڕادەوەستن دەبێت بەیەکەوە بجوولێن و نێزەکانیان بەیەکەوە بەر سەربازە یۆنانییەکان بکەوێت، ئەگەر بتوانین ئەو دیوارانە دروست بکەین، پێموایە دەتوانین بەرگری سەربازانی یۆنانی لەناو ببەین. داوای من لە تۆ ئەوەیە یەکەم دیواری لەو شێوەیە دروست بکەی و تاقی بکەیەوە و ئەگەر سەرکەوتوو بووی، دیواری تر دروست دەکەین، بەڵام چونکە رۆژەکان کورتن نابێت کاتمان لە کیس بچێت و دەبێت پەلە بکەی. ئاریابێژەن بۆ جێبەجێ کردنی ئەو فەرمانە کەوتەرێ و تیگرانسیش کۆمەڵێك لە

سەربازەکانی خستە بەر فەرماندەیی ئەو، ئەوکات ئەو دیوارە جوولاوە ناوی نەبوو و دواتر ناوی (دیواری ژووژك) لێندرا.

ئاریابێژەن دوای نیوکاتژمێر یەکەمین دیواری ژووژکی هێنایە پێش فەرماندەی سوپا. وەك گووترا بوو ریزی یەکەم نزیکەی دانیشتوو بوون و ئەوانی تر بەرەبەرە بەرزتر دەبوون تا ریزی دوایین بە پێوە دەوەستان و هەر ریزێك لە پێنج نێزە هەڵگر پێکهاتبوو و لە خوارەوە بۆ سەرەوە بیست نێزە بەرانبەر دوژمن دەبۆوە و چونکە سەربازەکان بەیەکەوە دەجوولان، هەر بیست نێزە بەیەکەوە بەر دوژمن دەکەت و بەو پێیە کە تیگرانس دەیەویست کۆمەڵی زۆری هاوشێوە دروست بکات کە یەك لەدوای ئەوی تر هێرش بکات، ئۆمێدی هەبوو کە بەرگری سەربازەکانی ئەسینا لە دەروازەی دەربەندەکە لە ناو ببات.

تیگرانس دروستکردنی دیوارەکانی تری ژووژکیشی بە ئاریابێژەن سپارد و فەرمانی کرد کە فەرماندەی هەریەکەیان، کەسی یەکەمی وەستاو لە لای ڕاست بێت. هەرچەندە ئاریابێژەن بە چاوی خۆی کوژرانی براکەی بینی، بەڵام داوای لە تیگرانس کرد تا فەرماندەیی یەکەم دیواری ژووژك بداتە ئەو و فەرماندەش بە هۆی پێداگری زۆری شازادە، داواکەی پەسەندکرد و بەو شێوەیە کوری داریوشی یەکەم جارێکی تر ئامادەی جەنگ بۆوە و هێشتا نیوەڕۆ نەهاتبوو کە هێرشی یەکەم دیواری ژووژك بە فەرماندەیی شازادە دەستی پێکرد و لە پشت ئەویشەوە دیوارەکانی تر ئامادەبوون بۆ هێرش و فەرمان کرا بە سەربازەکان تا ئەو لاشانەی ڕێگەی پێشرەویان لێ دەگرن، هەڵدەنە ناو خەرەندەکە و نەوەستن، چونکە دەبێت تا ئێوارە بە هەر شێوەیەك بێت نیوەی دەربەندەکە داگیر بکەن.

ئاریابێژەن فەرمانی بە دیوارەکەی خۆیدا تا بجوولێن و ئاریا بێژەن و نۆزدە سەرباز کەتنە هێرش بردن، نێزە درێژەکانی ئەوان وەك بیست پەیکان بەرەو دوژمن ڕاگیرابوو و بە نزیکبوونەوەیان لە سەربازانی ئەسینا، خێرایی خۆیان زیاد کرد و وەك تەنێك کە بەر دیوارێك دەکەوێت بەر سەربازە یۆنانییەکان کەوتن. هەرچەندە سەربازە یۆنانییەکان کەوتبوونە بەرانبەر چەکێکی تازە، بەڵام نەدەترسان و هەوڵیان دەدا بە زەربەکانی شمشێر و تیر، نیزەکان لە خۆیان دوور بخەنەوە، بەڵام ئەگەر نێزەیەك یا دوانیان بە زەربەکانیان دەشکاند، سەرەنجام ئەوانی تر دەگەیشتە سەربازە یۆنانییەکان و لە جەستەیان روودەچوو.

سەربازە ئەسینایییەکان ئەوەندە ئازا بوون کە خۆیان هەڵدەدا و بە تەور یا شمشێر لە سەری سەربازەکانی ناو دیواری ژووژکیان دەدا، بەڵام پێش کوشتنی بەرانبەرەکەیان یان دوای ئەوەی

زەربەکەیان لە سەریان دەدا و دەیانکوشت، بە هۆی نێزەکانی ئەوان دەکوژران و کەمێك پێش ئەوەی نیوەرۆ بگات دەرکەوت شێوازی ژووژك کاریگەرە، چونکە سەربازەکانی ئەسینا زۆریان لیّ کوژراو و یا بە هۆی بریندار بوونیان نەیاندەتوانی بەردەوامبن لە جەنگ.

سەربازەکانی مادیش زۆریان لیّ کوژرا و کەمەند هاوێژە یۆنانییەکان لە کاتی هاویشتنی کەمەندەکانیان بۆ دوژمن لەو ناوچە بەرتەسکە کاری جوانیان دەکرد و کاتێك کەمەندەکە لە گەردنی یەك سەربازی نێزە هەڵگری لەشکری هەخامەنشی گیردەبوو، پێش ئەوەی ئەو بتوانێت خۆی رزگار بکات، دەیانخستە سەر زەوی و بە رادەیەك گوشاری کەمەندەکە لەسەر گەردنی سەربازانی لەشکری هەخامەنشی توند دەبوو کە دەخنکان و خنکان رێگر دەبوو لە ئەوەی بتوانێت شمشێرەکەی لە کالان دەربکات و پەتی کەمەندەکە بپسێنێت، ئەو رۆژە دەرکەوت کە کەمەند هاوێژە یۆنانییەکان زۆر بە توانان.

تیگرانس وتبووی ئەگەر بینیتان لاشەی کوژراوەکان رێگەتان لیّ دەگرێت، هەڵیاندەنە ناو خەرەندەکە، بەڵام ئەوەندە لاشەی کوژراو و بریندار لە رێگا کەوتبوو کە رێگەکە بە تەواوەتی دەهات دابخرێت، بۆیت تیگرانس فەرمانی کرد تا چەند دەستەیەك سەرباز بە تایبەتی بۆ ئەو کارە بچن و لاشەکان هەڵدەنە ناو خەرەندەکە. ئەو دەستە سەربازانە دەچوونە پشت چوار یا پێنج دەستە لە دیوارە ژووژکەکان و لە پشتیانەوە لاشەکانی سەربازانی خۆیان و دوژمنیان بەبیّ جیاوازی دەخستە خەرەندەکەوە و ئەگە دەنگ لە لاشەیەکەوە هاتبایە و زانیبایان زیندووە، دەیاننارده پشت مەیدانی جەنگ. بە وتەی پرۆفیسۆر بارن دوور نییە هەندیّ لەوانەی دەنگیشیان لیّ دەهات هەڵدرابنە ناو خەرەندەکە و هۆکارەکەشی ئەوە بوو کە لاشەکان ئەوەندە زۆر بوون کە دەیانزانی تەنانەت ناتوانن بۆ ناشتنی سەربازەکانی خۆشیان رێورەسمە تایبەتییەکان بەجیّ بگەیێنن.

سەربازە یۆنانییەکان کە دیتیان دیوارە ژووژکەکان بۆیان بۆنەتە مایەی کێشەی زۆر، هەوڵیاندا بە زرێیەکانیان بەرگری لە خۆیان بکەن و ئەوان زرێیەکانیان بە شێوەیەك لە پیش خۆیان ڕاگرت کە دیوارێك لە قەلغانیان لە بەرانبەر ژووژکەکان دروستکرد، بەڵام ئەو دیوارە قەلغانیانە بچووك بوون و نەیدەتوانی ئەوان بپارێزێت و ئەگەر زرێکەیان بردبایە سەرەوە تا بەشی سەرەوەی جەستەیان داپۆشێت قاچەکانیان بیّ پۆشش دەمایەوە و نێزە درێژەکان کە قات قات بوون لە قاچ تا سەریانی کون کون دەکرد.

دوای ئەوەی پێشڕەوی سەربازەکانی دیوارە ژووژکەکان بەردەوامبوو، تیگرانس فەرمانیدا تا شازادە بکشێتەوە و دەیزانی ئەگەر بەو شێوە بەردەوامبێت دەکوژرێت و تاکە شت کە تا ئەوکات نەی هێشت بوو ئەو بکوژرێت، زرێ و قەلغان و کاسکێتەکەی بوون. نیوەی سەربازەکانی ئەو دیوارەی ئاریابێژەن فەرماندەی بوو، کوژران و شازادە ئەوانی لە گەڵ دیوارێکی تردا یەك خست و دیوارەکەی تر فەرماندەی هەبوو، بەڵام وەك رێز بۆ شازادە فەرماندەیی بۆ ئەو جێهێشت.

شێوازی جەنگی ئەو رۆژەی ئاریابێژەن بۆ دیوارەکانی تر بۆوە وانەیەك و ئەوانی تریش لە کاتێك کە هەندێ لە سەربازەکانیان دەکوژرا، دوو دوو دەبوونەوە یەك و هەندێکیان ژمارەی سەربازەکانیان دەگەیشتە سی کەس لە جیاتی بیست کەس. یەك کاتژمێر لە دوای نیوەرۆ ئاریابێژەن لە مەیدانی جەنگ هێندرایەدەر و تیگرانس پێیوت ئێوە ئەمرۆ ئەوەندەی پێویست بوو خزمەتی پاشای خۆتانتان کردووە و پێویستە پشوو بدەی. بەڵام ئەو نەیویست ئەو وتەیە پەسەند بکات و چۆوە لای پاشا و داوای لێکرد تا رێگەی بدات بۆ بەردباران کردنی یۆنانییەکان لە شاخ سەرکەوێت و ئەویش رێگەی پێدا و وتی چەندی پێویستە سەرباز لەگەڵ خۆتدا ببە.

هاتنی دیوارە ژووژکەکان بۆ ناو دەربەندەکە قورس ببوو و فەرماندەی یۆنانییەکان پیاوێك بوو بە ناوی (پۆلی تێن)، ئەو پیاوێکی زانا و داهێنەر بوو و کاتێك دیتی دیوارەکانی ژووژك ناگەڕێنەوە، بە هەر شێوەیەك کە هەبوو لە شوێنێکی سەرەولێژی شاخ کە کەس نەیدەتوانی بیگاتێ، دەستەیەك لە سەربازە فەلاخەن (بەرد هاوێژەکانی) دانا و فەرمانی کرد بەردیان بەسەردا ببارێنن. پولی تێن دەیزانی ئەو بەردانەی لە بەرزاییەوە بەر سەربازانی دوژمن دەکەون لە تیری ناو کەوان کاریگەرترن و جگە لە ئەوەش ئەوان تەواوی تیرەکانی خۆیان تا نیوەرۆ هاویشتبوو و بۆیە فەرمانی کرد تا بەرد هاوێژەکان پێش بەو دیوارە ژووژکانە بگرن کە پێ نەدەچوو کۆتاییان بێت.

دەستەیەك لە خوارەوە بەردیان دەگەیاندە بەرد هاوێژەکان و ئەوانیش بەردەکانیان بە سەر سەربازە هەخامەنشییەکاندا دەباراند، ئەگەر بەردەکان بەر روخسار یا سەر و قاچی سەربازەکان کەوتبانە لە رۆیشتن دەکەوتن و ئەگەر بەر شوێنی تر کەوتبانە، دووچاری ئازاری توندی دەکردن. بەڵام تیگراس بڕیاریدا بوو ئەو رۆژە ئەو دەربەندە بگرێت، بۆیە بەردەوام و بێ پسانەوە یەکەی تازەی ژووژکی پێکدەهینا و دەیناردن بۆ ناو دەربەندەکە.

کاتی ئێوارە سەربازە یۆنانییەکان کە لە بەیانییەوە تا ئەوکات بێ پسانەوە و ساتێك پشوودان دەجەنگان، هەرچەندە هەموویان وەرزشکار بوون و وەرزشکار درەنگتر ماندوو دەبوو، بەڵام وەرزشکاریش بە هۆی بەردەوام ڕاوەشاندنی تەور و شمشێر لە بەیانی تا ئێوارە، دواجار ماندوو دەبێت. وتمان لە کۆندا کە سەرباز لە مەیدانی جەنگ بە تیر و شمشیر و نێزە و گورز و بێ پسانەوە دەجەنگا، هیچ شتێك وەك ماندوویەتی لە کەوتنی ئەو کاریگەر نەبوو و بە هۆی ماندوویەتی بە رادەیەك بێ توانا دەبوون کە وێڕای ئەوەی دەیاندیت سەربازەکانی دوژمن شمشێریان بەرانبەر دەکەنەوە، ئەوەندە توانایان نەبوو کە شمشێری خۆیان بەرز بکەنەوە و لە بەرانبەر شمشێری دوژمنی رابگرن. ئەو رۆژە سەربازە یۆنانییەکان کەوتبوونە ئەو جۆرە لە ماندوو بوون و ئەو ژمارەیەی کە مابوونەوە نەیاندەتوانی بەردەوامی بدەن بە جەنگ کردن.

پولی تێن پێش ئەوەی سەربازەکانی بە تەواوەتی ماندوو بن، داوای یارمەتی لە پشتەوە کرد و وەڵامی نارد تا ژمارەیەك سەرباز بێت و جێگەیان بگرێتەوە تا ئەوان ماندوویەتیان دەربچێت. لە پشت پولی تێن لە ناوەڕاستی دەربەندەکە سێ سەد سەربازی ئێسپارت لە گەڵ پاشاکەیان بە ناوی لئۆنیداس هەبوون و وەڵامیاندایەوە کە ناتوانن شوێنی خۆیان جێ بهێڵن کە بەرانبەر رێ یا بزنە رێیە نهێنییەکەیە و بێن بۆ ئەوێ، چونکە دەترسن خەشایار رێگە نهێنییەکە بدۆزێتەوە و لە پشتەوە هێرش بکاتەسەر هەردوو لا.

ئەو رێگە نهێنییە هەمان ئەو رێگەیە بوو کە مێژوونووسە یۆنانییەکان زۆر باسیان کردووە و وایان بیر کردووتەوە کە هەخامەنشییەکان نەیزانیوە ئەو رێگەیە هەیە و لە ڕاستیدا خەشایار ئەو رێگەی زانیوە و وەك وتمان پێداگری خەشایار بۆ داگیرکردنی بە لانی کەم نیوەی دەربەندەکە، بۆ گەیشتنی بوو بەو رێگە باریکە تا لە ئەوێوە بتوانێت بەرەو دەرەوەی دەربەندەکە بڕوات و دەیزانی نابێت ئەو دەربەندە بە بەخشینی ژمارەیەکی زۆر لە کوژراو کە جێگەی پڕ نەکرێتەوە، بەجێ بهێڵێت.

بە پێی هەندێ سەرچاوە جگە لە سێ سەد سەربازە ئێسپارتییەکان، هەزار سەربازی یۆنانیش لە قەدی ئە دەربەندە بوون، بەڵام ئەوان نەچوون تا شوێنی سەربازە ماندووە ئەسینایییەکان بگرنەوە، پۆلی تێن کە بینی سەربازەکانی توانا و بایەخی سەربازی خۆیان لە دەستداوە بۆ ئەوەی هەموویان لە ناو نەچن، فەرمانیدا پەیوەندیان بە هێڵی پێشەوە و دوژمن بپسێنن و بکشێنەوە. باسی ئەو خاڵە گرنگە کە بوترێت تا پێش ئەوکات یۆنانییەکان بە هێواشی لە بەرانبەر سەربازە هەخامەنشییەکان کە هەموویان تازە نەفەس بوون، پاشەکشەیان

دەکرد و پاشەکشەکەیان بە مەبەستی ئەوە بوو کە لە شوێنی باشتر دەرفەت بێنن تا بەرگری بکەن، بەڵام ئەو جارە کشانەوە بۆ ئەوەی کۆتایی بە جەنگی ئەو رۆژە بهێنن.

سەربازەکانی لەشکری ماد ئەوەندە بەدوا یۆنانییەکاندا رۆیشتن تا گەیشتنە قەدی دەربەندەکە و لە ئەوێ دیوارێکیان بینی. ئەو دیوارە لە لایەن سەربازانی ئێسپارت دروستکرابوو تا ئەگەر دوژمنەکان توانیان بگەنە ئەو شوێنە، نەتوانن لە ئەوێ دەربچن و بۆیە سەربازەکانی ماد لە بەرانبەر دیوارەکە وەستان و تیگرانس ئەو شوێنانەی داگیری کرد بوون، بەهێزی کردن تا ئەگەر یۆنانییەکان هێرشیان کردەوە، نەتوانن داگیریان بکەنەوە. تیگرانس توانی لە کاتی رۆژئاوا بوونی ئەو رۆژە بە سەربەرزییەوە بچێتە لای خەشایارشا و ڕاپۆرتی ئاکامی جەنگی پێ بدات و بڵێت سەربازەکانی وەك پێیان وترابوو توانیان نیوەی دەربەندەکە داگیر بکەن.

ئاریابێژەن کە بۆ بەردباراندن بەسەر یۆنانییەکاندا چووبوو بۆ شاخ، کاتێك گەیشتە شوێنی خۆی کە یۆنانییەکان کشابوونەوە و هێڵی پەیوەندیان لەگەڵ دوژمن نەمابوو و چونکە شەو نزیك بوو، گەڕایەوە و بەو شێوەیە دووەم رۆژی جەنگ تەواو بوو.

## ئازایەتی سەربازەکانی ئێسپارت

سەبارەت بە جەنگی تەرمۆپیلێ زۆر ئەفسانە وتراون کە ئێمە لێرە باسمان نەکردوون، چونکە ئێمە باس لە مێژوو دەکەین نەوەك ئەفسانە.

یەك لەو ئەفسانانە ئەوەیە کە گوایە سەربازانی ئێسپارت لە شەوی سێ هەمی جەنگەکەدا لە شەو تا بەیانی بە ساز و ڕەبت کەوتنە سەما و هەڵپەرکێ و گۆرانی و ویستیان دوایین شەوی ژیانیان ئاهەنگ بگرن، بەڵام ئەو بابەتە بە دوو هۆکار ڕاست نییە:

یەکەم ئەوە بوو کە سەربازانی ئێسپارتی دڵنیا نەبوون کە بۆ بەیانی دەکوژرێن و خاڵی دووەم ئەگەر دڵنیاش بووبانە کە ڕۆژی دواتر دەکوژرێن، دیسان نەیاندەتوانی کاتەکانی خۆیان بە لێدانی عوود و ساز بەسەر ببەن و لە پەلاماری لەنەکاوی سەربازەکانی هەخامەنشی بۆ سەریان دەترسان و هەموو ساتێك چاوەڕوانی ئەو هێرشە بوون.

پێش ئەوەی بە تەواوەتی شەو دابێت، خەشایارشا براکەی کە ناوی (گۆبریاس) بوو ڕاسپارد تا ڕۆژی دواتر ئەو دیوارەی ئێسپارتەکان لە ناوەڕاستی گەلیەکە بینایان کردبوو وێران بکات و بەرگری سەربازە ئێسپارتەکان تێك بشکێنێت.

ڕاسپاردنی گۆبریاس بۆ ئەو کارە نەدەگەڕایەوە بۆ توڕە بوون لە تیگرانس، بەڵکو خەشایار ئەوی لاواندەوە و پلە و پایەی تازەی پێ بەخشی، چونکە ئەو توانی فەرمانی پاشای ئێران بەجێ بگەیێنێت و نیوەی گەلیەکە بگرێت، بەڵام ئەو سەربازەکانی بە هۆی جەنگی توندی ڕۆژی دووەم بە توندی ماندوو ببوون و پێویستیان بە پشوو هەبوو.

گۆبریاس برای خەشایارشا و کوری داریوشی یەکەم و هاوکات کورە پوری خەشایاریش بوو. چونکە داریوشی یەکەم تەنها هاوسەرگیری لە گەڵ ئاتووسای کچی کوروشی دامەزرێنەری زنجیرە پاشایەتی هەخامەنشی نەکردبوو، بەڵکو هاوسەرگیری کرد بوو لە گەڵ کچی بچووکی کوروش کە ناوی (ئارتیس توون) بوو و خەشایار کوری ئاتووسا بوو و گۆبریاسیش کوری ئارتیس توون و بەو شێوەیە ئەوان هەم برا بوون و هەم پورزای یەکتر.

خەشایار کاتێك گوبریاسی ڕاسپارد تا هێرش بکاتەسەر ئێسپارتەکان، پێیوت: ئەمرۆ تیگرانس دیواری ژووژکی داهێنا و بەو شێوەیە توانی ئاکامی باش وەربگرێت و تۆش بەیانی داهێنانێك بکە تا بتوانی بەیانی دیواری ناو گەلیەکە برۆخێنی و بۆ ئەمەش بڕۆ و سوود لە عەقڵی تیگرانس وەربگرە.

گۆبریاس دوای ئەوەی لە خزمەت پاشا هەستا، بە پەلە چوو بۆ لای تیگرانس کە بە خۆشحاڵیەوە دەیەویست بحەوێت و وتی: پاشا پێی وتووم لە تۆ بۆ وێرانکردنی ئەو دیوارەی لە لایەن ئێسپارتەکانەوە لەناو گەلیەکە دروستکراوە یارمەتی فکری وەربگرم.

تیگرانس وتی: شتێك لە دار دروست بکە کە دەسکی زۆری لێ دەرچووبن و ئەو دەسکانە سەربازەکانت بگرن و ڕابکەن و بە تەواوی هێزیانەوە لە دیوارەکەی بدەن. ئەگەر ئەوەی دروستی دەکەی گەورە و قورس بێت و سەربازەکانت بە خێرایی و توندی لە دیوارەکەی بدەن، دوای چەند زەربەیەك دیوارەکە وێران دەبێت. گۆبریاس هەر ئەو شەوە دارتاشەکانی ناچارکرد تا ئەو کەرەستەیەی بۆ دروست بکەن کە دواتر بە (بۆرگۆ) ناسرا، چونکە دەیزانی بەیانی کاتی پێویستی بۆ ئەوە نابێت.

ئەو کەرەستەیەی دارتاشەکان دروستیان کرد بوو وەك دیوارێکی دارینی قورس بوو کە دەسکی زۆر ئەستوور و بەرز و ستوونی وەك دیواری هەبوو و شەست کەس پێویست بوو بۆ هەڵگرتنی، بۆرگۆ ئەو سوودەی هەبوو کە ئەو سەربازانەی دەپاراست کە هەڵیان

گرتبوو لە تیری کەوان و بەردی بەردەقانی و بەردی مەنجەنیقەکان. سەربازەکانی بۆرگۆیان هەڵدەگرت، وێڕای ئەوەی پارێزراو دەبوون، هاوکات لە رێگەی ئەو کونانەی تیایدا دروستکرابوو، سەربازەکان پێش خۆیان دەدیت.

شەوی سێیەمی جەنگ هەوا زۆر ساردتر بوو و هەر دوو لا لە درێژایی گەلیەکە ئاگریان کرد بۆوە و لە درێژایی گەلی تەرمۆبیل رووناکی ئاگری هەخامەنشی و یۆنانییەکان دیار بوو و وێرای ئەوەی هەر دوولا ئاگری گەورەیان کردبۆوە، بەڵام نەیانتوانی لە بەر ئەوەی لە هەوای ئازاد بوون ئەو شەوە بخەون.

لە پشت دیوارەکە سێ سەد سەربازی ئێسپارتی و پاشاکەیان بە ناوی لئۆنیداس کە تەمەنی پەنجا ساڵ بوو، هەبوون و وەك پرۆفیسۆر بارنی بەریتانی دەڵێت لئۆنیداس پەنجا ساڵ تەمەنی بوو، بەڵام ئەو تەمەنە لە روخساری دەرنەدەکەوت و تەمەنی زۆر کەمتر دەردەکەوت. سێ سەد سەربازە ئێسپارتییەکەش بە پێچەوانەی ئەوەی لە ئەفسانەکاندا دەگوترێت هەموویان گەنج نەبوون و لە ناویاندا پیاوی تەمەن شەست ساڵیش هەبوو. هەموویان لەو کەسانە بوون کە لە قوتابخانەی ئێسپارت پەروەردە ببوون و لە ئێستای جیهاندا قوتابخانەیەك نییە کە بۆ پەروەردەکردنی سەربازەکان بە ئەندازەی قوتابخانەی ئێسپارت توند و پتەو بێت.

لە جەنگی دووەمی جیهانیدا ژاپۆنییەکان هەندێ فرۆکەوانیان بۆ گیان فیداکردن ئامادەکرد کە بە (کامیکاز) ناسرابوون و لە پەروەردەکردنیاندا زۆر بە رەقی مامەڵەیان لە گەڵدا دەکردن و لە دوایین قۆناغەکانی ئامادەکردنیاندا بە قامچی لێیان دەدان تا جەستەیان بەرگەی ئازارەکان بگرێت، بەڵام ئێسپارتەکان لێدانی بە قامچی لە سەرەتاکانی پەروەردەکردنیاندا بوو و لە کۆتاییەکاندا چەقۆیان لە گۆشتی ڕانی رۆدەکرد و ئەوان نە تەنها هاواریان نەدەکرد، بەڵکو نەدەبوو روخساریشیان گرژ بکەن. ئەو پەروەردەیە کە بەردەوام وەرزش و فێر بوونی هونەرەکانی جەنگ واتە شمشێر وەشاندن و نێزە لێدان و تیر هاوێشتن و بازدانی لەگەڵدا بوو، ئەوانی دەکردە مرۆڤی ئاسنین و تەنانەت بە دە برینی سووکی شمشێر یا تیریش نەدەکەوتن و دەبوایە ئەندامێکی هەستیاری لەشیان لێ بکرێتەوە تا بکەون.

له کاتی پەروەردەکردنیاندا بەردی قورسیان دەخستە سەر پشتی گەنجی ئێسپارت و ناچار بە سەرکوتن لە شاخیان دەکرد، لە ڕۆژی یەکەمدا ئەوان لەوانە بوو تەنها پەنجا هەنگاو ڕۆیشتبان و کەوتبانە، بەڵام ڕۆژانی دواتر ڕادەهاتن و سەرئەنجام لە شاخ سەردەکەوتن. جوانی ئەو جەستەیەی بە هۆی وەرزشەوە دروست دەبوو لە لای ئێسپارتەکان زۆر گرنگ بوو و ئەوان بوون کە ئەورووپییەکانیان فێر کرد باڵایان ڕێك ڕابگرن و لە کاتی ڕۆیشتندا نەچەمێنەوە و بەردەوام سەریان بە شێوەیەك ڕابگرن کە چاویان دوو سەد مەتر دوورتر لە خۆی ببینێت تا کووژ نەبنەوە.

یەکەمین ئۆلەمپیای وەرزشی لە یۆنان لە ساڵی (٧٧٦ پ. ز) ساز درا و ئەمەش بوو بە سەرەتای مێژووی یۆنانی و ئەگەر ئێمە ئەو بەروارە بە سەرەتای وەرزش لە ئێسپارت و یۆنان دابنێین، واتە نزیکەی (٣٠٠) ساڵ پێش هاتنی لەشکری خەشایار بۆ یۆنان ئەو وڵاتانە وەرزشیان دەکرد و سێ سەدە وەرزش لە نەوە لەدوا یەکەکان، یارمەتی جوان کردنی جەستە و باڵا و بەهێزکردنی ورەی نەوەکانی یۆنانیدا.

ئەو سێ سەد سەربازەی لەگەڵ لئۆنیداسدا بوون، بایەخی هەزار سەربازیان هەبوو و لە بوونیاندا نەترس هەبوو و نە لە جەنگی ماوە درێژدا ماندوو دەبوون. پێشتر باسمان کرد کە نەتەوەکانی یۆنان نەیاندەویست لەگەڵ هەخامەنشییەکان بجەنگن، چونکە خۆیان لە مەترسیدا نەدەبینی و تەنها ئەسینا خۆی لە مەترسیدا دەبینی. ئێسپارتیش لەبەردەم مەترسی هەخامەنشی نەبوون چونکە ئەنجوومەنی پیرانی ئێسپارت خوازیاری جەنگ لە گەڵ هەخامەنشییەکانی نەبوو و ئێسپارتەکان لەشکریان بۆ جەنگ کۆ نەکردەوە، بۆیە لئۆنیداسی پاشای ئێسپارت تەنها لە گەڵ سەربازە تایبەتییەکانی کە سێ سەد کەس بوون هات بۆ جەنگی هەخامەنشییەکان، وتنی ئەو خاڵەمان بە لاوە گرنگ بوو تا خوێنەر دووچاری سەرسوڕمان نەبێت کە بۆچی پاشای ئێسپارت تەنها بە سێ سەد سەربازەوە هات بۆ جەنگ.

بەپێی ئەو یاسایەی ئێستا بە دەستوور ناوی دەبەین لە دەوڵەتەشاری ئێسپارت، پاشای ئەو وڵاتە مافی هەبوو سەربازە تایبەتەکانی بۆ هەموو شتێك بەکار بهێنێت جگە لە دژایەتی گەلەکەی. بۆیە هەرچەندە ئەنجومەنی پیرانی ئێسپارت نەیدەویست لەگەڵ هەخامەنشیدا بجەنگێت، ڕۆیشتنی لئۆنیداس بۆ جەنگ بە پێی یاسای ناوخۆی ئێسپارت

تاوان نەبوو. ئەوانەی مێژووی جەنگی تەرمۆپیلیان خوێندووتەوە یا دەخوێننەوە لە بیریاندا وادەرکەوتووە کە دەوڵەتی ئێسپارت لەگەڵ هەخامەنشیدا جەنگاوە و لە کاتێکدا کە حکومەتی ئێسپارت خوازیاری جەنگ نەبوون و خەشایاریش ئەو ڕاستییەی دەزانی.

پرۆفیسۆر بارن نووسیویەتی: ئایا دەگونجێت ڕێککەوتنێك هەبووبێت کە حکومەتی ئێسپارت لە گەڵ خەشایار هەم بجەنگێت و هەم نەجەنگێت؟ ئایا ئەوان ویستبوویان هەم ئەسینا و هەم هەخامەنشییەکان لە خۆیان ڕازی بکەن؟ لە لایەك بڵاویان کردەوە کە جەنگ ناکەن و لە لایەکیش بە پاشای ئێسپارتیان وت وەك کەسێکی سەرکێش برۆ بۆ جەنگ تا ئەسینا لێمان رازی بێ و پێمان نەڵێن لە کاتی مەترسیدا یارمەتیان نەداین و هاو ڕەگەز و هاو زمان بوونیان ڕەچاو نەکرد و ئێمەیان بەرانبەر بەربەرەکان بە تەنها جێهێشت.

لەوانەیە خوێنەر پرسیار بکات کە ئەگەر ڕێکەوتنی بەو شێوە هەبوو بێت، بۆچی ئەنجوومەنی پیرانی ئەو وڵاتە تاکە سەربازێکی لە گەڵ ئەو سێ سەد سەربازە و پاشا نەنارد؟

وەڵام ئەوەیە کە لە ئێسپارت هەموو پیاوان سەربازی یەدەگ بوون و ئەگەر ئەنجوومەنی پیران تەنها یەك کەسی تر لە گەڵ ئەو سێ سەد سەربازەی گاردی تایبەتی پاشا ناردبایە، مانای ئەوە بوو کە لەشکری ئێسپارت چۆتە ناو جەنگ لە دژی هەخامەنشییەکان و لە ئێسپارت هیچ پیاوێك نەبوو کە سەربازی یەدەگ نەبێت تا بتوانن ئەو لە گەڵ ئەو دەستە سێ سەد سەربازییەی لئۆنیداس بۆ جەنگ بنێرن.

پرۆفیسۆر بارن لەو بارەوە ڕای خۆی بە تەواوەتی ناخاتە ڕوو و تەنها دەڵێت: بە دووری دەزانم پاشای ئێسپارت پاڵپشت بە ڕای ئەنجوومەنی پیرانی وڵاتەکەی چووبێتە جەنگ و بۆیە لە مێژووەکاندا دەبینین ئەنجوومەنی پیران دوای چوونی لئۆنیداس بۆ جەنگ، ئەویان لە پاشایەتی لادا. بەڵام ئەو بەرز ڕاگرتنەی لە دوای مردنی بۆ لئۆنیداس کرا، نیشاندەری ئەوەیە کە ئەو پاشایەکی لادراو نییە و بە وتەی پرۆفیسۆر بارن: ئەو نهێنییە مێژووییە هیچ کات ئاشکرا نابێت کە پاشای ئێسپارت بە ڕەزامەندی نهێنی ئەنجومەنی پیرانی وڵاتەکەی بۆ جەنگ چووە یا سەربەخۆ بەوکارەی هەستاوە.

هەندێ مێژوونووس دەڵێن ئێسپارت جەنگی لە دژی خەشایار ڕاگەیاند و لئۆنیداس سەربەخۆ نەچووتە ناو جەنگەکەوە، ئەوان دەڵێن پەرلەمانی ئێسپارت لە لئۆنیداسی ویست تا بە سەربازە تایبەتییەکانییەوە بچێتە جەنگ و وتیان دواتر هێزت بۆ دەنێرین. بەلام بارن دەڵێت ئێسپارت جەنگی ڕانەگەیاند و لئۆنیداس بۆ خۆی و بێ ڕەزامەندی ئەوان چوو بۆ گۆڕەپانی جەنگ.

ئەو بابەتانەی دەگێردرێنەوە ناتواندرێت ڕایان لەسەر بدەین و دەبێت پسەندیان بکەین، بەلام بابەتی عقلانی ئاساییە کە بڕیاریان لەسەر بدرێت و هەڵسەنگاندن بۆ وتەی مێژوونووس بکرێت. ئایا ئەنجوومەنی پیرانی ئێسپارت نەیاندەزانی ناردنی تەنها سێ سەد سەرباز بەبێ ناردنی پاڵپشتی بۆیان وەك ناردنیانە بۆ کوشتارگا؟ ئەوان چوون چاوەڕوان بوون سێ سەد سەرباز پێش بە لەشکری خەشایارشای هەخامەنشی بگرن؟

ئەوان هەموویان پیاوی جەنگ بوون و لە جەنگ تێدەگەیشتن و دەیانزانی لەشکری خەشایار ئەوەندە بەهێزە کە بە سێ هەزار سەربازیش وەستاندنی ناکرێت، چ جای ئەوەی بیانەوێت بە سێ سەد سەرباز ڕایان بگرن. لەشکری ئەوان لەشکری ئالمان و ئەمریکای جەنگی دووەمی جیهانی نەبوو کە ئامادەکردنیان ماوەیەکی زۆری بوێت.

وولاتەکەیان ئەوەندە بچووك بوو کە تەواوی خاکی ئێسپارت بە ڕۆیشتنی ئاسایی ئەسپ لە یەك ڕۆژدا دەبڕدرا و ئەوان دەیانتوانی لە یەك ڕۆژدا هەموو سەربازەکان ئامادەبکەن، ئەوان بە لانی کەم سێ مانگ پێش هاتنی خەشایار و لەشکرەکەی بۆ تەرمۆپیل، دەیانزانی پاشای هەخامەنشی دەیەوێت هێرش بکاتە سەر ئەسینا و ئەگەر مەبەستیان بوایە بجەنگن، دەیانتوانی لەشکر ئامادەبکەن و بۆیە دەردەکەوێت ئەوان ویستی جەنگ لەگەڵ خەشایاریان نەبووە. تەنانەت ئەگەر ئەنجومەنی پیرانی ئێسپارت لە دوا ڕۆژیش ڕای خۆی بگۆڕیایە و بڕیاری جەنگ لە گەڵ لەشکری هەخامەنشیان دابایە، دەیانتوانی لەشکر ئامادەبکەن و پاشاکەیان بە لەشکرێکی بەهێز بۆ ئەو جەنگە ڕەوان بکەن و نەك تەنها بە گاردەکەی خۆیەوە بیخەنە ناو جەنگ و بۆ سەربرخانەی بنێرن تا دواتر لەشکر ئامادەبکەن و بۆ پاڵپشتی ئەو ڕەوانی بکەن.

لە لایەکی تر دوای جەنگەکانی خەشایار لە یۆنان و گەرانەوەی هەخامەنشییەکان لەو ولاتە، بەردەوام پەیوەندی ئێسپارت و هەخامەنشییەکان باش بووە و تەنانەت لە جەنگە

ناوخۆییەکان یۆنانیش کە بە (جەنگەکانی پلۆپۆنز) ناسراون، هەخامەنشییەکان بە پارە یارمەتی ئێسپارتیان دەدا لە جەنگ لە دژی ئەسینا و ئێسپارت بە پاڵپشتی ئێران ببوو بە بەندەری ئازادی یۆنان و ئەو بابەتانە نیشاندەری ئەوەن کە ئێسپارت لە جەنگەکانی هەخامەنشییەکان و یۆنان بێ لایەن بوون.

لە بەرەبەیانی رۆژی سێیەمی جەنگدا کاتێك لئۆنیداس و سەربازەکانی لە خەو هەستان و بەرەو ئەو کانییە چوون کە لە نزیکیانەوە هەڵدەقوڵا و دەرژایە ناو خەرەندەکە، دەست و چاویان شووشت تا تەنبەڵی خەو فرێدەن، دواتر پرچەکانیان شانە کرد و گەڕانەوە لای دیوارەکە. لئۆنیداس بە سەربازەکانی خۆی وت: لەوانەیە سەربازانی هەخامەنشی ئەمرۆ ئەو دیوارەی ئێمە دروستمان کردووە، وێران بکەن و ئێمە ناچار دەبین کە ڤالانژ دروست بکەین بۆ بەرگری.

لەگەڵ خۆرهەڵاتدا سەربازانی هەخامەنشی بە فەرماندەیی گۆبریاسی برای خەشایار، دەستیان کرد بە هێرش و بۆ وێرانکردنی ئەو دیوارەی بەربەست بوو بۆ گەیشتنیان بە ئێسپارتییەکان، ئامێری بۆرگۆیان بە جووڵە خست.

لئۆنیداس کە بیری تەنها بۆ ئەوە دەچوو هەخامەنشییەکان بە پاچ دیوارەکە برۆخێنن، بۆیە بڕیاریدا بوو کە بە تیر و بەرد سەربازەکان بکوژێت و نەهێڵێت توانای ئەو کارەیان هەبێت، بەڵام لەپڕ بۆرگۆ دەرکەوت کە بە هێواشی دەجولا و وەك دیوارێکی گەورەی گەرووك دەچوو و تیر و بەرد کاری تێ نەدەکرد و نەدەزاندرا کێ دەیجووڵێنێت. کاتێك بۆرگۆ نزیکتر بۆوە، خێراییەکەی زیاتر بوو و بە خێرایی دەنگی بەرکەوتنی بە دیوارەکە بەرز بۆوە و لە شاخەکاندا دەنگی دایەوە و بە یەکەم بەریەك کەوتن، بەشێك لە بەردەکانی دیوارەکە کەوتن و رووخان.

پرۆفیسۆر بارن دەڵێت: ئەو دیوارەی سەربازە ئێسپارتییەکان دروستیان کردبوو بە چەندین لێدانی تری بۆرگۆ وێرانبوو، بەڵام پێش ئەوەی دیوارەکە بە تەواوەتی وێران ببێت، لئۆنیداس بە سەربازەکانی وت لەوانەیە ئەوان دوای وێرانکردنی دیوارەکە هەر بەو ئامێرە هێرشمان بکەنەسەر، بۆیە ئامادەبن و لە گەڵ رووخاندنی دیوارەکە هێرش بکەنە سەر بۆرگۆ و بە تەورەکانتان پارچە پارچەی بکەن، بە پێچەوانەوە بۆمان دەبێتە مایەی کێشە.

پێش دارماندنی دیوارەکە بە تەواوەتی، ئێسپارتەکان هێرشیان کردەسەر بۆرگۆکە و بە خێراییەکی زۆر بە تەورەکانیان کەوتنە پارچە پارچە کردنی و لە ماوەیەکی کەمدا وردیان کرد، ئەو سەربازانەی لە پشت بۆرگۆ بوون و ئەویان هەڵگرتبوو، ناچاربوون پاشەکشە بکەن، چونکە ئەوان بۆ ئەوەی بتوانن بۆرگۆ بگوازنەوە، نەیانتوانی بوو چەك هەڵبگرن و بۆیە لە ترسی کوژرانیان بە پەلە هەڵاتن. دوای ئەوە ئێسپارتییەکان لەودیو دیوار و هەخامەنشییەکان لە دیوەکەی تری دیوار ریز بوون.

دوای ئەوە ئیتر سەربازە ئێسپارتییەکان لەو دیوی دیوارەکە وەستان و سەربازەکانی هەخامەنشیش لە لاکەی تری و گۆبریاسی فەرماندەی ئەو بەشەی لەشکری هەخامەنشی کە جەنگ لە گەڵ ئێسپارتەکانی لە ئەستۆ بوو، فەرمانی هێرشی دەرکرد و سەربازە هەخامەنشییەکان بە لباد و ریشی درێژ جوولەیان کرد، بەڵام هەر بە گەیشتنیان بۆ سەر بەردەکان لە لایەن سەربازانی ئێسپارت کەوتنەبەر هێرش و سەربازە ئێسپارتەکان لەسەر بەردەکان چوستتر بوون و خۆیان هەڵدەدا.

گۆبریاس بینی ئەو بەردانە رێگرن لەبەردەم سەربازەکانی و فەرمانی کرد تا سەربازەکانی بەردەکان لە سەر رێگەیان لابدەن و بیانخەنە ناو خەرەندەکە و لە چەند خولەکێکدا بەردەکانیان هەڵدایە ناو خەرەندەکە و رێگە بۆ هێرش کرایەوە، بەڵام هەخامەنشییەکان بەر دیوارێکی ڕەق و توند کەوتن کە گیان لە بەر بوو و زەربەی کوشەندەی شمشێری دەوەشاند.

سەربازە ئێسپارتییەکان بە یەك ریز هەموو پانی رێگاکەیان گرتبوو و دوایین کەسیان لە تەنیشت خەرەندەکە دەجەنگا و ئەگەر تۆزێك لاقی خزی بایە، دەکەوتە ناو خەرەندەکە و بەڵام شوێنی خۆی نەدەگۆڕی و لە پشت ئەوانیشەوە سەربازەکانی تر وەستابوون تا بچنە ناوجەنگ. لە ریزی یەکەم قەلغانی سەربازە ئێسپارتەکان تا ڕادەیەك بەیەکەوە نووسابوون و تەنها شمشێرەکان لە ناو کەلینەکانەوە دەجووڵان و ئەوەندە خێرا بوون کە سەربازەکانی گۆبریاس دەیانزانی ئەگەر نزیك ببنەوە، دەکوژرێن.

لە پڕ سەربازێکی باڵابەرزی هەخامەنشی خۆی هەڵدا و بە گورزەکەی زەربەیەکی لە قەلغانی سەربازێکی ئێسپارتیدا و شمشێری ئێسپارتییەکەش بەر ئەو کەوت، بەڵام چونکە زرێی لە بەر بوو بریندار نەبوو و زەربەی دووەمی لە قەلغانەکەدا و گورزەکەی بە

دەستی سەربازەکە کەوت و شمشێرەکەی کەوتە سەر زەوی. ئەو سەربازە باڵابەرزە کە یەکەم سەربازی ئێسپارتی خستەسەر زەوی هەمان ئاریابێژەنی شازادە و برای خەشایارشا بوو کە وەك سەربازێکی ئاسایی بەشداری لە جەنگدا کرد بوو. دوای کەوتنی یەکەم سەربازی ئێسپارتی بە دەست ئاریابێژەن، ماوەیەکی زۆری خایاند و نەتواندرا هیچ سەربازێکی تری ئێسپارتی بکەوێندرێت، سەربازەکانی ئێسپارت هەموو چەکێکیان هەبوو و شێوازی جەنگ کردنیشان زۆر باش بوو و بۆیە سەربازە هەخامەنشییەکان نەیاندەتوانی ئەوان بریندار بکەن. سەربازە بەرد هاوێژە ئێسپارتییەکانیش بێ کار نەوەستا بوون و بە هۆی کارامە بوونیان، دەیانتوانی بێ ئەوەی بەردەکان لە هاورێکانیان بدەن، بەردبارانی هەخامەنشییەکان بکەن و ئەوانیان دووچاری ئازار و ئەزیەت دەکرد.

شمشێری سەربازە ئێسپارتییەکان تەنانەت بۆ یەك چرکە نەدەوەستا و ئەو شێوە شمشێر وەشاندنە بە هۆی ئەو گوشارەی دەیخستە سەر مەچەك و باسك و قاچەکان، بە ئاسانی بەهێزترین سەربازەکانی ماندوو دەکرد، بەڵام ئەگەر سەربازێکی کارامە لە بەیانی تا ئێوارە بە هێواشی شمشێری وەشاند بایە ماندوو نەدەبوو. بە هۆی ئەوەی شمشێر وەشاندنی ئێسپارتەکان زۆر خێرا بوو، ناوە ناوە سەربازەێك لە پشتەوە دەهات و جێگەی ئەوانی تری دەگۆڕی و شمشێری دەوەشاند و سەربازەکەی ریزی پێشەوە دەچۆوە پشتەوە تا ماندوو بوونی دەستی دەربچێت.

هەموو گەلیەکە تا چاو دەیدیت بە سەربازی هەخامەنشی تەنرابوو، بەڵام دیتنی ئەو لەشکرە بەهێزە تۆزقالێك ترسی نەدەخستە دڵی سەربازە ئێسپارتەکان و هەرچەندە لە پشت ئێسپارتەکان کەس نەبوو و یا بە پێی هەندێ گێرانەوەکان حەوت سەد سەربازی یۆنانی و بە وتەی هەنیدێکی تر هەزار سەربازی یۆنانی هەبوو و ئەگەر هەشبوایە نەیاندەتوانی بە هۆی تەنگی گەلیەکەوە یارمەتی ئێسپارتەکان بدەن و تەنها ئەگەر ئێسپارتەکان کشابانەوە بۆ دواوە، یۆنانییەکان دەیانتوانی جێیان بگرنەوە و ئێسپارتەکان ئەوەندە ورەیان بەرز بوو کە کشانەوەیان بە نەنگ دەزانی و ئامادەیی ئەو کارەیان تێدا نەبوو.

ئەو سێ سەد کەسە کە یەکێشیان لێ بریندار ببوو، ئەوەندە متمانەیان بە خۆیان بوو کە وایان بیر دەکردەوە کە دەتوانن رێگە لە لەشکرە سەد هەزار کەسیەکەی خەشایار

بگرن و نەتەنها ئەو رۆژە، بەڵکو رۆژانی تریش ناهێڵن ئەوان بجووڵێن. بە وتەی توسیدید لەو رۆژەی مێژووی ئیسپارت ناسرا واتە لە کاتی ئۆلەمپیادەکان لەساڵی (٧٧٦پ. ز) تا ئەو رۆژە لە هیچ جەنگێکدا نەدیترا سەربازی ئیسپارتی بۆ دواوە بکشێتەوە، تەنها لە سەر فەرمانی فەرماندەکەی و بۆ بەرژەوەندییەکی باڵاتری جەنگی و سەربازی ئیسپارتی کاتێك بەشداری جەنگ دەبوو تا دەکوژرا لە شوێنی خۆی دەبوو.

نەتەوەی ئیسپارت کە خاوەنی ئەو ورە بەرزە و توانا جەنگییە باشە بوون، ئەگەر نەیانتوانی هەموو یۆنان بخەنە ژێر دەسەڵاتی خۆیان، بەو هۆیەوە بوو کە ژمارەی دانیشتوانیان زۆر کەم بوو و هەرگیز نەیانتوانی لەشکرێك ئامادەبکەن کە لە رووی ژمارەوە بەرچاو بێت.

بە پێی ئەو بنەمایە ئەو سێ سەد سەربازە لەو رۆژەدا ئەوان لە بەرانبەر لەشکری هەخامەنشی بە تەنها بوون و گریمان ئەگەر کەسیش ویستبای جێگەی ئەوان بگرێتەوە، ئەوان ڕازی نەدەبوون کە شوێنی خۆیان بە ئەوانی تر ببخشن.

ئاریابێژەن جارێکی تر بە گورزەکەی هێرشی کرد و بازێکی بەرزی هەڵدا و خۆی بە سەر سەربازێکی ئیسپارتی دادا و بە گورزەکەی لە کاسکێتی سەر سەری سەربازەکەیدا، زەربەکەی ئەوەندە بەهێز بوو کە کاسکێتە قەڵاییەکە بە سەریەوە نووسا و سەربازە ئیسپارتییەکە نەیتوانی بوەستێت و کەوت، بەڵام زەربەیەکی بەهێزی سەربازێکی تری ئیسپارتی کە لە تەنیشت سەربازە کەوتووەکە بوو بەر چووکی ئاریابێژەن کەوت و چووکی ئاریابێژەنی بڕی کە پارێزەری نەبوو و کەوتە سەر زەوی.

ئەگەر ئاریابێژەن بەرگی ئاسنینی لەبەردا نەبوایە، دوای ئەوەی چووکی بردرا بێ گومان دەمرد، چونکە دوای کەوتنی چەند زەربەیەکی تری شمشێری بەرکەوتو بەرگەکەی ئەوی لە مردن رزگارکرد و بە پەلە سەربازەکانی تر ئەویان لە ریزی پێشەوەی جەنگ دەرباز کرد.

ئەو زەربەیەی بەر چووکی ئاریابێژەن کەوت بوو زۆر توند بوو. زرێی ئەوکات بە شێوەیەك دروست دەکرا کە رێگە لە جووڵەی چووکی مرۆڤ نەگرێت و بەو شێوەیە چووکی سەرباز بێ پۆشش دەبوو و ئاریابێژەنیش چووکی داپۆشراو نەبوو و ئەگەر چووکی داپۆشراو بووایە، جەنگاوەر نەیدەتوانی بە ئاسانی بجولێت و هەر جارێك کە قاچی

جوولاندبووایە دەبوایە جومگەیەکی کانزایی هاتووچۆی کردبایە و ڕێڕۆیشتن بە ئەو جومگە ئاسنینە زۆر هێواش دەبوو و بۆیە سەر چووکیان دانەدەپۆشی.

چونکە چووکی ئاریابێژەن بێ پارێزەر بوو، زەربەی شمشێری ئێسپارتییەکە ئێسکی چووکی شازادەی بە تەواوەتی بڕی بوو و دوای ئەوەی پزیشك برینەکەی دەرمان کرد، فەرمانی کرد بۆ ئەوەی شازادە چاك ببێتەوە نابێت بە هیچ شێوەیەك بجوولێت و بە پێچەوانەوە ئەو ئێسکەی دەرزی داوە یەك ناگرێتەوە و بۆیە شازادە چیتر توانای بەشداری لە جەنگی تەرمۆپیلی نەما، بەڵام لە ناو سەرباز و ئەفسەرەکانی لەشکری هەخامەنشیدا ئەو شانازییەی بەرکەوت کە دوو سەربازی ئێسپارتی لەناو ببات.

پێویستە بیرتان بخەینەوە کە لەو جەنگەدا بیست و دوو لە شازادە ئێرانییەکان بەشدار بوون کە بە خەشایارەوە یازدەیان کوری داریوشی یەکەم بوون و یازدەکەی تریش برازاکانی داریوش واتە کورە مامەکانی خەشایار و نزیکەکانی بوون، ئەو دیمەنەی باسمان کرد لە لێکۆڵینەوە بە پێزە دوو هەزار پەریەکەی پرۆفیسۆر بارن وەرگیراوە کە مامۆستای زانکۆی گلاسکۆی بەریتانیایە لە سەدەی هاوچەرخ واتە سەدەی بیستەم و ئێمە تا ئێستا نەمانبینیوە کەس سەبارەت بە جەنگەکانی ئێرانی و یۆنانییەکان لە ساڵی ٤٨٠ پێش زایێن کە جەنگی تەرمۆبیل یەك لە دیمەنە دیارەکانییەتی، لێکۆڵینەوەیەکی بەپێزتر و باشتر لەو لێکۆڵینەوەیەی پرۆفیسۆر بارن بڵاوکرابێتەوە.

دەبێت بڵێین کە پرۆفیسۆر بارن لە لێکۆڵینەوە زۆر بە سوودەکەی خۆیدا باسی لە بەشداری شەست و پێنج کەس لە شازادە و ئەندامانی بنەماڵەی پاشای هەخامەنشی کردووە لە جەنگی تەرمۆبیل و ئێمە خۆمان لە ناو هێنانیان دەپارێزین، تەنها ناوی برازاکانی داریوشی یەکەم دێنین:

١) تری تان تای خەمس کوری ئارتابانۆسی برای داریوشی یەکەم.

٢) ئارتی فیۆس کوری ئارتابانۆسی برای داریوشی یەکەم.

٣) ئاریامرووس کوری ئارتابانۆسی برای داریوشی یەکەم.

٤) باساکس کوری ئارتابانۆسی برای داریوشی یەکەم.

٥) ئارتا فرەنسی دووەم کوری ئارتافرەنسی یەکەمی برای داریوشی یەکەم.

٦) فراتاگۆن کوری ئارتانسی برای داریوشی یەکەم، ئارتانسی باوکی جوانە مەرگ بوو و پێش مردنی هەرچی هەیبوو بە داریوشی برای بەخشی و داوای لێکرد تا کورە هەتیوەکەی بەخێو بکات و داریوش سەرپەرەشتی ئەوی پەسەندکرد و فراتاگۆن لە لایەن داریوش بەخێو کرا.

شازادەکانی تری دیاری هەخامەنشیش کە لە جەنگی تەرمۆبیل بەشداریان کرد بریتی بوون لە ئەم ناوانەی خوارەوە:

٧) مەردوونیۆس کوری خوشکی داریوشی یەکەم (کورە پوری خەشایارشا).

٨) ئەسمەروونس کۆرە خوشکی داریوشی یەکەم (کورە پوری خەشایارشا).

٩) ئەرتۆخەمس زاوای داریوشی یەکەم (هاوسەری خوشکی خەشایارشا).

١٠) ئۆتانس باوکی ئامیس تریسی خێزانی خەشایار واتە باوکی شاژنی هەخامەنشی.

١١) ئاناڤس کوری ئۆتانس و ژن برای خەشایارشا و برای شاژنی هەخامەنشی.

نزیکەی چوار یەکێکی رۆژەکە رۆیشت بە بێ ئەوەی بچوکترین دەرز لەناو ئێسپارتەکاندا رۆبدات و ئەوان بەردەوامبوون لە شمشێر وەشاندن و ناوە ناوە سەربازە تازە نەفەسەکان جێگەی ئەوانەی پێشەوەیان دەگرتەوە.

گۆبریاس بینی دوور نییە تا ئێوارە جەنگ بەو شێوەیە بەردەوامبێت و بۆیە ویستی خۆڕاگری ئێسپارتەکان تێك بشکێنێت فەرمانی کرد تا مەنجەنیقەکان بێنن و بەردی گەورە بە سەر ریزی لە شکان نەهاتووی ئێسپارتەکاندا ببارێنن تا بەرگری ئەوان تێك بشکێنن. فەرمانەکەی جێبەجێ کرا و مەنجەنیقەکانیان لە پشتەوە هێنا و بۆ ئەوەی هەڵدانی بەردەکان سەرکەوتوو بێت ناچاربوون ئەوان لە لە پێش سەربازەکانی خۆیان ڕاگرن.

لئۆنیداس بە دیتنی مەنجەنیقەکان تێگەیشت کە ئەوان دەیانەوێت بە هەڵدانی بەردی گەورە لە ناویان ببن و دەیزانی کە قەلغانەکانیان بەرگەی بەردە گەورەکانی مەنجەنیقەکان ناگرێت، بۆیە فەرمانی بە سەربازەکانی کرد کە وەك چوون بۆرگۆیان لەناو برد بە هەمان شێوە بە تەورەکانیان مەنجەنیقەکانیش بشکێنن، بە پێچەوانەوە دووچاری ئازار و

ناخۆشی دەبنەوە و سەربازە ئێسپارتییەکانیش بە تەورەکانیانەوە هێرشیان بۆ مەنجەنیقەکان کرد.

فەرماندەی مەنجەنیقەکان برازای داریوش بوو و ناوی (فراتاگۆن) بوو و دوای ئەوەی باوکی مرد لە لایەن داریوش سەرپەرەشتی کرا، ئەویش وەك هەموو شازادە هەخامەنشییەکان بالآبەرز بوو و لە منداڵی وەك ئەوان پەروەردەکرابوو و مێژوونووس تۆسیدید دەڵێت: ئەو لە هاویشتنی قورسایی لە تەواوی ئێران هاوتای نەبوو.

تۆسیدید دەڵێت: بیستوومە فراتاگۆن ئەوەندە بەهێز بوو دەیتوانی عارەبانەیەك کە بە دوو ئەسپ ڕادەکێشرێت، ڕابگرێت و هەرچەندە ئەسپەکان توانای خۆیان بەکارهێنابایە نەیاندەتوانی عارەبانەکە بجووڵێنن. بەڵام من باوەڕ بەو پرۆپاگەندەیە ناکەم.

پرۆفیسۆر بارن دەڵێت: ئەگەر تۆسیدید لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەم ژیا بوایە، باوەڕی بەو پرۆپاگەندەیە دەکرد، چونکە ئەلێکساندەری سێ هەم ئیمپراتۆری ڕۆسیا کە لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەم کۆچی دوایی کرد، لە کاتی گەنجیدا نەتەنها دوو ئەسپ بەلکو عارەبانەی (ترۆپیکا) ڕادەگرت کە سێ ئەسپی پێوە بوو.

فراتاگۆن ئەو ڕۆژە وەك هەموو شازادەکانی تر بەرگی سەربازی کانزایی (زرێی) لە بەر بوو و کاتێك فەرمانی گۆبریاسی پێگەیشت، بە پەلە مەنجەنیقەکانی بە جووڵە خست و بە ناو سەربازەکانیدا تێپەڕاند و گەیاندنییە پێشەوەی سەربازەکانی خۆیان تا بەردبارانی ئێسپارتەکان دەست پێ بکات. مەنجەنیقەکان بچووك بوون، بەڵام ئەگەر بەکار کەوتبان ئێسپارتەکانیان بێ دەرەتان دەکرد، چونکە مرۆڤ هەرچەندە بەهێز بێت ناتوانێت بەرگەی زەربەکانی بەردە گەورەکان بگرێت و لەناو دەچێت. بەڵام لە گەڵ دەرکەوتنی مەنجەنیقەکان، ئێسپارتەکان بە تەورەکانی دەستیان هێرشێکی ئەوەندە بە هێزیان کرد کە لە کاتەکانی سەرەتادا سەربازەکانی خەشایار بە تەواوەتی پەشووکان.

سەربازەکانی ئێسپارت بۆ شکاندنی مەنجەنیقەکان پێویست نەبوو بە تەور هەموو بەشەکانی پارچە پارچە بکەن، تەنها دەبوایە ئەو بەشە بشکێنن کە بەردەکەی هەڵدەدا و لە فارسی بە (شاهین) ناو دەبرێت. شاهین دوو دەسکی درێژی هەبوو کە دەبوایە

ڕابکێشرێت تا دەگاتە زەوی، دواتر بەریان دەدا و دوای بەردانی بەردەکەی بە خێرایی دەرۆیشت.

پێویستە ئەوەش بگوترێت کە ئەگەر تەنها بە شکاندنی شاهینەکان کۆتایی هاتبایە، دارتاشەکانی لەشکر دەیانتوانی شاهینی تر دروست بکەن و لە مەنجەنیقەکەی ببەستن و ئەگەر هەموو مەنجەنیقەکە شکابایە، کاری دروستکردنی سەرلە نوێی مەنجەنیق ماوەی زۆرتری پێویست بوو. وێرای ئەوەش بە شکاندنی شاهین، مەنجەنیق لەکار دەکەوت و کشاندنەوەی مەنجەنیقەکان و چاك کردنەوەیان و گەڕاندنەوەیان بۆ پێشەوەی مەیدانی جەنگ یەك ڕۆژی دەویست.

کاتێك فراتاگۆن بینی ئێسپارتەکان مەنجەنیقەکان دەشکێنن، ڕوو لە سەربازەکانی هاواری کرد ئایا ڕووح لە جەستەتاندا نییە کە هێرش ناکەن و نایان کوژن، مەگەر نابینن کە مەنجەنیقەکان دەشکێنن؟ سەربازە هەخامەنشییەکان کە سەرەتا پەشووکا بوون، هاتنەوە سەرخۆ و کەوتنە بەرگری کردن و فراتاگۆنیش شمشێرە درێژە دوو لێوەکەی دەرهێنا و خۆی هەڵدا بۆ جەنگ کردن.

فراتاگۆن بۆ خۆشی باڵای بەرز بوو و شمشێرەکەشی درێژ بوو و لەگەڵ یەکەم خۆهەڵدانیدا، شمشێرەکەی لە ناو ڕوخساری یەك لە سەربازە ئێسپارتەکان ڕۆ کرد و شمشێر گەیشتە ناو مێشکی و کوشتی و هێرشی کردە سەر سەربازی دووەم و دوو زەربەی لێدا، بەڵام هەردوو زەربەکە بەر قەلغانەکەی کەوت و هیچی لێ نەهات. دووبارە فراتاگۆن خۆی هەڵدا و شمشێرە قورس و درێژەکەی لە قاچی سەربازێکی تری ئێسپارتی وەشاند و ئێسکی ژێر چووکی ئەوی بڕی و خستییە سەر زەوی و هێرشی بۆ سەربازی چوارەم کرد. شازادەی ئێرانی زۆر ئازا و دلێر بوو، بەڵام لەگەڵ پیاوانێك دەجەنگا کە لە دیار و ئازاترین سەربازەکانی دنیای کۆن بوون و کەس نەبوو لە ڕووی پەروەردەکردنی جەستەیی هاوتایان بێت.

یەك لە خەسڵەتەکانی سەربازی ئازا و کارامە ئەوەیە کە ئاگاداری باروودۆخی جەنگ دەبوو و دەیزانی چ ڕوودەدات و بەوپێیە دەجووڵایەوە، بەڵام ئەو سەربازەی ورەی جەنگی نییە و لە ڕووی جەستەیی و ڕووحیەوە پەروەردە نەکراوە، وێرای ئەوەی لە مەیدانی

جەنگدا دەجەنگێت، بەڵام دۆخی جەنگ نابینێت و تەنها ئەوەی لە بەرانبەریەتی دەبینێت.

بەڵام سەربازە ئێسپارتییەکان ئاگاداری مەیدانی جەنگ بوون و گوێیان لە دەنگەکان دەبوو. ئەوان پێش ئەوەی فراتاگۆن بکەوێتە جەنگ، کۆمەڵێك مەنجەنیقیان شکاندبوو و دیتیان کە مەنجەنیقەکان کەوتوونەتە ناو سەربازەکانی هەخامەنشی و فەرمانی فراتاگۆن بۆوە هۆی هاتنە پێشی سەربازەکانی و مەنجەنیقەکان کەوتنە پشتیانەوە و چیتر هەخامەنشییەکان نەیاندەتوانی سوود لەو مەنجەنیقانەش وەربگرن کە نەشکابوون، چونکە مەودایەکی ئازاد بۆ هەڵدانی بەرد نەبوو تا بەردی لێ هەڵبدرێت و سەربازە هەخامەنشییەکان ببوونە بەربەست لە نێوان ئێسپارتی و مەنجەنیقەکان.

مەترسی مەنجەنیقەکان بە شێوەی کاتی نەمابوو و فراتاگۆن ببوو بە مەترسی بۆ ئێسپارتەکان، ئەوان کە پیاوی جەنگ بوون و تێگەیشتن کە فراتاگۆن جیاوازە لە سەربازەکانی تری هەخامەنشی و دەبوایە زوو لە ناوی ببەن تا سەربازی تر نەکوژێت.

فراتاگۆن بێ ئەوەی لە دەورووبەری خۆی بڕوانێت بۆ جارێکی تر خۆی هەڵدا و شمشێرەکەی ئاراستەی روخساری سەربازێکی ئێسپارتی کرد، چونکە روخساری ئێسپارتەکان هیچ ئامێری پارێزگاری لەسەر نەبوو، بەڵام لە پڕ ئازارێکی زۆری لە سەر ئانیشکی هەست پێکرد و شمشێرەکەی لە دەست بەربۆوە، دیار بوو کە سەربازێکی ئێسپارتی بە تەور لە دەستی دابوو و پەڕاند بووی.

باسمانکرد بۆ ئەوەی جووڵەی سەرباز لە ناو بەرگی ئاسنین زیاتر بێت، تەواوی جومگەکان بە دانەپۆشراوی دەمانەوە و ئەمە لە لایەن هەموو سەربازانەوە دەزاندرا کە ئەو جومگانە خاڵی لاوازی هەر سەربازێکی زرێپۆشە، بۆیە سەربازە ئێسپارتییەکەش بە تەورەکەی لە ئانیشکی فراتاگۆنی دابوو کە یەك بوو لەو جومگانەی بە دانەپۆشراوی مابۆوە. شازادە فراتاگۆن دوای کەوتنی شمشێرەکەی لە دەستی بە گورجی داهاتەوە و دەستە براوەکەی خستە ژێر قاچی و بە یەك تەکان ئەو پێستەی پچراند کە دەستی پێوە ڕاگیر کرابوو و لە باسکی دابری و بە دەستی چەپ ئامادەی جەنگ بۆوە، لە کاتێکدا کە خوێن لە دەستە پەڕاوەکەی بە لێشاو دەهاتەدەر.

فراتاگۆن نەیدەتوانی بە دەستی چەپ وەك دەستی ڕاست بجەنگێت، بەڵام دەیتوانی بەرگری بکات و ڕێگە لە زەربەکانی ئێسپارتەکان بگرێت. گۆبریاس بە ڕێگەی یەك لە سەربازەکانی وەڵامی بۆ نارد کە بگەڕێتەوە و بە ئەوی وت کە تۆ دەستت نییە و دەکوژرێت. بەڵام ئەو وتی دوو سەربازی دوژمنم کوشتووە و تا سەربازێکی تریش نەکوژم و نەیکەم بە سێ سەرباز ناگەڕێمەوە.

شازادەی ئێرانی بۆ ئەوەی سەربازی سێ هەم بکوژێت، ویستی وەك جارانی پێشوو خۆی هەڵدات و شمشێرەکەی لە روخسار یا قاچی سەربازێکی ئێسپارتی بدات و بیخات، چونکە شوێنەکانی تری جەستەی سەربازەکان داپۆشرابوو. بۆیە وێڕای ئەوەی شازادەی ئێرانی خوێنی لە دەستی دەچۆڕایەوە، بازی هەڵدا و شمشێرە درێژ و راستەکەی کە لە پێشی بوو لە روخساری سەربازێکی ئێسپارتی چەقاند و خستییە سەر زەوی، بەڵام پێش ئەوەی شمشێرەکەی ڕابکێشێتەوە زەربەیەکی بەهێزی بەرکەوت و ئەو زەربەیە ئەوەندە بەهێز بوو کە بڕبڕەکانی ملی بڕی و فراتاگۆن تەنانەت بێ ئەوەی توانای هاوار کردنیشی هەبێت، کەوت و مرد. ئێمە ئەمڕۆ دەزانیین کە بۆ ئەو نەیتوانی هاوار بکات و هۆیەکەی ئەوە بوو کە مۆخی ناو ئێسکی ملی بە هۆی پچرانی بربرەی ملی پچرا، ئەو کەسەی بەو شێوەیە بەردەکەوێت ناتوانێت هیچکارێك و تەنانەت هاواریش بکات.

سەربازە هەخامەنشییەکان کۆششیان کرد و توانیان لاشەی فراتاگۆن لە ناو ئێسپارتەکان ڕزگار بکەن و بیکێشێننەوە بۆ پشتەوە. بەڵام فراتاگۆن کاتێك لە مەیدانی جەنگ کشێندرایەوە مرد بوو و وێڕای ئەوەش پێش مردنی خۆی توانی بگاتە مەبەستی خۆی و سێیەمی سەربازی ئێسپارتی کوشت.

گۆبریاس فەرمانی کرد تا سەربازەکانی بچن و دەستە بڕاوەکەی فراتاگۆن بێننەوە تا لاشەکەی ناتەواو نەبێت، بەڵام سەربازە هەخامەنشییەکان نەیانتوانی دەستە براوەکەی ئەو ببیننەوە و چونکە فراتاگۆن شازادەیەکی گەورە بوو، لاشەکەیان مۆمیا کرد و ناریانەوە بۆ ئێران. پێش چوونی ئێرانییەکان بۆ میسر، مۆمیا کردنی مردوو لە ئێران نەبوو و ئەوان لە میسرییەکان ئەوکار فێر بوون، بەڵام هیچ کات لە کاتە ئاساییەکاندا لاشەی مردوویان مۆمیایی نەدەکرد و تەنها ئەگەر ویستبایان لاشەیەك لە ڕێگەی دوورەوە بێننەوە، بۆ ڕێگرتن لە بۆگەن بوونی لاشەکە، مۆمیایان دەکرد.

خەشایار هەرکە زانی بەرگری ئێسپارتەکان زۆر توندە و بۆ تێك شکاندنی ئەوان پێویستە بە بەکوشتدانی ژمارەیەکی زۆر لە سەربازەکانییەتی، بیری لە ناردنی هێز بۆ پشت ئەوان کردەوە و ئەو بڕیارە پێش ئەوە بوو کە مەنجەنیقەکان بنێرن بۆ جەنگ و فراتاگۆن هێشتا زیندوو بوو.

خەشایارشا یەك لە سەردارەکانی لەشکرەکەی کە ناوی (فرەن داتس) بوو، داوا کرد و پێی وت: دەمەوێت لە رێگەی شاخەکەوە برۆی و بچیە پشت دوژمن کە رێی لێ گرتووین، سەربازەکانت دەبێت بتوانن لە شاخ بێنە خوارەوە و لە پشت ئێسپارتەکان کۆببنەوە، ئەوکات هێرشیان بکەنەسەر و بەو شێوە دوژمنەکان دەکەونە نێوان دوو بەرەی جەنگ و لەناو دەچن.

پاشای هەخامەنشی بە فرەن داتسی وت: سەربازەکانی تۆ دەبێت لە شوێنێکی شاخەکەوە بێنە خوارەوە کە نەدیترێن، چونکە ئەگەر ئێسپارتەکان ئەوان ببینن، پێش ئەوەی بگەنە خوارەوە بە تیری کەمان و بەردی بەردەقانی لەناویان دەبەن یا لە دوایین کاتەکاندا کە دەیانەوێت بگەنەوە خوارەوە بە نێزە و تیر و شمشیر دەیانکوژن. تۆ هەموو ئەو کەرەستانەی بۆ سەرکەوتن لە شاخ و رێ برین لەناو شاخ و دابەزین لە شاخ پێویستت دەبێت لە گەڵ خۆتدا ببە و سەربازەکانیشت پێویستە چەکی تەواویان لابێت تا ئەو کاتەی لە شاخ دێنە خوارەوە بتوانن لە پشتەوە هێرش بکەنەسەر ئێسپارتەکان.

ئەرکی دووەمی فرەن داتس بریتی بوو لە دۆزینەوەی ئەو رێگا نهێنییەی کە لەو گەلیە هەبوو تا لەو رێگەوە بتوانن لە تەرمۆپیل دەبچن و ناچار نەبن بە تەواوی گەلیەکەدا تێپەر ببن.

پێش سێ هەم رۆژی جەنگی تەرمۆپیل خەشایارشا بڕیاریدا بوو لەشکرەکەی بەو رێگەیەدا ببات و ناچار نەبێت تەواوی گەلیەکە ببرێت و بەرگری ئازایانەی ئێسپارتەکان لە رۆژی سێیەم سوورتری کرد لە سەر ئەو بڕیارەی. بەڵام دەیزانی کە ئەسپەکان و عارەبانەکان و بەشی زۆری پێداویستییەکان دەبێت لە پشتەوە بهێڵێتەوە، چونکە رێگە نهێنییەکە بریتی بوو لە (بزنە رێ) و مرۆڤ نەیدەتوانی بە ئاسانی پیایدا بڕوات و ناتواندرێت ئەسپ و عارەبانە و بارە قورسەکانی پیادا تێپەربکرێت، لە لایەکی تر بە

گریمانی زۆر یۆنانییەکان هەوڵی دەست بەسەرداگرتنی ئەسپ و عارەبانەکان و پێداویستییەکانیان دەدا و دەبوایە هێزێکی باش لە پشتەوە بمێنێتەوە.

هیرۆدۆت دەڵێت فرەن داتس لە گەڵ سەد هەزار سەرباز کەوتەرێ تا بە شاخەکەدا بڕوات.

سەلماندنی ئەوەی ئەو وتەیەی هیرۆدۆت زێدەڕۆیی تێدایە و دوورە لە ڕاستی، هیچ گرفتی نەبوو و چونکە ئەگەر وادابنێین کە ئەو سەربازانە لە ریزی پێنج کەسیدا بەرێکەوتن، کۆی ریزەکان دەکاتە بیست هەزار کە ئەگەر تەنها یەك چرکە بۆ پەرینەوەی هەر ریزێك پێویست بێت، ئەوا پێویست بە زیاتر لە نیو کاتژمێر هەیە تا سەد هەزار سەرباز لە بەرانبەر کەسێکدا تێپەربن کە لە لایەکەوە وەستاوە، بەڵام تاقی کردنەوە سەربازییەکان نیشانیان داوە کە تێپەڕبوونی سەد هەزار سەرباز زۆر زیاتر لە نیو کاتژمێری دەوێت و لە کاتژمێرێکیش زیاتر دەبێت و ئەمەش بەو مەرجەی بچوکترین وەستان لە رۆیشتنیان روونەدات. کەواتە ئایا لەو کاتە زۆرەدا چوون فرەن داتس سەرداری هەخامەنشی دەیتوانی سەد هەزار سەرباز لە شاخ بسورێنێتەوە لە پشت ئێسپارتەکان دایان بەزێنێت؟

لەوانەیە ئەگەر ئەو سەد هەزار سەربازە هەموویان لەو کەسانە بن کە لە سەرکەوتنی شاخ شارەزان، دیسان رۆیشتن و تێپەڕبوونی ژمارەیەکی ئاوا نزیکەی دە تا پازدە رۆژی پێویست دەبێت و کارێك نییە کە نە ئەوسا لە (٤٨٠ پ. ز) و نە ئێستا بەیەك رۆژ ئەنجام بدرێت، جگە لەوەش لە لەشکری خەشایاردا سەد هەزار سەربازی شاخ گەرد نەبوو تا فرەن داتس بتوانێت لەگەڵ خۆیاندا بیان بات.

ئەو سەربازانەی فرەن داتس لە گەڵ خۆی بردنی و شارەزای سەرکەوتنی شاخ بوون، خەڵکی ناوچە شاخاویەکانی زاگرۆس و تۆرۆس بوون کە وەك هەموو ئەوانەی لە شاخ لە دایك دەبن و گەورە دەبن، لە رێ رۆیشتن لە شاخ کارامە بوون و رۆیشتن لە شاخ ببوو بە بەشێك لە سروشتی ئەوان.

پرۆفیسۆر بارن دەڵێت: ئەو سەربازانەی فرەن داتس لە گەڵ خۆیدا بردنی بۆ شاخ تا لە پشت سەربازە ئێسپارتییەکان بێنە خوارەوە، بە دڵنیاییەوە لە پێنج سەد کەس زیاتر

نەبوون و لەو کەسانە بوون کە لە شاخەکان گەورە ببوون و لە ڕۆیشتن بە ناو شاخدا نەدەترسان.

هەروەها ئەو دەڵێت: ئەگەر ئێمە توانیبامان لە دوورەوە سەرکەوتنی ئەوان بە ناو شاخەکاندا چاو لێ بکەین، دەماندیت جیاوازی ئەوتۆی نییە لە گەڵ سەرکەوتنی شاخ گەردەکانی سەردەمی ئێستا کە لە زمانی ئینگلیزی بە (تۆ کۆرد) ناو دەبرێن. واتە سەربازەکان بە پەت خۆیان لە یەکتر بەست بۆوە و هەنگاوەکانیان بە پتەوی هەڵ دەهێنا، چونکە لە یەك (تۆ کۆرد- واتە تاقمێك کە بە پەت لە یەکتر بەسترابن) ئەگەر یەکیان بکەوتایە ئەوانی تر خۆیان دەبوایە بخەنە سەر زەوی و توند زەوییەکە بگرن تا بە هۆی قورسی جەستەی کەسی کەوتوو، ئەوانیش هەڵنەدێرێن.

ئەو سەربازانەی بە پەت لەیەك بەسترابوون و بە ناو شاخدا رێیان دەکرد، هەموو پێداویستی جەنگی و خۆراك و باڵاپۆشی سەربازی و تەنانەت تاوەشیان پێ بوو و چونکە دەیانزانی لەوانەیە ئەو رۆژە و شەو و رۆژی دواتریشی لەو شوێنە بمێننەوە. جووڵەی ئەوان زۆر هێواش بوو، چونکە دەیانزانی لە پێدەشتدا ئەو کەسە سەرکەوتوو دەبێت کە خێراتر دەروات و لە شاخیش بە پێچەوانەوەیە، ئەو کەسەی هێواش دەڕوات و بەردەکانی بەر پێی چاو لێدەکات تا بزانێت قاچی دەخاتە کوێ، خۆی دەپارێزێت تا رێگەکە دەبڕێت. ئەگەر خێرا بڕوات یا بێ پشکنین هەنگاو بنێت، ئەوا دەکەوێتە خوارەوە.

فرەن داتس دەیزانی ئەرکێکی قورسی خراوەتە سەر شان و دەبوایە زۆر بە ئارامی و لێهاتوانە سەربازەکان بە شێوەیەك بە شاخدا بباتە خوارەوە کە نە سەربازە یۆنانییەکان کە گریمانی بوونیان لە گەلیەکە دەکرا و نە ئێسپارتەکان لە کاتی دابەزیندا نەیانبینن. ئەو دەیزانی لە شاخەکاندا هەندێ لاپاڵ هەن کە لە کاتی هاتنە خوارەوە لەو لاپاڵانە، هیچ کەس نە لە پێشەوە و نە لە دواوە ناتوانێت بیانبینێت و بۆیە کاتێك گەیشتە ڕاست شوێنێك کە بە سەر ئەو شوێنەیدا دەروانی کە سەربازە ئێسپارتەکانی لێ بوون، بڕیاریدا یەك لەو لاپاڵانە تاقی بکاتەوە.

ئەوکاتەی فرەن داتس گەیشتە ئەو شوینەی کە لە ژێر پێی جەنگ بەردەوامبوو، ئارەزووی دەکرد بەرد بە سەر ئەو ئێسپارتانەدا ببارێنێت کە لە پشت هاورێکانیان

سەرگەرمی پشوو بوون و ماندوویەتیان لە جەستەیان دەردەکرد، بەڵام بە دوو هۆ ئەو کارەی نەکرد:

هۆکاری یەکەم ئەوە بوو کە لەو شوێنە بەرد نەبوو، چونکە لە لوتکەی شاخەکاندا بەردی لەیەك دابراو نییە و بەرد بە شێوەی گابەردی گەورە کە بەیەکەوە نووساون هەیە و ناتواندرێت بەرد دەست بخرێت مەگەر گابەردەکان بشکێندرێن و هۆکاری دووم ئەوە بوو کە دەیزانی بە هۆی بەرد باران کردنیان، خۆی ئاشکرا دەکات و نەتەنها ئێسپارتەکان دەیانزانی کە تاقمێك لە سەرەوەی شاخەوە دادەبەزن ولەوانەیە لە پشتیان بێنە خوارەوە، بەڵکو سەربازەکانی تری یۆنانیش کە لە دەربەندەکە بوون لە بوونی هەخامەنشییەکان لە سەر شاخەکە ئاگادار دەبنەوە و هەوڵ دەدەن رێگر بن لە هاتنە خوارەوەیان.

بۆیە فرەن داتس بە ناچاری لەو شوێنە تێپەڕبوو و ماوەیەك دواتر ئەو شوێنەی دۆزییەوە کە بەدوایدا دەگەڕا و ئەویش لاپاڵێکی بچووك بوو کە نە لە باکووری دەربەندەکە و نە لە باشووریەوە نەدەدیترا. فرەن داتس بریاریدا سەربازەکانی لەو شوێنە بباتە خوارەوە.

هەرچەندە ئەوان لە سەرکەوتنندا زۆر هێواش دەرۆیشتن، بەڵام لە هاتنە خوارەوە لە شاخ بە فەرمانی فرەن داتس ناچاربوون پەلە بکەن. چونکە بەشی خوارەوەی دەربەندی تەرمۆبیل لە دەست یۆنانییەکان بوو و ئەوان دەیانتوانی لە ناوچەی بەر دەستی خۆیان بە ئازادی هاتووچۆ بکەن و ئەگەر یەك لە سەربازە یۆنانییەکان بدیتایە کە سەربازی هەخامەنشی لە شاخ دێنە خوارەوە، پیلانی فرەن داتس بۆ هێرشی لەپڕ بۆ سەر ئێسپارتەکان لە پشتەوە مایە پووچ دەبوو و سەربازەکانی هەخامەنەشیش کە سەرگەرمی دابەزین بوون لە شاخ، دەکوژران. بۆیە بەردەوام بە سەربازەکانی دەووت پەلە بکەن و خێرا برۆن و کاتێك گەیشتنە خوارەوە بەپەلە ریزەکانی خۆتان بۆ جەنگ رێك بخەن، چونکە لە هەر کاتێکدا لەوانەیە دوژمن هێرشمان بۆ بکات.

لەو شوێنەی سەربازە ئێرانییەکان دەهاتنە خوارەوە، لێژی شاخەکە زۆر بوو و ئەوان نەیان دەتوانی بە شێوەی ئاسایی بێنە خوارەوە و بە یارمەتی ئەو پەتانەی پێیان بەسترا بۆوە، دەهاتنەخوار. ئەوان قاچیان دەخستە دامێنی شاخەکە، بەڵام ئەگەر بە هۆی پەتەوە پەیوەندیان بە سەرەوە نەبووایە، هەڵدەدیران بۆ خوارەوە و لە راستیدا

هاورێکانیان کە لە سەرەوە بوون، ئەوانیان شۆڕ دەکردەوە بۆ خوارەوە و بۆ خۆیان نەدەچوونە خوارەوە.

وێڕای ئەوەی فرەن داتس بەردەوام پەلەی دەکرد و دەیگووت پەلە بکەن تا دوژمن ئێوە نەبینێت، بەڵام دۆخی هاتنەخوارەوە لە شاخەکە زۆر قورس بوو و سەربازەکان هەرچەندە خێراییان دەنواند، توانایان نەبوو بەو شێوەی فەرماندەکەیان دەیەوێت لە شاخ بێنە خوارەوە.

دوای ئەوەی فرەن داتس توانی دوو سەد کەس لە سەربازەکانی خۆی بنێرێتە خوارەوە و ئارامی گرت تا ئەوانی تریش بگەنە خوارەوە. کاتێك نۆرەی دوایین سەرباز هات تا بێتە خوارەوە، کەس لە سەرەوە نەبوو تا سەری پەتەکە بگرێت تا ئەویش بە هێواشی بێتە خوارەوە، ئەو ناچاربوو سەری پەتەکە لە بەردێك ببەستێت و ئەوکات پەتە هەڵواسراوەکەی بە دەستەوە گرت و بە هێواشی دوو قاچەکانی خۆی شۆڕ کردەوە بۆ دامێنی شاخەکە، بەڵام دەرکەوت کە یا پەتەکە لە سەر بەردەکە جووڵاوە و یا سەربازەکە کەمتەرخەمی کردووە و پەتەکەی بە باشی نەبەستوتەوە، بۆیە بە هۆی بوونەوەی پەتەکەوە دوایین سەرباز لە کاتی هاتنەخوارەوەی لە شاخ، کەوتە خوارەوە و دەنگی کەوتنی ئەو وەك دەنگی هەورە بروسکە لەو ناوچە شاخاویەدا دەنگی دایەوە. فرەن داتس نەوەستا تا بزانێت ئەو سەربازە زیندووە یا مردووە و فەرمانی کرد تا سەربازەکانی بە پەلە بەرەو باکوور واتە پشت سەربازە ئێسپارتییەکان برۆن.

چونکە دەیزانی دەنگی کەوتنی سەربازەکە لە تەواوی گەلیەکە دەنگی داوەتەوە و بێ گومان دەبێتە هۆی بەدواداچوونی یۆنانییەکان کە لەناو دەربەندەکەن و بۆیە هەوڵ دەدەن بزانن ئەو دەنگە چ بووە، بۆیە پێویستە پێش ئەوەی یۆنانییەکان بزانن سەربازەکانی هەخامەنشی لە شاخ هاتوونەتە خوارەوە، هێرش بکاتە سەر ئێسپارتەکان و لە ناویان ببات و لە گەڵ لەشکری خۆیان لە ئەودیو ئێسپارتەکان تێکەڵ ببێتەوە و ئەوکات ئەگەر یۆنانییەکان زانیبایان کە سەربازانی هەخامەنشی لە شاخ هاتوونەتە خوارەوە هیچ مەترسیەك رووبەرووی سەربازەکانی نەدەبۆوە.

کردەوەی فرەن داتس لەو رۆژە و بەردنی سەربازەکان بۆ سەر شاخ و دابەزاندنیان لە پشت ئێسپارتەکان بە وتەی ژنران گۆردۆنی بەریتانی بریتی بوو لە شاکارێکی جەنگی.

سەربازەکانی ئێسپارت بە هۆی دابەزینی سەربازانی هەخامەنشی لە شاخ پشووکان و بیریان بۆ ئەوە نەدەچوو کە هەخامەنشییەکان لە شاخەوە هێز بێنن بۆ پشت ئەوان.

ژنراڵ گۆردۆن دەڵێت: من ئەو شوێنەم بینیوە کە ئەو سەربازانەی هەخامەنشی لێی هاتوونەتە خوارەوە و نازانم بەرزی ئەو شاخە لە ئەوێ تا ناو گەلیەکە چەندە. بەڵام ئەمرۆ بەرزایی شاخ تا دامێنی دەربەندەکە نزیکەی حەفتا مەترە و دامێنی شاخەکە نزیکە ستوونییە و هاتنە خوارەوەی سەرباز لە ئەوێوە زۆر سەخت و مەترسیدارە، بەڵام فرەن داتس جگە لە تەنها سەربازێك کە هەڵدێرا، کوژراوی نەدا و سەربازەکانی گەیاندە ناو دەربەنەکە.

هیرۆدۆت هاتنە خوارەوەی سەربازە ئێرانییەکان لەو شاخە لە پشت ئێسپارتەکان بە کردەوەیەك باس دەکات کە دوورە لە جوامێری و یاساکانی جەنگ و بە پێچەوانەوە ئەو کردەوەیەی فرەن داتس لەو رۆژەدا بریتی بووە لە شاکارێکی جەنگی و هیچ کەسێکی بە ویژدان بە پێچەوانەی نەریتی جوامێری دانانێت. لەو رۆژەوە کە کوروش بنەماکانی ڕازاندنەوەی لەشکری لە مەیدانی جەنگ لە سەر پێکهاتەی (لای راست و چەپ و دڵ) دانا، بەردەوام یەك لە دیارترین خۆدەرخستنە جەنگییەکان بریتی بوو لە گەیشتن بە پشتەوەی لەشکری دوژمن و لە پشتەوە هێرش کردن بۆ سەری.

ئانیبالْ فەرماندەی کارتاژ کاتێك جەبەل تاریقی بڕی و لە رێگای ئیسپانیا و فەرەنساوە خۆی گەیاندە شاخەکانی ئالْپ و فیلە گەورە ئەفریقیەکانی خۆی لە ئالْپەوە بردە رۆم، ئەو کردەوە جەنگییەی تەنها بۆ ئەوە بوو کە بتوانێت لە پشتەوە هێرش بکاتە سەر رۆمەکان. ئێستا لە تەواوی زانکۆ سەربازییەکانی دنیا ئەو کارەی ئانیبالْ وەك هونەری جەنگ دەخوێندرێت و بە شاکاری جەنگی دەیناسێنن و لە دوای بیست و سێ سەدە کە بە سەر ئەو جەنگەی ئانیبالْدا تێپەڕبووە، کەس نییە بلێت ئەو جۆرە جەنگ کردنەی ئەو دوورە لە جوامێری. ناپلیۆنی یەکەم ئیمپراتۆری فەرەنسا وانەی لەو کردەوەیەی ئانیبالْ وەرگرت و سەربازەکان و تۆپخانەی خۆی لە رێگەی شاخەکانی ئالْپ برد و ئیتالْیای داگیرکرد و مێژوونووسەکان کردەوەی ئەویش بە شاکار دادەنێن.

کەواتە بۆچی مانووری هەخامەنشییەکان بۆ هاتنەخوارەوە لە شاخ لە پشت ئێسپارتەکان کارێکی ناجوامێرانەیە، لە کاتێکدا کە ئەو کردەوەی هەخامەنشییەکان لە کردەوەی ئانیبالّ و ناپلیۆن زۆر قورستر بوو و لە هەردووکیان لە پێشتر بوو.

ژنرالّ گۆردۆنی بەریتانی دەڵێت: تا نەچنە تەرمۆپیل و ئەو شاخە نەبینن کە ئێرانییەکان پیایدا هاتوونەتە خوارەوە، ناتوانن تێ بگەن کە فرەن داتس فەرماندەی هەخامەنشی و سەربازەکانی ئەو، چ کارێکی ورد و سەختیان بە ئەنجام گەیاندووە.

لئۆنیداس پاشای ئێسپارت و فەرماندەی سەربازە ئێسپارتییەکان دەنگی کەوتنە خوارەوەی سەربازە ئێرانییەکەی بیست و بە سەربازەکانی خۆی وت پێموایە ڕووداوێکی تازە ڕوودەدات و خۆتان ئامادەبکەن و... هتد، خۆشی بەردەوام ئاگاداری پشتەوە بوو و لێی دانەبڕا تا لە دوورەوە دیتی سەربازەکانی هەخامەنشی دەرکەوتن. دواتر ئەفسەرێکی بە ناوی (کار فیدس) کە بە پلەکانی سەربازی ئێستا (مولازمی یەك) بوو، کردە فەرماندەی سەد سەرباز و وتی: تۆ لە گەڵ سەد سەرباز پێش بە ئەوان بگرە و منیش لە پێشەوە دەجەنگم.

مێژوونووسە یۆنانییەکان دەڵێن دوای ئەوی لئۆنیداس ئەو ئەفسەرەی دەست نیشان کرد تا پێش بە سەربازە هەخامەنشییەکان بگرێت کە لە پشتەوە دەهاتن، شمشێرە خوێناویەکی ڕوو لە هەتاو ڕاگرت و هاواری کرد: ئەی هەتاوی درەوشاوە بە هەموو جیهاندا، شاهید بە کە ئەمڕۆ لێرە کورانی ئێسپارت لە ڕێی نیشتیماندا خۆیان فیدا دەکەن.

گومان لە ئازایەتی لئۆنیداس و سەربازەکانیدا نییە، بەڵام ئەوانەی جەنگاوەرن دەزانن کە جەنگاوەر لە گۆڕەپانی جەنگدا دەرفەتی هۆنینەوەی داستانی نییە. لە نێوان نەتەوە کۆنەکان نەتەوەیەك ناناسین کە لە گەرمەی جەنگدا داستانیان نواندبێت و حەماسیان نواندبێت، تەنها عەرەبە پێ پەتییەکان نەبێت کە ئەوانیش پێش ئەوەی جەنگ دەست پێ بکات ئەو کارەیان دەکرد و دوای ئەوەی جەنگ دەستی پێدەکرد چیتر حەماسەیان نەدەخولّقاند و بە وتەی خۆیان (ڕەجز) یان نەدەووت. ئەو ڕستەیە لەو کاتەدا لە زمانی لئۆنیداس دەرنەچووە و زەروری نەبوو کە بیلێت، چونکە وەك باسمان کرد سەربازانی ئێسپارت لە جەنگدا هەرگیز هەنگاویان بۆ دواوە نەدەنا و لەو شوێنەی بۆی

دیاریکرابوو دەجەنگا تا ئەوکاتەی دەکوژرا و لە جەنگی تەرمۆبیلدا ئەوانەی ماندوو دەبوون دەکشانەوە و ئەوانەی لە پشتەوە بوون، شوێنیان دەگرتنەوە تا ئەوان پشوویان دەدا.

ئەو وتەیەی لئۆنیداس گەیێنەری ئەو مانایەیە کە بریار نەبووە سەربازە ئێسپارتییەکان لە جەنگەدا بکوژرێن و ئەو رۆژە و لەو جەنگە بە تایبەتی خۆیان فیدا کردووە، لە کاتێکدا کوژرانی سەربازە ئێسپارتییەکان لە جەنگدا رووداوێکی سروشتی بووە و سەربازی وڵاتی ئێسپارت کاتێك دەرۆیشت بۆ جەنگ یا دەکوژرا یا سەرکەوتوو دەبوو.

ئەو ڕستەیە کە دەگوترێت لئۆنیداس وتوویەتی و یا ڕستەیەکی تر کە لە سەر گۆڕی سەربازە ئێسپارتەکان نووسراوە و تا ئێستا ماوە، ماناگەلێکن کە دواتر لە لایەن دراما نووسە یۆنانییەکان نووسران و دواتر مێژوونووسەکان لێیان وەرگرتوون و لە پەرتووکەکانی خۆیاندا گونجاندیانن و هیچ یەك لەو ناوەرۆکانە لە لایەن خودی ئێسپارتەکانەوە نەووتراوە و نووسەرانی نەتەوەکانی تری یۆنان نووسیویانن و پیاوانی ئێسپارتی وەك پیاوە دلێرە راستەقینەکان خۆیان بە سەر خۆیاندا هەڵناڵێن و خەڵکی تر پیا هەڵدانیان بۆ دەکەن و هێشتا نەبینراوە سەردارێکی سەرکەوتوو شتێك وەك بەسەر هەڵدان بۆ خۆی بنووسێت و ئەوانی تر بەوکارە هەڵدەستن و شیعر دەڵێن و هەموو ئەو بابەتانەی لە داستانەکانی ئیلیاد و شانامەدا هاتوون لە لایەن هوومەر و فێردۆسیەوە نووسراون و وێڕای ئەوەی ئێسپارتەکان دلێرترین پیاوانی نەتەوەی یۆنان بوون، لە نێوان ئەواندا نووسەرێك نەبووە کە باسی ئازایەتی ئەوان بنووسێت.

کاتێك سەربازەکانی هەخامەنشی لە پشتەوە هاتن و لە سەربازە ئێسپارتەکان نزیك کەوتنەوە، سەربازە ئێسپارتەکان دوو جەبهەیان پێکهێنابوو و سروشتیشە کە سەربازەکانی ئەو دوو جەبهەیە پشتیان لە یەکتر کرد بوو. ئەوان چیتر نەیاندەتوانی پشوو بدەن، چونکە هەموویان لە جەنگدا بوون و کەسیان نەبوو کە بێ کار بێت و پشوو بدات تا دواتر جێگەی سەربازێکی تر بگرێتەوە.

گۆبریاس فەرماندەی بەشەکەی تری لەشکری هەخامەنشی کە لە خوارەوەی دەربەندی تەرمۆبیل دەجەنگان، چاوی لە هەتاو کرد تا بزانێت چەند ماوە تا رۆژ کۆتایی بێت و بە

ئەفسەرەکانی خۆی وت تا بە سەربازەکانی بڵێن کە ئەمرۆ کاتێك کە خۆر ئاوا دەبێت ، دەبێت بەرگری سەربازانی دوژمن کۆتایی پێ بهێنرێت و تێ بکۆشن تا بەردەوامی ئەو جەنگە نەکەوێتە رۆژی دواتر.

سەربازە هەخامەنشییەکان ماوە ماوە جێگۆرکێیان پێ دەکرا و هەرکە گۆبریاس هەستی دەکرد سەربازەکانی ماندوو بوون ئەوانی دەگۆڕین و سەربازە تازە نەفەسەکانی بۆ جەنگی ئێسپارتەکان دەنارد.

سەربازە ئێسپارتییەکان لە پێشەوە و لە دوواوە بە بێ وەستان شمشێریان دەوەشاند و بە قەلغانەکانیان بەرگریان لە بەرانبەر هێرشی هەخامەنشییەکان دەکرد و ئەفسەر و سەرباز لە پەنا یەکتر دەجەنگان و هەرچەندە هەوای وەرزی پاییز لەو ناوچە شاخاویە فێنك بوو، بەڵام ئارەقەی ماندوو بوون لە ژێر کاسکیتەکانیان دەهاتەدەر و بە سەر روخساریاندا دەهاتە خوار و لە هەندێکیاندا تێکەڵ بە خوێن دەبوو.

هەخامەنشییەکان دەیاندیت ئێسپارتەکان زرێیان لەبەر دایە، بۆیە هەوڵیان دەدا بە تەورەکانیان لە روخسار یا لە قاچیان بدەن کە بێ پۆشش بوون. کاتێك تیر بەر روخساری ئێسپارتییەك دەکەوت، شمشێرەکەی لە بن هەنگڵی دەگرت و بە ئارامی تیرەکەی دەردەهێنا و فرێی دەدا و دیسان شمشێرەکەی دەگرتەوە دەست و بەردەوام دەبوو لە جەنگ کردن. کاتێك زەربەیەك بەر قاچی دەکەوت ماوەیەك دەوەستا و تا ئازارەکە کەم دەبۆوە و دەستی بە جەنگ دەکردەوە و لە کاتی جەنگدا ئازارەکان کەمتر هەستیان پێ دەکرێت و دوای پشوودان و کاتێك سارد دەبێتەوە ئازارەکان دەزاندرێن.

یەکەم تیر کە بەر روخساری لئۆنیداس کەوت، بەر لێوی تەقاند و زەربەی بەهێز بوو و دوو دەدانی پێشەوەی شکاند، ئەو وەك سەربازەکانی خۆی شمشێری بە دەستی ڕاست و قەلغانی بە دەستی چەپ گرتبوو و دوای ئەوەی تیرەکەی بەرکەوت، شمشێرەکەی خستە بن هەنگڵی چەپی و تیرەکەی لە دەم و دەدانی دەرکێشا و فرێی دا و خوێن لە برینەکەی دەرپەڕی، بەڵام ئەو هیچ ئاگای لە لێو و دەدانی بریندار و خوێن بەربوون نەبوو، چونکە وەك سەربازەکانی تر لە منداڵییەوە بۆ بەرگەگرتنی ئازار ئامادەکرابوو.

هەروەك چوون ئەمرۆ مامۆستایانی هونەری (کیك بۆکسینگ) قوتابییەکانیان تێدەگەیاند کە ئەوەی زیاتر لە زەربەکان گرنگی بە رکابەر دەدات، بریتییە لە

بەگەگرتنی زەربەکان. لە ئێسپارتیش سەربازەکان فێر دەکران کە بەرگە گرتنی ئازاری زەربەی دوژمن لە کاتی جەنگدا، گرنگی زیاترە و پیاوی جەنگاوەر ئەو کەسەیە کە بریندار ببێت و بەردەوامبێت لە جەنگ.

لە کاتێکدا کە پاشای ئێسپارت بەردەوامبوو لە جەنگ کردن، تیری دووەم بەر ڕۆخساری کەوت و ئەو تیرە کەمێك بە خوارتر لە تیری یەکەم و لە ناو ئێسکی چەنەی کەوت. وەك ئەوەی مێشێك لە سەر چەنەی لئۆنیداس بێت و ئەو پیاوە ئاسنینە جارێکی تر شمشێرەکەی خستە ژێر هەنگڵی و تیرەکەی دەرهێنا و فرێیدا و لە کاتێکدا کە برینی پێشوو هێشتا خوێنی لێ دەچۆرایەوە، خوێنی برینی دووەمیش دەستی بە چۆرانەوە کرد.

لئۆنیداس دەرفەتی نەبوو کە دەست لە جەنگ هەڵبگرێت و داوا لە سەربازەکانی بکات تا تیماری بکەن و هەموو سەربازەکانی لە برین پێچیدا کارامە بوون. ئەوەندە خوێن لە بەر دوو برینەکانی روخساری لئۆنیداس چووڕایەوە تا قەلغان و قاچەکانی بە ڕەنگی ئەخەوانی گۆڕان، بێ ئەوەی خوێناوی بوونی ئەو سەرەنجی سەربازانی خەشایار ڕابکێشێت، چونکە لە نێوان سەربازە ئێسپارتییەکان کەس نەبوو کە خوێناوی نەبێت. بینینی دیمەنی ئەو سەربازە پۆلایینانە کە هەموویان لە خویندا سوور ببوون و بەردەوام دەستەکانیان دەجووڵان و لە شمشێرەکانیان خوێن دەچۆرایەوە، دیمەنێکی قورس و ناخۆش و بە شکۆ و وەحشیانە بوو.

خەشایار دیمەنی جەنگەکەی دەدیت و ئارەزووی دەکرد ئەوەندە نزیك ببێتەوە کە یەك بە یەکی سەربازە ئێسپارتییەکان ببینێت، بەڵام گۆبریاس ڕێگەی لێ گرت و دوور نەبوو ئەگەر زۆر نزیك بووایە تیری ئەوانی بەرکەوتبایە. وێڕای ئەوەی پاشای هەخامەنشی نەیدەتوانی وەك دەیویست دیمەنی جەنگ ببینێت، بەڵام دیسان تێدەگەیشت کە ئازایەتی ئەوان زیاترە لە ئەوەی ئەو بیری لێ کردبۆوە.

خەشایار جەنگی ریزی پشتەوەی سەربازە ئێسپارتییەکانی نەدەبینی کە لە گەڵ سەربازەکانی فرەن داتس دەجەنگان و تەنها جەنگی ریزی پێشەوەی دەبینی و دەیدیت کە سەربازە ئێسپارتییەکان بە شێوەیەك بەیەکەوە لکاون کە وادەزاندرێت بەرگە ئاسنینەکانیان لێك لحیم کراون و بە بوونەوەرێك دەچن کە سەد سەر و سەد دەستی هەیە و بەردەوام دەستی دەجووڵێتەوە. خەشایار دەستی چەپی سەربازە ئێسپارتییەکانی

نەدەدیت، چونکە دەستی چەپی ئەوان لە ژێر قەلغانەکانیان بوو و بەڵام دەستی راستی ئەوانی دەبینی.

بۆ پاشایەکی وەك خەشایار دیمەنەکانی ئەو گۆڕەپانەی جەنگ تازە نەبوون، ئەو لە سەردەمی داریوشی یەکەمی باوکی و لە کاتی دەسەڵاتی خۆشیدا کۆمەڵێك جەنگی بینی بوو و هەندێکات دیمەنەکانی ئازایانە بە بەرچاویدا تێپەر دەبوون و پیاوانێکی دەدیت کە لە جەنگدا زیاتر لە ئەوەی دەتوانن ئازایەتی و دلێری دەنوێنن، بەڵام وێڕای ئەوەی دیمەنی کۆمەڵێك جەنگی بینی بوون، شێوازی جەنگ کردنی سەربازە ئێسپارتەکان و بەرگری نائاسایی ئەوان لە بەرانبەر سەربازە هەخامەنشییەکان بۆ ئەو شتی تازە بوون.

جارجار سەربازێکی خوێناوی ئێسپارت دەکەوت و کەلینێك لەناو دیوارە ئاسنینەکەیاندا دروست دەبوو، بەڵام لە یەك چاو تروکاندندا ئەو کەلینەیان پر دەکردەوە و ئەوان بەیەکەوە دەنووسانەوە و بەرگە ئاسنینەکانیان لحیم دەبۆوە و دەستەکان بە هەمان خێرایی پێشوو شمشێرە خوێناویەکانیان دەوەشاند و خوێنە سوورەکەی سەر شمشێرەکان لە تیشکی خۆردا دەدرەوشایەوە.

هەمیشە ئازایەتی لە مەیدانی جەنگدا رێز و سەرەنجی بەدواخۆیدا هێناوە و جەنگاوەرەکان بۆ خەڵکی ئازا رێزیان نواندووە. کاتێك خەشایار بینی سەربازە ئێسپارتییەکان ئازایەتی و لێهاتوویی زیاتر لە ئەوەیان هەیە کە ئەو بیری لێ دەکردەوە، داوای کرد گۆبریاس بێت و پێیوت: بەو سەربازانە بڵێ ئەگەر خۆیان بە دەستەوە بدەن و کۆتایی بە جەنگ بێنن، بە باشی ڕەفتاریان لە گەڵدا دەکرێت.

لە پڕ دەنگی کەرەنای ڕاگرتنی جەنگ لە لایەن ئێرانییەکان لێدرا و هەموان دووچاری سەرسوڕمان بوون، سەربازەکانی خەشایار وازیان لە جەنگ هێنا و ئێسپارتەکانیش کە ماندوو بوون بە دەرفەتیان زانی تا پشوو بدەن.

نە هەخامەنشییەکان و نە ئێسپارتییەکان سەبارەت بە مانای ڕاگرتنی جەنگ هەڵە نەبوون و ئێسپارتی و هەخامەنشییەکان دەیانزانی ئەوە کاتییە. سەربازانی هەخامەنشی دەیانزانی خەشایارشا بریاریداوە کە ئەو رۆژە دەبێت جەنگ لە گەڵ ئێسپارتەکان کۆتایی پێ بێت و سەربازەکانی ئێسپارتیش دەیانزانی کە ئەستەمە لەشکری هەخامەنشی

جەنگ لە دژی ئەوان ڕابگرێت، چونکە دەیانزانی توانای بەرگری کردنی درێژخایەنیان نییە.

دوای دەنگی بەریەك کەوتنی شمشێرەکان و دەنگی نەعرەتەی هەندێ لە جەنگاوەرە هەخامەنشییەکان، بێ دەنگی باڵی بە سەر گۆڕەپانی جەنگدا گرت و ئەفسەرێکی خەشایار کە زمانی یۆنانی دەزانی، رووی لە ئێسپارتەکان کرد و وتی: پاشای هەخامەنشی فەرمانی کردووە تا بە ئێوە ڕابگەیێنم کە ئەگەر ئێوە خۆتان بە دەستەوە بدەن و کۆتایی بە جەنگ بێنن، لە گەڵتان بە باشی ڕەفتار بکرێت.

لئۆنیداس ویستی وەڵام بداتەوە، بەڵام چونکە دوو دەدانی پێشەوەی شکابوون نەیتوانی بە باشی بدوێت و هەندێ وشە دەرچوون کە مانایان نەزاندرا و ئەفسەرەکەی خەشایار وتی: تێ نەگەیشتم چت گووت.

لئۆنیداس بە ئەفسەرێکی خۆی وت تا بە دەنگێکی بەرز وەڵامی ئەو ئەفسەرە بداتەوە کە سەربازی ئێسپارت خۆ بە دەستەوە نادات.

ئەفسەرەکەی خەشایار پرسی کە ئایا ئەوە وەڵامی یەکجاری ئێوەیە؟

سەربازە ئێسپارتەکە لە پاشای ئێسپارتی پرسی تا چ بڵێت و لئۆنیداسیش وتی: وەڵام بدەوە کە ئەوە وەڵامی یەکجارەکی ئێمەیە و ئێمە خۆمان ڕادەست ناکەین. ئەفسەرەکەی خەشایار هاواری کرد و وتی ڕاگرتنی جەنگ بەردەوام دەبێت تا وەڵامەکەتان دەگاتە پاشا و گۆبریاس ئەو وەڵامەی بە خەشایارشا گەیاند و خەشایارشا فەرمانیدا جەنگ دەست پێ بکەنەوە تا بەرگری ئێسپارتەکان لەناو دەچێت.

بەیانی ئەو رۆژە دیمەنی سەربازە یۆنانییەکان بە پۆششی ئاسنین و کاسکێتەکانیان کە پەرەموجیان بەسەرەوە بوو، زۆر بە شکۆ بوون و بەڵام ئەوکات دیمەنی سەربازە ئێسپارتییەکان بە شێوەیەکی تر بە شکۆ بوو، چونکە سەرتاپای ئەوان بە خوێن ئەرخەوانی ببوو و شمشێری خوێناویان هەبوو کە لە تیشکی خۆردا دەدرەوشایەوە.

کاتێك کە هەخامەنشییەکان لە شاخ هاتنە خوارەوە و لە پشتەوە هێرشیان کردە سەر ئێسپارتەکان، لئۆنیداس پاشای ئێسپارت سەربازەکانی خۆی بە دوو دەستە دابەشکردبوون تا دەستەیەکیان پێش بە سەربازەکانی فرەن داتس بگرن. لە نێوان دوو دەستە سەربازی ئێسپارتی کە پشتیان لەیەك کرد بوو و لە گەڵ هەخامەنشییەکان

دەجەنگان، مەودا هەبوو و بەڵام تا جەنگەکە زیاتری بەسەردا دەڕۆیشت ئەو مەودایە کەمتر دەبۆوە و دواجار مەوداکە ئەوەندە کەم بۆوە کە دوو دەستە سەربازەکان بە فەرماندەیی لئۆنیداس و کارفیدس بەیەکەوە نووسانەوە و هێزیان زۆرتر بوو، چونکە بۆ ئەوان ئەو بابەتە ورەی هێناو و هەریەکەیان دەیزانی لە پشتییەوە دۆست هەیە نەك دوژمن.

خەشایار کە جارێك کۆتا وتەی بە سەربازە ئێسپارتەکان وتبوو، دەرفەتی بە ئێسپارتەکان دابوو، نەیدەویست ئەوە دووبارە بکاتەوە و بە گۆبریاسی دەووت کە جەنگ لەگەڵ سەربازە ئێسپارتەکان پێویستە تا ئێوارە کۆتایی پی بێت. لئۆنیداس بە وتەی تراژێدیا نووسە یۆنانییەکان رووی لە باکوور کرد، چونکە شاخی ئەلەمپ لە باکوور بوو و ویستی بزانێت خوایانی ئەو شاخە دێن بۆ یارمەتی ئەو و سەربازەکانی یا؟ بەلام خوایانی یۆنان کە لە شاخەکانی ئەلەمپ دەژیان نەهاتنە بۆ یارمەتیدانی لئۆنیداس و سەربازەکانی و ئەوانیان لە پێش هەخامەنشییەکان بە تەنها (هەر بە وتەی تراژێدیا نووسەکان) بەجێهێشت.

هەڵبەت ئەوان دەیانزانی کە خوایان نایەنە یارمەتیدانیان، بەڵام چاوەڕێ بوون یۆنانییەکان بێنە یارمەتیان، بەڵام لەو رۆژەدا تەنها یەك سەربازی یۆنانی نەهات بۆ یارمەتیان و ئێمە لە لە هیچ بەڵگەنامەیەکی مێژووییدا نابینین کە یۆنانییەکان بۆ یارمەتی ئەوان هاتبن، لە کاتێکدا کە ژمارەیەکی زۆر لە سەربازەکانی یۆنان لە بەشەکانی باشووری دەربەندی تەرمۆبیل بوون و دەیانتوانی بە خێرایی خۆیان بگەیێننە یارمەتی سەربازە ئێسپارتەکان، یا جێگەیان بگرنەوە تا ئەو پیاوە دلێرانە پشوو بدەن.

هەموو مێژوونووسە یۆنانییەکان هەوڵیانداوە هۆکار بۆ بە تەنها بەجێ هێشتی سەربازە ئێسپارتەکان لە بەرانبەر لەشکری هەخامەنشی بێننەوە و شیکردنەوە و بیانۆیەك بدۆزنەوە، بەڵام هەرچی وتوویانە بێ کاریگەریە و خوێنەر وتەی هیچیان بە هەند نازانێت.

پرۆفیسۆر بارن کە دەکرێت بە پسپۆری جەنگی تەرمۆبیل بناسرێت، دەڵێت: یۆنانییەکان بە ئەنقەست ویستیان لئۆنیداس و سەربازەکانی بکوژرێن و ئەو بۆ ئەم وتەیەی چەند هۆکارێك پێشکەش دەکات:

یەکەم ئەوە بوو کە نەتەوەکانی یۆنان ئیرەییان بە سەربازە ئێسپارتییەکان دەبرد چونکە نەیاندەتوانی لە رووی دلێری و خۆراگری لە گۆڕەپانی جەنگ بگەنەوە ئەوان و ئەوانیان لە بەرانبەر هەخامەنشییەکان بە تەنها هێشتەوە تا دوا کەسی ئەوان بکوژریت.

دووەم ئەوە بوو کە لئۆنیداس بە هۆی ئەو تورەیی و لووت بەرزییەی هەیبوو، لە لایەن یۆنانییەکان بێزراو بوو و تەنانەت ئەنجوومەنی پیرانی ئێسپارتیش نەفرەتیان لێ دەکرد و بێ ئارەزوو نەبوون کە لە مەیدانی جەنگ بکوژرێت و سەربازە ئێسپارتییەکان بوونە قوربانی نەفرەتی یۆنانییەکان لە لئۆنیداس.

سێ هەم/ لئۆنیداس تەنها بە ڕای خۆی چوو بوو بۆ مەیدانی جەنگ و ئەنجوومەنی پیرانی ئێسپارت فەرمانی کۆکردنەوەی سەربازیان لە وڵات و ناردنی بۆ پاڵپشتی ئەو دەرنەکردبوو تا ئەو بکوژرێت.

گریمان بە هەبوونی ئەو هۆکارانە ڕازی بین، دیسان یارمەتی نەدانی لئۆنیداس و سەربازەکانی لە لایەن نەتەوەکانی تر، دوور لەو هاودەردییە دەردەکەوێت کە لە نێوان نەتەوە یۆنانییەکان هەبوو. هەڵبەت لئۆنیداس دەیتوانی پێش ئەوەی هەخامەنشییەکان ڕێگەی پشتەوەی لێ بگرن، دەیتوانی سەربازێك بنێرێت بۆ دواوەی دەربەندەکە و داوا لە یۆنانییەکان بکات تا یارمەتی بۆ بنێرن، بەڵام ئەوەندە دەروونی بەهێز بوو، کە داواکردنی یارمەتی لە یۆنانییەکان بە شکانی خۆی دەزانی.

لە سەرتای جەنگدا سەربازەکانی خەشایار لاشەی کوژراوە ئێسپارتییەکانیان هەڵدەدایە خەرەندەکە و لاشەکانی سەربازەکانی خۆیان بۆ ناشتن دەگواستەوە بۆ پشت مەیدانی جەنگ، بۆ ئەوەی ڕێگەیان کراوە بێت و تەرمەکان بەر قاچیان نەگرن و ئێسپارتەکانیش هەمان کاریان ئەنجام دەدا. بەڵام دواتر کە دلێری لە رادە بەدەری ئێسپارتەکان بینرا، فەرماندەی هەخامەنشی فەرمانیدا تا لە فرێدانی تەرمی ئێسپارتەکان بۆ ناو خەرەندەکە بوەستن و ئەو تەرمانەش وەك ئەوانەی خۆیان بگوازنەوە بۆ پشت گۆڕەپانی جەنگ.

ئەگەر ئێستا لە یۆنان گۆرستانی ئەو سەربازانە دیارە، بە هۆی جوامێری سەرداری هەخامەنشییە کە نەیویست تەرمەکانی ئەو پیاوە ئازایانە لەناو بچن و ئەگەر ئەو

فەرمانی گواستنەوەی تەرمەکانی بۆ پشتی جەبهە دەرنەکردبایە و لە ناو خەرەندەکە دەبوونە خۆراکی کەمتیار و باڵندە لاشە خۆرەکان.

وتمان کە لئۆنیداس بە روخساری دانەپۆشراو دەجەنگا و سوودی لە رووپۆش و کاسکێت وەرنەدەگرت، دوو جار تیری بەرکەوت و تیری یەکەم بەر لێوی کەوت و تیری دووەم بەر چەنەگەی کەوت، بەڵام ئەو سەرکردە ئازایە جارێکی تریش تیری بەرکەوت و ئەجارە تیرەکە بەر چاوی چەپی کەوت. دیسان لئۆنیداس شمشێرەکەی لە ژێر هەنگلی گرت تا دەستی ڕاستی بەتاڵ ببێت و تیرەکەی گرت و لە چاوی چەپی دەرهێنا و فرێی دا و لە برینە تازەکەش خوێن دەچۆرایەوە. بەڵام پاشای ئێسپارت شمشێری لە بن هەنگڵی دەرهێنا و بەردەوامبوو لە جەنگ و وێڕای ئەوەی لە سێ برینی خوێن دەچۆڕایەوە، بەڵام هەر بە خێرایی شمشێری دەوەشاند. چەند ساتێك دوای ئەوەی چاوی چەپی لئۆنیداس کوێر بوو، رمێکی ئاودراو کە لە لایەن بازویەکی بەهێز هەڵدرا، بەرگە ئاسنینەکەی لئۆنیداسی بڕی و لە سینگی رۆچوو. ڕم پەیکانێکی تیژی هەیە کە ئەگەر دەستێکی بەهێز لە مەودایەکی نزیکەوە هەڵی بدات بۆ کەسێکی زریٚ پۆش، دەتوانێت چەکێکی مەترسیدار بێت و زرێکەی دەبڕی و لە جەستەی رۆدەچوو. دەزانیین هەڵدانی ڕم لە هۆنەرە جەنگییە کۆنەکانە و ئەو چەکە لە دەستی پیاوانی بەهێز و ڕاهێندراودا و لە مەودای نزیك، چەکێکی مەترسیدار بوو.

لئۆنیداس تا ئەوکات بەرگەی ئەو برینانەی گرتبوو کە بەر رۆخساری کەوتبوو و هەروەها بەرگەی ئەو برینە بچووکانەشی گرتبوو کە لە بەشەکانی تری جەستەی بوون، بەڵام نەیتوانی بەرگەی برینی ڕمەکە بگرێت، چونکە لە سینگی رۆچوو بوو و هەروەها نەیتوانی وەك برینەکانی پێشووی شمشێرەکەی لە ژێر هەنگلی دابنێت و رمەکە بگرێت و لە سینگی دەری بکات و توندی ئازارەکە ئەوی ناچارکرد تا بکەوێتە سەر چووك، بەڵام هێشتا شمشێرەکەی بە دەستێك بوو و قەلغانەکەشی لە دەستەکەی تریدا.

دوو سەربازی ئێسپارت کە لە تەنیشت لئۆنیداسەوە بوون، ئەویان دیت کە چووکی لە سەر زەوی دادا، بەڵام بە رادەیەك گرفتاری جەنگ بوون کە نەیانتوانی هیچ یارمەتییەکی لئۆنیداس بدەن و ئەگەر بۆ یارمەتیدانی ئەو لە جەنگ بیٚ ئاگا ببوانە، خۆشیان دەکوژران.

سەربازێکی ئێرانی کە گورزێکی لە دەستدا بوو توانی خۆی بگەیێنێتە لئۆنیداس و گورزەکەی بە توندی لە کاسکێتی ئەو پیاوەدا و لئۆنیداس کە تا ئەوکات لە سەر چووك بوو، کەوتە سەر زەوی و سەربازەکانی هەخامەنشی دەست بەجێ تەرمەکەیان ڕاکێشا و لە مەیدانی جەنگیان دوورخستەوە. ئەوکاتە کەس نەیزانی ئەو پیاوە پاشای ئێسپارتە و لە کۆتایی جەنگ پێناسی ئەو ئاشکرا بوو.

کوژرانی ئەو هیچ کاریگەری نەکردە سەر دۆخی سەربازەکانی تری ئێسپارتی کە ڕوو لە باکوور دەجەنگان و لە جەنگ بەردەوامبوون و فرەن داتس کە لە پشتەوە هێرشی کرد بووە سەر سەربازە ئێسپارتییەکان، ژمارەیەکی زۆری لێ کوژرا بوو و سەربازەکانی ئەو زرێیان لەبەر نەبوو.

فرەن داتس پێش جوولە کردن دەیزانی کە ئەگەر لە کاتی سەرکەوتن لە شاخ زرێ بکەنە بەریان، ناتوانن لە لوتکە بپەڕنەوە و بگەنە پشت ئێسپارتەکان. بەڵام سەربازە ئێسپارتییەکان وەك دەزانین کاسکێت و زرێیان هەبوو و شمشێر و نێزە کاریگەری لە بەشی سەرەوەی لەشیان نەبوو و لە قاچەکانیشیان تەنها ئەو شوێنانەی بێ پۆشش بوون دەتواندرا زەربەیان لێ بدرێت کە ڕان بەند و قاچ بەندی لێ نەبوو.

فرەن داتس پێش ئەوەی بکەوێتەڕێ بۆ سەرکەوتن لە شاخ ڕێژەیەکی زۆر پەتی هێنا بوو و دوای گەیشتنیان بۆ لای ئێسپارتەکان، چیتر پێویستیان بە پەتەکان نەما و بە سەربازەکانی وت تا سوود لەو پەتانە وەربگرن بۆ کەمەند هاوێشتن و سەربازە ئێسپارتەکانیان پێ بخەنە سەر زەوی. چەند جارێك هێرشی کەمەند سوودی هەبوو و توانیان چەند سەربازێکی ئێسپارتی بخەن و بیانکوژن، بەڵام سەربازانی ئێسپارت کاتێك زانیان لە مەترسی کەمەند دان، چیتر دووچارنەبوون و هەر جارێك کە بازنەی کەمەندیان بۆ دەهاویشترا، بە قەلغان یا شمشێر دووریان دەخستنەوە.

هەرچەندە سەربازەکانی فرەن داتس نەیاندەتوانی زاڵ ببن بە سەر بەرگری سەربازەکانی (کارفیدس)، بەڵام هێرشی ئەوان بۆ ئێسپارتەکان بە سوودی سەربازەکانی تری خەشایار لە لای باشوور بوو و لەو کاتەوە کە ئەو هێرشە دەستی پێکرد چیتر ئێسپارتەکان دەرفەتی پشوودانیان نەما و بێ پسانەوە شمشێریان دەوەشاند، ئەوان تەنها لە کاتی

ڕاگرتنە کاتییەکەی جەنگدا توانیان پشوو بدەن و دواتر کە جەنگ دەستی پێکردەوە، تەنها بۆ چاو تروکاندنێك شمشێرەکانیان نەدەوەستا.

گەزنەفۆن دەڵێت: هەندێکات سەربازێکی هەخامەنشی دەرفەتی دەبوو تا زەربەیەك لە قاچی سەربازێکی ئێسپارت بدات و بیخاتە سەر زەوی و هەرکە سەربازەکە دەکەوتە سەر زەوی، ئەوانی تر بەو زەربانەی لە روخساریان دەدا دەیان کوشت و یا بە شمشێر لە نێوانی کاسکێت و زرێکانیان واتە لە قۆرگیان دەدان و بە پەلە ملیان دەبرین. ئەو پەلە کردنە لە کوشتنی ئەو سەربازە کەوتوانە بۆ ئەوە دەگەڕایەوە کە سەربازەکانی ئێسپارتی جیابوون لەو سەربازانەی تا ئەو رۆژە بینی بوویان یا جەنگیان لەگەڵدا کردبوون و وایان دەزانی ئەو سەربازە ئێسپارتییەی کەوتووە، دوای ماوەیەکی کەم هێز وەردەگرێتەوە و هەڵدەستێتەوە و دیسان شمشێرە خوێناویەکەی دەکەوێتەوە جووڵە و پێویستە ئەو بکوژن.

هەندێکات سەربازێکی ئێرانی قاچی لە سەر خوێن دەخلیسکا و دەکەوت، بەڵام سەربازە ئێسپارتییەکان وێڕای ئەوەی قاچیان لە سەر خوێنەکان دانابوو، بەڵام نەدەخلیسکان و نەدەکەوتنە سەر زەوی، چونکە هەنگاوەکانیان بەرز نەدەکرد تا بیانخەنەوە سەر زەوی و خلیسك ببەن و ئەوان بن قاچیان لە سەر زەوی دەخشکاند بێ ئەوەی قاچیان لە زەوی جیابکەنەوە

ئەوان لە کاتە ئاساییەکان وەك هەر کەسێکی تر رێگایان دەبڕی و بۆ هەنگاونان قاچەکانیان لە زەوی بەرز دەکردەوە، بەڵام لە کاتی جەنگدا هەردوو بەرە پێکانیان لە زەوی دەخشکاند تا لەسەر خوێن خلیسك نەبەن و لەو رووەوە وەك بۆکس بازەکانی ئەمرۆ بوون کە لە شوێنی بۆکسێندا، قاچەکانیان لە سەر زەوی دەخشێنن و بنی لاقیان لە زەوی دانابرێت، چونکە ئەگەر داببرێت و لە هەمانکاتدا زەربەی مشتەکۆڵە بەریان بکەوێت، دەکەونە سەر زەویز

سەربازە ئێسپارتییەکان وێڕای ئەوەی لە مەیدانی جەنگ و لە سەر خوێن، قاچەکانیان لە زەوی دانەدەبری، جۆرە پێڵاوێکی تایبەتیشیان لە پێ دەکرد کە ژێری خەتی هەبوو و تەخت نەبوو و رێگری دەکرد لە بەربوونەوەیان.

پرۆفیسۆر بارن دەڵێت: لەو پێنج سەد سەربازە هەخامەنشییەی لە گەڵ فرەن داتس چوونە پشت ئێسپارتەکان و لە پشتەوە هێرشیان بۆ کردن، دوو سەدیان بریندار و کوژراو

بوون و لە مەیدانی جەنگ هێندرانە دەرەوە و ئەوانی تر بەردەوامبوون لە جەنگ، چونکە فرەن داتسیش وەك گۆبریاس دەیزانی دەبێت جەنگ لە گەڵ ئێسپارتەکان ئەو ڕۆژە کۆتایی بێت.

یەك کاتژمێر پێش خۆرئاوا بوون لە ناو ئەو سەد سەربازە ئێسپارتییەی رووە باکوور دەجەنگان، کەس نەما کە بتوانێت بەردەوامبێت لە جەنگ و هەموویان کەوتن و بە پێی فەرمانی خەشایار لە مەیدانی جەنگیان هێنانەدەرە. چونکە چیتر لە دەستەی باکووری ئێسپارتییەکان سەربازێك نەمابوو کە بتوانێت جەنگ بکات، سەربازەکانی دەستەی باشووری ئێسپارت کەوتنە نێوان دوو دەستە سەربازی خەشایار و ئەوەی تا ئەوکات لە پشتەوە ئەوانی دەپاراست لە ناو چوو.

چیتر جەنگ درێژ نەبۆوە و پاشماوەی سەربازە ئێسپارتەکان ئەوەندە ماندوو بوون کە نەیانتوانی ببنە دووبەش و دوو جەبهە دروست بکەن و خۆیان لە هێرشی هەخامەنشییەکان لە پشتەوە بپارێزن و ئەگەر وتەی هیرۆدۆت و گەزنەفۆن پەسەند بکەین کە دەڵێن: هەخامەنشییەکان هەموو ئەو سەربازانەیان کوشت. بەڵام پرۆفیسۆر بارن دەڵێت: کوشتنی ئەو سەربازانەی ئێسپارت دوای ئەوەی کە دەکەوتن لە لایەن سەربازە ئێرانییەکان، دوور بوو لەو شێوازە جەنگییەی کوروش و داریوش یاساکانیان دانابوو بە تایبەتی لە بارەی رەفتار لەگەڵ ئەسیرەکاندا. پاشای هەخامەنشی فەرمانی کرد بوو تا لاشەی کوژراوە ئێسپارتییەکان نەخەنە خەرەندەکەوە تا بیان نێژن، چوون رەزامەندی دەنواند تا ئەو سەربازانەی توانایان نەمابوو و ئەسیر ببوون، بکوژن؟

بە بڕوای پرۆفیسۆر بارن هەموو سەربازە ئێسپارتەکان کە ژمارەیان سێ سەد کەس بوو لە ناو جەنگدا نەکوژران و هەندێکیان مانەوە، بەڵام دواتر بە هۆی ماندوویەتی زۆر و ئەو برینانەی لە جەستەیاندا هەبوو، کەوتن و نەیانتوانی لە جەنگ کردن بەردەوامبن و کوشتنی ئەوان بە دەست لەشکری خەشایار بە زانینی ئەو رێزەی خەشایار لە ئەسیرەکانی دەگرت، ناچێتە بواری پەسەندکردنەوە.

لەوانەیە هەندێك لە ئەوان دوای ئەوەی ئەسیر بوون بە هۆی برینەکانیان مرد بن، بەڵام سەربازەکانی خەشایار هیچ یەك لە ئەسیرەکانیان نەکوشت و تەنها ئەو سەربازانەی لە مەیدانی جەنگدا دەجەنگان، کوژران. بۆ نموونە لئۆنیداس پاشای ئێسپارت و

جێگرەکەی (کارفیدس) کوژران و ژمارەی گۆڕەکانی سەربازە ئێسپارتەکان سێ سەد نییە تا بگوترێت کە هەر سێ سەد سەربازی ئێسپارتی کوژراون، بەڵام تێکرای مێژوونووسە یۆنانییەکان کە دەزانیین رایان بەرانبەر بە ئێرانییەکان باش نەبوو و بە تایبەتی هیرۆدۆت، ئێرانییەکان تاوانبار دەکەن کە ئەو سەربازانەش کە کەوت بوون و زیندوو بوون، کوشتیانن و لە سێ سەد سەرباز کە لەگەڵ لئۆنیداس هاتنە ترمۆبیل، تەنانەت یەکیان زیندوو نەمایەوە.